# هەزار و یەک شەو

وەرگێڕانی: سولەیمان ئیبڕاهیمزادە



بەرگی سێیەم

ADIBAN


## ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان

بەڕێوەبەری گشتی: ئارامی مەلا محەمەد



**ناونیشان:** سلێمانی، شەقامی ئیبراهیم پاشا،فولکەی گۆزەکان، نزیک ناوەندی ڕۆژهەڵاتی کوڕان.

**پەیوەندی:** 07701974656 - 07501590032 - 07731974646 - 07501696369

**Email:** bookadiban@gmail.com

**Facebook:** https://www.facebook.com/eadiban/



ناسنامەی کتێب

ناونیشان: هەزار و یەک شەو.

کۆکردنەوەی: عەبدول لەتیف تەسووجی.

بابەت: گێڕانەوە.

ژانر: کۆمەڵە چیرۆکی ئەفسانەیی فارسی، عەرەبی و هیندی.

وەرگێڕانی: سولەیمان ئیبراهیمزادە.

پێداچوونەوە: جووتیار قارەمان.

بەخشانگە: ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان.

دیزاینی دەق و بەرگ: ئارام مەلا محمەد

ساڵی چاپ: ٢٠٢٠ میلادی، بەرگی سێیەم، چاپی یەکەم.

لە بەڕێوەبەرایەتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (١٥٦٩) ساڵی (٢٠٢٠) پێ دراوە، ئەم کتێبە لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبانە،

## که شەوی چوارسەد و هەشتا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! بەلوقیا کە ئەو شـــەڕەی دیت نەترەی چوو، لە دڵی خۆیدا گوتی خودایە ئەوە چ بوو تووشـــی بووم. لەو جەنگەیەدا هەردوو لا چاویان پێی کەوت. هەرکە چاویان بەو کەوت شەڕەکەیان ڕاگرت و یەکێک لەو دوو لایەنە بەرەو ڕووی ئەو هاتن. کە لێی نیزیک بوونەوە ڕواڵەتی ئەویان بەلاو سەیر بوو. یەکێک لە سوارەکان لێی چووە پێشێ و بە بەلوقیای گوت: «ئەتۆ کێی و لە کوێوە دێی و دەچی بۆ کوێ؟» بەلوقیا گوتی: «ئەمن مرۆڤم و هەڵوەدا و ئەودالی خۆشـــەویســـتی حەزرەتی محەممەدم. بەلام ڕێگام لێ هەڵە بووە.» سـوارە گوتی: «ئێمە قەتمان مرۆڤ نەدیوە و ئێرە قەت مرۆڤی نەهاتووەتێ.» ئیدی ئەوان قسەکردنی بەلوقیایان بەلاوە سەیر بوو. ئەوجار بەلوقیا لەوانی پرسی: «ئێوە کێن؟» سوارەکە وەلامی داوە: «ئێمە جانتیم . بەلوقیا لێی پرسی: «سوارۆ، هۆکاری ئەو شەڕەتان چییە؟ ئێوە لە کوێ ئاکنجین و نێوی ئەو وڵاتە کوێیە؟» ســـوارەکە وەلام داوە: «ئێمە ئاکنجی «ارض بیضا» (ئەرزولبەیزا)ین واتە وڵاتی سپی. هەر ساڵێک خودا ئەمرمان پێ بکا دێینە سـەر ئەو ئەرزە و لەگەڵ هۆزی جان کە کافرن جیهاد دەکەین. بەلوقیا لێی پرسـی: « ارض بیضـا» (ئەرزولبەیزا)کوێیە؟» سـوارەکە گوتی: «لە پشـت کێوی قافەوەیە کە لێرەوە هەتا ئەوێ حەفتا و پێنج ســـاڵ ڕێیە. ئێرە ئی شـــەددادی کوڕی عادە و ئێمە بۆ جیهاد هاتووینە ئێرە و ئێمە جگە لە زیکر و یادی خودا هیچ کارێکمان نییە. پادشـــایەکمان هەیە ناوی ســـەخرپاشـــا . چار نییە دەبێ تۆ لەگەڵمان بێی تا بتبینێ. ئیدی ئەوان ڕۆیشـــتن و بەلوقیاش لەگەڵ ئەوان ڕۆیشـت. هەتا گەیشـتنە لای هۆدەکەی ئەوان. بەلوقیا سـەیری کرد ئەو شـــوێنە پڕە لە تاوڵ و ئۆبەی گەورەی حەریری ســـەوز کە خودا نەبێ کەس نازانێ ژمـارەیـان چەنـدە دەبێ. لە نێو ئەو خێوەتـانەدا خێوەتێکی دیت لە حەریری ســـوور کە گەورەییەکەی هەزار گەز دەبوو. کەندرەکانی لە حەریری شـین و گوڵمیخەکانی زێڕ و زێو بوو. بەلوقیا کە ئەو خێوەت و شـتەی دیت تاسـا. ئەوان بەلوقیایان برد هەتا گەیشـتنە ئەو تاوڵە کە تاوڵی سـەخرپاشـا بوو. بەلوقیایان بردە ژووری لای سـەخرپاشـا. بەلوقیا سـەیری کرد ئەوە پادشا لە سەر تەختێکی زێڕی سووری گەورە دانیشتووە کە بە دوڕ و گەوهەر ڕازاوەتەوە. لە لای ڕاســـتییەوە گەورەگەورەکانی جان و لە لای چەپییەوە حەکیمـان و ئەمیران دانیشـــتوون. بەلوقیا لەڕێوە چووە بەرەوە و ســـڵاوی کرد و کڕنۆشـــی برد. سـەخرپاشـا سـڵاوەکەی ئەسـتاندەوە و گوتی: «کاکە وەرە پێشـێ.» بەلوقیا چووە پێشـێ. پاشا فەرمووی کورسی بۆ دانێن. کورسیان بۆ هێنا و پاشا فەرمووی کرد. بەلوقیا لە سەر کورسـییەکە دانیشـت. ئینجا سـەخرپاشـا پرسـیاری لێ کرد کە: ئەتۆ چی؟ بەلوقیا وەلامی داوە من مرۆڤم و لە هۆزی بنی ئیسرائیلم. دوای ئەوە سەخرپاشا پێی گوت: «بەسەرهاتی

خۆتم بۆ بگێڕەوە کە چۆناوچۆن هاتوویتە ئەو وڵاتەوە.» بەلوقیا بەسەرهاتی خۆی لە سەرەتاوە تا ئەو شوێنە بۆ گێڕاوە. سەخرپاشا سەری لە کاری بەلوقیا سووڕ مابوو.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و نەوەد هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! سەخرپاشا سەری لە کاری بەلوقیا دەرنەدەچوو واقی وڕ مابوو. دوای ئەوە فەرمانی دا سفرە ڕاخەن و دەفری زێڕین و زیوینیان ڕیز کرد. لە جێیەک سەد وشتر و لە جێیەک بیست وشتر و لە شوێنێکی دی پەنجا سەر مەڕیان کوشتبووەوە و هەزار و پێنج سەد دەفریان دانابوو. بەلوقیا بە دیتنی ئەو دیمەنانە حەبەسابوو. ئینجا ئەوان خواردنیان خوارد و ئەویش لەگەڵ ئەوان نانەکەی خوارد و شوکری خودای کرد. ئەوجار سفرەیان کۆ کردەوە و میوەیان هێنا. کە لە میوەخواردنیش تەواو بوون شوکری خودا کرا و سڵاوەتیان بۆ حەزرەتی محەممەد نارد. کاتێک بەلوقیا ناوی محەممەدی بیست بە سەخرپاشای گوت: «دەمهەوێ داوایەکت لێ بکەم.» سەخرپاشا گوتی: «هەر پرسیارێکت هەیە بیکە.»

بەلوقیا گوتی: «ئێوە چین و ڕەسەن و لە چییە؟ حەزرەتی محەممەد لە کوێوە دەناسن وا سڵاوەتی بۆ دەنێرن؟ سەخرپاشا گوتی: «بەلوقیا خودای تەعالا دووزەخی لە حەوت نهۆمدا ئافراندووە. هێندێک لە سەرەوەی هێندێکن و نێوان ئەوان ئەو قاتە لەگەڵ قاتەکەی دیکە هەزار ساڵەرێیە. ناوی قاتی یەکەم جەهەننەمە و بۆ تاوانبارانێکە کە بێ ئەوەی تۆبە بکەن دەمرن. قاتی دووەم ناوی لەزییە و بۆ کافرانە و ناوی قاتی سێیەم جحیمە کە تایبەتی یاجووج و ماجووج چێ کراوە. ناوی قاتی چوارەم سەعیرە کە تایبەتی منداڵەکانی شەیتانە و ناوی قاتی پێنجەم سەقەرە و تایبەتی نوێژنەکەرانە. ناوی قاتی شەشەم حۆتەمە کە بۆ جوولەکە و گاورەکان چێ کراوە و ناوی قاتی حەوتەم هاوییەیە کە تایبەتی دووڕووەکانە.» بەلوقیا گوتی: « پاشا ڕەنگە ئازاری جەهەننەم لە قاتەکانی دیکە کەمتر بێ. چونکە ئەو لە قاتی یەکەم دایە؟»

سەخرپاشا گوتی: «ئەرێ، ئازاری ئەو لە هەموویان کەمترە بەڵام سەرەڕای ئەوەش هەزاران کێوی ئاگرینی تێدایە و لەو کێوانەش هەزارن ساکەدەشتی ئاگرینی تێدایە. هەر ساکەدەشتێکیش هەزاران شاری ئاوری تێدایە و هەر شارێکیش حەفتا هەزار قەڵای ئاگری تێدایە و هەر قەڵایەکیش حەفتا هەزار ماڵی تێدایە. هەر ماڵێکیش حەفتا هەزار تەختی ئاورینی تێدایە لە سەر هەر تەختێک حەفتا هەزار جۆرە ئازاری تێدایە. بەلوقیا ئازاری ئەو قاتە لە چاو ئەوانی دیکە هیچ نییە. ژمارەی ئەوان خودا بۆخۆی نەبێ کەس نازانێ چەندن. بەلوقیا، کە ئەو قسەیەی بیست بێهۆش بوو. کە وەهۆش هاتەوە دەستی کرد بە گریان و گوتی: «پاشا ئەی بڵێی ئێمە بە کوێ بگەین؟ پاشا گوتی: «بەلوقیا خەمت نەبێ هەرکەس حەزرەتی محەممەدی خۆش بوێ، ئاور نایسووتێنێ و ئازادە لە جەهەننەم. چونکە هەرکەس

ئۆممەتی حەزرەتی محەممەد بێ ئاور دووری لێ دەکا و لەبەری هەڵدێ. خودای تەعالا ئێمەی لە ئاور چێ کردووە و ئەوانەی کە خودا لە جەهەننەمدا لە پێش هەموو شـــتێک دروســـتی کردوون دوو شـــتن: یەکەم خولییەت و ئەوی دی میللییەت بوون. خولییەت بە شـــێوەی شـــێر ئافرابوو. میللییەتیش لە بچمی گورگ. کلکی میللییەت لە بیچمی ژناندا بوو. بەڵەک بوو. کلکی خولییەتیش لە بیچمی پیاواندا بوو کە شـێوەی ماری دەدا. کلکی میللییەت ڕواڵەتێکی کیسـەڵی هەبوو. درێژایی کلکی خولییەت بە درێژایی بیسـت سـاڵەڕێ بوو. دوای ئەوە خودای میری مەزن فەمـانی دا کلکی خولییەت و میلییەت تێکەڵ بن. ئەوان ئـاوێتەی یەک بوون. لەو دوانە مار و دووپشک کەوتەوە. کە شوێنی نیشتەجێ بوونی ئەوان دۆزەخە و بۆ ئازاری دانیشـتوانی دۆزەخ ئامادە کراون. دوای ئەوانە مار و دووپشـک جووت بوون و وەچەیـان لێ کەوتەوە و زۆر بوون. خودای گەورە دیســـــان بە خولییەت و میللییەتی فەرموو دیسان جووت بنەوە. کە جووت و میلییەت دوو گیان بوو. کە لێ بووەوە حەوت و کوڕ و حەوت کچی بوو. ئەوانیـان پەروەردە کرد هەتـا گەورە بوون. کە گەورە بوون کچەکانیان لە کوڕەکان مارە کرد. ئەوانە لە قســـەی باوکی خۆیان دەرنەدەچوون. جگە لە یەکێک لە کوڕەکان کە لە ڕووی بابی وەرگەڕاوە. لەڕێوە بوو بەکرم. ئەو کرمە ئیبلیســـی دەرکراو بوو. ئەو یەکێک لە نیزیکانی خودا بوو چونکە هەمیشـــە خەریکی عیبادەتی خودا بوو. هەتا هەڵکشا بۆ ئاسمان و لە خودا نیزیک بووەوە و بووە سەرۆکی لە خودا نیزیکان.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی چوارسەد و نەوەد و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! ئیبلیس بوو بە ســـەرۆکی نیزیکانی خودا. کاتێک کە خودا ئادەمی دروسـت کرد، بە ئیبلیسـی فەرمووو سـووژدەی بۆ بکە. ئیبلیس وڵامی نەداوە. خودا ئەوی دەرکرد و بێ بەری کرد. ئەوانەی لەو کەوتنەوە شـەیتانەکانن. بەڵام ئەو شـەش کوڕەی کە گوێڕایەڵی بوون. ئەوان جـانن. کە ئیمـانیـان هێنـا و ئێمە لە بەرەی ئەوانین. بەلوقیـا ئەو قسەیەی سەخرپاشای پێ سەیر بوو. ئینجا بە سەخرپاشای گوت: «دەمهەوێ بە یەکێک لە نیزیکانت بفەرموو بمبەنەوە وڵاتەکەی خۆم. ســـەخرپاشـــا وەڵامی داوە کە ئێمە ناتوانین کاری ئاوا بکەین. مەگین خودای تەعالا بیهەوێ و پێمان بڵێ.

بەڵام بەلوقیا ئەگەر دەشت هەوێ لەلای ئێمە برۆی ئەوە ئەسپێک لە ئەسپەکانی خۆمت دەدەمێ و ســـوارت دەکەم و پێشـــی دەڵێم بتبا بۆ ئەو شـــوێنەی بۆخۆم دەڵێم. ئەگەر گەیشتییە ئەو شوێنە ئەوە کۆمەڵێک دەبینی دێن بۆ لات و ناوی پاشاکەیان براخیایە. ئەگەر چاو لە ئەسپەکە بکەن دەیناسن و تۆ لە ئەسپەکە دادەبەزێنن و ئەسپەکە بۆ ئێمە دەنێرنەوە. ئێمە هەر ئەوەندەمان لە دست دێ. بەلوقیا کە ئەو قسەیەی بیست دەستی کرد بە گریان و بە پاشای گوت: «چۆنت پێ چاکە وا بکە. پاشا فەرمانی دا ئەسپێکیان بۆ هێنا و سواریان کرد و پێیان گوت: «بەڵام وریا بە لەو ئەسپە دانەبەزی، لێی نەدەی و بە سەریدا نەگوڕێنی دەنا لە بەینت دەبا. ئەتۆ هەر سـواری بەو ئارام دانیشـە و خۆت بگەر کارت پێی نەبێ هەتا بۆخۆی ڕادەوەستێ. هەر وەک پێم گوتی ئەوان دێن بۆ لات.

بەلوقیا ســـواری ئەســـپەکە بوو. کەوتە ڕێ و ماوەیەکی زۆر هەر بە نێو خێوەتەکاندا ڕۆیشت. سەیر لەودا بوو هێشتا هەر لە چێشتخانەکەی پاشا ڕەد نەببوو. هەر دەڕۆیشت و مەنجەڵی گەورەگەورەی دەدیت کە ئاگریان لە بندا داییســـا. بەلوقیا کە ئەو مەنجەڵانەی دەدیت وای چاو لێ دەکردن کە پاشـــا وایزانی برســـییەتی، فەرمانی دا دوو وشـــتری سوورەوەکراوی بۆ بێنن. چێشلێنەرەکان دوو وشتریان بۆ هێنا و لە پشتی ئەسپەکەیان دا. دوای ئەوە بەلوقیا سوار بوو ڕۆیشت هەتا گەیشتە ئەو شوێنەی کە سەخرپاشا گوتبووی. ئەســـپەکە ڕاوەســـتا. بەلوقیا لە ئەســـپەکە دابەزی و خەریک بوو تۆزی ڕێگایەی لە خۆی دەتەکاند کە تـاقمێک پیـاو هـاتن بۆ لای و لە دوور ئەســـپەکەیـان نـاســـییەوە. لەڕێوە ئەســـپەکەیان لێ وەرگرت و کەوتنە ڕێ. بەلوقیاش لەگەڵیان ڕۆیشـــت هەتا گەیشـــتنە لای براخیاشـا. بەلوقیا سـڵاوی لە پاشـا کرد. پاشا سـڵاوەکەی سـتاندەوە. ئینجا بەلوقیا چاوێکی لە ڕواڵەتی براخیاشا کرد کە وەک سەخرپاشای هاتە بەرچاو. کە نانیان دانا ئەویش لەگەڵ ئەوان نانەکەی خوارد و شـــوکری خودای کرد. ئەوجار ســـفرەیان لا برد و میوەیان هێنا.

میوەشـــیان خوارد. ئینجا براخیاشـــا لە بەلوقیای پرســـی لەکەیەوە لە لای ســـەخرپاشـــا کەوتوویتە ڕێ؟ بەلوقیا گوتی: «دوو ڕۆژ لەمەوبەر.» براخیاشـــا گوتی: «بەلوقیا دەزانی بەو دوو ڕۆژە چەندە ڕۆیشـــتووی؟» بەلوقیا گوتی: «ناوەڵڵا، نازانم.» براخیاشـــا گوتی: «بەو دوو ڕۆژە ڕێگای حەفتا مانگت بڕیوە.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و نەوەد و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! دوای ئەوە براخیاشا بە بەلوقیای گوت: «باسی بەسەرهاتی خۆتم بۆ بکە بزانم چۆناوچۆن هاتوویە ئەو وڵاتە؟» بەلوقیا بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕاوە. براخیاشان کە بەسەرهاتی بەلوقیای بیست، سەری لە کاری ئەو سوورِ ما. بەلوقیا دوو مانگی ڕەبەق لە لای براخیاشا ماوە.

کە شاژنی ماران چیرۆکەکەی تا ئێرە گێڕاوە. حاسێب کەریمەددین ئەوەندەی دی حەبەسا و بە شاژنی گوت: «تکایە بیکە بۆ خارتی گەورەیی و دلۆڤانی خۆت بە یەکێک لە دەستوپێوەندەکانت بڵێ بمباتەوە سەر زەوی با بچمە لای کەس و کارەکەی خۆم. شاژنی ماران گوتی: «حاسێب کەریمەددین ئەوەندە بزانە کە ئەگەر تۆ لەو ماڵە بڕۆیە دەرێ و بچی بۆ لای کەسوکارەکەت دەچییە گەرما و خۆت دەشۆی. کە تۆ لە خۆ شوتنەکت بوویەوە، ئەمن لەڕێوە دەمرم و هۆکاری مردنەکەشم ئەوە دەبێ. حاسێب کەریمەددین گوتی: «ئەمن سوێندت بۆ دەخۆم هەتا بمێنم سەر بە گرماودا نەکەم. ئەگەر غوسڵم لە سەر بێ هەر لە ماڵەکەی خۆم خۆم دەشۆم.» شاژنی ماران پێی گوت: «ئەگەر تۆ سەد جاریش سوێندم بۆ بخۆی، باوەڕ ناکەم کە ئەو کارە ناکەی. ئەخە لە بیرت نەچێ تۆ مرۆڤی. گفتی مرۆڤیش جێی باوەڕ نییە چونکە ئادەمی باوکتان لەگەڵ خوداش گفت و بەڵێنی خۆی نەبردە سەرێ. و پەیمان شکێنی کرد. حاسێب کەریمەددین کە ئەو قسەیەی بیست بێ دەنگ بوو. دەستی کرد بە گریان و تا دە ڕۆژان لە لای شاژنی ماران ماوە و هەر گریا. دوای ئەوە بە شاژنی گوت: «پێم بڵێ ئاخری بەلوقیا چی بە سەر هات؟» شاژنی ماران گوتی: «حاسێب، دوای ئەوەی بەلوقیا دوو مانگ لە لای براخیاشا ماوە. هەستا و ماڵاوایی لێ کرد و ڕۆیشت. شەو و ڕۆژ بە دەشت و بێرووندا ڕۆیشت هەتا گەیشتە کێوێکی بڵیند. چووە سەر کێوەکە. لەوێ فریشتەیەکی گەورەی دیت لەو کێوە دانیشتبوو عیبادەتی خودای گەورەی دەکرد و سڵاوەتی بۆ حەزرەتی محەممەد دەنارد. نووسراوەیەکیشی لە پێش بوو کە شتی سپی و ڕەشی لێ نووسرابوو. چاوی لەو نووسراوەیە دەکرد. دوو باڵیشی هەبوو. یەکیان هەتا ڕۆژهەڵات کشابوو، ئەوی دیکە تا ڕۆژئاوا. بەلوقیا چووە پێشێ سڵاوی لێ کرد و ئەویش سڵاوەکەی ئەستاندەوە. لە بەلوقیای پرسی: «تۆ کێی و لە کوێوە هاتووی و دەچی بۆ کێ و ناوت چییە؟» بەلوقیا گوتی: «ئەمن مرۆڤم و ناوم بەلوقیایە و لە خۆشەویستیان هەڵوەدای محەممەد بووم.» ئەو فریشتەیە پرسی: «هەتا گەیشتوویە ئێرە، چیت دیوە و چیت بە سەر هاتووە.» بەلوقیا تەواوی بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕاوە. چی دیتووە و چی بەسەرهاتووە.

کاتێک بەلوقیا ئەو بەسەرهاتەی بیست، واقی وڕ ما. ئەوجار بەلوقیا لە فریشتەکەی پرسی: «ئەتۆ کێی و ئەو نووسراوەیە چییە و چی لێ نووسراوە؟» فریشتە گوتی: «ناوی من میخائیلە و ئەمنیان داناوە چاوەدێری سووڕانی شەو و ڕۆژم و ئەوە کاری منە هەتا ڕۆژی ڕابوونەوە.»

بەلوقیا سیما و گەورەیی ئەو فریشتەیەی بەلاوە سەیر بوو. دوای ئەوە بەلوقیا ماڵاوایی لە فریشتەکە کرد و ملی ڕێیەی گرت و ڕۆیشت. ڕۆیشت تا گەیشتە مێرگ و سەوزاییەکی بەرین و لەوێ تێر گەڕا. حەوت جۆگەلە ئاوی دیت لە نێو دارستانەکەدا دەخوشین. هەر ئاوا بە دەوری دورگەکەدا دەگەڕا کە چاوی بە چوار فریشتە کەوت کە لە ژێر دارێکی گەورەدا دانیشتبوون. چوو بۆ لایان چاوی لە بیچم و قەلافەتیان کرد. یەکەمی وەک مرۆڤ هاتە بەر چاو، دووەمی بە شێوەی ئاژەڵی ماڵی و سێیەم و چوارەمی وەک باڵندە و شێر. کە هەموویان خەریکی زیکری خودا بوون و دەیان گوت: «خودایا، ئافرێنەر و بەدیهێنەری گەورەی ئێمە بیکە بۆ خاتری گەورەیی و مەزنی خۆت و خۆشەویستیی حەزرەتی محەممەد لەو بەدیهاتوانە خۆش بە کە لە بیچم و شێوەی منن و لەگەڵیان بە سۆز و بەزەیی بە.» کاتێک بەلوقیا گوێی لەو قسانەی ئەوان بوو. ئەوەندەی دیکە ئۆگری حەزرەتی محەممەد (د ـــ س) بوو. لە لای ئەوانیش ڕۆیشت و بە شەو و بە ڕۆژ هەر ڕۆیشت هەتا گەیشتە کێوی قاف. چووە سەر کێوەکە لەوێ فریشتەیەکی گەورەی دیت کە زیکری خودای تەعالای دەکرد و خەریکی تەسبیحات بوو. سڵاوەتی بۆ حەزرەتی محەممەد دەنارد. ئەو فریشتەیی دیت کە تێکدەئاڵا و دەکراوە. بەلوقیا سڵاوی لێ کرد و فریشتەکە سڵاوەکەی ستاندەوە و لێی پرسی: «ئەتۆ چی و لە کوێوە دێی و دەچی بۆ کوێ و ناوی تۆ چییە؟» بەلوقیا گوتی: «من لە هۆزی بەنی ئیسرائیلم و مرۆڤم. ناوم بەلوقیایە و هەڵوەدای دیداری حەزرەتی محەممەدم، بەڵام ڕێم ون کردووە. ئیدی تەواوی چیرۆکی ژیانی خۆی بۆ گێڕاوە. کە چیرۆکەکەی تەواو بۆ گێڕاوە لە فریشتەکەی پرسی کە ئەتۆ کێی و ئەو کێوە کوێیە و لێرە خەریکی چی؟ فریشتە گوتی: «بەلوقیا، ئەو کێوە قافە کە دەوری دونیای تەنیوە، هەر بستە ئەرزێک کە خودا بەدی هێناوە لە ژێر دەسەڵاتی مندایە. ئەگەر خودای تەعالا بیهەوێ کارەساتێکی سرووشتی وەک بوومەلەرزە و ویشکەساڵی و شەڕ و ئاشتی بنێرێ بۆ وڵاتێک ئەوە من دەکاتە بەرپرسی. ئەمن بێ ئەوەی لە جێی خۆم ببزووم ئەو کارەساتە بەسەر ئەو وڵاتە دێنم. پێم خۆشە بزانی تەواوی ڕەگ و دەماری گۆی زەوی لە دەست من دایە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی چوارسەد و نەوەد و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! فریشتە گوتی: ڕەگ و دەمارەکانی گۆی زەوی لە دەست من دایە. بەلوقیا گوتی: «گەلۆ خودا بێجگە لە زەوی شوێنی دیکەشی ئافراندووە بۆ ژیان؟» فریشتە گوتی: «بەڵێ، خودای تەعالا زەوییەکی دیکەی بە نێوی «ارض بیضـــا»(ئەرزولبەیزا) واتە زەوی سپی ئافراندووە کە دانیشتوانەکەی هەمووی فریشتەن و خواردن و خواردنەوەیان زیکر و تەســـبیح و بیرکردنەوەیە لە گەورەیی خودای بەدیهێنەرە و ســـڵاوەت ناردنە بۆ ڕوحانەتی پێغەمبەر. کە هەموو شـــەوانی هەینی دێنە ســـەر ئەو کێوە و هەتا بەیان هەر خەریکی نوێژ و پاڕانەوە و زیکری خودان. ئەو تاعەتەش دەکەنە دیاری بۆ ئەو تاوانبارانەی ئۆمەتی حەزرەتی محەممەد. بە تایبەتی بەو کەســـانەی کە غوســـڵی هەینی لە خۆیان دەردەکەن. ئیدی ئەو فریشتانە هەتا ڕۆژی هەینی ئەوە کاریانە. ئەوجار بەلوقیا پرسیاری لەو فریشتەیە کرد کە: «گەلۆ خودا لە پشت کێوی قافەوەش کێوی دیکەی هێناوەتە دی؟» فریشـــتە گوتی: «بەڵێ، بەڵێ لە پشـــت کێوی قافیشـــەوە کێوی دیکەی بەدی هێناوە کە بەرزاییەکەی پێنجســەد ساڵەڕێیە لە بەفر و تەرزە دروســتی کردووە. هەر ئەو کێوەیە کە بەشـێک لە گەرمی دووزەخی گرتووە. دەنا دونیا لە گەرمی دۆزەخدا دەسـووتا. لە پشـت کێوی قـافەوە هەزاران وڵاتی دیکەی لێیە کە هەر یەکیـان چـل بەرابەری ئەو وڵاتەیە. هێندێکیان لە زێو و هێندێکیان لە یاقووتە و هەرکام لەو وڵاتانە ڕەنگی جیاجیای هەیە. دانیشتوانی ئەو وڵاتانە فریشتەکەکانن کە ئەوان هیچ کارێکیان نییە جگە لە زیکر و نوێژ و تەسبیح و داننان بە تاکی و گەورەیی خودا. دایمە دەپاڕێنەوە خودا لە ئۆمەتی محەممەد (د ـــ س) خۆش بێ. ئەو فریشـتانە نە حەووا دەناسـن و نە ئادەم. نە ڕۆژیان بۆ هەیە و نە شەو.

بەڵام بەلوقیا، ئەوەش بزانە کە ئەو دونیایانەی باسی دەکەم حەوت قاتن، حەوت نهۆمن لە ســـەر یەک. خودای تەعالا فریشـــتەیەکی خوڵقاندووە کە ئەو کات دونیایەی لە ســـەر قەڵاندۆش داناوە. لە ژێر ئەو فریشـتەیە بەردێک و لە ژێر ئەو بەردەش مانگایەک و لە ژێر ئەویش ماسـی خوڵقاندووە و لە ژێر ئەو ماسـییەش دەریایەکی گەورەی خوڵقاندووە. خودا ئەو ماسـییەی پێشـانی حەزرەتی عیسـا داوە کاتێک گوتی کە خودایە ئەو ماسـییەم پێشـان بدە با ببینم. ئینجا خودا فریشـتەیەکی نارد کە حەزرەتی عیسا بەرێ تا چاو لە ماسـییەکە بکا. وا بوو فریشـتە حەزرەتی عیسـای هەڵگرت و پێی گوت: «عیسـا چاو لەو ماسـییە بکە. عیسا (د ـ س) چاوی لە ماسییەکە کرد. سەری ئەو ماسییە وەک بریسکە بە سەری عیسادا هات و عیسا (د ـــ س) لە ترسان لە هۆش خۆی چوو. کە وە هۆش خۆی هاتەوە لە لایەن خوداوە وەحی بۆ هات: «عیسا، ماسییەکەت دیت؟ زانیت درێژ و پانی چەندەیە؟» عیسا (د

ــــ س) وەڵامی داوە: «خودایە بە گەورەیی و شکۆی تۆ من ماسیم نەدیت. هەر ئەوەندە دەزانم شتێک وەک بریسکە بە سەرمدا هات کە درێژاییەکەی سێ ڕۆژڕێ دەبوو کە نەمزانی ئەو تیشکە چ بوو.»

خودای تەعالا فەرمووی: «ئەوەی بە بەر چاوی تۆدا هاتووە ئەوە سەری ئەو ماسییە بووە کە من ڕۆژێ چل ماسی ئاوا بە دی دێنم. تەواوی ئەو چل ماسییە دەرخواردی ئەو ماسییە دەدەم کە دونیا لە سەر شانی ئەوە.» بەلوقیا کە ئەوەی بیست سەری لە گەورەیی کار خودا گێژ بوو و تاسا. دوای ئەوە بەلوقیا لە فریشتەکەی پرسی: «خودای تەعالا لە بن ئەو دەریایە چی خوڵقاندووە؟» فریشتە گوتی: «خودای مەزن لە ژێر ئەو دەریایە هەوای داناوە و لە ژێر ئەو هەوایەش ئاگری بەدی هێناوە و لە ژێر ئەگرەکەش مارێکی گەورەی خوڵقاندووە کە ناوی فەلەقە. ئەگەر ئەو مارە لە ترسی خودا بوێرێ تەواوی ئەو شتانەی کە لەسەریتی بە یەکەوە قوتت دەدا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی چوارسەد و نەوەد و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! خودای تەعالا کە ئەو مـارەی بەدی هێنـا وەحی بۆ نـارد و پێی فەرموو کە دەمەوێ شـــتێکت بە ئەمانەت لە لا دانێم تا بۆم بپارێزی. مارەکە عەرزی کرد بەدیهێنەری من، چۆن بفەرمووی لە خزمەتت دام.

ئینجا فەرمانی بە مارەکە کرد: «زارت بکەوە.» کە مارەکە زاری کردەوە، خودای مەزن دۆزەخی خستە زگییەوە و پێی گوت: «هەتا ڕۆژی ڕابوونەوە ئەوەم بۆ ڕاگرە.» کە ڕۆژی ڕابوونەوە هات، خودای تەعالا فریشـتەکان ڕادەسـپێرێ بە زنجیرگەڵێکی زۆر دۆزەخ بێنن بۆ مەحشـــەر. ئەودەم فەرمان دەدا دەرگاکانی دۆزەخ بکەنەوە. هەر کە دەرگاکانی دۆزەخ بکرێنەوە مەشخەڵی ئاگرەکە بە قەد کێوێک لە دۆزەخەوە خۆ دەکێشێتە دەرێ.

کاتێک بەلوقیا ئەو قسەیەی لە فریشتەکە بیست، زۆر گریا و ماڵاوایی لە فریشتەکە کرد و بەرەو ڕۆژاوا کەوتە ڕێ. ڕۆیشـت هەتا تووشـی دوو کەس بوو کە لە پەنا دەروازەیەکی گەورە دانیشـــتبوون. لێیان چووە پێشـــێ یەکیانی وەک شـــێر هاتە بەرچاو و ئەوی دیکەی وەک مانگا. سڵاوی لێ کردن. ئەوانیش سڵاوەکەیان ئەستاندەوە و لە بەلوقیایان پرسی کە: «ئەتۆ چی و لە کوێوە دێی و دەچی بۆ کوێ؟» بەلوقیا وەڵامی دانەوە کە: «ئەمن مرۆڤم و خۆشەویستی حەزرەتی محەممەد (د ـــ س) منی هێناوەتە ئێرە. بەڵام ڕێم لێ ون بووە.» دوای ئەوە بەلوقیا لێی پرســـین: «ئێوە کێن و ئەوە دەرگای کوێیە؟» ئەوان گوتیان ئێمە دەرکەوانی ئەو دەرگایەین و کاری ئێمە هەر زیکر و یادی خودایە و ســـڵاوەت ناردن بۆ حەزەرتی محەممەدە (د ـــ س). بەلوقیا گوتی: «ئەوبەری ئەو دەروازەیە چییە؟» گوتیان: «نازانین.» بەلوقیا گوتی: «تۆ ئەو خودا گەورەیە ئەو دەرگایەم بۆ بکەنەوە با چاوێک لە ژووری بکەم.» گوتیان: «هیچکەس جگە لە دونیادا ناتوانێ ئەو دەرگایە بکاتەوە جگە لە جوبرەئیل.»

بەلوقیا کە ئەو وتەیەی بیســـت هەردووک دەســـتی هەڵێنا بە دەرگاکەیەوە ناو خۆی تێهەڵســـوو و لە بەر خودا پاڕاوە و گوتی: «ئافرێنەری من تکات لێ دەکەم جوبرەئیل بنێرە ئەو دەرگایەم بۆ بکاتەوە با بزانم ئەو ناوە چی تێدایە. خودای تەعالا دۆعاکەی قەبووڵ کرد ئەمری بە جوبرەئیل کرد بچۆ بە زەوی دەرگای «مجمع البحرین» (مەجمەعولبەحرەین)ی بۆ بکەوە. لەوێوە جوبرەئیل هات بۆ لای بەلوقیا. ســـڵاوی لێ کرد و دەرگاکەی بۆ کردەوە و بە بەلوقیای گوت: «فەرموو بچووە ژووری چونکە خودا فەرمانی پێ کردم دەرگاکەت بۆ بکەمەوە. ئیدی بەلوقیا چووە ژووری و جوبرەئیل دەرگاکەی داخســـتەوە و گەڕاوە بۆ ئاسمان.

بەلوقیا چاوی بە دەریایەک کەوت کە نیوەی سوێر و نیوەی شیرین بوو. لە قەراخ ئەو دەریایە دوو کێوی یاقووتیی سووری لێ بوو. بەلوقیا لەو کێوە چووە سەرێ. لەوێ سەیری کرد ئەوە فریشتەکان خەریکی زیکر و یادی خودان و لاالەالاالله و ئەڵلاهو ئەکبەرن. بەلوقیا سڵاوی لێ کردن. ئەوانیش جوابی سڵاوەکەیان ئەستاندەوە. بەلوقیا لە بارەی ئەو کێو و دەریایانەوە پرسیاری کرد. وەڵامیان داوە کە ئەو دەریایە یارمەتی تەواوی دەریاکانی سەر زەوی دەکا و ئێمە لەو دەریایەوە ئاو دەنێرین بۆ تەواوی دەریاکانی سەر زەوی. ئەو دوو کێوەش، خودا بۆ ڕاگرتن و پاراستنی ئاوی ئەو دەریایەی خوڵقاندوون. تا ڕۆژی پەسڵانیش لێرە کاری ئێمە ئەوەیە. ئەوجار ئەوان لە بەلوقیایان پرسی کە ئەتۆ لە کوێوە هاتووی و دەچی بۆ کوێ؟ بەلوقیا بەسەرهاتی خۆی لە سەرەتاوە تا ئەو شوێنە بۆ گێڕانەوە و پرسیاریشی کرد بە کوێدا بڕوا.

ئەوانیش گوتیان: «ڕاست بە سەر ئەو ئاوەدا بڕوا.» بەلوقیا لە ئاوی گیایەکەی پێی بوو دیسان لە بەری پێی دا و ماڵاوایی لە فریشتەکان کرد و بە سەر دەریادا ڕۆیشت. شەو و ڕۆژ بەردەوام ڕۆیشت لە ڕێگا تووشی چوار فریشتە بوو کە ئەوانیش بە سەر ئاوەکەدا دەڕۆیشتن بەڵام ڕۆینی ئەوان وا بوو کە وەک بروسکە دەخوشین.

بەلوقیا چووە پێشێ و سەر ڕێگاکەی لێ گرتن. کە گەیشتنێ بەلوقیا سڵاوی لێ کردن و لێی پرسین تۆ ئەو خودا گەورە پێم بڵێن؛ ناوتان چییە و لە کوێوە دێن و دەچن بۆ کوێ؟ یەکێک لەوان گوتی: «ناوی من جوبرەئیلە. ئەوەیان ئیسرافیلە و ئەوەیتر میکائیلە و هۆوەشیان ئیزڕائیلە. لە وڵاتانی لای ڕۆژهەڵات ئەژدیهایەک هاتووە کە هەزاران شاری وێران کردووە و خەڵکی ئەو شارانەی خواردووە. هەر بۆیە خودای تەعالا ئێمەی ڕاسپاردووە بچین ئەو ئەژدیهایە بگرین و بیبەین بۆ دۆزەخ. بەلوقیا سەری گەورەیی و قەڵافەتی جەستەیی ئەو فریشتانە سوورِ ما و زەندەقی چووبوو. ماڵاوایی لێ کردن و ڕۆیشت. شەو و ڕۆژ بەردەوام بە سەر ئەو دەریایەدا ڕۆیشت هەتا گەیشتە دوورگەیەک و ماوەیەک لە وێدا گەڕا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی چوارسەد و نەوەد و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! بەلوقیا چووە دورگەکە و ماوەیەک لەوێدا ماوە و گەڕا. لاوێکی جوانچاکی دیت. لێی چووە پێشێ سەیری کرد ئەوە لە پەنا دوو قەبر دانیشتووە و خەریکی شـینگێڕییە. بەلوقیا سـڵاوی لێ کرد. ئەو لاوە وەڵامی سـڵاوەکەی داوە. بەلوقیا پرسـیاری کرد کە ناوی چییە و چکارەیە و ئەو دوو گڵکۆیە کێن و بۆ بۆیان دەگری؟ لاوەکەی چاوی لە بەوقیا کرد و دەسـتی کرد بە گریانێک کافر بۆی موسـوڵمان دەبوو. بەدەم گریانەوە بە بەلوقیای گوت: «کاکە گیان، چیرۆکی ژیانی من چیرۆکێکی ســـەیر و ســـەمەرە و پڕ لە کارەسـاتی خۆش و ناخۆشـە. وەرە لە لام دانیشـە و باسـی ژیان و بەسـەرهاتی خۆتم بۆ بگێڕەوە کە هۆی هاتنت بۆ ئێرە چییە ئەودەم منیش سەربەهوردەی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە.

بەلوقیا لە لای گەنجەکە دانیشـــت و موو بە موو بەســـەرهاتی خۆی بۆ گێڕاوە کە چی کردووە و چووەتە کوێ و چی بەســـەرهاتووە هەمووی باس کرد و پێشـــی گوت کە ئەو هەڵوەدا بوون و پەڕیوە بوونەم لە خوشـــەویســـتی حەزرەتی موحەممەد (د ـــــ س) هەڵبژاردووە و ئەوداڵی ئەو زاتە گەورەیەم. جا ئیدی نازانم ئاخری بە کوێ دەگەم و چم لێ دێ. ئینجا گوتی ئەوە بوو باس و خواسی من و ئەوەی بە سەرم هاتووە.

لاوە، کە ئەو بەسەرهاتەی بیست، ئاهێکی هەڵکێشا و گوتی: «کاکە گیان هێشتا ئەتۆ لە چاو من چیت بە ســـەر نەهاتووە و چیت نەدیوە. بەلوقیا ئەمن حەزرەتی ســـولەیمانیشـــم دیتووە و زۆر شتی تر کە نابژێردرێ. کوڕە ئەمن شتی واوام بە سەر هاتووە ئەگەر بۆت بگێڕمەوە سـەرت دەماسـێ، ئەتۆ دانیشـە و جارێ لە لام بمێنەوە با بۆت بگێڕمەوە. ئەودەم پێشت دەڵێم ئەمن بۆ لێرەم.»

کاتێک شاژنی ماران هەتا ئێرەی چیرۆکەکەی گێڕاوە، حاسـێب کەریمەددین سـەری لەو بەســـەرهاتانە ســـووڕ مابوو، گوتی: « شـــاژن، تۆ ئەو خودایە ئازادم بکە و بە یەکێک لە خزمەتکارەکانت بڵێ من بەرێتەوە ســـەر زەوی، ســـوێندت بۆ دەخۆم هەتا بمێنم نەچمە گەرماو.» شاژن گوتی: «باسی ئەوە مەکە، چونکە ئەوە جێبەجێ نابێ و باوەڕ بە سوێندی تۆ ناکەم.» حاسـێب کە ئەوەی بیســـت بە دڵێکی پڕ لە خەمەوە دەســـتی کرد بە گریان و مارەکانیش هەموو لە تاوی ئەو دەســـتیان کرد بە گریان و لە بەر شـــاژن پاڕانەوە و پێیان گوت: «پێمانخۆشـــە یەکێک لە ئێمە ڕاســـپێری ئەو مرۆڤە بەرینەوە ســـەر زەوی، چونکە ئەوەتا بەڵێنی داوە هەتا هەتایە قەت نەچێتە گەرماو.» شـــاژنی ماران ناوی یەملیخا بوو. کاتێک یەملیخا زانی ئەوە هەموو مارەکان پێیان خۆشـــە هاوکاری ئەو مرۆڤە بکەم. هێنای حاسـێب کەریمەددینی سـوێند دا. دوای ئەوە بە مارێکی گوت، گوتی: «ئەو مرۆڤە بەرنەوە

سەر زەوی.» مارە هاتە لای حاسیب و ویستی بیباتە دەرێ. حاسیب بە شاژنی مارانی گوت: «ئەرێ قەرار بوو بەسەرهاتی ئەو لاوەم بۆ بگێڕییەوە کە بەلوقیا لە لای دانیشتبوو.» شاژنی ماران گوتی: «حاسێب بەلوقیا لە لای ئەو لاوە دانیشت و بەسەرهاتی خۆی لە ئەووەڵەوە تا کۆتایی بۆ گێڕاوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی چوارسەد و نەوەد و شەشەم هاتەوە

**چیرۆکی جانشا و شەمسە**

گوتی: خاوەنشکۆ! کە بەلوقیا چیرۆکی ژیانی خۆی بۆ لاوەکە گێڕاوە، لاوەکە پێی گوت: «کاکە گیان باوکی من پاشایەک بوو تیقمووسپاشایا پێ دەگوت. دەسەلاتداری مەڵبەندی کابول و بنی شەهلان بوو. دە هەزار سەرهەنگی هەبوو. هەر سەرهەنگێکی دستی بە سەر سەد قەلادا دەڕۆیی. پاشای حەوت ناوچە لە ژێر دەسلاتی بابمدا بوون. بە جۆرێک کە لە رۆژهەلات و ڕۆژئاواوە پیتاکی بۆ دەهات. بابم پادشایەکی عادڵ بوو. بە عەداڵەتەوە پاشایەتی دەکرد خودای تەعالاش لە هەموو ڕێیەکەوە یارمەتی دەدا. بەلام منداڵی نێرینەی نەبوو، هەمیشە لە بەر خودا دەپاڕاوە کوڕێکی بداتێ وا بێ دوای مەرگی جێگای ئەو بگرێتەوە و دەسلات و ولاتەکەی بۆ بپارێزێ و ڕایگرێ. ڕۆژێک لە ڕۆژان تەواوی زانا و حەکیم و ئەستێرەناسانی کۆ کردەوە بانگی کردنە لای خۆی و پێی گوتن: «دا چاوێک لە چارەی من بکەن بزانن بەشم لە کوڕدا دەبێ کە لە جێی من دانیشێ و ولات بەڕێوە ببا یان نا؟»

ئەستێرەناسان کتێبگەلێکی زۆریان کردەوە و لێی ورد بوونەوە لێکیان داوە و پێیان گوت: «پاشا ئەتۆ کوڕت دەبێ بەلام ئەو کوڕە لە داوێنی کەس داناکەوێ، جگە لە کچی پاشای خوراسان نەبێ.»

کاتێک تیقمووسپادشا ئەو هەواڵە خۆشەی لەوان بیست، لە ڕادە بەدەر خۆشحاڵ بوو، ئەستێرەناسەکانی خەنی کرد لە ماڵی دونیا.

پاشا وەزیرێکی زانا و چالاک و نەترسی هەبوو کە بارەتەقای هەزار سوار بوو. ناوی عەینزار بوو. پاشا بانگی کردە لای خۆی و ئەوەی لە ئەستێرەناسەکانی بیستبوو هەمووی بۆ گێڕاوە و پێی گوت برۆ خۆت تەیار کە و ساز بە بچووە بۆ خوراسان بۆ خوازبێنی کچی بێهڕەوانشا.

وەزیر دەستوبرد کاروباری سەفەری ئامادە کرد و بە هێز و سپایەکی زۆرەوە لە دەرەوەی شار تاوڵ و خێوەتی هەڵدا و تیقمووسپادشایش هەزاران باری دیبا و قەتعەی دیوار و گەوهەر و مرواری و قاقووت و زێڕ و زێو لە یەستر و وشتران بار کرد و دای بە وەزیر و نووسراوەیکیشی بەو ناوەرۆکەوە بۆ نووسی:

«لە پێش هەموو شتێکدا سلاوت ئاراستە دەکەم، بەڕێز بێهڕەوانشا. دوای ئەوە پێویستە عەرزت بکەم کە زانایان و ئەستێرەناسان ڕایان وایە کە من منداڵی نێرینەم دەبێ بەو

مەرجەی لەگەڵ کچەکەی تۆدا زەماوەند بکەم. ئێســـتاش من وەزیرەکەم عەینزارم لەگەڵ ماڵێکی زۆردا ناردووەتە خزمەتت ماڵەکە بۆ ئاهەنگی کچەکەت خەرج بکە. وەزیرەکەشـم با وەکیلم بێ و هەر لەوێ لێکمان مارە بکەم. هەر بۆیە تکایە داواکانی وەزیرەکەم بەجێ بێنن کە هەر داوای منن. خاوەخاو و کەمکاری تێدامەکە و خۆ لە دژایەتی بپارێزە چونکە خودای تەعالا دەســەڵاتی کابلی داوە بە من و ئەمیری بنی شـەهلاشـم وڵاتێکی زۆری خسـتووەتە ژێر دەســەڵاتی پاشـایەتی منەوە. ئەگەر تۆ کچەکەت بدەی بە من ئەوە من و تۆ لەو وڵاتە بەرینەدا شـەریک دەبین و هەموو سـاڵێ ئەوەندەت ماڵ بۆ دەنێرم کە لە ژمار نەیە. ئەوەیە داخوازی و مەبەستی من.»

تیقمووسپادشـا نامەکەی پێچاوە و دایە دەسـت عەینزار. وەزیر لە ڕێوە کەوتە ڕێ و شـەو و ڕۆژ بەردەوام ڕۆیشـت هەتا لە شـاری بێهرەوانشـا نیزیک بوونەوە. پادشـایان لە هاتنی وەیزی تیقمووسپادشـا ئاگادار کردەوە. پادشـا گەورەگەورەکانی دەوڵەتی نارد بۆ پێشـــوازی وەزیر. نێردراوەکـان چوون بەرەو پیلی وەزیری تیقمووس و دابەزین بە خێرهاتنیان کرد. دە ڕۆژ لەوێ مانەوە و هەموو ڕۆژێ خواردن و خواردنەوەی جۆراوجۆر و دیاری لە لایەن بێهرەوانشاوە دەهات بۆ وەزیری تیقمووسپادشا و داروودەستەکەی. کە دەرۆژە تەواو بوو چوونە ناو شـارەوە. بێهرەوانشـا بە پێشـوازیانەوە هەتا دەرەوەی شـار هاتبوو. کاتێک گەیشـتنە یەک یەکتریان لە ئامێز گرت و پادشـا زۆر بە گەرمی وەزیری لە ئـامێز گرت و بە خێر هـاتنی کردن. دوای ئەوە وەزیر عەینزار تەواوی دیـاری و پێشکەشییەکانی لەگەڵ نامەکەی تیقمووسپادشا بردە لای بێهرەوانشا و داینێ.

بێهرەوانشـا نامەکەی وەرگرت و خوێندییەوە و لە مەبەسـتەکەی گەیشـت. زۆری پێ خۆش بـوو بە وەزیـری گـوت: «خەمـت نەبـێ داخـوازییەکـانـت وەدی دێـنـم. ئەگەر تیقمووسپادشـا داوای گیانم بکا لە سـەر چاومی دادەنێم. ئیدی لەجێوە بێهرەوانشـا هەسـتا چوو بۆ لای کچەکەی و دایکی کچە. خزم و کەســەکانیانی کۆ کردەوە و بابەتەکەی لەگەڵ هێنانە گۆڕێ کە تێکڕا گوتیان: «بڕیار، بڕیاری تۆیە و چۆنت پێ باشە وا بکە.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی چوارسەد و نەوەد و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! ئەوجار بێهرەوانشـــا هاتەوە لای وەزیر و ئەرخەیانی کرد. ئیدی وەزیر عەینزار، دوو مانگ لە لای پادشـــا ماوە و دوای ئەوە بە بێهرەوانشـــای گوت: «سپاست دەکەم ئەگەر کارەکانمان ڕاپەڕێنی بڕۆینە شارەکەی خۆمان.» پادشا فەرمانی دا ئـاهەنگیـان بۆ بگێڕن و گیـازەکەیـان بۆ ئـامـادە بکەن. ئەوجـار تەواوی وەزیر و گەورەگەورەکانی دەوڵەتی کۆ کردەوە و ناردی کەشـــیش و قەشـــەیان هێنا. کچەیان لە تیقمووسپادشا مارە کرد. دوای ئەوە بێهرەوانشا دیاری و خەڵات و پێشکەشییەکی زۆری بۆ پێچاوە تا ڕادەیەک کە لە بژاردن و تاریف نەدەهات. فەرماندرا شـــار ڕازاوە. وەزیر عەینزار ماڵاوایی لە بێهرەوانشـــا کرد. بووکیان لە کەژاوەیەکی جوان و ڕازاوە بە زێڕ و خشـڵدا دانا. سـواریان تەرخان کردن لە لای ڕاسـت و چەپەوە لەگەڵی بڕۆن. بەو شـێوەیە وەزیر و هاوڕێکانی بە بووکەوە بەرە و شاری خۆیان کەوتنە ڕێ.

کاتێک هەواڵی گەڕانەوەیان برد بۆ تیقمووسپادشـــا و زانی بە بووکەوە گەڕانەوە، خۆشحاڵ بوو فەرمانی دا شار برازێننەوە و ئاهەنگی پێشوازی و خۆشی ساز کەن. کچی بێهرەوانشایان هێنا ناو شارەوە. خەڵکی شار تێکڕا خۆشحاڵ و شادمان بوون. بەو جۆرە تیقمووسپادشـا لەگەڵ کچی بێهرەوانشـا زەماوەندی کرد و جووت بوون. هەر لە شـەوی یەکەمدا کچی بێهرەوانشا دووگیان بوو. کە ماوەی دووگیانییەکەی تەواو بوو، ڕۆژی خۆی هات کوڕێکی کاکۆڵ زێڕینی بوو. مزگێنیان برد بۆ تیقمووسپادشـــا. تیقمووسپادشـــا خۆشحاڵ بوو، مزگێنیانە زێڕ و زیوی دا بە خەڵک. لەڕێوە زانایان و ئەستێرەناسانی بانگ کرد و پێی گوتن: «چاوێک لە چارەی ئەو کوڕە بکەن پێم بڵێن دوارۆژی ئەو کوڕە چۆن دەبێ و بە کوێ دەگا.» ئەوان چاویان لە چارەی کرد و عەرزی پادشـــایان کرد. کە دوارۆژێکی ڕوون و پڕ لە بەختەوەری و سەرکەوتنی دەبێ. لە سەرەتای گەنجێتیدا تووشی کەندوکۆســـپێکی زۆر دەبێ و ئازار دەبینێ. بەڵام لە دوایەدا دەبێ بە پاشـــایەک لە بابی باشتر و بەختەوەر دەبێ و بە سەر نەیارانیدا زاڵ دەبێ.

پاشا کە ئەو قسانەی بیست خۆشحاڵ بوو ناوی کوڕەی نا جانشاه بە دایەنی سپارد. تا پێنج ســاڵان بە باشــترین شــێوە پەروەردەیان کرد. دوای ئەوە خســتیانە بەر خوێندن. تەوراتیان پێ گوت. دوای ئەوە فێری ئەسپسواری و شەڕیان کرد. سوارچاکێکی چالاک و بە ناوبانگ بوو هەموو ڕۆژێ لە ڕاو بوو. پاشـا تەواو دڵی لێی حەسـابووەوە لێی پشـت ئەستوور بوو. ڕێکەوت وا بوو ڕۆژێک تیقمووسپادشا دەنگی سوارەکانی دا بڕۆن بۆ ڕاو و بۆخۆشـی لەگەڵ جانشـاه سـوار بوو. ڕۆیشـتە دەشـت و دەر بۆ ڕاو. هەرکە گەیشـتنە

ڕاوگە ئاسـكێكی جوان لە بەر دەمیان دەرپەڕی و بە لای شـازادە جانشـادا تیزماڵی دا. جانشـا كەوتە شـوێنی و حەوت كەس لە پیاوەكانی تیقمووسپادشـایش وە دوای جانشـا كەوتن.

تیژ غاریان دەدا هەتا گەیشتنە قەراخ دەریا. هەموویان تێی ئاڵان ئاسكەكە بگرن. مامزە لە ترسی گیانی، خۆی هاویشتە ناو دەریاوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆكی ئەمشـەویش كۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆكەكەی هەڵگرت بۆ شەوێكی دیكە.

## كە شەوی چوارسەد و نەوەد و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــكۆ! مامزە كە خۆی هاویشـــتە دەریاوە. گەمییەک لەوێ بوو، خۆیان گەیاندە گەمییە و گەیشـــتنە ســـەری و مامزەیان گرت. لەو جەنگەیەدا جانشـــا چاوی بە دوورگەیەک كەوت. بە پیاوەكانی گوت: پێم خۆشـــە بچینە ئەو دوورگەیە. پیاوەكانی پاشـــا گوتیان دەی باشـە با بڕۆین. هەموویان سـواری گەمییە بوون و چوون بۆ دوورگەكە. لەوێ دابەزین تێر گەڕان. دوای ئەوە هاتنەوە ناو گەمییەكە و ســـەوڵیان لێ دا و گەمییەیان لێ خوڕی بەڵام نەیان دەزانی دەچن بۆ كام لا هەر ئاوا دەڕۆیشـــتن و مامزەشـــیان پێ بوو. هەتا بوو بە شـــەو هەر ئاوا خولانەوە. لەو جەنگەیەدا بایەک هات و لۆتكەی ڕادا بەرەو ناوەڕاستی دەریا. ئەو شەوە لە دەریادا ڕۆژیان كردەوە. كە ڕووناكی كرد. تەماشایان كرد لە هیچ لاوە ویشكایی دیار نییە و نازانن بەرەو كوێ بچن و سەریان لێ شێوا.

تیقمووسپادشـایش، كە زانی كوڕەكەی هەر نەگەڕاوە و دیار نییە. سـوارەكانی دەسـتە دەسـتە كرد و هەر دەسـتەیەی ناردی بۆ لایەک بە دوایدا. وا بوو بوون بە چوار دەسـتە و تاقمێكیان بەرەو دەریا ڕۆیشتن. لە قەراخ دەریا تەماشایان كرد ئەوە ئەو پیاوەی كە جانشا لە لای ئەسپەكان دایابوو هەر لەوێیە.

پرسیاری جانشا و ئەو شەش كەسەی دیكەیان لێ كرد. ئەویش بۆی گێڕانەوە كە چۆن ئاخری ئاســـكەكەیان گرت و پاشـــان گوتیان دەچینە ئەو دوورگەیە و ئیدی نەهاتنە. ئینجا كابرا و ئەسـپەكانیان هێنا و هاتنەوە لای پادشـا و شـتەكەیان بۆ گێڕاوە. پادشـا كە ئەوەی بیست دەستی كرد بە گریان و تاجی لە سەر داكەند و فڕێی دا. ئاخی پەشیمانی هەڵكێشا. خێرا نامەی بۆ هەموو دوورگەكان نارد. كەشتیان هێنا و هەر كەشتییەی سەد كەس لە پیاوە چالاک و ئازاكانی ســـوار كرد و ناردی لە دەریادا بە پێوشـــوێنی كوڕەكەیدا بگەڕێن. بۆ خۆشی لەگەڵ پاشماوەی لەشكرەكەی گەڕاوە بۆ ناو شار و داخێكی گرانیشی لە سەر دڵ بوو. كە دایكی جانشـا ئەو هەواڵەی بیسـت بە چەپۆک لە سـەر و سـەكوتی خۆی بەربوو. لەو ڕۆژەوە ئیدی هەر چۆكی خەمی لە ئامێز دەگرت و دەپاڕاوە و دەلالاوە.

ڕاسـپاردەكانی پادشـاش هەتا دە ڕۆژان لە دەریادا گەڕان. كە نەیاندیتەوە گەڕانەوە بۆ لای پادشا.

جانشـا و هاوڕێكانیشـی كە لە دەریادا سـەرگەردان بوون بایەكی توند هات و ڕایدان تا بردنییە دوورگەیەک. لەڕێوە جانشـا و شـەش هاوڕێكەی دابەزین و چوونە ناو دوورگەكەوە. لەوێدا زۆر گەڕان وا بوو لە دوورگەكەدا تووشی كانییاوێک بوون. كابرایەكیان دیت لە سەر كانییەكە دانیشـتبوو چوونە پێشـێ و سـڵاویان لێ كرد. كابرا وەڵامی سـڵاوەكەی دانەوە

بەلام بە زمانێک قســەی دەکرد دەتگوت چریکەی مەل و باڵندەیە. هەر بەو زمانە دەســتی کرد بە قسەکردن. جانشا سەری سوورِ مابوو. ئیدی کابرا چاوێکی لە ڕاست و چەپ کرد و بوو بە دوو لەتەوە. نیوەی چوو بۆ لایەک و نیوەکەی دیکەی چوو بۆ لایەکی دی. ئەوەندەی پێ نەچوو کە کۆمەڵە پیاوێک لە کێوەکانەوە هاتنە خوارێ بۆ ســـەر ئەو کانییە. ئەوانیش هەرکامیان بوون بە دوو کوتەوە و هاتن جانشــا و هاوڕێکانی بخۆن. جانشــا کە زانی خەریکن بیخۆن ڕایکرد و هـاوڕێکـانیشـــی بە دوایدا هەلاتن. ئەو خەڵکەی کە دوو قاشیش ببوون کەوتنە شوێنیان. سێ کەس لە کۆیلەکانی جانشایان گرت و خواردیان. سێ کەســەکەی دیکەش لەگەڵ جانشــا خۆیان گەیاندە گەمییەکە و لە دەریایان دا. شــەو و ڕۆژ بەردەوام دەڕۆیشتن بەلام نەیاندەزانی گەمییەکە بەرەو کوێیان دەبا. هەتا وا بوو برسییەتی برســتی لێ بڕیبوون. مامزەکە کە لە گەمییەکەدا بەسـترابووەوە ناچار ئەویان کوشــتەوە و گۆشــتەکەیان خوارد. هەر ڕۆیشــتن هەتا گەیشــتنە دوورگەیەکی دیکە. تەماشــایان کرد ئەو دوورگەیە پڕە لە دار و چۆم و باغات. دوورگەیەک کە لە خۆشـــی و جوانیدا لە بەهەشـــتی دەکرد. جانشـا ئەو دوورگەیەی کەوتە بەر دڵی. هەر بۆیە ڕووی لە هاوڕێکانی کرد و گوتی: «کـامەتـان دەتوانن هەتـا ئەو دوورگەیە بچن و هەواڵێکی ئەوێم بۆ بێننەوە؟» یەکێـک لە کۆیلەکان گوتی: «ئەمن دەچم.» جانشــا گوتی: «ئێوە هەر ســێکتان بچن و چاو و گوێیەک ئـاو بدەن و وەرنەوە و خەبەرەکەم بۆ بێننەوە. ئەمن لێرە لە گەمییەکەدا چـاوەڕێی ئێوە دەبم تا دێنەوە.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی چوارسەد و نەوەد نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کۆیلەکانی جانشا چوونە ناو دورگەکەوە و هەر چوار دەوری گەڕان. کەسـیان نەدی. ئینجا چوونە ناو جەرگەی دورگەکەوە. کە چوون سـەیریان کرد ئەوە قەلایەک لە نێوەڕاسـتی ئەو دورگەیە دایە. دیوارەکانی دەرەوەی قەلا لە بەردەی ڕوخامی سـپی بوو، ماڵەکانی لە بلوور و لە نێوەڕاسـتی ئەو قەلایە باخێکی لێ بوو کە زمانی زمانزانان لە پەسـنیدا کول بوو. دارەکانی ئەو باخە میوەیەکی زۆریان پێوە بوو. گۆلاوێکی گەورەی تێدا بوو. لە پەنا ئەو گۆلاوە هەیوانێکی لێ بوو کە لە هەیوانەکەدا کورسـیگەلێکی زۆری تێدا داندرابوو. لە نێوەڕاستی کورسیەکاندا تەختێکی لێ بوو لە زێڕی سوور کە بە گەوهەری جۆراوجۆر ڕازابووەوە. کۆیلەکانی جانشـا کە ئەو باخ و باخاتەیان لە نێو قەلاکەدا دیت چوونە ژووریَ و تەواوی وڵات گەڕان. لێرەش کەسـیان نەدیت. ئەوجار لە قەلاکە هاتنە دەریَ و گەڕانەوە بۆ لای جانشا و چیان دیتبوو هەموویان بۆ گێڕاوە.

جانشا کە ئەو قسانەی بیست لە خۆشی دیتنی قەلاکە لە گەمییەکە هاتە دەریَ و لەگەڵ کۆیلەکانی چوو بۆ قەلاکە. جانشـا بە دیتنی ئەو هەموو جوانییەی قەلاکە واقی وڕ ما. لە باخەکانی قەلادا هەتا شـەو لەگەڵ هاوڕێکانی گەڕا و میوەیان خوارد. شـەو چوون بۆ لای کورسییەکان. جانشا چووە سـەر ئەو تەختەی لە نێوەڕاستی کورسییەکان بوو. لە سـەر کورسـییەکە دانیشـت. تەختەکەی بابی بیر کەوتەوە و دەسـتی کرد بە گریان. ئەو سـێ کۆیلەیەش لەگەڵ ئەو دەسـتیان کرد بە گریان. لەو جەنگەیەدا دەنگێکی بە سـام لە لای دەریـاوە هـات. ئەوان ئـاوڕیـان داوە بۆ لای دەنگەکە. کەچی دیتیـان ئەو مەیموو وەک خێزوخۆڵ بە وڵاتی بەر بوون. وادیار بوو ئەو کۆشـک و قەلایە ئی مەیموونەکان بوو کە شـەوانە دەهاتنەوە ئەویَ. ئەو شـەوە کاتێک ویسـتان دابەزنە سـەر دورگەکە گەمییەکەی جانشـا و ئەوانیان لەویَ دیت هەر بۆیە تێکیان شـکاند و هاتن بۆ لای جانشـا و کۆیلەکانی. جانشـا و کۆیلەکانی خەریک بوون لە ترسـان گیانیان دەرچیَ. کەچی کاتێک هاتنە پێشیَ و جانشـایان دیت لە سـەر تەختەکە دانیشـتبوو تاقمێکیان چوونە پێشـیَ و کڕنۆش و سـووژدەیان بۆ برد و ئەرزەکەیان ماچ کرد و هەسـتان دەسـتەونەزەر ڕاوەسـتان. دوای ئەوە تاقمێکی دیکە هاتن، چەند ئاسـکیان لەگەڵ خۆیان هێنا و هەر لەویَ سـەریان بڕین و کەوڵیان کردن. گۆشتەکەیان برژاند. سفرەیان ڕاخست و دەفری زێڕین و زیوینیان لە سەر دانا. ئاماژەی بۆ جانشا و هاوڕێکانی کرد دانیشن بخۆن. جانشا لە تەختەکەی هاتە خواریَ و دەسـتیان کرد بە خواردن. تاقمێک لە مەیموونەکانیش لەگەڵ ئەوان دانیشـتن و دەسـتیان کرد بە خواردن هەتا تێریان خوارد. دوای ئەوە مەیموونەکان خوانی خواردنیان لابرد و مەجۆعمە میوەیان ڕیز کرد. کەمێکیان لەویش خوارد. دوای ئەوە جانشـا بە ئاماژە بە

مەیموونەکانی گوت: «ئێوە چکارێک دەکەن و ئێرەتان بۆچییە؟» وەڵامیان داوە ئێرە قەڵای حەزرەتی سولەیمان داودە و لە ساڵدا جارێک دێتە ئێرە بۆ گەڕان و سەیران، پاشان دەڕوا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنج‌سەددەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! دوای ئەوە مەیموونەکان بە جانشایان گوت: «پادشا تازە تۆ پادشای ئێمەی و ئێمە خزمەتکاری تۆ دەبین. بخۆ و بخۆوە و دانیشە تۆ چۆن بڵێی ئێمە وا دەکەین. ئەوجار مەیموونەکان هەستان کڕنۆشیان برد و هەرکەسەی وە دوای کاری خۆی کەوت. جانشا لە سەر تەختەکەی خەوت و کۆیلەکانیشی هەر یەکەی لە دەور تەختەکە لە سەر ئەرزی خەوتن.

کە ڕۆژ بووەوە وەزیر و گەورەگەورەی مەیموونەکان هاتنە لا جانشا و لەشکرەکەشیان یەک‌یەک و دوو دوو هەموو کۆبوونەوە تا وڵات پڕ بوو. هەموو لە بەر دەمی جانشا ڕیز بوون. ئەوجار وەزیرەکان هاتنە پێشێ و بە جانشایان گوت کە دەبێ پاشایەتی و گەورەیەییمان بکەی. دوای ئەوە چەند کەسیان دیاری کرد لە خزمەت پاشا بمێننە بۆ کاری خزمەتگوزاری. ئەوەندەی پێ نەچوو تاقمێک مەیموون هاتن گەماڵیان پێ بوو بە قەد ئەسپێک زەلام. هەر گەماڵەی زنجیرێکیان لە ملی کردبوو. جانشا زەندەقی چوو لە ترسی ئەو گەماڵانە.

وەزیرەکان بە ئاماژە پاشایان تێگەیاند کە سواری یەکێک لەو سەگانە بێ و لەگەڵ مەیموونەکان بڕوا. لەڕێوە جانشا لەگەڵ سێ پیاوەکەی سوار بوون و پێ بە پێی مەیموونەکان ڕۆیشتن. لەشکری مەیموونەکانیش سوار بوون وەک مار و مێروو وڵاتیان داگرت و ڕۆیشتن. هێندێک بە سواری و هێندێک بە پێیان. جانشا نوقمی بیر و خەیاڵات ببوو نەیدەزانی چ دەبێ. هەتا وا بوو گەیشتنە قەراخ دەریا. جانشا سەیری کرد ئەوە گەمییەکەیان تێک شکاندووە و لەت و کوتیان کردووە. ڕووی لە وەزیرە مەیموونەکە کرد و گوتی: «ئەو گەمییەتان بۆ ئاوا لێ کردووە؟» گوتیان: کە پادشا کاتێک تۆ هاتیتە ناو ئەو دوورگەیە زانیمان تۆ پادشای، هەر بۆیە لەوە دەترساین کە هاوڕێکانت سوار کەی و هەڵێی و بە جێمان بهێڵن. هەر بۆیە گەمییەکەمان شکاند. جانشا کە ئەو قسەیەی بیست ڕووی لە کۆیلەکانی کرد و گوتی: «تازە لێرە ڕزگارمان نابێ و هیچمان پێ ناکرێ و هەر بۆیە دەبێ ڕازی بین بە ڕەزای خودا.»

دوای ئەوە لەگەڵ لەشکری مەیموونان وەڕێکەوتن. تووشی چۆمێک بوون، لە پەنا چۆمەکە کێوێکی لێ بوو. جانشا چاوی لە سەر کێوەکە کرد. تەماشای کرد پڕ لە دێوی گەورە گەورە. مەیموونەکان گوتیان: «ئەوانە دوژمنانی ئێمەن و ئێمە بۆ شەڕ لەگەڵ ئەوانە هاتووینە ئێرە.» جانشا لەو دێوانە ترسا. سەری هێندێک لەو دێوانە وەک سەری مانگا دەچوو سەری هێندێکی دیکەیان وەک ئی وشتر. کاتێک دێوەکان لەشکری مەیموونەکانیان

دیت بۆیان هاتن و هەر لە دوورەوە و لەوبەری چۆمەکەوە بەردی بە قەرا کۆڵەکەیەکیان لە مەیموونەکان هەڵدەکرد. شەڕێکی قورس لە نێوانیادا دەستی پێ کرد. جانشا کە زانی خەریکە دێوەکان بە سەر مەیموونەکاندا زاڵ دەبن. فەرمانی بە کۆیلەکانی دا کە تێر و کەوانەکانیان دەر بێنن و پێشی هێرشی ئەو دێوانە بگرن. پیاوەکانی جانشا تیر و کەوانیان دەر هێنا و دێوەکانیان وەبەر تیر دا. لەشکری دێوەکان زۆر پیس تێک شکا. ئەوەی کوژرا، کوژرا دەنا ڕایان کرد و هەڵاتن. مەیموونەکان لە چۆمەکەیان دا و کەوتنە سەریان. جانشا و پیاوەکانیشی لە چۆمەکەیان دا و پەڕینەوە و کەوتنە سەر دێوەکان. بەو جۆرە وایان ڕاو نان تا تەواو لە چاو ون بوون و ئاودیوی کێوێکی دیکەشیان کردن و بۆ خۆیان چوونە سەر کێوەکە. لە سەر کێوەکە جانشا قەتعەیەکی دیتەوە لە بەردی مەرمەڕ بوو. کە لە سەری نووسرابوو: ئەی ئەو کەسەی کە هاتوویتە ئێرە ئەوەندە بزانە تۆ دەبی بە پاشای مەیموونەکان و تازە ڕزگارت نابێ. مەگین لە دوو لاوە، لای ڕۆژهەڵاتی ئەو کێوەوە کە ئەویش ڕێگایەکی دوورە و سێ مانگەڕێیە و پڕە لە کێوی دڕندە و دێو و درنج و شتی وا. کە لەوانە ڕەد بووی دەگەیە دەریایەک کە دەوری دونیای داوە.

بەڵام ئەگەر لە لای ڕۆژئاواوە بڕۆی ڕێگای چوار مانگە و دەشتێکە تا چاو هەتەر دەکا ڕەڵمە. دوای ئەوە دەگەیە کێوێک. ئەو کێوە ئاگرئاسا دەگرێ.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! جانشا که ئەو نووسراوەیەی دیت و خوێندییەوە. له کۆتایی نووسراوەکەدا ئەوەشی دیت که نووسرابوو دوای ئەوە تووشی ڕووبارێکی گەورە دەبی که زۆر تیژ تێ دەپەڕێ و ڕۆژانی شەممە ئاوەکەی ویشک دەبێ. له نیزیک ئەو ڕووبارەوە شارێکی لێیه که خەڵکەکەی جوولەکەن. ئیدی لەو ناوچەیە جگه لەو شارە شاری دیکەی لێ نییە. هەتا تۆ له لای ئەو مەیموونان بی مەیموونەکان به سەر دێوەکاندا زاڵ دەبن و دەرەقەتیان دێن. بۆ ئاگاداریت ئەو قەتعەیە سولەیمان کوڕی داوود نووسیویە.» که جانشا قەتعەکەی خوێندەوە دەستی کرد به گریان. زۆر چاک گریا و پاشا بابەتەکەی بۆ کۆیلەکانیشی باس کرد. دوای ئەوە لەگەڵ لەشکری مەیموونەکان به دڵێکی خۆشەوە گەڕانەوە و هاتنەوە کۆشک. جانشان ماوەی ساڵ و نیوێک پادشای مەیموونان بوو.

دوای ساڵ و نیوێک جانشا به مەیموونەکانی گوت سوار بن دەچین بۆ ڕاو. بۆخۆشی لەگەڵ کۆیلەکانی سوار بوون. هەر لەو ناوچەیە بۆ ئەو ناوچەیە و مەڵبەندە بۆ ئەو مەڵبەندە ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە دەشتە ڕەڵمەکە. جانشا که ئەو دەشتەی دیت ناسییەوە. چونکه ئەو نیونیشانەکەی له نووسراوەی سەر قەتعە بەردەکەدا دیتبوو. فەرمانی دا لەشکر ڕاوەستن و لادەن و بار بخەن. لەشکر لای دا و باریان خست. هەتا ده ڕۆژان خەریکی خواردن و خواردنەوە و حەسانەوە بوون. جانشا کۆیلەکانی بانگ کرد و پێی گوتن: «دەمەوێ لەو دەشتی ڕەڵمە ڕەد بین و بچین بۆ شاری جوولەکان. بەشکوو خودای تەعالا له دەست ئەو مەیموونانە ڕزگارمان بکا. کۆیلەکان گوتیان فەرمان فەرمانی تۆیە. ئیدی ڕاوەستان هەتا بوو به شەو. کاتێک تەواو تاریک بوو جانشا لەگەڵ کۆیلەکانی هەستان چەک و کەلوپەل و تیر و کەوانیان دەست دایه و به ئارامی له لەشکر هاتنە دەرێ و ڕۆیشتن هەتا بەیانی هەر ڕۆیشتن.

بەیانی که مەیموونەکان له خەو هەستان سەیریان کرد ئەوە جانشا و سێ کۆیلەکەی لەوێ نەماون. زانیان ئاوان هەڵاتوون. ئیدی تاقمێک له مەیموونەکان سوار بوون به ڕێگای ڕۆژهەلاتدا ڕۆیشتن. تاقمێکی دیکه سوار بوون بەرە و دەشتی ڕەمڵ ڕۆیشتن. ئەوەندە نەڕۆیشتبوون که له دوور دیتیان جانشا و کۆیلەکانی گەیشتوونە لێواری دەشتی ڕەمڵ. مەیموونەکان هەر که ئاوایان دیت تیژ کەوتنە سەریان و بۆیان چوون. جانشا ئاگای لێ بوو که مەیموونەکان هاتن. لەگەڵ کۆیلەکانی هەڵاتنە ناو دەشتی ڕەمڵەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو که مەیموونەکان لێیان نیزیک بوونە و هێرشیان کردە سەریان. ویستیان جانشا و کۆیلەکانی بکووژن. له پڕدا مێروولە له ژێر ئەرزی هاتنە دەرێ و وەک کوللە به وڵاتی بەر

بوون. ئەو مێرووولانە بۆ گەورەیی بە قەد ســـەگێک دەبوون. ئیدی مێرووولەکان هێرشـــیان کردە ســـەر مەیموونەکان و هێندێکیان لێ خواردن بۆخۆشـــیان تاقمێکیان لێ کوژرا. بەڵام مێرووولەکان مەیموونەکانیان بەزاند و ڕاویان نان. هەرکە مێرووولەیەک هێرشـــی دەکردە ســـەر مەیموونێک دوو قاشـــی دەرکرد. بەو جۆرە شـــەڕێکی قورس لە نێوان ئەو دوو گیانلەبەرە هاتە ئاراوە و هەتا بوو بە شـەو ئەو شـەڕ و کوشـتار بەردەوام بوو. کە بوو بە شەو جانشا و کۆیلەکانی کەڵکیان لە تاریکی وەر گرت و بە دەشتەکەدا ڕۆیشتن.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی پێنجسەد و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کە بوو بە شەو جانشا و کۆیلەکانی کەڵکیان لە تاریکی وەرگرت و بە دەشتەکەدا هەڵاتن و هەتا بوولێڵەی بەیانی لەبەر ماندوویان لە پێ کەوتن. کە هەوا ڕووناک بوو مەیموونەکان زانیان جانشا و وان بە کوێدا هەڵاتوون کەوتنە سەریان و دیتیاننەوە هێرشیان کردنە سەریان. جانشا بە کۆیلەکانی گوت بە شیر بیانکووژن. کۆیلەکان بە شیر تێیان کەوتن. بە ڕاست و چەپدا دەیان وەشاند و لێیان دەکوشتن. زۆریان لێ کوژرا لەو نێوەدا مەیموونێکی زەلام و زەبەلاح هاتە بەرەوە کە ددانەکانی دەتگوت ددانی فیلن و کشانەوەی نەبوو، یەکێک لە کۆیلەکانی گرت و دوو لەتی کرد. جانشا کە ئەوەی دی لەولاوە زۆر بە توندی هەڵات. جێگاکەی سەربەرەوخوار بوو. لە خوارەوە چۆمێکی بەرینی لێ بوو. کە زانی ناتوانێ بەرەنگاریان بێتەوە و لە دەستیان نەجاتی نابێ. تیژ تێی تەقاند هەتا گەیشتە چۆمەکە و خۆی تێ هاویشت. یەکێک لە کۆیلەکانیش مابوو ئەویش کە بە دوای جانشا دا ڕای کردبوو، ئەویش خۆی لە ئاوەکە هاویشت. هەرکیان بە مەلە تا نێوەڕاستی ئاوەکە ڕۆیشتن. لەو بەری چۆمەکە دارێکی لێ بوو، جانشا هەر بە مەلە ڕۆیشت هەتا دەستی گەیشتە لقی دارەکە و خۆی نەجات دا و پەڕییەوە. بەڵام کۆیلەکە قەوەی بەئاوەکە نەشکا و ئاوەکە ڕایدا و لەگەڵ خۆی بردی.

جانشا بە تەنیا پەڕییەوە ئەوبەری چۆمەکە. خەریک بوو جلەکانی بەری دەگوشی بۆ ئەوەی هەڵیانخا ویشک ببنەوە. مەیموون و مێروولەکان لەوبەری شەڕێکی قورسیان بوو. ئاخری وا بوو. مەیموونەکان پاشەکشەیان کرد و گەڕانەوە و شەڕەکە کۆتایی هات.

جانشا لەو بەری چۆمەکە دانیشتبوو بۆ چارەڕەشی و مەینەتبەشی و لە دەست دانی هاوڕێکانی دەگریا. هەتا بوو بە شەو. جلەکانی کردەوە بەری و بە ترس و خۆفێکی زۆرەوە چووە ئەشکەوتێکەوە. تا بەیانی لەوێدا خۆی مات دا. کە ڕۆژ بووەوە، هەستا کەوتە ڕێ و شەو و ڕۆژ بێ مەبەست هەر دەڕۆیشت و بنچکە گیان و گەڵا و شتی دەخوارد. هەتا گەیشتە ئەو کێوەی کە ئاوری لە هەناوی دائیسا دوای ئەوە هەر ڕۆیشت هەتا گەیشتە ئەو چۆمەی کە شەممانە ویشک دەبوو. گەیشتە ئەو چۆمە کە چۆمێکی یەکجار گەورە و بەرین بوو. لەو بەری چۆمەکەوە شارێکی گەورە دیار بوو. وا دیار بوو ئەو شارە شاری جوولەکان بوو. کە لە نووسراوەی سەر قەتعەکەدا باسی کرابوو. ئیدی لەوێ دانیشت هەتا ڕۆژی شەممە و ئاوەکە ویشک بوو. جانشا لە چۆمەکە پەڕییەوە و چووە شاری جوولەکان. کەس دیار نەبوو. لە نێو شاردا دەگەڕا هەتا دیتی دەرگایماڵێک کراوەتەوە. کردییەوە و چووە ژوورێ. سەیری کرد خاوەنماڵەکە مات دانیشتووە و هیچ ناڵێ. غەوارەم

و زۆر برسـیم. خاوەنماڵ بە ئاماژە گوتی دانیشـە بخۆ و بخۆوە و هیچیش مەڵێ. جانشـا دانیشت. خواردی و خواردییەوە و ئەو شەوە لە لای ئەو خەوت. کە ڕۆژ بووەوە خاوەنماڵ سڵاوی لێ کرد و لێی پرسـی: «لە کوێوە هاتووی و دەچی بۆ کوێ؟» جانشـا زۆر گریا و بەسـەرهـاتی خۆی بۆ جوولەکە گێڕاوە و پێی گوت کە خەڵکی کوێیە و کوڕی کێیە. جوولەکەکە پێی سەیر بوو گوتی: «ئێمە قەتمان نێوی شاری ئاوا نە بیستووە و نە دیتووە. تەنیا شارێک کە گەورەگەورەکانی ئێمە پێیان ناساندووین و باسیا کردووە شاری یەمەنە. جگە لەو شـارە نێوی شـاری دیکەمان نەبیسـتووە.» جانشـا گوتی: «شـاری ئێمە لە شـاری یەمەنەوە زۆر دوور نییە.» جووەکە گوتی کە بازرگانەکانی یەمەن دەڵێن لێرەوە تا یەمەن دوو سـاڵ و سـێ مانگیان پێ دەچێ. جانشـا گوتی: «کەی ئەو کاروانە دەگاتە ئێرە؟» جووەکە گوتی: «ساڵی داهاتوو کاروانەکە دێ.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی پێنجسەد و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! جانشـــا ناڕەحەت بوو دەســـتی کرد بە گریان، بیری دایک و بابی دەکرد و بیری لەو تاڵی و چەرمەســـەرییانە دەکردەوە کە تووشـــی ببوو. ئەوەندی دیکە ناڕەحەت بوو. جووەکە گوتی: «کوڕی باش ناڕەحەت مەبە و گریانی ناوێ لە لای ئێمە بە هەتا کاروانەکە دێ. ئەو دەم من دەتنێرمەوە بۆ شارەکەی باوکت. جانشا دوو مانگ لە لای جووەکە ماوە، هەموو ڕۆژێک لە ماڵێ دەهاتە دەرێ و بە گەڕەک و کۆڵانەکانی شـــاردا دەســـووڕاوە. ڕۆژێکی هەر وەک ڕۆژان لە ماڵێ هاتە دەرێ. گەڕەک بە گەڕەک ڕۆیشـــت. گوێی لە دەنگی جاڕچی بوو کە هەرای دەکرد و دەیگوت: «کێ حازرە هەزار دیناری زێڕ و کەنیزێ وەک مانگی دەمێ بەو مەرجەی لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ کارم لەگەڵ بکا؟» کەس وەڵامی نەدەداوە. جانشـــا لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەو ماســـتە بێ موو نییە وا لە بەیانییەوە هاوار دەکا کەس خۆی لێ نادا. دیارە دەبێ کارێکی مەترسیدار بێ و کابرا حازرە کەنیزێک و هەموو پارەیەی بۆ بدا.» ئیدی جانشـــا لە کابرا چووە پێشـــێ و پێی گوت کاکە من ئەو کارە دەکەم. جاڕچی چاوێکی لێ کرد و دەستی گرت و بردییەوە ماڵێ.

جانشـــا ســـەیری کرد ماڵێکی گەورەیە و بازرگانێکی جوولەکەش لەوێ لە ســـەر کورسییەکی ئاونووس دانیشتووە. جاڕچی چوو لە بەر دەمی کابرای بازرگان ڕاوەستا و پێی گوت: «ئەوە ســـێ مانگە من هاوار دەکەم کەس جوابم ناداتەوە. ئەو لاوە ئەوڕۆ هات گوتی من دەیکەم. بازرگان کە ئەو قسەیەی لە جاڕچی بیست. هەستا دەستێکی بە سەریدا هێنا و قۆڵی گرت و بردی بۆ شـــوێنێکی خاوێن و خۆش و فەرمانی دا خواردن بێنن. کۆیلەکان سفرەیان ڕاخست و خواردنی جۆراجۆریان هێنا دایان نا. بازرگان لەگەڵ جانشا خواردنەکەیان خوارد و دەستیان شوت. ئینجا بازرگانەکە هەستا هەنبانەیکی هێنا کە هەزار دیناری زێڕی تێدا بوو، ناردی کەنیزێکی زۆر جوان و خانومانیشـــیان هێنا. ئەوجار ڕووی لە جانشـــا کرد و گوتی: «ئەو دینارە زێڕانە وەرگرە، لەگەڵ ئەو کەنیزە و کارەکەم بۆ جێبەجێ بکە. جانشـــا کەنیز و ماڵەکەی وەرگرت و کەنیزەی لە پەنا خۆی دانا. بازرگانە هەستا بڕوا بە جانشای گوت: سبەینێ کارەکە جێبەجێ بکە. ئیدی جانشا ئەو ڕۆژە هەتا شەو شەویش هەتا بەیانییەکەی لەگەڵ ئەو کەنیزە خەریکی کەیف و خۆشی بوو. کە ڕۆژ بووەوە چوو بۆ گەرماو. بازرگان فەرمان دا کە جلوبەرگێکی بەشـــکۆ بۆ جانشـــا بەرن. خزمەتکارەکان کەوای دیبایان بۆ برد.

کە جانشا لە گەرماو هاتە دەرێ، کەواکەیان بە شانیدا دا و بردیانەوە ماڵێ. بازرگان بە کۆیلەکانی گوت چەنگ و عوود و مەی بێنن. بازرگان و جانشـــا هەتا نیوە شـــەو خەریکی

بەزم و خواردنەوە و خۆشـــی بوون. دوای ئەوە بازرگان چووە لای خێزانی و جانشـــاش چوو لەگەڵ کەنیزەکەی تێخزا. کە بوو بە ڕۆژ جانشا چوو بۆ گەرماو. کە لەگەرماو هاتەوە، بازرگان چووە لای و پێی گوت: «ئەوڕۆ دەمهەوێ کارەکەم بۆ جێبەجێ کەی.» جانشـــا گوتی: «بە سەر چاو.»

بازرگانەکە بە خزمەتکارەکانی گوت دوو یەستر بێنن. بازرگان سـواری یەسترێک بوو. جانشـــاش ســـواری ئەوی دیکەیان بوو. لە بەیانییەوە هەتا ئێوارە هەر ڕۆیشـــتن هەتا گەینشتنە کێوێکی بەرز. بازرگان لە یەسترەکە دابەزی و بە جانشاشی گوت دابەزێ. دوای ئەوە بازرگان خەنجەرێک و گوریسـێکی دا بە جانشـا و پێی گوت: «دەمهەوێ ئەو یەسـترە سەر بڕی.» جانشا لەڕێوە بە گوریسەکە دەست و پێی یەسترەی بەست و سەری بڕی و کەوڵیشـــی کرد. بازرگانە گوتی ئێســـتا نێو زگەکەی دەرێنە و هیچی تێدا مەهێڵە و بۆخۆت بچووە ناوییەوە. منیش دەیدرووومەوە. ئەتۆ ماوەیەک لەوێدا بمێنەوە و پاشـــان کە هاتییە دەرێ چیت دی بۆم بگێڕەوە. جانشـا بە لەز ناوزگی یەسـترەی دەرهێنا و بۆخۆی چوو لە زگی یەســـترەوە. بازرگان خێرا ورگەکەی درووەوە و لەوێ بەجێی هێشـــت و لێی دوور کەوتەوە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! بازرگانەکە لێی دوور کەوتەوە و چوو لە قەڵەشتەبەردێکی شاخەکەدا خۆی شـــاردەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو کە باڵندەیەکی گەورە هات ڕۆ بووە کەلاکە و هەڵیگرت و بردی، بردی بردی هەتا گەیشتە لوتکەی شـاخەکە کە زەردومایەکی ئەستەم بوو. داینا و ویســتی بیخوا. جانشــا هەســتی بە باڵندەکە کرد و بە خەنجەرەکە سـکی یەسـترەکەی دڕی و هاتە دەرێ. باڵندەکە کە جانشـای دیت هەڵفڕی و ڕۆیشـت. ئەوجار جانشـاه هەسـتا چاوێکی لە ڕاسـت و چەپی خۆی کرد. کەسـی نەدیت. جگە لە کەسـێکی مردوو کە لەوێ ویشـک ببوو. جانشـا کە ئەوەی دیت دەسـتی لە ژیان شـوت. ئەوجار چاوێکی لە خوارەوەی کێوەکە کرد. تەماشـــای کرد بازرگان بە نیگەرانییەوە دەیڕوانییە سـەرێ. بازرگان کە چاوی بە جانشا کەوت گوتی: «لەو بەردانەی لای خۆت بۆم بەردەوە با پێت بڵێم بە کام لادا بێیە خوارێ. جانشـا لەو بەردانە دووسـەد بەردی بۆ بەرداوە. ئەو بەردانە هەمووی یاقووتی سوور و سەوز و گەوهەری گرانبایی بوون. دوای ئەوە جانشا بە بازرگانی گوت بە کام لادا بێمە خوارێ. بازرگان وەڵامی نەداوە و بەردەکانی هەموو کۆ کردەوە و لە یەسترەکەی خۆی نا و لێیدا ڕۆیشت. جانشا لە سەر ئەو کێوە بە تەنیا ماوە و دەستی کرد بە گریان و پاڕانەوە. هەتا سێ ڕۆژان ئەوە حاڵی بوو.

دوای سێ ڕۆژەکە هەستا بەسەر کێوەکەدا باسکە و باسک ڕۆیشت. هەتا دوو مانگان هەر ڕۆیشت و گریا و بنچکە گیا و داری خوارد تا گەیشتە دەشتاییەکان کە لەوێ دارێکی زۆری لێ بوو. جانشـا بە دیتنی ئەو ئاوەدانی و باخ و دەشـتە خۆشـحاڵ بوو. ڕووی لەوێ کرد کە گەیشـتێ سـەیری کرد، کۆشـکێکی لێیە. لێی چووە پێشـێ. بە دەوریدا گەڕا و سـووڕاوە هەتا دەرگایەکی دیتەوە. لەوێ کابرایەکی پیر دانیشـتبوو. گوچانێکی یاقووتی بە دەستەوە بوو. ڕووخسارێکی گەش و نووورانی. لەوێ ڕاوەستابوو. جانشـا چوو بۆ لای و سڵاوی کرد. کابرا سڵاوەکەی ئەستاندەوە و فەرمووی کرد دانیشێ. جانشا لە بەر دەرگای کۆشک دانیشت. ئەوجار کابرا لە جانشای پرسـی ئەوە لە کوێوە و چۆناچۆن هاتوویە ئەو وڵاتە. بە تەمای بچی بۆ کوێ، قەت هیچ مرۆڤێک ڕێی نەکەوتووەتە ئێرە. جانشـــا کە ئەو قســـەیەی لە کابرا بیســـت، هێندەی کوێری دیتبوو دەســـتی کرد بە گریان. هێندە گریا هەناسەی دەر نەدەهات. کابرا گوتی: «ڕۆڵە گیان، مەگری، منیشت ناڕەحەت کرد.» هەستا چوو خواردەمەنی بۆ هێنا و شوکری خودای کرد. دوای ئەوە پێی گوت: «ڕۆڵە گیان، دا پێم بڵێ چیت بە سـەر هاتووە کێی و لە کوێوە هاتووی.» جانشـا تەواوی بە سـەر هاتەکەی خۆی بۆ گێڕاوە. کابرا بە بیستی ئەو چیرۆکە ویشک بوو. نەیدەزانی بڵێ چی. ئیدی جانشا بە کابرای گوت: «ئەتۆش پێم بڵێ ئێرە کوێیە و ئی کێیە؟» کابرا گوتی: «ڕۆڵە گیان: ئەو

کۆشکە و ئەو وڵاتە ئی سولەیمان کوڕی داودە (س ـــ خ). نێوی من شێخ نەسرە و پاشای باڵندەکانم. حەزرەتی سولەیمان منی لێر داناوە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی پێنجسەد و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! کابرا گوتی: حەزرەتی ســـولەیمان منی لێر داناوە و زمانی مەل و پەلەوەری فێری من کردووە و کردوومی بە پاشـــای ئەوان. هەموو ســـاڵێک باڵندەکان دێنە ئێرە من زیارەت دەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ شـــوێنەکەی خۆیان.» جانشـــا بەو قســـەی شـــێخ نەسر دەستی کرد بە گریان و گوتی: «بابە من چۆن بچمەوە بۆ شارەکەی خۆمان.» شێخ نەســـــر گوتی: «ڕۆڵە تۆ لای کێوی قـافی و تۆ نـاتوانی بچییەوە ولاتی خۆتـان. مەگین ڕاوەســـتی هەتا مەل و باڵندەکان دێن، ئەودەم تۆ بە یەکێک لەوان بســـپێرم. هەتا بتبەنەوە شـــــارەکەی باوکت. تازە تۆ لە لای من بمێنەوە، لەو کۆشـــــکەدا بۆخۆت بخۆ و بخەوە و سەیران بکە تا مەل و باڵندەکان کۆ دەبنەوە.

جانشـا لە لای شـێخ نەسـر ماوە و دایمە خەریکی گەشـت و سـەیرانی نێو کۆشـک و باخەکان بوو، تەواو بووژابووەوە کە باڵندەکان هاتنە زیارەتی شـێخ نەسـر. شـێخ نەسـر جانشـــای بانگ کرد و دەســـتەیەک کلیلی دایە و پێی گوت: «ئەوە کلیلی دیوەکانی کۆشـــکە، بچووە دەرگاکانیان هەڵگرە و چاویان لێ بکە جگە لە فڵانە دیو. نەچی بێ قســـەیم بکەی و دەرگای ئەو دیوە بکەیەوە دەنا تازە ڕووی خۆشی و شادی نابینییەوە.

شـێخ نەسـر ئەو قسـانەی بۆ جانشـا کرد و ئەوی تەواو لە مەترسـی ئەو دیوە ئاگادار کردەوە و بۆخۆی چوو بۆ دیداری باڵندەکان.

جانشـــا هەســـتا چوو بۆ کۆشـــک و دەســـتی کرد بە گەڕان بە هەموو لایەکی کۆشـــکدا. تەواوی دیوەکانیش گەڕا هەتا گەیشـــتە ئەو دیوەی کە شـــێخ نەســـر گوتبووی کە خۆی لێ نەدا. چاوێکی لە دەرگای ئەو دیوە کرد زۆر خۆشـــی هاتە بەرچاو. قفڵێکی زێڕی پێوە بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی بە ڕواڵەت ئەو دیوە لە هەموو دیوەکانی کۆشک خۆشترە جا ئی چییە وا شـــێخ منی لەو دیوە تۆقاندووە نازانم. بەڵام هەرچی بێ لەگەڵ چارەنووس هیچ ناکرێ، ئەوەی بە ســـەرم بێ دێ. دەیکەمەوە. ئیدی دەســـتی کێشـــا و قفڵەکەی کردەوە و وەژوور کەوت. ســـەیری کرد گۆلێکی گەورەی تێدایە و لە پەنا گۆلەکە کۆشـکێکی لێیە. ئەو کۆشـکە لە زێڕ و زێو و بلوور چێ کرابوو. تەواوی دیمەنەکانیش لە یاقووتی سوور و ســـەوز بوو. ئەرزەکەشی لە جێی بەردی مەڕمەڕ و ڕوخام، یاقووتی سەوز و گەوهەری تێ گیرابوو. لە نێوەڕاســـتی ئەو کۆشـــەکە حەوزێکی زێڕینی پڕ لە ئاو. لە پەنا ئەو حەوزە ئاژەڵی کێوی و مەل و پەلەوەری لە زێڕ و زێو چێ کراوی لێ بوو کە ئاویان لە زاری دەهاتە دەرێ. هەر کـاتێک بـاشـــــی دەهـات هەر کـام لەوانە دەنگی خۆی لێ دەهـات. لە نیزیک ئەو حەوزە هەیوانێکی گەورەی لێ بوو کە لە نێو ئەو هەیوانەدا تەختێکی یـاقووتی دانـدرا بوو کە بە

دوڕ و جەواهێرات ڕازابووەوە. ئەو تەختە خێوەتێکی لە ســــەر هەڵدرابوو. خێوەتەکە لە قوماشـــی دیبای ســـەوز بوو کە بە تاڵی زێڕ و زێو و نەقیمی گرانبایی قەراخەکانی نەخشـــێنرابوو. گەورەیی و بەربڵاوی ئەو خێوەتە پەنجا گەز بوو. لە نێو ئەو خێوەتەدا هۆبەیەکی تایبەتی تێدا بوو کە شـــتەکانی حەزرەتی ســـولەیمانی تێدا بوو. جانشـــا باخێکی دیکەی دیـت لەولای هەیوانەکەوە کە خـاوەنی داری میوەی جۆراوجۆر و جۆگەلە و ڕووباری بە نێودا دەخوشـی. لە دەوری کۆشـکەکە گوڵەباخ و شـیلان و ڕیحانە و هەموو جۆرە گوڵێکی دیکەیان لێ دابوو. جانشـــا ســـەری لەو هەموو خۆشـــییەی نێو ئەو باخ و کۆشکە سووڕ مابوو. زیاتر چووە نێو کۆشک و باخەوە و سەیری ئەو هەموو شتە سەیر و ســەمەرەیەی دەکرد. لەوێ دیتی خیزی قەراخ چۆم و دەریا هەمووی لە نەقیمی گرانبایی و گەوهەری شەوچرا بوون. لەو کۆشکەدا جگە لەوانە زۆر شتی دیکەشی دیت.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی پێنجسەد و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! جانشا لەو کۆشکەدا زۆر شتی دیت کە بە دیتنیان واقی وڕ ما. لە کۆشکەدا زۆر گەڕا، هەتا گەیشتە دیوێک کە تەختێکی تێدا بوو. چوو لە سەر تەختەکە ماوەیەکی زۆر خەوت. کاتێک وە خەبەر هات هەستا ڕۆیشت هەتا لە کۆشک چووە دەرێ. کورسییەک لە بەر دەرگای کۆشک بوو، ماوەیکیش لەوێ دانیشت و لە سەیری جوانی ئەو دیمەنانەدا نوقم ببوو. هەر ئاوا کە سەری داخستبوو لە فکری ئەوەدا بوو کە ئێرە کوێیە و ئی کێیە؟ لە پڕدا سێ کۆتر لە حەواوە هاتن و لە قەراخ گۆلەکە نیشتنەوە. ماوەیەک پێکەوە یاریان کرد و بە دەوری یەکدا هاتن. ئینجا پەڕەکانیان لە خۆیان کردەوە و ڕووت بوونەوە. بوون بە سێ کیژی مانگ ڕوخسار کە لە دونیادا نموونەیان نەبوو. دوای ئەوە چوونە ناو گۆلەکەوە و دەستیان کرد بە مەلە کردن. ماوەیەک خەریکی گەمە و یاری و پێکەنین بوون. جانشا کە ئەو کیژانەی دیت نوقمی جوانیان بوو. دوای ئەوەی تێریان مەلە کرد لە ئاوەکە هاتنە دەرێ و لە باخدا دەستیان کرد بە گەشت و سەیران. جانشا کە ئەو لەنجە و لار و سیمایەی دیت هۆشی لای خۆی نەما. کەوتە شوێنیان و خۆی گەیاندنێ، سڵاوی لێ کردن. ئەوانیش جوابی سڵاوەکەیان داوە. پاشان لێی پرسین گوتی: «خانمەکان ئێوە کێن و لە کوێوە هاتوون؟» هەرە چووکەکەیان وەڵامی داوە: ئێمە پەرین و بۆ گەڕان و سەیران هاتووینە ئێرە. جانشا پێی گوت: «بەزەییتان بە مندا بێت. ئەو کچە گوتی: «لەو قسانە گەڕێ و بڕۆ بە لای کاری خۆتەوە. جانشا کە ئەو قسەیەی بیست دەستی کرد بە گریان و ئەو بەیتانەی خوێندەوە:

دێی وەکوو خەونێ دەخزییە ژیانمەوە
چی چێژ و سۆزە دەڕێژییە گیانمەوە
بە لەنجە دەڕۆی و دەڵێی مەمبینە
شێت و شەیدا و هەڵوەدام بە دواتەوە
سووڕ ماوە سەرم، وڕ و کاس و گێژم
پەری یا فریشتە هات بە لامەوە

کاتێک کچەکان ئەو شێعرەی جانشایان بیست دەستیان کرد بە پێکەنین و گەمە و هەڵپەڕکێ و شادی. ئەوجار جانشا چوو کەشەفێکی میوە لە باخەکە ڕنی هێنای لە پێشی دانان. ئەوانش خواردیان و خواردیانەوە و ئەو شەوە لەوێ لەگەڵ جانشا خەوتن. کە ڕۆژ بووەوە کچەکان پەڕوباڵیان دەر کردەوە و بوونەوە بە کۆتر. جانشا کە دیتی ئەوان باڵ و

پەڕیان دەرکرد و لە بەر چاوی ئەو فڕین خەریک بوو گیانی شـیرینی لە لەشـی دەرفڕێ. هەر بۆیە یەک بە خۆی هاواری کرد و لە حاسـته خۆی بێهۆش کەوت، ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە هەر لەوێ کەوتبوو.

شـێخ نەسـر لە لای باڵندەکان گەڕابووە و لە جانشـا دەگەڕا هەتا لەگەڵ باڵندەکان بینێرتەوە بۆ شـارەکەی خۆی. کاتێک شـێخ نەسر زۆر لە کۆشکدا گەڕا و ئەوی نەدیتەوە، زانی کە دەرکی ئەو دیوەی کردووەتەوە. شـێخ بە مەلەکانی گوتبوو کە لاوێکە کە گێژاوی چارەنووسی هێناوییەتە ئێرە. لە ئێوەم دەوێ بیبەنەوە شارەکەی خۆی. مەلەکان گوتیان بە سەر سەر و بە سەر چاو.

بە کورتی، شـێخ بە دوای جانشـادا دەگەڕا هەتا گەیشـتە دەرکی ئەو دیوەی کە پێی گوتبوو، نەیکاتەوە. لە ڕێوە چووە ژوورێ، سەیری کرد ئەوە جانشا لەوێ لە بن دارێک بێ هۆش کەوتووە. خێرا چوو هێندێک ئاوی بۆنخۆشـی هێنا و بە سـەریدا هەڵپرژاند و وە هۆشی هێناوە. جانشا چاوێکی لەملا و ئەولای کرد.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەشکۆ، جانشا چاوێکی لەملا و ئەولای خۆی کرد. جگە لە شێخ نەسر کەسی دیکەی نەدیت. ئەوەندی دیش ناڕەحەت بوو. بە دڵێکی پڕ لە خەم و پەژارەوە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

قـــــــــــومرییەکی ئاسمانـــــی ئەوڕۆکانێ بە لەنجەو لار
نـازی دەفرۆشـــت بە دڵی من و بە چیمەن و گوڵی بەهـار
بەختەوەر بـــــــــووم ئەوڕۆکانێ چەرخ بە کەیفم دەگەڕا
تۆمەز دەرکێـــکی ئاسمان کراوە تا ئەو بێتە خـــــــوار
کەچی فـــــــڕ فـــــڕی ڕۆیی، بەجێی هێشتم ئەو پەرییە
دەبێ هـــــــــەتاکوو من ماوم ڕۆندک بڕێژم لە سوێی یار

شێخ نەسر کە ئەو شێعرەی لە جانشا بیست پێی گوت: «کوڕم پێم نەگوتی دەرکی ئەو دیوە مەکەوە و مەچووە ژوورەوە. ئێستا کە بە قسەی منت نەکردووە دا بۆم بگێڕەوە چیت دیوە و چیت بە سـەر هاتووە.» جانشـا بۆی گێڕاوە چی دیتووە و چی بە سـەر هاتووە. لەگەڵ ئەو کچانە چی کردووە و چیان پێ گوتووە. شـێخ گوتی: «کوڕی من ئەو کچانە پەری بوون و سـاڵێ جارێ دێن بۆ ئێرە بۆ سـەیر و سـەیاحەت و هەتا شـەو خەریکی سەیران و کایە و گەمە دەبن و دەڕۆنەوە. دوایە دەچنەوە شارەکانی خۆیان. جانشا گوتی: «گەورەم شاری ئەوانە لە کوێیە؟» شێخ نەسر گوتی: «ڕۆڵە گیان بە خودا خۆ من نازانم شـارەکانیان لە کوێیە. شـوێنەکەیان نازانم.» دوای ئەوە شـێخ نەسـر بە جانشـای گوت: «ئێستا هەسـتە و ئەو ئەڤینە لە سـەرت دەرهاوێ کە لە سـەرت دایە، با من تۆ لەگەڵ ئەو مەل و باڵندانە بەڕێکەمەوە بۆ شـارەکەی خۆتان بۆ ماڵە باوکت.» هەر شـێخ ئەو قسـەیەی کرد هاواری کرد و بێ هۆش بوو. دوای ماوەیەک وە هۆش خۆی هاتەوە و گوتی: «ئەمن ناچمەوە بۆ شـــارەکەی خۆم تا ئەو کچانە نەبینمەوە، گەورەم ئەوەش بزانە کە من قەت بیری کەس و کارم ناکەم، ئەگەر لە لای تۆ بشـمرم. من دڵخۆشـم ئەوەندەش کە سـاڵێ جارێکیش بێ چاوم بە دەلال و خۆشەویستەم بکەوێ.» ئیدی بە ئاهـ و ناڵەوە دەستی کرد بە خوێندنەوەی ئەو شێعرە.

دڵ پڕ لە خۆزگە و بریایە و زۆرکەم دێـــــــتە دی
دەمـرم تا ئەو کاتەی ئەو ئاواتەم دێـــــــــتە دی
تیشـــکی گەشـــی هەتـاو کە خۆت دەر خەی دەزانم

دوای ئەوە خۆی بەســـەر قاچی شـــێخ دادا و قاچی ماچ کرد و بە گریانەوە پێی گوت: «تکایە بەزەییت پێمدا بێ خودا بەزەیی پێتدا بێ. یارمەتیم بدە بە ئاواتم بگەم و لەو چارەڕەشـــییە ڕزگارم بێ.» شـــێخ گوتی: «کوڕم خۆ بە خودا ئەمن ئەو کچانە ناناســـم و نازانم لە چ شارێکن. ئێستا کە تۆ یەکیانت وەبەر دڵی کەوتووە ڕاوەستە تا ساڵێکی دیکەش لێرە بمێنەوە. دیسان لەو ڕۆژەدا دێنەوە ئێرە. کە کاتی ئەوە هات، ئەوان بێنەوە ئێرە، تۆ لە بن دارێک خۆت مات بدە. کاتێک ئەوان هاتن باڵوپەڕیان لە خۆیان کردەوە و چوون لە ناو ئاوەکەدا مەلە بکەن، ئەتۆ زوو بچووە باڵوپەڕی ئەوەی وا خۆشـــت دەوێ هەڵیگرە. ئەوان کاتێک تۆیان دیت دێنە دەرێ خۆیان کۆ کەنەوە. ئەو کەنیشکەی تۆ خۆشت دەوێ و تووک و پەڕەکەی بە تۆیە، لێت دێتە پێشـــێ و بە لەبزێکی نەرم و نیان و ســـەروڕوویەکی خۆشـە دەڵێ: «براکەم، دا تووک و پەڕەکەم دەوە.» ئەگەر بێت و دڵت نەرم بێ بیدەیەوە، تازە چاوت پێی ناکەوێ و بە ئاواتت ناگەی. خێرا تووک و پەڕی خۆی لە خۆ دەدا و دەڕواتە بۆ لای هۆز و کەس و کاری خۆی. هەر چاوێکیشت لێ ناکا. ئەگەر ئەتۆ تووک و پەڕەکەی ئەوت وەگیر کەوت توند لە باوەشـــتی گرە و مەیدەوە. هەتا ئەمن لە لای باڵندەکان دێمەوە و ئەودەم ئێوە لەگەڵ یەک دەکەمە ئاشـــنا و بۆت نەرم دەکەم و پێکەوە دەتان نێرمەوە بۆ کابول. ئەمن هەر ئەوەندەم لە دەست دێ.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی پێنجسەد و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! جانشا بە بیستنی قسەکانی شێخ نەسر ئەهوەن بووە و هەر لە لای ئەو ماوە هەتا سـاڵێکی دی، هەر ئەوڕۆی دا بە سـبەینێ هەتا کاتی هاتنەوەی باڵندەکان هاتەوە. شـێخ نەسـر چاوەڕێی هاتن و دیداری مەل و باڵندەکان بوو، جانشـاش چوو لە باخەکەدا لە بن دارێک خۆی مات دا. هەتا سـێ ڕۆژان لەوێ ماوە و کچەکان هەر نەهاتن. کەوتە دڵەکوتە و نیگەرانی. لەبەر نارەحەتیان دەستی کرد بە شین و گریان هەتا لە ئاستە خۆی بێ هۆش بوو و کەوت. دوای ئیسـتێک وە هۆش هاتەوە. تاوێک ڕوو بە ئاسـمان دەگریا و ئیسـتێک سـەری دادەخسـت و ئاخ و داخی دەدا دەرێ و جارێک ڕوو بە گۆلە ئاوەکە ویشـک دەبوو لە تا و یای خۆشـەویستیدا دڵی بە توندی لێی دەدا کە لە پڕدا سێ باڵندە لە بیچمی کۆتردا لە ئاسـمانەوە هاتنە خوار و نیشـتن. بەڵام هەر کۆترەی بە قەد داڵێک دەبوو. دوای ئەوە کۆترەکان لە قەراخ گۆلە ئاوەکە نیشـتن و چاوێکیان لە ڕاسـت و چەپ کرد. کەسـیان لەوێ نەدیت. ئینجا باڵ و پەڕەکەیان لە خۆیان کردەوە و چوون لە گۆلەکەوە. لەشـیان دەتگوت زێوە. لە ئاوەکەدا خەریکی کایە و شـەڕە ئاو و پێکەنین بوون. لەو جەنگەیەدا گەورەکەیان گوتی: «کچەکان دەترسـم کەسـێک لە کۆشـکەوە بە دزییەوە چاومان لێ بکا.» کچێکی دیکەیان گوتی: «خوشـکێ ئەو کۆشـکە ئی حەزرەتی سـولەیمانە، خۆ لە ئینس و جن کەسـی لێ نییە. وا بوو ئەوی هەرە چکۆڵەیـان بە بزەوە گوتی: «خوشکەکانم، ئەگەر کەسێکیشی لێ بێ دڵنیا بن جگە لە من کەسی ناوێ.

ئەوان ئاوا لەوێ خەریکی کایە و شۆخی بوون. جانشاش لە خۆشیان دڵی دەلەرزی و لە بن دارێک خۆی حەشار دابوو چاوی لێ دەکردن. ئەوان ئەویان لێ دیار نەبوو. سەرقاڵی مەلە بوون و بە مەلە چووبوونە نێوەڕاسـتی گۆلەکە لە پەڕوباڵەکەیان دوور کەوتبوونەوە. ئینجا جانشـا وەک بروسـکە خۆی گەیاندە پەڕوباڵی کچە گچکەکەیان و هەڵی گرت. کچە ناوی شەمسە بوو. کاتێک کچەکان چاویان بە جانشا کەوت لە ترس و شەرمان دەلەرزین و خۆیان لە ئاوەکەدا حەشـار دەدا. وردە وردە بە مەلە هاتنە قەراخ ئاوەکە. چاویان لە جانشـا کرد. سـەیریان کرد کوڕێکی قۆز و لەبەردڵانە و لە وەچەی مرۆڤە. پێیان گوت: «ئەتۆ کێی و چۆن هاتوویە ئێرە و بۆ ئەو پەڕوباڵەی شـەمسـەت هەڵگرتووە؟» جانشـا گوتی: «وەرن با بەسـەرهاتی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە. خاتوو شـەمسـە پێی گوت: «چییە ئەو پەڕوباڵەی منت بۆ هەڵگرتووە، ئەمن لە کوێوە دەناسی؟» جانشا گوتی: «سۆمای چاوم لە ئاوەکە وەرە دەرێ با بەسـەرهاتی خۆمت بۆ بگێڕمەوە و پێت بڵێم بۆ لە نێو ئەو سێ خوشکە جلەکانی تۆم هەڵگرتووە. کچە گوتی: «گەورەم باڵ و پەڕەکەم بدەوە با لە بەریان بکەم و بێم بۆ لای تۆ. جانشا گوتی: «خۆری جوانان من ناتوانم ئەو باڵ و پەڕەت دەمەوە

و خۆم له ئەڤینی تۆ بێ بەش بکەم و به دەستی خۆم حوکمی مردنی خۆم دەرکەم. له سوێی ئەڤینی تۆ سۆمای چاوم نەماوه. ئەمن ئەو پەڕوباڵەت نادەمەوه هەتا شێخ نەسر پاشای باڵندەکان نەیەته ئێره. شەمسه که قسەکانی جانشای بیست، پێی گوت: «ئێستا که جلەکانی من نادەیەوه، کەمێک بکشێوه با خوشکەکانم بێن جلەکانیان له بەر بکەنەوه و شتێکیش بدەن به من خۆمی پێ داپۆشم. جانشا لەڕێوه گەڕاوه بۆ لای کۆشک و شەمسه و خوشکەکانی له ئاوەکه هاتنه دەرێ. خوشکەکانی شەمسه پەڕوباڵەکانیان له بەر کردەوه و یەک دوو پەڕیشیان دا به شەمسه که نەیدەتوانی پێی هەڵفڕێ. ئەو تووک و پەڕەی له خۆی دا و وەک دارسەلو هەستا سەر پێ و ئاسک ئاسا به لەنجەولار چوو بۆ لای جانشا. سەیری کرد له سەر تەختێک دانیشتووه. سڵاوی لێ کرد و چوو له نیزیک ئەوەوه دانیشت و پێی گوت: «کوڕی جوان، تۆ خۆشت و منیشت تێدا دەبەی، ئێستا بەسەرهاتی خۆتم بۆم بگێڕەوه بزانم چیت بەسەر هاتووه؟ جانشا که دیتی شەمسه ئەو قسانەی کرد دەستی کرد به گریان. ئەوەنده گریا جلەکانی بەری خووسان. شەمسه زانی که جانشا گیرۆدەی کەمەندی ئەڤینی ئەوه، هەستا چوو له لای دانیشت و فرمێسکەکانی سترِی و پێی گوت: «قوزەکەم، مەگری و چیرۆکی ژیانتم بۆ بگێڕەوه.»

جانشا بەسەرهاتی خۆی له ڕۆژی یەکەمەوه تا ئەو شوێنەی پێکەوه دانیشتبوون بۆ شەمسه گێڕاوه.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکه.

## که شەوی پێنجسەد و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! خاتوو شەمسە کە چیرۆکی ژیانی ئەوی بیست ئاهێکی هەڵکێشا و پێی گوت: «گەورەم ئەگەر تۆ من خۆش دەوێ جلەکانم دەوە با لەگەڵ خوشکەکانم بچمەوە ناو هۆزەکەی خۆمان و ئاگاداریان کەمەوە کە تۆ ئاشقی من بووی و بگەڕێمەوە لای تۆ و ئەتۆ بەرە و شارەکەی باوکت بەرمەوە. جانشا کە ئەوەی بیست دەستی کرد بە گریان و بە شەمسەی گوت: «کارێکی شیاو نییە خوێنی منی ئەوداڵ بڕێژی و لە خۆڕا بمکووژی. خاتو شەمسە گوتی: «خاوەنم بە چ هۆیەک دەبێ تۆ بکووژم؟! جانشا گوتی: «لەبەر ئەوەی ئەگەر تۆ پەڕوباڵەکەت لە خۆت دەیەوە و بڕۆی گیانی منیش لە لەشم دەردەچێ. خاتوو شەمسە کە ئەوەی بیست پێکەنی و خوشکەکانیشی پێکەنین. ئەوجار خاتوو شەمسە پێی گوت: «خەمت نەبێ تازە تۆ مێردی منی، ئیدی هەستا و لە ئامێزی گرت و بە خۆیەوە گوشی و هەنیە و کولمەی ماچ کرد. جانشاش ئەوی لە باوەشیدا گوشی و ماوەیەکی باش ئاوا لە ئامێزی یەکدا بوون. دوای ئەوە لە باوەشی یەک هاتنە دەرێ و لە سەر تەختەکە دانیشتن. پاشان خوشکە گەورەکەی هەستا و لە کۆشک هاتە دەرێ و چووە ناو باخەکەوە و کەمێکی میوە و شت لێ کردەوە و بۆی هێنا. ئیدی خواردیان و خواردیانەوە و خەریکی عەیش و نۆش بوون. جانشا کوڕێکی باڵا بەرز و ڕێکوپێک و قۆز و جوانچاک بوو. خاتوو شەمسە پێی گوت: «خۆشەویستەکەم، بە خودا ئەمنیش ئۆگر و ئەڤینداری تۆم و لە قوڵایی دڵمەوە خۆشم دەوێی و قەت لێت جودا نابمەوە.» جانشا بەو قسەیە ئەرخەیان بوو. کەیفی ساز بوو دەستی کرد بە گاڵتە و جەفەنگ. لەو کاتەدا کە ئەوان خەریکی گاڵتە و جەفەنگ بوون، شێخ نەسر لە لای مەل و باڵندەکان گەڕاوە.

کە چاویان بە شێخ نەسر کەوت هەموویان لەبەری هەستان و سڵاویان کرد و دەستیان ماچ کرد. شێخ دۆعای بەخێری بۆ کردن و فەرمووی کردن دانیشن. ئەوانیش دانیشتن. ئەوجار شێخ بە خاتوو شەمسەی گوت: «خانمە جوانەکە، ئەو کوڕە شێت و شەیدای تۆ بووە و لە تاوی تۆ حەجمینی نییە. بیکە بۆ خاتری خودا بەزەییت پێیدا بێ، لەو کوڕە چاک و پاکانەی زەمانە. لە وەچەی پاشایانە. باوکی پاشای کابولە و وڵاتێکی پان و بەرینی لە بەر دەستی دایە.» کاتێک شەمسە گوێی لە قسەکانی شێخ بوو گوتی: «بابە شێخ فەرمایشتەکانی تۆم بیست و ملکەچی فەرمانتم. چوو دەستی شێخی ماچ کرد و دەستەونەزەر لە پێشی ڕاوەستا. شێخ پێی گوت: «کچم ئەگەر ڕاست دەکەی، سوێند بە خودای گەورە بخۆ کە هەتا ماوی خەیانەتی پێ نەکەی.» ئەوجار کیژە زۆری سوێندی گەورە گەورە خوارد کە قەت خەیانەتی پێ نەکا و ئەو وەک مێردی هەتا هەتایی خۆی قەبووڵ بکا. بەڵێنی بە شێخ دا و گوتی: «بابە شێخ، بەڵێنت پێ دەدەم قەتی لێ جیا

نابمەوە.»

دوای ئەوەی کە شـەمسـە ئاوا سـوێندی خوارد و بەڵێنی بە شـێخ دا، شـێخ باوەڕی بە شەمسە کرد و ڕووی لە جانشا کرد و پێی گوت: «سپاس بۆ خودا کە ئەو دوانەتانی ئاوا بە یەک گەیاند و ڕێکی خستن.» جانشا لە ڕادە بە دەر کەیفی ساز و خۆشحاڵ بوو. جانشا و خاتوو شەمسە سێ مانگان لە لای شێخ نەسر لە خۆشی و عەیش و نۆشدا بوون.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و دەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! دوای سێ مانگ شەمسە بە جانشای گوت: «پێم خۆشە بچینەوە شارەکەی خۆتان و مارەم کەی ژیانێکی نوێ دەست پێ بکەین.» جانشا لەگەڵ شێخ نەسر راوێژی کرد و ئەوەی کە شەمسە پێی گوتبوو بۆ شێخیشی گێراوە. شێخ نەسر گوتی: «برۆ بەڵام لەگەڵ شەمسە زۆر باش بە.» جانشا گوتی: «بە سەر سەر و سەر چاو.»

خاتوو شەمسە داوای باڵ و پەڕەکانی کردەوە و بە شێخی گوت: «بابە شێخ پێی بفەرموو تا باڵ و پەڕەکانم داتەوە.» شێخ بە جانشای گوت، باڵ و پەڕەکانی وێدەوە. جانشا لەڕێوە هەستا چوو بۆ کۆشک و باڵ و پەڕەکانی هێنا و دایەوە.

خاتوو شەمسە باڵ و پەڕەکانی لە خۆی شەتەک دا و بە جانشای گوت: «وەر سەر کۆڵم، چاوت بقووچێنە و گوێت بگرە تا شریخەی ئاسمانەکانت نەیەتە گوێ. بە هەردووک دەستیشت توند باڵم بگرە و وریابە نەکەوی. جانشا چووە کۆڵی. هەرکە ئەو ویستی هەڵفڕێ، شێخ نەسر گوتی: «کەمێک ڕاوەستە با نیشانەکانی شاری کابولت پێ بڵێم، نەوەک ڕێت لێ تێک چێ بچی بۆ جێگایەکی دیکە.» شەمسە ڕاوەستا. شێخ نێونیشانەکانی کابولی پێ گوت و جانشای بەو سپارد و ماڵاوایی لێ کردن. شەمسە ماڵاوایی لە خوشکەکانیشی کرد و پێی گوتن: «ئێوە بچنەوە بۆ لای کەس و کارەکەمان و ڕووداوەکەی من و جانشایان بۆ بگێڕنەوە. دوای ئەوە شەمسە هەڵفڕی و وەک با و بریسک بە ئاسماندا ڕۆیشت. خوشکەکانیشی هەڵفڕین و چوونەوە بۆ لای هۆزەکەی خۆیان و بەسەرهاتەکەی شەمسەی خوشکیان و ڕووداوی زەماوەندەکەیان لەگەڵ جانشا بۆ خزم و کەسەکەیان گێڕاوە.

شەمسەش لە نیوەڕۆوە هەتا ئێوارە یەک تەکان هەڵفڕی. ئێوارە لە دوورەوە چاوی بە مێرگ و مێرغوزارێک کەوت کە پڕ بوو لە دار و کانی و سەوزایی. خاتوو شەمسە بە جانشای گوت: «ئێرە مێرگێکی خۆش و سەرسەوز و پڕ لە دارستانی لێیە دەڵێم لێرە لادەین و کەمێک بحەسێینەوە. شەو لێر بین و بەیانی وەڕێ کەوینەوە. دەڵێی چی؟» جانشا گوتی: «چۆنت پێ خۆشە وا بکە.» لە ڕێوە شەمسە لوور بووەوە ناو مێرگ و سەوزاییەکە و نیشتەوە. جانشاش لە کۆڵی هاتە خوارێ. جانشا ناوچەوانی ماچ کرد و ماوەیەک لە قەراخ چۆمەکە دانیشتن. دوای ئەوە هەستان و لە نێو ئەو دار و باخ و چۆمەدا گەڕان و سەیرانیان کرد. میوەیان لە دارەکان دەکردەوە و دەیانخوارد هەتا بوو بە شەو. دوایە هاتنەوە لای دارێک و تا بەیانی لەوێ خەوتن.

کە بوو بە ڕۆژ خاتوو شەمسە جانشای لە کۆڵی کرد و هەتا نیوەڕۆ بێ ڕاوەستان فڕی. گەیشتە شوێنێک، نیشانەکانی کە شێخ نەسر کوتبووی وردە وردە وەدەر دەکەوت.

کاتێک شەمسە ئەو نیشانانەی دیت لە ئاسمانەوە بەرەو دەشتێکی خۆش و سەرسەوز کە چۆم و ڕووبارەکانی لە دوورەوە سەرنجیان ڕادەکێشا و دار و باخەکانی خۆشیان دەخستە دڵی مرۆڤەوە، ڕۆیشتە خوارێ. لەو دەشتەدا پۆل پۆل مامز دەلەوەڕین و کانیاوەکان ئاوێکی پاکیان لە بەر دەڕۆیشت. شەمسە لەو دەشتە خۆشە نیشتەوە و جانشاش لە کۆڵی هاتە خوارێ و تەوێڵی ماچ کرد. خاتوو شەمسە بە جانشای گوت: «خۆشەویست و سۆمای چاوم، دەزانی چەندمان ڕێگا بڕیوە؟» جانشا گوتی: «ناوەڵڵا.» کیژەکە گوتی: «سێ مانگەڕێیە.» جانشا پێی سەیر بوو گوتی: «باش بوو شکوور بە سلامەتی گەیشتینەوە.» ئینجا لە پەنا یەک دانیشتن. خواردیان و خواردیانەوە و دەستیان کرد بە یاری و جەفەنگ و کەیف و خۆشی. لەوجەنگەیەدا تەماشایان کرد، دوو سوار بەرەو لای ئەوان دێن. جانشا جوان سەرنجی دانێ سەیری کرد یەکیان ئەو پیاوە بوو کە کاتێک سواری گەمییەکە ببوون لە لای ئەسپەکانی دانابوو. ئەوی دیکەش یەکێک لەو سوارانە بوو کە لە ڕاوەکەدا لەگەڵیان بوو. ئەوان کە جانشایان دیت ناسیانەوە و هاتن سلاویان کرد و خۆیان بە سەر قاچیدا دا. ئینجا گوتیان ئەگەر ڕێمان بدەی دەچینەوە لای باوکت و مزگێنی دەدەینێ. جانشا گوتی: «پێتان خۆشە بچن.» گوتیشی: «تاوڵە و ڕاخەر و شتیشمان بۆ بێنن دەمانهەوێ تا حەوت ڕۆژ لێرە بمێنینەوە. هەتا دەستەی سواران دێن بەرەو پیرمان و بە تەشریفاتەوە دەمانبەنەوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی پێنجسەد و یازدەهەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! ئەو دوو پیاوە خێرا سـوار بوون چوون بۆ لای باوکی جانشـا. کە گەیشـتنە بارەگای تیقمووسپاشـا، گوتیان: 'پاشـای جیهان، مزگێنیمان دەیە کورەکەت هاتووەتەوە و ئەوە لە فلان مێرگ و باخە.' پاشـا کە ئەو هەواڵەی بیسـت، لە خۆشـیان شـاگەشـکە بوو و لەوێ بێهۆش کەوت. کە وە هۆش هاتەوە، فەرمانی دا ماڵ و خەلاتێکی باش بەو دوو سـوارە بدەن. وەزیر زێڕ و ماڵێکی زۆری دا بەو دوو پیاوە و خەلاتی کردن و گوتی: 'ئەوە ئێمە خەلاتی باشـمان دا بە ئێوە، جا چ راسـت بکەن چ درۆ.' پیاوەکان گوتیان: 'بە خودا درۆ ناکەین و ئیستێک لەوەو بەر لە لای شازادە دانیشتبووین. بۆ درۆ و راستی، پێشی گوتین کە پێتان بلێین تاوڵە و خێوەتیان بۆ بەرن، چونکە دەیانهەوێ حەوت رۆژ لەو مێرگە بمێننەوە هەتا وەزیر و گەورەگەورەکان و فەرماندەکانی دەوڵەت بە پیرییانەوە دەچن.' ئیدی پاشـا فەرمووی تەپڵ و دەفی شـادی لێ دەن و، جارچی بانگەواز بکەن با خەڵک ئاگادار بنەوە کە جانشـا هاتووەتەوە. دوای ئەوە تیقمووسپاشـا بە کۆمەڵە سوارێکی زۆرەوە چوو بۆ مێرگ و دارستانەکە. جانشـا لەگەڵ خاتوو شـەمسـە دانیشـتبوو کە سـوپا وەدەر کەوت. جانشـا هەسـتا و بەرەو پیلی بابی چوو. کاتێک سـوارەکان نیزیک بوونەوە، ئەویان ناسـییەوە و دابەزین و دەسـتیان ماچ کرد. ئەوجار جانشـا لەنواوە و سوارەکان لەدواوە رۆیشتن تا گەیشتنە لای تیقمووسپاشا. هەر کە پاشا چاوی بەو هەموو جوانییەی کورەکەی کەوت، لەسـەر زینەکەوە خۆی هاویشـتە خوارێ و جانشـای کوڕی لە ئامێز گرت و دەستی کردە گریان. دوای ئیستێک سوار بووەوە و بە کورەکەشی گوت کە سـوار بێتەوە. سـوارەکان لە لای راسـت و چەپیاونەوە دەرۆیشـتن هەتا گەیشـتنە لای چۆمەکە. سـوپاکە دابەزین و خێوەتیان هەڵدا و دەف و دەهۆڵ و تەپڵیان دەژەنی و لە کەرەنایان دەتووراند.

تیقمووسپاشـا بە پێشـخزمەتەکانی گوت: 'خێوەتی دیبای سـوور بۆ خاتوو شـەمسـە هەڵدەن.' پێشـخزمەتەکان فەرمانیان بەجێ گەیاند. ئینجا خاتوو شـەمسـە باڵ و پەڕی لە خۆی کردەوە و هەسـتا بەرز و رێک وەک شـمشـاد بە لەنجەولار تاوسـاسـا بەرەو خێوەتەکەی رۆیشـت و چوو لەنێو تاوڵەکەدا دانیشـت. لەرێوە تیقمووسپاشـا لەگەڵ کورەکەی چوون بۆ تاوڵەکەی شەمسە. کاتێک خاتوو شەمسە پاشای دیت، لە بەری هەستا و کڕنۆشی برد و دەستی ماچ کرد. تیقمووسپاشا دانیشت و جانشا و شەمسەی لەمبەرە و ئەوبەری خۆی دانا. بەخێرهاتنی شـەمسـەی کرد و بە جانشـای گوت: 'جا رۆڵە، بۆم بگێڕەوە ئەو ماوەیە لە کوێ بووی و چیت بەسـەر هاتووە؟' جانشـا تەواوی ئەو رووداو و شـتانەی کە دوای راکردن بەدوای ئاسکەکەدا بۆی هاتبوونە پێشـێ، موو بە موو هەمووی

بۆ بابی گێڕاوە. پاشا کە ئەو بەسەرهاتانەی بیست، سەری سوورِ ما. نەیدەزانی چی بڵێ. ئنیجا ڕووی لە شەمسە کرد و گوتی: 'سپاس بۆ ئەو خودایەی دڵی تۆی نەرم کرد و لەگەڵ کوڕەکەم پێک هاتن و منی بە کوڕەکەم شاد کردەوە ڕەحمێکی گەورەی پێ کردین.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی پێنجسەد و دوازدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! پاشا بە خاتوو شەمسەی گوت: 'پێم خۆشە حەزت لە چییە داوای بکەی هەتا بۆت وەدی بێنم.' شەمسە گوتی: 'ئاواتی من ئەوەیە لە نێوەڕاستی باخدا کۆشکێکم بۆ چێ کەی و جۆگەلە ئاو بە بەر کۆشکەکەدا بڕوا.' پاشا گوتی: 'بە سەر سەر و چاو.' ئەوان خەریکی وتوویژ بوون کە دایکی جانشا لەگەڵ ژنی وەزیر و گەورەکانی شار و فەرماندەکان گەیشتن. جانشا هەر کە هەواڵی هاتنی دایکی بیست، خێرا لە تاوڵەکەی هاتە دەرێ و بە پێشوازییەوە چوو. یەکتریان لە ئامێز گرت. دایکی جانشا لە خۆشیان فرمێسکی ڕانەدەوەستا و دەگریا و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

دەزانی چەندە خۆشە دیداری یاری نادیارت؟
وەک لە بێروونێکی وشکا ساقی بێتە هاوارت

'دایک و کوڕ بە نۆرە زۆریان باسی ڕەنج و تاڵیی ئەو ماوە دوور و درێژە کرد و پێکەوە گریان و پێکەنین. ئینجا تیقمووسپاشا چووەوە تاوڵەکەی خۆی و جانشاش لەگەڵ دایکی چوونە تاوڵەکەی پاشا و دەستیان کرد بە وتوویژ. لەو جەنگەیەدا مژدەدەران مژدەیان هێنا ئەوە خاتوو شەمسە دێتە سڵاوی شاژن. کە دایکی جانشا ئەو هەواڵەی بیست، هەستا چووە پێشوازیی شەمسە و سڵاوی لێ کرد و لە ئامێزی گرت. ماوەیەک ئاوا مانەوە و پاشان لەگەڵ ژنە وەزیر و فەرماندە و گەورەکانی دەوڵەت بەرەو تاوڵەکەی خاتوو شەمسە وەڕێ کەوتن. تیقمووسپاشا دیاری و خەڵاتێکی زۆری بەسەر سوپا و هەژاران و خەڵکی دیدا بەخشییەوە. هێندە بە هاتنەوەی کوڕەکەی خۆشحاڵ بوو هەتا دە ڕۆژان لەو دەشتەدا خواردن و خواردنەوە بەخشراوە و لە خۆشی و ئاهەنگدا بوون.

دوای ئەوە پاشا فەرمانی دا سوپا بگەڕێتەوە و بۆ خۆشی سوار بوو. سوپا و ئەمیران و وەزیران و گەورەکانی شار لە ڕاست و چەپییەوە دەڕۆیشتن. بەو شێوەیە ڕۆیشتن هەتا گەیشتنەوە شار. شار هەموو ڕازابووە و دەنگی دەف و دەهۆڵی شادی وڵاتی داگرتبوو. دایکی جانشا و خاتوو شەمسە چوونەوە کۆشک. گەورەکانی شار دیاریی باش و گرانباییان دەبەخشییەوە و خەڵکی تەماشاچی سەریان سووڕ مابوو. هەتا دە ڕۆژان خەڵکی هەژار نان دران و ماڵیان بە سەردا بەخشراوە. شەمسە خانم واقی وڕما و بەو دیمەنە شاگەشکە بوو.

ڕۆژێکی تیقمووسپاشا فەرمانی دا وەستای دیواریان بانگ کرد و پێی گوتن کە کۆشکێکی لەو چەشنە لە نێوەڕاستی باخدا ساز کەن. ئەوان کوڕنۆشی بەڵێیان برد و

چوون بە لای کاری خۆیانەوە و دەســتیان کرد بە درووســتکردنی کۆشــک. جانشــاش بەردبڕی بانگ کرد و پێی گوتن: 'دەبێ کۆڵەکەیەک لە بەردی ڕوخامی ســپی درووســت بکەن بەڵام دەبێ ناوەکەی هلۆل[1] بێ.' کۆڵەکە درووســت کرا و جانشــا هێنای پەڕوباڵە سپییەکانی کە شەمسە پێی دەفڕی، لەنێو ئەو کۆڵکەی نا و قورقوشمی تواوەی بەسەر دا کرد و تەواو شــاردییەوە. کاتێک کۆشــکەکە تەواو بوو، پڕیان کرد لە فەرشــی دیبا. بەزم و ئاهەنگێکی خۆش ســاز کرا و خاتوو شــەمســەیان هێنایە نێو ئەو کۆشــکە و، پاشــان هەر کەســەی چوو بە لای کاری خۆیەوە. کاتێک خاتوو شــەمســە هاتە کۆشــکەوە، بۆنی جلە تایبەتەکانی بۆ دەهات.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشــەویش کۆتایی پێ هات و شــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. هلۆل: کلۆر، بۆش.

# کە شەوی پێنجسەد و سێزدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! خاتوو شەمسە کە بۆنی پەڕوباڵەکەی خۆی بۆ هات و شوێنەکەی دیتەوە، ویستی دەریانبێنێ. تا نیوەشەو ڕاوەستا. کاتێک جانشا تەواو خەوی لێ کەوت، هەستا چووە لای ئەو شوێنەی بۆنەکەی لێ دەهات. هەر دایەوە و دایەوە هەتا گەیشتە کۆڵەکەکە. لەوێدا دیتی قورقوشمیان بە سەردا تواندبووەوە. قورقوشمەی لادا و هەر بەدەوریدا هات و دایەوە هەتا گەیشتە پەڕوباڵەکەی، پەڕوباڵەکەی هێنا دەرێ و لە بەری کرد. هەڵفڕییە سەر دیواری کۆشکەکە و لەوێڕا هەرای خەڵکی ناو کۆشکەکەی کرد و گوتی: 'دا بچن جانشام بۆ بانگ کەن با ماڵاوایی لێ بکەم.' دانیشتووانی کۆشک چوون جانشایان ئاگادار کردەوە. جانشا هات و گوتی: 'ئەوە چۆن ئەوانەت دیتەوە؟' خاتوو شەمسە گوتی: 'خۆشەویستەکەم، بینایی چاوم، بە خودا من تۆم زۆر زۆر خۆش دەوێ و زۆر خۆشحاڵ بووم، تۆ ئاوا بە دیداری کەس‌وکارەکەت شاد بوویەوە و هاتیەوە شارەکەی خۆت. دەزانم ئەتۆش منت خۆش دەوێ وەک چۆن من تۆم خۆش دەوێ. وەرە لام لە قەڵای گەوهەرنگین.' ئەوەی گوت و هەڵفڕی. جانشا کە ئەوەی دیت و ئەو قسانەی بیست، خەریک بوو گیانی دەرچێ. لەجێوە بێهۆش بوو، هەر لەوێ کەوت. تاقمێک هەڵاتن بۆ لای تیقمووس‌پاشا و هەواڵەکەیان پێ ڕاگەیاند. پاشا هات بۆ کۆشک و کوڕەکەی دیت لەوێ کەوتبوو. لە تاوانی دەستی کرد بە گریان. زانی گیرۆدەی خۆشەویستیی خاتوو شەمسە بووە. ئینجا ناردیان گوڵاویان هێنا بەسەریاندا هەڵپرژاند و وە هۆشیان هێناوە. جانشا کە سەیری کرد باوکی لەپشت سەرییەتی، دەستی کرد بە گریان. باوکی پرسی: 'چی بووە؟' جانشا گوتی: 'بابە، شەمسە لە ڕەگەزی پەرییانە و من زۆرم خۆش دەوێ. باڵ‌وپەڕێکی لای من بوو کە بێ ئەو نەیدەتوانی هەڵفڕێ. ئەو باڵ‌وپەڕەم لە قەدی کۆڵەکەیەکی کۆشکەکە خستوو قورقوشمم بەسەردا کرد. کەچی ئەو خانمە چووە هەمووی داوەتەوە و خۆی گەیاندووەتە باڵ و پەڕەکەی و دەریهێناوە. هەتا نەچووبووە سەر دیوارەکە و هەرای نەکردبوو بۆ ماڵاوایی، کەس نەیزانی بوو. ئلەوێڕا هەرای منی کرد و گوتی: 'من تۆم خۆش دەوێ، ئەوە تۆم هێناوە لای دایک و بابت. ئەگەر تۆش منت خۆش دەوێ، لە قەڵای گەوهەرنگین وەرە لام.' ئەوەی گوت و هەڵفڕی. تیقمووس‌پاشا گوتی: 'ڕۆڵە، خەم مەخۆ. ئەمن بازرگان و جیهانگەڕەکان کۆ دەکەمەوە و هەواڵی ئەو قەڵایەت بۆ پەیدا دەکەم. دوای ئەوە دەچین و شەمسە خانم لە کەسوکارەکەی دەخوازین. ئاواتە خوازم خودا پێکتان شاد کاتەوە و بە یەکجاری پێک بگەن.'

پاشا خێرا فەرمانی دا چوار وەزیرەکەی بێنە هەنتەشی و پێی گوتن: 'بازرگان و گەڕۆکەکانی شار کۆ بکەنەوە و شوێن و ناونیشانی قەڵای گەوهەرنگینیان لێ بپرسن.

هەرکەس بزانێ و بۆ شـــوێن و جێگاکەی ڕێشـــاندەرمان بێ، پەنجاهەزار دیناری زێڕی ســــووری دەدەمێ.' وەزیرەکان بە پیر فەرمانەکەی پاشـــاوە چوون و هەموو بازرگان و جیهانگەڕەکانیان دیتنەوە و لێیان پرسین: 'ئەرێ بە شوێنی قەڵای گەوهەرنگین دەزانن یان نا؟' کەس نەیگوت بە جێگاکەی دەزانێ یان ناوی بیستووە. وەزیرەکان گەڕانەوە لای پاشا و ڕووداوەکەیان بۆ گێڕاوە. پاشـا کە قسـەکەی ئەوانی بیسـت، فەرمانی دا کە کامە ژن و کەنیز جوان و دەنگخۆش و مۆســیقاژەنی باشــە، کۆی کەنەوە بەشــکو بە دانیشـــتن و گوێگرتن و دیداری ئەوان تۆزێک دڵی هێور ببێتەوە. وا بوو پاشـــا چۆنی فەرمان دابوو، جێبەجێ کرا. دوای ئەوە تیقمووسپاشا جیهانگەڕ و شۆفاری بۆ شارەکان نارد بەشکو بە جۆرێک سۆراخێکی قەڵای گەوهەرنگین بکەن. نێردراوەکان ماوەی دوو مانگان بە شـاراندا ســووڕانەوە و بەبێ هیچ هەواڵێک گەڕانەوە لای پاشـا و عەرزیان کرد کە هیچیان دەسـت نەکەوتووە. پاشـــا زۆر نارەحەت بوو. تێر گریا و پاشـــان هەســـتا چوو بۆ لای کوڕەکەی. ســەیری کرد ئەوە کوڕەکە لە کۆڕی ســەما و ئاهەنگ و بەزمی جواناندایە، بەڵام هیچ لەوە ناچێ خەمی شەمسەی ڕەوی بێ و ئارام بووبێتەوە. پاشا پێی گوت: 'ڕۆڵە، هیچ هەواڵێکمان وەگیر نەکەوتووە. خەم مەخۆ کچی زۆر لە شەمسە جوانترت بۆ دێنم.' جانشا هەر کە ئەو قسەیەی بیست، دەستی کرد بە گریانێک، سەیر. ئینجا ئەو شێعرەی خوێندەوە.

ئەگەر نـالوێ شـــاد ببمەوە بە دیـاری یـاری جوانم
ناشـــم هەوێ هەتاکوو هەم بڵێم خاوەن دەســـگیرانم

تیقمووسپاشـــا لەگەڵ پاشـــای هێند ناخۆشـــییەکی قووڵیان لە نێواندا بوو، چونکە تیقمووسپاشا جارێکیان پیاوەکانی ئەوانی کوشتبوو و ماڵەکەیانی بە تاڵان بردبوو. پاشای هێند کە ناوی کەفیدپاشا بوو، سوپایەکی گەورەی هەبوو. هەزاران سەرهەنگی هەبوو. هەر سەرهەنگێکیش هەزار هۆزی لە بەردەستدا بوو. هەر هۆزێکیش چوارهەزار سواری هەبوو. چوار وەزیری هەبوو. چەندین پاشـــا لەژێر دەســـەڵاتی ئەودا پاشـــایەتییان دەکرد کە هەر پاداشایەی بۆ خۆی هەزاران شاری لەژێر ڕکێفدا بوو. هەر شارەش هەزار قەڵای هەبوو.

کاتێک کەفیدپاشـا، زانی ئەوە تیقمووسپاشـا سـەرقاڵی کێشـەی کوڕەکەیەتی و زۆر لە بیر بەڕێوەبردنی وڵاتەکەیدا نییە و ســـوپاکەی پەرەمپەرەم بووە، بۆخۆشـــی لە تـاوی کوڕەکەی نـاپەرژێتە ســـەر ئەوانە، وەزیرەکـانی بـانگ کرد و پێی گوتن: 'خۆ لە بیرتـان نەچووەتەوە تیقمووسپاشـــا هێرشـــی کردینە ســـەرێ و کەسوکاری کوشـــتین و ماڵ و ســـامانی ئێمەی بە تاڵان برد! ئێســـتاش بیســـتوومەتەوە کە تیقمووسپاشـا لەبەر کێشــەی کوڕەکەی هۆشـــی بە لای هیچ شـــتێکەوە نەماوە و ســـوپاکەی بڵاو بووەتەوە. ئێســـتا کاتی تۆڵەیە. خۆتان بۆ هێرش تەیار کەن. چەک و کەلوپەلی شەڕ و تفاق ساز کەن. لە زووترین

کاتدا دەکەوینە ڕێ و دەچین ئەو و کوڕەکەی دەکوژین و دەســـت بەســـەر وڵاتەکەیدا دەگرین.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی پێنجسەد و چواردەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! کەفیدپاشا، پاشای هێند بە سەرانی سوپای گوت، خۆیان ساز کەن بۆ شەڕ و گەشتێکی دوور. سەرانی سوپا فەرمانی پاشایان بەجێ گەیاند و هەر زوو چەک و کەل‌وپەلی شـەڕ و بژیو و پێداویسـتییان ئامادە کرد. هەتا سـێ مانگان هەر هێزیان کۆ کردەوە. دوای ئەوە تەپڵی سـەفەریان لێ دا و هێما و ئاڵایان هەڵدا. کەفیدپاشـا لەگەڵ سوپاکەی وەڕێ کەوتن. ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە وڵاتی کابول کە وڵاتی تیقمووس‌پاشا بوو. تەواوی وڵاتیان تاڵان کرد و پیرەکانیان کوشت و گەنجەکانیشیان بە دیل گرتن. ئەو هەواڵە بە تیقمووس گەیشـتەوە. پاشـا بە بیسـتنی ئەو هەواڵە بە جارێک تێک چوو. وەزیر و سـەرهەنگ و گەورەگەورەکانی حوکوومەتی بانگ کرد و پێی گوتن: 'هەر وەک دەزانن کەفیدپاشا هێرشی کردووەتە سـەر وڵاتمان و شـەڕمان پێ دەفرۆشێ. سوپایەکی زۆر و زەوەندشـی هەیە تا ڕادەیەک کە هەر خودا دەزانێ ژمارەیان چەندەیە. ئێوەم بانگ کردووە بیرێـک بکەینەوە چ بکەین و ڕاتـان چییە؟' ئەوانیش گوتیـان: 'ئێمە پێمـان وایە دەبێ ڕووبەڕوویان ببینەوە و پێشـیان بگرین و لە وڵاتەکەمان وەدەریان نێین.' تیقمووس‌پاشـا گوتی: 'کە وایە خۆتان بۆ شـەڕ سـاز کەن.' ئیدی دەرکی جبەخانە کراوە و زرێ و کڵاو و شیر و مەتاڵ بە سوپا درا و ئامادەی شەڕ بوون. ئاڵایان هەڵدا و تەپڵ و زوڕنای شەڕیان لێ دا و لە کەڕەنایان تووڕاند.

بەو جۆرە تیقمووس‌پاشـا بە سـوپاکەوە بۆ بەرەنگاریی کەفیدپاشـا ڕۆیشـت. ڕۆیشـتن ڕۆیشتن هەتا لە سوپای کەفیدپاشا نیزیک بوونەوە. تیقمووس‌پاشا لە شێوێنێک کە ناوچەی زەهرانی پێ دەڵێن، لایان دا و نامەیەکی نووسـی کە دەقەکەی ئاوا بوو: 'کەفیدپاشـا، ئەو کارانەی تۆ وەک کاری هەتیومەتیو و هەرچیوپەرچی دەچێ. ئەگەر تۆ پاشـازادە بای، هەرگیز کاری ئاوات نەدەکرد و هێرشت نەدەکردە سەر وڵاتی من و ستەمت لە مسکێنانی من نەدەکرد. ئەگەر من دەمزانی کە تۆ غیرەت وەبەر خۆت دەدەی و هێرش دەکەیە سـەر وڵاتی من، پێش ئەوەی تۆ پەل ببزووی، من پەلم دەشکاندی. ئێستاش ئەگەر بە خۆشی لەو وڵاتە دەچیە دەرێ و دەست لەو کوشت و کوشتارە هەڵدەگری، ئەوە باشە و منیش لێت خۆش دەبم. دەنا خۆت بۆ زەبری شیر و ڕمبی ئێمە ساز کە.

نامەکەی پێچاوە و بە پیاوێکدا ناردی و چەند شـۆفاریشـی لەگەڵ نارد. کابرا نووسراوەکەی وەرگرت و ڕۆیشت هەتا گەیشتە نیزیک خێوەت و کەژاوەکەی کەفیدپاشا. سەیری کرد هێندێک لە تاوڵەکان لە ئەتڵەسی سوورن و ئاڵاکان لە ئاوریشمی سەوز. لەنێو ئەو تاوڵانەدا تاوڵێکی گەورەی دیت کە بە نۆبەدار و سـوپایەکی بێژمار دەوری درابوو.

هەر کە گەیشتە ئەو خێوەتە، پرسیاری کرد: 'ئەو خێوەتە ئی کێیە؟' گوتیان: 'ئەوە خێوەتی کەفیدپاشایە.' ئەو کابرایە تەماشای کرد ئەوە کەفیدپاشا لەسەر کورسییەکی زێڕی ڕازاوە بە گەوهەری جۆراجۆر دانیشتووە. وەزیر و سەرهەنگەکانیش لەبەردەمی دەست بە سینگەوە ڕاوەستاون. ئینجا نامەکەی بە دەستەوە گرت و چوو بۆ لای. هێندێک لە پیاو و پارێزەرەکانی هاتن و نامەکەیان لێ وەرگرت و بۆ پاشایان بردیان. پاشا نامەکەی خوێندەوە و زانی چ باسە. خێرا وەڵامی نامەکەی بۆ نووسییەوە و گوتی: 'تیقمووسپاشا، ئێمە هاتووین بۆ تۆڵە و دەبێ ئەو پەڵە ڕەشە لە نێوچاوانمان بسڕینەوە و تەواوی شار و ئاواییەکانی ئێوە وێران کەین و ناموستان بە با دەین. پیرانتان بکوژین و منداڵەکانتان بە دیل بگرین. سبەینێ دێینە سەرتان، جا ئێوە ئازا بن خۆ لە بەر زەبری شێر و ڕمبی ئێمە بگرن.' لە کۆتاییدا نامەکەی پێچاوە و دای بە نێردراوەکەی تیقمووسپاشا. کابرا نامەکەی وەرگرت و گەڕاوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و پازدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ! کابرای نامەبەر وەڵامی نامەکەی وەرگرت و گەڕاوە. کە گەیشــتە لای تیقمووسپاشا، کڕنۆشی برد و نامەکەی دایە و ئەوەی دیبووی بۆ پادشای گێڕاوە کە چەندی ســوار و پێرەو و ســوپای ئاوا و ئاوا دیوە و خودا نەبێ کەس نازانێ ژمارەیان چەندەیە و هەرگیز بە کوشتن لەبن نایەن.

کاتێک تیقمووسپاشــا نامەکەی پاشــای هیندی خوێندەوە، وەها تووڕە بوو، لەجێوە وەزیر عەینزاری بانگ کرد و فەرمانی پێ دا، بە لەز هەزار سوار ئامادە بکا و شەو بەسەر ســوپای کەفیدپاشــادا بدا. وەزیر عەینزار دەمودەســت هەزار ســواری ســاز کرد و بەرەو ســوپاکەی کەفیدپاشــا کەوتە ڕێ. کەفیدپاشــاش وەزیرێکی هەبوو ناوی قەتەرفان بوو. فەرمانی پێ دا بەرەو ســوپای تیقمووسپاشــا ڕۆیشــتن. هەتا نیوەشــەو لە ڕێدا بوون. لە نیوەی ڕێگەدا دوو سوپا بەرەنگاری یەک بوونەوە. سوارەکانی هەردووک لا تێک خوڕین و شــەڕێکی قورس لەنێوانیاندا دەســتی پێ کرد و هەتا لای بەیانی لێکیان دا. کە ڕۆژ بووەوە، سوپای کەفیدپاشا لەبەرانبەر سوپای تیقمووسپاشادا تێک شکان و ڕایان کرد.

کاتێک ڕاکردووانی سوپای کەفیدپاشا گەیشتنەوە لای پاشاکەیان، پاشا تووڕە بوو و پێی گوتن: 'ئەوە بۆ ئاواتان لێ هاتووە، خوێڕییانە؟' گوتیان: 'پاشــای جیهان، کە بەرەو ســوپاکەی تیقمووسپاشــا ڕۆیشــتین، نیوەشــەو لە نیوەی ڕێگا تووشــی ســوپاکەی وەزیر عەینزار بووین. وا بوو شــەڕێکی قورس هاتە ئاراوە و خەڵکێکی زۆر کوژرا. کاتێک وەزیر عەینزار دەنگی فیلەکانی دەدا، هەموو ڕەویان دەکرد و تەپوتۆز نەیدەهێشــت چاو چاو ببینێ. خوێن وەک دەریا شــەپۆلی دەدا. هەر بۆیە ئەگەر ڕامان نەکردبا، یەک دانەشــمان دەرنەدەچووین.' کەفیدپاشــا کە ئەوەی بیســت، گوتی: 'ئەوە پیت و فەڕی خۆرتان لەگەڵ نەبووە و ڕقی لێ هەڵگرتوون، بۆیە ئاواتان لێ هاتووە.

وەزیر عەینزاریش گەڕاوە لای تیقمووسپاشا و ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە. تیقمووسپاشا کەیفی ســاز بوو، پیرۆزبایی لە وەزیر کرد و فەرمووی تەپڵی ســەرکەوتن لێ دەن. پاشــان سۆراخی سوار و پێرەوەکانیان گرت، دووسەد کەس کوژرابوون.

کەفیدپاشــاش ســوپایەکی زۆر و زەوەندی کۆ کردەوە و هاتنەوە گۆڕەپان. ســوپایەکی پــازدەڕیزی کە هەر ڕیزێکی دەهەزار ســـوار بوو، وەک دیوار لە گۆڕەپـانی شـــەڕدا ڕاوەستابوو. سێسەد کەس لە پاڵەوانان هەر فیلسوار بوون. تیقمووسپاشاش سوپاکەی لە دە ڕیزدا ڕووبەڕووی دژمن تەکووز کردبوو کە هەر ڕیزەی دەهەزار سوار بوون. سەد سوار لە پاڵەوانان لە لای ڕاست و چەپییەوە دەڕۆیشتن.

که سـوپاکان ڕووبەڕووی یەک ڕێک خران، سـوارە چالاک و نەترس و بە ناوبانگەکان لە هەردووک لا بۆ یەک چوونە بەرەوە. سوارەکانی دوو سوپا پێکیاندا دا و دەنگی تەپڵ و دووزەلە لە هەردووک لا بەرز بووەوە و تۆز بەری ئاسمانی گرت. هەر لە بەری بەیانییەوە هەتا تاریکان ئەو دوو سـوپایە لێکیان دا و ملەیان کرد. کە تاریک بوو، لە یەک جویێ بوونەوە و هەر کەسەی گەڕاوە بۆ هوردووەکەی خۆی.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و شازدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! کاتێک کەفیدپاشا سەرژمێرییەکی سوپاکەی کرد و دیتی پێنجهەزار کەسیان لێ کوژراوە. بە جارێک توورە بوو.

بەڵام تیقمووسپاشا کە سەرژمێریی سوپاکەی کرد، سێهەزار کەسیان لێ کوژرابوو. بۆ ڕۆژی دواییش کەفیدپاشا کە هاتەوە بەرەی شەڕ، هەر ئەو کارەی کرد کە ڕۆژی پێشوو کردبووی. هەر لایەنەی پێداگریی لە سەرکەوتنی خۆیان دەکرد.

کەفیدپاشا لە لای خۆیانەوە هەرای لە سوپاکەی کرد و گوتی: 'ئەرێ سوارینە، کەسی وامان تێدایە بڕواتە پێشێ و ڕچەمان بۆ بشکێنێ؟' لەپڕدا لاوێکی فیلسوار بە ناوی بەرکیک لە فیلکەی دابەزی و هات لەبەردەمی سوپاکەی خۆیان و کەفیدپاشادا کڕنۆشی برد و ڕوخسەتی خواست. ئینجا هەستا و سواری فیلەکەی بوو. بەرەو بەرەی شەڕ چوو. لە دوورەوە نەڕاندی: 'کێ هەیە بۆم بێتە پێشێ؟ کێ هەیە بوێرێ شان لە شانم دا؟

تیقمووسپاشا کە ئەوەی بینی و شەڕخوازیی ئەو پاڵەوانەی دیت، ڕووی لە سوپاکەی کرد و گوتی: 'پاڵەوانان، کێ لە خۆی ڕادەبینێ بۆی بڕواتە پێشێ و سەربەرزمان بکا؟' لاوێک لەنێو سوپاکە هاتە دەرێ، ئەسپێکی کێواسای لەژێردا بوو. هات گەیشتە لای تیقمووسپاشا و دابەزی، کڕنۆشی برد و ڕوخسەتی خواست، بۆی بڕواتە پێشێ. ئێنجا سوار بووەوە، ڕووی لە بەرکیک کرد. بەرکیک کە ئەو لاوەی دیت، گوتی: 'ئەتۆ کێی ئابڕووی من دەبەی و بۆم هاتوویە پێشێ؟ بڕۆوە کەسێکی وا بنێرن کە هاوشانی من بێ. ناوت چییە، گولەپیاو؟' لاوەکە گوتی: 'ناوم غەزەنفەرە.' بەرکیک گوتی: 'ناوی تۆم لە شاری خۆشمان بیستبوو، بەڵام جا ئەتۆ چی ت و شەڕی پاڵەوانانەی ئاوا چی؟' غەزەنفەر کە بەو وتانە زۆر توورە بوو، ڕقی هەستا و ڕمبەکەی لەژێر ڕانی دەرکێشا. بەرکیکیش شیرەکەی بە دەستییەوە بوو. شەڕێکی قورس لەنێوانیاندا سەری هەڵدا. بەرکیک شیرێکی داهێنایەوە، چی وای نەما لایەکی غەزەنفەر ڕامالێ، بەڵام باش ڕزگاری بوو. ئێنجا غەزەنفەر ڕمبێکی وای هاویشتێ کە بەر و پشتی ئەمدیواودیو کرد و خستییە زەوی.

ئەوجار یەکی دیکەی هاتە گۆڕەپان و بە غەزەنفەری گوت: 'ئەتۆ کێی تا برای من بکووژی؟' هەر وای گوت و تیرێکی گرتە غەزنەفەر. ئەو تیرە زرێکەی بڕی و گەیشتە ڕانی غەزنەفەر. غەزنەفەر کە ئەوەی دیت، تیرەکەی دەرکێشایەوە و، بە شیرەوە ڕایسایە و هەر یەکەم شیر لە ناوقەدەوە دوولەتی کرد. دوای ئەوە غەزنەفەر گەڕاوە لای تیقمووسپاشا.

کاتێک کەفیدپاشا ئەوەی دیت، دەنگی سوپاکەی دا: 'دا پێیاندا دەن و تۆڵەی خوێنی

هاوڕێکانتان بکەنەوە.' تیقمووس‌پاشـــاش کە زانی هێرشـــی گشـــتی دێنن، فەرمانی بە سـوپاکەی دا بەرەنگاریان ببنەوە. شـەڕێکی سـەخت و خوێناوی هاتە ئاراوە. ئەسـپەکان دەیانحیلاند و پیاوەکان پەلاماری یەکتریان دەدا. بریقەبریقی شـــیر و هاوار و گوڕە و حیلەی ئەســـپ دنیای پڕ کردبوو. هەر جارەی لایەک لایەکی دیکەی هەڵدەبڕی و دەنگی دەهۆڵ و زووڕنای بەرز دەبووەوە. ئەوەندەی پێ نەدەچوو لێیان وە دەست دەهاتن و ئەو جار ئەوان ئەوانیان ڕاو دەنا و دەنگی تەپڵ و دووزەلەی ئەمیان بەرز دەبووەوە. بەو جۆرە تا ڕۆژئاوابوون گۆرەپانی شەڕ گەرم بوو و خوێن لە بەر پێیان هەر جلقەی دەهات. ئەسپ و فیل و شـــەرکەڕان هەتا ئەژنۆیان لە خوێندا بوو. کاتێک ڕۆژ ئاوا بوو، هیچ لایەک هێز و بڕستی شەڕی نەما؛ هەردووک لا گەڕانەوە بۆ هوردووی خۆیان.

تیقمووس‌پاشا سەرژمێریی سوپاکەی کرد، پێنج‌هەزار کەس لە پاڵەوانەکانی کوژرابوون. بەڵام لە سـوپاکەی دی کەفیدپاشـا سـەیری کرد، شـەش‌هەزار کەسـی کوژراوە. هەتا سێ ڕۆژان شـەڕ لەنێوانیان ڕاوەسـتا. دوای ئەوە کەفیدپاشـا نامەیەکی بۆ فاقوون پاشـا ناوێک نووســـی و بە ڕاســـپاردەیەکدا ناردی. کەفیدپاشـــا لە نامەکەدا ئاماژەی بەوە کردبوو کە فاقوون لە دایکەوە خزمێتی. کاتێک نامەبەرەکە نامەکەی گەیاندە فاقوون و، ئەویش زانی بابەتی نامەکە چییە، خێرا سوپایەکی گەورەی پێکەوە نا و ناردی بۆ یارمەتی کەفیدپاشا.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی پێنجسەد و حەڤدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! ئەو دەمەی تیقمووسپاشا بە دڵی شادەوە دانیشتبوو، کەسێک هات و گوتی: 'گەورەم، تەپوتۆزێک لە دوور دیارە.' تیقمووسپاشا خێرا چەند کەسی نارد بزانن چ باســـە. چەند کەســـەکە گورج چوون و گەڕانەوە، گوتیان: 'قوربان، حەوت بەیداخ لە تۆزەکەدا دەرکەوتن. هەر بەیداخەی ســـێهەزار باڵبازی لە ژێردا بوون و دەچوون بۆ لای کەفیدپاشا.'

پاشا فاقوون گەیشتە لای کەفیدپاشا و سڵاوی لێ کرد و لێی پرسی: 'ئەرێ ئەمە چییە و ئەم شـــەڕە لە پێناوی چییە؟' کەفیدپاشـــا گوتی: 'ئەی مەگەر نازانی کە تیقمووسپاشـــای دژمنی من و باوباپیرانم لە ئێمەی کوشـــتووە؟ منیش هاتووم تۆڵەی لێ بســـتێنمەوە و لمبۆزی لە عەرز دەم.' پاشا فاقوون گوتی: 'خۆزە ئەمەت لێ پیرۆز کا!' ئەوجار کەفیدپاشا دەستی پاشا فاقوونی گرت و بردییە تاوڵەکەی خۆیەوە. کاری تیقمووسپاشا و کەفیدپاشا بێرە گەیشت.

شازادە جانشا کە دوو مانگ بوو باوکی خۆی نەدیبوو زۆر نیگەران بوو، لە کەنیزەکانی پرســـی: 'ئەرێ ئەوە باوکم چی لێ قەوماوە وا دوو مانگە دیار نییە و ســـەری لێ نەداوم؟' ئەوانیش ڕووداوەکەیان بۆ گێڕاوە. جانشـا بە پەلە داوای ئەسـپەکەی خۆی کرد تا بچێ بۆ لای باوکی. کە ئەســـپیان هێنا، بە خۆی گوت: 'ئێســـتا من بۆخۆم گێرەوکێشـــەم زۆرە و واباشە بڕۆم بۆ شاری جوولەکان وە دوای کاروباری خۆم کەوم. ، بەشکو ئەو بازرگانەی لەوێ منی بە کرێ گرت، دیســـان بە کرێم بگرێتەوە و لەو ڕێگەوە بە ئامانجم بگەم.' ئینجا ســـوار بوو و لەگەڵ هەزار کەســـدا وەڕێ کەوت. خەڵکی وایان دەزانی دەچێ بۆ یارمەتی باوکی. تا زەردەپەڕ ڕۆیشـتن. وا بوو گەیشـتنە مێرگوزارێکی بەربڵا و لەوێ باریان خست و لێی خەوتن. کە دانێکی شەو ڕۆیشت و جانشا زانی تەواوی سوپاکە نووستوون، گورج رابوو، ســـوار بوو و بەرەو بەغدا وەڕێ کەوت. مەمنا لە کابرای جوولەکەی بیســـتبوو کە ساڵی کەرەتێک لە بەغداوە کاروان بەرەو لای ئەوان دێ، بە خۆی گوت: 'هەر کە گەیشتمە بەغدا، ڕەگەڵ کاروانەکە دەکەوم تا بگەمە شـــاری جوولەکان.' بەم هیوا و ئاواتەوە ملی ڕێیەی گرت و ڕۆیشـــت. باڵبازەکان کە خەبەریان بووەوە، تەماشـــا دەکەن جانشـــا و ئەسـپەکەی لە هیچ کوێ دیار نین. دەمودەســـت ســـوار بوون، ئەملاوئەولایان لێ کرد، هیچ هەواڵێکی نەبوو. چوون بۆ لای تیقمووسپاشـا و ڕووداوەکەیان بۆ گێڕاوە. پاشا ئەوەندەی دیش نـاڕەحەت بوو. تـاجەکەی بە زەویدا دا و بە دەنگێکی بەرز لە قوڵپەی گریـانی دا و گوتی: 'لە ڕۆژێکی وادا کە دژمن ڕووبەڕوومە، کوڕەکەم ون بووە!' وەزیرەکان پێیان گوت:

'ئەی پاشای جیهان، دان بە خۆدا بگرە.' پاشان تیقمووسپاشا فەرمانی دا سوپا بگەڕێتەوە. سوپا پشتی لە شەڕگە کرد و بەرەو شاری خۆیان گەڕانەوە. دەروازەکانی شاریان گاڵە دا و لە بورجەکانیاندا دامەزران. کەفیدپاشـــا مانگی جارێک دەهات دەوری شـــارەکەی تیقمووسپاشـای دەدا و، شـەو و ڕۆژ لە بەر دەروازەی قەڵادا دەمانەوە. تا وای لێ دەهات ماندوو دەبوون و دەگەڕانەوە بۆ ناو تاوڵەکانی خۆیان تا سـەرلەنوێ خۆیان تەیار کەنەوە و برینداره‌کانیان تیمار بکەن. خەڵکی شـــارەکەی تیقمووسپاشـــاش کە ســـوپای دژمن دەکشـــانەوە، چەک و چۆڵی خۆیـان ســـاز و تەیـار دەکردەوە و بورجەکانیـان نۆژەن دەکردەوە. ـــ بە کورتی، ئەو شەڕ و ململانێیەی تیقمووسپاشا و کەفیدپاشا حەوت ساڵی خایاند.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی پێنسەد و هەژدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! جانشا سەری خۆی هەڵگرت و لە شاخوکێو و دەشتودەری دا. تووشی هەرکەس دەبوو، هەواڵی قەڵای گەوهەرنگینی دەپرسی. کەس هیچ هەواڵ و نیشانێکی لێ نەدەزانی و دەیانگوت: 'هەرگیز ناوی وامان نەبیستووە.' ئەوجار لە بارەی شاری جوولەکانەوە پرسی. کابرایەکی بازرگان پێی گوت کە شاری جوولەکان لە بەری ولاتانی ڕۆژهەلاتەوەیە و ئەگەر پێت خۆشە ئەم مانگەی دادێ لەگەڵ ئێمە وەرە بۆ شاری مەرزەقان و لەوێوە دەچینە خۆراسان و شاری شەمعوون، ئەوێ لە شاری جوولەکاکەنەوە نیزیکە.' جانشا خۆشحاڵ بوو، دانی بە خۆیدا گرت تا کاتی سەفەری کاروانەکە هات. جانشاش لەگەڵیان کەوت و چوو بۆ شاری مەرزەقان. لەوێشەوە ڕۆیشت ڕۆیشت تا گەیشتە خۆراسان و شاری شەمعوون، لەوێ پرسیاری کرد، شاری جوولەکان لە کام لاوەیە، ناونیشانیان دایە. جانشا وەڕێ کەوت. شەو و ڕۆژی لەسەریەک کردەوە هەتا گەیشتە رووبارێک کە لە تەنیشت شاری جوولەکانەوە بوو، لە گوێی ئەو رووبارە دانیشت. لەوێ بوو، هەتا ڕۆژی شەممە کە ئەو ئەو رووبارە بە هێزی هێزداری مەزن وشک بوو. ئیدی جانشا لە رووبارەکە پەڕییەوە و چوو بۆ ماڵی ئەو کابرا جوووەی کەڕەتی پێشوو چووبووە کنی. ئەو جووە و ماڵ و منداڵەکەی سڵاویان لێ کرد و بەخێرهاتنیان کرد. خواردن و خواردنەوەیان بۆ هێنا و گوتیان: 'ئەم ماوەیەی ون بووی، لە کوێ بووی؟' جانشا گوتی: 'جا وەڵا بڵێم لە کوێ بووم، لەسەر زەوی خودا بووم.' ئەو شەوە لای ئەوان ڕۆژی کردەوە. بەری بەیان هەستا. بە شاردا گەڕا و جارچییەکی دی، جاڕی دەدا: 'کێ دەیەوێ تا نیوەڕۆ کار بکا و هەزار دینار و کەنیزێکی جوانکیلەی وەگیر کەوێ؟' جانشا گوتی: 'من ئەو کارە دەکەم.' جاڕچی گوتی: 'دوام کەوە.' بردییە لای بازرگانێک، بازرگان سڵاوی لە جانشا کرد و بردییە ژوورەوە. خواردن و خواردنەوەیان بۆ دانا. جانشا خواردی و خواردیەوە. دوایە بازرگان زێڕەکان و کەنیزەکێکی بۆ هێنا. جانشا زێڕەکانی لێ وەرگرت و ئەو شەوەی لەگەڵ کەنیزەکەدا ڕابوارد. کە ڕۆژ بووەوە، بازرگان و جانشا هەرکەسەی سواری هێسترێک بوون، ڕۆیشتن ڕۆیشتن تا گەیشتنە کێوێک. بازرگان کێردێک و گوریسێکی دا بە جانشا و هێسترەی بەستەوە و سەری بڕی.

دوای ئەوە بازرگان گوتی: 'ئێستا ورگی هەڵدڕە و بچۆ ناوی. من دەیدرووومەوە. جا هەرچیت بینی بۆمی بگێڕەوە.' ئیدی جانشا چووە نێو ورگی هێسترەکەوە. بازرگانەکەش درووییەوە و چوو لەو لاوە لە پەنایەکدا خۆی حەشار دا. دوای ماوەیەک باڵندەیەک لە ئاسمانەوە ڕۆی هاتێ و کەلاکەی ڕفاند و بەرزی کردەوە بۆ هەوا. چوو لەسەر لووتکەی کێوەکە نیشتەوە. گەرەکی بوو کەلاکە بخوات. جانشا ورگی کەلاکەکەی هەڵدڕی و هاتە

دەرێ، باڵندەکە لە ترسان، سڵەمییەوە و هەڵفڕی. جانشا کە تەماشای کرد، لەسەر لووتکەی کێوێکە. ســـەیری خوارێی کرد. بازرگانی لە بناری کێوەکەدا دیت. هەرای کردێ و گوتی: 'دەی ئێستا چ بکەم؟' بازرگان گوتی: 'لەو بەردانەی ئەوێم بۆ بەر دەوە با ڕێی هاتنەخوارێت نیشـــان دەم.' جانشـــا گوتی: 'مەگەر تۆ هەر ئەو کابرایەی پێنج ســـاڵ لەمەو پێش نییت کە نیازی لەنێوبردنی منت بوو؟ قەســـــەم بە خودا هیچت بۆ بەر نادەمەوە.' ئیدی ملی ڕێیەی گرت و بەو ڕێگەدا ڕۆیشت کە دەچووە لای شێخ نەسر.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی پێنجسەد و نۆزدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! جانشا شەو و ڕۆژ بەڕیوە بوو تا گەیشتە کۆشکی سولەیمان. شیخ نەسری دیت، لە بەر دەرگای کۆشک دانیشتبوو. چووە پێشێ و سڵاوی لێ کرد و دەستی ماچ کرد. شێخ گوتی: 'ڕۆڵە گیان، ئەوە چۆنە دیسان ڕێت لێرە کەوتووەتەوە خۆ من تۆم لەگەڵ خاتوو شەمسەدا بە دڵێکی خۆشەوە بەڕێ کردەوە؟' جانشا هەر کە ناوی خاتوو شەمسەی بیست، لە قوڵپی گریانی دا و بەسەرهاتی خۆی بۆ شێخ نەسر گێڕاوە کە خاتوو شەمسە بەر لەوەی بفڕێت پێی گوتووە: 'گەر منت خۆش دەوێ، دەبێ بێی بۆ لام لە قەڵای گەوهەرنگین.' شێخ نەسر سەری لەم قسە و لەم کارە سووڕ ما، گوتی: 'ڕۆڵە گیان، بەو خودایەی خودایەتی دەکا، من نازانم قەڵای گەوهەرنگین لە کوێیە، قەتیشم نەبیستووە.' جانشا گوتی: 'دەی ئێستا من دەبێ چی بکەم لە تاوان خەریکە گیانم دەرچێ و شێت بم؟' شێخ گوتی: 'لێرە بە و دان بە خۆتدا بگرە تا دیسان باڵندەکان دێنەوە و من هەواڵی قەڵای گەوهەرنگینیان لێ دەپرسم. بەشکو یەکێکیان پێی بزانێ.' ئیدی جانشا هێور بووەوە و چووە کۆشکەوە، تا درەنگانێک لای شێخ ماوە. بە ڕۆژدا دەچووە ئەو هۆدەوە کە باخ و ئاوەکەی لێ بوو و کچۆڵەکانی لەوێ دیبوو، بۆخۆی لەوێ پیاسەی دەکرد.

ڕۆژێک هەر وەک ڕۆژانی پێشوو کە دەهاتە لای شێخ نەسر دادەنیشت، لەوێ دانیشتبوو، شێخ نەسر گوتی: 'ڕۆڵە گیان، کاتی هاتنەوەی باڵندەکان نیزیک بووەتەوە.' جانشا ئەو هەواڵەی پێ خۆش بوو. چەند ڕۆژ ڕەد نەبووبوو کە باڵندەکان پەیدا بوون. شێخ نەسر هاتە کن جانشا و گوتی: 'ڕۆڵە، ئەم ناوانەت بیر بمێنێ و بەخێرهاتنی باڵندەکان بکە.' جا کە باڵندەکان گەیشتنێ، دەستەدەستە سڵاویان لە شێخ نەسر کرد، شێخیش پرسیاریی قەڵای گەوهەرنگینی لێ کردن. کەچی هەموو گوتیان: 'لەوەتی هەین ناوی ئەم قەڵایەمان نەبیستووە!' جانشا کە ئەوەی بیست، لە پرمەی گریانی دا و لە بەردم شێخ لە هۆش خۆی چوو. دوایە شێخ نەسر باڵندەیەکی زلی بانگ کرد و پێی گوت: 'ئەم لاوەم بۆ بگەیەنە شاری کابوول.' شێخ نەسر ناونیشانی ڕێی کابوولی دا بە باڵندەکە. باڵندەکە جانشای هەڵگرت و پێی گوت: 'ئاگات لە خۆت بێ و توند خۆت بگرە. گوێت باخنە تا دەنگی جووڵەی ئاسمانەکان و شەپۆلەی پێلی دەریاکان زیانت پێ نەگەیەنن.' ئەوجار باڵندەکە هەڵفڕی. شەو و ڕۆژێک یەک تەکان ڕۆیشت. دوای ئەوە لای پاشای هۆڤییان کە ناوی شابەدری بوو، نیشت و بە جانشای گوت: 'ڕێمان گوم کردووە.'

دوایە ویستی جانشا هەڵگرێ و دیسان بفڕێ، جانشا گوتی: 'ئێستا کە ڕێت گوم کردووە، لێرە بەجێم بێڵە و برۆ بە دوای کاری خۆتدا با من لێرە بە کەنەفتی بمرم.' وا بوو

باڵندەکە ئەوی لە لای شـابەدری دانا، وە دوای کاری خۆی کەوت. شـابەدری لە جانشـای پرســـــی: 'ڕۆڵە، تۆ کێی و لەگەڵ ئەم باڵندە زلەدا لە کوێوە هاتووی و چیت لێ قەوماوە؟' جانشا بەسەرهاتی خۆی مووبەموو بۆ گێڕاوە. پاشای هۆڤییان سەری سووڕ ما و گوتی: 'بە حەققانیەتی سولەیمان–سلاوی خودای لێ بێ–منیش نازانم ئەو قەڵایە لە کوێیە و ناویم هەر نەبیسـتووە! بەڵام هەرکەس بە شـوێنی ئەو قەڵایە بزانێ، شـەرت بێ، دەینێرم لەگەڵت بێ بۆ ئەوێ.' دوای ئەوە جانشـا دەسـتی کرد بە گریان. چەند ڕۆژێک لەوێ دانی بەخۆیدا گرت. پاشی ئەوە شابەدریی پاشای هۆڤییان هاتە لای و گوتی: 'ڕۆڵە گیان، ها ئەو وەرانە[1] بگرە و هەر چییەکیان تێدا نووســـراوە لە بەری کە. هەر کاتێ هۆڤییان هاتن، نیشـــانی ئەو قەڵایەشیان لێ دەپرسم.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. وەر: تەتەڵە، تەختە و بەردێک کە شتی لەسەر نووسراوە.

## که شەوی پێنجسەد و بیستەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! وا بوو ئەوەندەی پێ نەچوو، هۆڤییان پۆلپۆل هاتن. شـــابەدری هەواڵی قەڵای گەوهەرنگینی لێ پرسین. هەموو گوتیان: 'ئێمە نێویمان نەبیستووە و نازانین لە کوێیە.' جانشـا لە قوڵپی گریانی دا. پاشـای هۆڤییان گوتی: 'ڕۆڵە گیان، خەم مەخۆ، من برایەکەم لە خۆم گەورەتر هەیە، ناوی شـەماخپاشـا، لەبەر ئەوەی کەسـێکی سـەرەڕۆ و لاسار بوو، حەزرەتی سولەیمان خستبوویە کۆیلەوە. جا لەنێو جندۆکە و پەریاندا کەسـی لەو گەورەتر نەبوو. ڕەنگە ئەو بە شوێنی ئەو قەڵایە بزانێ ئاخر ڕەگەزی جندۆکە و پەری لە ژێر دەسەڵاتی ئەودا بوون.

دوایی پاشـای هۆڤییان جانشـای سـواری کۆڵی یەکێک لە هۆڤییان کرد و کاغەزێکی بۆ براکەی نووسـی و، جانشـای بەو سـپارد. ئەو هۆڤییە دەمودەسـت وەڕێ کەوت، تا لای شـەماخپاشا نەوەستا. لەوێ لە شـوێنێکی دوور لە شـەماخپاشـاوە وەسـتا، جانشا لە کۆڵی هاتە خوارێ و بە پێیان ڕۆیشت ڕۆیشت تا گەیشتە هەنتەشی شەماخپاشا. دەستی ماچ کرد و کاغەزەکەی شـابەدریی داێ. کە شـەماخپاشا کاغەزەکەی خوێندەوە، تێگەیشت چ باسە، بە جانشـای گوت: 'ڕۆڵە گیان، گومانم لەوە نییە کە سـولەیمان—سـڵاوی خودای لێ بێ—لە ژیانی خۆیدا ناوی ئەم قەڵایەی بیسـتووە یان بینیوێ، بەڵام کوڕی خۆم، من خوداناسـێک دەنـاسـم لەم کێوەدایە؛ زۆر بەتەمەنە و هەرچی باڵندە و هۆڤی و جندۆکە هەن لەژێر فەرمانی ئەودان، هەر بۆیە بەردەوام دۆعای پایەداربوون و مانەوە بۆ پاشـایانی جنۆکە دەخوێنێ و ئەوانی لە ودمی ئەو دۆعایانەوە هێناوەتە ژێر بار و من هەر لە سـەرەتای کارەوە سـەرپێچی سـولەیمانم دەکرد، ئەو دیلی کردم، بەڵام ئەگەر بە هۆی فڕوفێڵی ئەم خوداناسـەوە نەبووبا، قەت نەیدەتوانی بەسـەرمدا زاڵ بێ؛ لە ودمی دۆعاکانی ئەوەوە دەستی پێم گەیشت. جا ئەوە بزانە کە ئەم خوداناسە بە هەموو وڵاتان و هەرێماندا گەڕاوە، گشت شوێن و قەڵا و ڕێگە و شارەکان دەزانێ. گومانم هەیە شوێن هەبێ و ئەو نەیزانێ. جا ئێسـتا دەتنێرمە کنی، ڕەنگە بتوانێ ناونیشـانی ئەو قەڵایەت بداتێ. ئیدی ئەگەر ئەو نەزانێ، هیچکەسی دیکە نازانێ، چونکە ئەو خوداناسـە، باڵندە و هۆڤی و جنۆکانی هێناوەتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. ئەو خوداناسە لە هەموو سیحرێک شارەزایە. گۆچانێکی پێیە سێ لکی لێ بووەتەوە. کە گۆچانەکەی لە زەوی دەچەقێنێ و دۆعا بەسـەر لکی یەکەمیاندا دەخوێنێ، گۆشـت و خوێنی لێ دێتە دەرێ. کە دۆعا بەسـەر لکی دووەمیاندا دەخوێنێ، شـیری خواردنەوەی لێ دێ. کە دۆعا بەسـەر لکی سـێیەمدا دەخوێنێ، لەویشـە گەنم و جۆ دێتە دەرێ. ئینجا ئەو خوداناسـە دێرێکی هەیە، پێی دەڵێن دێری ئەڵماس و خۆشـی ناوی یەغمووسـە. جا دۆعا نییە لە بەری نەبێ. بۆیە ناچارم تۆ بە باڵندەیەکی گەورەدا کە چوار

باڵی هەیە، بنێرمە لای ئەو.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی پێنج‌سەد و بیست و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! جا ئەوجار باڵندەی چوارباڵ کە درێژیی هەر باڵێکی سی باڵ بوو، جانشای سوار کرد، قاچەکانی هێندە زل بوون لە گوێن پێی فیل و تەنیا ساڵی دوو جار دەفڕی. شەماخ‌پاشا دێوێکی هەبوو، ناوی تەمسوون بوو، هەموو ڕۆژێ دەچوو لە عێراق دوو هێستری دەڕفاند و دەیهانەوە کوت‌کوتی دەکرد، بەیانی و ئێواران دەرخواردی ئەو باڵندەیەی دەدا.

جانشا سواری کۆڵی ئەو باڵندەیە بوو. شەماخ‌پاشا بەو باڵندەی گوت کە جانشا بگەیەنێتە لای یەغمووسی خوداناس. دەم‌ودەست باڵندەکە جانشای لە کۆڵ کرد و شەو و ڕۆژێک بەڕێوە بوو تا گەیشتە کێوی ئەرزیز و دێری ئەڵماس. ئەوجار جانشا دابەزی، یەغمووسی خوداناسی لە میحرابی دێرەکەدا دی کە خەریکی خواپەرستی بوو. ئیدی جانشا چووە پێشێ، کڕنۆشی برد و دەستی لەسەر سینگی دانا و ڕاوەستا. کە خوداناس ئەوی دی، گوتی: 'ڕۆڵەی هەڵوەدا و پەڕیوەی وڵاتان، پێم بڵێ بۆ هاتوویە ئێرە؟' جانشا بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕاوە.

کە خوداناسەکە چیرۆکی ئەوی بیست، گوتی: 'بەو خودای بانی سەر، بە هەموو عومرم ناوی ئەو قەڵایەم نەبیستووە! بەڵام کوڕی خۆم، خۆت ڕاگرە تا باڵندە و هۆڤی و خێڵی جنۆکان دێن، لەوان دەپرسم. بەڵکو ئەمە خودایە یەکێکیان بە هەواڵی ئەو قەڵایە بزانێ.' ئیدی جانشا ماوەیەکی زۆر لای خوداناسەکە ماوە هەتا وا بوو هۆڤی و باڵندە و خێڵی جنۆکان هاتن بۆ دێرەکە و دەستی خوداناسیان ماچ کرد. خوداناس پرسیاری قەڵای گەوهەرنگینی لێ کردن، کەچی تاقیان بە هەواڵی ئەو قەڵایەیان نەدەزانی و دەیانگوت: 'نەک هەر ئەم قەڵایەمان نەدیوە ناویشیمان نە بیستووە.

ئیدی جانشا دەستی کرد بە گریان. ئەوجار دوای ئەوانە باڵندەیەکی ڕەشی زەلامی دیکە هات؛ دەستی خوداناسی ماچ کرد. خوداناسیش پرسیاری قەڵای گەوهەرنگینی لێ کرد. ئەو باڵندەیە گوتی: 'قوربان، لەپشت کێوی قافەوە کێوی بلوورمان هەیە کە لەپشتی ئەویشەوە شوێنێک هەیە. جا من و براکانم بێچوو بووین، باوک و دایکمان ڕۆژانە دەچوون خۆراکیان بۆ دەهێناین. بە هەڵکەوت ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕۆیشتن و تا حەوت ڕۆژان نەهاتنەوە. زۆر زۆرمان برسی بوو. خودا کردی لە ڕۆژی هەشتەمدا هاتنەوە. لێمان پرسین: 'ئەرێ ئەوە لە کوێ بوون، بۆ نەدەهاتنەوە؟' گوتیان: 'وەڵا جنۆکەیەک ڕفاندینی، بردینی بۆ قەڵای گەوهەرنگین بۆ لای شەهلان‌شا. جا کاتێ شەهلان‌شا ویستی بمان کوژێ، پێمان گوت: 'لێمان خۆش ببە؛ منداڵمان بچووکە.' وا بوو شەهلان‌شا نەیکوشتین.' جا قوربان گیان،

ئەگەر باوک و دایکم زیندوو بایەن، شـــوێنی ئەو قەلایەیان پێ دەگوتی.' هەر کە جانشـــا ئەمەی بیســـت، بە کوڵ گریا و بە خوداناســـی گوت: 'تکات لێ دەکەم بەو باڵندەیە بفەرموو کە من بەرێتە ئەو هێلانەیەی کە دایک و باوکی ئوانیان تێدا پەروەدە کرد لە کێوی بلوور.' خوداناس بە باڵندەکەی گوت: 'هەســـتە کوێ دەڵێ بیبە و لە قســـە دەرمەچووە و هەر چی گوتی بە گوێی بکە.' باڵندەکە گوتی: 'هەرچی تۆ بیڵێیت، ســـەرم بۆی پێوە نییە.' ئیدی ئەوجار جانشـــای هەڵگرت، هەڵفڕی و شـەو و ڕۆژێک ڕۆیشـت تا گەیشـتە کێوی بلوور و لەوێ نیشتەوە. پاشان جانشای نایە کۆڵی، دیسان فڕی و تا دوو ڕۆژان هەر ڕۆیشت هەتا گەیشتنە ئەو خاکەی هێلانەکەی باوک و دایکی لێ بوو.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی پێنجسەد و بیست و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! باڵندەکە جانشای لە هێلانەکەی باوک و دایکیدا دابەزاند و پێی گوت: 'ئەمە ئەو خاک و ئاوەیە کە ئێمە لێ بووین.' جانشا تێر گریا و بە باڵندەکەی گوت: 'ئەوجار بمبە ئەو جێیە کە باوک و دایکت دەچوون لەوێ خۆراکتان بۆ بهێنن.' باڵندەکە گوتی: 'بەسەر هەردووک چاوم.'

ئیدی جانشای کردەوە کۆڵی، حەوت شەو و ڕۆژ فڕی تا لە ڕۆژی هەشتەمدا گەیشتە کێوێکی بەرز و هەڵەمووت و جانشای لە کۆڵی داگرت و پێی گوت: 'ئیدی لێرەوە بۆولاوە من شارەزای هیچ شوێنێکی دی نیم.' جانشا هەر لەو شوێنەدا نووست. کە وە ئاگا هاتەوە، ڕووناکییەکی لە دوورەوە دیت، پڕشنگەکەی دنیای گرتبووەوە. سەری لەو ڕووناکییە سوور ما و، نەیدەزانی کە ئەو درەوشانەوەیە پڕشنگی ئەو قەڵایەیە وا بەدوایدا وێڵ و سەرگەردان بووە. نێوانی جانشا و ئەو قەڵایە دوو مانگەڕێ بوو. ئەو قەڵایەیان لە یاقووتی سوور چێ کردبوو و خانووەکانی نێوی لە زێڕی سوور بوون. ئەو قەڵایە هەزار بورجی هەبوو کە لە گەوهەری جۆراوجۆر بینا کرابوون، هەر لەبەر ئەوە ناوی قەڵای گەوهەرنگینیان لێ نابوو. قەڵایەکی تا بڵێی گەورە بوو و پاشاکەی ناوی شەهلان بوو، ئەو باوکی کچە گۆرینەکان بوو. جانشا، کاری بێرە گەیشت.

خاتوو شەمسە کە لە لای جانشاوە گەڕاوە، چووەوە کن دایک و باوک و خزمانی و بەسەرهاتی خۆی و جانشای بۆ گێڕانەوە. باسی ئەوەی کرد کە جانشا تەواوی دونیا گەڕاوە و گەلێک شتی سەیروسەمەرەی بینیوە. کە دایک و باوکی ئەم قسانەیان لێ بیست، پێیان گوت: 'ڕۆڵە گیان ڕەوا نییە ئەوەندەی ئازار بدەی.' ئەوجار باوکی خاتوو شەمسە ئەم بەسەرهاتەی بۆ خزمەتکارە نڕناشەکانی[1] کە لە هۆزی جان بوون گێڕاوە. پێی گوتن: 'هەر کامێکتان مرۆیەکی بینی، بیهێنێتە لامان.' خاتوو شەمسەش بە دایکی گوتبوو: کە جانشا خۆشی دەوێم. هەرچۆنێک بێت، بەدوامدا دێ. ئینجا کاتێک فڕیمە سەر کۆشکەکە، پێم گوت: 'گەر بە ڕاستی عاشق بی، دێی بۆ لام بۆ قەڵای گەوهەرنگین.

کورتی کەینەوە، جانشا کە ئەو پڕشنگەی دی، دڵی هاتە سەر ئەوەی بەرەو ئەوێ بڕوا تا بزانێ ئەوە چییە. لەو دەمەیدا خاتوو شەمسەش یەکێک لە نڕناشەکانی ناردبوو بۆ کێوی قەرمووس ناردبوو کارێکی بۆ جێبەجێ بکا. جا ئەو نڕناشە بەرەو کێوی قەرمووس دەچوو کە لە دوورەوە چاوی بە مرۆیەک کەوت. ڕووی تێ کرد و سڵاوی لێ کرد. جانشا زیرەی کرد، بەڵام وەڵامی سڵاوەکەی داوە. نڕناشەکە لێی پرسی: 'ناوت چییە؟' جانشا گوتی: 'ناوم

---

[1]. نڕناش: عیفریت.

جانشـایە. ئەڤیندارم و لە سـوێی پەریزادێک بە ناوی خاتوو شـەمسـە هەڵوەدا و شـێت و شـەیدا بووم. دوای ئەوەی بردمە کۆشـکەکەی باوکم، ڕۆیشـت و بە جێی هێشـتم.' ئیدی ئەوەی لەگەڵ خاتوو شـەمسـەدا بەسـەری هاتبوو، هەمووی موو بە موو بۆ نڕناشـەکە گێڕاوە و گریا.

کە نڕناشـەکە گریانی جانشـای دی، دڵی بۆی سـووتا و پێی گوت: 'واز لە گریان بێنە. ئەوە بە مرازی دڵی خۆت گەیشتی. خاتوو شەمسەیش تۆی زۆر خۆش دەوێ و دایکیشی لەو خۆشـەویستییەی ئاگادار کردووەتەوە، هەرچی لە قەڵای گەوهەرنگیندایە لەبەر خاتری ئەوە تۆیان خۆش دەوێ. دەی باشـە ئیدی چیت دەوێ لەوە خۆشـتر.' ئەوجار نڕناشـەکە جانشـای کردە کۆڵی و ڕۆیشـت تا گەیشـتە قەڵای گەوهەرنگین. مژدەدەران بەرەو شـەهلانشـا و خاتوو شـەمسـە و دایکی تێیان تەقاند و داوای مزگێنییان کرد. لەڕادەبەدەر خۆشحاڵ بوون. ئیدی شەهلانشا لەگەڵ دەستەیەک لە نڕناش و جنۆکان سوار بوو و بە پیری جانشاوە چوون.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی پێنجسەد و بیست و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! کاتێک شەهلانشا گەیشتە لای جانشا، جانشای لە باوەشی گرت. جانشاش دەستی ئەوی ماچ کرد. شەهلاششاش کەوایەکی ئاتەگ زێڕینی بە شانیدا دا و تاجێکی وای لە سەری نا کە هیچ پادشایەک تاجی ئاوای نەبوو. ئەسپێکیشیان لە ڕەوە ئەسپی پاشاکانی هۆزی جان بۆ هێنا. جانشا سواری ئەو ئەسپە بوو. نرناشەکانیش سوار بوون و لە ڕاست و چەپییەوە دەڕۆیشتن و لەگەڵ شەهلانشا قسەیان دەکرد و دەڕۆیشتن هەتا گەیشتنە کۆشک. پادشا دابەزی و جانشاش هەر لەوێ دابەزی. جانشا سەیر کرد ئەو کۆشکە کۆشکێکی زۆر خۆشە و تەواوی دارودیوارەکەی لە گەوهەر و یاقووت ڕۆ نراوە. زەوی حەوشەکەش لە جیاتی بەردی ڕوخام و مەڕمەڕ؛ بلوور و بەرزەڕینە و زمڕوودیان تێ گرتووە. جانشا بە بینینی ئەوانە حەپەسا و فرمێسکی هاتە خوارێ. پاشا و دایکی خاتوو شەمسە فرمێسکەکانیان بۆ سڕی و پێیان گوت: 'باشە ئیدی، خۆت نارەحەت مەکە تازە ئەوە بە مرازی خۆت گەیشتی.' کە جانشا گەیشتە نێو کۆشک، کۆیلە و کەنیز و خزمەتکاری بە پیریانەوە هاتن. بردیانن لە شوێنێکی شیاو دایان نان و لە خزمەتیاندا ڕاوەستان. شەهلانشا گەڕاوە بۆ شوێنەکەی خۆی. بە کۆیلە و کەنیزانی گوت، جانشا ببەنە هەنتەشی. جانشایان بردە لای. پاشا لە بەری هەستا و ئەوی لەسەر تەختەکەی لەپاڵ خۆیدا دانیشاند. ئەوجار سفرەیان ڕاخست. خواردن و خواردنەوەی جۆراوجۆریان خوارد و خواردەوە و دەستیان شوشت. دوایی دایکی خاتوو شەمسە هاتە لایان و سڵاوی لە جانشا کرد و بەخێرهاتنی کرد. دڵی خۆش کرد کە بە کامی دڵی گەیشتووە. خێرا گەڕاوە لای خاتوو شەمسەی کچی و هێنایە کن جانشا.

کە خاتوو شەمسە هاتە کن جانشا، سڵاوی لێ کرد و دەستی ماچ کرد و لەبەر ئەوەی خەجاڵەتی ئەو و باوک و دایکی ئەو بووبوو، سەری داخستبوو. ئینجا خوشکانی خاتوو شەمسە، ئەوانەی وا لە کۆشکی سولەیماندا لەگەڵی بوون، هاتن و دەستی جانشایان ماچ کرد. ئەوجار دایکی خاتوو شەمسە گوتی: 'ڕۆڵە گیان، شەمسەی کچم ناحەقیی لە تۆ کردووە. بەڵام تازە هەرچی بووە ڕابردووە، لەبەر خاتری ئێمەش بێ ئەوجار لێی خۆش بە.' کە جانشا ئەو قسەیەی لەو بیست، ئاخێکی توندی هەڵکێشا و بووڕایەوە. گوڵاویان هێنا و بەسەردا هەڵپرژاند تا وە خۆ هاتەوە. کە وە خۆ هاتەوە تەماشای خاتوو شەمسەی کرد و گوتی: 'سپاس بۆ ئەو خودایەی ئاواتی دڵمی وەدی هێنا و گڕی تاسەمی دامرکاند.' خاتوو شەمسە پێی گوت: 'جانشا گیان، یا خودا لە هەرچی ئاگرە بەدوور بی. دەی ئێستا دەمەوێ بەسەرهاتی خۆت لە ساتی دابڕانی منەوە بگێڕیەوە و پێم بڵێی چۆن گەشتیتە ئێرە لە کاتێکدا هیچ کەس ئەم قەلایە پێ نازانێ و ئێمە ملکەچی هیچ پاشایەکی سەر زەوی نین

و هیچ کەس ڕێی ئەم قەڵایە نازانێ.' ئیدی جانشـا بەسـەرهاتی خۆی بە وردی بۆ خاتوو شەمسە گێڕاوە و، ڕوداوی کێشەی باوکی و کەفیدپاشای بۆ باس کرد، ئەو هەموو سەختی و مەترسـییە سـەیروسـەمەرانەی لە ڕێدا تووشـی بووبوو، هەمووی بۆ گێڕاوە، بە خاتوو شـەمسـەی گوت: 'کچێ، من تەواوی ئەم سـەختییانەم لەبەر تۆ کێشـاوە.' دایکی خاتوو شـەمسـە گوتی: 'سـپاس بۆ ئەو خودایە کە بە ئاواتی دڵت گەیشـتی. ئەمە شـەمسـەیە و کەنیزی تۆیە و ئەوە ئەومان بە دیاری دایتێ.' دوایی دایکی خاتوو شـەمسـە پێی گوت: 'ئیشـەڵڵا مانگی داهاتوو ئاهەنگ دەگێڕین و کچەکەت لێ مارە دەکەین تا بیبەیتەوە بۆ شاری خۆتان، هەزار نڕناشت لەگەڵ دەنێرین کە ئەگەر ڕێ بە لاوازترینیان بدەیت، ئەوا لە چاوتروکانێکدا کەفیدپاشـا و سـوپاکەی دەپێچێتەوە. ئیجا هەر سـاڵێکیش خێڵێکی دی لە جنۆکان دەنێرینە لات کە ئەگەر بێتوو فەرمان بە یەکێکیان بدەیت دژمن لەناو ببات، ئەوا لە چرکەیەکدا تاقیان لێ ناهێڵێت.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی پێنجسەد و بیست و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! ئەوجار شەهلان‌شا لەسەر تەخت دانیشت و بە گەورەگەورەکانی دەوڵەتی گوت، شـــار برازێننەوە و تا حەوت ڕۆژ ئاهەنگێکی شـــادی بگێڕن. ئەوە بوو سـەرانی حوکوومەت کەوتنە سـازکردنی کاروباری ئاهەنگ و تا دوو مانگ سـەرقاڵی ئەوە بوون. دوای ئەوە ئاهەنگێکی گەورەیان گێڕا و سـفرەی شـادییان ڕازاندەوە و جانشـایان ناردە پەردەی خاتوو شـەمسـەوە، دوو سـاڵان لەگەڵ ئەودا بە عەیش و نۆش و خۆشـی و شـادی ڕایان بوارد. پاشـان بە خاتوو شـەمسـەی گوت: 'باوکت بەڵێنی دا بماننێرێتەوە بۆ شـارەکەی خۆمان وا بێ سـاڵێ لەوێ و سـاڵێ لەمێ بەسـەر بەرین.' خاتوو شـەمسـە لای شێو چووە کن بابی و ئەوەی جانشا پێی گوتبوو، بە بابی گوت. باوکی پێی گوت: 'بەسەر چاو. بەڵام تا سـەری مانگ دەبێ ڕاوەستن تا سوپایەک لە نڕناشـەکانتان بۆ کۆک و تەیار کەم.' خاتوو شـەمسـە قسـەکانی بابی بۆ جانشـا گێڕاوە. ئەو ماوەیەی کە پاشـا گوتبووی لەوێ دانیان بە خۆیاندا گرت. کە ماوەکە تەواو بوو، شـەهلان‌شـا بە نڕناشـەکانی گوت: 'لە خزمەتی خاتوو شـەمسـە و جانشـا بچن و بیانگەیەننەوە شـاری کابوول.' پاشـا تەختێکی گەورەی لە زێڕی سـوور بۆ چێ کردن کە بە گەوهەر ڕازێنرابووەوە و پـارچەیەکی ئاوریشـمی سـەوزیان بە سـەردا دابوو، لێوارەکانی بە گەوهەری گرانبایی چنرابوو بە جۆرێک ئاوی چاوی تەماشـاکەرانی دەبرد. وا بوو جانشـا و خاتوو شـەمسـە ماڵاواییان لە دایک و باوک و خوشک و کەس‌وکاریان کرد. شەهلان‌شاش تا نیوەی ڕێ بەڕێی کردن. لە لای نێوەڕۆدا، تەخت‌هەڵگران تەختەکەیان دانا و جانشا و خاتوو شەمسە لە تەختەکە هاتنە دەرێ، ماڵاواییان لە پاشـا کرد. شـەهلان‌شـا خاتوو شـەمسـەی بە جانشـا سـپارد و بە نڕناشـەکانیشـی گوت ئاگایان لە ودوانە بێ. ئەوجار تەختەکەیان هەڵگرت و ئەوان ڕۆیشـتن و پاشاش گەڕاوە. شەهلان‌شا سێ‌سەد کەنیزی دەلال و خوێنشیرینی بە خاتوو شەمسە و سێ‌سەد کۆیلەی لە وەچەی جندۆکانی بە جانشـا بەخشیبوو. کەنیز و کۆیلەکانیش لەسـەر تەختەکە دانیشـتن، نڕناشـەکان تەختیان هەڵگرت وە هەوا کەوتن و بەرەو شـاری کابوول ڕۆیشـــتن. هەر ڕۆژێک ڕێی ســـێ مانگیان دەبڕی و بەم جۆرە دە ڕۆژان بەڕێوە بوون. ڕۆژی یازدەیەم شـــاری کابوول وەدیار کەوت. لە ئاســـمانەوە بەرەو شـــارێکی گەورە داگەڕان. ئەو شارە شاری تیقمووس‌پاشا بوو.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و بیست و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! نرناشانی هەڵگری تەختەکە بەرەو شاری تیقمووسپاشا داگەڕان. لەو دەمەدا تیقمووسپاشا کەوتبووە تەنگانەوە و داوای ئەمانی لە کەفیدپاشا کرد. بەڵام کەفیدپاشا ئەمانی نەداین. جا کە تیقمووسپاشا زانی لە دەست کەفیدپاشا ڕزگاری نابێ و هیچ ڕێگا چارەیەکیش نییە، ویستی خۆی بکوژێت و لەو خەمە ڕزگاری ببێ. ماڵئاوایی لە وەزیر و فەرماندە و گەورەگەورەکانی دەوڵەت کرد. بۆ ماڵاوایی لە ژنەکانی چووە کۆشکەوە. خەڵکی وڵاتەکە لە بانگیان و دەستیان کرد بە شین و زاری و گەورە و بچووک و ژن و پیاو هەموو دەگریان لەو جەنگەیەدا نرناشەکان لە کۆشکدا نیشتنەوە، جانشا و خاتوو شەمسە و کەنیز و کۆیلەکان لە تەختەکە دابەزین. کە دابەزین بینیان دژمن تەواو شاری گەمارۆ داوە و خەڵکەکەی پەشێو و بێ دەرەتانن. جانشا بە خاتوو شەمسەی گوت: 'ئازیزم، ڕووناکی چاوم، تۆ سەیری حاڵی باوکم کە. چۆن تەنگیان پێ هەڵچنیوە!' خاتوو شەمسە کە ئەو حاڵەی دی، فەرمانی بە نرناشەکان دا، هێرش بەرنە سەر سوپای گەمارۆدەری قەڵا و لەناویان ببەن. پێشی گوتن: 'تاقیان لێ نەهێڵن.' ئەوجار جانشا ئاماژەی بۆ یەکێک لە نرناشەکان کرد کە ناوی قەڕاتیش بوو، پێی گوت: 'کەفیدپاشا زنجیر کە و بیهێنە ئێرە.' نرناشەکان لەڕێوە بەرەو هوردووی کەفیدپاشا کەوتنە ڕێ و لەوێ تا نیوەشەو ڕاوەستان. پاشان هێرشیان بردە سەر کەفیدپاشا و سوپاکەی و دەستیان کرد بە کوشتوبڕی باڵبازەکانی. هەر نرناشێک هەشت-نۆیەک لە باڵبازەکانی کەفیدپاشایان بە فیلەکەی ژێرییەوە دەگرت و هەڵی دینا بۆ حەواو بە زەویدا دەدان. هەندێک لە نرناشەکان بە کوڵەکەی ئاسن لە باڵبازەکانیان دەدا و دەیانکوشتن. بەڵام ئەو نرناشەی قەڕاتیشی ناو بوو، چووە تاوڵەکەی کەفیدپاشاوە، کەفیدپاشا لەوێ لەسەر تەختەکەی دانیشتبوو. بە تەختەکەوە هەڵی گرت و بەرەو ئاسمان فڕی. کەفیدپاشا لە ترسی قەڵافەتی ئەو دێوە خەریک بوو گیانی دەرچێ. دێوەکە بردی. جا هەر کە کەفیدپاشا خۆی بە ئاسمانەوە دیت، لە تاوان بەربووە سەروچاوی خۆی. کاری کەفیدپاشا بێرە گەیشت.

کاتێک تیقمووسپاشا جانشای دیت، خەریک بوو لە خۆشییاندا شاگەشکە ببێت و گیانی دەرچێ. یەکبەخۆی قیژاندی و لە هۆش خۆی چوو. کە وە هۆش هاتەوە، کوڕەکەی لە ئامێز گرت و بە کوڵ گریا و نەشیدەزانی کە نرناشەکان لەگەڵ کەفیدپاشادا لە شەڕدان. ئەوجار خاتوو شەمسە هەستا، چووە خزمەت تیقمووسپاشا، دەستی ماچ کرد و گوتی: 'خاوەنشکۆ! بچۆ سەربانی کۆشکەکە و لەوێوە شەڕی خزمەتکارەکانی شەهلانشای باوکم ببینە.' دەمودەست تیقمووسپاشا هەستا و لەگەڵ جانشا و خاتوو شەمسەدا چوونە سەربانی کۆشک و لەوێرا تەماشای شەڕی نرناشانیان دەکرد. هەندێک لەو نرناشانە وایان

له فیلسـوارەکان دەدا، ئێسـک و گۆشـتی فیل و سـوارەکان تێکەڵ دەبوون. هەندێک لە نرناشـەکان کە ڕوویان لە تاقمێک باڵبازی کەفیدپاشـا دەکرد و بەسـەریاندا دەیاننەڕاند، ئەوان لە جێوە دەکەوتن و دەمردن. هەندێکی دی دە کەس و بیست کەسیان بە فیلەوە وە هەوا دەخست و بە زەوییاندا دەدا و دەپلێشانەوە.

بە کورتی، ئەمان بەم جۆرە شـەڕیان دەکرد و تیقمووسپاشـا و جانشـا و خاتوو شەمسەش لە دوور شەڕەکەیان لە ژێر چاوەدێریدا بوو.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و بیست و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! جا کەفیدپاشا لەو تەشقی ئاسمانەوە سەیری سوپاکەی دەکرد و دەگریا. دوو ڕۆژ لەسەر یەک هەر لە سوپاکەی ئەویان کوشت تا قڕیان تێ خستن و کەسیان نەما. ئەوجار قەراتیش تەختی کەفیدپاشای لەنێو قەڵای تیقمووسپاشادا دانا و تیقمووسپاشا بە نڕناشێکی کە ناوی شەموال بوو گوت: 'کەفیدپاشا زنجیر کە و لە چاڵەڕەشدا بەندی بکەن.' شەموال فەرمانی تیقمووسپاشای بەجێ هێنا. تیقمووسپاشا بە دەهۆڵکوتانی گوت دەهۆڵی شادی بکوتن و بۆخۆشی بە بزەبز چوو بۆ لای دایکی جانشا تا هەواڵی هاتنەوەی جانشای پێ ڕاگەیەنێ پێشی بڵێ کە جانشا سەرپاکی سوپای کەفیدپاشای لەناو بردووە و کەفیدپاشاشی خستووەتە کۆیلەوە. کاتێک ئەو هەواڵەی دا بە دایکی جانشا، دایکی جانشا کەیفی ساز بوو. لە خۆشیان خەریک بوو بفڕێ. هەستا چوو بۆ لای جانشا.

جانشا کە دایکی بینی، بەرەو پیلی چوو لە ئامێزی گرت، دایکی ئەوەندە خۆشحاڵ بوو، بووراوە و بە لادا هات. گوڵاویان بەسەردا هەڵپرژاند. کاتێک وە ئاگا هاتەوە، کوڕەکەی لە ئامێز گرت و فرمێسکی شادی داباراند. کە خاتوو شەمسە زانی خەسووی هاتووە، هەستا و هاتە کنی. سڵاوی لێ کرد و دەستی ماچ کرد. باوەشیان بە یەکدا کرد و ماوەیەک لە باوەشی یەکدا بوون. ئەوجار دەستیان بە قسە و باس کرد، تیقمووسپاشا دەروازەکانی شاری کردەوە و مژدەدەرانی نارد بۆ شار و گوندەکانی دەوروبەری. لە هەموو لایەکەوە دیاری جۆراوجۆریان بۆ پاشا نارد، سەرهەنگ و سەرتیپ و باڵبازەگەل هاتن بۆ پیرۆزبایی. ئەوجار پاشا ئاهەنگێکی گەورەی بۆ جانشا گێڕا و فەرمانی دا شار برازێننەوە. سەد کەنیزی ناسکۆڵە و جوانی پێشکەشی خاتوو شەمسە کرد. پاشی چەند ڕۆژان خاتوو شەمسە چووە کن تیقمووسپاشا و تکای بۆ کەفیدپاشا کرد کە ئازادی بکا تا بگەڕێتەوە بۆ شارەکەی خۆی. خاتوو شەمسە گوتی: 'ئەگەر کەفیدپاشا خراپەیەکی لێ بوەشێتەوە، ئەوە بە یەکێ لە نڕناشەکان دەڵێم دەمودەست بیهێنێتە هەنتەشی تۆ.' تیقمووسپاشا تکای خاتوو شەمسەی قەبووڵ کرد و فەرمانی دا، کەفیدپاشا بێنن. وا بوو کەفیدپاشایان بە زنجیرکراوی هێنا و لەبەردەم تیقمووسپاشادا ڕایانگرت. کەفیدپاشا پێچکەی تەختی پاشایەتی ماچ کرد. تیقمووسپاشا گوتی: زنجیرەکانی بکەنەوە. خزمەتکارەکان زنجیرەکانیان لێ کردەوە، تیقمووسپاشا پێی گوت: ' ئەوە خاتوو شەمسە تکای بۆ کردی. ئێمەش تکاکەیمان قەبووڵ کرد. ئێستا بگەڕێوە شاری خۆت. ئەگەر دیسان خراپەیەکیشت لێ ببینم و ببیستم ملهوڕی بکەی، ئەو خاتوون بە نڕناشێک دەڵێ بە دەست و پێ بەستراوی بتهێنێتە ئێرە.' دوایی کەفیدپاشا بە سەرشۆڕی گەڕاوە بۆ شارەکەی خۆی.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی پێنجسەد و بیست و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەشکۆ،پاشان جانشا و خاتوو شەمسە بە خۆشی و شەوق و زەوقەوە رایاندەبوارد. ئەم چیرۆکانە لاوێک بۆ بەلووقیای دەگێڕاوە کە لەنێوان دوو گۆڕدا دانیشتبوو. کاتێک چیرۆکەکانی تا ئێرە گێڕاوە، بە بەلووقیای گوت: 'جا ئەو جانشایە منم. بەلووقیا، کاکە گیان، ئەم ڕووداوانە گشتی بەسەر من هاتووە و بە چاوی خۆم بینیومن.' بەلووقیا سەری لە بەسەرهاتی ئەو سووڕ ما و کەوتە بیرکردنەوە. دوایی بەلووقیا بە جانشای گوت: 'کاکە گیان، ئەم دوو گۆڕە چین و لەبەر چی لێرەدا دانیشتووی و بۆچی دەگری؟' جانشا گوتی: 'من و خاتوو شەمسە لە کن دایک و باوکم ژیانێکی پڕ لە خۆشی و عەیش و نۆشمان بوو. سالێ لە کابوول و سالێ لە قەلای گەوهەرنگین بووین. هاتوچۆی ئێمە لە ڕێی ئەو تەختەوە بوو کە ئێمە لەسەری دادەنیشتین و نڕناشان هەلیاندەگرت، بەرەو ئاسمانیان دەبرد و ڕۆژێک ڕێی سێ مانگیان دەبڕی و بە دوو ڕۆژ لە قەلای گەوهەرنگینەوە دەگەیشتینە کابوول و لەوسەریشەوە بە هەمان جۆر. سالانێکی دوور و درێژ لەم دۆخەدا بووین. وا بوو سالێک لە سالان وەک جاری جاران سەفەرمان کرد و گەیشتینە ئەم شوێنە. تەختەکەمان لێرە بەجێ هێشت چووین بۆ حەسانەوە لە ناو دوورگەکەدا بگەڕێین.

ئەوە بوو لە گوێ ئەم ڕووبارە دانیشتین، خواردمان و خواردمانەوە. دوایی خاتوو شەمسە جلوبەرگی داکەند و بۆ خۆشتن چووە ڕووبارەکەوە و کەنیزەکانیش جلوبەرگیان داکەند و چوونە ڕووبارەکەوە و مەلەیان دەکرد کە کتوپڕ گیانلەبەرێک لە گیانلەبەرانی دەریایی بە خاتوو شەمسەوەی دا. خاتوون لە جێوە یەکبەخۆی زریکاندی و مرد. کەنیزەکان لە گیانلەبەرەکە پرینگانەوە. چەند کەسێکیان خاتوو شەمسەیان هەلگرت و هێنایانەوە تاولەکە. جا کە من ئەوم بە مردوویی دی، لە هۆش خۆم چووم و کەوتم. کە هۆشم هاتەوە بەر، تێر گریام و بە نڕناشەکانم گوت کە تەختەکە هەلگرن و بچن بۆ لای کەس‌وکاری خاتوو شەمسە و لەو بەلایە ئاگاداریان کەنەوە. نڕناشەکان چوون. سێ ڕۆژی پێ چوو کە خزم و کەسی خاتوو شەمسە هاتن. شۆردیان، کفنیان کرد و لەم شوێنەدا ناشتیان. ویستیان منیش لەگەل خۆیان بەرنەوە بۆ قەلای گەوهەرنگین. من داوام لە باوکی خاتوو شەمسە کرد لەتەنیشت گۆڕی خاتوو شەمسەدا گۆڕێکیش بۆ من هەلکەنن و لە من گەڕێن و بەجێم بێلن. تا ئەگەر مردم منیش لەپال ئەودا بنێژرێم. پاشا فەرمانی بە خزمەتکارەکان دا و داواکەمیان بەجێ گەیاند و لێرەدا جێیان هێشتم. ئیدی ڕۆیشتن و، منیش لەو دەمەوە هەر خەریکی گریە و زاریم و چاوەڕێی مەرگم. جا چیرۆکی من و هۆی دانیشتنم لەنێوان ئەم دوو گۆڕەدا ئەمەیە.' دوایی جانشا بە گریانەوە ئەم شیعرەی

خوێندەوە:

ژین چرایەکی بێ تیشکە بەبێ تۆ
دەشتێکی قاقرە و ویشکە بەبێ تۆ
شەوەزەنگە و نووتەکە ئەم دونیایە
تۆ نەبی من هیچم وەبەر چاو نایە

بەلووقیا کە ئەم قسەیەی بیست، سەری سوور ما.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی پێنجسەد و بیست و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! 'بەلووقیا سەری لەو بەسەرهاتەی جانشا سوور ما، گوتی: ' خودا دەیزانێ وام دەزانی کەس بە قەد من لە دونیادا نەگەڕاوە. زۆرم شـایی بەخۆم بوو کەچی ئێستا کە بەسەرهاتی تۆم بیست، ئەوەی دیبووم هەمووم لە بیر چووەوە.' ئەوجار جانشا گوتی: 'کاکە گیان، تکایە گەورەیی بفەرموو ڕێگایەکی باشـم پیشـان بدە.' بەلووقیا ڕێی پیشان دا و ماڵاوایی لێ کرد و ڕۆیشت.

## درێژەی چیرۆکی بەلووقیا

"تەواوی ئەم چیرۆکانە شـاژنی ماران بۆ حاسـیب کەریمەددینی دەگێڕاوە. کە شـاژنی ماران چیرۆکەکەی بڕیە گەیاند، حاسـیب کەریمەددین پێی گوت: 'باشـە شـاژنی ماران، تۆ ئەم چیرۆکانە لە کوێوە دەزانی؟' شـاژنی ماران بە حاسـیبی گوت: 'پازدە سـاڵ لەمەو بەر نامەیەکم نووسی و بە مارێکی گەورەدا ناردم بۆ بەلووقیا لە شاری میسر. ئەو مارە چوو بۆ میسر و نامەکەی گەیاندە دەست کچی شەمووخ. کچی شەمووخ کاغەزەکە وەر دەگرێت و دەکەوێتە سـۆراغی بەلووفیا و دەیبینێتەوە. دەچێتە لای و نامەکەی دەداتێ. بەلووقیا نامەکەی من دەخوێنێتەوە و تێدەگات چ باسـە. دەڵێت: 'یانی تۆ لە لای شـاژنی مارانەوە هاتووی؟' ئەو مارە دەڵێ: 'بەڵێ، لای ئەوەوە هاتووم.' بەلووقیا دەڵێت: 'دەمەوێ لەگەڵ تۆدا بێم بۆلای شـاژنی ماران، چونکە کارێکم پێیەتی.' ئەو مارە دەڵێ: 'بەسـەر چاو.' ئەوجار هەڵیدەگرێت و پێی دەڵێت: 'چاوت بنووقێنە.' بەلووقیا چاوی دەنووقێنێت. کە چاو دەکاتەوە سەیر دەکا ئەو لەسەر ئەم کێوەیە کە منی لێیم و دەچێتە لای ئەو مارەی کاغەزەکەی منی بۆ بردبوو. سـڵاوی لێ دەکا و هەواڵی شـاژنی مارانی لێ دەپرسـێت. ئەو مارە پێی دەڵێت: 'شـاژن لەگەڵ سـوپاکەیدا چووە بۆ کێوی قاف. کە هاوین داهات، دەگەڕێتەوە بۆ ئێرە. هەر کاتێک بچێتە کێوی قاف، من دەکاتە جێنشـینی خۆی. جا ئەگەر تۆ کارێکت بەوە، ئەوا بە منی بڵێ تا بۆت جێبەجێ بکەم.' بەلووقیا دەڵێت: 'دەمەوێ ئەو گیایەم بدەیتێ کە هەرکەس بیکوتێتەوە و ئاوەکەی بگرێ و بیخواتەوە، ناسـاغ نابێ و پیری ڕووی تێ ناکا و قەتیش نامرێ.' مارە گوتی: 'تا بەسـەرهاتی خۆتم؛ لەو ڕۆژەوەی لە شـاژنی ماران جودا بوویتەوە و لەگەڵ عەفان چوونە گڵکۆی سـولەیمان، بۆ نەگێڕیتەوە و پێم نەڵێی چیت لێ قەوما، ئەو گیایەت پیشـان نادەم.' بەلووقیا ناچار بەسـەرهاتی خۆی لە سـەرڕاوە بۆ مارەکە گێڕاوە، چیرۆکی جانشـاشی بەو جۆرەی بیستبووی، بۆ ئەو مارەی گێڕاوە. ئەوجار پێی دەڵێ: 'جا ئێستا تۆش داخوازییەکەم بەدی بێنە با بگەڕێمەوە بۆ شارەکەی خۆم.' ئەو مارە دەڵێ: 'بە

حەزرەتی سـولەیمان من ئەو گیایە ناناسـم و پێی نازانم.' ئینجا بەو مارەی وا بەلووقیای هێنابوو، گوت: 'هەسـتە بەلووقیا هەڵگرە و بیبەوە شـارەکەی خۆی.' ئەو مارە گورج ڕابوو و بەلووقیای بانگ کردە کن خۆی و پێی گوت: 'چاوت بچووقێنە.' بەلووقیا چاوی چووقاند. کە چاوی کردەوە، لە ماڵێ بوو. دوای ئەوەی شاژنی ماران لە کێوی قاف گەڕایەوە. مارەی جێنشینی چووە هەنتەشی، سڵاوی لێ کرد و گوتی: 'بەلووقیا سڵاوی لێ دەکردی.' ئەوجار سەربهووردەی بەلووقیای بۆ شاژنی ماران گێڕاوە.'

"دوای ئەوە شـاژنی ماران بە حاسـیبی گوت: 'هۆکاری ئەوەی کە من بەسـەرهاتی بەلووقیا دەزانم، ئا ئەمە بوو کە بۆم باس کردی.' حاسـیب کەریمەددین گوتی: 'شـاژن، تۆ پێم بڵێ، دوای ئەوەی بەلووقیا لە جانشـا جیا بووەوە، چی بەسـەر هات؟' شـاژنی ماران گوتی: 'کە بەلووقیا لە جانشـا جیا بووەوە، شـەو و ڕۆژ ڕۆیشـت تا گەیشـتە دەریایەکی پان‌وبەرین، لەوێ لە ئاوی ئەو گیایەی لەژێر پێی دا و بەسـەر ئاوەکەدا ڕۆیشـت تا ڕێی کەوتە دوورگەیەکی پڕ لە دار و دار و کانیاوی سـازگار. بەو دوورگەیەدا دەسـووڕاوە و چاوی دەگێڕا. وا بوو تووشی دارێکی گەورە بوو، گەڵاکانی بە قەد چارۆکەی کەشتی پان. کە لە دارەکە چووە پێشـێ سـەیری کرد، سـفرەیەکی گەورە لە ژێریدا ڕاخراوە و هەموو جۆرە خواردەمەنییەکی لە سەرە. لە سەر دارەکەش مەلێک هەڵنیشتووە، مەلێکی گەورە کە جەستەی لە لۆلۆ و زمرڕوودی سەوز و قاچەکانی زیو و دندووکی یاقووتی سوور، باڵ و پەڕی لە گەوهەری گرانبایی چێ کرابوون. ئەو باڵندەیە بەردەوام یادی خودای دەکرد و سڵاوی بۆ حەزرەتی محەممەد(س ـ خ) دەنارد.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی پێنجسەد و بیست و نۆیەم هاتەوە

گوتی: 'خاوەنشکۆ! بلوقیا کە چاوی بەو باڵندە گەورەیە کەوت لێی پرسی: «ئەتۆ کێی و چ کارەی؟» باڵندەکە وڵامی داوە، گوتی: «من باڵندەی بەهەشـــتم. خودای مەزن کاتێک ئادەمی لە بەهەشت وەدەر نا، چوار گەڵا لە گەڵای دارەکانی بەهەشتی بۆ هاویشتە دەرەوە تا خۆیانی پێ داپۆشـــن. ئەو گەڵایانە کەوتنە زەوی. یەکیان کرم خواردی و ئاوریشـــمی لێ ســـاز بوو. یەکی دیکەیان مامز خواردی و میســـکی لێ ســـاز بوو. ســـێیەمین گەڵا هەنگ خواردی و هەنگوینی لێ دروست کرد و چوارەمین کەوتە هیندەوە و ... لێ دروست بوو.

بەڵام من تەواوی گۆی زەوی گەڕاوم هەتا خودا بەســـەری کردمەوە و ئەو شـــوێنە پیرۆزەی بە قســـمەت کردم. شـــەوانی هەینی تەواوی چاکان و پاکان و دەمڕاســـتانی دونیا دێنە ئێرە و ئەم شـــوێنە ماچ دەکەن لەو خواردنە دەخۆن و میوانی خودای مەزن دەبن. هەموو شـــەو و ڕۆژێکی هەینی ئەو میوانداریيە لە لایەن خودا دەکرێ و پاشـــان ســـفرە کۆ دەکرێتەوە و دەبردرێتەوە بۆ بەهەشت. هەتیش لێی کەم نابێتەوە ئاڵگۆڕی بەسەر نایە.'

"ئەوجار بەلووقیا لەو خۆراکەی خوارد. کە تێر بوو، سپاسی خودای کرد. لەناکاو خزر پەیدا بوو. بەلووقیا هەستایە سەر پێ و سڵاوی لێ کرد. ویستی بڕوات، ئەو باڵندەیە گوتی: 'هۆی بەلووقیا، لە لای خزردا دانیشـــە.' بەلووقیا دانیشـــت. خزر پێی گوت: 'کاری خۆتم پێ بڵێ و چیرۆکی ژیانتم بۆ بگێڕەوە.' بەلووقیا ســـــەربوردەی ژیانی خۆی لەو ڕۆژەوەی لە ماڵ وەدەر کەوتبوو تا گەیشتنی بەو شوێنەی لێی دانیشتبوون بۆ گێڕاوە. دوایی بە خزری گوت: 'قوربان، ئێرە تا میســـــرە چەندە دوورە؟' خزر گوتی: 'نەوەد و پێنج ســـــاڵ ڕێیە.' بەلووقیا کە ئەم قســـەیەی بیســـت، هەســـتایەوە و پێی خزری ماچ کرد و گریا و پێی گوت: 'لەم ئاوارەیيە ڕزگارم کە، مەگەر هەر خودا خۆی پاداشـــت بداتەوە. وا خەریکە تێدا دەچم و چم بۆ ڕزگاریی خۆم پێ شـــک نایە.' خزر پێی گوت: 'داوا لە خودای باڵادەســـت بکە تا فەرمانم بداتێ تۆ بگەیەنمە میســـر.' بەلووقیا بە کوڵ گریا و دەســـتی داماوی بۆ دەرگانەی خودا بەرز کردەوە. خودای گەورە وەڵامی داواکەی داوە و ســـرووشـــی بۆ خزر نارد کە بەلووقیا بە خزم و کەس‌وکاری شـــاد بکەوە. خزر گوتی: 'بەلووقیا، ئەوە خودای مەزن داواکەتی قبووڵ کرد و سرووشی بۆ ناردم تا بتگەیەنمەوە میسر. ئێستا باوەشم پێدا بکە و توند بە هەردوو دەستت بمگرە و چاوانت بچووقێنە.' دەم‌ودەست بەلووقیا باوەشی پێدا کرد، توند گرتی و چاوی چووقاند. خزر هەنگاوێکی هەڵهێناوە و بە بەلووقیای گوت: 'دەی چاو بکەوە.' کە بەلووقیا چاوی هەڵێنا لە بەردەرگای ماڵی خۆیان بوو. ویستی ماڵئاوایی لە خزر بکات، کەچی خزر بزر ببوو.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شه‌وی پێنجسه‌د و سییه‌م هاته‌وه

گوتی: "خاوه‌نشـــکۆ! به‌لووقیا که دیتی خزر غه‌یب بوو، چووه‌وه ماڵی خۆیان. کاتێک دایکی چاوی پێی که‌وت، له خۆشـــیيان قیژاندی له هۆش خۆی چوو، هه‌ر له‌وێ که‌وت. گولاویان هێنا به‌ســه‌ریاندا هه‌ڵپرژاند تا وه هۆش هاته‌وه. که هاته‌وه ســه‌رخۆ کوڕه‌که‌ی له ئامێز گرت، ده‌ســـتی کرد به گریان. به‌لووقیاش تاوێک پێده‌که‌نی و تاوێک ده‌گریا. خزم و که‌س لێی کۆ بوونه‌وه و خۆشـحاڵی خۆیان ده‌ربڕی له‌وه‌ی که به ســلامه‌تی گه‌ڕاوه‌ته‌وه. هه‌واڵی هاتنه‌وه‌ی به ناو شـاردا بڵاو بووه‌وه. له هه‌موو لایه‌که‌وه دیارییان بۆ هێنا و ته‌پڵی شـادییان لێ دا. به‌لووقیاش سـه‌رله‌به‌ری چیرۆکی خۆی بۆ گێڕانه‌وه و باسـی ئه‌وه‌شـی بۆ کردن که چۆن خزر ئه‌وی گه‌یاندووه‌ته‌وه به‌رده‌رگای ماڵی خۆیان و پاشـــان بزر بووه. خه‌ڵک به‌و هه‌واڵه به جارێک سه‌ریان سووڕ ما.'

**درێژه‌ی چیرۆکی حاسیب که‌ریمه‌ددین**

"شـــاژنی ماران ته‌واوی ئه‌و چیرۆکانه‌ی بۆ حاســیب که‌ریمه‌ددین گێڕاوه. حاســیب به بیستنی ئه‌م چیرۆکه ته‌واو سه‌ری سووڕ ما و تێر گریا. دوایی شاژنی ماران گوتی: 'کوڕه حاسیب، ئه‌من له‌وه ده‌ترسم که چوویه‌وه بۆ شاره‌که‌ی خۆتان، به‌ڵێنه‌که‌ت له بیر بکه‌یت و په‌یمانه‌که‌ت بشکێنی بچیته گه‌رماو.' حاسیب که‌ریمه‌ددین سوێندی گه‌وره‌تر له پێشووی بۆ خوارد که تازه قه‌ت پێ نه‌نێته گه‌رماوه‌وه. ئه‌وجار شـــاژنی ماران به مارێکی گوت که حاسیب به‌رێته‌وه سه‌ر زه‌وی. ماره‌که خێرا هه‌ڵی گرت و پاش ئێره و ئه‌وێیه‌کی زۆر..."

لێره‌دا بوو، مـاوه‌ی چیرۆکی ئه‌مشـــه‌ویش کۆتـایی پێ هـات و شـــه‌هرزاد درێژه‌ی چیرۆکه‌که‌ی هه‌ڵگرت بۆ شه‌وێکی دیکه.

## که شەوی پێنجسەد و سی و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! مارەکە حاسیبی هەڵگرت و پاش ئێرەوئەوێیەکی زۆر سەری لە زەویی هێنا دەرێ و حاسیبی لە سەر زەوی دانا. حاسیب کەریمەددین بەرەو ماڵی خۆیان کەوتە ڕێ. تەنگی ئێوارە گەیشتەوە و لە دەرگای دا. دایکی هات و دەرگای لێ کردەوە. کوڕەکەی لە بەر دەرگا دیت. لەخۆشیاندا قیژاندی و باوەشی پێ داگرت و دەستی کرد بە گریان. خێزانیشی کە گوێی لەو گریانە بوو، هاتە دەرێ و مێردەکەی دیت لە لای خەسووی ڕاوەستابوو. سڵاوی لێ کرد و دەستی ماچ کرد. ئیدی بە دیداری یەکدی شاد بوونەوە و وەژوور کەوتن. پاشان حاسیب کەریمەددین هەواڵی ئەو ئەنجینەکێشانەی[1] پرسی وا لەگەڵی بوو ئەویان لە چاڵەکەدا جێهێشت. دایکی گوتی: 'ئەوان هاتنە لام و گوتیان: 'کوڕەکەت گورگ خواردوویەتی.' ئێستاش ئەوان بازرگان و خاوەن ماڵ و سامان و دووکان و بازاڕن. داهاتیان بە لێشاوە و لە دەسەڵاتدارانن. هەموو ڕۆژێ دێنە لامان و لێرە دەخۆن و دەخۆنەوە، تا ئێستا ئەمە کاریانە.' حاسیب کەریمەددین بە دایکی گوت: 'دا تۆ پێیان بڵێ کە حاسیب لە سەفەر هاتووەتەوە و وەرن بۆ لای.'

"کە ڕۆژ بووەوە، دایکی حاسیب چوو بۆ ماڵی ئەنجینەکێشەکان و ئەوەی کوڕەکەی پێی گوتبوو، بەوانی گوت. ئەنجینەکێشەکان کە ئەمەیان بیست، ڕەنگیان گۆڕا و بە دایکی حاسیبیان گوت: 'بەسەر چاو.' هەریەکی دەستێک جلی ئاوریشم کە قەراخەکانی بە زێڕ داگیرابووەوە دا بە دایکی تا بۆ حاسیبی بەرێتەوە. پێشیان گوت سبەی دێینە دیمانەی.' ئیدی دوای ئەوە دایکی حاسیب گەڕاوە لای کوڕەکەی، ئەوەی ئەنجینەکێشەکان گوتبوویان بۆی گێڕاوە و دیارییەکانی بۆیان ناردبوو دای بە حاسیب. کاری حاسیب کەریمەددین بێرە گەیشت.

"ئەنجینەکێشەکانیش کۆمەڵێک لە بازرگانانیان کۆ کردەوە و ئەوەی بەسەر حاسیب کەریمەددینیاندا هێنابوو، بۆیان گێڕانەوە و، داوای ڕێگەچارەیان لێ کردن. بازرگانەکان گوتیان: 'چارە ئەوەیە؛ هەرکەسەی نیوەی ماڵەکەی خۆی بدا بە حاسیب.' وا بوو هەموو لەسەر ئەمە ڕێککەوتن؛ نیوەی ماڵی خۆیان بدەن بە حاسیب. هەر بۆیە یەکی نیوەی ماڵەکەی خۆیان هەڵگرت و چوونە هەنتەشی، سڵاویان لێ کرد و دەستیان ماچ کرد. ئەو ماڵەی بردبوویان، دایانێ و پێیان گوت: 'ئەم ماڵە لە پای ئەو چاکانەی تۆیە کە لەگەڵ ئێمەت کرد.' حاسیب کەریمەددین ماڵەکەی لێ وەرگرتن و پێی گوتن: 'ئەوەی چوو، چوو— کەس هیچی لەگەڵ قەدەر پێ ناکرێ.' ئەوان گوتیان: 'دەی ئێستا هەستە با بچینە دەرێ

---

[1]. ئەنجینە: ئێزنگ، ئێزینگ، هێزم، داری ئامادەکراو بۆ سووتاندن.

بگەڕێین و بچینە گەرماو.' حاسیب کەریمەددین گوتی: 'من سوێندم خواردووە، تا من بم قەت قەت نەچمە گەرماو.' ئەوان گوتیان: 'دەی ماڵی هەر کامێکمانت پێ خۆش دەچینە ئەوێ لە خۆشی تۆ لە دەوری یەک کۆ دەبینەوە.' تا حەوت شەو و ڕۆژ ئەوە کاری بوو. دوای ئەوە حاسیب دەستی دایە بازارگانی و هێندەی نەبرد بوو بە خاوەن ماڵ و سامان. بازرگانانی شار هات‌وچۆیان دەکرد و ئەویش چیرۆکی خۆی بۆ دەگێڕانەوە. تا ماوەیەکی زۆر ئاوا ڕابرد. بە هەڵکەوت ڕۆژێک لە ڕۆژان بە شاردا دەگەڕا، بە بەر گەرماوێکدا ڕابرد و گەرماوەکە هی دۆستێکی دێرینی خۆی بوو. ئەوی بینی و سڵاوی لێ کرد و یەکدییان لە باوەش گرت. گەرماوچی پێی گوت: 'دەی هەر لەبەر حورمەتی دۆستایەتییەکەمان وەرە گەرماوەکەم ببینە و خۆتی لێ بشۆ. با منیش خزمەتێکی تۆم کردبێ.' حاسیب گوتی: 'من سوێندم خواردووە کە تازە نەچمە گەرماوەوە.' کابرای گەرماوچی سێ‌تەڵاقەی لێ خوارد. حاسیب حەپەسا و گوتی: 'برا گیان، مەگەر دەتەوێ منداڵەکانم بێ باب بن و ماڵوێرانم کەی؟!' ئەوجار گەرماوچی خۆی بەسەر پێی حاسیبدا دا و ماچی کرد و گوتی: 'من لە پشتی تۆم. هەر دەبێ بێیتە گەرماوەکەمەوە. ئەگەر گوناهێکی تێدا بێ، ئەوە من ئەو گوناهە لە ئەستۆ دەگرم.' کرێکارانی گەرماوەکە و هەرکەس لەوێ بوون، دەوری حاسیبیان دا، بردیانە گەرماوەکەوە و جلیان لە بەر داکەند. کە حاسیب برایە ژوورەوە، لە پەنای دیوارەکەدا دانیشت و جامێک ئاوی بە سەریدا کرد. لەناکاو بیست پیاو بۆی هاتن و گوتیان: 'هۆی کابرا، هەستە پاشا کاری بە تۆیە.' ئەوجار یەکێیان چوو تا پادشا و وەزیر ئاگادار کاتەوە. وەزیر سوار بوو و لەگەڵ شەست کەس لە کۆیلەکانی بەرەو گەرماوەکە وەڕێ کەوتن. هات و سڵاوی لە حاسیب کرد و سەد دیناری دا بە گەرماوچییەکە و گوتی: 'ئەسپێک بۆ حاسیب بێنن با سواری بێ.' ئیدی وەزیر و حاسیب سوار بوون و لەگەڵ کۆیلەکاندا ڕۆیشتنەوە بۆ کۆشکی پاشا. وەزیر حاسیبی لەگەڵ خۆی بردە ژوورەوە و دانیشتن. دوایی سفرە ڕاخرا و خواردن و خواردنەوە خوران و نۆشران و، دەستیان شوشت. پاشان وەزیر دوو خەڵاتی دا بە حاسیب کە هەریەکەیان بایی پێنج‌هەزار دینار دەبوو، پێشی گوت: 'بزانە کە خودای گەورە بە هاتنی تۆ منەتباری کردین. پاشامان بە هۆی ئەو نەخۆشییەی تووشی بوو، خەریک بوو بمرێ. جا لە کتێبەکانی ئێمەدا ئاماژە بەوە کرابوو کە ژیانی پادشا لە دەستی تۆدایە.' حاسیب سەری لە کاری ئەمانە سووڕ مابوو. ئەوجار وەزیر و حاسیب و گەورەگەورەکانی دەوڵەت لە هەر حەوت دەروازەی کۆشکەوە وەژوور کەوتن. چوونە لای پادشا. ئەو پاشادیە ناوی کەرەزدان و یەکێک لە پادشایانی عەجەم بوو. پادشای حەوت هەرێم بوو، سەد پادشای دی گوێ بەرفەرمانی بوون کە هەریەکەیان لەسەر تەختی زێڕین دادەنیشت و دەهەزار پاڵەوانی هەبوو، هەر پاڵەوانێکیش سەد جێگر و هەریەکێک لەمانیش سەد میرغەزەبی هەبوو کە دایمەودەرهەم بە شیری هەڵکێشراوەوە ڕاوەستابوون. جا کە وەزیر حاسیبی بردە بەردەم پادشا، دیتیان ئەوە

پادشا نووستووه، پەڕۆیەکی بەسەر ڕوخساریدا داوە و لە تاو ئازار دەناڵێنێ. کە حاسیب ئەوی بینی، لە حەیبەتی کەرەزدان شا پەشۆکا، کوڕنۆشی بۆ برد و دۆعای بۆ کرد. پاشان سەروەزیران کە ناوی شەمهوور بوو، ڕووی کردە حاسیب، سڵاوی لێ کرد و ئەوی لە دەستەڕاستی پاشاوە لەسەر کورسییەکی زێڕین دانیشاند."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی پێنجسەد و سی و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! وەزیر شەمهوور فەرمانی دا سفرە ڕاخەن، لەرێوە ڕایان خست و خواردنی جۆراجۆریان لە سەر دانا. هەنتەشیان خواردیان و خواردیانەوە و دەستیان شوشت. ئەوجار وەزیر شەمهوور هەستا، خەڵکەکەش بە حورمەتی ئەو هەستان و چوون بۆ لای حاسیب کەریمەددین. وەزیر شەمهوور بە حاسیبی گوت: 'ئێمە هەموو کۆیلەیی تۆین و تۆ هەرچیت لێمان بوێ، با نیوەی وڵاتەکەشمان بێ، دەست ناقووچێنین، چونکە هەر تۆ دەتوانی پاشامان چارە بکەیت.' ئەوجار وەزیر دەستی حاسیبی گرت و بردییە پێش پاشا. حاسیب چاوی لە پاشا کرد، بینیی لەوپەڕی ناساغیدایە و هەستی کرد نەخۆشییەکەی فرە سەختە. ئینجا وەزیر دەستی حاسیبی ماچ کرد و گوتی: 'داوات لێ دەکەین پادشا چارسەر بکە و هەر چییەکت لێمان بوێ بۆتی جێبەجێ دەکەین. لە پارە و سامان چیت دەوێ، دەتدەینێ. داوای ئێمە لە تۆ هەر ئەمەیە.' حاسیب گوتی: 'جەنابی وەزیر، گەرچی کوڕی دانیالی پێغەمبەرم، بەڵام هیچ بەهرەیەکم لە زانستدا نییە. هەرچەندە سێ ڕۆژی ڕەبەق وەبەر خوێندنی نۆژداریان نام، کەچی فێری پیشەی نۆژداری نەبووم. خۆزگە شتێکم دەزانی و پادشام چارە دەکرد.' وەزیر گوتی: 'لە لای ئێمە ئەم قسانە مەکە و درێژەی مەدەرێ، بە خودا ئەگەر هەموو حەکیمانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بێن و کۆ ببنەوە، تۆ نەبی بەشەر نییە چارەی پادشا بکا.' حاسیب گوتی: 'ئاخر باشە چۆنی چارە بکەم نە دەزانم دەردی چییە و نە دەرمانی؟!' وەزیر گوتی: 'ئیدی من نازانم کەیفی خۆتە.' حاسیب گوتی: 'دەی خۆ ئەگەر من بزتمک دەرمانی چییە، چارەی دەکەم.' وەزیر گوتی: 'تۆ لە هەموو کەس باشتر دەزانی دەرمانی ئەو چییە. دەرمانی ئەو شاژنی مارانە. تۆ ئەوت دیوە و شوێنەکەی دەزانی؛ لای ئەو بووی.'

"حاسیب کە ئەمەی بیست، زانی کە هۆکاری ئەم هەموو بێنەوبەرەیە چوونە گەرماوەکەیە. ئەوجار لە کردەی خۆی پەشیمان بووەوە، بەڵام پەشیمانی دادی نەدا، پێی گوتن: 'باشە شاژنی ماران کامەیە؟ خۆ من نایناسم و ناویم نەبیستووە.' وەزیر گوتی: 'خۆتمان لێ ناشارەزا مەکە. ئێمە بەڵگەمان لایە کە تۆ ئەو دەناسی و دوو ساڵی ڕەبەق لای ئەو بووی.' حاسیب گوتی: 'من ئەو ناناسم و نەمدیوە.' خێرا وەزیر فەرمانیدا کە کتێبەکە بهێنن. کتێبیان بۆ هێنا و کردیانەوە. بۆیان خوێندەوە کە لەم کتێبەوە دەردەکەوێ کە پیاوێ ڕێی دەکەوێتە لای شاژنی ماران و دوو ساڵان لای ئەو بەسەر دەبا. پاش دوو ساڵ لە لای مارەکەوە دێتەوە سەر زەوی و هەر دەم بچێتە گەرماوەوە سکی ڕەش هەڵدەگەڕێت. ئینجا بە حاسیبی گوت: 'دا دەی سەیری ورگت کە.' حاسیب سەیری ورگی کرد، دیتی ورگی ڕەش هەڵگەڕاوە. بە وەزیری گوت: 'من هەر لە زگماکییەوە ورگم ڕەشە.'

وەزیر گوتی: 'من لە هەر گەرماوێکدا سێ کەسم دانابوو بۆ ئەوەی هەرکەس بچێتە گەرماوەوە، سەیری ورگی بکەن و منی لێ ئاگادار بکەنەوە. جا کە تۆ چووبوویتە گەرماوەکەوە، ورگی تۆیان بینیبوو کە ڕەشە و، منیان لێ ئاگادار کردەوە. ئەگەرنا خۆشم باوەڕم نەدەکرد ڕۆژێک بێ و تۆم وەگیر بکەوێ. ئێمە هیچ پێویستییەکمان بە تۆ نییە، ئەوە نەبێ کە ئەو جێیەمان پیشان بدەی کە لێی هاتییە دەر و هاتیتەوە سەر زەوی. ئەوجار تۆ بڕۆ بە دوای کاری خۆتدا. ئەوجار خۆمان دەتوانین شاژنی ماران بگرین، چونکە کابرایەکمان لایە دەتوانێت ئەومان بۆ بگرێ.'

"کە حاسیب ئەوەی بیست، قسەی پێ نەما و زانی کار لە کار ترازاوە، بەڵام تازە پەشیمانی سوودی نەبوو. بەردەوام کاربەدەستان و گەورەگەورەکان داوایان لێ دەکرد کە شوێنی شاژنی مارانیان پێ بڵێ، بەڵام حاسیب لە وەڵامیاندا دەیگوت: 'من نەمدیوە و ناویم نەبیستووە.' ئیدی وەزیر بانگی میرغەزەبی کرد و پێی گوت کە جلوبەرگی حاسیب داکەنێ و بیرزاێکی باشی بکا. دەمودەست میرغەزەب جلوبەرگی حاسیبی داکەند و ئەوەندەی لێ دا تا لە تاو سەختیی ئەشکەنجەکە مەرگی بە چاوی خۆی دی. ئینجا وەزیر پێی گوت: 'ئێمە بەڵگەمان بە دەستەوەیە کە تۆ شوێنی شاژنی ماران دەزانی، ئیدی بۆ لێمان دەشارییەوە؟!'
"

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شه‌وی پێنجسه‌د و سی و سێیه‌م هاته‌وه

گوتی: "خاوه‌نشکۆ! 'وه‌زیر به حاسیبی گوت: 'تۆ هه‌ر ئه‌و جێگه‌یه‌مان پێ بڵێ که لێی هاتیه ده‌رێ، ئیدی برۆ دوور که‌وه‌وه. بۆخۆمان که‌سێکمان هه‌یه شاژنی ماران بگرێت، ئه‌تۆ خه‌مت نه‌بێ کارمان به تۆ نییه.'

"به کورتی، وه‌زیر به‌نه‌رمی و له‌سه‌رخۆیی قسه‌ی له‌گه‌ڵ کرد و دواندی. که‌وایه‌کی شاقه‌لزێڕینیشی به شانیدا دا که په‌راوێزه‌کانی به گه‌وهه‌ری جۆراوجۆر ڕازابووه‌وه. ئه‌وجار حاسیب داواکه‌ی قه‌بووڵ کرد و گوتی: 'باشه پێتان ده‌ڵێم.' وه‌زیر که ئه‌مه‌ی بیست، ته‌واو که‌یفی ساز بوو. خێرا سوار بوو و ته‌واوی کاربه‌ده‌ستان و حاسیبیش له‌گه‌ڵی سوار بوون و ڕۆیشتن ڕۆیشتن تا گه‌یشتنه ئه‌و کێوه. حاسیب که‌ریمه‌ددین چووه ئه‌شکه‌وته‌که‌وه زۆر گریا و لاڵاوه و ئاخی په‌شیمانی هه‌ڵکێشا. وه‌زیر و گه‌وره‌گه‌وره‌کان به دوایدا ڕۆیشتن تا گه‌یشتنه ئه‌و چاڵه‌ی هه‌نگوینه‌که‌یان لێ ده‌رهێنابوو. چوون له چاڵه‌که‌وه، حاسیب ئه‌و شوێنه‌ی لێی هاتبووه ده‌ره‌وه پێشانی وه‌زیری دا. ئه‌وجار وه‌زیر چووه پێشه‌وه، دانیشت و بخوری داگیرساند و ویردی خوێند و فووی به چوارده‌وریدا کرد. ئاخر وه‌زیر کابرایه‌کی جادووگه‌ر بوو، گاڵته‌ی به خوداناسان ده‌کرد و جادووگه‌ریی به لاوه په‌سه‌ند بوو.

"که ویرده‌که‌ی ته‌واو کرد، به ده‌نگێکی به‌رز قاوی کرد: 'هۆی شاژنی ماران وه‌ره ده‌رێ.' له‌و ده‌مه‌دا ده‌رگایه‌کی گه‌وره کراوه و گرمه‌یه‌کی گه‌وره له گوێن هه‌وره‌تریشقه‌ی لێ هات. وایان زانی چاڵه‌که تێک ڕووخا. ئه‌وانه‌ی له‌وێ بوون هێندێکیان بێهۆش بوون و تاقمێکیشیان له ترسان دڵیان تۆقی و مردن. ئه‌وجار مارێک له چاڵه‌که هاته ده‌رێ به قه‌د فیلێک، بڵێسه‌ی ئاور له چاو و زارییه‌وه سه‌ری ده‌کرد. مه‌جۆعمه‌یه‌کی زێڕینی به پشته‌وه بوو که به دوڕ و گه‌وهه‌ر ڕازابووه‌وه و مارێک له سه‌ری پاپۆکه‌ی خواردبوو. ئه‌و ماره تیشکی ده‌داوه به جۆرێک شوێنه‌که‌ی به پرشنگی خۆی ڕووناک کردبووه‌وه. ڕوخساری وه‌ک ڕوخساری مرۆڤ بوو و به زمانێکی ڕه‌وان ده‌دوا. ئه‌و ماره شاژنی ماران بوو. سه‌یری ئه‌ملا و ئه‌ولای خۆی کرد و چاوی به حاسیب که‌ریمه‌ددین که‌وت و پێی گوت: 'په‌یمان‌شکێن، ئه‌خه تۆ نه‌تگوت به‌ڵێنه‌که‌م ده‌به‌مه سه‌ر؟ پێم نه‌گوتی ناتوانی؟ چی لێ هات په‌یمان و ئه‌مه‌ک و دۆستی؟ کوا ئه‌و په‌یمانه‌ی به منت دا؟ کوا ئه‌و سوێندانه‌ی ده‌تخواردن که نه‌چیته گه‌رماوه‌وه؟ به‌ڵام قه‌یناکا که‌س ناتوانێت له ده‌ست چاره‌نووس ڕاکا. دیاره خودای گه‌وره کۆتایی ته‌مه‌نی منی داوه‌ته ده‌ست تۆ و هه‌ر له ئه‌زه‌له‌وه بڕیار بووه من بکوژرێم و که‌ره‌زدان‌شا له ئازار و ناڕه‌حه‌تی ڕزگاری ببێ.'

"دوای ئه‌وه شاژنی ماران به کوڵ گریا و حاسیب که‌ریمه‌ددینیش له تاوی ئه‌و ده‌ستی

کرد بە گریان. کە وەزیر شـەمهووری پیس شـاژنی مارانی دی، دەسـتی بۆ درێژ کرد تا بیگرێت، شاژنی ماران گوتی: 'هەی چەپەڵ، دەستت بکشێنەوە، ئەگینا بە تین و هەڵاوی زارم دەتکەم بە مشـتێک خۆڵەمێش.' ئەوجار شـاژنی ماران حاسـیبی بانگ کرد و گوتی: 'وەرە ئێرە و بە دەستی خۆت بمگرە و لەسەر ئەو مەجۆعمەیەم دانێ وا لەگەڵ خۆتان هێناوتانە. لەگەڵ چارەنووس هیچ ناگرێ و هەر دەبێ بە دەستی تۆ بکوژرێم.

ئیدی حاسیب، شاژنی مارانی گرت و لە سەر مەجۆعمەکەی دانا. مەجۆعمەکەی لە سەر سەری دانا و بەرەو شار گەڕانەوە. هەر وا کە دەڕۆیشتن، لە نێو ڕێدا شاژن سەری بردە بن گوێی حاسـیب کەریمەددین و پێی گوت: 'حاسـیب! گەرچی پەیمانت شـکاند و بەڵێنت نەبردە سەر، بەڵام قەیناکا سووچی تۆ نییە و چارەنووس وای بۆ بڕیومەوە. ئێستا شتێکت پێ دەڵێم بەڵام بە گوێم بکە زەرەر ناکەی هیچ زۆریش لە قازانج دەبی.' حاسیب بە شاژنی گوت: 'شـاژن، هەرچی پێم بڵێی لە قسـەت ناچمە دەرێ' شـاژنی ماران گوتی: 'کە دەگەنە ماڵی وەزیر، ئەو بە تۆ دەڵێت: 'سـەری ئەم مارە ببڕە و گۆشـتەکەی بکە بە سـێ کوتەوە.' تۆ بڵێ: 'من ناتوانم سـەری ببڕم' و بە گوێی مەکە تا خۆی سـەرم ببڕێ و گۆشـتەکەم بکا بە سێ کوتەوە. جا کە کوشتمی، گۆشتەکەم لەتلەت دەکا، کەسێک لە لایەن کەرەزدانشاوە دێ لە دوای ئەو و لەگەڵ خۆی دەیبا. وەزیر گۆشـــتەکەم دەکاتە مەنجەڵێکی مســـەوە و لەســـەر ئاگردانێکی دادەنێ و بە تۆ دەڵێ: 'ئاگرەکەی هەڵکە و ئاگات لەم مەجەڵە بێ. چاوەدێری بکە تا وردەوردە گۆشـتەکە چەوری دەداتەوە. ئیدی چەورییەکەی بگرە و بیکە شـووشـەیەکەوە و ماوەیەک ڕاوەسـتە تا سـارد دەبێتەوە. ئینجا بیخۆرەوە و با هەرچی هۆکاری ناســـاغی و ئازارە لە لەشـــتدا نەیهێڵێ. ئاورەکەی بۆ خۆش کە دوایی دیســـان گۆشتەکە چەوری دیکە دەداتەوە. دیسان چەورییەکە بگرەوە و بیکە شووشەیەکی دیکەوە بۆ من. منیش دەیخۆمەوە، هێندێک پشت و شتم دێشێ بەشکوو بڕەوێ.'

" 'بە کورتی، وەزیر دوو شـووشـەت دەداتێ و ئەم قسانەت بۆ دەکا و خۆی دەچێ بۆ لای پادشـا. ئەوجار تۆ ئاگرەکە هەڵبکە، جاری یەکەم کە گۆشـتەکە چەوری داوە، تۆ ئەوە بگرە و بیکە شووشەیەکەوە و دایێ بۆ وەزیر با ئەو بیخواتەوە، وریا بە نەچی بیخۆیەوە. ئینجا کە دیسان گۆشتەکە چەوریی دەڵاندەوە، بیگرە و لە شـووشـەیەکی بکە و بۆ خۆتی دابنێ. کە وەزیر لای پاشاوە هاتەوە و داوای شووشەی دووەمی لێ کردی، تۆ شووشەی یەکەمی بدەرێ. جا بزانە چی بەسەر دێ.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی پێنجسەد و سی و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! شاژنی ماران گوتی: 'دوایە بۆخۆت لە شووشەی دووەم بخۆرەوە. کە تۆ ئەوە بخۆیتەوە، دڵت دەبێتە کانگای زانست. ئینجا گۆشتەکە بەرە بۆ پادشا با بیخوا. دوای ئەوەی پادشا گۆشتەکەی خوارد؛ دەسماڵێکی بە سەر سەروچاویدا بدە و لێی گەڕێ تا تەواو گۆشـتەکە کاری خۆی دەکا با بخەوێ. ئەوجار کەمێکی بادە دەرخوار بدە. لەڕێوە چاک دەبێتەوە و بە هێزی هێزدار نەخۆشـی لە لەشـیدا نامێنێ. بەڵام چۆنم پێ گوتی ئاوا بکە و لە قسەم دەر مەچووە.'

"وا بوو ڕۆیشـتن تا گەیشـتنە ماڵی وەزیر. وەزیر بە حاسـیبی گوت: 'لەگەڵم وەرە ژوورەوە.' کە وەزیر و حاسـیب چوونە ژوورێ، کاربەدەسـتان و سـوپا بڵاوەیان کرد و هەریەکەی چوو بە لای کاری خۆیەوە. حاسیب مەجۆعمە مارەکەی لەسـەر سـەری داگرت و داینا. وەزیر پێی گوت: 'ئەو مارە سـەر ببڕە.' حاسـیب گوتی: 'من ناتوانم سـەری ببڕم. قەت هیچم سـەر نەبڕیوە. خۆت سـەری بڕە.' ئیدی وەزیر شـەمهوور هەسـتا و شـاژنی مارانی لەسـەر مەجۆعمەکە گرت و سـەری بڕی. حاسـیب بە دیتنی ئەو دیمەنە زۆر تێک چوو دەسـتی کرد بە گریان و بە کوڵ گریا. وەزیر پێی پێکەنی و گوتی: 'گەوجە، ئەوە بۆ مار دەگرییت؟!'

"دوایی وەزیر گۆشـتی مارەکەی کرد بە سـێ کوتەوە و خستییە مەنجەڵێکی مسـەوە، مەنجەڵەکەی لەسەر ئاگردان دانا. لەو جەنگەیەدا کۆیلەیەک لای پاشاوە هات و بە وەزیری گوت: 'پادشا کاری پێتە دەفەرموێ هەر ئێستا بێ. وەزیر هەستا. دوو شووشەی هێنا و بە حاسـیب کەریمەددینی گوت: 'ئاگرەکەی بکەوە و بۆی خۆش کە تا گۆشـتەکە لە نێو مەنجەڵەکەدا تەواو چەوری دەداتەوە. ئەوجار چەورییەکە لەسـەر گۆشـتەکە بگرە و بیکە یەکێ لەم شـووشانەوە و ماوەیەک بوەستە تا سارد دەبێتەوە. ئەوجار تۆ ئەوە بخۆرەوە. ئەگەر ئەوە بخۆیەوە، ئیدی هیچ ئێشێ لە لەشتدا نامێنێ. با ئاورکە هەر خۆش بێ تا دیسان گۆشـتەکە چەوریی دەدەڵێنێتەوە، ئەوجاریش چەورییەکە لەسـەر گۆشـتەکە بکەوە و بیکە شـووشـەکەی دیکەوە و لای خۆت هەڵیگرە تـا دێمەوە و دەیخۆمەوە، چونکە منیش پشتێشەمە، بەشکوو پشتی منیش چاک بێ و ئێشم نەمێنێ.' دوای ئەوە وەزیر چوو بۆ لای پادشـا، حاسـیب ئاگری لەژێر مەنجەڵەکەدا کردەوە ڕاوەسـتا تا گۆشـتەکە چەوریی داوە. ئەوجار چەورییەکەی لەسەر گۆشتەکە گرت و کردییە شووشەیەکەوە و شووشەکەی لەو لاوە دانا. ڕێک بەو جۆرەی کرد کە شـاژنی ماران پێی گوتبوو. کە گۆشـتەکە کوڵا، مەنجەڵەکەی لەسـەر ئاگر داگرت و چاوەڕێ بوو تا وەزیر هاتەوە. کاتێک وەزیر لە لای

پاشـا هاتەوە، بە حاسـیبی گوت: 'دەی چیت کرد؟' حاسـیب گوتی: 'کارەکەم کرد.' وەزیر گوتی: 'چیت لە شـووشـەی یەکەم کرد؟' حاسـیب گوتی: 'خواردمەوە.' وەزیر گوتی: 'هیچ گۆڕانێک لە لەشـتدا نابینم!' حاسـیب گوتی: 'کوڕە لەوەتی خواردوومە لە تەوقی سـەرم تا نووکی پێم دەڵێی ئاورە دائیسـێ. ئەوجار وەزیر گوتی: 'ئەی شـووشـەکەی دیکە کوا؟' حاسـیب شـووشـەی یەکەمی بۆ هێنا. وەزیر بە گومانی خۆی ئەوە شـووشـەی دووەمە. لەڕێوە بە سەرییەوە نا. هێشتا لە قورگی نەچووبووە خوارێ کە لەشی هەڵئاوسا و دای بە زەویدا، ئەو قسـەیەی پێشـینیان وە ڕاسـت گەڕا کە دەڵێن: 'ئەوەی چاڵ بۆ ئەم و ئەو هەڵکەنێ، خۆی تێ دەکەوێ.' ئینجا حاسیب بە خۆی گوت: 'ئەگەر ئەوەی شووشەی دووەم زیانی بووبایە، ئەوا وەزیر بۆ خۆی دانەدەنا.' ئەوجار پشـتی بە خودا بەسـت و ئەوەی لە شووشەی دووەمدا بوو خواردییەوە. دەمودەست مێشکی بوو بە کانگای زانست و دەرکی زانیاریی بە ڕوودا کراوە. پاشـان ئەو گۆشـتەی لە مەنجەڵەکەدا بوو، کردییە دەفرێکی مسییەوە..."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی پێنچسەد و سی و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! حاسیب گۆشتەکەی خستە دەفرێکی مسییەوە. لە ماڵی وەزیر وەدەر کەوت کە سەیری ئاسمانی کرد، هەر حەوت ئاسمان و ئەستێرانی جێگیر و گەڕۆک و چۆنییەتی ڕەوتی هەسارەکانی بینی و هەقیقەتی وشکایی و ئاوی بۆ وەدەرکەوت و زانیاریی لەبارەی ئەندازە و گەردووونناسی و ژمارەزانییەوە وەرگرت و ڕێساکانی خۆرگیران و مانگگیران و کاتەکانیانی هاتە دەست. دوایی سەیری زەویی کرد، هەرچی تێیدا بوو لە کانزا و ڕووەک بینینی و زمانی هەموویان فێر بوو. زانیاری لەمەڕ زانستی پزیشکی و سیمیا[1] و کیمیاوە[2] پەیدا کرد. ئەوجار گۆشتەکەی برد و ڕۆیشت تا گەیشتە کۆشکی کەرەزدان‌شا و لە پێش پادشا ڕاوەستا. کورنۆشی برد و پێی گوت: 'ئەگەر وەزیر شەمهوور مردووە، پادشامان سڵامەت و تەمەن درێژ بێ.' پادشا بەم قسەیە تووڕە بوو. بۆ مردنی وەزیر بە کوڵ گریا و کاربەدەست و گەورەگەورەکانی حوکوومەتیش گریان.

"پادشا ئەوجار گوتی: 'خۆ ئێستا وەزیر شەمهوور لە لای من بوو و چوو گۆشتەکەم بۆ بێنێ! هۆکاری مردنەکەی چی بوو و چی لێ قەوما؟' حاسیب، چۆنییەتی مردنەکەی بۆ پادشا گێڕاوە. باری خەمێکی قورس کەوتە سەر شانی پادشا و بە حاسیبی گوت: 'بڵێی دوای وەزیر شەمهوور دۆخی من چی بەسەر بێ؟' حاسیب گوتی: 'خاوەنشکۆ! خەم مەخۆ. من بە سێ ڕۆژ چارەت دەکەم و تۆزقاڵێک ناساغی لە لەشتدا ناهێڵم.' کەرەزدان‌شا بە بیستنی ئەم قسەیە خۆشحاڵ بوو و بە حاسیبی گوت: 'من بەس دەمەوێ لەم بەڵایە ڕزگارم ببێ، خودای دەکرد ساڵێکی پێ دەچوو.'

"ئەوجار حاسیب هەستا، گۆشتی شاژنی مارانی هێنایە پێشەوە، کەمێکی دەرخواردی پادشا دا. دەسماڵێکی بە ڕووی پاشادا دا و پێی گوت، بخەوێ. پادشا لە ئێوارەوە تا ڕۆژئاوابوون نووست تا گۆشتەکە جوان دەن[3] بوو و دەگیانی گەڕا. ئەوجار حاسیب پادشای هەستاند و کەمێکی بادە دایە و خەواندییەوە. پادشا تا بەیانی خەوت. کە ڕۆژ بووەوە، هەمان کاری دوێنێی دووپاتە کردەوە. تا بە سێ ڕۆژ هەر سێ کوتە گۆشتەکەی دەرخوارد دا. ڕۆژی سێیەم پادشا لە تەوقی سەر تا نووکی پێی ئارەقەی دەردا. دوای ماوەیەک ئارەقەکەی ویشک بوو و نەخۆشییەکانی پەڕی و هیچ ئازارێک لە لەشیدا نەما. کە ئازاری نەما، حاسیب پێی گوت: 'ئێستا دەبێ بچیتە گەرماو.' ئەوجار پادشای بردە

---

[1]. زانستی سیحر و جادوو بە هەموو جۆرەکانییەوە.

[2]. زانستێک کە لە قەدیمدا پێیان وابوو هەرکەس بیزانێ دەتوانێ ئاسن و مس بکا بەزێڕ.

[3]. دەنبوون : هەڵتاواندن، گڤێرین.

گەرماو جوان شۆردی و هێنایەوە. لەشی پادشا وەک زیوی بێخەوشی لێ هات و لە جاری جاران باشتر بووەوە.

"ئەوجار پادشا کەوای شکۆمەندانەی پۆشی و لەسەر تەختی پادشایەتی دانیشت. ڕێی دا حاسیب کەریمەددینیش لەگەڵیدا دابنیشێت. حاسیب لەتەنیشتیدا دانیشت. پادشا فەرمانیدا سفرە ڕاخەن. لەگەڵ حاسیب خواردیان و خواردیانەوە. پاشان وەزیر و کاربەدەست و سەرهەنگ و فەرماندەرانی سوپا و گەورەگەورەکانی دەوڵەت بۆ پیرۆزبایی هاتنە لای پادشا. پادشا پێی گوتن: 'ئەی وەزیر و کاربەدەست و سەرهەنگ و فەرماندرانی سوپا و گەورەکانی دەوڵەت، سەروەزیری من ئەم حاسیب کەریمەددینەیە وا چارەی دەردی منی کرد. ئاگادار بن کە بۆخۆم ئەوم لە جێی وەزیر شەمهوور کردە سەرۆکی وەزیرانی خۆم.'
"

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و سی و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! پادشا گوتی: 'ئەوە حاسیبم کردە سەروەزیر. هەرکەس گوێڕایەڵی ئەو بکا، گوێڕایەڵیی منی کردووە.' لەڕێوە هەنتەشییان هەستان، دەستی حاسیبیان ماچ کرد و پیرۆزبایی سەروەزیرییان لێ کرد. ئەوجار پادشا قوماشێکی گرانبایی کە لە زێڕی سوور چنیبوویان و پەراوێزەکانی بە گەوهەر و یاقووتی گرانبایی نەخشێنرابوو، هەرزانترینی ئەو گەوهەرانەش نرخەکەی پێنجهەزار دیناری زێڕی سوور بوو، دای بە حاسیب. سێسەد کەنیزۆکی ڕۆمیی جوان و دڵڕفێن و سێسەد کەنیزۆکی حەبەشی و پێنجسەد هێستری بە بارەوە بە دیاری دایە کە هەموو ماڵی گرانبایی بوون. ئەوەندەشی مەڕ و ماڵات و چوارپێ و گا و گوێلک داییێ، لە ئەژمار نەدەهاتن. سەرباری هەموو ئەم شتانەش، وەزیر و کاربەدەست و گەورەگەورەکانی دەوڵەتی ڕاسپارد، دیاری شیاوی بۆ بنێرن.

"ئەوجار حاسیب کەریمەددین سوار بوو، وەزیر و کاربەدەستان و گەورەگەورەکانی دوڵەت و تەواوی سوپاش سوار بوون و وە دوای حاسیب کەوتن تا گەیشتنە ئەو خانووەی پادشا بۆ حاسیبی دیاری کردبوو. ئەوجار حاسیب لەسەر کورسی دانیشت، وەزیر و گەورەگەورەکانی حوکوومەت هاتنە پێشەوە، دەستیان ماچ کرد و پیرۆزباییان لێ کرد. خزم و کەسی حاسیب خۆشی و شادی لە دڵی گەڕا. پاشان ئەنجینەکێشەکان کە هاوڕێیانی حاسیب بوون، هاتن و پیرۆزباییان لێ کرد. دوایی حاسیب سوار بوو و چوو بۆ ماڵی وەزیر شەمهوور و ئەوەی لە ماڵی ئەودا بوو هێنایە ماڵەکەی خۆی. ئەوێک کە هیچی لە زانست و زانیاری نەدەزانی، بە هێزی هێزدار لە هەموو زانستێک شارەزا ببوو، ژیری و زاناییەکەی حەوت کەوشەنی تێپەڕاندبوو. دوای ئەوە، ڕۆژێک لە ڕۆژان بە دایکی گوت: 'دایە گیان، خۆ دانیالی باوکم پیاوێکی زانا و تێگەیشتوو بوو، دا پێم بڵێ کتێب و شتی وا چی بەجێ هێشتووە.' دایکی کە ئەو قسەیەی لێ بیست، هەستا چوو ئەو مجرییەی هێنا وا باوکی ئەو پێنج پەڕەی تێدا هەڵگرتبوو کە لە کتێبە ژێرئاوکەوتووەکانەوە بۆی مابوونەوە، لە پێش حاسیبی دانا و پێی گوت: 'باوکت جگە لەو پێنج پەڕە هیچی لە پاش بەجێ نەماوە.' حەسیب خێرا سەری مجرییەکەی هەڵگرت و پەڕەکانی دەهێنا و خوێندییەوە و گوتی: 'دایە ئەو پەڕانە بەشێکی پەڕتووکێکی گەورەن؛ پێم بڵێ ئەوانی دیکە چیان لێ هاتووە؟ دایکی حاسیب گوتی: ' ڕۆڵە گیان، باوکت بە دەریادا دەگەڕا و کتێبەکانیشی لەگەڵ خۆیدا دەبرد، جارێکیان کەشتییەکەی لە دەریادا شکا و پەڕتووکەکانیشی نوقم بوون. باش بوو خودای گەورە باوکتی ڕزگار کرد، بەڵام لە پەڕتووکەکانی هەر ئەو پێنج پەڕەی بۆ دەرچوو. کاتێک باوکت لە سەفەر گەڕاوە، من بە تۆ دووگیان بووم. پێی گوتم: 'ڕەنگە کوڕت ببێ. ئەو پەڕانە هەڵگرە. کاتێک گەورە بوو، لە میراتی پرسی، پێی بڵێ کە باوکت جگە لەم پێنج پەڕە

هیچی بەجێ نەهێشتووە.' دوای ئەوە حاسیب کەریمەددین لە خۆشترین ژیان و عەیش و نۆش و خۆشی و شادیدا بوو تا ئەوەی کە تێکدەری خۆشییەکان و شێوێنەری کۆمەڵەکان بەربینگی گرت. پاکە ئەو خودایەی نامرێ."

**چیرۆکی سەندباد**

شەهرزاد کە چیرۆکی حاسیب کەریمەددینی تەواو کرد، گوتی: " ئەم چیرۆکە خۆش بوو، بەڵام بە قەد چیرۆکی سەندباد خۆش نییە." شەهریارشا گوتی: "چیرۆکی سەندباد چۆناوچۆنە؟"

شەهرزاد گوتی: "دەڵێن لە سەردەمی خەلافەتی هارونەڕەشید کابرایەکی هەژاری لێقەوماو لە شاری بەغدا بوو، ناوی سەندبادی کۆڵبەر بوو. هەمیشە باری قورسی هەڵدەگرت و بە کرێی کۆڵبەری دەژیا. بە هەڵکەوت ڕۆژێکی گەرم کە تینی تاو ئاسنی دەتواندەوە و جەرگی کەرپەزی[1] دەبرژاند، سەندباد کۆڵێکی قورسی بە کۆڵەوە بوو. لە گەرمان و لەبەر ماندوویان پشووی دەرنەدەهات و چین چین ئارەقەی دەردەدا. وا بوو گەیشتە بەر دەرگای ماڵی بازرگانێک، بەر دەرگاکەیان تازەماڵدرابوو، ئاوپڕژێن کرابوو. زۆر فێنک و دڵڕفێن بوو، سەکۆیەکی گەورە لە پەنا دەرگای ئەو ماڵە بوو، سەندباد کۆڵەکەی لە سەر سەکۆکە دانا و ویستی پشوویەک بدا."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. کەرپەز: زەردەقوڕە.

## که شەوی پێنجسەد و سی و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! که سەندبادی کۆڵکێش بۆ وچانێک کۆڵەکەی لەسەر ئەو سەکۆیە دانا، شنەیەکی بلاوێن تەزووی بە لەشیدا هێنا. کەیفی بەو شنەیە ساز بوو، لە سەر لێواری سەکۆکە دانیشت، لەو ماڵەوە دەنگی گۆرانی و سەما و چریکەی باڵندەی خۆشخوێن دەهات، ئەوەندەی دی گوڕ و تینی بە بەردا هاتەوە. چووە نێو دەرگاکە و سەرێکی کێشا ژووری. لەو ماڵەدا باخێکی گەورەی بینی و سەیری کرد کۆیلە و خزمەتکار و هەموو جۆرە ئامرازێکی عەیش و نۆش و مەزنیی تێدایە و بۆنی چێشتی خۆشی دێ. ئەوجار سەری بۆ ئاسمان هەڵبڕی و گوتی: 'ئەی بەدیهێن و پەروەرێن، ئەی ڕۆزیدەری زیندەوەران، تۆبە، پەشیمانم لە ئاکار و گوناهم و داوات لێ دەکەم لە هەموو گوناحەکانم خۆش ببی و عەیب و عارم بپۆشی.! کەس ڕەخنەی لە کاری تۆ نییە و بۆی نییە پرسیار لە کردەی تۆ بکا. تۆ ئەو زاتە پاکەی کە هەرکەسێکت بوێ بێنیازی دەکەی و هەرکەسێکیش بتەوێ نیازمەدی دەکەی. یەکێ سەربەرز و یەکێ سەرشۆڕ دەکەی. تۆی بەدەسەڵاتی زاڵ و کاربەجێ. هەرکەس بتەوێ ڕۆزیی هەراو و نیعمەتی بێڕادەی بەسەردا دەڕێژی، هەر بەو جۆرەی وا ئاسوودەیی بێکۆتا و بەخششی فرەت بەم ماڵە داوە کە هەوای خۆش و خواردن و خواردنەوەی بەتامی تێدایە و ژیان تێیدا لەوپەڕی تەکووزیدایە. هەرکەسێ هەر چییەکت پێ ڕەوا دیبێ، ئەوەت داوەتێ: یەکێ لە خۆشی و شادیدا، یەکێ لە ڕەنج و مەینەتدا. یەکێ بەخت یاوەریەتی و، یەک وەک من نەدامەتییەتی.' ئەوجار ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ژیانی شەمووز سمکۆڵان دەکا
ناوەستێ و کاری خۆی دەکا و دەڕوا
یەکێ دەگلێنێ لە تۆز و خۆڵدا
یەکێ دەیگرێ و دەستەمۆی دەکا
یەکێ شاد دەکا بە ئامانجەکەی
یەک هەڵدەدێری بۆ نێو گۆڕەکەی
ئەوەیە ژیان قەت پێی مەنازە
کەس تێ نەگەیی لەو ڕەمز و ڕازە

"کە کۆڵبەرەکە شێعرەکەی تەواو کرد، گەرەکی بوو بگەڕێتەوە و بچێتە دەرێ، لەناکاو کوڕێژگەیەکی جوانکیلە و نەونەمام کە پۆشاکی بەری لە ئاوریشمی نەخشداری چینی بوو،

هات و قۆڵی سـەندبادی کۆڵبەری گرت و پێی گوت: 'وەرە ژووری. گەورەکەم کاری پێتە.' کۆڵبەر تەماشـایەکی کرد، دیتی ناکرێ سـەرپێچی قسـەی کورێژگەکە بکا و چارە نییە دەبێ بچێتە لای گەورەکەی. گورج کۆڵەکەی لە دالانەکە بە دەرگـاوان سـپـارد، خۆی لەگەڵ کورێژگەکەدا چووە ژووری.ماڵێکی دیت، لە دار و دیواری خۆشـی و ئاسـوودەیی دەباری. لەوێدا بەزمێکی شـاد و کۆڕێکی خۆشـتر لە باخی ئیرەمی دیت کە هاوڕێیانی دڵپاک و ئەمەکدار لەوێدا دانیشـتبوون و سـەرگەرمی گفتوگۆ بوون. لە هەموو جۆرە نوقڵ و میوە شیرین و بەتامەکانی لێ بوو. بادەی ڕوونی ترێیان دانابوو. ئامێرگەلی مۆسیقا وەک چەنگ و عوود و دەف و نەی بە دەستی کەنیزانی شۆخ و شەنگەوە بوو، هەرکام لە لای خۆیەوە ڕێکوپێک و بە شـێوەیەکی جوان ڕیز بووبوون. لەسـەروی کۆڕەکەوە پیاوێکی بەڕێز دانیشـتبوو، دیاردەکانی پیری تێیدا سـەری هەڵدابوو. بەڵام پیاوێکی وێچوو و خوێنشـیرن و بەسـام و شـکۆ و سـەنگین بوو. سـەندبادی کۆڵبەر لە سـەیری ئەو دیمەنە پەشـۆکا و بە خۆی گوت: 'ئەم ماڵە یا باخێکە لە باخەکانی بەهەشت، یا ماڵی یەکێک لە پاشایانە!' ئەوجار بەوپەڕی ڕێزەوە چووە پێشـەوە، سـڵاوی لە دانیشـتووان کرد و نزای بۆ کردن، کوڕنۆشی برد و سەری داخست و ڕاوەستا."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و سی و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! سەندباد ڕاوەستا. خاوەنی کوڕەکە پێی گوت دانیشێ، بانگی کردە نیزیکی خۆیەوە و بەخێرهاتنی کرد. مەمنا کەسێکی دلۆڤان بوو، سەری قسەی لەگەڵ سەندباددا کردەوە و پرسیاری لەبارەی زۆر شتەوە لێ کرد تا سفرە ڕاخرا و خواردەمەنی خۆش و بەتامیان دانا. سەندبادی کۆڵبەر هاتە بەرەوە، ناوی خودای لێ هێنا، بەشی خۆی خوارد، دەستی شۆرد و سپاسی خودای کرد. ئەوجار خاوەنی ماڵەکە پرسی: 'کاکە، ناوت چییە و چ کارەی؟' سەندباد گوتی: 'ناوم سەندباد کۆڵبەرە. بار و کۆڵ و شت بۆ خەڵک هەڵدەگرم و حەقدەست وەر دەگرم و بژیومی پێ دابین دەکەم.' خاوەنی ماڵەکە بزەیەکی هاتێ و پێی گوت: 'کاکی کۆڵبەر، من و تۆ هاوناوین، بە من دەڵێن: 'سەندبادی دەریایی.' بەڵام کاکی خۆم، من دەمەوێ ئەو شێعرەی لە بەر ماڵەکەی مندا گوتت، دیسان بۆم بڵێیت با جارێکی دیکە گوێم لێ بێ.' کۆڵبەر شەرمی کرد و بە سەندبادی دەریایی گوت: 'سوێندت دەدەم بە خودا کە لێم بە دڵ مەگرە. ئاخر ڕەنج و سەختی و کوێرەوەری و نەبوونی پیاو کەمعەقڵ و بێئەدەب دەکەن.' سەندبادی دەریایی گوتی: 'کوڕە شەرم مەکە. تۆ برای منی. شێعرەکەم بۆ بڵێ؛ هەر زۆر بە لامەوە خۆش بوو.' کە سەندبادی کۆڵبەر زانی زۆری پێ خۆشە بیبیستێ، شێعرەکەی بۆ گوتەوە. سەندبادی دەریایی ئەو شێعرەی پێ سەیر بوو و بە بیستنی کەیفی ساز بوو و بە کۆڵبەری گوت: 'جا من شتێکم بەسەر هاتووە، هەر زۆر سەیرە. حەز دەکەم لێی بەئاگا بی و تەواوی ئەو ڕووداوانەی بەر لەم خۆشگوزەرانی و پێگەیستنەم بەسەرم هاتوون، بۆت بگێڕمەوە. با بزانی کە من ئەم خۆشبەختییەم دوای ڕەنج و کوێرەوەری و چەرمەسەرییەکی زۆر دەست کەوتووە. حەو سەفەرم کردووە و لە هەر سەفەرێکدا ڕووداوێکی سەیر و سەمەرە و سەختی وام بەسەر هاتووە بە بیستنیان سەر کاس دەبێ. بەڵام ئەوەندەش بزانە کەس ناتوانێ خۆی لە قەزا و قەدەر بدزێتەوە.

### چیرۆکی، یەکەم گەشتی سەندبادی دەریایی

" ' یەکەم چیرۆک کە لە یەکەم گەشتدا ڕووی دا ئاوا بوو: باوکم بازرگانێک بوو وەک بازرگانەکانی دیکە. کاتێ کۆچی دوایی کرد، من دەستم بەسەر ماڵەکەیدا گرت و دەستم کرد بە خواردن و خەرج کردنی، لەگەڵ لاوە هەرزەکارەکاندا دادەنیشم بادەم دەخواردە. هەموو ڕۆژێک لەگەڵ هاوڕێکانمدا دەچووم لە ناو باخ و سەیرانگاکان و دەسووڕامەوە و لە عەیش و نۆشدا بووم پێم وا بوو ئەو ماڵە قەت تەواو نابێ و بە ڕاستی ئەو جۆرە ژیانە لە بەرژەوەندیم دایە. ماوەیەکی زۆر ئاوام ڕابوارد.کاتێک وە خۆ هاتمەوە زانیم لاڕێ بووم، زۆر درەنگ بوو. ماڵەکەم لەدەست بیووەوە. ژیانم ژێروژوور ببوو. خەم و خەفەت دایگرتم.

ئاخری ناچار بووم دەستم دایە کاری تاقەت پرووکێن. چیرۆکی حەزرەتی سولەیمانی کوڕی داودم بیستبوو. وە بیرم هاتەوە کە فەرمووبووی سێ شت لە سێ شت باشترن: ڕۆژی مردن لە ڕۆژی لەدایکبوون، سەگی زیندوو لە شێری مردوو و گۆڕ لە کۆشک.' ئیدی هەستام، ئەو ماڵ و موڵکە بۆم مابووەوە، فرۆشتنم و سێهەزار درەمم خڕ کردەوە. بە مێشکمدا هات بڕۆم بۆ وڵاتانی دوور. ئەو قسەیەی شاعیرم بیر کەوتەوە کە گوتبووی:

لە گوند و شارێک خۆت قەتیس مەکە
تۆزێک واوە چۆ چاوانت وەکە
دونیا بەرینە ئەسپی خۆت ڕادە
دۆش دامەمێنە و خۆتی لێ بادە
هیچ پەیدا نابێ بۆ خەویڕی نوستوو
ڕێوی گەڕاو بە نەک شێری نوستوو

" 'ئیدی چاکی مەردایەتیم بە لادا کرد و کەلوپەلی بازرگانیم کڕی و خۆم ساز کرد لە دەریا بدەم. چوومە شاری بەسرە و لەوێ لەگەڵ تاقمێک لە بازرگانان سواری کەشتی بووم. شەو و ڕۆژ بە دەریادا ڕۆیشتم و لەم دوورگە بۆ ئەو دوورگە و لەم دەریا بۆ ئەو دەریا. کە دەگەیشتمە هەر جێیەک، شتێکم دەکڕی و شتێکی دیم دەفرۆشت هەتا وا بوو گەیشتمە دوورگەیەک لە گوێن باخی بەهەشت. کەشتیوانەکە کەشتییەکەی بەرەو کەناری دوورگەکە ئاژۆت. ئەوەی لە کەشتییەدا بوو دابەزینە دوورگەکەوە و ئاگردانیان ساز کرد و ئاگریان کردەوە و هەر کەسەی خەریکی کارێک بوو: یەک چێشتی لێدەنا، یەکێ جل دەشۆرد و یەک خەریکی سەیر و گەڕان بوو. من لەوانە بووم چووم سەروگوێیەک ئاو بدەم.

" 'سەرت نەئێشێنم، خەڵکەکە سەرقاڵی خواردن و خواردنەوە و ڕابواردن بوون کەشتیوانەکە لە کەناری دوورگەکە ڕاوەستابوو و لەناکاو یەکبەخۆی قاوی کرد: 'هۆ خەڵکینە، گەر دەتانهەوێ ڕزگارتان بێ، خێرا هەڵێن، سواری کەشتییە ببنەوە. هیچ لەگەڵ خۆتان مەبەن و گیانی خۆتان ڕزگار کەن. ئەمە دوورگە نییە، بەڵکو ماسییەکی زەبەلاحە کە هاتووەتە سەر ئاوەکە و لم و خۆڵ و دار و بەردی لەسەر کۆ بووەتەوە و گژ و گیا و داری بەسەرەوە ڕسکاوە و وەک دوورگەی لێ هاتووە! جا ئێوە کە ئاگری لەسەر بکەنەوە، تینی گەرمییەکە کاری تێ دەکا؛ هاکا هەر ئێستا ببزوێ و هەمووتان هەڵڕێژێتە دەریاوە. کوڕە گشتتان نوقم دەبن. خێرا کەن خۆتان ڕزگار کەن با تێدا نەچن!

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و سی و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! 'سەرنشینەکان بە بیستنی قسەکانی کەشتیوان ترسیان ڕێنیشت و پەشۆکان. ئاگردان و کەلوپەلەکانیان جێ هێشت و خێرا بەرەو کەشتییە هەڵاتن. هەندێکیان گەیشتبوونە کەشتییە و هەندێک نەگەیشتبوونێ کە دوورگەکە لەرزایەوە و ڕۆیشتە خوارێ و نوقم بوو هەرچی لەســـەر ئەو دوورگەیە بوو ڕۆچووە دەریاوە. منیش یەکێک لەوانە بووم وا ڕۆچووینە دەریاوە. بەڵام خودا خۆی فریام کەوت. تەختەیەکی گەورە کە جلیان تێدا دەشـۆرد، بەرەو ڕووم هات. دەسـتم پێوە گرت و چوومە سـەری دانیشـتم. جا چونکە جەنگەی ئاوا گیان زۆر خۆشـەویسـتە، لە تاوا بۆقاسـا بە چوارپەلم درم بە ئاوەکە دەدا و مەلەم دەکرد و، شەپۆلەکانیش لە ڕاست و چەپەوە یارمەتیان دەدام.

" 'کەشـــتیوان چارۆکەی کەشـــتییەی هەڵدا و لەگەڵ ئەو کەســـانەدا وا لە نوقمبوون ڕزگـاریـان بووبوو و لە کەشـــتییەدا بوون، وەڕێ کەوتن و لایـان لەوانەی نـاو ئـاوەکە نەکردەوە. من هەر چاوم لە کەشـــتییە بوو تا ئەوەی کە لە چاو ون بوو. ئیدی لە مەرگی خۆم دڵنیا بووم و دەستم لە ژیان شوت. پاش ماوەیەک شەو داهات و ئەو شەوە تا بەیانی بەسەر تەختەکەوە لە ناو دەریادا سووڕامەوە. شەو و ڕۆژێک لەو دۆخەدا بووم. وا بوو با بە هـانـامەوە هـات و بەرەو قەراخی دوورگەیەکی بردم کە لـکوپۆپی دارەکـانی بە لای دەریادا شـۆڕ بووبوونەوە. دەستم کێشـا و توند لقی یەکێک لە دارەکانم گرت. لە کاتێکدا لە کـاتێکدا بە حـاڵ هێزم لەبەردا مـابوو، وردەوردە لقی دیکەشـــم گرت. بە لقەکانەوە خۆم گەیاندە دارەکە و لەوێشـــەوە چوومە نێو دوورگەکەوە. دوایە تەماشـــام کرد گۆشـــتی لاقم ماســـی خواردبوویان و زامداریان کردبوو، بەڵام من لە ترســـی گیانی خۆم، هەر پێشـــم نەزانیبوو.

" 'ئەوجار وەک مردوو لە دوورگەکەدا لێی کەوتم. هێندە شـــەکەت بووم تا بەیانی وە خەبەر نەهاتبووم. کە خۆر گەییە سەرم، هۆشم هاتەوە بەر و سەیرم کرد هەردووک قاچم ئاوساون. جارێ لەسەر دەست و جارێ لەسەر ئەژنۆ ئەملا و ئەولام دەکرد. لە میوەگەلی دوورگەکەم دەخوارد و لە کانیاوەکانی ئاوم دەخواردەوە. تا وا بوو دوای چەند شـــەو و ڕۆژ تۆزێک بووژامەوە و کەنەفتیم نەما و هێزم هاتەوە بەر. گۆچانێکم درووســـت کرد، بە دەســـتمەوە گرت و لەنگەری خۆم پێ ڕادەگرت. بەو دەوروبەرەدا دەگەڕام و ســـەیری دەسکردی کردگارم دەکرد.

" 'ماوەیەکی زۆر بەم جۆرە ڕۆژم ئاوا دەکرد تا ڕۆژێکیان لە قەراغ دوورگەکە دەگەڕام، لە دوورەوە ڕەشـــاییەک دەرکەوت. بە گومانی خۆم هۆڤی یان گیانلەبەری دەریایە. گورج بەرەو لای چووم. تەماشا دەکەم ئەسپێکی گەورەیە و لە قەارغ دوورگەکە بەستوویانەتەوە.

که لێی نیزیک بوومەوە، کوڕژنێکی[1] بەرزی کرد کە زیرەی پێ کردم. لەناکاو پیاوێک لەژێر زەوییەوە هاتە دەر. بەدوامدا هات و بانگی کردم: 'کێی؟ کوێندەرییت؟ بۆ هاتوویتەتە ئێرە؟' گوتم: 'قوربان گیان، من پیاوێکی غەوارەم. لەگەڵ کۆمەڵێک لە هاوڕێکانمدا لە دەریامان دا. وا بوو هەموومان نوقم بووین. خودا منی بەســـەر کردەوە و لەتە تەختەیەکی بۆ ناردم و سواری بووم. ئەو منی بەسەر ئاوەکەدا هێنا تا تا ڕێم لێرە کەوت.'

" 'ئەو کابرایە کە قســەکەمی بیســت، قۆڵی گرتم و گوتی: 'لەگەڵم وەرە.' منی بردە نێو ســارداوێکەوە لەژێر زەویدا و لەوێشــەوە بۆ خانوویەکی گەورە کە هەر لەو ژێرەوە بوو. منی لەو دیوەدا دانا و خواردنی هێنا. زۆرم برســـی بوو. خواردم تا تێر بووم. ئەوجار بەســەرهاتمی پرســی. منیش هەموویم بۆ گێڕاوە. ســەری لەو هەموو پەندە ســوورِ ما کە بەسـەر من هاتبوو. کاتێک گێڕانەوەکەم تەواو بووم، گوتم: 'قوربان، ئێستا کە من چیرۆکی خۆمم بۆ گێڕایتەوە، تکایە تۆش چیرۆکی خۆتم بۆ بگێڕەوە کە تۆ کێی و بۆچی لێر ئاکنجی و ئەو ئەســـپەت لەبەر چی لەو کەنار دەریایە بەســـتووەتەوە؟' ئەو کابرایە گوتی: 'بۆ زانیاریت ئێمە کۆمەڵێکین لە دەوروبەری ئەم دوورگەیەدا بڵاو بووینەتەوە. ئێمە مەیتەری ڕەوە ئەسپەکانی مێهرجانپادشاین و هەموو ئەسپ و ماینەکانی پادشا لە دەست ئێمەدان و هەر مانگێک باشـــترین ماینە بەتەڵەبەکان دێنینە ئەم دوورگەیە، لە کەناری دەریادا دەیانبەستینەوە و خۆمان لە سارداوەکاندا دەشارینەوە تا کەس نەمانبینێ.'

ئەوجار ئەســـپە دەریاییەکان بە بۆنی ماینەکان لە دەریا ســـەر دەردێنن و ســـەیری ئەملاولا دەکەن، کە کەس نەبینن بەغار دێن بۆ لای ماینەکان و ســـواریان دەبن. ئینجا دەیانەوێت ماینەکان لەگەڵ خۆیاندا ببەنە دەریاوە. ماینەکان لەبەر ئەوەی بەســـتراونەوە ناتوانن بڕۆن. ئیدی ئەســپەکان کوڕژن دەکەن و لووشــکە لە ماینەکان دەدەن، گازیان لێ دەگرن. ماینەکانیش بە دەنگێکی بەرز دەکوڕێنن بە جۆرێک کە ئێمە دەیبیســتین و دەزانین کە کارەکەمان ســەری گرتووە. خێرا لە ســارداوەکە دێینە دەرێ و بەســـەر ئەســـپەکاندا دەگوڕێنین، دەنگیان دەدەین و لە ماینەکانیان دوور دەخەینەوە، تا خۆیان لە دەریا دەهاوێنەوە. ئەوجار ئەو ماینانە لە ئەسـپە دەریاییەکان ئاوس دەبن. هەر چییەکیان لە نێر و مێ ببێ، بە نرخی گران دەفرۆشـــرێن و لەســـەر زەویدا هیچ کامیان تایان نابێ. جا ئەم ڕۆژانە کاتی هاتنی ئەسپە دەریاییەکانە و، ئەگەر خودا بیهەوێ تۆ لەگەڵ خۆم دەبەمەوە و دەچینەوە لای مێهرجانپادشا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. کوڕژن: حیلەی توورەییانەی ئەسپ.

## که شەوی پێنجسەد و چلەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! 'مەیتەرەکە گوتی: ' دەتبەمە لای مێهرجانپادشا با شارەکەشمان ببینی. باش بوو، تووشی ئێمە بووی، دەنا لێرە لە تانیاییدا دەمردی و دەستت بە هیچ کوێ ڕانەدەگەیشت و کەسیش نەیدەزانی. بەڵام خەمت نەبێ تازە من ڕزگارت دەکەم و بەڕێت دەکەمەوە شارەکەی خۆت.' منیش دۆعای خێرم بۆ ئەو پیاوە کرد و سپاسی چاکە و دلۆڤانییەکەیم کرد. هەر ئاوا لە باسوخواسدا بووین کە ئەسپێکی دەریایی سەری لە دەریا دەرهێنا و حیلاندی و چووە لای ماینەکە. کە لە کاری خۆی بووەوە، گەرەکی بوو ماینەکە لەگەڵ خۆیدا بەرێتە دەریاوە، بەڵام نەیتوانی. ئەوجار بە لووشکە لێی دا و ئەویش کۆڕاندی. مەیتەرەکە دەستی دا گۆچان و دەهۆڵ و لە سارداوەکە وەدەر کەوت. بە گۆچانەکەی دەهۆڵەکەی کوتا و هاوڕێکانی ئاگادار کردەوە. دەسبەجێ ئەوانیش بە ڕمبەوە لە حەشارگەکانیان هاتنە دەرەوە و کردیان بە هات و هاوار تا ئەسپە دەریاییەکە لێیان سڵەمییەوە و خۆی لە دەریا هاویشتەوە. کابرا تۆزێک دانیشت وا بوو هاوڕێکانی هاتن و هەریەکەی هەوساری ماینێکی بە دەستەوە بوو. کە منیان لای ئەو دی، پرسییان کە کێم. منیش بەسەرهاتی خۆمم بۆ ئەوانیش گێڕاوە. ئەوجار هاتنە پێشێ و سفرەیان ڕاخست و نانمان خوارد. پاشان هەستان سوار بوون و منیشیان سواری ئەسپێک کرد. شەووڕۆژ بەڕێوە بووین تا گەیشتینە شاری مێهرجانپادشا. ئەوان چوونە لای پادشا و باسی منیان بۆ کردبوو. ئەویش داوای منی کرد. منیان بردە هەنتەشی پادشا و لەبەردەمی ڕایانگرتم. سڵاوم لێ کرد، وەڵامی سڵاوەکەمی داوە. گەورەیی نواند و بەسەرهاتمی پرسی. منیش تەواوی سەرگوزەشتەی خۆمم بۆ گێڕاوە. پێی سەیر بوو، گوتی: 'کوڕم، قەسەم بەو خودایە ئەجەلت نەهاتووە، بۆیە لەم سەختییانە دەرباز بووی! بەڵام سپاس بۆ خودا کە سڵامەتی.' ئەوجار دڵخۆشی دامەوە و گەورەیی و سەرنووسەریی کۆیلەرەکەی بە من سپارد. من لە خزمەتیدا مامەوە، ئەو، چاکەی زۆری لەگەڵ کردم و تکاکانمی قەبووڵ دەکرد. ساڵانێک لە لای بووم و هەر کەشتییەک دەگەیشتە دوورگەکە، خێرا لێم دەپرسین لە کوێوە هاتوون هەر دەمگوت بەشکوو لە بەغدا یان شارەکانی نیزیکییەوە هاتبن و منیش لەگەڵ ئەواندا بگەڕێمەوە، بەڵام لە بێبەختی من هیچ کەس و بازرگانێک نەیاندەزانی بەغدا کوێیە. زۆر نارەحەت بووم و بە درێژایی ئاوارەییم مات و مەلوول بووم. هەر لەم دۆخەدا مامەوە تا ڕۆژێک لە ڕۆژان چوومە هەنتەشی مێهرجان. چەند کەسێکی هێندی لە لا بوو. سڵاوم لێ کردن. وڵامی سڵاوەکەمیان داوە و بەخێرهاتنیان کردم و لێیان پرسیم: 'کوێندەرییت؟

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی پێنجسەد و چل و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! سەندبادی دەریایی بە هاوڕێیانی کۆڕەکەی گوت: 'منیش ناونیشان و هەواڵی هێندم لێ پرسین. پێیان گوتم: 'چەند ڕەگەزێکی جۆراوجۆرن. هەندێکیان کریشنا و ڕەسەن و نەجیبزادەن کە ستەم لە کەس ناکەن. هەندێکیان بەرەهمەنن کە ئەوانە هۆزێکن قەت مەی ناخۆنەوە.' بەڵام ئەمانە خۆیان لەگەڵ عەیش و نۆش و بەزم و ڕەزم و سەما و گۆرانی دانویان دەکوڵێ. دەیان گوت حەفتا و دوو و هۆز و بەرەی جیاجیا لە هێندا دەژین. لە وڵاتی مێهرجانپادشادا کە دوورگەی کابولیان پێ دەگوت، دوورگەیەکم دی، شەوانە دەنگی دەف و تەپڵی لێ دەبیسترا، کەچی هیچ کەسێکیش لەوێ نەبینرابوو. لەو دەریایەدا ماسیم بینی کە درێژییەکەی دووسەد باڵ بوو. هەر لەو دەریایەدا ماسییەکم دی کە وەک تابلۆی وێنەکێشەکان ڕەنگاوڕەنگ بوو. کوڕە لەو گەشتەدا شتی سەیر و سەمەرەی زۆرم بینی کە ئەگەر کەمێکیشیان بگێڕمەوە، هێشتا هێند زۆرە لە دوا نایە.

" 'سەرتان نەئێشێنم، بەردەوام بەو دوورگانەدا دەگەڕام و سەیری هەموو ئەو شتانەم دەکرد لە دوورگەکاندا بوو. تا ڕۆژێکیان لە کەناری دەریادا گۆچانم بە دەستەوە بوو، هەر وەک جاری جاران ڕاوەستابووم کە لەناکاو کەشتییەکی گەورە دەرکەوت پڕ بوو لە بازارگان. کە کەشتییە گەیشتێ و لەگەنگەری گرت. سەرنشینەکان هەرچی کەلوپەلی پێیان بوو، دایان گرت و هێنایانە دەرەوە، منیش یەکیەک دەمنووسین. دوایی لە کەشتیوانم پرسی: 'هیچ لە کەشتییەدا ماوە یان نا؟' گوتی: 'بەڵێ، قوربا. بڕێک کەلوپەلی تێدا ماوە، بەڵام خاوەنەکەیان لە یەکێک لە دوورگەکاندا لە دەریادا خنکا و ئێستا کەلوپەلەکانی لە لای ئێمە بە ئەمانەت ماوە. بە تەماین بیانفرۆشین و نرخەکەیان لە بەغدا بدەینەوە بە منداڵ و کەسوکارەکەی. لە کەشتیوانم پرسی: 'ناوی خاوەنی ئەو کەلوپەلانە چی بوو؟' گوتی: 'ناوی سەندبادی دەریایی بوو کە لە دەریادا خنکا.' کە من قسەکەی کەشتیوانم بیست، لێی ورد بوومەوە. ناسیمەوە و هاوارم لێ بەرز بووەوە و پێم گوت: 'کوڕە کەشتیوان، خۆ خاوەنی ئەو کەلوپەلانە منم و من ناوم سەندبادی دەریاییە. لە بیرتە لەگەڵ کۆمەڵێک لە هاوڕێکانمدا نەمانزانی چووینە دوورگەیەک کە ماسی بوو. کاتێک ماسییەکەی ئێمەی بەسەرەوە بوو بزووت، تۆ هاوارت کرد. هەڵێنە ناو کەشتییەکەوە، ئەوەی توانی بگەڕێتەوە ناو کەشتییە، گەڕاوە. ئەوەی نەیتوانی کەوتە دەریاوە. منیش لەوانە بووم وا کەوتمە دەریاوە. بەڵام خودای گەورە تەختەیەکی گەورەوەی بۆ کردمە سەبەب ڕزگاری کردم و گەیاندمییەوە کەناری ئارامی. پاشان ڕێم کەوتە دوورگەیەک و دیسان خودا فریام کەوت تووشی مەیتەرەکانی مێهرجانپادشا بووم. ئەوان منیان هێنا ئەم شارە و بردیانمە هەنتەشی پاشا. ئەویش گەورەیی کرد بەرپرسایەتی سەرنووسەری کۆیلەرەکەی دامێ.

هەنووکە قسەی من لای ئەو بیستراو و وەرگیراوە. جا ئەم کەلوپەلەی لە کەشتییەی تۆدایە هی منە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی پێنجسەد و چل و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! 'کەشتیوان گوتی: 'سوبحانەڵڵا، خۆ ئەمانەتمان لا نەماوە!' گوتم: 'بۆ وا دەڵێی؟! خۆ من بەسەرهاتی خۆمم بۆ گێڕایەوە!' کەشتیوان گوتی: 'ئاخر تۆش بیستت من گوتم کەلوپەلێکم لایە و خاوەنەکەی خنکاوە، ئێستا دەتهەوێ ئەو ماڵەم لێ زەوت بکەی. ئەو ماڵە لە تۆ حەرامە و ئی تۆ نییە و من بە چاوی خۆم دیتم ئەو کابرایە لەگەڵ کۆمەڵێک لە هاوڕێکانیدا کەوتنە دەریاوە و نوقم بوون. تۆ چۆن دەڵێی، من خاوەنی ئەو کەلوپەلەم؟!' پێم گوت: 'دەی مادام وایە، گوێ بگرە با بەسەرهاتی خۆمت بۆ بگێڕمەوە تا ڕاستیت بۆ ڕوون ببێتەوە. ئاخر درۆ پیشەی دووڕوویانە.'

" 'ئەوجار تەواوی سەربووردەی خۆمم لەو ڕۆژەوەی لە بەغداوە وە دەر کەوتین تا ئەو ڕۆژەی گەیشتینە ئەو دوورگەیە و ئەو قسانەی کاتی خۆی لەنێوان من و کەشتیواندا کرابوون، بۆ کەشتیوانم گێڕاوە. ئیدی کەشتیوان و ئەو بازرگانانەشی ئەو کات لە کەشتییەدا لەگەڵم بوون ڕاستیی قسەکانمیان بۆ دەرکەوت و ناسیانمەوە و خۆشحاڵی خۆیان لەوەی کە بە سەلامەتی ڕزگارم بووە دەر بڕی و سوێندیان خوارد: 'باوەڕمان نەدەکرد ڕزگارت ببێت و نەمری. بەڵام دیارە خودا تەمەنێکی تازەی داویتێ.' پاشان کەلوپەلەکەیان لە کەشتییە داگرت، سەیریان کرد ناوی منیان بە سەرەوەیە و هیچیان لێ کەم نەبووتەوە. خێرا هەستام، کردمنەوە و شتە گران و بەنرخەکانم جیا کردەوە تا بە دیاری بیبەم بۆ پادشا و لەگەڵ دەستەیەک لە سەرنشینانی کەشتییەدا چووینە لای پادشا. پادشام تێگەیاند کە ئەم کەشتییە هەر ئەوەیە کە منی تێدا بوو و پێم گوت: 'کەلوپەلەکانم لە کەشتییەدا مابوون، بەبێ کەم و کەسری بە دەستم گەیشتنەوە و ئەم دیارییانەش بەشێکن لە کەلوپەلەکە.' پاشا سەری لەم کارە سووڕ ما و ڕاستیی قسەکانمی بۆ دەرکەوت، دڵاوایی خۆی بەسەردا باراندم و لەبەرانبەر دیارییەکەمدا گەلێک شتی پێ دامەوە. دوایی هەر چییەکم بوو فرۆشتم و کاڵا و کەلوپەلێکی زۆرم لە شتومەکی ئەو شارە کڕی. کاتێک بازرگانەکان ویستیان بڕۆنەوە، منیش کەلوپەل و شتەکانم خستە نێو کەشتییەوە. ئەوجار چوومە خزمەت پادشا، سپاسی چاکە و گەورەیی و دڵاوایییەکەیم کرد. ئینجا داوام لێ کرد ڕێم بدا بڕۆمەوە بۆ وڵاتی خۆم. پادشا ڕێی دام بڕۆمە و ماڵ و سامانێکی زۆریشی دامێ. پاشان ماڵاوایمان لە یەکتر کرد. سواری کەشتییەکە بووین و لەسەر خودا وەڕێ کەوتین. هاتمان هات و بای خوازراو هەڵی کرد وا بوو بێ گێرەوکێشە دوای چەند شەووڕۆژ گەیشتمەوە شاری بەسرە. ماوەیەکی کەم لەوێ مامەوە، دڵم بەوە زۆر خۆش بوو کە لە شاری خۆمەوە نیزیک بووم. ئەوجار بەرەو بەغدا کەوتینە ڕێ. کە گەیشتمە بەغدا، کەلوپەل و کاڵایەکی زۆر و زەبەند و ماڵ و سامانێکی باشم پێ بوو. لە

کەشتی دابەزیم و چوومەوەماڵێ. منداڵ و کەس‌وکار و ناسیاوەکانم لێم کۆ بوونەوە و بە زیندوویێتیی من شـــادمان بوون. پاشـــان کۆیلە و کەنیزم کڕی و خزمەتکار و کلفەتم لە نێویاندا دەســتنیشــان کرد. خانوو و کاروانســەرا و باخی زیاد لە پێشــووم کڕی و تێکەڵ خۆشـــەویســـتانم بوومەوە لەگەڵ هاوڕێکانم یەکدەنگ و یەکرەنگ بووینەوە. ئەو ڕەنج و مەینەتەی لە ئاوارەییمدا چەشــتبووم، لە بیرم کرد. ئەو ترس و دڵەڕاوکێیەی لە ســەفەردا دیبووم، هیچم لە بیر نەما. وەک جاری پێشوو دەستم کردەوە بە عەیش و نۆش و بەزم و ڕابواردن. ئەوە چیرۆک و بەسەرهاتی یەکەم گەشتم بوو. سبەینێ چیرۆکی دووەم گەشتم لە حەوت گەشتەکەم دەگێڕمەوە.'

"پاشان سەندبادی دەریایی میوانداریی لە سەندبادی کۆڵبەر کرد و سەد مسقاڵ زێڕی ســـووری بە دیاری دا بە ســـەندبادی کۆڵبەر و گوتی: 'ئەوڕۆ دڵت خۆش کردین و بە هاوڕێیەتیت ســـەربەرزت کردین.' ئیدی ســـەندبادی کۆڵبەر زێڕەکانی وەرگرت، بە سپاسگوزاری و ستایشەوە لەوێ هاتە دەرێ و بە تەواوەتی سەری لەم بەسەرهاتە سووڕ مابوو. ئەو شــەوە لەماڵەو خەوت. کە ڕۆژ بووەوە، چوو بۆ ماڵی ســەندبادی دەریایی. کە چووە ژوورەوە، سەندبادی دەریایی ڕێزی لێ گرت و نیزیکتر لە خۆیەوە داینیشاند. کاتێک خەڵکەکەی دیکەش ئامادە بوون، خواردن و خواردنەوەیان بۆ هێنان، خواردیان و خواردیانەوە. دەســتیان کرد بە بەزم و شــادی و کاتێکی خۆشــیان بەســەر برد. ئەوجار ســـەندبادی دەریایی ســـەری باســـی کردەوە و گوتی: 'برایان، وەک دەزانن، دوێنێ بۆم گێڕانەوە کە لە خۆشگوزەرانی و شادییەکی لە ڕادەبەدەردا ڕام دەبوارد.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی پێنجسەد و چل و سێیەم هاتەوە

## چیرۆکی دووەم گەشتی سەندبادی دەریایی

گوتی: "خاوەنشــکۆ! ســەندبادی دەریایی کە لەگەڵ هاورێکانیدا دانیشــتەوە، گوتی: 'من لەوپەڕی کامەرانیدا بووم تا وا بوو ڕۆژێک لە ڕۆژان بە مێشــکمدا هات ســەفەرێکی دیکە بکەم و بچم هێندێک شار و دوورگەگەلی دیکە بگەڕێم و ببینم و ماڵ بەسەر یەکەوە بنێم. وا بوو خۆم ساز کرد و ماڵێکی زۆرم لەگەڵ خۆم برد، کەلوپەل و شمەکی باش و پاکم کڕی، بارم تێک نا و چوومە کەنار دەریا. کەشــتییەکی گەورە و تۆکمەم دۆزییەوە کە بادەوەی ئاوریشــم و کارکەری ئازا و چەکی باشــی تێدا بوو. شــوێنێکم تێدا بە کرێ گرت، بارەکانم بردە ناوی و لەگەڵ کۆمەڵێک لە بازرگاناندا دانیشــتم. هەر هەمان ڕۆژ کەوتینە ڕێ. بای خوازراو هەڵی کرد. لە دەریایەکەوە بۆ دەریایەکی دی و لە دوورگەیەکەوە بۆ دوورگەیەکی دی دەڕۆیشتین و لە هەر شوێنێک کە کەشتییەکە لای دەدا و لەنگەری دەگرت، بازرگانان و ســامانداران دەهاتن و خەریکی مامەڵە دەبووین. دەمانکڕی و دەمانفرۆشــت. ئیدی ئەوە کارمان بوو تا وا بوو ڕێمان کەوتە دوورگەیەکی گەورەترەوە کە داری زۆر و میوەگەلی ئاودار و گوڵووکی هەمەڕەنگ و مەلانی خۆشــخوێن و کانیاوی ڕوون و ڕەوانی تێدا بوو. بەڵام ئاوەدانی تێدا نەبوو!

" 'کەشتیوان لەوێ لەنگەری خست. بازرگانان و سەرنشینان دابەزین و خەریکی سەیر و گەڕان بوون. منیش لەگەڵ ئەواندا چووبوومە دوورگەکەوە و لەسەر کانیاوێکی سازگار دانیشتبووم. ئەو خواردنەی پێم بوو، لێم خوارد و شنەیەکی فێنک و خۆشی دەهات. ئیدی خەو بردمییەوە. بێخەم بووم و کەیفم بەو سروە خۆشە دەکرد. کە خەبەرم بووەوە، کەسم بە دەورە نەمابوو. نە جندۆکە و نە مرۆم نەدی و هیچ نیشــانەیەک لە کەشــتی و سەرنشینەکانی نەبوو. هیچ کام لە بازرگان و کەشتیوانەکان منیان بیر نەکەوتبووەوە، هەر بۆیە منیان لەو دوورگەیەدا بە تەنیا جێ هێشتبوو و ڕۆیشتبوون. سەیری ڕاست و چەپی خۆمم کرد، بێ لە خۆم کەسی ترم نەبینی. ئەوەندە دڵتەنگ و پەرێشان بووم خەریک بوو، لە تاوان دڵم بتۆقێ، نە ماڵی دنیایەم پێ بوو نە خواردەمەنی. لەو دوورگەیەدا تەنیا مامەوە و دەستم لە ژیان شۆرد و بە خۆمم گوت: 'لە هەموو هەورێ نابارێ. ئەوە جاری پێشوو باش بوو تووشی ئەو کابرایەبووم، گەیاندمییەوە ئاوەدانی، بە خودا پێم وا نییە تازە شتی وا ڕوو بداتەوە. جاری پێشــووش هەر ڕێکەوتێک بوو. لە عەزرەتان بە کوڵ گریام و خۆم دەلاواندەوە. خۆم سەرکۆنە کرد و لە سەفەرەکەم پەشیمان بوومەوە کە بۆچی دەستم لەو ئاسوودەیی و شادییەی لە بەغدا هەمبوو، بەردا و دیسان ڕێی هات و نەهاتم گرتە بەر. خۆ

من له هیچم کەم نەبوو!'

" 'بە کورتی، ئەو سەختییانەی لە گەشتی یەکەمدا هاتبووە سەر ڕێم، هەمووم وە بیر هاتەوە، پەشیمان بوومەوە لەوەی لە بەغدا هاتبوومە دەر و لە دەریام دابوو، بە هۆی داهێزراوی و پەرێشانییەوە وەک شێتم لێ هات. ئینجا هەستام، لە دوورگەکەدا هەر دەڕۆیشتم و چاوم بەملا و ئەولادا دەگێڕا نەمدەتوانی لە جێیەک بسرەوم. ناچار بە دارێکی بەرزدا هەڵزنام و لەوێوە سەیری دەوروبەرمم کرد. جگە لە ئاو و ئاسمان و دارەکانی دوورگەکە هیچی دیکەم نەبینی. کە باش ورد بوومەوە، چاوم بە شتێکی گەورەی سپی کەوت. لە دارەکە هاتمە خوارەوە. بەرەو لای چووم. کە گەیشتمە لای، سەیرم کرد گومبەزێکی گەورەیە. بە دەوریدا سووڕامەوە دەرگای چوونە ژوورەوەم نەدۆزییەوە. زۆر نەرم و ساف بوو. کە نەمتوانی بچمە ناوی، دەورەکەیم پێوا، پەنجا هەنگاو بوو. بیرم لە ڕێیەک دەکردەوە کە بچمە ناوی، کەچی ڕێی تێنەچوو. بە نارەحەتی و پەرۆشییەوە ئەوسەرەوسەرم دەکرد. تا وا بوو وڵات تاریک بوو. وەک ڕۆژئاوابووبێ وا بوو. بە خەیاڵی خۆم هەور بەری خۆری گرت، سەرم هەڵبڕی و سەرنجم دا، باڵندەیەکی زەبەلاحم وەبەر چاو هات بە دوو باڵی درێژ و پانەوە کە بەری ئاسمانی گرتبوو، خۆر بە هۆی ئەوەوە پەنای گرتبوو. سەرم لەو باڵندەیە سووڕ ما. ئەوجار چیرۆکێکم وە بیر کەوتەوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی پێنجسەد و چل و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! سەندبادی دەریایی گوتی: 'چیرۆکێکم بیر کەوتەوە، کاتی خۆی لە گەشتیاران و ڕێبوارانم بیستبوو. ئەویش ئەوە بوو لە هەندێک لە دوورگەکاندا باڵندەیەکی زەبەلاح هەیە، ڕوخی پێ دەڵێن و بێچووەکانی بە گۆشتی فیل بەخێو دەکا. زانیم کە ئەو گومبەزە سپییە هێلکەیەکە لە هێلکەکانی ئەو باڵندەیە. من سەرم لە کاری خودا و لەو باڵندەیە سووڕ مابوو. سپاس و ستایشی خودای گەورەم دەکرد و چاوم لەو باڵندەیە بوو کە بەرەو گومبەزەکە نزم دەبووەوە، لەسەری نیشت و خەوت. لەو جەنگەیەدا من هەستام، جامانەکەی سەرمم کردەوە و وەک گوریسم لێ کرد. سەرێکیم بە ناوقەدمەوە و سەرەکەی دیکەشیم توند لە لاقی ئەو باڵندەیە بەست و بە خۆمم گوت: 'بۆ هەر شوێنێک بچێ، ڕێی دەکەوێتە لای شار و ئاوەدانییەک —خۆ لە دانیشتن لەم شوێنەدا هەر باشترە.' ئیدی لە حەیبەتی ئەوەی نەکا خەوم لێ بکەوێ و ئەو باڵندەیە ناخافڵ بمبا، ئەو شەوە نەخەوتم. کە خۆر لە کەل هاتە دەر، باڵندەکە لەسەر هێلکەکە هەستا، سیرەیەکی بەرزی کرد و فڕی. منیشی هەڵگرت، ئەوەندە بەرز بووەوە کە گومانم وا بوو پەڕەکانی لە ئاسمان دەخشێن.

" 'دوایە بەرەو خوار داگەڕا تا گەیشتە سەر لووتکەی شاخێکی بەرز. کە زانیم نیشتەوە و من لە سەر زەویم، گورج چوومە پێشەوە و خۆم لە قاچی ئەو بکەمەوە. زۆری لێی دەترسام، بەڵام منی نەبینی و هەستی پێ نەکردم. جامانەکەم لە قاچی کردەوە و ڕزگارم بوو. لە پەنایەکەوە وەستابووم کە ئەو باڵندەیە شتێکی بە چنگ هەڵگرت و هەڵفڕی و ئەویشی لەگەڵ خۆی برد و بەرەو دەریا فڕی. کە سەیرم کرد، مارێکی یەکجار گەورە بوو. من سەرم لە گەورەیی ئەو مارە سووڕ ما و بە سەرسامییەوە لەو شوێنە دەڕۆیشتم. سەیرم کرد لە سەر زنجیرە ساخێکم کە خوارەوەی بێروونێکی فراوان و بەرین بوو، کێوێکی ئەوەندە بەرز و دژوار لەتەنیشتیەوە بوو کە کەس نەیدەتوانی پێیدا سەر کەوێ. ئیدی پەشیمان بوومەوە و خۆمم سەرکۆنە کرد: 'بۆچی لەو دوورگەیە هاتمە دەر و لە پێناو چی خۆم لە پێی ئەو باڵندەیە کردەوە؟ بریا هەر لەو دوورگەکە ماباماوە، بەس نەبوو لەوێ خواردن دەست دەکەوت و ئەوێ زۆر لێرە باشتر بوو.' سوبحانەڵڵا لە چۆرتمێک ڕزگارم نەببوو، کەوتمە چۆرتمێکی گەورەتر و سەختترەوە. ئەوجار هەستام، ورەم وەبەر خۆم ناو داگەڕام و لە بێروونەکەم دا و ڕۆیشتم. تەماشام کرد زەویی ئەو بێروونە ئەڵماس بوو. مار و ئەژدیهای وای تێدا بوو دەتگوت دارخورمان هێند زەبەلاح بوون، دەیانتوانی فیل قووت بدەن. ئەو مارانە لە حەیبەتی باڵندەی ڕوخدا بە شەو دەهاتنە دەرەوە و بە ڕۆژ خۆیان دەشاردەوە، نەکا ڕوخ بیانرفێنێ. جا ڕوخ عادەتی وا بوو کە دەیرفاندن، لەتلەتی دەکردن و هۆی ئەم کارەشی دیار نەبوو. ئیدی من لەو بێروونەدا مامەوە و کردەپەشیمان

بووم و دەمگوت: 'قوڕ بەو سەرەم کە بۆ لەناوبردنی خۆم پەلەم کرد و بۆ مەرگی خۆم لە هەڵپەدا بووم. دیسان باش بوو، سپاس بۆ خودا کە هاتمە ئەم شوێنەوە؛ جارێ باشە.' کە ڕۆژ بووەوە، بەو بێروونەدا دەڕۆیشتم و جێیەکم نەدەدۆزییەوە شەوی تێدا بەسەر بەرم. زۆر هەر لە مارەکان دەترسام. خواردن و خواردنەوەم لە بیر چووبووەوە، هەر بیر گیانی خۆمدا بووم. لەو جەنگەیەدا لە دوور چاوم بە ئەشکەوتێک کەوت. بەرەو لای چووم، چوومە ئەشکەوتەکەوە. بەردێکی گەورەی تێدا بوو. تەکانم بە بەردەکە دا و زارکی ئەشکەوتەکەم گرت. لەناو ئەشکەوتەکەدا بووم و بە خۆمم گوت: 'با بچمە دەرێ و چاوەڕێی بەزەیی خودا بم.'

" 'دوایە سەیری ناو ئەشکەوتەکەم کرد، مارێکی گەورەم دی، لە لای سەرەوەی ئەشکەوتەکە لە سەر هێلکەکانی پاپۆکەی خواردبوو. هەموو لەشم کەوتە لەرزە و خۆم دا دەست قەزا و قەدەر و لەوێ مات بووم. کە ڕۆژ بووەوە، بە پاڵ کەلێنێکم دا بەردەکە و لە ئەشکەوتەکە هاتمە دەرێ. بەڵام لەبەر بێ خەوی و برسێتی و ترسی زۆر وڕ و کاس ببووم. بە لاترەلاتر، سەرگەردان ملی ڕێیەم گرت و بەو بێروونەدا ڕۆیشتم تا لە ناکاو بەسەر کەلاکێکی گەورەدا کەوتم. کەسم لێ دیار نەبوو. سەرم سووڕ ما و تێدا مام، کەوتمە بیرکرنەوەوە و چیرۆکێکم وە بیر هاتەوە، لە بازرگان و گەڕیدەکانم بیستبوو کە لە کێوی ئەڵماس مەترسی گەورەگەورە هەیە. کەس ناتوانێت بچێتە ئەوێوە، بەڵام بازرگانان کە بیانهەوێت بچن بۆ بەردی ئەڵماس ، فێڵێک ساز دەکەن، مەڕێک دەکوژنەوە و کەوڵی دەکەن. پاشان کەلاکەکەی لە سەر ئەو کێوەوە فڕێ دەدەنە ناو بێروونەکەوە. کەلاکەکە کە دەکەوێتە سەر بەردە ئەڵماسەکان، بەردەکان بە گۆشتەکەوە دەنووسێن، دوایە داڵ و هەڵۆ و شت لەسەر ئەو کەلاکە دەنیشنەوە و بە چنگ هەڵی دەیگرن و دەیبەنە سەر کێوەکە. دەمودەست بازرگانان خۆ دەگەیەننە سەری و باڵندەکە دەنگ دەدن و هەڵی دەفڕێنن، کەلاکەکەی پێ بەجێ دێڵن. ئەوجار بۆخۆیان دەچنە پێشەوە و ئەو بەردە ئەڵماسانەی بە گۆشتەکەوە نووساون لێی دەکەنەوە و دەیبەنەوە بۆ شارەکانیانی خۆیان. دەنا کەس ناتوانێت دەستی بە ئەڵماس بگات، بەم فێڵە نەبێ.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی پێنجسەد و چل و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! سەندبادی دەریایی تەواوی ئەو شتانەی لە کێوی ئەڵماس دیبوونی بۆ هاوڕێکانی گێڕاوە. دوایی گوتی: 'لاشـــەکەم دی و چیرۆکەکەم بیر کەوتەوە، چوومە سـەری و ئەوەندەی توانیم بەردە ئەڵماسـم لێ کردەوە. خسـتمنە نێو کراس و گیرفان و قۆڵمەوە. بەو جۆرە ئەڵمـاسـێکی زۆرم کۆ کردەوە. ئەوجـار بە مێزەرەکەم خۆم بە کەلاکەکەوە بەستەوە و بە پشتدا پاڵ کەوتم و کەلاکەکەم خستە سەر سنگم. لەو جەنگەیەدا داڵێک هات لە سەر کەلاکەکە نیشتەوە. بە چنگ گرتی و کەلاکەی بە منەوە وە حەوا خست و بەرزی کردینەوە. منیش باوەشـم پێدا کردبوو. ئەو داڵە فڕی و من و کەلاکەکەی برد تا لەسەر لوتکەی کێوەکە نیشتەوە و کەلاکەکەی لەسەر زەوییەکە دانا؛ گەرەکی بوو کەلاکەکە هەڵدڕێت و بیخوات، لە ناکاو بوو بە هەراوهوریا و کشەکش. داڵەکە سڵەمییەوە و هەڵفڕی. من گرێی مێزەرەکەم کردەوە و خۆم لە کەلاکەکە کردەوە. جلوبەرگەکەم شـــەلاڵی خوێن بوو. ئینجا هەستام و لەپاڵ کەلاکەکەدا ڕاوەستام. تەماشام کرد ئەو بازرگانەی کە دەنگی داڵەکەی دەدا، هات بۆ لای من و کەلاکەکە. کە چاوی بە من کەوت، ترسـا. هیچیشـی پێ نەگوتم. هاتە لای کەلاکەکە و ئەمدیو و ئەودیوی کرد. سـەیری کرد هیچ ئەڵماس و شتێکی نەدی پێوەی نووسابێ. هاواری لێ هەستا، ئەی هاوار بە ماڵم خۆ هیچی پێوە نەنووساوە؟!' ئیدی من لێی چوومە پێشێ. پرسی: 'تۆ کێی؟ لەبەر چی هاتوویە ئێرە؟' پێم گوت: 'مەترسە و لەسـەرخۆ بە من کەسـێکی بازرگانم و زیانم بۆ کەس نییە. بەسـەرهاتێکی سـەیر و سـەمەرەم هەیە، چیرۆکی هاتنە ئێرەم شـتێکی سـەیرە. خەمت نەبێ، ئەڵماسـم زۆر پێیە. دەتدەمێ.'

" ' هەر لەو دەمەدا بازرگان هێور بووەوە، دۆعای خێری بۆ کردم ، سـپاسـی خودای کرد و لەگەڵمدا کەوتە قسـە. ئەو بازرگانانەی کە کەلاکیان بەردابووەوە، کە گوێیان لە دەنگی من و ئەو بوو، هاتن بۆ لامان، سـلاویان لێ کردین و چاک و چۆنییان لەگەڵ کردم. منیش خۆم پێ ناسـاندن و بەسـەرهاتی خۆمم بۆ گێڕانەوە و ئەو سـەختییەی لە سەفەرەکەمدا تووشـی ببووم، بۆم باس کردن و هۆکاری گەیشتنە ئەو شوێنەم پێ گوتن. دوایە بەشـێکی زۆری بەردە ئەڵماسـەکانم دا بە خاوەنی ئەو کەلاکە کە خۆم پێوە بەستبووەوە. ئەویش زۆری پێ خۆش بوو و دۆعای بۆ کردم. بازرگانەکان گوتیان: 'خودا ژیانێکی تازەی پێ بەخشـیوی، ئەگیان بەر لە تۆ کەس نەبووە چووبێتە ئەو شـوێنە و بە زیندوو دەرچووبێ.' ئەو شـەوە بە ئاسـوودەیی و بێخەم خەوتم جا چونکە لە بێروونی مارەکان ڕزگارم ببوو و گەیشتبوومە ئاوەدانی، کەیفساز و بەدەماخ بووم.

" 'کە تاو هەلات، هەستاین و ڕۆیشتین و گەلێک ماری گەورەمان بینی تا گەیشتینە دوورگەیەک. لەوێ داری کافووری لێ بوو، ئەوەندە گەورە بوون سەد کەس دەیانتوانی لەژێر سێبەریاندا دابنیشن. ئەگەر کەسێک بیویستبایە کافووری دەست بکەوێ، بە شتێکی تیژ و درێژ سەرەوەی دارەکەی کون دەکرد، ئیدی کافووری لێ دەچۆڕا و پاشان وەک جیوە توند دەبووەوە. دوای ئەوە ئەو دارە ویشک دەبوو بۆ سووتانیان دەکاریان دەکرد. لەو دوورگەیەدا جۆرێک ئاژەڵی هۆڤی لێ بوو، کەرگەردەنیان پێ دەگوت، وەک مانگا و گامێش لە دوورگەکەدا دەلەوەڕا. ئەو گیانلەبەرە لە وشتر گەورەتر بوو و شاخێکی بەرز بە پێشەسەریەوە بوو، درێژییەکەی دە باڵ دەبوو. لە هەندێک لە گەڕیدە و گەشتیارانم بیستووە ئەو کەرگەردەنە فیلی ـــ بەو گەورەییە ـــ بە شاخی هەڵگرتووە و بە دوورگە و کەناراوەکاندا گێڕاوییەتی تا فیلەکە بە شاخییەوە مردووە. چەوریی فیلەکە بە هۆی تینی خۆرەوە تواوەتەوە و بە سەروچاویدا هاتووەتە خوارێ، لە جێوە کوێری کردووە. ئەوجار ڕوخ ـ کە باڵندەیەکە ـ هاتووە بە چنگ هەڵی گرتووە و بەو فیلەوە کە بە شاخەکەیەوە بووە بردوویەتەوە بۆ خۆراکی بێچووەکانی. هەر لەو دووگەیەدا جۆرێک گامێشم بینی کە لە لای خۆمان هاوشێوەیان نەبوو. من هەندێک لەو بەردە ئەڵماسانەی پێم بوو، لەگەڵ بازرگاناندا مامەڵەم پێ کرد. درهەم و دینار و کاڵای بازرگانیم لێ وەرگرتن و پاشان لەگەڵیاندا چووم و درێژەم بە سەفەرەکەم دا و بە شاراندا دەگەڕاین و تەماشای کاری کردگارم دەکرد. لە بێروونێکەوە بۆ بێروونێک و لە شارێکەوە دەچووین بۆ شارێک و لە هەموو شوێنێک سەودا و مامەڵەمان دەکرد تا وا بوو گەیشتینەوە شاری بەسرە و چەند ڕۆژێک لەوێماینەوە. دوایی هاتینەوە بەغدا.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی پێنجسەد و چل و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ! ســەنبادی دەریایی گوتی: 'کە گەیشــتمەوە بەغدا، چوومەوە ماڵی خۆم. گەلێک ئەڵماس و کاڵای گرانبایی و کەلوپەلی دانسقەم لەگەڵ خۆم هێناوە. خاوخێزان و کەس‌وکارم لێم کۆ بوونەوە. دەســتی هەژارنم گرت، یارمەتی هاوڕێکانم دا و دیاریم بۆ بازرگانان نارد. ئیدی هەر خواردنی بەجێم دەخوارد و خواردنەوەی خۆشم دەخواردەوە و جلوبەرگی کەشخە و شکۆمەندانەم دەپۆشی. هەرکەس هەواڵی هاتنەوەمی دەبیست، دەهاتە لام و لە چۆنییەتی گەشتەکەم و خۆشی و ناخۆشی شارانی دەپرسی. منیش بۆم دەگێڕاوە و ئەویش ئەو هەموو ڕووداوەی پێ سەیر دەبوو. جا ئیشەڵڵا سبەینێ بەسەرهاتی گەشتی سێیەممتان بۆ دەگێڕمەوە.'

"دوای ئەوەی ســـەندباد لە گێڕانەوەی چیرۆکی دووەمی بووەوە، شـــێویان خوارد و سەندبادی دەریایی سەد مسقاڵ زێڕی سووری دا بە سەندبادی کۆڵبەر. سەندبادی کۆڵبەر زێڕەکانی لێ وەرگرت، زۆری ســـپاس کرد و دۆعای خێری بۆ کرد. ئەوجار ماڵاوایی لێ کرد بەرەو ماڵ بووەوە. ئەو شـەوەش بە دڵێکی خۆشـەوە ڕۆژی کردەوە. کە ڕۆژ بووەوە هەســـتا نوێژی بەیانی کرد و لە کاتی دیاریکراودا چووەوە ماڵی ســـەندبادی دەریایی. سەندبادی دەریای بەخێرهاتنی کرد و لە لای خۆیەوە داینا. سەرقاڵی قسە و باس بوون تا هاوڕێکانی دیکەش چوون. ســـفرە ڕاخرا، خواردنیان خوارد و خواردنەوەیان خواردەوە. پاشان خەریکی بەزم و خۆشی و قسە و باس بوون.

### چیرۆکی سێیەم گەشتی سەندبادی دەریایی

"ئەوجار ســـەندبادی دەریایی ســـەری قســـەی کردەوە و گوتی: 'هاوڕێیان، گوێ لە چیرۆکی سێیەم بگرن کە زۆر لەوانی تر خۆشتر و سەرنجڕاکێشترە. کاتێک من لە گەشتی دووەمم گەڕامەوە، لەو پەڕی شـادی و خۆشـگوزەرانی و شـەوق و زەوقدا دەژیام—هەر بەو جۆرەی دوێنێ بۆم گێڕانەوە. ماوەیەکی زۆر بە دڵێکی خۆش و کەیفێکی ســـازەوە لەگەڵ لە بەغدا لەگەڵ هاوڕێیارانی ئەمەکدار و خۆشـــمەشـــرەفم مامەوە. دوایە کەوتمەوە یادی دەستکەوتەکانی سەفەر. خولیای گەشت و گەڕان و حەزی بینینی شار و دەریاکان و کۆکردنەوەی زێڕ و زیو لە سەری دام. کەلوپەل و کاڵای زۆر و شیاو بۆ گەشتی دەریاییم کڕین. لە بەغداوە چووم بۆ بەسرە. لەوێ خۆم گەیاندە لێواری دەریا، کەشـتییەکی گەورەم دیت، بازرگانی ناودار و کەسانی خێرۆمەند و ڕێکوپێکی تێدا بوو. لەگەڵیان سوار بووم و بە پشـــتیوانی خودا وەڕێ کەوتین. دەریا بە دەریا و دوورگە بە دوورگە ڕۆیشـــتین. کە

دەچووینە هەر جێیەک، شـتمان دەمانکڕی و شـتمان دەمانفرۆشـت و دەگەڕاین. لەوپەڕی خۆشـــی و کامەرانیدا بووین هەتا ڕۆژێک لە ڕۆژان لە نێو دەریادا دەڕۆیشــــتین و دەریا شەپۆلانی بوو، کەشتیوان لە لێواری کەشتییە ڕاوەستابوو، سەیری چواردەوری دەریاکەی دەکرد. کتوپڕ بە چەپۆک بەر بووە ســـەر و گوێلاکی خۆی و چـارۆکەکـانی هەڵوێزنی، دەستی کرد بە لە خۆدان و خۆ ڕنین و هاتوهاوار. گوتمان: 'کاکی کەشتیوان، ئەوە چ بووە، بۆ وا دەکەی؟' کەشـــتیوان گوتی: 'خەڵکینە، بای نەخوازراو لە ڕێی لاداوین. چارەنووس بەرەو چیای مەیموونانی بردووین. تازە کەسـمان بە سـڵامەتی ڕزگاری نابێ ناتوانێ؛ هەر ئەوەندە دەزانم، گشـتمان تێدا دەچین.' هێشـتا کەشـتیوان قسـەکانی تەواو نەکردبوو کە مەیموون هاتن و دەوری کەشـتییەیان گرت. وەک کوللە بە دەر و ژووی کەشـتییەدا بڵاو بوونەوە. ئێمە نەمانوێرا لێیان دەین و بیانکوژین و دەریان بکەین، گوتمان نەکا بە هۆی زۆربوونییانەوە بمانکوژن. وەک دەڵێن زۆربوون گوێ بە ئازا و بوێری نادا، ئیدی ترسمان لێ نیشـت. ئەوانە دزێوترین هۆڤی بوون: چاویان زەرد و ڕوویان ڕەش و یاڵی وەک یاڵی شێریان هەبوو. کەس لە قسەیان

تێنەدەگەیشت و سەری لە کاریان دەر نەدەکرد. بالایان چوار بست بوو. بە گوریسەکاندا هەڵگەڕان و بە ددان قرتاندیانن. مەمنا لە هەموو لایەکەوە گوریســـەکانی کەشـــتییەیان قرتاندبوو، با کەشـتییەی بەرەو چیای مەیموونان برد. مەیموونەکان هەموو بازرگانەکانیان گرتن و بردیاننە دوورگەکەوە. ئەوجار کەشـــتییەکەیان بە کەلوپەلەکانی ناویەوە برد و لە چاو ون بوون. نەمانزانی بۆ کوێ چوون و کەشـــتییەکەیان بۆ کوێ برد. ئیدی ئێمە لەو دوورگەیەدا ماینەوە، لە میوەکانیمان دەخوارد و لە کانیاوەکانی دەمانخواردەوە. وا بوو لە ناکاو لە ناو دوورگەکەدا خانوویەکی ئاوەدانمان بینی. بەرەو لای چووین. تەماشـامان کرد ئەوە کۆشـکێکە دیوارەکانی بەرز و دەروازەکەی لە چێوی ئاونووسـە. چووینە ژوورەوە. ئەو کۆشـکە لە هەموو لایەکەوە دەرگای هەبوو لە لای سـەرووووەوە سـەکۆیەکی گەورەی بەرزمان دی. مەنجەڵی چێشت لەسەر ئاورگەکان و ئێسقانی زۆریش لە کەنار ئاورگەکاندا کەوتبوون. بەڵام کەس لەو کۆشکەدا نەبوو. ئێمە سـەرمان لەوە سووڕ مابوو. ماوەیەک لە حەوشەی کۆشکەکەدا دانیشتین. ئینجا خەوتین، هەر لە نیوەڕۆوە تا دەمەو ئێوارە لە خەودا بووین کە لەپڕ زەوی لەرزایەوە و دەنگێکمان لە هەواوە بیســـت، لەو دەمەدا کەســـێکی زەبەلاح و ڕەشـپێسـت و بالابەرز، بە شـێوە مرۆڤ دەرکەوت. کە چاوەکانی وەک کڵپەی ئاگر و ددانی لە گوێن شـــفرەی بەراز بوون. دەمی ئەوەندە زل بوو، وەک زارکی چاڵاو و لێوەکانی لە هی وشتر دەچوون. گوێچکەکانی پان و درێژ و تا پشتێندی شۆڕ بووبوونەوە. نینۆکەکانی چەشـنی نینۆکی دڕەندەکان بوون. کە ئەومان ئاوا دی، ترسـەکەمان ئەوەندەی تر زیادی کرد و نەترەمان چوو. لە تاوان وەک مردوومان لێ هاتبوو.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی پێنجسەد و چل و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! سەنبادی دەریایی گوتی: 'کە ئەو کەسەمان بەو سەر و سیما تۆقێنەرەوە دیت، هێز لە ئەژنۆماندا نەما. کە هاتە خوارەوە، تۆزێک لەسەر سەکۆکە دانیشت. ئەوجار هەستا و هات بۆ لامان و دەستی منی گرت و لە زەوی بەرزی کردمەوە. سەرنجی ئەملاولای منی دا و تاقی کردمەوە هەر بەو جۆرەی قەساب قەڵەوی و کزی ئاژەڵێک هەڵدەسەنگێنێ. بە هۆی ئەو ڕەنج و مەینەتییە زۆرەی کە تووشی ببووم، منی لەڕ و لاواز هاتە بەرچاو و چ گۆشتی پێوە شک نەبردم. ئیدی وازی لێ هێنام و یەکێکی دیکەی لە هاوڕێکانم هەڵگرت. ئەویشی وەک من هەڵسەنگاند، چونکە ئەویشی بە لاوە گۆشتن نەبوو، بەری دا. هەر وا دانەدانە تاقی دەکردینەوە تا وا بوو گەیشتە کەشتیوانی کەشتییە کە پیاوێکی قەڵە و کەتە بوو. وەک قەساب کە بەران بە زەویدا دەدا، ئاوا بە زەوییدا دا، پێی نایە سەر ملی و ملی شکاند. ئینجا شیشێکی درێژی هێنا لە گەرووی ڕۆکرد و لە پاشوویەوە دەریکرد. دوایی ئاگرێکی بڵێسەداری هەڵکرد و شیشەکەی لەسەر دانا و بەسەر ئاگرەکەوە ئەمدیو و ئەودیوی کرد تا گۆشتی کەشتیوان بە باشی برژا. پاشان شیشەکەی لەسەر ئاگرەکە لا برد و لەبەردەم خۆیدا داینا و بە نینۆک هەموو گۆشتەکەی لێ کردەوە و خواردی و هەموو ئێسقانەکانی کوڕوساندەوە و تووڕی دانە ئەو لاوە، ماوەیەک دانیشت. دوایی لەسەر ئەو سەکۆیە خەوت و وەک بەرانی سەربڕاو دەینرکاند و تا بەیانی ئاوا خەوت. کەڕەی بەیانی هەستا و ڕۆیشتە دەرێ. کە لێمان دوور کەوتەوە، لەگەڵ یەکدیدا کەوتینە قسە و دەگریاین و دەمانگوت: 'خۆزگە لە دەریادا نوقم ببووینایە، یان مەیموونەکان بیانخواردینایە و ڕۆژمان بێرە نەگەیشتبایە، زۆر لەوە باشتر بوو لەسەر ئاور ببرژێنرێین کە ئەم جۆرە مردنە خراپترین جۆری مردنە. دەمانگوت بەو خودا خودایەتی دەکا تازە ڕزگارمان نابێ.' دوایە هەستاین لە کۆشکەوە بەرەو دوورگەکە چووین کە سا بەڵکو جێیەک بۆ خۆشاردنەوە یان ڕێیەکی هەڵاتن بدۆزینەوە. زۆر گەڕاین و جێیەکمان نەدۆزییەوە. ئێوارە بوو و لەوپەڕی ترس و ئەندێشەدا گەڕاینەوە بۆ کۆشک. تاوێک بوو دانیشتبووین کە زەوی لەرییەوە و ڕەشەی گۆڕین پەیدا بوو و هاتە لامان و وەک کەڕەتی پێشوو دانەدانە هەڵیسەنگاندین تا یەکێکمانی پەسەند کرد و ئەو بەڵایەی بە سەر هێنا کە بە سەر کەشتیوانی هێنا. دوایە لەسەر سەکۆکە خەوت. کە هەتاو کەوت، هەر وەک ڕۆژی پێشوو هەستا و ڕۆیشتەوە دەرێ و ئێمەی لەوێ بەجێ هێشت. ئێمە کۆ بووینەوە دەستمان کرد بە ڕاوتەدبیر، گوتمان: 'بەو خودایە ئەگەر خۆمان لە دەریا دابێ و بخنکێین، زۆر لەوە باشترە کە بەسەر ئاگرەوە ببرژێین بەڕاستی دزێوترین جۆری مردنە.' ئیدی یەکێک لە کوڕەکان گوتی: 'دەبێ فێڵێکی بۆ بدۆزینەوە و بیکوژین تا لە دەستی ئاسوودە

بین.' من گوتم: 'براینە، ئەگەر هەر دەتانەوێ بیکوژن، با ئەم تەختانە بەرین و بڕێک دار و شتی دیکەی بۆ کۆ بکەینەوە و شتێکی وەک کەشتی درووست بکەین.

جا دوای ئەوەی فێڵەکەمان سەری گرت و کوشتمان، سواری ئەو کەشتییە ببین و لە دەریا بدەین ئەوجار خۆمان دەدینە دەست قەزار و قەدەر و خودا چۆنی ویست با وامان بێتە ڕێ، یان ئەوەی هەر لێرە دانیشین تا کەشتییەک دێ و سواری دەبین و دەڕۆین.' هەموو گوتیان: 'بە خودا ئەوە بیرێکی ژیرانەیە و پێی ڕازین.' ئیدی هەموو هەستاین تەختەکانمان بردە دەرێ و شتێکی لە گوێن کەشتیمان لێ ساز کرد و لە کەناری دەریا دامانننا و بڕێک توێشوومان تێدا کۆ کردەوە و، گەڕاینەوە بۆ کۆشک.

" 'کە ڕۆژ ئاوا بوو، زەوی لەرزی و ڕەشە دەرکەوت. دانەدانە ئەمدیواودیوی کردین، یەکێک لە هاوڕێکانمانی برد و برژاندی. کە لە سەر سەکۆکە خەوت، کە زانیمان خەوی لێ کەوتووە، چووین دوو شیشمان هێنا و لە سەر ئاورەکە کە هێشتا دائیسا، دامانن. ڕەشە وا خەوتبوو پرخەی ڕۆژەڕێیەک دەڕۆیی. کە شیشەکان جوان سوور بوونەوە، ئەوجار هەڵمان گرتن و چووین بەوپەڕی هێز و تواناوە لە هەردوو چاویمان ڕۆ کرد، ئیدی یەکبەخۆی نەڕاندی بە جۆرێکی وا خەریک بوو هەموومان شێت بین و دڵمان بتۆقێ. لەسەر سەکۆکە هەستا و وە دوامان کەوت. ئێمە بە ڕاست و چەپدا هەڵدەهاتین. بەڵام چونکە کوێر ببوو، ئێمەی نەدەدیت، سەرەڕای ئەوەش لە ترسانی حەجمانمان نەبوو پێمان وا نەبوو تازە ڕزگارمان دەبێ.

دوایە بۆ دەرگای کۆشکەکە دەگەڕا. کە دەرگاکەی دۆزییەوە، وەدەر کەوت، هێندە توند دەینەڕاند و دەیبۆڕاند زەوی خستبووە لەرزە. کەچی تەماشامان کرد ئەو ڕەشە لەگەڵ تاکەکەیدا کە لە خۆی زلتر و دزێوتر بوو، هاتەوە. هاتن، کە ئێمە ئەومان لەگەڵ تاکەکەیدا دی، سام و دڵەڕاوکێ بەسەرماندا زاڵ بوو و لە ترسان خەریک بوو گیانمان دەرچێ. بێ سێ و دوو تیژ بەرەو ئەو کەشتییەی دروستمان کردبوو، رامان کرد. خستمانە دەریاوە و سواری بووین. ئەو جووتەیش بەردی گەورەگەورەیان تێ دەگرتین. وا بوو جگە لە سیانمان، ئەوانی ترمان بە بەرد کوژران و کەوتنە دەریاوە هەر من و دوو کەسی دی لەسەر ئەو شێوە کەشتییە ماینەوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی پێنجسەد و چل و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! سەندبادی دەریایی گوتی: 'ئەو شێوە کەشتییە ئێمەی گەیاندە دوورگەیەک و لەوێ تا ڕۆژ ئاوا بوو هەر گەڕاین. کە شەو داهات، نەختێک لەو دوورگەیە خەوتین. کە وە خەبەر هاتین، تەماشا دەکەین ئەوە ئەژدیهایەکی زەبەلاح دەوری داوین و بە تەمایە قووتمان بدا. وا بوو یەکێک لە هاوڕێکانمانی قووت دا و چوو بە لای کاری خۆیەوە. خەمی هاوڕێکەمان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە ترسی گیانی خۆشمان خەریک دڵمان بتوقێ. گوتمان: 'بە خودا ئەو جۆرە مەرگەش لەوەی پێشوو ناخۆشترە! دڵمان بەوە خۆش بوو کە لە دەستی ڕەشە دەربازمان بوو و لە خنکان لە دەریا ڕزگارمان بوو، بەڵام تازە لەوە ناچێ لە دەست ئەم ئەژدیهایە قوتارمان بێ.'

" 'دوایی هەستاین چووینە دوورگەکەوە و کەمێکمان میوە خوارد و لە کانییەک ئاومان خواردەوە. کە تاریک بوو بە دارێکی بەرزدا سەر کەوتین و خۆمان گەیاندە لقەکانی سەرسەرەوەی و لەوێدا خەوتین. کە شەو تاریکی کرد، ئەژدیهاکە هات و بە دەوری دارەکەدا کەمێکی ملۆمۆ کرد و ڕوانییە دەوروبەری؛ هەستی کرد بەسەر ئەو دارەوەین. ئیدی وا بوو بە دارەکەدا هەڵگەڕا. کە گەیشتە هاوڕێکەم هەڵی لووشی و لە بەر چاوی من قووتی دا. ئەوجار داگەڕا و لێیدا ڕۆیشت. ئیدی من تا ڕۆژم لێ بووەوە هەر ئەوەندە بوو گیانم دەرنەچوو. کە ڕۆژ بووەوە و تاو هەڵات لە دارەکە هاتمە خوارێ. هێزی پێم نەبوو داروبەردم لێ ببوو بە هەژدیها. ویستم هەرچۆنێک بێ خۆم بگەیێنمە کەشتیاساکەم و لە دەریا بدەم بەشکوو ئەوە لەو هەموو مەترسییە ڕزگارم بێ.

بەڵام دەستشۆردن لە گیان سەخت بوو. ناچار تەختەیەکی پان و درێژم بە پێیەکانمەوە و یەکێکی دیکەم بە لای ڕاستمەوە و دانەیەکی دیم بە لای چەپمەوە و یەکێک بە سکمەوە و دانەیەکی ترم بە سەرمەوە بەست و، بەو جۆرە کە پێیەکانی خۆمم بەستبوونەوە، دانیشتم و لەناو ئەو تەختانەدا خەوتم—ئەو تەختانە دەوریان دابووم. کە شەو تاریک بوو، ئەو ئەژدیهایە بە پێی شەوانی پێشوو هات بۆ گیانم، سەیری کردم و گەرەکی بوو قووتم بدا. تەختەکان لە هەر لایەکەوە بەربەست بوون و ئەژدیهاکە نەیدەزانی چی بکا. هەر بە دەوروبەرمدا دەخولاوە، بەڵام نەیتوانی دەمی بمگاتێ و، منیش لە تاو ترسان وەک مردووم لێ هاتبوو. هەر ئەوەندە بوو گیانم دەر نەچووبوو. ئەژدیهاکە لێم دوور دەکەوتە و دیسان بۆم دەهاتەوە. هەموو جارێک دەیویست قووتم بدا و لەبەر تەختەکان بۆی نەیدەتوانی. تا دەمەو بەیان کاری ئەژدیهاکە ئەمە بوو. کە هەتاو کەوت، ئەژدیهاکە لەوپەڕی تووڕەییدا لێم دوور کەوتەوە و لێم ون بوو. گورجێ دەستم درێژ کرد

و ئەو تەختانەم لە خۆم کردەوە. جا چونکە زۆریشـــم ڕەنج و ســـەختیم بە هۆی ئەو ئەژدیهاوە کێشابوو، جووڵەم لێ بڕابوو.

" 'دوایی هەستام، بە دوورگەکەدا ڕۆیشتم ڕۆیشتم تا گەیشتمە سەر دەریاکە. لەوێڕا چاوم بە کەشـتییەک کەوت لە نێو دەریاکەدا بوو. ئیدی لقێکی گەورەم لە دارێک کردەوە و بە ڕاوەشاندنی ئەو لقە دارە ویستم سەرنجی خەڵکی ناو کەشتییەکە بۆ لای خۆم ڕابکێشم. هەر واش بوو، کە منیان دیت و گوێیان لە دەنگم بوو. کەشـتییەیان بەرەو من ئاژۆت و لێم نیزیک بوونەوە. پاشـان هاتنە پێشـەوە، هەڵیانکێشـام و بردیانمە کەشـتییەکەوە و لەو دۆخە ڕزگاریان کردم. پرسـیاریان لێ کردم کە بۆ بە تەنیا لەو دوورگەیە بووم و منیش تەواوی بەسـەرهاتەکەمم بۆ گێڕانەوە. باسی ئەو هەموو سەختی و ناڕەحەتییانەم کر کە بە سـەرم هاتبوون. بە بیستنی قسەکانی من سەریان سووڕما و وڕ و کاس بوون. دوایی جلوبەرگی تازە و نان و شتیان دامێ. جلەکانم لە بەر کرد و تێرم نان خوارد و ئاوی سار و خۆشیشم خواردەوە. تۆزێک پشـووم هاتەوە بەر و بووژامەوە و خەیاڵم ئاسـوودە بوو. لە خۆشـیان باوەڕم نەدەکرد کە خودا لەو مەترسـییەی ڕزگار کردووم و بە زیندوویی ماوم. شـوکر و سـپاسـی خودام دەکرد. ئیدی لەگەڵ خەڵکی کەشـتییەدا ڕۆیشـتین. بای خوازراو یارمەتی داین و بردینی تـا گەشـــتینە دوورگەیەک کە دوورگەی ســـەلاهیتەیـان پێ دەگوت. کەشتییەکەیان لەلای ئەو دوورگەیە ڕاگرت.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و چل و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! سەندبادی دەریایی گوتی: 'ئەو کەشتییەی تێیدا بووم، لەبەرانبەر دوورگەی سەلاهیتەدا ڕاوەستا. هەموو بازرگانان و سەرنشینانی کەشتییەکە چوونە دوورگەکەوە و کاڵاکانی خۆمانمان بۆ سەودا و مامەڵە لە کەشتییەکە داگرت.

" 'دوایی خاوەنی کەشتییە ڕووی کردە من و گوتی: 'تۆ پیاوێکی غەریبە و نەداری، هەر وەک خۆت گوتت گەلێک قۆرت و نەهاتی بەسەر هاتووە و ڕەنجی زۆرت کێشاوە. جا قازانجێکم بۆت ببێ وا بێ پێی بگەیتەوە شارەکەی خۆت و دۆعای بەخێرم بۆ بکەی. من گوتم: 'بەڵێ، بەردەوام دۆعات بۆ دەکەم.' ئینجا خاوەنی کەشتییە گوتی: 'کەسێک لەگەڵماندا گەشتیار بوو، لێمان ون بووە. ئێستا نازانم ماوە یان مردووە. جا دەمەوێ بارێک لە کاڵاکانی ئەوت بدەمێ بۆخت لەم دوورگەیەدا بیفرۆشە بەشکوو قەرەبووی سەختی و نارەحەتییەکانت بکاتەوە، ئەوەی دەشمێنێتەوە، لە لای خۆم ڕایدەگرم و دەیپارێزم. تا دەگەینەوە بەغدا و لەوێ سۆراخی خزم و کەسەکانی دەگرم و ماڵەکەی دەدەمەوە بە میراتگرەکانی. گەلۆ تۆ دەتوانی ئەم کارە بکەی و کاڵاکانی ئەو وەک بازرگانێک مامەڵەی پێوە بکەی؟' گوتم: 'قوربان، بڕیارت لەسەر سەرمە و منەتباریشت دەبم.'

" 'ئەوجار فەرمانی بە کرێکارەکان دا کە بارێک لەو کاڵایە بێننە دوورگەکەوە و ڕادەستی منی بکەن. ئەوە بوو نووسەری کەشتییەکە گوتی: 'سەرۆک، ئەم شتومەکانە هی کێن و بە ناوی کێوە بیاننووسم؟' سەرۆک گوتی: 'بە ناوی سەندبادی دەریاییەوە بیاننووسە. ئەوە ئی ئەو پیاوە بوو، لە دوورگەکە لێمان هەڵبڕا و بێ سەروشوێن بوو. ئێستا دەمەوێ ئەم غەریبەیە بە کاڵاکانی ئەو مامەڵە بکا. خێرەکەی بۆخۆخی هەڵگرێ و تا پاشەکەوتێکی دەبێ ئەو دەم دەسمایەکەی لێ وەردەگرینەوە و دەیبەینەوە بۆ بەغدا. ئەگەر سەندبادمان دۆزییەوە، ئەوە دەیدەینەوە و، ئەگەر نەشماندۆزییەوە، دەیدەینەوە بە میراتگرەکانی.' کاتێک لە سەرۆکم بیست گوتی؛ بە ناوی سەندبادی دەریاییەوە بیاننووسە، بە خۆمم گوت: 'بە خودا سەندبادی دەریایی منم و من بووم لە دوورگەکەدا ون بووم.' ئیدی دانم بە خۆمدا گرت تا بازرگانەکان لە کەشتییە دابەزین، پێکەوە کۆ بوونەوە، خەریکی قسە بوون و باسی کاروباری کڕین و فرۆشتنیان دەکرد. چوومە پێشەوە، بە خاوەنی کەشتییەم گوت: 'کاکە گیان، ئەرێ خاوەنی ئەم کەلوپەلانە دەناسی یان نا؟' گوتی: 'نەوەڵا. هەر نایناسم، بەس ئەوە دەزانم کابرایەکی خەڵکی بەغدا بوو و ناوی سەندبادی دەریایی بوو. ڕۆژێک کەشتییەکەمان لای دوورگەیەک ڕاگرت، سەندبادی دەریایی لەو دوورگەیە ون و تا ئەمڕۆ هەواڵیمان نەبیستووەتەوە.'

" 'ئیدی پێکەنیم و گوتم: 'سەرۆک، ڕەنگە پێت سەیر بێ، بەڵام من سەندبادی دەریاییم؛ ماوم و نەمردووم. کاتێک کەشتییەکەتان لەو دوورگەیە ڕاگرت و بازرگانەکان هاتنە دوورگەکەوە، منیش لەگەڵ خەڵکەکەدا هاتمە دەرەوە، هەر وا بە نێو دوورگەکەدا دەگەڕام و چاوم دەگێڕا. وا بوو لەسەر کانییەک دانیشتم و خواردنم خوارد، هەواکەم زۆر بە دڵ بوو، ڕاکشام پشوویەک بدەم کەچی خەوم لێ کەوت. کاتێک خەبەرم بووەوە، تەماشا دەکەم بە تاقی تەنێم و نەکەس دیارە و نە کەشتییەکە. بەجێتان هێشتبووم، هەر بۆیە ئەو کاڵایانە هی منن. ئەو بازرگانانەی لە کێوی ئەڵماس بەردیان کۆ دەکردەوە، منیان بینی و شایەدی دەدەن کە من سەندبادی دەریاییم. هەر وەک چۆن چیرۆکی خۆمم بۆ تۆ گێڕاوە، بۆ ئەوانیشم گێڕاوەتەوە کە من خەوتبووم و هاوڕێکانم منیان لە بیر چووبوو، بە جێیان هێشتبووم.'

" 'کە بازرگانەکان قسەکانی منیان بیست، لێم کۆ بوونەوە، هەندێکیان باوەڕیان پێ کردم و هەندێکیشیان پێیان وا بوو درۆ دەکەم. لەو دەمەدا یەکێک لە بازرگانەکان کە بیستی باسی کێوی ئەڵماس دەکەم و ناوی ئەوێم هێنا، هەستا و هاتە بەرەوە و بە بازرگانەکانی گوت:

'کاکە! لە بیرتانە کە من باسی ڕووداوە سەیرەکانی سەفەرەکەی خۆمم بۆ دەگێڕانەوە، گوتم ڕۆژێکی هەر وەک جاری جاران کەلاکی بەرانەکەم هەڵدایە بێرووني ئەڵماسەوە، پیاوێک خۆی بە کەلاکەکەی منەوە بەستبووە داڵێک هێنایە سەر کێوەکە و ئێوە بڕواتان بە قسەکەی من نەکرد؟' بازرگانەکان گوتیان: 'بەڵێ، لە بیرمانە باست کرد و ئێمە باوڕمان پێ نەکردی. ' ئەو بازرگانە گوتی: 'ئەمە هەر ئەو پیاوەیە کە خۆی بە کەلاکەکەی منەوە بەستبووەوە و بەردە ئەڵماسە گرانبایییەکانی دامێ. هەر لەگەڵ ئەم پیاوەدا تا شاری بەسرە لە کەشتییەدا هاوڕێ بووین. کە گەیشتینە ئەوێ، ئەم پیاوە ماڵاوایی لێ کردم و ڕۆیشتەوە بۆ شارەکەی خۆی. ئێمەش چووینەوە بۆ شاری خۆمان. ئەمە ناوی سەندبادی دەریاییە و بۆی باس کردبووین کە لە دوورگەیەکدا خەوتووە و هاوڕێکانی لە بیریان چووە و جێیان هێشتووە. هاوڕێیان، بزانن کە ئەم پیاوە هەر بۆ ئەوە گەیشتووەتە ئێرە تا ڕاستیی قسەکانی منتان بۆ دەربکەوێ. جا ئەم کەلوپەلانە هی ئەون و، کاتێک لەگەڵ ئێمەدا بوو ئەم باسەی بۆ گێڕاینەوە. ئەوا ئێستا ڕاستیی قسەکانی دەرکەوت.' کە خاوەنی کەشتییەکە قسەی بازرگانەکەی بیست، هاتە لام و ماوەیەک سەیری کردم و لێم ورد بووەوە. دوایی گوتی: 'دا پێم بڵێ نیشانی کەلوپەلەکانت چییە؟' من نیشانەی کەلوپەلەکانم پێ گوت و، ئەو کارانەی لەنێو کەشتییەدا لەنێوان من و ئەودا گوزەرابوون، یەکیەک بۆم باس کرد. پاشان کە دڵنیا بووەوە من سەندبادی دەریاییم، باوەشی پێدا کردم و پیرۆزبایی سەلامەتیمی لێ کردم و گوتی: 'برا گیا، قەسەم بە خودا ئەم ڕووداوانەی بە سەر تۆ

هاتوون، زۆر زۆر جێی زەندەمان و سۆسرەتە! بەڵام سپاس بۆ خودا کە من و تۆی پێک گەیاندەوە تا کەلوپەلەکانت بدەمەوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنهسەد و پەنجایەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ!کاتێک بۆ بازرگانەکان و کەشـــتیوانەکە ڕوون بووەوە کە من سـەندبادی دەریاییم، هەر لەو کاتەدا کەلوپەلەکانم ڕادەسـت کران. لەو گەشـتەدا کاڵاکانم قازانجێکی زۆریان کرد و لە ڕادەبەدەر خۆشـحاڵ بووم. سـپاسـی خودام کرد کە بە سـلامەتی دەرچووم و ماڵەکەمم بۆ گەڕاوە. هەر وا لە دوورگەکاندا خەریکی سـەودا و مامەڵە بووین تا گەشتینە وڵاتی سیند. لە دەریادا زۆرمان شتی سەیروسەمەرە دیت کە لە ژمارە نایەن. ماسییەکم دی لە مانگا دەچوو، ماسییەکی ترم دی لە کەر دەچوو. باڵندەیەکم دی لە ئاو دەهاتە دەرەوە لەسەر ئاوەکە هێلکەی دەکرد، لە سەریان دەنیشت و جووچکەی هەڵدەهێنا و هەرگیز نەدەچووە وشـکانی. دوای ئەوە بە یارمەتی خودای گەورە درێژەمان بە گەشـتەکەمان دا و بای خوازراو هەڵیکرد و گەشـتەکەمان بە خێر و خۆشـی گەیشـتە کۆتایی. گەشـتینە بەسـرە و چەند ڕۆژێک لەوێ ماینەوە. پاشـان بەرەو بەغدا کەوتینە ڕێ. کە گەشـتینەوە بەغدا، چوومەوە ماڵی خۆم و چاوم بە خزم و دۆسـتانم شـاد بووەوە. خۆشـحاڵ بووم بەوەی دوای ئەو هەموو گیروگرفتە بە سـلامەتی گەیشـتمەوە ماڵی خۆم. دەسـتم کرد بە خێر و خێرات و پۆشـتەکردنی هەتیوان و دەسـتگیرۆیی بێوەژنان. خزم و کەسـی خۆم بەسـەر کردەوە و گرێم بۆ کردنەوە و گیروگرفتم لەگەڵ چارەسـەر کردن و دیاریم بۆ ناسـیاوان نارد. ئیدی سـەرقاڵی خواردن و خواردنەوە و ڕابواردن و خۆشگوزەرانی بووم، ئەو سەختی و مەینەتییانەی دیبوومن لە بیرم چووەوە. لەم گەشتەدا قازانجێکی زۆرم کردبوو کە بە خەرجکردن تەواو نەدەبوو. ئەوەی بۆم گێڕانەوە، بەسـەرهاتەکانی ئەم گەشـتە بوون. ئیشـەڵڵا سـبەینێ وەرنەوە لام تا چیرۆکی چوارەم گەشتمتان بۆ بگێڕمەوە کە ئەو لەوانی پێشوو سەرسووڕهێنترە."

"دوایی سـەندبادی دەریایی وەک جارەکانی دی سـەد مسـقاڵی زێڕ دا بە سـەندبادی کۆڵبەر و سـفرەیان ڕاخسـت، چێشـت داندرا و خورا و بڵاوەیان کرد. بەڵام زۆر سـەریان کەیف بەو چیرۆکانە کرد. سـەندبادی کۆڵبەر بەوپەڕی خۆشـحاڵی و گەشـاوەییەوە بە زێڕەکانەوە گەڕاوە ماڵێ. شەو لە ماڵی خۆیدا ڕۆژی کردەوە. دەمەو بەیان لە خەو هەستا، دوو ڕکات نوێژی بەیانی کرد و جەنگەی دانیشـتنەکە بەرەو ماڵی سـەندبادی دەریایی ملی ڕێیە گرت. کە چووە لای، سـڵاوی لێ کرد. سـەندبادی دەریایی بە ڕوویەکی خۆشـەوە سـڵاوەکەی سـتاندەوە و کۆڵبەرەی لە لای خۆیدا دانیشـاند تا هاوڕێکانی دیکەش ئامادە بوون. ئەوجار نانیان خوارد.

**چیرۆکی چوارەم گەشتی سەندبادی دەریایی**

"سەندبادی دەریایی دەستی کردەوە بە قسە و درێژەی چوارەم چیرۆکی دامەزراند و گوتی: 'هاورێیان، کە گەیشتمەوە بەغدا و چاوم بە خزم و دۆستانم شاد بووەوە، لە خۆشی و شادییەکی بێسنووردا بووم ئێ ئەو بەڵا و ڕۆژڕەشیانەی بەسەرم هاتبوو، هەمووم لە بیر چووبوونەوە. لە بەزم و خۆشگوزەرانیدا بووم و لەگەڵ هاوڕێیانمدا هەر ڕۆژەی لە باخێکدا بە خۆشی ڕامان دەبوارد.

" 'ڕۆژێک لە ڕۆژان نەفسی بەدکارە کەڵکەڵەی سەفەری خستە مێشکمەوە. بیری گەشت و کڕین و فرۆشتنم دەکرد. بڕیارم دا و خۆمم یەکلایی کردەوە، کاڵای گرانبایی و گونجاو بۆ گەشتی دەریام کڕی. باری زیاترم لە جارانی دی بەست. لە بەغداوە چوومە بەسرە. بارەکانم خستە کەشتییەوە و لەگەڵ تاقمێک لە گەورە بازرگانانی بەسرە سواری کەشتی بووین. کەشتی لە پەنای خودای بەرز و بێ هاوتا وەڕێ کەوت. چەند شەو و ڕۆژ بە خۆشی لە گەشتدا بووین و بای خوازراو هەڵی کرد. لە دوورگەیەکەوە بۆ دوورگەیەکی دی و لە دەریایەکەوە بۆ دەریایەکی دی دەچووین تا وا بوو بای نەخوازراو هەڵی کرد. کەشتیوان لەنگەرەکانی کەشتییەکەی خستن و کەشتی لە ناوەڕاستی دەریادا ڕاگرت. بە شین و شەپۆڕەوە دەستمان بۆ ئاسمان هەڵێنابوو لە بەرخودا دەپاڕاینەوە بە هانامانەوە بێت و ڕزگارمان بکا. وا بوو کوتوپڕ بایەکی توند هەڵی کرد. بادەوەی کەشتییەکەی دڕاند و کەشتی تێکوپێک شکاند. سەرنشینانی کەشتییەکە بە کاڵا و شمەکەکانەوە کەوتینە دەریاوە. تا نیوەڕۆ مەلەم کرد. وا بوو خودا ڕەحمی کرد و تەختەیەکی گەورەی کەشتییەکە نیزیکمان بووەوە، لەگەڵ کۆمەڵێک لە بازرگانەکاندا کە مەلەمان دەکرد، لەسەر تەختەکە گیرساینەوە و خۆمان گرت.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی پێنجسەد و پەنجا و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! سەندباد گوتی: ' لەگەڵ کۆمەڵیک لە بازرگانەکاندا کە هەر بە مەلە خۆمان ڕاگرتبوو، خۆمان بە تەختە گرتەوە و لە سەر تەختەکە گیرساینەو و لە پاڵ یەکدا دانیشتین. بە قاچ ئاوی دەریامان دەبڕی و بە یارمەتی شەپۆل و با بەرەو دوورگەکە چووین. لەبەر بێ خەوی و شەکەتی و برسییەتی و ترس و دڵەڕاوکێ ڕەنگی مردوومان لێ نیشتبوو. بەو حاڵەوە لە دوورگەکەدا سووڕاینەوە و بۆ ئەوەی لە برسان نەمرین گژوگیامان خوارد و شەویش لە قەراخ دوورگەکە خەوتین. کە ڕۆژ بووەوە هەستاین بە نێو دوورگەکەدا سووڕاینەوە تا لە دوور چاومان بە باڵاخانەیەک کەوت. بەرەو باڵاخانەکە چووین و تا قاوەڵتوون گەیشتینە بەر دەرگای باڵاخانەکە و لەوێ ڕاوەستاین. لە پڕدا کۆمەڵێکی ڕووت هاتنە دەرێ بێ ئەوەی یەک قسەمان لەگەڵ بکەن، گرتیانین و بردیانین بۆ لای پادشاکەیان. پادشا فەرمووی کردین و ئێمەش دانیشتین. ئەوجار خواردنێکیان لە پێش داناین کە نەمانزانی چییە و تا ئێستا شتی وامان نەدیبوو. ئەمن ئیشتیام نەچوویێ. بەڵام هاوڕێکانم بە پێچەوانەی منەوە خواردیان. نەخواردنەکەم هی سۆز و بەزەیی خودا بوو، بۆ من وا ئێستا من زیندووم.

" 'کە هاوڕێکانم لەو چێشتەیان خوارد، مێشکیان لە دەست دا و وەک شێتان نانیان خوارد و حاڵیان تێک چوو. ئەوجار ڕۆنی نارگیلیان بۆ هێنان و خواردیانەوە و، لەشیان بەو ڕۆنە چەور کردن. دەمودەست چاوی هاوڕێکانم گەڕا بوو و بە پێچەوانەی دابی خۆیان نانیان دەخوارد. لە کاریان حەپەسابووم و ئاخم بۆ هەڵدەکێشان. بە هۆی ترسەوە خەمم زیاد بوو و تەواو لەو خەڵکە ڕووتە تۆقیبووم. کە جوان لێیان ورد بوومەوە، زانیم کە مەجووسین و پاشاکەیان دێوە. هەرکەس بێتە شارەکەیانەوە، یان لە ڕێ و بان و بێروونان‌دا تووشی بن دەیگرن و دەیبەنە لای پادشاکەیان. لەوێ خواردنی دەدەنێ و ڕۆنی تێهەڵدەسوون تا هۆشی لای خۆی نەمێنێ و ئاوەزی تێک بچێ، ئەوجار حەزی خواردنی زیاد دەبێ و زۆر دەخوا. ئەوجار ئەوەندەی لەم خواردن و خواردنەوەیەی دەدەنێ تا زل و قەڵەو دەبێ. دوایی سەری دەبڕن و دەیبرژێنن و دەیدەن بە پاشا بیخوا، کەچی خۆیان ئەوە ناخۆن و گۆشتی مرۆ بە کاڵی دەخۆن.

" 'جا کە من بە کارەکەیانم زانی، بۆ خۆم و هاوەڵانم خەمبار بووم. هاوەڵانم کە مەست بوون، نەیاندەزانی چییان لێ دەکەن. دوایی بە کەسێکیان سپاردن. ئەو کەسە بەڕۆژدا ئەوانی دەبرد وەک پاتاڵ و شت دەیلەوەڕاندن.

" 'بەڵام من لەبەر ترس و خەفەت و برسێتی لەڕ و لاواز و ڕەقوتەق بووم و گۆشتم

پێوە نەمابوو. کە منیان بەو حاڵەوە بینی، وازیان لێ هێنام و لە بەر چاویان کەوتم و هیچ کامیان منی وەبیر نەدەهاتەوە، تا ئەوە بوو لەو شـــوێنە دوور کەوتمەوە. شـــوانێکم دی، لەنێو دوورگەکە لە شـــوێنێکی بەرزدا دانیشـــتبوو. کە جوان تێم ڕوانی، دیتم ئەوە هەر ئەو کەســـەیە وا هاوەڕێکانمیان پێ ســـپاردبوو تا بیانلەوەڕێنێت. جگە لە هاوەڵەکانم، گەلێک کەسی دیکەشی پێ بوو، ئەوانیش تێک چووبوون. ئەو شوانە مرۆیە کە منی دیت، زانی من تێک نەچووم و مێشـکم لە جێی خۆیەتی و ئەوەی بەسـەر هاوڕێکانم هاتووە بە سـەر من نەهـاتوووە. لە دوورڕا تێی گەیـانـدم و گـوتـی: بگەڕێوە و لەو ڕێیەوەی دەکەوێتە دەســـەڕاســـتەوە برۆ؛ لەوێوە ڕزگارت دەبێ.' من بەو جۆرەی ئەو ئاماژەی کرد و گوتی، گەڕامەوە. لە دەســـەڕاســـتدا ڕێیەکم دیت و گرتمە بەر. ماوەیەک ڕام دەکرد و ماوەیەک بۆ حەسانەوە بە هێواشـی دەڕۆیشتم تا وا بوو لە چاوی ئەو کابرایە ون بووم کە ئەم ڕێیەی پیشـــان دابووم. نە من ئەوم دەبینی، نە ئەو من. لەو جەنگەیەدا ڕۆژ ئاوا بوو، تاریکی باڵی بە سەر وڵاتدا کێشا. بۆ پشوودان دانیشتم و گەرەکم بوو بخەوم. ئەو شەوە لە ترسان و لەبەر برسییەتی خەو نەچووە چاوم. نیوە شەوە هەستام و بە دوورگەکەدا وەڕێ کەوتم تا تاوهەڵاتی بەیانی هەر ڕۆیشتم. جا ئەوەندەی لە برسـێتییەکەم دابمرکێنێتەوە، لە بنکە گیا و گەڵای دارانم خوارد. ئەوجار هەســـتامەوە و کەوتمە ڕێ و حەوت شـــەو و ڕۆژ هەر بە دوورگەکەدا ڕۆیشتم و هەر کاتێک برسیم دەبوو، بە گیای ئەو دەوروبەرە برسییەتییەکەم دادەمرکاندەوە، تا وا بوو بەرەبەیانی ڕۆژی هەشـتەم ڕەشـاییەکم لە دوورەوە بەدی کرد. بەرەو ڕووی چووم و هەتاکوو ئێوارەیەکی درەنگ بەرێوە بووم و لە ترس و دڵەڕاوکێدا بووم. کە لێیـان نیزیـک بوومەوە و جوان ســـەرنجم دانێ، کۆمەڵێکم بینی کە بیبەریـان دەچنییەوە.

" 'کە لێیان نیزیک بوومەوە، دیتیانم. بەرەو ڕووم هاتن و دەوریان دام. لییان پرســـیم: 'تۆ کێی و لە کوێوە دێی؟' گوتم: 'من پیاوێکی غەریب و لێقەوماوم.' ئیدی ئەوەی بە سەرم هاتبوو، بۆم گێڕانەوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی، چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و پەنجا و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! سەندبادی دەریایی گێڕاوییەتەوە: 'کاتێک من باسی ئەو کوێری و نەدامەتییانەم بۆ کردن، گوتیان: بە ڕاستی بەسەرهاتێکی سەیر و سەرسووڕهێنەرە، ئەوە چۆن توانیت لە چنگ ئەو قولانە ڕزگارت بێ. خۆ ئەوانە هێندە زۆرن تەواوی ولاتیان داگرتووە و هۆڤی و مرۆخۆرن، ڕزگاربوون لە دەست ئەوانە کارێکی زۆر دژوارە و کەس ناتوانی بە سلامەتی لە چنگیان دەرچێ.' من بۆم باس کردن کە چۆن قولەکان خۆراکێکیان دەرخواردی هاوالەکانم دا کە من لێم نەخوارد. ئەوجار پیرۆزبایی سلامەتیمیان لێ کردم و لای خۆیان دایاننیشاندم. کە لە کارەکەیان بوونەوە، چێشتێکی بەتامیان هێنا. لێم خوارد و ماوەیەک لایان حەسامەوە.

" 'دوایی سواری کەشتییان کردم و بردیانمەوە دوورگەکەی خۆیان و لەوێش بردیانمە کن پادشا. سلاوم لە پادشا کرد و ئەویش سلاوەکەمی ستاندەوە. ڕێزی لێ نام دەنگوباسمی پرسی. منیش مووبەموو بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕاوە. ئیدی واقی وڕ ما لەو هەموو پەندەی بەسەرم هاتووە و فەرمووی کردم دانیشم. پاشان فەرمانیدا و خواردنیان هێنا. تێرم خوارد و دەستم شۆرد. سپاسی خودام کرد و ستایشی پادشام کرد. لە لای مامەوە و بە شاردا گەڕام. سەیرم کرد شارێکی ئاوەدانە و بازاڕێکی تێدایە هەر جمەی دێت لە فرۆشیار و کڕیاران. ئەوەندەی میوە و خۆراکی جۆراوجۆر تێدایە کە لە باس نایە. ئیدی من کە گەیشتمە دڵم خۆش بوو، حەسامەوە و ئۆگری خەڵکەکەی بووم.

" 'لای ئەوان و پادشا، خۆشەویست ببووم و ڕێزی تایبەتم هەبوو. خەڵکی ئەو شارە بە ورد و درشتیانەوە سواری ئەسپی بێ زین دەبوون. پێم سەیر بوو! لە پاشام پرسی ئەوە چۆنە زینی لێ نانێن خۆ سواری بە زینەوە زۆر خۆشترە و شتێکی دیکە و سوار چالاکتر دەکا. پادشا گوتی: 'زین چییە؟ نەقەتم دیوە نە قەت نێویم بیستووە. ئەوە یەکەم جارە دەیبیستم. ئیدی من بە پادشام گوت: 'ئەگەر ڕێم بدەی زینێکت بۆ چێ دەکەم و سواری بە، جا ئەودەم دەزانی زین چییە.' پادشا گوتی: 'درووستی کە بزانم چ دەکەی.' داوام کرد دارتاش و دارم بۆ بێنن. دارتاشیان بانگ کرد و داریشیان هێنا. لە پەنا دارتاش دانیشتم فێرم کرد چۆنی دارەکە بۆ بتاشێ. داوای خوریم کرد، لەڕێوە خوریان بۆ هێنام و لەو خورییە لبادەکەم سووەوە و ساز کرد و چەرمم تێ گرت و ئالقە تێ گرت و گالەم[1] بۆ شۆڕ کردەوە. ئەوجار ئاسنگەرم بانگ کرد و چۆنییەتی درووستکردنی ئاوزەنگم پێ گوت. ئاوزەنگێکی گەورە و بە لاق خۆشم پێ ساز کرد. ئەوجار سپیم کردەوە و لە

---

[1]. گالە: هەگبەی بچووکی پشت زین.

ئاوزەنگبەندێکی پەشمیم بۆ هۆندەوە و ئاوزەنگەکانم بە قایم کرد. ئەوجار هەستام یەکێک لە باشترین ئەسپەکانی پادشام هێنا و زینم کرد و ئاوزەنگەکان ڕایەڵ کرد و ڕێشمە و لغاو کرد و بردم بۆ پادشا. پادشا زۆری پێ خۆش بوو، پەشندی کرد. کە سوار بوو، هێندەی پێ خۆش و باش بوو، خەلاتێکی باشی کردم. وەزیری پادشا کە دیتی من زینی ئاوا ساز دەکەم ئەویش داوای کرد زینێکی بۆ چێ کەم. زینێکی وەک ئەوەی پادشام بۆ ئەویش ساز کرد. گەورەگەورەکانی دەوڵەت و خاوەن پلە و پایەکانیش داوای زینیان لێ کردم و بۆ ئەوانیشم چێ کرد. دارتاش و ئاسنگەرم فێر کردبوو؛ زین و ئاوزەنگم بۆ ساز کەن و بەردەوام زین و ئاوزەنگم دروست دەکرد و دەمفرۆشت و بەو شێوەیە ماڵێکی زۆرم وەسەر یەک نا. لە لای پادشا و گەورەگەورەکانی دەوڵەتیش ڕێز و ڕوومەتێکی باشم هەبوو. قەدرم چووبووە سەرێ.

" 'زۆریان خۆش دەویستم هەتا ڕۆژێک لە ڕۆژان بەوپەڕی دڵخۆشی و ڕێز و حورمەتەوە لە لای پادشا دانیشتبووم؛ کە پادشا پێی گوتم: «فلانی تۆ خۆشەویستی ئێمەیت و لە لای ئێمە ڕێزێکی زۆرت هەیە و تازە لە خۆمانی و ناتوانین لێت دابڕێین. ناتوانین ڕۆژێک ببیستین تۆ لەو شارە دەڕۆی و تاقەت ناهێنین. ئەمن دەمهەوێ شتێکت پێ بڵێم و چاوەڕوانیم لێت هەیە بێ قسەییم نەکەی.» منیش پێم گوت: «من قەت قسەی جەنابت ڕەد ناکەمەوە، جەنابت زۆرت چاکە بۆ من بووە و پشتت گرتووم. من نۆکەری تۆم. چۆن لە قسەت دەردەچم؟» پادشا گوتی: «ئەمن دەمهەوێ ژنێکی جوان و ساماندار و خوێنشیرینت بۆ بێنم و تۆش لە لای ئێمە بمێنییەوە.» کە گوێم لەو قسەیەی پادشا بوو، لە شەرمان وڵامم پێ نەدراوە. پادشا گوتی: «ڕۆڵە بۆ هیچ ناڵێی؟» گوتم: «پادشای جیهان قسە، قسەی جەنابتە.» ئیدی لەڕێوە ناردیان قازی و شایەدیان هێنا و ئافرەتێکی ڕێزدار و ڕەسەن و خانەدان، جوان و لەبەردڵانیانی لێ مارە کردم کە خاوەنی ماڵ و سامان و باغ و مەزرا و خانووی باش بوو.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی پێنجسەد و پەنجا و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! سەندبادی دەریایی گوتی: «پادشا ژنێکی جوان و دەوڵەمەندی لێ مارە کردم و ماڵ و سامانێکی لە ڕادەبەدەر، خانوویەکی گەورە و بەربلاو، کۆیلە و کەنیز و مەڕوماڵات و تەنانەت جلی شیاوی دامێ و مانگانەی بۆ بڕیمەوە. ئیدی لەوپەڕی ئاسوودەیی و ئەرخەیانی و کامەرانیدا دەژیام. ئەو تاڵی و سوێریانەی دیبووم هەموو لە بیر چووبووەوە و بۆخۆم دەمگوت ئەگەر چوومەوە بۆ شارەکەی خۆم خێزانیشم لەگەڵ خۆم دەبەم. بەڵام کەس نازانێ چارەنووس بەرەو کوێی دەبا و چی بەسەر دێ.

کورتی کەمەوە، من ئەو ژنەم زۆر خۆش دەویست و ئەویش زۆری سۆز بۆم بوو. جگە لە کۆکی، ناکۆکیمان لە نێواندا نەبوو. ژیان پڕ لە خێر و خۆشی و شادی بوو هەتا ژنی جیرانەکەمان مرد. چونکە ئەمن ئەو جیرانەمان زۆر خۆش دەویست چووم بۆ فاتیحا خوێندن. کە چووم سەیرم کرد ئەو جیرانەمان بە مات و مەلوولی دانیشتبوو. سەرەخۆشیم لێ کرد و دڵخۆشیم داوە و گوتم: 'کاکە گیان خەم مەخۆ ئیشەڵڵا خودا لەو ژنەی خۆت جوانترت بە قسمەت دەکا و ئەوەندەی گڵ سەر گۆڕی ئەو ژنەشتە ئەوەندە تەمەنی تۆ درێژ دەکا.' کابرا دەستی کرد بە گریان و زۆر لە کوڵ گریا و پێی گوتم: 'هاوڕێی دڵسۆز چۆن تازە من دوای ئەوە ژنی دیکە دێنم. کوا خودا ژنی لەوە چاکتر بە قسمەت من دەکا. ئەویش بۆ منێک کە یەک دوو ڕۆژێکم تەمەن ماوە؟' گوتم کاکەگیان، تۆزێک گەشبین بە، ئەوەندە خۆت ئازار مەدە خۆ هێشتا زۆرت بە بەرەوە ماوە و شوکور بە تین و گوڕ و ساغ و سەلیمی، ئەو قسانە چییە؟' کابرا پێی گوتم: 'هەواڵ! بە گیانی تۆ، تازە سبەینێ من لە ڕیزی مردواندا دەبم.' لێم پرسی: 'مەبەستت چییە بۆ وا دەڵێی؟ بۆ سبەینێ لە ڕیزی مردواندا دەبی؟' گوتی: 'لێرە داب وایە کە ژنێک دەمرێ، پیاوەکەشی لەگەڵ لە دەنێژن. هەر بۆیە ئەوڕۆ کە خێزانمیان ناشت منیشی لەگەڵ دەخەنە گۆڕەکەوە. ئەگەر پیاوەکەش بمرێ ژنەکەی بە زیندوویی لەگەڵ لە گۆڕەکە دەخەن. بۆ ئەوەی دوای مردنی هاوژینەکەیان ئیدی نەمێننەوە و لەو دونیایە خۆشی ببینن.' من گوتم: 'بە خودا ئەوە دابێ زۆر ناحەزە و لە ئاوەز بە دوورە.' ئێمە هەروا خەریک بووین قسەمان دەکرد، خەڵکێکی زۆر هاتن بۆ سەرەخۆشی و دڵنەوایی دانەوە و ئامادە کردنی کاروباری ناشتنەکەیان. ئەوجار دارتەرێکیان هێنا و ژنی دراوسێکەمیان لە سەر دانا و بردیان بۆ گۆڕستان. مێردەکەشی لەگەڵ خەڵکەکە کەوتە ڕێ هەتا لە شار چوونە دەرێ. لە داوێنی کێوێک تەرمەکەیان دانا. بەردێکی گەورە لەوێ بوو بەردەکەیان هەڵگرت و واوەیان برد. ژێر ئەو بەردەکە چاڵ بوو. ژنەیان شۆڕ کردەوە ناو چاڵەکە و لە کابرا هاڵان، ئەویشیان بە گوریس بەستەوە و بەڕێیان کردە خوارێ. گۆزەڵەیەک ئاو و حەوت نانیان وەک تێشوو بۆ بەڕێ کردە خوارێ.

کابرا کە گەیشـــتە خوارێ گوریســـەکەی لە خۆی کردەوە و خەڵکەکە گوریســـەکەیان هەڵکێشـاوە سـەرێ. بەردەکەیان لە سـەر چاڵەکە داناوە و چوون بە لای کاری خۆیانەوە. هاوڕێکەشـمیان لەگەڵ ژنەکەی لەو چاڵەدا بەجێ هێشـت. ئەمن لە دڵی خۆمدا گوتم خۆ بە خودا ئەو جۆرە مردنە لەوانی دیکەش ناخۆشترە. ئیدی هەستام چووم بۆ لای پادشای ئەو شـارە و پێم گوت: 'خاوەنشکۆ! ئەو لەو شـارەی ئێوە چۆناوچۆن مرد و زیندوو بە یەکەوە دەنێژن.' پادشـــا گوتی: 'لەو شـــارەی ئێمە داب وایە ئەگەر ژنێک بمرێ مێردەکەشـــی بە زیندووی لەگەڵ لە گۆڕەکە دەخەن. ئەگەر مێردەکەش بمرێ، ژنەکەی بە زیندووی لەگەڵی دەنێژن. هەتا بە زیندوویی و مردوویی لەیەک جیا نەبنەوە. ئەوە هەر زووەوە بووە و لە پشتاوپشتمان بۆمان ماوەتەوە. گوتم: 'خاوەنشکۆ! ئەوە غەوارە و لاوەکیش وا لێ دەکەن؟' پـادشـــا گوتی: 'ئەیچۆن، غەوارە و لاوەکیش ژنیـان بمرێ لەگەڵ ژنەکەی بە زیندوویی دەینێژین. کە ئەو قسـەیەم بیسـت، زراوم چوو. دایمە لە ترسـی ئەوەی ژنەکەم بمرێ و بە زیندوویی لە چاڵم خەن دەتگوت دڵم توقی. جارجار دڵخۆشـــی خۆم دەداوە و دەمگوت: 'بەشکم من لە پێش ئەودا بمرم خۆ کەس نازانێ کێ لە پێش کێدا دەمرێ.

ڕێکەوت وا بوو چەند ڕۆژ دوایە ژنەکەم نەخۆش کەوت و ئەوەندەی پێ نەچوو مرد. زۆربەی خەڵکی شـار هاتن بۆ سـەرەخۆشـی و دڵدانەوەم. پادشـاش هات بۆ سـەرەخۆشـیم. دوای ئەوە ژنەکەمیان شۆرد و جوانترین و باشترین جلەکانیان لە بەر کرد. ملوانکە گەوهەر و مرواریییەکانیان کردە ملی. لە ســـەر دارتەرمەکەیان دانا و بردیانە گۆڕســـتان. لەوێ کە دایان نا. بەردەکەیان لە ســـەر گۆڕەکەی لا برد و ژنەکەمیان ڕۆ هێشـــتە خوارێ. ئەوجار تەواو هاوڕێ و ناســـیاوەکانم دەوریان دام و گەردن ئازادیان لێ دەکردم و بە تەما بوون بمگرن و لە گۆڕەکەم هاوێن. منیش هاوارم دەکرد و دەمگوت: 'ئەمن غەوارە و لاوەکیم و ئەو دابەی ئێوەم لا پەســـنـد نییە و تـاقەتیم نییە. هیچ گوێیـان نەدامێ و گرتمیـان و بەســـتیانمەوە. گوزەڵە ئاوێک و حەوت نانیان لەگەڵ خســـتم و بەڕێیان کردمە خوارێ. بانگیان کردم گوتیان گوریســـەکە لە خۆت کەوە. ئەمن گوێم نەدانێ و بە قســـەم نەکردن. ئیدی تووڕە بوون و گوریسـەکەیان لە پاڵ هاویشـتم و سـەری چاڵەکەیان ناوە و ڕۆیشـتن بە لای کاری خۆیانەوە. سەیرم کرد ئەو نێوە و بن ئەو کێوە ئەشکەوتێکی گەورەیە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و پەنجا و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! سەندبادی دەریایی گوتی: 'کە مندیان لەگەڵ ژنەکەم خستە ئەشکەوتەکەوە، زارکەکەیان بەو بەردە گرت و چوون بە لای کاری خۆیانەوە. مردوویەکی زۆر لەو ئەشکەوتەدا بوو. بۆگەنەکەی مێشکی سەری پیاوی هەڵدەگرت.

"زۆرم خۆم سەرکۆنە کرد و لە کردەی خۆم پەشیمان بوومەوە. لە بەر خۆمەوە گوتم: 'هەرچیم بەسەر بێ هەقی خۆمە.' ئیدی لەوێ مامەوە و ئاگام لە شەو و ڕۆژ نەبوو و کەم کەم شتم دەخوارد. هەتا برسێتی و تینوویێتی زۆریان بۆ نەهێنابام، نەمدەخوارد و نەمدەخواردەوە. لە ترسی ئەوەی نەکا ئەو نەختە نان و ئاوەم تەواو ببێ، کەمەکەمە دەمخوارد. دەمگوت: 'سوبحانەڵلا، ئەوە چ بەڵایەک بوو یەخەی گرتم؟! باشە بۆچی لەم شارە ژنم هێنا؟! ئای چەند چارەڕەشم، هێشتا تەنگ و چەڵەمەیەک بەرۆکم بەر نادا، گرفتێکی دیکە بەربینگم پێ دەگرێ. خۆزگە لە دەریادا دەخنکام یا لەو کێوە دەمردم. زۆر خۆشتر بوون تووشی ئێرە بم و ئاوا بمرم. بەردەوام سەرکۆنەی خۆم دەکرد و لەسەر ئێسکوپرووسکی مردووەکان دەنووستم و لە بەر خودا دەپاڕامەوە گیانم بکێشێ. کەچی نەیکوشتم و هەر لەو دۆخەدا بووم تا وا بوو لە تاو برسێتیدا هێزم لە بەر بڕا و لە تینوویێتیدا هەناوم ویشک هەڵگەڕا. ناچار پارووییەکم خوارد و قومێک ئاوم هەڵقوڕاند و هەستام بەنێو ئەشکەوتەکەدا بە کوترەکوتر[1] گەڕام. بۆم دەرکەوت ئەو جێیە زۆر فراوانە. مردوو و ئێسکوپرووسکی ڕزیوی دیکەی زۆر لێ بوو. هەر تێیان هەڵدەنگوتم. لە لایەکی ئەشکەوتەکەوە کەمێک دوورتر لە مردووەکان جێیەکەم بۆ خۆم خۆش کرد. وا دیار بوو ئێسک و پروسکی کەم لێ بوو، لەوێ دەخەوتم. بەڵام تووێشووەکەم کەم ببووەوە و کەمێکم نان و ئاو پێ ما. ڕۆژی نا ڕۆژێک پارووییەکم نان دەخوارد و قومێک ئاوم دەخواردەوە. بۆ ئەوەی نەکا نان و ئاوم لێ ببڕێت و بە سەختی بمرم. ڕۆژێکیان دانیشتبووم و بیرم لەوە دەکردەوەد کە ئەگەر بێتوو نان و ئاوم لێ ببڕێت، دەبێت چی بکەم و چیم بەسەر دێ. لەم خەیاڵەدا بووم کە لە ناکاو بەردەکەی سەر زارکی چاڵەکە لا درا. گوتم: 'تۆ بڵێیت شتێک قەومابێت؟' کەچی خەڵکەکەم بینی لە قەراغ لێواری چاڵەکە ڕاوەستابوون، پیاوێکی مردوو و ژنێکی زیندوویان داهێشتە چاڵەکەوە. ژنە دەگریا و دەینالاند، نان و ئاوێکی زۆریشیان بۆ ئەو ژنە داهێلایە خوارەوە. من سەیری ژنەم دەکرد و ئەو منی نەدەبینی. ئیدی خەڵکەکە سەری چاڵەکەیان ناوە و ڕۆیشتن. منیش ئێسکی لاقی مردوویەکم هەڵگرت، بەرەو ژنە چووم بە هەموو هێزمەوە لە سەریم دا. لە جێوە بووراوە. ئەوەندەم لە سەری ڕاکێشا تا مرد. ئەو نان و ئاوەی پێی بوو بردمنە ئەو شوێنەی دوو لە

---

[1]. کوترەکوتر: کوێرەکوێر، واتە وڵاتت لێ دیار نەبێ و بشڕۆی.

مردووەکانی دیکە خۆشــم کردبوو. لە ترسـی ئەوەی نەکا تەواو ببێت و لە برسـان بمرم، توزەتۆزە لەو نان و ئاوەم دەخوارد و دەخواردەوە، هەر ئەوەندەی بەر بە بێهێزیم بگرێت.

" 'بەو جۆرە ماوەیەکی زۆرم لەو ئەشــکەوتەدا مامەوە و هەر زیندوویەکیان لەگەڵ مردووێکدا بخسـتایەتە چاڵەکەوە، دەمکوشـت و بە نان و ئاوی ئەو خۆمم لە مردن ڕزگار دەکرد. ڕۆژێک لە ڕۆژان خەوتبووم، کە خەبەرم بووەوە، گوێم لە خشـپەیەک بوو. لاقی مردووەکەم هەڵگرت و بەرەو ڕووی چووم. کە هەسـتی کرد بۆی چووم، هەڵات. تەماشـا دەکەم ئاژەڵێکی هۆڤی بوو[1]. دوای کەوتم. لە پێشـی ئەشـکەوتەکەوە تروسـکاییەکی وەک ئەسـتێرە دەرکەوت کە نـاوەنـاوە ون دەبوو. بەرەو شـــۆقە چووم. هەرچەندە نیزیکتر دەبوومەوە، ڕۆشـــناییەکە زیـاتر و کلاوڕۆژنەکە گەورەتر دەبوو. ئیدی دڵنیا بووم ئەو ئەشـکەوتە ڕێی دەربازبوونی هەیە. لە بەر خۆمەوە دەمگوت: 'ئەم ئەشـکەوتە یا زارکێکی دیکەی وەک ئەوەی دیکەی هەیە، یـا لانیکەم کونێکی بۆ دەرەوە تێدایە، بۆیە ئەو ئـاژەڵە توانیوییە بێتە ئێرە.'

" 'ئەوە بوو ماوەیەک بیرم کردەوە، ئینجا بەرەو ڕۆشـــناییەکە چووم. وردەوردە بۆم دەرکەوت ئەوە کونێکە و ئەو ئاژەڵانە کێوییانە لەو کونەوە دەێنە ناو ئەشـــکەوتەکەوە و گۆشـــتی مردووەکان دەخۆن و دوای تێربوون هەر لەو کونەوە دەچنە دەرەوە. کە ئەو ڕەهۆڵەم دیت پشـوویەکم هاتەوە بەر و دڵم حەسـاوە، هیوام هاتەوە بەر و لەو بێ هیواییە ڕزگارم بوو، ئیدی بە کونەکەدا هاتمە دەرێ. تەمەشام کرد لە سەر کێوێکی بڵیندم ل قەراغ دەریایەکی ســـوێر. ئەو کونە کەوتبووە پشـــتەوەی کێوەکە. ئەو کێوە لە نێوان دەریا و شارەکەدا هەڵکەوتبوو کە کەس نەیدەتوانی بگاتە ئەوێ.

" 'ئیدی دڵم خۆش بوو، ئەو جارەش ڕزگارم بوو. ســـپاســـی خودام کرد. دواتر بەو کونەدا گەڕامەوە نێو ئەشـــکەوتەکە و ئەو نان و ئاوەی پاشـــەکەوتم کردبوو، لەگەڵ خۆم هێنامنە دەرەوە و زۆریشـــم گەوهەر و خشـــڵ و کانزای گرانبایی مردووەکان خســـتە نێو جلوبەرگەکانیـانەوە و هەڵمگرت و لەو کونەوە هـاتمە دەرێ و چووم لە قەراغ دەریـاکە دانیشـتم و چاوەڕێی کەشـتی بووم. دوای ئەوەش جار جار دەگەڕامەوە بۆ ئەشکەوتەکە و ئەگەر کەسـێکی زیندوویان شـۆڕ کردباوە ناو ئەشـکەوتەکە دەمکوشـت و نان و ئاوەکەیم دێنا و دەهاتمەوە کەنار دەریاکە و چاوەڕێی کەشـــتی دەبووم. ماوەیەکی زۆر ئەوە ژیانی من بوو.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. هۆڤی: درندە.

## کە شەوی پێنجسەد و پەنجا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! سەندبادی دەریایی گوتی: 'ڕۆژێکیان لە گوێ دەریا دانیشتبووم و چووبووم لە فکرەوە کە لەپڕ لە دەریادا چاو بە کەشتییەک کەوت. کراسێکی سپی، یەکێک لە مردووەکان کە زێڕ و شتم تێدا هێنابوو، بە سەری دارێکمەوە کرد و لە حەوادا شەکاندمەوە تا بەڵکو چاویان پێم بکەوێ. باش بوو چاویان پێم کەوت و لە ئاماژەکەم تێگەیشتن، کەشتییان بەرەو من ئاژۆت. کە نیزیک بووەوە، چەند کەسێکیان بە سواری لۆتکەیەک نارد بۆ لام.

"کە ئەو کەسانە لێم نیزیک بوونەوە، لێیان پرسیم: 'تۆ کێی؟ بۆچی لێرە دانیشتووی؟ چۆن هاتوویتەتە ئەم کێوە؟ ئێمە لەوەتی هەین قەتمان نەدینە کەسێک هاتبێتە ئێرە!' گوتم: 'من بازرگانم، کەشتییەکەم نوقم بوو. باش بوو کەمێکم لە کەلوپەلەکانم خستە سەر تەختەیەک و بە هەزار ڕەنج و مەینەت، خودا ڕەحمی پێ کردم و ڕزگارم بوو، ڕێم کەوتە ئێرە.' کە ئەو قسانەیان بیست، یارمەتیان دام، ئەو زێڕ و گەوهەرانەی کە لە ئەشکەوتەکەوە هێنابوومن لە لۆتکەکەمان خستن و بۆخۆشم سوار بووم و بەرەو کەشتییەکە ڕۆیشتین.

" 'کەشتیوانەکە پێی گوتم: 'ئەرێ کاکە، چۆنە گەیشتوویتەتە ئێرە؟ ئاخر ئەم کێوە زۆر بڵندە و شارێکی ئاوەدانیش لەپشتەوەیەتی. من زۆر دەمێکە بێرەدا هاتوچۆ دەکەم و لە ئاژەڵی کێوی و مەل و باڵندە زیاتر کەسم لێ نەدیوە.'دیسان بە کەشتیوانەکەم گوت: ' من بازرگانم، لەگەڵ کەشتییەکی گەورە بووم، وا بوو ڕەشەبا هات و کەشتییەکەمان تێک شکا ئیدی هەرچۆنێک بوو کەمێکم لە کەلوپەلەکانم خستە سەر تەختەیەک و خۆم لە سەر گیرساندەوە. بە هەزار زەحمەت و کوێرەوەری، ڕزگارم بوو، ڕێم کەوتە ئێرە. ئیدی لێرە دانیشتم. چاوەڕێ بووم خودا فریام کەوێ و کەشتییەکم بۆ بنێرێ و ڕزگارم ببێ. ' بەڵام ئەوەی لە شارەکە و لە ئەشکەوتەکەدا بەسەرم هاتبوو، بۆ ئەوم نەگێڕاوە. بە ڕاستی لەوە ترسام کەسێکی خەڵکی ئەو شارە لە کەشتییەکەدا بێت. دوایی دیارییەکی گرانباییم لەو کاڵایانەی پێم بوو، بۆ کەشتیوان برد و گوتم: 'گەورەم، تۆ بوویتە مایەی ڕزگاریم لەو شوێنە ترسناکە. ئەم دیارییەم لێ وەربگرە.' کەشتیوان دیارییەکەمی وەرنەگرت و گوتی: 'ئێمە هیچ لە کەس ناستێنین. ئەگەر کەسێک کەوتبێتە دەریاوە، یان جیماوێک لە کەناری دەریا یان لە دوورگەیەکدا ببینین، سواری دەکەین، نان و ئاوی دەدەینێ. ئەگەر ڕووت بێ، پۆشتەی دەکەین. کە بە سلامەتی بگەیەنە بەندەر، شتێک لە ماڵی خۆمانی دەدەینێ و ئەم چاکانەشی لە پێناو خودادا لەگەڵ دەکەین.'

" ' ئیدی دۆعای بەخێرم بۆ کرد. لە دوورگەیەکەوە بۆ دوورگەیەکی دیکە و لە

دەریایەکەوە بۆ دەریایەکی دیکە دەڕۆیشتین و من دڵم بە سلامەتیی خۆم خۆش بوو. هەر کاتێکیش بیرم لەو ماوەیە دەکردەوە کە لە ئەشـــکەوتەکەدا بووم، خەریک دەبوو لە تاوان شێت بم. هەر ئاوا ڕۆیشتین تا خودا ڕەحمی پێ کردین و گەیشتینە بەسرە. دوو-سێ ڕۆژ لەوێ مامەوە. ئینجا گەڕامەوە بەغدا، چوومەوە ماڵی خۆم و خزم و دۆســت ســەریان لێ دام و بەخێر هــاتنەوەیــان کردم و بە گەڕانەوەم دڵخۆش بوون. ئەو گەوەر و زێڕ ومرواریيەی لەگەڵ خۆم هێنابوومن، لە سـندووقێکم نان، خێرم لێ دا، بەشــی خەڵکم لێدا و هەتیو و بێوەژنانم پۆشتە و پەرداخ کردنەوە. ئەوجار لەگەڵ دۆست و برادەراندا کەوتمەوە ئەوپەڕی خۆشی و شادی و بەزم و ڕەزم. جا کاکە گیان سەندبادی وشکایی، ئەوەش پەند و بەســەرهاتەکانی چوارەمین گەشـتم بوو. جا ئیشــەڵلا سـبەینێ کە بێیتەوە لام، ئەوەی لە گەشتی پێنجەممدا بەسەرم هاتووە، بۆتی دەگێڕمەوە کە ئەو لەوانەش سەرسووڕهێنترە کە تا ئێســتاش بۆم باس کردووی.' دوای ئەوە ســەندبادی دەریایی فەرمانی دا ســەد مسـقاڵ زێڕی سوور بدەن ویشکایی. ئەوجار سفرەیان ڕاخست و ئامادەبووان تێر و پڕیان خوارد و لەوپەڕی ســــەرســـووڕماویدا بڵاوەیان کرد، هەر کەســــەی ڕێی ماڵی خۆی گرتە بەر. ســەندبادی کۆڵبەریش چووەوە ماڵی خۆی و شــەوی لەوپەڕی شــادیدا بە ڕۆژ گەیاند. کە بەیان ئەنگوت، ســەندبادی وشــکایی هەســتا نوێژی کرد و لە کاتی خۆیدا هەســتا چوو بۆ ماڵی سەندبادی دەریایی. کە گەیشتە ئەوێ، سڵاوی لە سەندبادی دەریایی کرد، ئەویش بە ڕوویەکی خۆشــەوە وڵامی ســڵاوەکەمی داوە و فەرمووی کرد دانیشــێ. ســەندبادی کۆڵبەر دانیشـــت تا هاوڕێکانی دیکەش هاتن. ئینجا خواردنی جۆراوجۆریان دانا. هەنتەشـــییان خواردیان و خواردیانەوە و کەیفیان پێ کرد. پاشان قسەوباس دامەزرا. سەندبادی دەریایی هاتەوە سەر گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی."

لێرەدا بوو، مــاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتــایی پێ هــات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی پێنجسەد و پەنجا و شەشەم هاتەوە

### چیرۆکی پێنجەم گەشتی سەندبادی دەریایی

گوتی: "خاوەنشکۆ! سەندباد دەستی بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێنجەم گەشتی کرد و گوتی: 'برایینە، جا کاتێک لە گەشتی چوارەمم گەڕامەوە، کەوتمە سەر ناز و نیعمەت و ئەوەی لێم قەومابوو، بیرم چووەوە. ڕۆژێک لە ڕۆژان هەوای گەشت لە سەری دام. وەک جارانی پێشوو دڵم کەوتە قرتوفرت بۆ گەشت و گەڕان بە دوورگە و شاراندا. چاکی مەردایەتیم بە لادا کرد و کاڵای گرانبایی شیاوی سەفەری دەریاییم کڕی. بارم تێکەوە نا و لە بەغداوە بەرەو بەسرە وەڕێ کەوتم. لەوێ کەشتییەکی گەورە و جێدارم کڕی. کەشتیوان و کرێکارم بۆ بە کرێ گرت. کۆیلە و خزمەتکارم بۆ دابین کرد و بەڕێم کردنە سەری. بارەکانم خستە ناوی و کۆمەڵێک لە بازرگانانیش شوێنیان بۆ خۆیان و بارەکانیان لێ بەکرێ گرتم. باریان هێنایە کەشتییەکەمەوە. سوار بوون و دانیشتن. بە خۆشی و شادییەوە کەوتینە ڕێ. لە دوورگەیەکەوە بۆ دوورگەیەکی دی و لە دەریایەکەوە بۆ دەریایەکی دیکە دەڕۆیشتین. بە دوورگە و شاراندا دەگەڕاین و دەمانکڕی و دەمانفرۆشت. وا بوو گەیشتینە دوورگەیەکی پان و بەرین و چۆڵ، هیچ کەسێکی لێ نەبوو و گومبەزێکی گەورەی لێ بوو. بازرگانەکان بۆ سەیری ئەو گومبەزە دابەزین. کە بازرگانەکان دیتیان، نەیانزانی هێلکەی ڕوخە. بە بەرد لێیاندا تا شکا. ئەوجار وەک ڕووبار ئاوی لێ ڕەوان بوو و جووچکەی ڕوخەکەی تێدا دەرکەوت. بازرگانەکان ئەویان لە هێلکەکە هێنایە دەرەوە و سەریان بڕی. گۆشتێکی زۆری بوو. من لە کەشتییەکەدا بووم و ئاگام لێیان نەبوو. لەو دەمەدا یەکێک لە خزمەتکارەکان هات و پێی گوتم: 'گەورەم وەرە تەماشای ئەو هێلکەیە کە.' هەستام سەیری کەم، بینیم بازرگانەکان شکاندوویانە. ئیدی من گوڕاندم بە سەریاندا و گوتم: 'بۆچی واتان کردووە؟ ئێستا ڕوخەکە دەردەکەوێت و کەشتییەکەمان تێک و پێک دەشکێنێت. خێرا هەڵێن وەرن سوار بن.' بە دوای قسەکەی مندا خۆر لە چاو ون بوو و دنیا تاریک بوو. سەرمان هەڵبڕی تا بزانین چی بەری خۆری گرت و بۆ تاریک بوو؟ سەیرمان کرد ڕوخێک بەری ئاسمانی گرتووە و دەقریشکێنێ، دیار بوو بانگی جووتەکەی دەکرد. وا بوو جووتەکەی هات و لە حەواوە دەستیان کرد بە قاووقیژ. خەڵکەکە خێرا سوار بوون بە کەشتیوان و پیاوەکانم گوت بەر لەوەی تێدا بچین، کەشتییەکە بئاژۆن. لە جێوە کەشتیوان دەستوبردی کرد، چارۆکە هەڵدرا و کەوتینە ڕێ. ڕوخ لێمان ون بوون، ئێمە بە خێرایی دەمان ئاژۆت تا لە دەستیان ڕزگارمان بێت. لەپڕ دیتمان وە دوامان کەوتوون، دەوری کەشتییەکەمانیان دا و یەکەی بەردێکی زلی بە قەد شاخێکی بە چنگەوەیە.

" 'یەکێکیان بەردەکەی بەسەردا بەردابنەوە. بەڵام چونکە کەشتییەکەمان تیژ دەڕۆیشت، ویمان نەکەوت و لە نیزیک کەشتییەکەوە کەوتە دەریاوە. بە هۆی گەورە بوونی بەردەکەوە دەریا شڵەقا و شەپۆلێکی وای دا کەشتییەکەمان چی وای نەما بوو سەروژێر بێ. هەر چەند لە ئاوەژوو نەبووەوە بەڵام ئەوجار ڕوخەکەی دیکەیان بەردەکەی بەسەردا بەر داینەوە و پاشی کەشتییەکەی گرت و تێکی شکاند. کەشتی تێک شکا و هەموومان بە بارەکەیەوە کەوتینە دەریاوە. خودا ڕەحمی کرد و دەستم لە تەختەیەکی گەورەی کەشتییە گیر بوو. خۆم پێ گرتەوە و سواری بووم، بە قاچەکانم ئاوم ڕادەدا و با و شەپۆلانیش یارمەتییان دەدام. جا چونکە کەشتییەکە لە نیزیکی دوورگەیەکدا نوقم بووبوو، شوکری خودا گەیشتمە دوورگەکە. بەڵام لە دوا هەناسەکانمدا بووم و لە ترسان و لەبەر ماندووی، نیوەگیان بووبووم. لە تاو برسێتی و تینوێتی هێندەی نەمابوو بمرم. ماوەیەک لە قەراغ دەریاکە کەوتم. تا کەمێک هێز هاتەوە بەر. هەستام و بە دوورگەکەدا گەڕام. سەیرم کرد ئەو دوورگە باخێکە لە گوێن باخەکانی بەهەشت. گوڵی جۆراوجۆر و میوەی بەتام و مەلی خۆشخوێنی تێدا بوو. لە میوەکانم خوارد و لە کانییەکانی ئاوم خواردەوە و سپاسی خودام کرد.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنج‌سەد و پەنجا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! سەندبادی دەریایی گوتی: 'کە لە خنکان ڕزگارم بوو و کەوتمە ئەو دوورگە خۆشـــەوە تا شـــەو داهات بە نێو دوورگەکەدا ســـووڕامەوە. لەو دوورگەیەدا نە دەنگێکم دەبیســت و نە کەســێکم دەبینی. لە ترســان و لەبەر ماندوویی و بێهێزی و بێخەوی وەک مردووم لێ هاتبوو. لە پەنایەک خۆم گرمۆڵە کرد و هەتا تاوهەڵاتی بەیانی لە جێی خۆم نەبزووتم. کە ڕۆژ بووەوە، هەستام و بە لێواری دەریا شینەکەدا ڕۆیشتم تا گەیشتمە ســـەر کانیاوێک، لەوێ پیرەپیاوێکی ســـیماجوانم دی دانیشـــتبوو. گەڵای دارانی بە خۆیەوە بەستبوو. لە بەر خۆمەوە گوتم: 'ڕەنگە ئەم پیرەپیاوە یەکێک لە سـەرنشـینانی کەشـتییەکە بێت کە لە خنکان ڕزگاری بووبێ و گەیشـتبێتە دوورگەکە.' لێی نیزیک بوومەوە و سـڵاوم لێ کرد. بە ئاماژە وەڵامی دامەوە و دەنگی نەکرد. پرسیم: 'مامە گیان بۆ لێرەی؟' سەرێکی جووڵاند و ئاهێکی هەڵکێشـــا و داخ و حەســـرەتی لێ دەرکەوت. بە دەســـت تێگەیاند کە لە کۆڵم کە و بمبە بۆ ئەوبەری چۆمی. بە خۆمم گوت: 'ئەگەر من چـاکە لەگەڵ ئەم کـابرا پیرەدا بکەم و بیگەیەنمە ئەو جێیەی خۆی دەیەوێت، ڕەنگە ئەو چـاکەیەم بێتەوە ڕێ و خودا لە پاداشی ئەو چاکەیەدا دەرووم لێ بکاتەوە.' گورج چوومە پێشـەوە، کردمە کۆڵم و بردمە ئەو جێیەی ئاماژەی بۆ کرد. ئەوجار هەڵتروشـــکام و گوتم: 'فەرموو دابەزە.' کابرا پیرە دەست و قاچی لە ملم و نێو قەدم ئاڵقە کرد و دانەبەزی. سەیری لاقەکانیم کرد، وەک پێستی گامێشم هاتە بەرچاو. لێی ترسام و ویستم فڕێی دەمە خوارێ. ئەوەندەی دی خۆی لێ توند کردم. ویستی بمکوژێ لە ترسام دونیام لەبەر چاو تاریک بوو وەک مردوو بە لادا هاتم.

" 'بەو حاڵەشـــەوە لێی دەدام و دەســـتیشـــی ئەوەندە قورس بوو وەک قامچی ئێشـــی بە جەرگم دەگەیاند. لە تاوان هەســتامەوە، بە پێی دەگوتم؛ بمبە بۆ لای داری میوە خۆشـەکان. هەر کاتێک ســـــەرپێچیم دەکرد، بە لاق و دەســـــت تێی دەســـــرەواندم. بۆ هەر کوێیەک بیویســـتایە، ئاماژەی بۆ دەکرد و وەک یەک ســـم لێی دەخوڕیم. ئەگەر زانیبای خاوە دەکەم، بە هەموو هێزی خۆی لێی دەدام. وەک دیل لە بەر دەســـــتیدا بووم و بەردەوام بە دوورگەکەدا دەمگێڕا و شـــەو و ڕۆژ بە کۆڵ و قەڵاندۆشـمەوە بوو. بەســـەر شـــان و مل و پشـــتمدا دەمیســـت و دەڕیا. لە کاتی خەویشـــدا توند دەســـت و لاقەکانی لە دەوری مل و ناوقەدم دەئاڵاند. کەمێک دەخەوت و دیســــان خەبەری دەبووەوە و لێی دەدام. نەمدەتوانی لار بجووڵێمەوە و بەردەوام لە ڕەنج و دەردەســـەریدا بووم. ســـەرکۆنەی خۆمم دەکرد و مەرگم بە ئاوات دەخواست.

" 'ماوەیەکی زۆر ئاوا لە زەجر و ناڕەحەتیدا بووم تا وا بوو ڕۆژێک لە ڕۆژان لە دوورگەکەدا گەیشتمە شوێنێک پڕ بوو لە کووڵەکە. هەندێکیان وشک بووبوون. کوولەکەیەکی وشکی گەورەم هەڵگرت و سەرەکەیم لا برد و هەڵمکۆڵی. دواتر چوومە بن دارمێوێک. ئاوی ترێم گوشییە نێوی و پڕم کرد و توند سەریم نایەوە. لە بەر خۆرم دانا. ماوەیەکی بەسەردا تێپەڕی تا گەیی و بوو بە بادەیەکی بێوێنە. من هەموو ڕۆژێک لێم دەخواردەوە. ئەو بە دەستی ئاماژەی کرد کە ئەوە چییە؟ گوتم: 'ئەمە شتێکە هێز دەداتە دل و مێشک ئاسوودە دەکات.' کەمێکم لەو بادەیە دەخواردەوە و وەک ئەسپ ئەوم بە نێو داراندا دەگێڕا. کە تەواو مەست بووم، کەوتمە سەما و گۆرانیگوتن و سەرخۆشی. ئەو چەپەڵە کە منی ئاوا بینی، داوای کرد لەو بادەیە بیدەمێ. منیش لە ترسی گیانم، کوولەکە مەیەکەم دایێ. ئەویش زارکی کوولەکەی بە دەمیەوە نا و ئەو مەیەی تێیدا مابوو، هەڵیقوڕاند و کوولەکەکەی فڕێ دا. ئەوجار مەست بوو. بە کۆڵمەوە کەوتە سەما و جووڵە جووڵ، تا وا لێ هات ئەوەندە مەست بوو، هێزی لە بەردا نەما و شل بوو، بەملاولادا لار دەبووەوە. کە زانیم هێزی نەماوە، لە کۆڵم کردەوە و بە زەویمدا دا.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی پێنجسەد و پەنجا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاونشکۆ، سەندبادی دەریایی بە هاورێکانی گوت: 'کە ئەو چەپەڵەم بە زەویدا دا، لە کۆڵم بووەوە و ڕزگارم بوو. ئەوجار ترسم لێ نیشت کە بە مەستیی هەستێتەوە و کێشەم بۆ دروست بکا. گورج بەردێکی زلم بە تۆقی سەریدا دا و کوشتم. کە مرد، دڵم حەساوە. بە ڕۆژدا دەچووم بە میوە و شت خۆم تێر دەکرد و ئاوم دەخواردەوە و پاشان دەچوومەوە قەراغ دەریا و دادەنیشتم و چاوەڕێی کەشتی دەبووم. ڕۆژێکیان بیرم لە سەربوردەی خۆم دەکردەوە و لە بەر خۆمەوە دەمگوت: 'خۆزگە دەمزانی دوای ئەمە چیم بەسەر دێ. بڵێی بە ساغ و سلامەتی بگەڕێمەوە ناو کەس‌وکارم یا نا؟' ڕاست لەو کاتەدا کەشتییەک لە دەریادا دەرکەوت و هات هات تا گەیشتنە لای من و لایان دا و لەنگەریان خست گوریسەکانیان بە دارەکانەوە بەستەوە. سەرنشینەکان هاتنە دوورگەکەوە و من بەرەو لایان چووم. کە بینیمیان، خێرا هاتنە لام و دەوریان دام و پرسیارباریانیان کردم. کە بۆچی لەو دوورگەیەم. منیش بەسەرهاتی خۆمم بۆ گێڕانەوە. سەریان لە قسەکانم سووڕ ما و پێیان گوتم: 'ئەو پیرەپیاوەی هاتووەتە کۆڵی تۆ، ئەوە 'پیری دەریا'ی پێ دەڵێن. جگە لە تۆ، کەس نەبووە بچێتە ژێر پێیەکانی و ڕزگاری ببێ. سپاس بۆ خودا کە سلامەتی.'

" ' ئەوجار خواردن و پۆشاکیان بۆ هێنام. بە ئەندازەی پێویست خواردم و جلم لە بەر کرد. دوایی بردیانمە کەشتییەکەوە و ئاژۆتیان تا گەشتینە شارێک کە خانووەکانی بەرز بوون و دەیانڕوانییە سەر دەریا. بەو شارەیان دەگوت شاری مەیموونان. خانووەکانی ئەو شارە دەرگایەکی چووکەیان بە سەر دەریادا هەبوو. دانیشتووانەکەی کە دەبوو بە شەو لە ترسی مەیموونان بەو دەرگایەدا دەچوون سواری لۆتکە و گەمی و کەشتیان دەبوو و کەمێک لە ڕوخ دەریاکە واوە دەچوون هەر لەوێدا دەخەوتن تا بەیانی. ئەمن چووم سەرێکی نێو شارمدا کەمێک بگەڕێم و چاو لە وڵاتی بکەم کەچی کە گەڕامەوە کەشتییەکە ڕۆیشتبوو. لە تاوان بە هەردووک دەست بە ئەژنۆی خۆم دادا. ئیدی وە بیرم هاتەوە، جاران چیم چێشتووە بە دەست مەیموونانەوە. ئیدی هێندە ناڕەحەت بووم دەستم کرد بە گریان. لەو جەنگەیەدا کەسێکی خەڵکی ئەو شارە هاتە لام و گوتی: 'کاکە ئەوە چییە بۆ ناڕەحەتی؟ دەڵێی غەوارەی؟' گوتم: 'بەڵێ، لاوەکیم و لەگەڵ کەشتییەک بووم، هاتمە خوارێ کەمێک لە نێو شار بگەڕێم دەرنگ هاتمەوە و فریای نەکەوتم، ڕۆیشتبوو. کابرا گوتی: 'هەستە لەگەڵم وەرە سواری لۆتکەیەک شتێک بە دەنا ئەگەر شەو لێرە بمێنییەوە، مەیموونان شەو هەلاهەلات دەکەن. ' ئیدی هەستام لەگەڵی چووم و سواری لۆتکەیەک بووم. لۆتکەکەیان فرسەخێک لە وشکی دوور خستەوە و شەو لەوێدا خەوتین. کە ڕۆژ بووەوە، گەڕانەوە بۆ وشکی و لە لۆتکە و شتەکان دابەزین. هەرکەسەی چوو بە لای کاری خۆیەوە و ئەوە

پیشـــەی هەموو ڕۆژێکیان بوو. ئەگەر کەسـێک هاتبا و لە ناو شـار بمابایەوە، شـەو کە مەیموونەکـان دڕژانە نـاو شــــار هەپرووون بە هەپروونیـان دەکرد. کە ڕۆژ دەبووەوە، مەیموونەکان دەچوونە دەرەوەی شـــار و میوەی باخەکانیان دەخوارد و تا ئێوارە لە کێو دەخەوتن. کە هەوا داریک دەبوو دیسـان دادەگەڕانەوە بۆ ناو شـار و ئەو شـارە لە شـارە هەرە دوورەکانی سوودانە.

" 'یەکێک لەو شتە سەیر و سەرسووڕهێنەرانەی لەو شارەدا بەسەرم هات، ئەوە بوو کە پیاوێک لەوانەی شـەو لە گەمییەکەدا دەمانەوە لێی پرسـیم: 'تۆ کە لەم شـارەدا غەریبی، ئەی هیچ پیشـــەیەک دەزانی خۆتی پێوە ســـەرقاڵ بکەی؟' گوتم: 'نە بە خودا هیچ کار و پیشەیەک نازانم، جگە لەوەی پیاوێکی بازرگانم و هیچ سامانێکم نییە. کەشتییەکم هەبوو پڕ لە کاڵای گرانبایی. ئەویش لە دەریادا تێک شـــکا و هەر چی تێدا بوو نوقم بوو. خودای گەورە تەختەیەک لە تەختەکانی ئەو کەشـتییەی بۆ کردمە هۆکار و بووە مایەی ڕزگاریم.' ئەو کابرایە کە ئەو قسـەیەی لێ بیسـتم، توورەکەیەکی بۆ هێنام و گوتی: 'ئەم توورەکەیە بگرە و پڕی کە لە ورکە بەرد ئێرە ورکەبەردی زۆرە. کە ورکەبەردەکـانت کۆ کردەوە، ڕەگەڵ کۆمەڵێکت دەخەم کە لە شـــار دەچنە دەرەوە. بەوانت دەسـپێرم. تۆ لەگەڵ ئەواندا برۆ، ئەوان هەر چییەکیان کرد تۆش وا بکە، ڕەنگە ئەوەندەی قازانج بۆت هەبێ کە بتوانی پێی بگەڕێیەوە شارەکەی خۆت.'

" 'وا بوو ئەو پیاوە منی لەگەڵ خۆی بردە دەرەوەی شـــار. من توورەکەکەم پڕ کرد لە ورکەبەرد. تا من وام کرد، ئەو کەســـانەی کە قەرار بوو لەگەڵیان بچمە دەرێ هاتن. ئەو کابرایە منی بەوان سپارد و گوتی: 'ئەو پیاوە غەریبە. خێرتان دەگاتێ لەگەڵ خۆتاندا بیبەن. بەشـــکوو لەم ڕێیەوە بتوانێ قووتی خۆی پەیدا بکا و خوداش پاداشـــی خێرتان بداتەوە.' کەچی گوتیان: دەی زۆر باشـــە پێمان خۆشـــە بابێ.' ئیدی منیان لەگەڵ خۆیان برد و ئەوانیش یەکی توورەکەیەکی وەک ئەوەی منیان پێ بوو کە پڕبوون لە ورکەبەرد. پێکەوە ڕۆیشـــتین تا گەیشـــتینە دەشـــتێکی بەرینی پڕ لە داری بەرز، کەس نەیدەتوانی بگاتە چڵەپۆپەکـانیـان. ئەو نێوە تژی بوو لە مەیموون. کە مەیموونەکـان ئێمەیـان دیـت، لێمـان ســـڵەمینەوە و بە دارەکاندا هەڵگەڕان. ئەوجار هاوڕێکانم، ئەو بەردانەی لە توورەکەکانیاندا هێنابوویان، لە مەیموونەکانیان هەڵدەکرد. مەیموونەکانیش میوەی دارەکانیان لێ دەکردەوە و لە وانیان هەڵدەکردەوە. کە سەیرم کرد، دیتم ئەو میوانەی مەیموونەکان لێیان دەکردەوە و دەیانهاوێشت، گوێزی هێندین.

'منیش چوومە ژێر دارێکی گەورە کە مەیمووونی زۆر بەســـەرەوە بوو، دەســـتم کرد بە بەرد تێ گرتن. ئەوانیش گوێزی هێنـدیـان تێ دەگرتمەوە. گوێزەکـانم کۆ دەکردنەوە و هێشتا بەردی نێو توورەکەکەم تەواو نەبووبوو کە گوێزی زۆرم کۆ کردبووەوە. هاواڵەکانم

تەواو بوون و هەرکەسەی لە قەرا توانایی خۆی گوێزی کۆ کردبووەوە. هەر ئەو ڕۆژە گەڕاینەوە بۆ نێو شار. من چوومەوە بۆ لای ئەو پیاوەی منی لەگەڵ ئەو کۆمەڵەدا نارد. ئەوەی هێنابوومەوە دامێ و سپاسی چاکەکەیم کرد. ئەو کابرایە پێی گوتم: 'لەمانە بە ئەندازەی قووتی ئەمڕۆت بفرۆشە.' ئینجا کلیلێکیشی دامێ و گوتی: 'ئەمە کلیلی فلان شوێنە و بەشەکەی دیکەی گوێزەکان لەوێ دانێ و هەموو ڕۆژێ لەگەڵ ئەو کۆمەڵەدا بڕۆ و بەو جۆرە بکە کە ئەمڕۆ کردت.' دوایی خراپترینیان جیا کەوە، بیفرۆشە و بەشەکەی دیکەی لێرەدا کۆ بکەوە. بەشکوو ڕۆژێک فریات کەوێ و بتوانی پێی بچییەوە بۆ شارەکەی خۆت. دۆعای خێرم بۆ ئەو پیاوە کرد و بەو جۆرەی ڕایسپاردبوو، هەموو ڕۆژێک توورکەکەم پڕ دەکرد لە بەرد، لەگەڵ هاورێکانمدا دەچوومە دەر و ئەوان چییان دەکرد، منیش وام دەکرد. ماوەیەکی زۆر ئەمە کارم بوو هەتا گوێزێکی زۆرم لەو گوێزە هێندییە خڕ کردەوە و زۆریشم لێ فرۆشت. پارەکەم کۆ کردەوە و ئەگەر کاڵایەکی باشم بدیبایە دەمکڕی. خۆشم لێ دەگوزەرا و خەڵکی شار دەیانناسیم و ڕێزیان لێ دەگرتم. ئیدی ئەوە کاری من بوو تا وا بوو ڕۆژێکیان لە کەناری دەریا ڕاوەستابووم کە کەشتییەک بەرەو شار هات و لەوێ لەنگەری گرت. بازرگانێکی زۆر لە کەشتییەکە دابەزین. سەرقاڵی کڕین و فرۆشتن بوون. من هاتمەوە لای کابرا و پێم گوت ئەوە کەشتییەک هاتووە منیش دەمهەوێ لەگەڵیدا بڕۆمەوە بۆ شارەکەی خۆم، زۆرم بیری وڵات و کەس‌وکارەکەم کردووە.' گوتی: 'بەڵێ، ڕاست دەکەی.' ئیدی ماڵاواییم لێ کرد. سپاسی چاکەکەییم کرد و هاتمەوە بۆ لای کەشتییەکە. شوێنێکم لە خاوەنی کەشتییەکە بە کرێ گرت. ئەو گوێز و کاڵایەی هەمبوو، هەمووم خستە کەشتییەکەوە و هەر ئەو ڕۆژە کەشتییەکە کەوتە ڕێ.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.کە

## که شەوی پێنجسەد و پەنجا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! سەندبادی دەریایی بە هەنتەشییانی کوڕەکەی گوت: 'هەر ئەو ڕۆژە کەشتییەکە وەڕێ کەوت و لە دوورگەیەکەوە بۆ دوورگەیەکی دی دەچووین و لە دەچووینە هەر کوێ خەریکی کڕین و فرۆشـــتن دەبووین و قازانجمان دەکرد. تا وا بوو خودا زۆر زیاتر لەو ماڵەی پێ بەخشیم کە لە دەستم دابوو. لەو ڕۆژانەدا گەیشتینە دوورگەیەک کە مێخەک و بیباری زۆر بوو هەندێک دەیان گوت؛ لە تەنیشت هەر بیبەرێکدا گەڵایەکی گەورە هەیە بەسـەریەوە سـێبەر دەکات و نایەڵێت باران لێی بدات، کە بارانیش خۆش بکات، ئەو گەڵایە لەسـەر بیبەرەکە لا دەچێ. لەوێ ڕۆیشـتین گەیشـتینە دوورگەیەک، دوورگەی عەسـەراتیان پێ دەگوت کە داری عوودی قەماریی زۆر لێ بوو. دوای ئەوە گەیشـتینە دوورگەیەکی دیکە کە پێنج ڕۆژەڕێ لەوەی پێشووەوە دوور بوو. پڕ بوو لە عوودی چینی کە لە عوودی قەماری باشـتر و گرانترە. بەڵام خەڵکی ئەو دوورگەیە لە چاو خەڵکی دوورگەی عوودی قەماری بێدین و بێڕەوشت بوون؛ خۆشیان لە خراپەکاری دەهات و داب و ڕەوشـتی ئیسـلامەتیان لەبەرچاو نەدەگرت. دوای ئەوە گەیشـتینە شـوێنی مرواریییەکان. گوێزی هێندیمان دەدا بە نۆقارەکان[1] تا لە بەختی ئێمە بچنە ژێر ئاوەکەوە. کە چوونە ژێرەوە، مرواریی گەورە و گرانبابییان لەگەڵ خۆیان هێنا دەرێ. مرواریییەکانی من لە هی هەمووان گەورەتر و باشـتر بوو. نۆقارەکان گوتیان: 'گەورەم، شـوکوری خودا تۆ بەختی چاکت هەیە، ئاخر هەرگیز مرواریی وامان دەرنەهێناوە.' ئەوجار مرواریییەکانم وەرگرت و هاتینەوە نێو کەشتییەکە. کەشتیمان ئاژۆت و شەو و ڕۆژێک بەڕێوە بووین تا گەیشتینەوە بەسـرە. لەوێ لە کەشـتی دابەزیم، ماوەیەکی کەم مامەوە. دوای ئەوە ڕووم لە بەغدا کرد. گەیشـتمەوە گەڕەکی خۆمان و چوومەوە ماڵی خۆم. خزمان و دۆسـتان بە سـاغی و سلامەتی من دڵخۆش بوون و پیرۆزباییان لێ کردم. دیاریم بۆ دۆست و خزم و ناسیاوان نارد. نان و ئاوم دا بە هەتیو و بێوەژنان و پۆشتە و بەرداخم کردنەوە. خودا وا قەرەبووی بۆ کردمەوە کە سامان و ماڵەکەم زۆر زیاتر بوو لە چوار سەفەرەکەی پێشووم. ئەو دەرد و چەرمەسـەرییانەی بەسـەرم هاتبوون، لە بیرم چوونەوە. لە جاران زیاتر ڕووم لە عەیش‌ونۆش و بەزم کرد. ئەوە بوو بەسەرهاتەکانی پێنجەم گەشـتم. جا ئیشەڵڵا خودا یار بێ، سـبەینێ بەسـەرهاتی شـەشـەم گەشـتمتان بۆ دەگێڕمەوە کە زۆر لەوانەش سـەیر و سەمەرەترە.'

"ئەوجار سـفرەیان ڕاخسـت و نانیان خوارد. دوایی سـەندبادی دەریایی سـەد مسـقاڵی

---

[1]. نۆقارە: غواص، ئەوەی دەچێتە قووڵایی ئاو.

زێڕی سوور دا به سەندبادی کۆڵبەر. سەندبادی کۆڵبەر زێڕەکانی لە شاقەلی کراسەکەی کرد و لەوپەڕی سەرسامیدا گەڕاوەماڵەکەی خۆی. ئەو شەوەی بە خۆشی و کامەرانییەوە تێپەڕاند. کە بانگی بەیانی دا، هەستـــتا نوێژەکەی کرد و لە جەنگەی خۆیدا بەرەو ماڵی سەندبادی دەریایی کەوتە ڕێ. کە گەیشتە لای، سڵاوی لێ کرد. سەندبادی دەریایی وڵامی سڵاوەکەی داوە و فەرمووی کرد دانیشێ. سەندبادی ویشکی دانیشت و لەگەڵ سەندبادی دەریاییدا کەوتنە وتوویژ تا هاوڕێکانی دیکەش هاتن. ئەوجار لە هەرلایەکەوە قســـە و باس گەرم بوو تا سفرە ڕاخرا و چێشت داندرا. هەنتەشییان خواردیان و خواردیانەوە و کەیفیان ســـاز بوو. ئەوجار ســـەندبادی دەریایی ســـەری گڵۆڵەی بیرەوەرییەکانی گرتە دەســـت و دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی شەشەم گەشتی:

# چیرۆکی شەشەم گەشتی سەندبادی دەریایی

" 'هاورێیان، کاتێک لە پێنجەم گەشـــتم گەڕامەوە، ڕەنج و چەرمەســـەرییەکانم لە بیر چوونەوە. کەوتمە سـەر خۆشـی و شـادی و خۆشـگوزەرانی. ئەوە بوو ڕۆژێک لە ڕۆژان هەر وەک خووی خۆم بوو بە دڵێکی شادەوە دانیشتبووم کە دەستەیەک لە بازرگانان هاتنە کنم، دیار بوو پیاوی گەشت و گەڕان بوون. کە ئەوانم دی، گەشتی دەریام بیر هاتەوە. ئەو ساتەم هاتەوە یاد کە بە دیدتنی دۆست و خزمان شاد بووبوومەوە. دیسان هەوای سەفەر لە سەری دام. ئەوە بوو کالا و شتومەکی گرانباییم کڕی. شتی وا کە شایانی گەشتی دەریا بن. بارم بەسـت و لە بەغداوە بەرەو بەسرە کەوتمە ڕێ. لەوێ لە کەشـتییەکی گەورەدا کە کۆمەڵێک لە بازرگانانی تێدا بوو، شوێنێکم بە کرێ گرت. بارەکانم خستنە کەشتییەکەوە و لە بەسرە دەرچووین.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی پێنجسەد و شەستەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ! ســەندبادی دەریایی گوتی: 'بارم خســتە کەشــتییەکەوە و لەگەڵ هاوڕێکانمدا لە شارەوە بەرەو بەسرە گەشتەکەمان دەست پێ کرد. بەردەوام لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێک و لە شارێکەوە بۆ شارێکی دیکە دەچووین و خەریکی کڕین و فرۆشتن بووین و دەگەڕاین. خۆشمان بەســەر دەبرد و گەشتەکەمان بەفەڕ بوو و قازنجی زۆرمان کرد تا وا بوو ڕۆژێکیان کەشتیوانی کەشتییەکە هاواری لێ هەستا و کڵاوپێچی لە عەرزی ڕاکێشا و بە چەپۆک دای بە سەر و گوێلاکیدا و لە تاوان بووراوە. بازرگانەکان لێی کۆ بوونەوە و گوتیان: 'کەشــتیوان! ئەوە چی قەوماوە بۆ وا دەکەی؟!' کەشــتیوان گوتی: 'گەلۆ، ڕێمان ون کردووە و لە دەریایی بێ مەترســی دەرچووین و لە دەریایەکی دیکەداین کە من شــارەزای نیم. ئەگەر خودا خۆی لەم شــوێنە مەترســیدارە ڕزگارمان نەکات، هەموومان تێدا دەچین. جا کە وایە لە خودا بپاڕێنەوە و داوای یارمەتی لێ بکەن.' ئەوجار کەشــتیوان هەســتا بۆ ڕێگە چارەیەک بگرێ. لەناکاو ڕەشــەبایەک کەشــتییەکەی بەرەو پاشــەوە ڕادا و لە نیزیک کێوێکی بڵندا تێکی شــکاند. تەختەکانی پرش و بڵاو بوون و هەر چییەکی تێدا بوو نوقمی دەریا بوو. بازرگانان کەوتنە دەریاوە. بەشــێکیان خنکان و بەشــێکیان خۆیان گەیاندە کێوەکە. منیش لەوانە بووم کە ڕزگارم بوو. بە کێوەکەدا هەڵگەڕام و لەوێوە دوورگەیەکی گەورەم دی کە گەلێک کەشــتی شــکاو لەلایدا کەوتبوون. گەلێکم لەو شــتانە بینی کە دەریا ڕایدابوونە قەراغەوە و ســــەرســــامیان دەکردی. چوومە نێو دوورگەکەوە و کانییەکم دۆزییەوە کە لەژێر کێوەکەوە هەڵدەقوڵا و ڕووبارێکی لەبەر دەڕۆیی و لە لایەکی دیکەی کێوەکەوە لە زەوی دەچووە خوارەوە. ئیدی سەرنشینانی کەشتییەکە ئاوا هاتنە دوورگەکە و لەوێ پرش و بڵاو بوونەوە. بە بینینی ئەو کاڵا و شــــتە زۆرانەی لە کەناری دەریاکەدا بوون، هۆشیان لای خۆیان نەما و وەک شێتیان لێ هات. لەنێو ئەو ڕووبارەشدا گەوهەر و یاقووت و مرواریی جۆراوجۆری گەورەم بینی کە هەر وەک لمی ڕووبار هەڵڕێژرابوون و بەستێنی ئەو ڕووبارە بە هۆی ئەو شتانەوە کە تێیدا بوو، وەک ئەستێرە دەدرەوشاوە. لەو دوورگەیەدا گەلێک عوودی چینی و عوودی قەماریم بینی. لەوێ ســــەرچاوەیەکی عەنبەرم بینی هەڵدەقوڵا و وەک مۆمی تواوە بەرەو کەناراوەکە دەڕۆیشــــت. یانلەبەری دەریایی لە دەریا دەهاتنە دەر و هەڵیاندەلووشــی و دەچوونەوە دەریاوە. دواتر ئەو عەنبەرە لە سـکی ئەو گیانلەبەرانەدا گەرم دەبوو و لە دەمیانەوە دەیانکردەوە نێو ئاوی دەریاکە. دەســتبەجێ لە دەریادا دەیبەســــت، دەگۆڕا، شــــەپۆلەکان ڕایدەدانە ڕۆخ دەریاکە و بازرگانان کۆیان دەکردنەوە. بەڵام ئەو عەنبەرەی کە پوخت بێت و گیانلەبەران نەیانبردبێتە دەریاوە، لە ڕووی زەویی ئەو دوورگەیەدا دەیبەســت. کەس ناتوانێت بچێتە ئەو شــوێنەوە وا عەنبەری

پوختی تێدایە، چونکە دوورگەکە لەنێوان چەندین کێودایە و کەس ناتوانێت بەســــەر ئەو کێوانەدا هەڵگەڕێت و لە هیچ لایەکەوە ڕێگا ناچێتەوە سەر ئەو دوورگەکە.

" 'بە کورتی، ئێمە لەو دوورگەیەدا دەگەڕاین و سـەیری دەسـتکردی کردگارمان دەکرد. لە کاری خۆمان حەپەسـابووین و ترس نیشـتبووە دڵمان. توێشـوویەکی کەممان پێ بوو و ڕۆژێ جارێک یان ڕۆژە نا ڕۆژێک نانمان دەخوارد. هەر کەسێکمان لێ دەمرد، دەمانشۆرد و لەو پەڕۆ و شیتاڵەی دەریا ڕایدابوونە کەناراوەکەوە کفنمان بۆ دەکرد. ئەوە بوو زۆرمان لێ مرد و کەمێکمان مایەوە. بە هۆی دەریاوە تووشـی سـکئێشـە بووین. دوای ماوەیەکی کەم دانەدانە هاوڕێکانم مردن. بێ لە من کەس نەما و توێشوویەکی کەمیشم پێ بوو. ئیدی بۆ حاڵی خۆم گریام و گوتم: 'خۆزگە من لە پێش هاوڕێکانم دەمردم بەسنەبوو دەیانشۆردم و کفنیان دەکردم و دەیان ناشتم.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەوشــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و شەست و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! سەندبادی دەریایی گوتی: 'دوای ئەوەی لەو دوورگەیەدا بە تەنیا مامەوە، هەستام لە سووچێک چاڵێکی قووڵم بۆ خۆم هەڵکەند و بە خۆمم گوت: 'هەر کات کەلەلا بووم و زانیم وادەی مەرگمە، دێمە نێو ئەم چاڵەوە و لێرەدا دەخەوم تا دەمرم. دوایە با وردەوردە لمم بەسەردا دەکا و دامدەپۆشی.' ئەوجار لەسەر لێواری چاڵەکە دانیشتم، سەرکۆنەی خۆمم دەکرد کە بۆچی لە شاری خۆم وەدەر کەوتم. ئاخر دوای ئەو گشتە ڕەنج و چەرمەسەری و مەترسییەی لە گەشتەکانی دیکەدا بەسەرم هات، بۆ دەبوو ڕێگای وا بگرمەوە بەر. دیسان لەپێناو چیدا لە شاری خۆم وەدەر کەوتم، خۆ پێویستم بە هیچ نەبوو، ماڵی دنیایەشم بوو. تەنانەت ئەوەندەم ماڵ و سامان هەبوو تا دەمردم بەشم بکا و تەواویش نەبێ، تەنانەت نەمدەتوانی نیوەشی خەرج بکەم.

" 'دوای ئەوە لە کاروباری خۆم ڕامابووم و بیرم دەکردەوە. بە خۆمم گوت: 'بەو خودا ئەم ئاوە سەرەتا و کۆتاییەکی هەر دەبێ هەبێ و ئەم ئاوە ئاخری بە لای ئاوەدانییەکدا هەر دەڕوا. وا چاکە بە تەختە و دار شتێک درووست بکەم هەر ئەوەندەی بتوانم لەسەری دانیشم، بۆ ئەوەی بیخەمە ئەم ئاوەوە با بمبات. ئەگەر چارەنووس ڕزگاریی لە چارەم نووسیبێ، ئەوە ڕزگارم دەبێ. ئەگەر ڕزگاریشم نەبێ، ئەوە لەژێر ئەم کێوە و لەنێو ئەم ڕووبارەدا بمرم باشترە تا لێرە لە برسان بمرم.' ئیدی بە دڵێکی پڕ لە خەم و پەژارەوە هەستام، لە دوورگەکەدا لەو چێو عوودە قەماری و چینییانەم کۆ کردوە کە پرش و بڵاو کەتبوون. بە گوریسێک لە گوریسی کەشتییە شکاوەکان کەوتبوو، پێکەوە شەتەکم دان و تەختەی پانی کەشتییە شکاوەکانی ئەو ناوەم لەسەر دارەکان دانا و سەگەلۆتکەیەکم ساز کرد. جا هەموو دار و تەختەکانیم توند بەست و لەو گەوهەر و مرواریيە گەورە و عەنبەرە پوخت و شتانەی دیکە کە لە دوورگەکەدا بوون، هەڵمگرت و لەسەرم دانان و توێشووەکەش ئەوەی مابوو، هێنام. سەگەلۆتکەم خستە ڕووبارەوە لەسەری دانیشتم و بە گوێی شاعیرم کرد کە دەڵێ:

گەڕانە تێدا دەگۆڕێ بیر و ڕوانینت بۆ ژیان
چاو دەکاتەوە و دەبینی، بە هەزاران ڕەنگی جوان جوان
کێ گەڕابێ و دونیای دیبێ، دەبێ بڵێ من ژیاوم
تا نەگەڕێی و نەبینی هەست ناکەی بە جیاوازییەکان
لە گەرمان گەر هەڵنەقرچێی هەست بە خۆشیی فێنکی ناکەی
پشتکۆمی باری ژین نەبی، چووزانی مانای پشووودان

کەسێک جگە لە گوندی خۆی، بستـــــــــــــێک ئەولاتر نەچووە
شـــاری وان کەلاوەیەکە، نـــــــــــــاگا بە گوندەکەی خۆیان

" 'بە کورتی،بە هەزار ترس و ئەڵلا ئەڵلا لە سەر ئەو تەختەیە دانیشتم و بە ڕووبارەکەدا ڕویشـتم و بیرم لە سـەرەنجامی کاری خۆم دەکردەوە. تەختەکە بەسـەر ئاوەکەدا ڕۆیشـت ڕویشـت تا وا بوو ڕووبارەکە چوو لە بن زەوییەوە و منیشـی لەگەڵ خۆی بردە خوارێ. ئەو نێوە تـاریکییەکەی ئەنگوسـتەچـاو بوو هیچم لێ دیـار نەبوو، جـارجـار تەختەکە لە قەراغەکانی ئەشـکەوتەکە دەگیرا و بە زۆری تێوە دەچوو یان بۆخۆم سـەرم لە میچەکەی دەدرا و ئێشێکی زۆرم پێ دەگەیشت. تازە ڕێگای گەڕانەوەشم نەبوو. کردەپەشیمان بووم و خۆمم سـەرکۆنە دەکرد و دەمگوت: 'ئەگەر بێتوو ئەم شـوێنە ئەوەندە تەنگ ببێتەوە و لوتکەکەی تێوە نەچێ، چیم بە سـەر دێ هەر خودا بۆخۆی دەزانێ بە چ سـەگمەرگییەک دەمرم.' باش بوو بە هەر زەحمەتێک بوو لەو تەنگانانە ڕەد دەبووم. هەر ڕۆیشـتم و شـەو و ڕوژم لێک جیا نەدەکردەوە و لە ترسـی گیانی خۆم زیرەم کردبوو. هەر بەو جۆرە بەسەر ئاوەکەدا دەڕۆیشتم و ئەو ڕووبارە دەمێک تەنگ و دەمێک پان دەبووەوە، بەڵام ئەو تاریکییە چرە ئازاری دەدام و تەواو بێزار دەکردم. دوایە هێندە ماندوو و شەکەت بووم بێ ئەوەی بۆخۆم بزانم خەوم لێ کەتبوو. کاتێک خەبەرم بووەوە، هەسـتم کرد کەوتوومەتە ڕوونـاکـاییەوە. چـاوم کردەوە، شـوێنێکی بەربڵاو و خۆش بوو، لۆتکەکەم بە دارێکەوە بەسترابووەوە. دەستەیەکی حەبەشی لێم خڕ بووبوونەوە. کە دیتیان من چاوم کردەوە، لێم نیزیک بوونەوە. بە زمانێک دەدوان کە لێیان تێنەدەگەیشـتم. جا بە هۆی ئەو سـەختی و ناخۆشـییەوەی لەژێر کێوەکەدا چەشـتبووم، پێم وا بوو، خەون دەبینم. کە قسـەیان لەگەڵ کردم، من لێیان تێنەگەیشـتم و وەڵامم نەدانەوە. ئەوجار پیاوێکیان هاتە بەرەوە، بە عەرەبی سـڵاوی لێ کردم. پێی گوتم: 'کاکی برا، کێیت و خەڵکی کوێیت؟ بۆچی هاتوویتە ئێرە؟' دوایی گوتی: 'ئێمە وەرزێرین، هـاتبووین زەوییەکـانمـان ئـاو بـدەین. کە تومـان لێرە بە خەوتوویی لە سـەر ئەو لۆتکەیە دیت لۆتکەکەمان گرت و بەسـتمانەوە، گوتمان بەشـکوو هەستی پێمان بڵێیت بۆچی هاتوویتە ئەم شوێنە.' پێم گوت: 'گەورەم، لە ڕێی خودا سەرەتا شـتێکم دەنێ بیخۆم لە برسـان هێزی قسـەکردنم نییە. دوای ئەوەی شـتێکم خوارد، هەرچی دەپرسـی بپرسـە.' خێرا خواردنی بۆ هێنام. تێرم خوارد و حەسـامەوە. ترسـم ڕەوییەوە و گیانم هاتەوە بەر. کە بووژامەوە سـپاسـی خودام کرد و خۆشـحاڵ بووم کە لەو تەنگ و چەڵەمەیە و شـانەچیرەیە دەرچووبووم. تەواوی بەسـەرهاتی خۆم لەسـەرەتاوە تا کۆتایی بۆ گێرانەوە و ناخۆشییەکانی ئەو ڕێیەم بۆ باس کردن.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی پێنجسەد و شەست و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! ســـەندبادی دەریایی گوتی: 'ئەوجار خەڵکەکە بە یەکدییان گوت: 'دەبێ ئەمە لەگەڵ خۆماندا ببەینە لای پاشـــا تا بەســـەرهاتەکەی بۆ ئەویش بگێڕێتەوە.' ســـەندباد دەگێڕێتەوە کە منیان لەگەڵ خۆیان برد و لۆتکەکەشـــیان بە هەرچی گەوهەر و مرواری و ســـامانەوە بوو هەڵیان گرت و بردیانە لای پادشـــا. چووینە لای پاشـــا و من بەسەرهاتی خۆمم گێڕاوە.

" 'پاشا سەری لە بەسەرهاتەکەم سووڕ ما و پیرۆزبایی ساغ و سلامەتیمی لێ کردم. منیش هەستام چووم لەسەر لۆتکەکە گەوهەر و مرواری و عوود و عەنبەرێکی زۆرم هێنا و پێشکەشی پاشام کرد. من لە دڵی پاشا جێم خۆش کرد و پلەم بەرز بووەوە و هیچ کات لە بارەگاکەی جیا نەدەبوومەوە. هەرکەس ڕێی بکەوتایەتە ئەو دوورگەیەوە، هەواڵی شاری منی دەپرســـی و منیش هەواڵی شـــاری ئەوانم دەپرســـی. وا بوو ڕۆژێکیان پاشـــا هەواڵی خەلیفەی بەغدای پرســـی و پێی خۆش بوو دادگەریی و دڵکراوەیی ئەو بزانێت. من باســـی بەخشـندەیی و دادگەریی خەلیفەم بۆ کرد و ئەو ســـەری لە کارەکانی خەلیفە ســـووڕ ما و گوتی: 'خەلیفە ڕەوشـــتێکی جوانی هەیە و کارەکانی لە ڕووی زانســـتەوەیە. قســـەکانت خۆشەویستی ئەویان لە دڵمدا درووست کرد. جا دەمەوێت دیارییەکی بۆ ئامادە بکەم و بە تۆدا بۆی بنێرم.' گوتم: 'بەســـەر چاو گوێڕایەڵی فەرمانتم و دیارییەکەت دەگەیەنمە دەست خەلیفە و خۆشەویستی تۆی بۆ دەگێڕمەوە.'

" 'بە کورتی و بە پوختی، ماوەیەکی زۆرم لەلای پاشـــا بە شـــکۆمەندی و خۆشـــبژیوی بەســـەر برد. ڕۆژێک لە ڕۆژان لە دیوانی پاشـــا دانیشـــتبووم، بیســـتم لە نێو شـــار تاقمێک کەشـتییەکیان ســـاز کردووە و بە تەمان بچن بۆ بەسـرە. بە خۆمم گوت: 'دەرفەتی چاکە و هەلی وا هەڵناکەوێتەوە.' ئیدی خێرا چوومە لای پاشا، دەستیم ماچ کرد و ئاگادارم کردەوە کە ئەو کۆمەڵە کەشـــتییەکیان ســـــاز کردووە و، بە تەمان بچن بۆ بەســـــرە، منیش زۆر تامەزرۆی وڵات و کەس‌وکاری خۆمم. ئەگەر ڕێم بدەی پێم خۆشـــە لەگەڵیان بڕۆم. پاشـــا گوتی: 'چۆنت پێ خۆشـــە وا بکە، بەڵام ئەگەر لاشـــمان بمێنیەوە، ڕێزت لە ســـەر چاومانە.' گوتم: 'گەورەم، قەســـــەم بە خودا، تۆ منت نوقمی چاکەی خۆت کردووە، بەڵام تاســـــەی دیداری ماڵ و منداڵ و وڵاتم زۆری بۆ هێناوم.'

" 'پاشا ئەو بازرگانانەی بانگی دەربار کرد کە نیازی گەشتیان هەبوو. منی پێ سپاردن و سامانێکی بێئەندازەی پێ بەخشیم و دیاریی شایانی بۆ خەلیفە هاروونەڕەشید بە مندا نارد. دوایی ماڵاواییم لە پاشـــــا و تەواوی هاوڕێکانم کرد. لەگەڵ بازرگانەکاندا ســـــواری

کەشـــتییەکەدا بووم و وەڕێ کەوتین. بای خوازراو هەڵیکرد، گەشـــتەکەمان خۆش بوو و بەردەوام لەم دەریا بۆ ئەو دەریا و لەم دوورگە بۆ ئەو دوورگە دەچووین هەتا بە سلامەتی گەیشتینەوە بەسرە. لەوێ لە کەشتی دابەزیم و چەند ڕۆژێک مامەوە. پاشـان بەرەو بەغدا وەڕێ کەوتم و یەکسـەر چوومە بارەگای هارووەنەڕەشـید. ئەو دیارییانەی، پاشـا بۆ خەلیفەی ناردبوو، دام بە بەرپرسـانی دەربار. دوای ئەوە هاتمەوە ماڵی خۆم و ماڵ و سـامانەکەم کۆ کردەوە. هاوڕێ و خزم و خوێش هاتنە سـەردانم و بە دیداری یەکتر خۆشـحاڵ بووین و دیاریم بۆ هەموو لایەک نارد. دەسـتی هەژاران و نەدارانم گرت و پۆشـتە و پەرداخم کردنەوە. دوای چەنـد ڕۆژێـک خەلیفە داوای کردم و لە هۆکـاری دیارییەکانی پرسـی. پرسـی: 'ئەم دیارییانە هی کێن و لە کوێوە هێناوتن؟' گوتم: 'خەلیفەی مەزن، ناوی ئەو شـارە نازانم کە دیارییەکانم لێ هێناوە و ڕێگەکەشـی نازانم، بەڵام کاتێک کەشتییەکەمان نوقم بوو، من کەوتمە دوورگەیەک و لەوێ شـتێکی لۆتکەئاسـام درووست کرد و خستمە ئەو ڕووبارەوەی لە دوورگەکەدا بوو. چوومە سـەری و ئەو ڕووبارە منی لەو جێگە مەترسـیدارە ڕزگار کرد.' ئەئاوا تەواوی ئەوەی ڕووی دابوو بۆم گێڕاوە و هۆکاری ناردنی دیارییەکانم پێ گوت. خەلیفە زۆر زۆری پێ سـەیر بوو تووشـی زەندەمان و سۆسـرەت بوو. فەرمانی دا بەسـەرهاتەکەم بنووسـنەوە و بە تۆمارگەی سـپارد تا ببێتە پەند بۆ بەرەی کە دێ. دوای ئەوە زۆری ڕێز لێ دەنام و لە شـاری بەغدادا زیاد لە جاران لە خۆشگوزەرانیدا بووم و سەختی و چەرمەسەرییەکانی گەشتەکەمم بیر چوونەوە. ئەوە بوو بەسـەر هاتی من لە شـەشـەم گەشـتمدا. ئیشـەڵڵا ئەگەر ماین و نەمردین، سـبەینێ بەسەرهاتی حەوتەم گەشتمتان بۆ دەگێڕمەوە کە لەوانەی پێشوو سەیرترە.'

"دوایی سـەندبادی دەریایی فەرمانی دا سـفرە ڕاخەن. پاش نانخواردن سـەد مسـقاڵی زێڕی سـوور دا بە سـەندبادی کۆڵبەر. سـەندبادی کۆڵبەر زێڕەکانی هەڵگرت و لەگەڵ ئەو کۆمەڵە خەڵکەی کە لەوێ بوون گەڕانەوە و لەوپەڕی سەرسامی و خۆشحاڵیدا بوون."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و شەست و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! سەندبادی وشکایی چووەوە ماڵەکەی، ئەو شەوە بە خۆشی ڕۆژی کردەوە. دەمەو بەیان دوو ڕکات نوێژی کرد و خۆی ساز کردەوە چوو بۆ ماڵی سەندبادی دەریایی. دوای ئەوەندەی پێ نەچوو هەموو دۆستان هاتن.

### چیرۆکی، حەوتەم گەشتی سەندبادی دەریایی

"سەندبادی دەریایی سەری قسەی کردەوە و گوتی: 'بەڕێزان، وەک دەزانن، کە لە شەشەم گەشتم گەڕامەوە لە جاران زیاتر لە خۆشگوزەرانیدا بووم. سەرقاڵی بەزم و ئاهەنگ و خۆشی بووم. بە دڵی خۆم ڕامدەبوارد و لە هیچیشم کەم نەبوو. ڕۆژێکیان گەڕانی دەریا و سەیرانی شاران و هاودەمیی بازرگانان لە سەری دام. بڕیارم دا بچم بۆ سەفەر و کالای گرانباییم کڕی. بارم تێکەوە پێچا و لە بەغداوە بەرەو بەسرە کەوتمە ڕێ. لەوێ کەشتییەکم بینی کە کۆمەڵێک لە گەورە بازرگانان لەنێویدا بوون. منیش چوومە ئەو کەشتییەوە، لەگەڵ ئەواندا بوومە دۆست و هەر ئەو ڕۆژە کەوتینە ڕێ. بای خوازراو هەڵیکرد و کەشتییەکەمان بێ کێشە گەیشتە شارێک کە شاری چینیان پێ دەگوت. لەوپەڕی ئاسوودەیی و دڵخۆشیدا بووین. لە بارەی کاری بازرگانی و کڕین و فرۆشتنەوە لە قسەدا بووین کە لەناکاو ڕەشەبایەکی بەهێز بەرۆکی کەشتییەکەی گرت و بارانێکی بە خوڕیش دای دا. بارەکانمان تەڕ بوون. هەرچی پەردە و لبادی پێمان بوو، بەسەر بارەکانماندا دان تا کالا و شتومەکەکانمان لێ زایە نەبێ و خۆشمان دەستمان کرد بە دۆعا و پاڕانەوە و لالانەوە لە بەر خودا کە لەو بەڵاو نەهامەتییە مەترسیدارە ڕزگامان بکا و بمان پارێزێ. لەو دەمەدا کەشتیوان هەستا و قۆڵی هەڵماڵی و شاقەلی کەواکەی تێ هاویشت، بە ستوونی چارۆکەکەدا هەڵگەڕا و سەیری ڕاست و چەپی کرد. لە پڕدا بە چەپۆک بەر بووە سەروگوێلاکی خۆی و دەستی کرد بە سەر و ڕیش ڕنینەوە. گوتمان: 'کەشتیوان! کاکە ئەو چ بوو؟چی قەوماوە؟' گوتی: 'کوڕە قوڕمان وەسەر بوو. لە بەر خودا بپاڕێنەوە فریامان کەوێ و ڕزگارمان بکا. ئەو ڕەشەبایە بەسەرماندا زاڵ بووە و قەسەم بە خودا ڕایداوینەتە ئەوپەڕی دەریا.'

" 'دوایی کەشتیوان هاتە خوارەوە، لە مجرییەکدا کتێبێکی دەرهێنا و کردیەوە و توورەکەی جاویشی دەرهێنا. کتێبەکەی خوێندەوە و پێی گوتین: 'خەڵکینە، لەم کتێبەدا شتێکم بینی کە سەرسامی کردم. ئەویش ئەوەیە کە هەرکەسێک بگاتە ئەم شوێنە، ڕزگاری نابێ و تێدا دەچێ. ئەم ولاتە پێی دەڵێن هەرێمی پاشایان و ئارامگەی سولەیمانی کوڕی

داود لێرەیە. ئێرە ماسی زەبەلاح و تۆقێنەری لێیە. هەر کەشتییەک بگاتە ئێرە، ماسییەک لە دەریاوە بۆی دێتە سەرەوە و کەشتییەکە بە سەرنشینەکانیەوە قووت دەدا.'

" 'کە ئەم قسەیەمان لە کەشتیوان بیست، حەپەساین و هێشتا قسەکانی ئەو تەواو نەببوو کە کەشتییەکەمان بەرز بووەوە و کەوتەوە سەر ئاوەکە. ئەوجار دەنگێکی بەرزی وەک هەورەگرمە هات کە زیرەی پێ کردین، هەندێکیان زراویان چوو و هەندێکیشیان بوورانەوە. لەو ساتەدا لە مەرگی خۆمان دڵنیا بووین. لەپڕ ماسییەکی گەورەی وەک کێو بەرەو کەشتییەکە هات. کە ئەو ماسییەمان دیت دستمان لە ژیان شوت و خۆمان بۆ مردن ئامادە ساز کرد. سەیری ئەو ماسییەمان دەکرد و سەرمان لە گەورەیییەکەی سوورِ ما بوو لە ناکاو ماسییەکی دیکە بۆمان هات کە بوونەوەری لەو گەورەتر و درێژترمان نەدیبوو. ماڵاواییمان لە یەکتر کرد و دەگریاین کە ماسییەکی دیکەی لەو دووانە گەورەتر دەرکەوت. ئیدی بە جارێک گیانمان لە بەردا نەمابوو لە ترسان حەجمیان نەما. ئەوجار هەرسێ ماسییەکە بە دەوری کەشتییەکەدا سوورِانەوە و ماسی سێیەمین خەریک بوو کەشتییەکە بە هەموو شتێکەوە قووت دا کە لەپڕ بایەکی بەهێز هات و کەشتییەکە بە قەدی شاخێک گەورەدا درا. لەرێوە کەشتییەکە تێک شکا و هەر لەتە تەختەیەی بۆ لایەک چوو. بار و بازرگان و خەڵکی نێو کەشتییەکە هەموومان لە دەریادا نوقم بوون. من ئەو جلانەی لە بەرمدا بوون، دامکەندن. جگە لە جلی ژێرەوە هیچم لە بەردا نەما. کەمێکم مەلە کرد و خۆم گەیاندە یەکێک لە تەختەکانی کەشتییەکە و چوومە سەری. شەپۆل و با لە سەر ئاوەکە بۆ ئەملا و ئەولایان دەبردم. سەرێ و خوارێیان پێ دەکردم. لەبەر رەنج و ترس و برسێتی بەحاڵ گیانم تێدا مابوو. بە بەرد لە ئەژنۆی خۆم دەدا کە بۆچی لە سەر ئەو هەموو ئاسوودیی و خۆشگوزەرانییەرا خۆم خستە ئەم رۆژە رەشەوە. بە خۆمم گوت: 'ئالیی سەندبادی دەریایی، تۆ هەموو جارێ تووشی ئەو پەند و گێچەڵە دەبی و ئەو هەموو سەختی و چەرمەسەری دەبینی، کەچی حەیات نییە نییە و دیسان دەست لە سەفەری دەریایی هەڵناگری و دوای بەینێک دیسان هەڵەسوون دێنییەوە. قەیناکا گۆرِی گیانت بێ بیچێژە.'

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی پێنجسەد و شەست و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـکۆ! سـەندبادی دەریایی گوتی: 'بە خۆمم گوت: 'هەرچیم بەسـەر بێ هەقی خۆمە. با دەسـت لەو چاوچنۆکی و تەماحە هەڵگرم، لەبەر تێر نەخۆری خۆمە ئەو هەموو بەڵایەم بەسـەر دێ. خۆ ئەو ماڵ و سـامانەی من هەمە قەت بە خەرج کردن تەواو نابێ و لە بن نایە.' دوای ئەوە هەڵوێسـتم گرت، هەر لەم سـەفەرەوە تۆبەی یەکجارەکی بکەم و تازە سەفەر نەکەم و قەت بیریشی لێ نەکەمە.

" 'بە کورتی، تا دوو ڕۆژ ئەوە حاڵم بوو. هەر دەگریام و دەپاڕامەوە، وا بوو گەیشـتمە دوورگەیەک پڕ لە داری بەری، کە لەبەر بەری زۆر سـەریان گەیشـتبووە زەوی. کانیاوی سـازگار. لە میوەی دارەکانم خوارد و لەو کانیاوانە ئاوم خواردەوە. بووژامەوە و هاتمەوە سـەر خۆ، خەیاڵم ئاسـوودە بوو و گوڕ و تینم هاتەوە بەر. ئەوجار بە دوورگەکەدا گەڕام. لەلایەکییەوە تووشـی ڕووبارێکی گەورە بووم، دەخوشـی. لە سـەرێکی ئەو ڕووبارەوە ڕاوەسـتام و سـەیرم دەکرد. ئەو لۆتکەیەم بیر هاتەوە، لە گەشـتی پێشـوومدا درووسـتم کردبوو. بە خۆمم گوت: 'پێم وا بێ، ناچارم وەک جاری دیکە لۆتکەئاسـایەک درووسـت بکەم. ئەگەر ڕزگارم ببێ، ئەوە بە ئاواتم دەگەم. ئەگەریش تێدا بچم، ئەوە لەو هەموو ڕەنج و کوێرەوەرییە ڕزگارم دەبێ.' ئەوجار کەوتمە کۆکردنەوەی وشـکە داری ئەو دارانە. لە توێکڵی دارەکان و ڕەگی گیاکان شـتێکی وەک گوریسـم هۆنییەوە و تەختەکانم پێ لێک بەسـت. خسـتمە ڕووبارەکەوە، لەسـەری دانیشـتم و ڕۆیشـتم هەتا وا بوو لەوسـەری دوورگەکەوە دەرچووم و لێی دوور کەوتمەوە. تا سـێ ڕۆژ دوای دوور کەوتنەوە لە دوورگەکەش هەر ئاوا دەڕۆیشـتم. لەو ماوەیەدا لە سـەر لۆتکەکە ڕاکشـابووم، هیچم پێ نەبوو، بیخۆم و ئەگەر تینووشم بوایە، لە ئاوی ڕووبارەکەم دەخواردەوە. ترس، سەختی و برسـێتی وایان تەنگ پێ هەڵچنیبووم، ئەوەندەی نەمابوو بمرم. لەو جەنگەیەدا گەیشـتمە کێوێکی بەرز کە ئاوەکە دەچوو لە ژێر کێوەکەوە. کە ئەوەم دی، ئەو ڕووبارەم کەوتەوە بیر کە سەفەرەکەی جاری پێوشوو پێیدا تێپەڕیم. ئەو سەختی و چەرمەسەرییانەم وە بیر هاتەوە کە جاری پێشوو بە سەرم هات. ترسم ڕێنیشت و ویستم لۆتکەکەم ڕاگرم و دابەزم و بە کێوەکە هەڵگەڕێم، کەچی ئاوەکە بەسـەرمدا زاڵ بوو، لەگەڵ خۆی بردمی بۆ ژێر کێوەکە. ئیدی دەسـتم لە ژیان شـوت. ماوەیەک بە بن کێوەکەدا ڕۆیشـتین و دوای ئەوە چووینە دەرێ و بە سـەر دەشـتێکی پان و بەریندا کەوتین. ڕووبارەکە لەو دەشـتەدا تیژ تێدەپەڕی و دەخوشی و هەوراسا هەر گرمەی دەهات. من لە ترسـی ئەوەی نەکا لەسـەر لۆتکەکە بکەوم، توند هەردوو دەسـتم بە لۆتکەکەوە گرتبوو. لۆتکەکە وەک پووش بە دەم ئاوەکەوە دەڕۆییشـت. نەم دەتوانی جڵەوی بکەم و هێز و توانای ئەوەشـم نەبوو بەرەو

وشـــكانى لاى بدەم. وا بوو منى گەياندە كەنارى شـــارێكى ئاوەدان و شـــوورەبەرز كە خەڵكێكى زۆرى تێدا بوو. كاتێك خەڵكى شـــارەكە ديتيان من بەســـەر تەختەكەوەم و ڕووبارەكە دەمرفێنێ و منيش چيم لە دەست نايە، پەتك و گوريسيان بۆ هاويشتم و بەرەو كەنارەكەيان ڕاكێشام. هێندە برسى و تينوو و ماندوو و تۆقاو بووم لە نێو خەڵكەكەدا دڵم بووراوە و بە لادا كەوتم. پياوێكى بەســـالاچوو و بەڕێز لەنێويانەوە هاتە لام. جلوبەرگى شكۆدارى لە بەر كردم و بردميە گەرماو. دوايى شەربەتى وزەبەخشى دامێ و بووژامەوە و بۆنى خۆشـى لێ دام. ئەوجار بردميە ماڵى خۆيان. لە جێيەكى خۆشـدا دانيام و چێشـتى بەتام و خۆشى بۆ هێنام. خواردنەكەم خوارد و تێر بووم. سپاسى خودام كرد كە ڕزگارى كردم. ئەوجار كۆيلەكانى ئاوى گەرميان هێنا، دەســـتم شـــۆرد. كەنيزەكانى دەســـرەى ئاوريشميان هێنا و دەستم پێ وشك كردەوە و دەموپلمم سڕى. دوايە كابرا هەستا لە پەنا ماڵەكەى خۆيدا، جێيەكى جيا و سەربەخۆى بۆ ساز كردم. كۆيلە و كەنيزى خستە خزمەتم. هەر كار و پێويستييەكم هەبا ئەوانە دەسبەجێ جێبەجێيان دەكرد. هەتا سێ ڕۆژان ئاوا بە دەورمدا هاتن و خواردن و خواردنەوە و بۆنى خۆشـــيان بۆ هێنام، تا هێزم هاتەوە بەر و بووژامەوە و هاتمەوە سەر خۆ.

" 'بۆ ڕۆژى چوارەم كابرا هاتە لام و زۆر بەڕێزەوە ســـلاوى لێ كردم و گوتى: 'ڕۆڵە گيان، سپاس بۆ خودا كە سلامەتى. جا ئێستا ئەگەر پێت خۆشە، هەستە با بچين لە قەراغ دەريا شـتەكانت بفرۆشـە. ئەگەر شـتێكى باشـيشـت بەرچاو كەوت، بيكڕە، سـا بەڵكو ئەمە خودايە ســـوودێكى باشـــى بۆت هەبێ.' من تۆزێك بێدەگ بووم و بە خۆمم گوت: 'جا من شـــتم لە كوێ بوو ئەو كابرايە بۆ دا دەڵێ؟!' كابرا گوتى: 'ڕۆڵە گيان، دڵتەنگ مەبە و بيرى لێ مەكەوە. هەستە لەگەڵم وەرە با بچينە بازاڕ. ئەگەر كەسێك نرخێكى باشى دايەى، تۆش پێى ڕازى بووى ئەوە بيانفرۆشـــە. ئەگەر ئەو نرخەشـــت بە دڵ نەبوو، شـــتەكانت لاى من دانێ تا ڕۆژێكى دى كڕياى باشـــترى بۆ پەيدا دەبێ.' بيرم كردەوە و لە دڵى خۆمدا گوتم جارێ با لەگەڵى بچم بزانم مەبەستى چييە و لەگەڵ چييەتى.' ئيدى هەستام و گوتم: 'مامە گيان! من لە خزمەتتدام، جەنابت چۆن بفەرمووى وا دەكەم.' ئينجا لەگەڵ كابرادا چووينە بازاڕ. تەماشا دەكەم ئەو لۆتكەيەى خۆم دروستم كردبوو، پێى هاتبووم، لێك هەڵوەشێنراوە و داراكانى لەســـەر يەك هەڵچنراون. دارەكانى لە دارى ســـەندەلە[1] و دەلاڵ و كڕيار لێيان گرد بوونەتەوە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەى چيرۆكى ئەمشـــەويش كۆتـايى پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەى چيرۆكەكەى هەڵگرت بۆ شەوێكى ديكە.

---

[1]. دارى سەندەل: دارێكى بۆن خۆشە و تەمەنى كارى زۆرە واتە زۆر درەنگ دەرزێ.

## که شەوی پێنجسەد و شەست و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! سەندبادی دەریایی گوتی: 'دەڵاڵ کڕیاری دێنایە سەر دارەکانی لۆتکەکە. بازرگانان مەزندەیان دەکرد و بەرەبەرە نرخیان زیاد دەکرد تا نرخ گەیشتە هەزار دینار. نرخ ڕاوەستا و بازرگانەکان نرخیان زیاد نەکرد، کابرا سەیرێکی کردم و گوتی: 'ڕۆڵە گیان، وا دیارە نرخەکەی لەوە زیاتر نابەنە سەرێ و ئەم ڕۆژانە کاڵاکەت هەر ئەوەندە دێنێ. ئەگەر بەم نرخە دەیفرۆشی، ئەوە لەگەڵیان ڕێک بکەوە و پارەی خۆت وەرگرە. ئەگەر ناشیفرۆشی، من بۆت هەڵدەگرم تا ئەو کاتەی نرخی دەچێتە سەر.' گوتم: 'قوربان، فەرمان فەرمانی تۆیە. چۆنت پێ خۆشە وا بکە.' کابرا گوتی: 'ڕۆڵە گیان، ئەم چێوانە بە هەزار و سەد دینار دەفرۆشی یا نا؟' گوتم: 'بەڵێ، دەیانفرۆشم.' لە جێوە بە کۆیلەکانی گوت دار و چێوەکان هەڵگرن و بیانبەنە ژوورێکەوە. منی بردەوە ماڵێ. تەواوی پارەکەی بۆ ژماردم و مجرییەکی[1] هێنا پارە زێڕەکانی تێ کرد، سەری نایەوە و قفڵێکی ئاسنی لێ دا و کلیلەکەی دامێ. دوای چەند ڕۆژێ پێی گوتم: 'ڕۆڵە گیان، کارێکم پێتە و تکام وایە بە گوێم بکەی.' گوتم: 'مامە گیان، کارەکە چییە؟' گوتی: 'من پیاوێکی پیر و بەساڵاچووم و کوڕم نییە. کەنیشکێکی زۆر جوان و ڕێکوپێکم هەیە. دەمهەوێ لێت مارە کەم و بۆخۆت لێرە لەم شارە بژی. دوای ئەوەش گشت دارونەدارمت ڕادەست دەکەم و دەتکەمە جێنشینی خۆم.' کە گوێم لەو قسەیە بوو، متەقم نەکرد. کابرا گوتی: 'ڕۆڵە گیان، بە قسەم بکە زەرە ناکەی. من بە تەمام بتکەم بە زاوای خۆم و لە جێی کوڕی خۆمت دانێم. ، هەموو ماڵ و سامانەکەمت بخەمە بەر دەستت. هەر کاتێکیش ویستت بگەڕێیتەوە بۆ شاری خۆت، کەس دەست ناهێنێتە ڕێت.' گوتم: 'مامە گیان، باوەڕ بکە ئەوەندەم ڕەنج و چەرمەسەری دیوە، خۆمم بۆ یەکلا نابێتەوە و نازانم قازانج و زیانم لە چی دایە. ئێستا تۆ لە جێی باوکمی و فەرمان فەرمانی تۆیە. چۆنت پێ خۆشە وا بکە.'

" 'دەمودەست کابرا فەرمانیدا قازی و شایەد بێنن. کچەکەی خۆی لێ مارە کردم و شاییەکی گەورەی گێڕا. منی ناردە پەردەوە. کچە لە جوانی و خوێنشیرینیدا تای نەبوو. زێڕ و ملەوانکە و پووزەوانە و کەمەربەند و گوارە و گوڵبەرۆکی وای پێوە بوو نرخەکەیان خۆی لە یەک ملیۆن دینار دەدا. سۆزم بۆی جووڵا و بینای خۆشەویستی لەنێوانماندا پتەو بوو. ماوەیەک لەگەڵ ئەو ژنەمدا لە خۆشی و شادیدا بووم تا وا بوو باوکی مرد. ماڵەکەی بۆ من بەجێ ما، هەموو کۆیلەکانی هاتنە ژێر فەرمانم و بازرگانان منیان لە جێی ئەو بە گەورەی خۆیان دانا. هەروەک چۆن بێ مۆڵەتی ئەو کەس کاڵایەکی نەدەکڕی، بێ مۆڵەتی

---

[1]. مجری: سندووقی بچووک.

من قامکیان له ئاو ڕۆ نەدەکرد.

" 'ئەوجار لەگەڵ خەڵکی شـــاردا تێکەڵ بووم. تەماشـــا دەکەم ئەوانە ســـەری هەموو مانگێک دەگۆڕێن و باڵ و پەڕیان لێ دەڕوێ و پێی دەفڕێنە ئاســـمان و لە شـــاردا جگە لە منداڵ و ژنەکان کەســـــی تێدا نامێنێ. بە خۆمم گوت: 'کە ســـــەری مانگی تازە هات، بە یەکێکیان دەڵێم کە بۆ هەر جێیەک چوون، منیش لەگەڵ خۆتاندا ببەن.' کە ســـــەری مانگی تازە هات، ڕوومەتیان گۆڕا. چوومە کن یەکێکیان، گوتم: 'تۆ خودا منیش هەڵگرە و لەگەڵ خۆتدا بمبە بۆ ئاسمان با کەمێک بگەڕێم و دواییش لەگەڵتاندا دێمەوە.' گوتی: 'شتی وا نابێ من تۆ لەگەڵ خۆمدا هەڵگرم.' زۆری لێ پاڕامەوە و لالامەوە تا قایل بوو. باوەشم پێدا کرد. هەڵیگرتم و فڕی بۆ ئاســـــمان. ئەوەندە هەڵکشـــــا کە گوێم لە دەنگی فریشـــــتەکان بوو تەسبیحاتیان دەکرد. سەرم لەم کارە سووڕ ما و بیرم لە دەسەڵاتی خودا کردەوە و گوتم: ' سوبحانەڵڵا'. هێشتا وشەکەم تەواو لە دم نەهاتبووە دەر کە ئاگرێک لە ئاسمانەوە هات و خەریک بوو هەموومان بســـووتێنێ. هەموو بە جارێ نیشـــتنەوە و منیان لەســـەر کێویکی بەرز فڕێ دا و زۆرم لێ تووڕە بوون. هەر لەوێ جێیان هێشتم. لەو کێوەدا بە تەنیا مامەوە و لە کاری خۆم پەشیمان بوومەوە و گوتم: 'ســوبحانەڵڵا، لە لە ئاریشـــەیەک ڕزگارم دەبێ و ئاریشـــەیەکی ناخۆشـــتر بەرۆکم دەگرێ!' لەو کێوەدا ســـەرگەردان دەگەڕام و نەمدەزانی ڕوو لە کوێ بکەم. لەناکاو دوو کوڕێژگەی ڕوومـانگم دی کە لەو کێوەدا دەگەڕان. هەر یەکەی گۆچانێکی پێ بوو، لە زێڕی سوور دروست کرابوو. لێیان چوومە پێشێ و سـڵاوم لێ کردن. سـڵاوەکەمیان ستاندەوە و، پێم گوتن: 'ڕۆڵە گیان ئەوە ئێوە کێن و لەم شـاخ چ دەکەن؟' گوتیان: 'ئێمە کۆیلەی خوداین.' ئەوجار یەکیان گۆچانەکەی دامێ و ڕێی خۆی گرتە بەر. ڕۆیشتن و منیان هەر لەوێدا بە تەنیا جێ هێشت. گۆچانەکەم بە دەستەوە گرت، لەســـەر ئەو کێوە دەســـووڕامەوە و بیرم لەو دوو کوڕە دەکردەوە کە لەپڕ ئەژدیهایەک لە خوار کێوەکەوە هاتە سەر، پیاوێکی بە دەمەوە بوو کە تا ناوکی چووبوو لە دەمییەوە. چی وای نەمابوو تەواو قووتی بدا، ئەو پیاوە دەیقیژاند و دەیگوت: 'هەرکەس ڕزگارم کا، خودا لە سەختی ڕزگاری دەکا.' من چوومە پێشێ، بە گۆچان لە سەری مارەکەم دا. دەمودەست مارەکە زاری کردەوە و پیاوەکەی دەر داوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی پێنجسەد و شەست و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! ســـەندبادی دەریایی بۆ میوانەکانی گێڕاوە و گوتی: 'کە من بە گۆچانە زێڕەکەم لە ســـەری مارەکەم دا، لەڕێوە ئەو پیاوەی بەردا کە بە دمییەوە بوو. ئەو کابرایە هاتە لام و گوتی: 'مادام لە چنگ ئەو مارە ڕزگارت کردم، قەتت لێ جودا نابمەوە و لەم کێوەدا دەبمە هـاوڕێت.' بووینە هـاوڕێ و لەو کێوەدا دەســـووڕاینەوە کە لە نـاکاو کۆمەڵێک بۆمان هاتن. بینیم ئەو پیاوەی منی هەڵگرت و بردمیە ئاســـمان، لەنێویاندایە. من چوومە پێشـــەوە و داوای لێبووردنم کرد و گوتم: 'ئەرێ هاوڕێی دێرین! ئەو دەردە چ بوو داتمێ؟ چۆن هاوڕێ ئاوا لە هاوڕێی خۆی دەکا؟' گوتی: 'تۆ مەگەر هەر ئەو کەسە نیت کە بە تەســـبیحاتەکەت ئێمەت تێدا برد؟' گوتم: 'کوڕە، پیاوی چاک، لێم بە دڵ مەگرە. خۆ من نەمزانی نابێ قســـەی وا بکەم. تازە بەڵێن بێ لەمەوبەدوا هیچ ناڵێم و تەســـبیحات ناکەم.' ئەوجار ئەو پیاوە مەرجی دانا و پەیمانی لەگەڵ بەســـتم کە ناوی خودا بەســـەر زمانمدا نەهێنم و تەسبیحات نەکەم.

" 'کە پەیمانەکەم پەســەند کرد، بە کۆڵیەوە گرتم، بەرەو ئاسمان فڕی و بردمیەوە ماڵی خۆم. ژنەکەم هات سڵاوی لێ کردم و بە ساغ و سڵامەتیم دڵخۆش بوو. گوتی: 'لەمەودوا لەگەڵ ئەو پیرەدا تێکەڵ مەبە و خۆت بەدوور بگرە لەوەی لەگەڵیاندا بچیتە دەرەوە. ئەوانە دۆستی شەیتانەکانن و یادی خودا ناکەن.' من پێم گوت: 'ئەی باوکت چۆن لەگەڵیاندا بوو؟' گوتی: 'باوکم لەوان نەبوو و وەک ئەوانی نەدەکرد. ئێســـتا کە باوکم مردووە، من دەڵێم دارونەدارت بفرۆشە و پارەکەی بدە بە کەلوپەلی بازرگانی و بەرەو شاری خۆت بگەڕێوە و منیش لەگەڵ خۆت ببە. ئاخر من تازە دوای باوک و دایکم ناتوانم لەم شـــارەدا بژیم.' بۆچوونەکەیم بە دڵ بوو. ماڵ و سامانەکەم فرۆشت و چاوەڕێی کەشتی بووم لەو شارە بڕۆم. لەو جەنگەیەدا، تاقمێک لە خەڵکی ئەو شارە نیازی سەفەریان بوو، کەشتییان دەست نەکەوت.

" 'دوایی تەختەیان کڕی و کەشتییەکی گەورەیان درووست کرد. منیش شوێنێکم لێ بە کرێ گرتن و پـارەم دانێ. لەگەڵ ژنەکەمـدا چووینە کەشـــتییەکەوە و کـاڵا و شتومەکەکانیشمان برد. ماڵ و مڵکمان جێ هێشت. لە دوورگەیەکەوە بۆ دوورگەیەکی دی و لە دەریایەکەوە بۆ دەریایەکی دی بەڕێوە بووین. ڕۆیشـــتین ڕۆیشـــتین تا وا بوو بە سڵامەتی گەیشتینە شـاری بەسرە. لەوێ نەماینەوە و سـواری کەشـتییەکی دی بووین و کەلوپەلەکانمان تێ خست و بەرەو بەغدا وەڕێ کەوتین.

" 'کە گەیشـتینەوە بەغدا، هاتینەوە ماڵی خۆمان. خزم و دۆسـتان سـەریان لێ داین. بە

دیداری خزم و خوێش شـادمان بووم. زێڕ و پارەکانم خسـتنە سـندووقەوە و هەڵمگرتن. دۆسـت و هاواڵم ئەو ڕۆژانەیان لێک داوە کە لە حەوتەمین گەشتم پێم چووبوو. بیسـت و حەوت سـاڵم پێ چووبوو. وا بوو ئەوان دەسـتیان لێ شـوبووم. کە بەسـەرهاتی خۆمم بۆ گێڕانەوە، هەموو سەریان لە کارم سووڕ ما. تەواو پێیان سەیر بوو و بە ساغ و سڵامەتیم دڵخۆش بوون و پیرۆزباییان لێ کردم. ئیدی تۆبەم کرد کە لە وشـکانی و دەریادا سـەفەر نەکەم. دوای ئەو حەوتەم گەشـتەم کە دواین گەشـتی من بوو، ئیدی لەو جارەوە تۆزی غەریبی لە ڕەنگم نەنیشت.

"'سەندبادی وشکایی، کاکی خۆم تۆ تەماشای کاری من کە و ئەو ڕەنج و نەهامەتییانە ببینە کە بەسـەرم هاتوون. ببینە چ چەرمەسـەرییەکم چەشـتووە تاوەکو ئێسـتا ئاوا بە ئاسوودەیی دانیشتووم.'

"سەندبادی کوڵبەر داوای لێبووردنی لە سەندبادی دەریایی کرد و تکای لێ کرد ئەوەی کردوویە لێی بە دڵ نەگرێ. سـەندبادی دەریایی لێی خۆش بوو. کردییە دۆسـت و هاواڵی خۆی. بەردەوام هاودەم و هاونشـینی یەکدی بوون، لە خۆشـی و شـادیدا ڕایاندەبوار تا تێکدەری خۆشـییەکان و بڵاوەپێکەری کۆڕەکان و ڕمێنەری کۆشـکەکان و ئاوەدانکەرەوەی گۆڕەکان سەری بەسەری کردنەوە.

## چیرۆکی جنۆکە و شەیتانە بەندییەکان

"دیسـان دەگێڕنەوە کە سـەردەمانی زوو لە دیمەشـقی شـام خەلیفەیەک هەبوو بە ناوی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان.

ڕۆژێک لەسـەر تەختی خەلافەت دادەنیشـێ و گەورەگەورەکانی وڵات لە هەنتەشـیدا دەبن. باس لەبارەی دەسەڵاتدارانی دادگەری پێشینەوە بوو و چیرۆکێک لەمەڕ سولەیمانی کوڕی داودەوە(س ـ خ) هاتە گۆڕێ. گوتیان کە خودای گەورە حوکمداریی مرۆڤ، جنۆکە، باڵندە، هۆڤی و جگە لەوانیشـی پێ دا. ئەوەی خودا بەوی دا، بە کەسـی دیکەی نەداوە. ئەو پێغەمبەرە بە پلەیەک گەیشـتبوو کە هیچ کەس پێی نەگەیشـتبوو، تەنـانەت جنۆکە و نرنـاشـەکانی لە کووپەی مسـدا بەند دەکرد، قەڵاییی تواوەی بەسـەردا دەکرد و بە ئەنگوستیلەکەی مۆری دەکرد."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی پێنجسەد و شەست و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشسکۆ! ئەوجار تاڵیبی کوڕی سەهل گێڕایەوە، پیاوێک لەگەڵ تاقمێک سواری کەشتی دەبێ و بەرەو هیندستان وەڕێ دەکەوێ. شەو و ڕۆژ لە ڕێیەدا دەبن تا وا دەبێ، شەوێک لە شەوان ڕەشەبایەک هەڵدەکات و دەیانخاتە زەوییەک لە زەوییەکانی خوداوە. کە ڕۆژ دەبێتەوە، لە ئەشکەوتەکانی ئەو ناوچەیە هۆزێکی ڕەشپێستی ڕووتوقووت کە لە هۆڤیان دەچوون، ئەوانە هەر لە خۆیان پادشایەکیشیان هەبوو. دێنە لای کەشتییەکە. هیچیشیان زمانی عەرەبیان نەدەزانی. کە ئەوانە سەرنشینانی کەشتییەکە دەبینن، پاشاکەیان لەگەڵ دەستەکەیدا دێنە لای کەشتییەکە و سڵاو لە خەڵکەکەی دەکا و لە ئایینیان دەپرسێت. کە سەرنشینەکان وەڵام دەدەنەوە و باسی گوزەرانی خۆیان دەکەن، پاشا دەڵێت: 'ترستان نەبێت، بەڵام بزانن کە بەر لە ئێوە ئادەمیزاد نەهاتبووە لامان.' دوایی پاشا بە گۆشتی باڵندە و ئاژەڵی کێوی و ماسی میوانداریان لێ دەکات و بێ لەوانە هیچ جۆرە خۆراکێکیان نەبوو. پاشان سەرنشینەکان چوونە سەیر و گەڕانی ئەو شارە. ماسیگرێک دەبینن کە تۆڕی داوێتە دەریاوە. کە تۆڕەکە دەردێنێتەوە، کووپەیەکی مسی کە مۆری حەزرەتی سولەیمانی لێ درابوو، بە تۆڕەکەوە دێ و کابرای ماسیگر کووپەکە دێنێتە دەرێ و دەیشکێنێت. لە جێوە دووکەڵێکی ڕەش بەرەو ئاسمان هەڵدەچێت و دەنگێکی ناسازی لێ بەرز دەبێتەوە کە دەڵێت: 'ئەی پێغەمبەری خودا، تۆبە بێ، تۆبە!' ئەوجار دووکەڵەکە دەبێتە کەسێکی دزێو کە سەری لە ڕێکی لووتکەی کێوەکە بوو. ئەوجار ئەو کەسە لە بەر چاوی ئامادەبووان ون دەبێ. سەرنشینانی کەشتییەکە لە حەپەساندا خەریک بوو دڵیان بتۆقێ. کەچی خەڵکی شارەکە مێشێکیشیان لێ میوان نەبوو. دوایی یەکێک لە سەرنشینەکانی کەشتییەکە چووە لای پاشا و لە بارەی ئەو کەسەی نێو کووپەکەوە پرسیی. پاشا پێی دەڵێت: 'ئەوە یەکێکە لەو جندۆکانەیە کە حەزرەتی سولەیمانی پێغەمبەر ڕقی لێ هەڵدەگرێ و لەو کووپە مسییەدا بەندی دەکا و سەری دەنێتەوە و قەڵایی تواوەی بەسەردا دەکا. و بە ئەنگوستیلەی پێغەمبەری مۆری دەکا و دەیهاوێتە دەریاوە. زۆر جاران کە ماسیگرەکان تۆڕ دەهاونە دەریاوە، ماسی بگرن کەچی لەو کووپە مسیانە بە تۆڕەکانیانەوە دێ و دەریاندێننەوە. کە دەیانشکێنن، نڕناشێکی لێ دێتە دەرەوە و بە گومانی خۆی سولەیمان ماوە، لە ترسان هەر دەڵێ 'تۆبە، تۆبە.' عەبدولمەلیک کە ئەم چیرۆکەی لە تاڵیبی کوڕی سەهل بیست، واقی وڕ ما و گوتی: 'سوبحانەڵڵا، سولەیمان چ دەسەڵاتێکی مەزنی هەبووە!' جا یەکێک لە هەنتەشییانی کۆڕەکە نابیغەی زوبیانی[1] بوو و

---

[1]. نازناوی زیادی کوڕی موعاویەیە کە ١٨ ساڵ پێش کۆچ، کۆچی کردووە. چاکەگۆی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان و یەکێک لە سێ شاعیری گەورەی بەر لە ئیسلام بوون.

گوتی: 'قوربان، تاڵیب ڕاست دەکا. بەڵگەی ڕاستیی قسەکەشی ئەم شیعرەی حەکیمی یەکەمە کە گوتوویەتی:

سولەیمان کە بوو بە پادشای جیهان
بەو جۆرە دایڕشت بەرنامە و پلان
بە فەرمانی خوا بجووڵێتەوە
ئەوەی لار بڕوا ڕاستی کاتەوە
ئەوەی ملکەچی فەرمانی خوا بێ
هەتا هەتایە لە خۆشی دابێ
پادشایەتی ئەرکی گرانە
دەستێکی هەنگوین یەکی سندانە

## چیرۆکی شاری مس

"خەلیفە گوتی: 'قەسەم بە خودا ئاواتم ئەوەیە لەو کووپانە ببینم.' تاڵیبی کوڕی سەهل گوتی: 'قوربان، ئەم کارە بۆ تۆ ئاسانە. نێردەیەک بنێرە کن عەبدولعەزیزی برات کە نامەیەک بۆ مووسای والی مەغریب بنووسێت تا سوار ببێت و بەرەو ئەو کێوە بچێت و لەو کووپانەت بۆ بێنێ.' خەلیفە فکرەکەی ئەوی پێ جوان بوو، گوتی: 'ئافەرین تاڵیب، بەلام دەمەوێ بۆ ئەو کارە تۆ ڕاسپێرم، بچیتە کن مووسا. جا لەم گەشتەتدا هەرچی ماڵ و پشتمێرت بوێ، دەتدەمێ و ئالای سپیت پێ دەسپێرم و خزم و کەست دەحەسێنمەوە.' تاڵیب گوتی: 'بەسەر سەر و سەر چاو، قوربان.' ئەوجار خەلیفە فەرمانی دا؛ نامەیەک بۆ عەبدولعەزیزی برای لە میسر و نامەیەکیش بۆ مووسا لە مەغریب بنووسن کە مووسا خۆی پێوشوێنی کووپەکانی سولەیمان بگرێ و کوڕەکەی لە جێی خۆی دانێ و سوپایەکی زۆر لەگەڵ خۆیدا ببات، هەوڵێکی زۆر بدا و سستی نەنوێنێ و بیانوو نەهێنێتەوە.'

" 'دوایی هەردوو نامەکەی مۆر کرد و بە تاڵیبی سپاردن. سامانێکی زۆری دا دەستی و پشتمێر و پیاوی ئازای ڕەگەڵ خست. بەوجۆرە تاڵیب بەرەو میسر وەڕێ کەوت."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی پێنجسەد و شەست و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! تاڵیبی کوڕی سەهل لە شامەوە لەگەڵ هاوسەفەرەکانی وەڕێ کەوت. ڕۆیشتن ڕۆیشتن تا گەیشتنە میسر. چوون سەری میری میسریان دا. میری میسر باشترین شوێنی بۆ تاڵیب تەرخان کرد، پێویستییەکانی بۆ دابین کرد و ڕێزی لێ نا. پاشان کەسێکی شارەزای لەگەڵ تاڵیب نارد و ڕۆیشتن ڕۆیشتن تا گەیشتنە لای مووسای کوڕی نەسر. کە میرمووسا هەواڵی هاتنی تاڵیبی پێ گەیشت، بە پێشوازییەوە چوو و بە دیداری گەلێ خۆشحاڵ بوو. دەمودەست تاڵیب نامەی خەلیفەی دایێ. میرمووسا نامەی کردەوە و خوێندییەوە، لە بابەتەکە تێگەیشت و نامەکەی بە سەریەوە نا و گوتی: 'فەرمانی خەلیفە لەسەر سەرمە.' ئەوجار گەورە و دانایانی وڵاتی بانگ کرد و نێوەڕۆکی نامەکەی خەلیفەی بۆ باس کردن. ئەوان گوتیان: 'ئەی میری مەزن، ئەگەر دەتەوێ کەسێک بۆ ئەو جێیە ڕێنوێنیت بکا، ئەوە دەبێ عەبدوسسەمەدی کوڕی عەبدولقوددووسی سموودی بانگ بکەی. ئاخر ئەو پیاوێکی زانا و بە ئەزموو و دنیادیدەیە. شارەزایی تەواوی لە نێو دەریا و بەژ هەیە. قوونەکەوی دونیای کردووە و وەک ڕێوییەکە جێ نەماوە گووی لێ نەکردبێ.' میرمووسا داوای کرد کە عەبدوسسەمەد بانگ بکەن. عەبدوسسەمەد هات. پیاوێکی بەساڵاچوو بوو. میرمووسا سڵاوی لێ کرد و پێی گوت: 'گەورەم، ئەوە خەلیفەی زەمان، عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان، نامەیەکی ناردووە و داوای ئەو کووپە مسیانە دەکا کە سولەیمان پێغەمبەر جنۆکانی تێدا بەند دەکرد. جا ئەمن ئەو شوێنە پێ نازانم و، بیشتووشمە کە تۆ شارەزایی زۆرت لە دەریا و بێروون و کێوان هەیە. ئەگەر حەزت لێیە ئارەزووی خەلیفە بەجێ بێنێ، ئەوە ئەو جێیەم پێشان بدە.' شێخ عەبدوسسەمەد گوتی: ''میری مەزن، ڕێگەکەی دوور و ترسناکە!' میرمووسا گوتی: 'دوورییەکەی چەندە؟' کابرا پیرە گوتی: 'بە چوون و هاتنەوە پێنج ساڵت پێ دەچێ. سەرەڕای ئەوەش ئەو ڕێیە پڕە لە مەترسی سەیر و سەمەرە. ئەوجار ئەتۆ پیاوێکی ئازایی و بڕۆی جێت خاڵی دەبێ. وڵاتەکەشمان لە دژمنەوە نیزیکە. هاکا لە نەبوونی تۆدا مەسیحییان بە هەلی بزانن و هێرشمان بکەنە سەر و وڵاتەکەمان داگیر بکەن. بۆیە لەسەرتە کارزانێک لە وڵاتدا لە جێی خۆت دانێی.' هەر بۆیە میر، مووسا هاروونی کوڕی لە جێی خۆی دانا و سوپای خستە بەر فەرمانی ئەوەوە. فەرماندەکانی سوپا گوێڕایەڵ بوون و فەرمانیان بەجێ هێنا. هاروون گەورەیەکی ناودار و دلێر و کەڵەوەکێش بوو. دوای ئەوە شێخ عەبدوسسەمەد بە میرمووسای گوت: 'ئەو جێیە ئەو شتەکەی لێیە و خەلیفە داوای کردووە، چوارمانگە ڕێیە و لە کەناری دەریایە. تەواوی ئەو ڕێیەش ئاوەدانییە، گشت ماڵەکان خۆش و دڵڕفێنن و کانی سازگاری لێیە. ئاواتەخوازم لە پیت و ودمی تۆوە ئەم ڕێیەمان بۆ ئاسان ببێ.' میر

موسسا گوتی: 'شێخ ، هیچ کام لە پاشایان تا ئێستا پێی ناوەتە ئەو وڵاتە یان نا؟' شێخ گوتی: 'ئەرێ، ئەو وڵاتە هی ئەسکەندەری رۆمییە.' دوایی میرمووسا و شێخ و هاوڕێانی وەڕێ کەوتن و ڕۆیشتن ڕۆیشتن تا گەیشتنە کۆشکێک. شێخ گوتی: 'بچنە ژوورەوە، پڕە لە شتی سەیر و سەمەرە.' ئەوجار میرمووسا و شێخ و هاوڕێیان بەرەو کۆشک چوون. کە گەیشتنە بەر کۆشک، سەیریان کرد دەروازەی کۆشک لە سەر پشتە. تەماشایان کرد، لەسەردەرانەی کۆشکەکە بە زمانی یۆنانی شێعر نووسراوە. شێخ گوتی: 'قوربان، ئەم شێعرانە بخوێنمەوە یان نا؟' میرمووسا گوتی: 'بیانخوێنەوە سا بەڵکو خودا بۆتی بکاتە مایەی خێر و لەم گەشتەمدا لە بەرەکەتی تووە منیش خۆشحاڵ بە دەستی پڕ بگەڕێمەوە.' ئەوجار شێخ چووە پێشێ و شێعرەکەی خوێندەوە:

تێفکرە ژێری وردبیــــــــن، ژین فێرگەیە بۆ ژیران
لە هەر خەســــــــــارێ عەقڵێ، وانەیەکە بۆ ژیان
سەری زۆر خـــــان و میران، تۆزی ژێر پێی منداڵە
خاک و خـــــــۆڵی کۆلانان، ئەزموونی سەدانساڵە
ئەوەش مرۆی خۆی دەوێ، ئەو ئەزموونە وەکو کـا
کـــــــــۆشکی بەرزی ژیانی، بەوانە گردوکۆ کا

"دوای ئەوە، میرمووسا هێندە گریا تا بووراوە. کە وە هۆش هاتەوە، چووە کۆشکەوە. سەری لە جوانی کۆشکەکە سوورِ ما و سەیری پەیکەر و وێنەکانی دەکرد کە لەسەر دەرکی دووەمی کۆشک چەند بەیتە شێعرێکی بینی. میرمووسا گوتی: 'دەی شێخ، ئەو بەیتانە بخوێنەوە.' شێخ چووە پێشێ و دەستی بە خوێندنەوەیان کرد:

هەتا کەی دڵی تینوو، دڵ بەو هـــــــۆدە دەبەستی
هاکا گاز کرای بڕۆی، خـــــــــۆ ناتوانی بوەستی
کە قووقەی کەڵەشــێری کۆچ لە خەوی هەســتاندی
تازە دەبێ وەپێچی، بارگـــــــــــە و بنەی غەریبی
دەڵێن کە مرۆڤی ژیـــــــــــــر، ئاماژەیەکی بەسە
بێتوو لە قەڵا کۆنان تــــــــــــێفکری ئیدی بەسە
ئەو گشتە پادشا و مـــــــــیرە، کە تۆ ناویت بیستووە
لووتی بەرزی هەمـــــــــوویان تێکەڵ ئەو خاکە بووە

"میرمووســــا دایە قوڵپی گریان و دنیا لە بەرچاوی تاریک بوو و گوتی: 'ئێمەیان بۆ

کارێکی مەزن ئافراندووە.' ئەوجار لە کۆشــکەکە ورد بووەوە، تەماشــای کرد کەســی تێدا نییە و چۆڵوهۆڵە، خانووەکان تۆقێنەر و دار و دیوار تۆزیان لێ نیشــتووە. لەنێوەڕاســتی کۆشــکەکەدا گومەزێکی تێدایە هێندە بڵندە ســەر لە ئاسـمان دەســوێ و چوارســەد گۆڕی دیکەی لە دەوروبەرین. میرمووســـا لە گۆڕەکان نیزیک بووەوە و کێلی یەکیان کە بەردی ڕوخام بوو، ئەو چەند بەیتەیان لەسەر هەڵکۆڵیبوو:

گەر بۆ تاقە جارێکــــــــــیش بێ ورد لەو دونیایە بڕوانە
بزانە چــــــــــــــی بە سەر هاتو، ژیان چەندە لە گۆڕانە
نە کۆیلەدارێکی بە فــــــــــــیز، کۆیلان بە قەمچی ڕا دەدا
نە کۆیلەیەکی بـــــــــــێ ئەنوا، لە ترسان میز بە خۆی داکا
لەو مەیـدانی جەفـا و ڕەنجە، ڕەنجـدەر و ڕەنجبەر بێ دەنگە
نە دەنگی عوود و ســـاز و چەنگ، نە بگرە و بەریدەی جەنگە
بەرگەی بێدەنگی ناگـــــــــــرێ، ئەو کە بە قاقا گۆچ دەکرێ
دەبێ و ڕۆژێ دەبـــــــــێ بمرێ، خۆشی تا سەر سەر ناگرێ
کەس حــــــــــــــەز بە دیتنی ناکا، بێدەنگییەکی سامناکە
ڕۆژێ چاو لێی تـــــــــــێر نەدەبوو، ئێستا بە دیتنی خەمناکە

"ئەوجار میرمووســـا و ئەو کەســـانەی لەگەڵی بوون، زۆر گریان. دوایی لە گومزەکە نیزیک بووەوە و دیتی هەشت دەرگەی هەیە. دەرگاکان لە تەختەی سەندەل چێ کراون، بە بزمـاری زێڕ داکوتراون و بە گەوهەری جۆراوجۆر ڕازێنراونەتەوە و لەســـەر دەرگەی یەکەم ئەم بەیتانە نووسراون:

قەڵای هیممەتـت هێنـد بەرز بێ، خوێڕێتیـت بەلاوە نەنـگ بێ
ژیــــــــــنی ئەم یەک و دوو ڕۆژە، چ نییە بۆ پشت بەستن بێ
پاکانەی خــــــــــــوێڕییەتی مەکە، قەت قەت نابێ بە سەرمایە
نان و ئاو و پلە و پایە، نەتکەن پێخـــــــــــــوست و بێ مایە
دەرفەت لە بۆ خۆشەویستـــــــــــــی، هێند کەمە لەم دونیایەدا
نە فریای عەشق دەکەوی، نە تـــــــــــــــۆڵە لەو مەودایەدا
کوا تۆ دەتوانی بژمێری، ئەژماری جـــــــــــــوانییەکانی ژین
کوا تۆ دەتوانی بێوەی بی، لە دەستی قـــــــــــــین و ڕقی ژین
نە گەر گەورە نەبـی، دەشـــکێی، نە کەم بـخـۆی کەمـی دێنـی
دەی کەوایە نەچی بچـــــــــــــی، پشتی هیممەتت بشکێنی

"کە میرمووســا گوێی لەو بەیتانە بوو، هێندە گریا تا لە هۆش چوو. کە وە خۆ هاتەوە، چووە گومەزەکەوە و لەوێ گۆڕێکی بەرزی بینی کە تەتەڵەیەکی ئاسنی لەسـەر بوو. شـێخ عەبدوسسـەمەد لە تەتەڵەکە نیزیک بووەوە و دیتی لەسـەریان نووسیوە: 'بە ناوی خودای نەمری هەرماو بۆ هەتاهەتا کە نە لە کەس بوە و نەکەسـیشـی لێ دەبێ و هیچ هاوتایەکی نییە. بە ناوی خودای شکۆمەند و زاڵ، بە ناوی ئەو زیندووەی نامرێت.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی پێنجسەد و شەست و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! پاش ئەوەی شێخ عەبدوسسەمەد نووسراوەکانی سەر تەتەڵەکەی خوێندەوە، سەیری کرد نووسراوە: 'ئەی ئەو کەسەی دێیتە ئێرە، پەند لە ڕووداوەکانی ڕۆژگار و ئەو هەوراز و نشێوەکانی تووشیان دەبی وەرگرە. فریوی زێڕ و سامان و پلە و پایەی دنیا مەخۆ کە هەڵخەڵەتێنەر و خاپێنەرە. مزڵێکی کاتییە و تەڕاویلکەیە کە تینووان بە ئاوی تێگەیشتوون. کاولاشێکە و نەفامان بە ئاوەدانی دەزانن. پشتی پێ مەبەستە و دڵی مەدەرێ. خۆت لە داوی قوتار بکە و خۆتی پێوە هەڵمەواسە. ئاخر من چوارهەزار ئەسپی ڕازاوە بە زینی زێڕینم هەبوو و هەزار کچە شازادەی کەچینم هێنا و خودای بەخشێنەر هەزار کوڕی ئازا و نەترسی دامێ و هەزار ساڵ بە خۆشگوزەرانی و کامەرانی ڕامبوارد و ئەوەندەم ماڵ و سامان کۆ کردەوە کە هەموو پاشایانی سەر زەوی دە-یەکی ئەو ماڵ و سامانەیان نەبوو. پێم وا بوو ئەو ناز و نیعمەتە نابڕێتەوە کە لەناکاو تێکدەری خۆشییەکان و بڵاوەپێکەری کۆڕەکان و لەناوبەری لاوان و پیران، لەناوبەری دەسەڵاتداران و هەژاران بەسەریدا داین و بە بەڵایەکمان بە سەر هات، هەر ڕۆژەی دووانمان لێ دەمرد تا وای لێهات گەلێک کەسمان لێ مرد. کە دیتم وا مەرگ بەسەر شارەکەمانیدا داوە و نوقمی دەریای نەمانی کردووین، نووسەرێکم بانگ کرد و پێم گوت: ئەم شێعر و پەندانە بنووسێتەوە. من بە هەزاران هەزار باڵبازی بوێر و ئازا و سەدان هەزار فەرماندەی بە ناوبانگم هەبوو. پێم گوتن زرێ لە بەر کەن و شیرە تیژەکانتان لە قەدتان دەن و دەست دەنە ڕمبی درێژ و سواری ئەسپە کێواساکانتان بن. کە لە لایەن خوداوە فەرمان هات، پێم گوتن: 'سوپا بەهێزەکەم، گەلۆ دەتوانن ئەم بەڵایە کە لە لایەن خودای گەورەیی و سەربەرزییەوە هاتووە، پێشی بگرن و لێمانی دوور بخەنەوە؟' هەموو دۆش دامان و سەریان داخست و گوتیان: 'چۆن دەتوانین بە گژ کەسێکدا بچین کە هیچ بەربەستێک ناتوانێت بەری پێ بگرێت؟!' ئەوجار داوام کرد ماڵ و سامانەکەم بهێنن. هازاران کاروانم زێڕی سوور و بە خەروار گەوهەر و مرواریم هەبوو. دووهێندەی ئەوەش زیوی بێخەوشم هەبوو لەگەڵ پاشەکەوتێکی وا کە پاشایانی سەر زەوی شتی وایان بە خۆوە نەدیبوو. گشتیان هێنا. بە هەنتەشییانم گوت: 'ئەرێ دەتوانن بەم هەموو ماڵ و سامانە ڕۆژێکم ژیان بۆ بکڕن؟' نەیانتوانی. ئەوجار ملم بۆ خواستی خودا دا و ڕازی بووم بە ڕەزای ئەو، تا وا بوو گیانم کێشرا و لە گڵکۆکەمدا مات بووم. ئەگەر دەتەوێت ناوم بزانیت، ئەوا گووشی کوڕی شەددادی کوڕی عادی گەورەم.' لە تەتەڵەکەشدا ئەم بەیتانەیان نووسیبوو:

خاوەن شڕوشاتاڵەکان، کەم دڵ بە دونیا گەرم کەن
ئەی خوا سەرسەری ناسەکان،ئاورێک بەنەوە شەرم کەن

هەتا کەنگێ دڵخۆش دەکـــــــــــەن، لەم دونیا گردوکۆ دەکەن
بیرێ لەولا ناکەنەوە، شتـــــــــــــــێکی لۆ کۆوە ناکەن
پەند وەرگرن لێ قـــــــــــەوماوان، دیوتانە دونیای پڕ تاوان
بکەن زوو داوای لـــــــــــێ بووردن، لە دەرکی پڕ بەزەی یەزدان
چاوتان داپچـــــــــــــڕیوە بە سەر، ئاو و بەژ و ئاسمان و خۆر
چاوتان برسی و دەستتان درێـــــــــــژ، وەکوو هۆڤیانی مرۆخۆر
زۆر پاشـای بە زیپک و زاکوون، وەک تـــــــــۆزی ڕێگە تێدا چوون
چەرخی گەردوون هـاڕیونی، هەر وەک قەت نەبووبن ون بوون
چاو لە هێز و سوپایان کە بڵاو بـــــــــوون لە گوێن تووی هەرزن
زۆر خاوەن هێز و دەسەڵات، بـــــــــــێ دەسەڵات لە بن عەرزن

"میرمووسا زۆر گریا تا بووراوە، کە هاتەوە سەر خۆ، هەستان بەنێو کۆشکدا دەگەڕان و شـــوێنەکانیان تەماشـــا دەکردن. میزێکی مەڕمەڕی نانخواردنیان بینی کە چوار پایەی هەبوو و لەســەر ئەو میزە نووســرابوو کە هەزار پاشـای یەکچاو لەسـەر ئەم میزە نانیان خواردووە و هەر وەها هەزار پاشای چاوساغ هاتوونە سەر ئەو میزە. ئێتستاش هەموو لە دنیا ڕۆیشـــتوون و لەژێر خاکدا مات بوون. ئەوەی نووســـرابوو، میرمووســـا هەمووی نووسییەوە و لە کۆشک هاتە دەر و جگە لە میزەکە، هیچی لە کۆشک نەهێنا دەرەوە. شێخ عەبدوسسەمەد لە نواوە و باڵبازەکان لە دواوە سێ ڕۆژ هەر ڕۆیشتن تا گەیشتنە گردێکی بەرز و بەسەر ئەو گردەوە سوارێکی مسیان بینی کە درەوشانەوەی نووکی ڕمەکەی ئاوی چاوی دەبرد، لەســەری نووسـرابوو: 'ئەی ئەو کەســەی ڕێت دەکەوێتە لێرە ، ئەگەر ڕێی شــاری مس نازانیت، ئەوا دەســتی ئەم ســوارە بجووڵێنە کە وەردەســووڕێت و دیســان دەوەســتێت. بۆ هەر لایەک وەرســووڕا، ئەوە بەو لایەدا بڕۆ چونکە هیچ مەترســییەکت تووش نابێت و دەتگەیەنێتە شاری مس.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ! میرمووسا که لەپی سوارەکەی جوولاندەوە، لەپی سوارە لەجێوە سووڕاوە و ڕووو بە لایەک ڕاوەستا. میر و سوپاکەی بەرەو ئەو لایە ڕۆیشتن. شەووڕۆژ لە ڕێیە دابوو تا وابوو تووشی ئەستوونێک بوون کە لە بەردی ڕەش چێ کرابوو. داعبایەک تا نێوقەدی لەو ئەستوونە گیرابوو. دوو باڵی گەورە و چوار دەستی هەبوو. دوو دەستی وەک دەستی مرۆ و دوو دەستیشی لە گوێن دەستی ئاژەڵی هۆڤی بوون. سەر و قژی وەک کلکی ئەسپ و چاوەکانی پۆلووئاسا دائیسان. چاوێکی لە سەر تەوێڵی بوو، دەتگوت چاوی ورچە و ئاورینگی لێ دەپرژێ. ڕەش و زەلام بوو. بە کەنەفتییەوە دەیگوت، پاکە ئەو خودایەی منی بەو ڕۆژە گەیاندووە و ئەو بەلایەی بەسەر هێناوم و دەبێ تا ڕۆژی پەسلانیش هەر ئاوا بمنمەوە.'

"کە خەڵکەکە ئەویان ئاوا دی، لە ترسی شێوەی دزێو و تۆقێنەری تۆقان و هەلاتن. میرمووسا بە شێخ عەبدوسسەمەدی گوت: 'ئەمە چییە؟!' شێخ گوتی: 'نازانم!' میرمووسا گوتی: 'بچۆ پێشێ و لێی بپرسە بزانە بۆ وایە. بەشکوو پێت بڵێ.' شێخ گوتی: ' خودا میرمان پایەدار کا. بە خودا من لێی دەترسم.' میر گوتی: 'لێی مەترسە؛ ئەو ناتوانێ زیانت پێ بگەیەنێ.' ئیدی شێخ عەبدوسسەمەد لێی نیزیک بووەوە و پرسی: 'ئەرێ گەورەم ئەتۆ کێی و چ کارەی و بۆ لێرە چەقیوی؟' ئەو کەسە گوتی: 'من نرناشێکم لە وەچەی جندۆکان. ناوم دەهەشی کوڕی عەمەشە. لێرانەدا بەندی دەسەلاتی پەروەردگارم و تا ئەو ساتەی خودا بیهەوێ ئاوا سزا دەدرێم.' میرمووسا بە شێخی گوت: 'لە هۆکاری بەسرانەکەی بپرسە.' شێخ پرسی و نرناشەکە گوتی: 'بەسەرهاتی من شتێکی سەیرە. ئەویش ئاوایە: هێندێک لە منداڵانی ئیبلیس بوتێکیان لە عەقیقی سوور هەبوو. منیان خستبووە خزمەتی ئەو بوتە. پاشایەک لە پاشایانی دەریا کە لە شکۆ و ڕێزدا لە سەرووی پاشایانی دی بوو، ئەو بوتەی دەپەرست. بە هەزاران سوپای جندۆکە لەژێر فەرمانی ئەودا بوون و گوێڕایەڵی بوون. هۆزێکی دیکەی جندۆکانیش کە هەر فەرمانبەرداری ئەو بوون، گوێڕایەڵیی منیشیان دەکرد و فەرمانیان لێ وەردەگرتم. جا هەمووی ئەمانە بێقسەیی سولەیمانیان دەکرد و من دەچوومە نێو ئەو بوتەوە و بکە و مەکەم بەو هۆزەی جندۆکان دەگوت.

" 'ئەو پاشایە کیژێکی هەبوو، کۆیلەی ئەو بوتە بوو و تەواو پشتی پێ بەستبوو. بە دڵەوە عیبادەتی دەکرد. ئەو کاتە کەس لەو جوانتر و دەلالتر نەبوو. من لای سولەیمان تاریفی ئەو کچەم کرد. سولەیمان کەسێکی ناردە کن بابی کچە و لێی سپارد: 'دەبێت ئەو کچەم لێ مارە کەی و بوتەکەشت بشکێنی و بڵێی: 'شایەتی دەدەم کە خودا تاق و تەنیایە

و سـولەیمان پێغەمبەری خودایە.' جا ئەگەر ئەم کارە بکەی، ئەوە هەرچیمان هەیە دەبێ بە هی یەکدی و ئەگەر گوێڕایەڵیش نەبی، ئەوا سوپایەکت دێنمە سەر نەتوانی بە بەرەنگاریان بییەوە. بە گشتی یان بە گوێم بکە، یا خۆت بۆ مردن ساز بکە، چونکە زۆر زوو سوپایەکی گەورەت دەنێرمە سـەر و بە سـەرشـۆڕی دیلت دەکەم.' کە نێردەکەی سـولەیمان هاتە کن پاشـای جندۆکان، پاشا سـەرکەشـی کرد. خۆی بە گەورە زانی و بە قسـەی نەکرد. ئەوجار بە وەزیرەکانی گوت: 'ئەرێ وەزیرینە ئێوە ڕاتان لە سـەر ئەو داوایەی سـولەیمانی کوڕی داود چییە کە داوای کچەکەمی کردووە و فەرمانی داوە بوتەکەم بشـکێنم؟' وەزیرەکان گوتیان: 'قوربان، سـولەیمان دەسـتی پێت ناگا و ناتوانێت هیچت لێ بکا، ئاخر تۆ لەنێو دەریایەکی گەلێک فراواندای. ئەگەر بۆیشـت بێت، ناتوانێت بەسـەرتدا زاڵ ببێ، چونکە نڕناشـەکان بەرەنگاریان دەبنەوە و ئینجا بوتەکەش بە هاناتەوە دێ. وا باشـە لەگەڵ بوتە ئاقیقەکەش ڕاوێژ بکەی، ئەگەر فەرمانی شـەڕی دا، ئەوە خۆت بۆ شـەڕ ئامادە بکە. ئەگەر بەرژەوەندیی لە شەڕدا نەبینی، باش وایە بەگوێی بکەی.' دەمودەست پاشا هەستا و چوو بۆ لای بوتەکە. ئاژەڵی بۆ گاوگەردوون کرد و سـەری بڕین و نیازمەندانە کڕنۆشـی برد. تێر گریا و ئەم شێعرەی خوێندەوە:

ئافرێنەری هـــۆزەکەم، بوتی بێ هاوتا
لە سـایی تۆ هاتـوونە دی، هەر دوو دونیـا
سـولەیـمان تەمای سـەرکوتی تۆی گرتووە
هەڕەشەی لە ناوبـــردنمانی کردووە
ئێستە هاتـووم پارێزگاری لە تۆ بکەم
لە ڕێی تۆدا خـۆ بەخت کەم گیانم بدەم

"دوایی ئەو نڕناشـەی تا بنهەنگڵی لە ئەستوونەکە گیرابوو، بە شێخ عەبدوسسـەمەدی گوت: 'من لە نەفامی و کەمعەقڵیی خۆم چوومە نێو ئەستوونەکەوە و سەرپێچی سولەیمانم بە ئاسان زانی و ئەم بەیتەم خوێندەوە:

خەم مەخـۆ مـن کە ئـافـرێـنەری هەر دوو دونـیـام
هـەزارانـی وا تـێـک دەشـکـێنم دڵنیام

" 'کە پاشـا ئەو وەڵامەی لە من بیست، ورەی بەرز بووە و ئاهەنگی شـەڕی حەزرەتی سولەیمانی ڕاگەیاند. نێردەی سولەیمانی بانگ کرد و زۆر بە سەختی ئەشکەنجەی دا و بە سـەرشـۆڕی ناردییەوە. هەواڵیشـی پێدا بۆ سـولەیمان نارد کە بە هەڕوگیف مەمترسێنە و

ئەگەر تۆ هێرشیشم نەکەیتە سەر، ئەوا من هێرشت دەکەمە سەر. کە سولەیمان لەوە ئاگادار بووەوە، دنیای لە بەرچاو ڕەش بوو. دەمودەست سوپایەکی گەورەی لە مرۆ، جندۆکە، باڵند و هۆڤییان ساز کرد و بە دێرمیاتی وەزیر کە پاشای جنۆکان بوو، گوت: 'نرِناشانی جنۆکە لە هەرکوێیەک هەن، کۆیان کەوە.' وا بوو، شەشسەد ملیۆن جندۆکە هاتن. دوایی بە ئاسەفی کوڕی بەرخیای گوت: 'سوپای مرۆیانیش کۆ کەوە.' ئەوانیش ملیۆنێک بوون. بەو جۆرە سولەیمان لەگەڵ سوپایەکدا کە نە پێشی دیار بوو نە پاش، لەسەر تەخت دانیشت و باڵندان بە بان سەریەوە و هۆڤییانیش لەژێریدا، کەوتنە ڕێ تا گەیشتنە وڵاتی جندۆکان و دەوری دوورگەکەیان دان و ئەو وڵاتە پڕ بوو لە سوپای سولەیمان.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی پێنجسەد و حەفتا و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! نڕناشەکە بە شێخ عەبدوسسەمەدی گوت: 'کە سولەیمانی پێغەمبەر بە سوپاکەیەوە هاتە دوورگەکەوە، کەسێکی ناردە لای پادشاکەمان و ئاگاداری کردەوە کە ئەگەر دەتهەوێ تاج و تەختت پێ کۆ نەکەمەوە و نەتکەمە پەندی زەمانە، ئەوە دەست لەو لووت بەرزییەت هەڵگرە، بوتەکەت بشکێنە و ئیمان بێنە بە بێ هاوتایی خودا و پێغەمبەرایەتی من. ئینجا کچەکەتم لێ مارە بکە. ئەگەر وا نەکەی و بتهەوێ لەو دوورگەیەدا خۆت مات کەی؛ ئەوە خودای مەزن بای خستووەتە ژێر فەرمانی منەوە و فەرمانی پێ دەکەم بە سواری ڕاخەرەکەم بمهێنێتە لای تۆ و ئەو دەم بۆخۆم دەزانم چیت بەسەر بێنم. پادشا کە ئەو قسانەی لە ڕاسپاردەی سولەیمان بیست، گوتی: بڕۆوە پێی بڵێ ئەوە ئەوەی ئەو دەیهەوێ جێبەجێ نابێ و من ئامادەی بەرەنگاربوونەوەم. ڕاسپاردەکە گەڕاوە بۆ لای سولەیمان (س ـ خ) قسەکانی پادشای بۆ گێڕاوە.

پادشا دوای ئەوە بە هەزاران جندۆکەی ژێر فەرمانی کۆ کردەوە و ئەهریمەکانی ناو دوورگەی بانگ کرد و لەگەڵ ئەوانی خست. دەرکی چەک و جبەخانەی کردەوە و چەکی بەسەردا دابەش کردن. سولەیمانیش (س ــ خ) سوپاکەی تەکووز کرد. فەرمانی بە هۆڤیانی دا ببنە دوو بەشەوە: بەشێکی لە دەستی ڕاستی سوپا و بەشێکی لە دەستی چەپی سوپا سەقامگیر بن. باڵندەکانی ڕاسپارد لە کاتی شەڕدا بە دندووک چاویان دەربێنن و بە باڵ لە سەروچاویان دەن. بە هۆڤیانی گوت سکی ئەسپەکانیان بدڕن. ئەوجار تەختێکیان بۆ سولەیمان (س ــ خ) دروست کردە لە بەردی مەڕمەڕ و بە گەوەر و مرواری ڕازاندیانەوە. سولەیمان (س ــ خ) بۆخۆی لە سەری دانیشت. وەزیرکەی خۆی (ئاسفی کوڕی بەرخیا) لەگەڵ پادشای مرۆیان لە دەستی ڕاست و وەزیر دمریات لەگەڵ پادشای جندۆکان لە دەستی چەپییەوە و مار و ئەژدیها لە پێشیانەوە و بە هێرشیان کردە سەرمان. دوو ڕۆژ لە دەشتێکی پان و بەرین بە شەرهاتین. لە ڕۆژی سێیەمدا بەڵا ڕووی تێکردین و چارەنووس پشتی شکاندین. یەکەم کەس کە بە سپاکەیەوە هێرشی کردە سەر سولەیمان (س ــ خ) من بووم. کە بە هاوڕێکانم گوت ئێوە لە جێی خۆتان بن، من دەچمە شەری دمریات. کوتوپڕ دمریات وەک کێو بە سەرمدا ڕووخا و بەردی ئاگرینی تێ گرتم. جندۆکان وایان بە سەردا گوڕاندم، وەمزانی ئاسمان ڕووخا. دوای ئەوە بە سوپاکەی گوت هێرشمان بکەنە سەر. ئێمەش پەلامارمان دانێ و بەسەر یەکتردا دەمان شریخاند. شەڕ بڵێسەی ستاند و خەریک بوو دڵمان بتۆقێ. باڵندە لە ئاسمانەوە و هۆڤیان بە زەویدا ئاوقامان دەبوون. تا وا بوو سوپاکەی من وردە وردە ورەیان شکا و لاواز بووین و سوپاکەم بەزی. سولەیمان (س ــ خ) هەرای کردنێ ئەو گڵاوە بگرن. مرۆ هێرشی کردە سەر مرۆ و

جندۆکە بۆ سەر جندۆکە. پادشاکەمان هەڵات. سوپای سولەیمان (س ـ خ) کەوتنە سەرمان و هۆڤیان دەوریان داین. باڵندەکەکان لە سەر سەرمان بوون جار جارێ بە چنگ و دندووک چاوی باڵبازەکانیان دەردێنا بە باڵیان لە سەروچاومانیان دەدا. هۆڤیان سکی ئەسپ و باڵبازەکانیان دەدڕین تا وای لێ هات ئێمە زۆر کەسمان لێ کوژرا. ئەمن لە دەست دمریات ڕام کرد و فڕیمە ئاسمان. سێ مانگەڕێ بە دوامەوە بوو هەتا بەو ڕۆژەی گەیاندم.""

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی پێنجسەد و حەفتا و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! ئەو نرناشەی لە ستوونەکەدا بەند کرابوو، کە بەسەرهاتی خۆی لە سەرەتاوە تا کۆتایی بۆ میرمووسا و دەستوپێوەندەکەی گێڕاوە، شێخ عەبدوسسەمەد پێی گوت: 'کامە ڕێ دەچێتەوە شاری مس؟' ئەویش ڕێیەکەی پیشان دان.

کە گەیشتنە شاری مس، تەماشا دەکەن شوورەکەی وەک کێو بەرزە. ناچار میرمووسا و شێخ عەبدوسسەمەد و خەڵکەکە لەوێ دابەزین و هەرچەندی کردیان و کۆشان، ڕێی چوونە ناوەوەیان نەدیتەوە. ئەوجار میرمووسا بە تاڵیبی کوڕی سەهلی گوت: 'ئەڕێ تاڵیب، چۆن بچینە ناوەوە؟' تاڵیب گوتی: 'میرم، دوو-سێ ڕۆژ دان بە خۆتدا بگرە تا بە شێوەیەک دەچینە ناوەوە.'

"دوایە میرمووسا بە پیاوەکانی گوت: 'سوار بن و بە دەوری شاردا بگەڕێن سا بەڵکو شوێنێک بدۆزنەوە پێیدا بچینە ژوورێ.' دەموودەست سوار بوون و دوو شەو و ڕۆژ بە دەوری شاردا سووڕانەوە. سێیەم ڕۆژ بە هیلاکی و هیوابڕاوییەوە گەڕانەوە و گوتیان: 'میری گەورە، هەر ئەم جێیەی لێی دابەزیوی، لە هەموو جێیەکانی دی نزمترە و بۆ چوونە ناو ئاسانترە.' میرمووسا، تاڵیبی کوڕی سەهل و شێخ عەبدوسسەمەدی لەگەڵ خۆی برد و چوونە سەر ئەو کێوەی بەرانبەر بە شار و لەوێوە تەماشایان کرد. تەماشا دەکەن شارێکە، هەرگیز شاری وا گەورەیان نەدیبوو. کۆشکەکانی ڕازاوە و بڵند بوون و ڕووبار بەنێویاندا دەخوشی و باخی پڕ لە داری میوە. بەڵام ئەو شارە کەسی تێدا نەبوو. بەس دەنگی کوندەپەپوو و قاڕەی قەلەڕەشە دەبیسترا. میرمووسا ڕاوەستابوو و ئاخ بۆ ئەو شارە هەڵدەکێشا و دەیگوت: 'پاک و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی گەڕی گەردوون نایگۆڕێ.' لەو دەمەیدا کە بە سەرسامییەوە ڕاوەستابوو، تەسبیحاتی دەکرد، لە لایەکی شوورەکەوە چاوی بە حەوت تەتەڵەی مەڕمەڕ کەوت کە لە دوورەوە دیار بوون. چوو بۆ لای تەتەڵەکان و لەسەر یەکێکیان نووسراوەیەکی دیت. بە شێخی گوت: بیخوێنێتەوە. شێخ چووە پێشێ و خوێندییەوە کە پەند و ئامۆژگاری بوو بۆ کەسێ پەندوەرگر و بە یۆنانی نووسرابوو: 'ڕۆڵە گیان، بۆچ وا کەمترخەمی لە ئاست شتێک کە لە بەرچاوتدایە و لە هەموو شتێک زیاتر لێت نیزیکە؟ مەگەر نازانیت کە پێشینیانت پێکی ئەجەلیان نۆشی و تۆش بەم زووانە دەینۆشیت؟ بەر لەوەی بچیە ژێر گڵ، سەیر بکە و لە کاری خۆت ورد بەوە. ئەوانە لە کوێن کە گەورەی شاران بوون و دەستوپێوەند و سوپا لەژێر فەرمانیاندا بوون؟ بە خودا مەرگ بەرۆکی هەموویانی گرت و لە کەس‌وکار و وڵاتی جودا کردنەوە و لە کۆشکە فراوانەکانەوە ڕاپێچی گۆڕە تەنگەکانی دان.' جا لەژێر نووسینەکەوە ئەم بەیتانەش

نووسرابوون:

کامە پادشـــا لە ژێـــــــــــــر تاقی ئەم ئاســـمانە
ژیـــا و هەرگـــز مەرگ پـێـی نەگـرت بەهـانە
ئەو کەســـــــەی ژینی کردە مـایە بۆ ژیـان
کە ژیــــــن نەمـا پـاشـــەکەوتی بوو بە زیـان
پێـت دۆڕاو بن کۆکەرەوان تـا هـــــــەتـایە
خـــــــــــــوایە نە کۆ دەکا و نە لە دۆڕاندایە

میرمووسا هاواری لێ هەستا و ڕوندک بە چاوانیدا هاتنە خوارەوە و گوتی: 'قەسەم بە خودا تەرکی دنیـا مـایەی ڕزگـاری و بەرزیی پلە و پـایەیە.' ئەوجـار داوای پێنووس و تێنووسی کرد. ئەوەی لەسەر تەتەڵەکە بوو، نووسییەوە. دوایی لە تەتەڵەی دووەم نیزیک بووەوە و ئەویش ئەمەیان لەسـەر نووسیبوو: 'ڕۆڵە گیان، چی تۆی لە خودای خۆت دوور خستووەتەوە و بە چ هۆکارێک فەرامۆشت کردووە؟ مەگەر نازانیت کە دنیا خانەی مەرگە نەک جێی مانەوە و سانەوە؟ ڕۆژگار جێی ڕەنج و چەرمەسەرییە نەک جێی هەدا و ئارامی. بە چاوی پەندەوە بنۆڕە کە لە کوێن ئەو پاشـــایانەی عێراقیان ئاوەدان کردەوە و لە خۆراســـان و ئیســـفەهان ڕاپانبوارد. ئەوە بوو بانگدەری مەرگ بانگی کردن و ئەوانیش وەڵامگۆی بانگەکەی بوون. باڵاخانە بەرز و پتەوەکانیان ســـوودی پێ نەگەیاند و کۆگا پڕەکانیان لە مەرگ قوتاری نەکردن.' جا لەژێریدا ئەم بەیتانە نووسرابوون:

هەڵۆی جیـــــــــــهان تیژڕۆیە و بێ ڕەزایە
لە ڕاو زیاتر چی دیـــــــــکەی لە دەست نایە
هەڵۆ قەت ڕێ بە کـاروان نـاگرێ و بیخـوا
هەڵـۆی گەردوون ڕێـگـرە و کـاروان دەخـوا
ڕووی قسەی ژیان لە ژێــــــــــر و وریایە
پەرژینێک لە هەرچی جـــــــــوانی دونیایە

"ئەوجار میرمووســـا گریا و گوتی: 'بە خودا ئێمە کارێکی گەورەمان لە بەرە و بۆ شـتێکی مەزن ئافرێندراوین.' دوایی هەرچی لەسـەر تەتەڵەکە نووسـرابوو، نووسـییەوە. لە تەتەڵەی سێیەمین نیزیک بووەوە."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی پێنجسەد و حەفتا و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! میرمووســـا لە پارچەی ســـێیەمین نزیبک بووەوە و لەســـەری نووســـرابوو: 'ڕۆڵە گیان، تۆ بە دۆســـتایەتی دنیا فریوت خواردووە و پەروەرێنی خۆت لە بیر چووەتەوە. هەر ڕۆژێک لە تەمەنت تێدەپەڕێت، تۆ لە ســـــەرەنجامت نیزیک دەبیتەوە و پێیشی شادی. ڕۆڵە گیان:

بیری بکەوە بـــــــــــــــۆ دواڕۆژی خۆت
خۆشـــی و نۆش کل کە بۆ نـاو گۆڕی خۆت
بفڕێ ڕووح تازە چـــــــــــــیت لە دەست نایە
دوای تۆ گشـت دەســــــــــتیان لە گۆزە دایە

" 'کوڕەکەم، وەڵامی خۆت بۆ بەردەم خودای مەزن ئـامـادە بکە.' لەژێر تەتەڵەکەدا نووسرابوو:

ئەی دڵ بە دونـیـا خـۆشـــی، مـردووی ئەم ژینە
تێی نەگەیشـتووی هەمـــــــــــــــووی فێڵ و خاپینە
زەمانە هەر خولێکی ئامـــــــــــــــــــــــۆژگارییە
بە زمانی نازانی تـــــــــــــــــــــۆ، دەردت كارییە
تاپۆ نەکراوە مـــــــــــــــــاڵی، تایبەت لۆ کەسێک
تا وەمێنێ لە کەسێـــــــــــــــــــــــکەوە بۆ کەسێک
ئەوان کە ڕۆیشتن و نەمـــــــــــــــــان بۆت ببێ
تێیدا بحەسێیەوە جێی هەمـــــــــــــــــیشەت بێ

"ئینجا میرمووســـا تێر گریا و لە تەتەڵەی چوارەمین ڕاما. لەســـەر ئەویش نووســـرابوو: 'ڕۆڵە گیان، تا کەی پەروەردگارت چاوپۆشـــیت لێ بکات و تۆش هەر لە بێئاگاییدا بیت؟ ئاگات لێ بێت کە مەرگ چاوەڕێتە و پێی لەســـەر پشـــتە. هیچ بەیانی و ئێوارەیەک نییەکە ئەجەل نەیەتە لات و هۆشـــداریت نەداتێ. وریا بە نەکا لە ناکاو بگاتێ و ئەتۆش خۆت بۆ ســـاز نەکردبێ. گوتەکانم لە گوێ گرە؛ دنیا تا ســـەر نییە و لە گوێێ ماڵی جاڵجاڵۆکەیە.' لەژێر تەتەڵەکەدا ئەم بەیتانەش نووسرابوو:

تۆ کە ســـــــــــاڵت لە چنگ خودا بڕیوە
هاتوچۆی گەلـــــــــــی ساڵ و مانگت دیوە
زۆرجار مەست و زۆرجـــــــار کەلەلا کەوتووی
ســــــــــاڵ و ڕۆژ تێپەڕیوە و نەبزووتووی
گەلـــێ کەس لەم کـۆشـــــکەوە ڕابـــوون و چـــوون
بەرەو گۆڕستان و لە تــــــــــۆش سەرتر بوون
هەموو ڕۆین و تــاج و تەختیــان جــــــــێ مــاوە
بێ دەســــەڵات، هەموو کەوتـــــــــوون لەو لاوە

" ئیدی میرمووسا گریا و ئەو شێعرانەی نووسییەوە و لەسـەر کێوەکەوە بەرەو خوار بووەوە. هـاتەوە نێو ســـوپاکەی و ئەو ڕۆژە هەر لە بیری ئەوەدا بوو کە چۆن بچێتە شـارەکەوە. بە تاڵیبی گوت: 'ئەرێ چۆن بچینە ئەم شـارەوە بەشـکوو شـتی سـەیر و جێ زەندومانی وای لێ بێ ببێتە مایەی دڵخۆشـــی و ڕازیبوونی خەلیفە لێمان.' تاڵیب گوتی: 'میرم، پەیژەیەک درووست کەن و دەچینە سەر شوورەکە. لەوێوە چاو لە نێو شار دەکەین بەشـــکوو لەوێوە ڕێی دەروازەکەی بدۆزینەوە.' میرمووســـا گوتی: 'منیش هەر ئەمەم بە خەیاڵدا دەهات و ئەمە بۆچوونێکی درووستە.'

"پاشان دارتاش و ئاسنگەرانی بانگ کرد و ئەمری پێ کردن، پەیژەیەک لە دار درووست بکەن و بە مێخی ئاسن تۆکمەی بکەن. وەستایان مانگێک خەریکی درووستکردنی پەیژەکە بوون. ئەوجـار پیـاوانی ئـازا کۆ بوونەوە و پەیژەکەیـان بەرز کردەوە و بە دیواری شـوورەکەیانەوە نا. زۆر تەواو بوو. هەر دەتگوت ئەندازەی گیراوە. ئەوجار میرمووسـا بە دەســتوپێوەندەکەی گوت: 'کێ دەتوانێ بەم پەیژەیەدا بڕواتە ســەر دیواری شــوورەکە و سەیرێکی ئەو دیو بکا و پێمان بڵێ کە چۆن دەرگاکە دەکرێتەوە؟' یەکێکیان گوتی: 'قوربان، من وەســـەر دەکەوم و دەچمە ئەو دیو و دەروازەکەی دەکەمەوە.' میر ئافەرینی پێ گوت. ئەو کابرایە سەر کەوت، لەسەر شوورەکە ڕاوەستا و سەیری شاری کرد. دەستەکانی لێک دان و قیژاندی و گوتی: 'تۆ پاکتری' ئەمەی گوت و خۆی هەڵدایە ناو شـارەکەوە و ئێسـک و پرووسکی تێک شکان. میر گوتی: 'ئەوە ئێمە ژیرین وامان کرد، ئەی دەبێ شێتەکان چی بکەن؟ خۆ ئەگەر هەر ئاوا بڕواتە پێشـــێ، هەموو باڵبازەکانمان دەمرن و ئیدی ناتوانین داوای خەلیفە بەجێ بێنین. هەستن تا لێرە بڕۆین و پێویستمان بەم شارە نییە.' ئامادەبووان گوتیان: 'ئاخر هاتوو کەســێکی دی لەو ئازاتر بێ.' پاشـــان یەکێکی دی چووە ســـەرێ و ئەویش خۆی بەو دەردە برد. ئەوە بوو یەکیەک دەچوونە سەرێ و خۆیان هەڵدەداشت تا ژمارەیان گەیشـتە دوازدە کەس. ئەوجار شـێخ عەبدوســـەمەد گوتی: 'ئەم کارە بە خۆم

نەبێ بە کەس ناکرێ. ئەوانە ئەزموونی ئەو کارانەیان نییە.'میرمووسا گوتی: 'یا شێخ، ئەم کارە مەکە. تۆ ناتوانی سەر کەوی و ئەگەر تۆ بمری، هەموومان تێدا دەچین. هەر تۆ ڕابەر و ڕینوێنی گەل و هۆزی.' شێخ هەستا ئاتەگەی لە پشتێنەی خست و گوتی: 'وە ناو خودا.' ئەوجار بە پەیژەدا هەڵگەڕا و دۆعای ڕزگاربوونی خوێند تا گەیشتە سەر دیواری شوورەکە. ئینجا دەستی لێک دان و چاوی لە شار کرد. خەڵکەکە هەموو پێکڕا هاواریان لێ کرد: 'کوڕە یا شێخ نەکەی خۆت هەڵبدەیتە خوارەوە و کاری وا نەکەی. ئەگەر تۆ وا بکەی، هەموومان تێدا دەچین.' ئەوجار شێخ زۆر پێکەنی و تا درەنگێک دانیشت. بیسمیللای کرد و دۆعای ڕزگاربوونی خوێند و هەستایەوە. هاواری کرد: 'هۆ میری مەزن هۆ، هیچ ترستان نەبێ؛ خودا گیان لە ودمی ناوی خۆیەوە لە تەڵەکەی شەیتان پاراستمی.' میرمووسا گوتی: 'یا شێخ، چیت بینی؟' شێخ گوتی: 'کە سەرکەوتمە سەر شوورەکە، دوازدە کەنیزەی مانگڕووم بینی.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی پێنجسەد و حەفتا و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! شـــێخ گوتی: 'چاوم بە دوازدە کەنیزۆکی ڕوومانگ کەوت کە بە دەنگی بەرز بانگیان دەکردم و بە دەســـت ئاماژەیان بۆ دەکردم کە وەرە بۆ لامان. منیش وام زانی کە لە خوارەوە دەریایەکی ئاوە و گەرەکم بوو خۆم هەڵدەمە دەریاکەوە هەروەک هـاوڕێیـانی پێش خۆم، بەڵام لە ودمی نـاوی پیرۆزی پەروەردگـارەوە، ئەوانم دی کە مردوون. وا بوو چەنـد ئـایەتێکم لە کتێبی خودا خوێنـدەوە تـا خودا لە فڕوفێڵی ئەوانی پاراستم و خۆم هەڵنەدا خوارەوە. گومان لەوەدا نییە کە ئەمە جادوویەکە و خەڵکی شارەکە کردوویانە تا هەرکەس بیەوێت بچێتە ئەم شـــارەوە، بەری پێ بگرن. ئەوەتا هاوڕێکانمان کەوتوونەتە خوارەوە و تێدا چوون.'

"ئەوجار شـێخ بەسـەر دیوارەکەدا ڕۆیشـت تا گەیشـتە دوو بورجی مسـین. کە دوو دەرگای زێڕینیان تێدابوو. هەر چەند قوفڵیان پێوە نەبوو بەڵام هیچ نیشـــانەی کردنەوەیان خوویا نەبوو. شێخ ماوەیەک وەستا و تێی ڕاما، لەنێو دەرگەکەدا وێنەیەکی مسی سوارێکی دی کە دەســتێکی درێژ کردبوو، وەک ئەوە بڵێ چاو لە دەســتم کە بزانە چی نووســراوە. لێیان نووســیبوو: 'ئەگەر دوازدە جار ئەو ئاســنەی لە ناوکی ســوارەکە دایە، بســووڕێنی، ئەوە دەرگاکە دەکرێتەوە.' تەماشـــای کرد بزمارێکی ئاســـن لە ناوکی ســـوارەکە خرابوو. دوازدە جاری با دا. دەمودەســـت دەرگە کرایەوە و دەنگێکی وەک هەورەتریشـــقەی لێوە هات. ئەوجار شێخ کە پیاوێکی زانا و بلیمەت بوو و هەموو زمانەکانیشی بە باشی دەزانی، چووە ژوورەوە. کە چووە ژوورەوە بەســـــەر دالانێکی بەرزدا کەوت. کە ئەملاولاکەی ســـەکۆی بەرزی لێ بوو. لەگەڵ تاقمێک کە لەســـەر ئەو ســـەکۆیانە مردبوون. لە ســـەر ســـەریـانەوە مەتـالگەلێـک هەڵاوەســـرابوون و ڕمبەکـانیـان لە زەوی چەقێنرابوون و کەوانەکانیان زێیان تێ هەڵکێشرابوو. دەرگاکان بە ئاسـن پشـتیان درابوو. قوفڵی چکۆڵەیان پێوە بوو.

"شـــێخ بە خۆی گوت: 'ڕەنگە کلیلەکـان بەم خەڵکە بێ.' چـاوێکی بە خەڵکەکەدا گێڕا، چاوی بە کابرایەک کەوت، پیری پێوە دیار بوو، لە شـــوێنێکی بەرزتر لە خەڵکەکەوە بوو. شـێخ عەبدوســـەمەد گوتی: 'پێم وا بێ کلیلی ئەو کڵۆمانە لای ئەو پیرەپیاوە بێت و ئەم دەرگاوان و ئەو باڵباز و شتەش لە ژێر فەرمانی ئەودا بووبن.' شێخ چوو بۆ لای پیرەپیاوە و کەواکەی لا دا، کلیلەکـانی دیتەوە بە کەواکەیـدا کردبوو. دڵی خۆش بوو، کلیلەکـانی هەڵگرت و چوو کڵۆمەکانی هەڵگرت و دەرگەی کردەوە. دەرگەکە هێندە ئاسـنەواڵە و شـت پێ بوو کە کردیەوە شـریخەی وا هات دەتگوت ئاسـمان ڕووخا. کە دەرگەکە کراوە شـێخ

یەک بە خۆی گوتی ئەڵلاهوئەکبەر و ســـوپاکەش بە دوایدا گوتیانەوە. هەموویان دڵخۆش بوون و میرمووسا بە ساغیی شێخ و کرانەوەی دەروازەی شار فرە شادمان بوو.

میرمووسـا و سـوپاکە سـوپاسـی شـێخیان کرد و تێکرا ویسـتیان بچنە ژوورەوە. میر گازی کردن: 'هۆ خەڵکینە، باش نییە هەموومان بچینە ژووریٚ. وا باشـــە نیوەی ســـوپا لە دەرەوە بن و نیوەکەی دیکە بچنە ژووریٚ.' ئیدی میرمووســـا لەگەڵ نیوەی ســـوپاکەیدا وەژوور کەوتن. لە پێشـــدا چاویان بە هـاوڕێکانی خۆیان کەوت کە خۆیـان هەڵدابووە خوارەوە و مردبوون. ئەوانیـان بە خـاک ســـپـاردن. دوایە دەرگەوان و خزمەتکـار و پەردەدارەکانین دیت کە هەر یەکەی لە شـــوێنێک مردبوون. ئەوجـار چوونە بـازاڕەوە. بازاڕێکی گەورەیان بینی کە هەموو دووکانەکان کرابوونەوە و تەرازووەکان داندرابوون و کاروانســـەراکان پڕ لە کاڵا بوون، بەڵام خێوەکانیان هەموو لە دووکانەکاندا مردبوون و پێســتیان بە ئێسـکیانەوە نووسـابوو. دوایی چوونە بازاڕی ئاوریشـمفرۆشـانەوە و لەوێ کوتاڵی ئاوریشـم و دیبایان بینی کە بە زێڕی سـوور و زیوی سـپی نەخشـێنرابوون و چاو لە بینیان هەڵنەدەهات. خاوەنەکانیان لە بەردەرکی دووکانەکانیاندا مردبوون، لە تۆ وایە دەیانویست پێکەوە وتووێژ بکەن. ئەوێیان هەڵبوارد و گەیشتنە بازاڕی گەوهەر و مرواری و یاقووت و لەوێشەوە چوونە بازاڕی ئاڵوگۆڕی دراو و زێڕناسانەوە. گشتیان مردبوون و ئاوریشمی جۆراوجۆریان لەژێردا بوو و دووکانەکانیان پڕ لە زێڕ و زیو بوو. لەوێش ڕەت بوون و چوونە بازاڕی عەترفرۆشـانەوە. دیتیان دووکانەکانی ئەوانیش پڕن لە میســک و کافوور و عەنبەر و خاوەنەکانیان نەماون. کە لە بازاڕی عەترفرۆشـــان وەدەر کەوتن، لە نیزیکی ئەوێوە کۆشـــکێکی بەرزیان بینی و چوونە ناوەوە. لەوێ ئاڵای هەڵکراو و ڕمبی داچەقێنراو و کەوانی زێ بێ هەڵکێشراو و مەتاڵی ئاوێزان بە زنجیری زێڕین و تاسکڵاوی زێڕکەفتکراویان بینی. کورســـیگەلی باش باش لە داڵانەکانی کۆشـکدا بوون کە پیاوگەلێک لەسەری دانیشتبوون کە پێستی لەشیان وشک هەڵگەڕابوو. کەسێک ناشارەزا بایە پێی وا دەبوو، نووستوون، بەڵام لە برسام و لە توونیان مردبوون. میرمووسا سەری سووڕ ما و یاد و تەسبیحاتی خودای کرد، سەیری ئەو خانووە پتەو و کارە سەیر و نەخش و نیگارە زۆرەی کۆشکی دەکرد. ئینجا چاوی بەو چەند بەیتە کەوت:

لەخۆ دەرچـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــاوی کاری دونیایە
بـــۆچ لە خـــۆت دەرچـــووی؟ چـــیە ئەو هەوایە؟
لەوە ناترسی کە ئەو نەهەنـــــــــــــــــــــــــــــــگە
قووتت دا بۆ ئەو زۆر زۆر ســــــــــــــــــانایە
بیر لە شاگەلی ئێران بـــــــــــــــــــــــــــــکەوە
چارەنـــــــــــــــــــــــــــــــــــــووسی وان بۆچی ئاوایە

کوا فەرەیـــــــــــــــــــــدوون و لە کوێیە قوباد
ئەوەی بەرکـــــــــــــــــــــۆشی، هێمای ئاڵایە
ســـــام و ڕۆســـــتەمـی زەمـان کـوان لە کـوێـن
دەنگی ســـــــــــــــــــــوپای مازەندەران نایە
بـابەک و ســـــاســـــان، لەگەڵ ئـــــەردەشـــێر
بەهـــرام، نەوشـــــیـروان، هەرچـــی پـــادشـــایە
ئەوانە هەموو کۆچیان کرد ڕۆیـــــــــــــــــــین
تاقێـــــــــــــــــــــکیان نەگەڕانەوە دوایە

"ئیدی میرمووسا هێندە گریا تا بووراوە. کە وە هۆش هاتەوە، داوای کرد ئەو بەیتانەی بۆ بنووسنەوە. ئەوجار چووە کۆشکەکەوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شه‌وی پێنج‌سه‌د و حه‌فتا و پێنجه‌م هاته‌وه

گوتی: "خاوه‌نشکۆ! میرمووسا چووه کۆشکه‌وه. چوار ژووری له‌به‌رانبه‌ر یه‌کدیدا دی که به زێڕ و زیو نه‌خشێنرابوون. به‌ژێر هه‌ر ژوورێکدا ڕووبارێک ڕاده‌خوشی و ئه‌و چوار ڕووباره له چوار ده‌ریاچه‌ی گه‌وره‌وه که به مه‌رمه‌ڕی جۆراوجۆر ڕێیان بۆ ساز کرابوو، ڕاکێشرابوون. میرمووسا به شێخی گوت: 'وه‌ره با بچینه ژووره‌کانه‌وه.' چوونه یه‌که‌م ژووره‌وه، ته‌ماشا ده‌که‌ن پڕه له زێڕ و زیو و گه‌وهه‌ر و یاقووت و مرواری و کانزای گرانبایی. له‌وێ چاویان به یه‌غدانی پڕ له کوتاڵی ئاوریشم و دیبای سوور و زێڕیان که‌وت. ئه‌وجار چوونه ژوورێکی دیکه‌وه، دارماڵ بوو له چه‌کوچۆڵ و که‌لوپه‌لی جه‌نگی وه کلاوزرێ و زرێکه‌لی داودی و شمشێری هێندی و ڕمبی ناوچه‌ی خه‌تی و گورزی خه‌واره‌زمیان. دواتر چوونه سێیه‌م ژووره‌وه، سه‌یریان کرد ئه‌ویش پڕه له ئامێری شه‌ڕی. پاشان چوونه چواره‌م ژووره‌وه، دیتیان ئه‌وێش قاپ و قاپاخی خۆراک و شله‌مه‌نی له زێڕ و زیو و مرواری و عه‌قیقی سووری لێیه. سوپاکه ئه‌وه‌نده‌ی توانییان له‌و شتانه‌یان هه‌ڵگرت. که ویستیان له‌و دیوانه بچنه ده‌رێ، ده‌رگه‌یه‌کیان بینی له عاج و داری ئاونووس چێ کرابوو، په‌رده‌یه‌کی ئاوریشمیان پێدا هه‌ڵواسیبوو که په‌راوێزه‌کانی به زێڕ نه‌خشێنرابوو و قوفڵی زیوینی پێوه بوو که کردنه‌وه‌یان به مه‌ته‌ڵ بوو نه‌ک به کلیل. ئیدی شێخ عه‌بدوسسه‌مه‌د چووه پێشه‌وه و به هۆی زیره‌کییه‌وه قوفڵه‌کانی کردنه‌وه. دوای ئه‌وه سوپاکه چوونه نێوکۆیه‌که‌وه، ته‌ته‌ڵه‌ی تێدا بوو و وێنه‌ی هۆڤی و باڵندان به زێڕی سوور و زیوی سپی له‌سه‌ریان نه‌خشێنرابوون، چاوه‌کانیان له دوڕ و یاقووت بوون و ته‌ماشاکه‌ران شه‌یدای بینینیان ده‌بوون. دوایی چوونه حه‌وشه‌یه‌که‌وه که میرمووسا و شێخ له جوانی ده‌ستکردی ئه‌و شوێنه سه‌ریان سووڕ ما. ئینجا له‌وێوه چوونه حه‌وشه‌یه‌کی دیکه‌وه که زه‌مینه‌که‌ی له به‌ردی ڕوخامی سواوی تێ گیرابوو. به گه‌وهه‌ر ڕازێندرابووه‌وه و بینه‌ر وای ده‌زانی ئاوی تێدا وه‌ستاوه، ئه‌گه‌ر که‌سێک پێی له‌سه‌ر دانابایه، به هۆی ساف و لووسییه‌وه هه‌ڵده‌خلیسکا. میرمووسا فه‌رمانی دا که شتێک له‌وێدا ڕابخه‌ن تا هه‌ڵنه‌خلیسکێن و بکه‌ون. شتێکیان ڕاخست و به هه‌رچۆنێک بوو ڕه‌ت بوون. که له‌وێ ڕه‌د بوون، گومه‌زێکیان دی، به به‌ردی زێڕکه‌فتکراو ڕۆنرابوو و خه‌ڵکه‌که ئه‌وه‌ی بینیبوویان، هێنده‌ی جوانی ئه‌و بینایه نه‌بوو. له‌وێدا حه‌وزێکی تێدا بوو که تاوڵێکی دیبایان له‌سه‌ر هه‌ڵدا بوو. ته‌ختێکی بڵێندیان له‌سه‌رووی حه‌وزه‌که‌وه دانابوو که به دوڕ و گه‌وهه‌ر و یاقووت نه‌خشێنرابوو و کچێکی له‌سه‌ر دانیشتبوو که که‌س کچی ئه‌وه‌نده جوانی به چاوی خۆی نه‌بینیبوو. ئه‌و کچه کراسێکی له به‌ردا بوو، به مرواری نه‌خشێنرابوو، تاجێکیشی به سه‌ره‌وه بوو، له زێڕی سوور و گه‌وهه‌ری گرانبایی چێکرابوو، گه‌وهه‌ری بریسکه‌دار به

کەمەریەوە بوون و دوو گەوهەر بە تەویلیەوە ئاویزان بوون کە وەک خۆر پرشنگیان داویشت و دەتگوت سەیری چەپ و ڕاست دەکات."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كه شەوی پێنجسەد و حەفتا و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! میرمووسا که ئەو کیژەی دی، سەری له جوانییەکەی سووڕ ما و له تاو شەنگی و سووریی گۆنای و ڕەشیی بسکی وڕ و کاس بوو. که سەیرت دەکرد وات دەزانی زیندووه و سەیری ڕاست و چەپ دەکات، بۆیه سلاویان لێ کرد. تالیبی کوڕی سەهل گوتی: 'میرم، ئەم کچه مردووه. خۆ گیانی تێدا نییه تا وەڵامی سڵاو بداتەوە.' دوایی تالیب گوتی: 'قوربان، لەم کارەدا زانستیان دەکار کردووه. ئەویش ئەوەیه که دوای مردنی، چاوی کچەیان دەرهێناوه و جیوەیان کردووەته ژێر چاوەکانیەوە و دوایی چاوەکانیان خستووەتەوە جێی خۆی. ئێستا وا دەنوێنێ که پێڵووەکانی دەجووڵێن و تەماشاکەران پێیان وایه ئەم کچه سەیری ڕاست و چەپی دەکات له کاتێکدا مردووه.' ئەوجار میرمووسا گوتی: 'پاک و بێگەردیی بۆ ئەو خودایەیه که نامرێ و مردنی بۆ کۆیلەکانی داناوه.'

"به کورتی، ئەو تەختەی کچه مردووەکەی له سەر دانیشتبوو ، پلیکانی هەبوو و دوو کویلەی ڕەش و سپی لەسەر پلیکانی یەکەم بوون. یەکێکیان ئامێرێکی پۆلای به دەستەوە بوو، ئەوی دیکەیان شیرێکی درەوشاوەی پێ بوو که ئاوی چاوی دەبرد. تەتەڵەیەکی زێڕین ڕووبەڕووی کۆیلەکان بوو که لەسەریان نووسیبوو: 'به ناوی خودای میهرەبانەوە. سپاس بۆ خودای بەدیهێنەری مرۆ و گەورەی گەوران و هۆی هۆکارەکان. به ناوی خودای هەرمانی هەتاهەتاییەوە. به ناوی خودای داڕێژەری قەزا و قەدەرەوە.'

"دوای ئەوه نووسیبوویان: 'ئەی نەوەی ئادەم، بۆچی بەم جۆره گیرۆدەی ئاواتی بەرزیت و بۆ مەرگت پشت گوێ خستووه؟ مەگەر نازانی مەرگ دملەسەرپشت به دواتەوە تا گیانت بکێشێ؟ که وایه تۆش بارگه و بنەی کۆچت بپێچەوە و تێشووی ڕێگایەت وەلا نێ، هەر بینا لەگەڵ دونیا لێک هەڵبڕان. به یادی خۆتی بهێنەوه که ئادەمی باوکی مرۆ له کوییه و نووح و منداڵەکانی چییان بەسەر هات. کیسرا و قەیسەرەکان، پاشایانی هیند و عێراق بۆ کوێ چوون؟ سوڵتانه گەوره و ستەمکارەکان و ئەوانەی لەمسەر بۆ ئەوسەری زەوییان به دەستەوە بوو، چییان لێ هات؟ گەورەکانی عەڕەب و عەجەم بەو هەموو ئاپۆره و دەستوپێوەندەوە مردن و ئێسقانیشیان ڕزی. له کوێن قاڕوون و هامان و شەددادی کوڕی عاد و کەنعانی خاوەنی بینای زۆر زەبەلاح؟ شمشێری ئەجەل لێی دان و مەقەستی مەرگ بەرگی به بەریان بڕی، بەڵام نازانم ئەوانه تووێشووی ڕۆژی پەسڵانیان برد یان نا. هیچ وڵامێکیان پێیه بۆ ئەولا یان نا؟ ئەی ئەو کەسەی دێیته ئەم شوێنەوە، ئەگەر من ناناسیت، با خۆمت پێ بناسێنم، من تورموزی کچی عەمالیقەکانم و لەگەڵ بەردەستەکانمدا دادگەر بووم و وەک پاشایانی دیکه وڵاتانم داگیر نەدەکرد. سەردەمانێکی دووروودرێژ به

خۆشی و کامەرانی ژیام. بەوە خۆشحاڵ بووم کە بە سوپا و خەڵکەکەم ببەخشم و کۆیلە و کەنیزان ئازاد بکەم.

" 'دوای ئەوە تووشـــــی بەڵای ناگەهان بووم و لەنێو مەینەتیدا ڕۆچووم. هۆکارەکەش ئەوە بوو کە حەوت ســـاڵی ڕەبەق باران نەباری و گیا نەڕوا. ئەوەی ئازووقەمان بوو، خواردمان. ئینجا چوارپێکانیشـــمان خوراد. ئیدی ئەو شـــتەی بۆ خواردن بشـێت، نەمانما. ئەوجار زێڕ و زیوم هێنا و کێشام و ناردم بۆ وڵاتانی دەورووبەر. هەموو شاران گەڕان و قووتیان دەســـت نەکەوت و زێڕ و زیویان بۆ هێنامەوە. ئەو دەم ماڵ و دارونەدارم لە کۆگەکان هێنانە دەرەوە و دەرگەکانی قەڵامان بەســـتن، خۆمان دایە دەســـت ویســـتی پەروەردگار. ئیدی هەمووومان بەم جۆرە تێدا چووین کە دەیبینیت. هەرچیمان بنیاد نابوو و کۆمـان کردبووەوە، جێمان هێشـــت. ئەوە بوو بەســـەرهاتی ئێمە. من بە خێر و تۆ بە سلامەت.' لەژێر تەتەڵەکەدا ئەم بەیتانەیان دیت نووسرابوون:

دەسەڵاتی تـــــــــــورک لە خشتەی بردووی
شکۆی ســـــــــــوڵتانی لە دڵ دەر کردووی
سوڵتان مەحمـــــــــــوود قەت لە بیر ناچێتۆ
گرێ پووچکەکان هەر خــــــــۆی ئەی کردۆ
کە ملکی ڕەی گـــــــــــرت لەگەڵ سیستان
بەرز بوو پلەی لە عـــــــــــەرز تا ئاسمان
وای لێ هات ســــــــوڵتان لە خۆی دەربچێ
زۆرکەس هـــــــــــەر ئاوا بەو دەردە دەچێ
گەورەیی سوڵتان کارێکی کــــــــــــردبوو
ترس و گومان لای خەڵک مـــــــــــــردبوو
ئەو هەموو شـــــــــکۆ و گەورەییەی کوانێ
ئاسمان مەمنـــــــــوون بوو پێی لەسەر دانێ
ڕۆژگـــــــــــــار زۆرانی بە زۆرانی خست
زۆر کەســـی کەوتووش ڕۆژگار ســـەری خســـت

"ئەوجار میرمووسا کە لە شیعرە گەیشت دەستی بە گریان کرد و گوتی: 'قەسـەم بە خودا پارێزکاری پایەیەکی پتەوە و مەرگ بەڵێنێکی هەق و ڕوون.' لە کۆتایی تەتەڵەکەدا نووسـرابوو: 'ئەی زاروزێچی ئادەم، پەند لە ڕابردووان وەربگرە و ڕێی ڕزگاری بگرە بەر. مەگەر نابینیت کە پیری بەرەو گۆڕت دەبات؟ ئەی بۆ تەماشـــای مووی ســـپیت ناکەی کە مژدەی مەرگت دەداتێ ؟ سا تۆش بۆ ڕۆیشتن و لێپرسینەوە ئامادە بە. کوڕی ئادەم، کوان

گەلانی پێشـوو و پاشـایان چییان لێ هات؟ شـووره قایم و قەڵا مکوومەکانی شـەددادی کوڕی عاد و کۆشـکی لەبنەهاتووی کوان؟ ئەی فیرعەون و نەمروود کە سـەرکەشـییان دەکرد، کوان؟ گشـتیان مەرگ لەگەڵ خۆڵ تێکەڵی کردن. لەوانە نە گەورەیان ما و نە چووکە، نە پیاو ما و نە ژن. ئەی ئەو کەسـەی دێیتە ئێرە، ئاگات لێ بێت کە نابێت لە دنیادا بە هیچ شـتێک لە خۆ بایی ببیت. ئاخر دنیا بێئەمەگ و فریودەر و دوابڕاوە. خۆزگەم بەو کەسـە کا کە گوناحی خۆی لە بیر ناچێتەوە کاریّ ناکا بچێتەوە سـەری. ترسـی لە پەروەردگاری هەبێت و ئاگای لە ئاکار وکرداری خۆی بێت. توێشـووی دواڕۆژ لە پێش خۆیەوە بنێرێت. هەرکەس کە بێتە شـاری ئێمەوە، ئەوەندەی لە ماڵی دنیا دەیەوێت، دەتوانێت هەڵبگرێت، بەڵام دەست لەم شتانە نەدات کە بە لاشەی منەوەن؛ ئەمانە داپۆشەری عەیبی منن و لە دنیا ئەوەی بۆم ماوەتەوە، ئەمەیە. ئامان کە دەسـت بۆ ئەم شـتانە درێژ مەکەن، ئەگینا تێدا دەچن. ئەمن ئەو ئاگادارم کردنەوە و قسـەی خۆم کرد. دوایە نەڵێن نەمانزانی. باقی وەسسەلام.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی پێنجسەد و هەفتا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! میرمووسا کە ئەم گوتانەی بیست، ئەوەندە گریا تا بێهۆش بوو. کە وە هۆش هاتەوە، هەموو شتەکانی نووسی و کردیە سەرمەشقی خۆی. ئەوجار بە سوپاکەی گوت: 'ئەوەندەی دەتوانن لەو گەوهەر و دەفر و شتە دانسقانە هەڵگرن.' تاڵیبی کوڕی سەهل بە میرمووسای گوت: 'باشە چۆن ئەم کچە بەو هەموو زێڕ و زیوەوە بەجێ بهێڵین، ئەویش جوانی وا کە لە دنیادا تای نییە و لەم سەردەمەدا هاوشێوەی دەست ناکەوێ؟ خۆ ئەم کچە لە هەموو ئەو ماڵەی دیکە باشترە و بۆ دیاریی خەلیفە لە هەموو شتێک شاوترە.' میرمووسا گوتی: 'کوڕە تاڵیب، مەگەر وەسیێتی کچەت نەبیست کە لەسەر تەتەڵەکە نووسرابوو تکای کردبوو دەست لەم نەدەین؟ خیانەت لە ئامانەت ڕەوا نییە.' تاڵیب گوتی: 'وەڵا هەر لەبەر ئەم قسانە ناکرێ واز لەم ماڵە بهێنرێ. جا خۆ ئەم کچە مردووە و پێویستی بەو شتانە نییە. ئەم ماڵ و گەوهەرانە جوانی ژیانن و ئەم کچەیش پارچەیەک قوماشی بەسە. ئەم ماڵە هەر بۆ ئێمە باشە.'

"ئیدی تاڵیب لە پلیکانەکان نیزیک بووەوە. پێیاندا سەر کەوت تا گەیشتە نێوان دوو کۆڵەکەکەی بەرانبەر دوو کەسەکە. دەمودەست یەکێکیان گورزێکی بە پشتیدا دا و ئەوی دیکەشیان بەو شیرەی بە دەستیەوە بوو، سەری لە لەشی جیا کردەوە. میرمووسا گوتی: 'ئەی خودا ڕەحمەت پێ نەکا. ئاخر بڵێ ئەم هەموو ماڵەت بەس نەبوو کە چاوت بڕییە هی ئەم کچە؟' دوای ئەوە میر فەرمانی دا سوپاکە بچێتە ژوورێ. وا بوو چوونە ژوورێ بە خەروار لەو ماڵ و گەوهەرانەیان هەڵگرت و هاتنە دەرێ. ئەوجار میرمووسا فەرمانی کرد کە دەروازەی شارەکە هەر بەو جۆرەی داخرابوو، دایبخەنەوە. کەوتنە ڕێ و لە ڕوخ دەریا گەیشتنە کێوێکی بەرز کە گەلێک ئەشکەوتی تێدا بوو و قولەڕەشی چەرمپۆشی لێ دەژیان و لە قسەیان تێنەدەگەیشتی. کە سوپاکەیان بینی هەڵاتن و خۆیان بە ئەشکەوتەکاندا کرد و ژن و منداڵەکانیان لە زارکی ئەشکەوتەکاندا ڕاوەستان. میرمووسا پرسی: 'ئەرێ شێخ عەبدوسسەمەد، ئەم هۆزە کێن؟' شێخ گوتی: 'ئەمە ئەو هۆزەن کە خەلیفە داوای کردوون.' لەڕێوە دابەزین و تاوڵیان هەڵدا. هێشتا نە حەسابوونەوە کە پاشای قولەڕەشەکان لە کێوەکە هاتە خوارێ، زمانی عەرەبی دەزانی.

"کە میری بینی، سڵاوی لێ کرد، میریش سڵاوەکەی ستاندەوە و ڕێزی لێ گرت. ئینجا پاشای قولان لە میری پرسی: 'جندۆکەن یا مرۆڤن؟' میر گوتی: 'مرۆڤین، بەڵام گومانی تێدا نییە ئێوە جندۆکەن وا لەم کێوەدا دەژین لە خەڵک دوورە و کەوتوون.' پاشای قولان گوتی: 'نا، ئێمەش ئادەمیزادین و لە وەچەی حامی کوڕی نووحین و ئەم دەریایەیش دەریای

کەرکەرە.' میرمووسا پرسی: 'باشە ئێوە کێ دەپەرستن کە هیچ پێغەمبەرێک نەهاتووەتە ئەم خاکەوە تا شەریعەتتان بۆ بێنێ؟' پاشای قولان گوتی: 'میرمووسا، تارماییەک لەم دەریاوە دەردەکەوێت کە تیشکەکەی ئاسۆ ڕوون دەکا. ئەوجار بە دەنگێک کە دوور و نیزیک بیبیستن، بانگ دەکا: 'هۆ وەچە و تۆرەمەی حام! شەرم لە کەسێک بکەن کە ئەو ئێوە دەبینێت و ئێوە ئەو نابینن. جا بڵێن: لائیلاهە ئیللەڵڵا، موحەممەد ڕەسووڵوڵڵا.' ئینجا دەڵێت کە من ئەبولعەباسی خزرم.'

"دوایە گوتی: 'میرمووسا، ئەو کەسە نوورانییە هەندێک قسەی فێر کردووین کە بەو قسانە خۆ لە خودا نیزیک دەکەینەوە کە ئەمانەن: 'بێ لە خودای تەنیا، هیچ خودایەک نییە. دەسەلات هەر هی ئەوە و سپاسگوزارییش بۆ ئەوە. دەژیێنێت و دەمرێنێت و بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە.' جگە لەم قسانە هیچی دیکە نازانین. جا لە هەموو شەوانێکی هەینی تیشکێک لەسەر زەوی دەبینین و دەنگێکی لێوە دەبیستین کە دەڵێ: 'پاک و بێگەرد و پیرۆزە. خودای فریشتە و ڕۆحە. ئەوەی بیەوێت، دەبێ و ئەوەی ئەو نەیهەوێت، نابێ. ئینجا میرمووسا گوتی: 'ئێمە دەستوپێوەندی گەورەی موسڵمانان، عەبدولمەلیکی کوڕی مەروانین. ئێمە هاتووین ئەو کووپانە دەربێنین کە لە سەردەمی سولەیمانی کوڕی داوددا جندۆکە و وەچەکانی شەیتانی تێدا بەند کراوە و هاوێژراونەتە ئەم دەریایەوە. خەلیفەکەمان دەیەوێت لەو کووپانەی بۆ ببەین تا بە چاوی خۆی بیانبینێت.' پاشای قولان گوتی: 'بە خێر بێن.' بە گۆشتی ماسی میوانداریی لێ کردن و بە نۆقارەکانی[1] گوت کە لەو کووپانە لە دەریا دەربهێنن. نۆقارەکان چوونە دەریاوە و دوازدە کووپەیان دەرهێنا کە بە مۆری سولەیمان مۆر کرابوون. میرمووسا و شێخ عەبدوسسەمەد و تەواوی سوپا بە وەدیهاتنی داواکەی خەلیفە خۆشحاڵ بوون. ئیدی میرمووسا ماڵێکی زۆروزەبەندی بە پاشای قولان بەخشی و، ئەویش دیاری سەیر و سەمەرەی دەریایی لە شێوەی مرۆئاوییەکان بۆ عەبدولمەلیک نارد و بە میرمووسای گوت: 'لەم سێ ڕۆژەدا میوانداریی ئێوەمان لەم جۆرە ماسیانە کرد.' میر گوتی: 'کە وایە دەبێت لەمانە لەگەڵ خۆماندا ببەینەوە بۆ خەلیفە با ئەویش بیانبینێت و زیاتر لە کووپەکانی سولەیمان دڵی پێیان خۆش ببێت.'

"پاشان میرمووسا ماڵئاوایی لە پاشای قولان کرد و ڕۆژ و شەو بەڕێوە بوون تا گەیشتنەوە شام، لای خەلیفە عەبدولمەلیک. میرمووسا ئەوەی ڕووی دابوو، بۆی گێڕاوە و ئەوەی لە شێعر و پەند نووسیبوویەوە هەمووی بۆ خوێندەوە و ڕووداوەکەی تاڵیبی کوڕی سەهلیشی بۆ گێڕاوە. خەلیفە گوتی: 'خۆزگە منیش لەگەڵتان هاتبام، تا ئەوەی ئێوە بە چاوی خۆتان دیوتانە، منیش دیبام.' پاشان خەیفە کووپەکانی وەرگرت و سەری هەڵپچڕین. ئەو دێو درنجانە دەردەپەڕین و دەچوونە هەواوە و دەیانگوت: 'تۆبە، تۆبە، ئەی پێغەمبەری

---

[1]. نۆقار: ئەوەی بچێتە ژێر ئاوەوە و بۆ ماوەیەکی زۆر بمێنێتەوە، غواص.

خودا. هەرگیز ناگەڕێینەوە سەر ئەو تاوانانە.' عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان لە بینینیان سەری سووڕ ما و گەلێکی بە لاوە سەیر بوو.

"بەڵام ئەو کچۆڵە دەریاییەی پاشای قولان لە گۆشتی هاوشێوەکانی ئەو میوانداری کردبوو، خستبوویانە کۆلێکی پڕ بوو لە ئاو و سەریان گرتبوو، بەڵام چونکە شوێنەکەی گەرم بوو هەواشی بۆ نەچووبوو لەوێدا مردبوو. دوای ئەوە خەلیفە ماڵەکەی هێنا و لە نێو موسڵمانانداندا دابەشی کرد."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی پێنجسەد و حەفتا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ! دوای ئەوە میرمووســا داوای لە خەلیفە کرد کە کوڕی ئەو بکاتە میری مەغریب و خۆی بچێتە قودسی پیرۆز و سەرقاڵی خوداپەرستی خۆی بێت. خەلیفە داواکەی قەبووڵ کرد و کوڕەکەی لە جێی دانا. میرمووســا چوو بۆ قودس و لەوێ مرد. ئەوەی لە باس‌وخواسی شاری مس پێمان گەیشتووە، هەر ئەمە بوو. خودا خۆی باشتر دەزانێت.

## چیرۆکی فێڵی ژنان

### بەسەرهاتی پاشا، کوڕەکەی و کەنیز و حەوت وەزیر

"دەگێڕنەوە، ســاڵانی زوو پاشــایەکی بەتەمەن هەبوو خاوەن ماڵ و سـامانێکی زۆر و ســوپایەکی گەورە بوو، بەڵام منداڵی نەبوو. هەر بۆیە دایمە دڵتەنگ و پەشــێو بوو. پێغەمبەران و پیاوچاکانی کردە تکاکار بەشــکوو خودا منداڵێکی نێرینەی بداتێ و دوای خۆی بیکاتە میراتگری خاک و وڵاتەکەی. ئەوجار هەســتا چووە دیوان و لە کچی مامی ڕاسپارد و داوای کرد، وابوو کچە مەمەکەی مارە کرد و هێنایە ماڵێ و چێژی لێ وەرگرت. بە ویســتی خودا ئامۆزای پاشــا دووگیان بوو. دوای تێپەڕبوونی ماوەکەی و لە مانگ و ڕۆژی خۆیدا، کوڕێکی بوو لە گوێێ مانگی چواردە. کوڕەیان بە دایەنیان ســپارد و تا پێنج ســاڵان پەروەردیان کرد. پاشــا زانایەکی لە لابوو ناوی ســەندباد بوو. ســەندباد لە چاو زاناکانی دیکە کارزانتر بوو، دواڕۆژی کارەکانی باشتر پێشبینی دەکرد. پاشا کوڕیژگەکەی بەو سپارد. کە کوڕە بووە دە سـاڵ، لە زانایی و وێژەوانیدا لەو سـەردەمەدا تای نەبوو و کەس نەیدەتوانی شان لە شانی بدات. ئەوجار پاشا پاڵەوانی هێنا و پێی گوت کە کوڕەکەی فێری ئەسپسواری و تیرئەنگێوی و شمشێروبازی بکات. وا فێری ئەو هونەرانەش بوو کە لە هەموو کەسێک لەسەرتر بوو. ڕۆژێک لە ڕۆژان سەندبادی دانا سەیری بەختی شازادەی کرد. دیتی شــازادە تا حەوت ڕۆژان قســەیەک دەکات کە ئەو قســەیە دەبێتە مایەی تیداچوونی. لە جێوە ســەندبادی زانا هەستا و چوە کن پاشــا و ئەوەی لە ئەستێرەکانەوە بۆی دەرکەوتبوو، بە پاشای گوت. پاشا گوتی: 'کوڕە دەستم بە داوێنت، چار چییە و دەبێ چی بکەین؟' بیرمەند گوتی: 'گەورەم، بە بۆچوونی من وا باشــە بیبەیتە ســەیرانگەیەک و

ئامێری موسیقی و گۆرانیبێژی لێ کۆ بکەیتەوە ئەم حەوت ڕۆژە بە عەیش و نۆشەوە ڕایبوێرێ.' پاشا کەنیزەکێکی تایبەتی جوان و شۆخی بانگ کرد و کوڕەکەی پێ سپارد و پێی گوت: 'گەورەی خۆت ببە و بچۆ فلان کۆشک. تا حەوت ڕۆژان، لە کۆشک وەدەر مەکەوە.' کەنیزۆک هەستا چوو قۆڵی شازادەی گرت و بردییە کۆشکەکە. ئەو کۆشکە چل ژووری هەبوون. هەر ژوورەی دە کەنیزی شەنگ و شەپاڵی تێدا بوو کە هەریەکەی جۆرێک ئامێری مۆسیقای لە دەستدا دابوو. هەرکاتێک مۆسیقایان دەژەنی، کۆشکیان دەینا سەما. لە چواردەوری کۆشکدا جۆگەلە ئاو و لە کەناری هەر جۆگەلەیەک گوڵ و داری جۆراوجۆر لێ بوو.

جوانی و شیرینی شازادە بە ڕادەیەک بوو کە زمان لە پەسنیدا لاڵ دەبوو. کە شەوێکی لەوێ بەسەر برد و کەنیز لە جوانی و چەلەنگی شازادە ورد بووەوە، شەیدای جوانییەکەی بوو و عەشقی ئەوی لە دڵدا چەسپی. نەیتوانی بەر بە خۆی بگرێت. خۆی خستە بەر پێی شازادە و سەر و ڕووی ماچ کرد. ڕازی خۆی ئاشکرا کرد. کە شازادە ئەوەی بینی و ئەو قسانەی بیست، بە کەنیزی گوت: 'ئیشەڵڵا کە چوومەوە بارەگای باوکم، ئا ئەمەی بۆ دەگێڕمەوە تا سووک و ڕسوات بکا و لەبەینت بەرێ.' کەنیزە خێرا هەستا و گەڕاوە لای پاشا. بەگریانەوە لەبەر دمی پاش خۆی بە زەویدا دا. پاشا بە پەرۆشەوە پرسی: 'کەنیزۆ، حاڵی گەورەکەت چۆنە؟ چی بووە بوا دەکەی؟' کەنیز گوتی: 'پاشام، گەورەم داوای لێ کردم، بەڵام من بەدەم داواکەیەوە نەچووم. ویستی بمکوژێت، منیش هەڵاتم. تازە ناچمەوە ئەو کۆشکە.' کە پاشا ئەمەی بیست، زۆر تووڕە بوو. وەزیرانی بانگ کرد و فەرمانی کوشتنی شازادەی دا. ئەوجار وەزیرەکان بە یەکدییان گوت: 'پاشا نیازی کوشتنی شازادەی هەیە، بەڵام ئەو کوڕە لای ئەو ئازیزە و دوای گەلێک چاوەڕوانی چاوی بەم کوڕە ڕوون بووەوە، ئەگەر بیکوژێت، دوایە پەشیمان دەبێتەوە و سەرکۆنەی ئێمە دەکا و دەڵێ، ئەی بۆچی ڕێگەچارەیەکتان نەدۆزییەوە و لە کوشتنی پەشیمانتان نەکردمەوە.' وا بوو ئەوان ڕێکەوتن لەسەر ئەوە، ڕێگەیەک بدۆزنەوە کە پاشا لە کوشتنی شازادە پەشیمان بکەنەوە. لەو دەمەدا وەزیری یەکەم گوتی: 'من ئەمڕۆ شەڕی پاشاتان لە کۆ دەکەمەوە. دەمودەست کەوتە ڕێ بۆ لای پاشا. کە گەیشتە دیوان، مۆڵەتی قسەکردنی وەرگرت. پاشا ڕێی دا. وەزیر گوتی: 'گەورەم، ئەگەر تۆ هەزار کوڕت هەبێ، نابێ تەنانەت یەکێکیشیان بە قسەی کەنیزەکێک بکوژی بەبێ ئەوەی بزانی داخۆ ڕاست دەکا یا درۆ. ڕەنگە داوێکی بۆ کوڕی تۆ نابێتەوە.' پاشا پرسی: 'وەزیر، ئەرێ هیچت لە بارەی فێڵ و تەڵەکەی ژنانەوە بیستووە؟'

## چیرۆکی پاشا و ژنی وەزیرەکەی

"گوتی: 'بەڵێ، پاشام. بیستوومە یەکێک لە پاشانی زوو زۆر ئاشقە ژن بوو. ڕۆژێک لە یەکێک دیوەکانی کۆشک دانیشتبوو و چاوی لە دەرێ دەکرد، لە ناکاو لە سەر بانی ماڵێک چاوی بە شەنگ و شۆخێک کەوت. قەتی شتی هێندە جوانی نەدیتبوو.' ئیدی لەڕێوە هوگری بوو. خۆی پێ ڕانەگیرا و ناردی بزانێ ئەوە ماڵی کێیە. گوتیان: 'ئەوە ماڵی فلان وەزیرە.' هەر ئەو دەمە بانگی ئەو وەزیرەی کرد. کە وەزیر هات، پاشا ڕایسپارد بچێت سەریکی ناوچەکانی دەوروبەری شانشینەکە بدات و لە کاوباریان بکۆڵێتەوە و هەواڵیان بپرسێ. وەزیر فەرمانی گوتی دەستی لەڵێی لەسەر چاوی دانا. کە وەزیر وەڕێ کەوت و چوو بۆ سەفەر، پادشا فێڵێکی ساز کرد و چوو بۆ ماڵی وەزیر. کە ژنی وەزیر ئەوی بینی، ناسییەوە و دەستی ماچ کرد و لە دووریەوە دەستەونەزەر ڕاوەستا. دوایی پرسی: 'گەورەم، هۆی هاتن بۆ ئێرە چییە چونکە کەسی وەک من شایانی ئەوە نییە تۆ دڵی بدەیتەوە؟' پاشا گوتی: 'تامەزرۆییم بۆ تۆ منی کێشایە ئێرە.' ژنی وەزیر کڕنۆشی برد و گوتی: 'گەورەم، من شایانی کەنیزیی خزمەتکارەکانی تۆش نیم. چۆناوچۆنە وا بەخت ڕووی تێ کردووم و ئەو بازەم لەسەر بنیشێ ؟' پاشا خۆی پێ ڕانەگیرا و دەستی بۆ برد. ژنی وەزیر گوتی: 'گەورەم جارێ پەلە مەکە دەرفەت بۆ ئەو کارە زۆرە. تازە ئەمڕۆ لای من بمێنەوە با شتێک سازکەم و بیخۆین، پاشان هەرچی دەکەی بیکە و ملکەچی فەرمانتم.'

" 'ئەوجار پاشا لە سەر کورسییەکەی وەزیر دانیشت. ژنی وەزیر چوو کتێبێکی هێنا، بۆ ئەوەی تا ئەو چێشتەکە لێدەنێ پادشا بیخوێنێتەوە. کتێبەکە پەند و ئامۆژگاری تێدا بوو. پاشا کتێبی وەرگرت و دەستی بە خوێندنەوەی کرد. کە ئەو پەند و ئامۆژگارییانەی بینی و زینای لە بەرچاو کەوت و لە هەڵوێستەکەی پەژیوان بووەوە. ئەوجار ژنی وەزیر نەوەد جۆر خواردنی لە نەوەد ڕەنگی جیاوازدا لە پێش پاشا دانا. کە پادشا لە چێشتەکانی چێشت، سەیری کرد هەموویان یەک تامن. پاشا زۆری پێ سەیر بوو، لە ژنی وەزیری پرسی: 'ئەی هونەرمەند، ئەو خواردنانە بە ڕەنگ جیاوازن کەچی یەک تامن!' ژنی وەزیر گوتی: ' خودا شکۆی پاشامان پایەدار کا! من ئەم نموونەیەم بۆ ئەوە هێنایەوە تا پاشا پەند وەربگرێت.' پاشا گوتی: مەبەستت چی بوو؟' ژنی وەزیر گوتی: 'پاشا لە کۆشکی خۆیدا نەوەد ژنی هەیە کە لە ڕەنگدا جیاوازن و لە تامدا یەکێکن.'

" 'کە پاشا ئەم گوتەیەی بیست، شەرمەزاری ژنی وەزیر بوو، خێرا لە ماڵەکەی هاتە دەرەوە و لە تاو پەشیمانی ئەنگوستیلەکەی لەژێر کورسییەکەی وەزیردا لە بیر چوو و گەڕاوە کۆشک. کە پاشا لە دیوان دانیشت، وەزیر گەڕاوە و لاشیپانی دەرگەی دیوانی ماچ کرد. دەنگ و باس و بارودۆخی ئەو ناوچانەی بۆ گێڕاوە. دوایی مۆڵەتی خواست و چووەوە ماڵەکەی خۆی. ویستی لە شوێنی خۆی دانیشێ، لەژێر کورسییەکەیدا چاوی بە

ئەنگوستیلەیەک کەوت. هەڵیگرتەوە و نایە باخەڵی. ئیدی هەتا ساڵێک لە ژنەکەی نەبان بوو، خۆی تێ نەدەگەیاند. بەڵام ژنە هۆکاری قەڵسی وەزیری نەدەزانی.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی پێنجسەد و حەفتا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! 'وەزیر ساڵێک ژنەکەی نەدواند و ژنەش هۆکاری قەڵسییەکەی نەدەزانی. کە هەر توورەیی وەزیر درێژەی کێشا و ژنەش هۆکارەکەی نەدەزانی، کەسێکی نارده لای باوکی و لە بابەتەکەی ئاگادار کردەوە. باوکی ئەو ژنە گوتی: 'کە بچمە دیوانی پاشا، بابەتەکەی بۆ دەگێڕمەوە.'

" 'وا بوو ڕۆژێکیان وەزیر و قازی و باوکی ژنە لە دیوانی پاشا بوون. خەزووری وەزیر گوتی: ' خودای گەورە پاشامان سەرکەوتوو بکا. من باخێکم هەبوو لە جوانی و خۆشیدا داخی بە دڵی باخی ئیرەمەوە دەنا. دارەکانی شۆڕ بووبوونەوە و گەڵێک زێڕ و زیوم تێدا خەرج کردبوو. کە دارەکانی هاتنە بەرهەم، من بە دیاری بە وەزیرەکەی تۆم بەخشی. وەزیر لە میوەکانی خوارد و چێژی لێ وەرگرت، کەچی دوایی دەستی لێ هەڵگرت و ئاوی نادا تا چرۆکانی وشک بوون و لە بەرەو کەوت ژاکا.' وەزیر گوتی: 'پاشام، ئەو ڕاست دەفەرمووێت. من ئەو باخەم دەپاراست و لە میوەکانیم دەخوارد، بەڵام ڕۆژێک چوومە ئەو باخەوە جێپێی شێرێکم بینی و لە خۆم ترسام و دووریم لێ کرد.' پاشا زانی کە ئەو جێپێیەی وەزیر باسی دەکا، ئەنگوستیلەکەی پاشایە کە لە ماڵی ئەودا جێ مابوو. بە وەزیری گوت: 'وەزیر، بگەڕێوە نێو باخی خۆت و دڵنیا بە و خەیاڵت ئاسوودە بێ کە بیستوومە شێر چووەتە ئەو باخەوە، بەڵام زیانی پێ نەگەیاندووە.' وەزیر گوتی: 'بەسەر سەر و سەر چاو.'

" 'دوای ئەوە وەزیر گەڕاوە ماڵی خۆی. بانگی ژنەکەی کرد و کێشەکەیان بنەبڕ کرد و باوەڕی بە داوێنپاکییەکەی کرد. پاشام شتێکی دیکەشم بیستووە ...

### چیرۆکی بازرگان و ژنەکەی و تووتییەکەی

" '... بازرگانێک بوو زۆر دەچوو بۆ سەفەری ئەملاوئەولا، ژنێکی زۆر جوان و بەرچاویشی هەبوو. ئەو بازرگانە ژنەکەی لە ڕادەبەدەر خۆش دەویست. هەر لەبەر ئەوەش دڵپیسی لێ دەکرد. بازرگانەکە تووتییەکی کڕی، ئەو تووتییە کاتێک مێردی ژنە لە ماڵ نەبووبا، هەر چییەکی هاتبا گوێ دوایە بۆ مێردەکەی دەگێڕاوە. وا بوو، بە هەڵکەوت جارێکیان کابرا چووبوو بۆ سەفەر، ژنەش لەگەڵ لاوێکی جوانچاک و ڕێکوپێکدا کەین و بەینی بوو. کوڕە دەهاتە ماڵی بازرگانە و ژنەش زۆری بە دەوردا دەهات و قەدری دەگرت و ئاوری حەزی دادەمرکاند.

" 'کە مێردەکەی هـاتەوە، تووتییەکە تەواوی ئەو ڕووداوانەی بۆ گێڕاوە و پێی گوت: 'گەورەم، کوڕێکی جوان دەهاتە ئێرە و ژنەکەت زۆری خۆش دەویست.' بازرگان کە ئەوەی بیســت، ویســتی ژنەکەی بکووژێ. ژنەکەی پێی گوت: 'پیاوەکە ڕاوەســتە و پەلە مەکە، لە خودا بترســە. ئاخر ئەوە کەی ژیرییە گوێ لە قســەی ئەم باڵندە فێرکراو و نەزانە بگریت؟ ئەگەر دەتەوێ ڕاست و درووستی ئەم کارەت بۆ ڕوون ببێتەوە، ئەمشـەو هەستە و بچۆ ماڵی یەکێک لە هـاوڕێکانـت و لەوێ بخەوە. کە ڕۆژ بووەوە، وەرەوە لای تووتییەکە و بەسەرهاتەکەی لێ بپرسـە تا ڕاست و درۆت بۆ دەرکەوێ.' پیاوە چوو بۆ ماڵی یەکێک لە دۆستانی و شەوێ لەوێ ماوە.

" 'ئەوجار ژنە چوو توورەکەیەکی بەســـەر ئەو قەفەســـەکەدا کرد کە تووتییەکەی تێدا بوو و ئاوی بەســـەردا دەڕشـــت و باوەشـــێنی دەکرد و تشـــکی چرایەکی وەک تیشـــکی هەورەبرووســکە لە قەفەســـەکە گرت. تا بەیانی دەســتاڕی دەسووڕاند کە گرمەی دەهات. بەیانی بازرگانەکە گەڕاوە ماڵ و ژنەکەی پێی گوت: 'دا باســی دوێنێ شــەوی لێ بپرســـە بزانە دەڵێ چی.' بازرگان لە تووتییەکەی پرسی. تووتی گوتی: 'گەورەم، دوێنێ شەو لەبەر ئەو گشـــتە با و باران و هەورەگرمە و هەورەبرووســـکەیە هەر نەمتوانی هیچ ببینم و ببیستم.' بازرگان بە تووتییەکەی گوت: 'درۆزن. دوێنێ شـەو نە بای هاتووە و نە پەڵەیەک هەور بە ئاسمانەوە بوو.' تووتی گوتی: 'من هەر ئەوەم پێگوتووی کە بینیومە و بیستوومە.' بازرگان ئەوەی لە بارەی ژنەکەیەوە لە تووتییەکەی بیستبوو، بە بە هێندی نەگرت. گەرەکی بوو لەگەڵ ژنەکەیدا ئاشـــت ببێتەوە. ژنە گوتی: 'بە خودا ئاشـــت نابمەوە تا ئەو تووتییە نەکووژی. چونکە بوختانی بۆ هەڵبەســـتووم.' ئیدی بازرگان لەڕێوە تووتییەکەی کوشـــت. چەند ڕۆژێک لەگەڵ ژنەکەی بە ســـۆز و دلۆڤانییەوە ڕایبوارد. ڕۆژێکیان کوڕێکی جوان و قۆزی بینی کە لە ماڵی ئەو هاتە دەرێ. ئەوجار ڕاســـتی قســـەی تووتییەکە و فێڵی ژنەکەی بۆ دەرکەوت و لە کوشـتنی تووتییەکە پەشـیمان بوو. چووەوە ماڵێ و ژنەکەی کوشـت و سـوێندی خوارد کە تازە قەت ژن نەهێنێت. جا پاشـام، من ئەو چیرۆکەم بۆیە بۆ گێڕایەوە تا بزانیت زۆر بە فێڵ و دهۆن و پەلەکردن لە کاردا پەشـــیمانی بە دواوەیە.' پاشـــا کە چیرۆکە نەستەقەکەی وەزیری بیست، لە کوشتنی کوڕەکەی پاشگەز بووەوە.

"بۆ بەیانی، کەنیزەکە هاتە دیوانی پاشـا و کوڕنۆشــی برد و لاشـیپانی دەرگەکەی ماچ کرد و گوتی: 'پاشـــام، ئەوە چۆناوچۆن بە قســـەی وەزیر هەقی منت بە فیڕۆ دا؟ بۆچی ســـەرەتا حوکمت دا و دوایی وەزیر تۆی لەو حوکمە پەشـیمان کردەوە؟ پاشـایان ئەگەر زیپک و زاکوونیان نەبێ کەس قســـەیان بە هێند ناگرێ و بەردەســـتەکانیان گوێڕایەڵ و فەرمانبەر نابن. پاشـام، تۆ بە دادگەری و بەویژدانی بەناوبانگی و لەنێوان من و کوڕەکەتدا داوەری بکە. ئاخر بیستوومە ...

**چیرۆکی جلشۆر و کوڕەکەی**

" '... جلشـــۆرێک هەموو ڕۆژێک دەچووە گوێ دیجلە و جلی دەشـــۆرد و کوڕەکەی لەگەڵی دەچوو و خۆی دەخســتە دیجلەوە و مەلەی دەکرد. باوکیشـی دەنگی نەدەدا و ڕێی لێ نەدەگرت تا وا بوو ڕۆژێک کوڕە وەک جاران لە دیجلەدا مەلەی دەکرد، وا بوو باسـکی گیرا و لە جووڵە کەوت و نوقم بوو. بـاوکی کە ئەوەی دیـت، خۆی هەڵـدایە دیجلەوە کوڕەکەی ڕزگار بکا. کە گەیشتە کوڕەکەی و گرتی، هەردووکیان پێکەوە نوقم بوون. بەڵام پاشا تۆش ئەگەر ڕێ لە ستەمی کوڕەکەت نەگری، زۆر دەترسم هەردووکتان تێدا بچن.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که ئەوی پێنجسەد و هەشتایەم هاتەوە

”گوتی: خاوەنشـکۆ! که چیرۆکی جلشـۆر و کوڕەکەی بۆ پاشـا گێڕاوە، گوتی: 'پاشـا، پیاوان گەلێک فێڵ و دەهۆیان لەژێر سەردایە و بیستوومە ...

### چیرۆکی تۆمەتی ناڕەوای پیاوێک لە ژنەکەی

” '...پیاوێک ئەڤینداری ژنێکی جوان بوو که ئەو ژنە مێردەکەی خۆش دەویسـت و مێردەکەشـی ئەوی خۆش دەویسـت. ئەو ژنە بە چاکەکاری و داوێنپاکی بەناوبانگ بوو. کـابرای ئەویـندار ڕێی تێ نەبرد و هەر بۆیە زۆر نـاڕەحەت بوو. خەمی لێ زیـاد بوو بەردەوام لە بیر ئەوەدا بوو بە فێڵێک خۆی بگەیەنێتێ. مێردی ئەو ژنە کۆیلەیەکی هەبوو که لە ماڵی خۆیدا پەروەردەی کردبوو. زۆری باوڕە پێی بوو. کابرای ئەویندار هاتە کن ئەو کۆیلەیە و زۆری لەبەر هەڵخوێند و نێوانی لەگەڵ خۆش کرد. بە دیاری و چاکە هێنایە ژێر بـاری خۆی تـا وای لێ هـات تەواو گوێڕایەڵی دەکرد. ڕۆژێکیـان کـابرای ئەویندار بە کۆیلەکەی گوت: 'ئەرێ فلانی، کـاتێک خـانمەکەت لە مـاڵ چووە دەرەوە، بمەبەوە مـاڵی خۆتان.' کوڕە قەبووڵی کرد. که خانم چوو بۆ گەرماو و گەورەکەی چوو بۆ دووکان، کوڕە چووە کن کابرای ئەویندار، دەسـتی گرت و بردییەوە ماڵێ و ئەوی لە ماڵدا بوو یەکـیەک پیشـانی دا. کابرای ئەویندار چونکە فێڵێکی لەژێر سـەردا بوو، سـپێنەی هێلکەیەکی لەگەڵ خۆیدا بردبوو، که گەیشـتە جێخەوی خاوەنماڵ، کۆیلەکەی خافڵاند و سـپێنەکەی کرد بەسەر جێخەوەکەدا و لە ماڵەکە هاتە دەرەوە.

” 'ماوەیەک تێنەپەڕیبوو که کابرا لە دووکان گەڕاوە، ویسـتی بخەوێت، پەتووی لا دا و هەسـتی بە تەڕییەک کرد. دەسـتی بۆ برد و وای زانی تۆماوی پیاوە. بە تووڕەییەوە سـەیری کۆیلەکەی کرد و پرسـی: 'خانمت لەکوێیە؟' کۆیلەکە گوتی: 'چوو بۆ گەرماو و ئێستا دێتەوە.' بەو قسەیە گومانە گەورەکەی لێ وەڕاست گەڕا. دڵنیا بوو که ئەوە تۆماوی پیاوە. ئیدی بە کۆیلەکەی گوت: 'هەر ئێسـتا بچۆ بۆ گەرماو و خانمەکەت بانگ کەوە.' کۆیلەکە لەڕێوە دەپەڕی چوو خانمی هێناوە. کابرا که چاوی بە ژنە کەوت، بۆی هەسـتا و زۆر چاکی لێ دا و ویسـتی بیکوژێ، ئەو ژنە چارەڕەشـە هاواری لە دراوسـێکانی کرد. دراوسـێکان بەهاوارییەوە هاتن. پێی گوتن: 'مێردەکەم دەیەوێ بمکوژێ و من هیچ تاوانێک لە خۆمدا شک نابەم.' دراوسێکان دژی کابرا وەستانەوە و پێیان گوت: 'ناتوانیت دەستی بۆ ببەیت. یا تەڵاقی دە، یا بە باشـی ڕایگرە. ئێمە ئەو ژنە بە باش دەناسـین و دەزانین چەند داوێنپاکە و دەمێکە دراوسـێمانە و هەرگیز خراپەیەکمان لێ نەدیوە.' کابرا گوتی: 'من لە

جێخەوەکەمدا لینجاوێکی وەک تومـاوی پیـاوانم دی. هۆکـارەکەی نـازانم.' پیـاوێـک لە هەنتەشـــیان هاتە پێشـــێ و گوتی: 'دا دەی ئەو لینجاوەمان پیشـــان دە.' کە لینجاوەکەی پیشـــان دا، ئەو پیاوە داوای ئاگری کرد و لینجاوەکەی گەرم کرد. تەماشـــایان کرد سـپی هەڵگەڕا و برژا. کابرا لێی خوارد و بە هەنتەشـیانی چەشـت. هەموو زانیان کە ئەو لینجاوە سـپێنەی هێلکەیە. ئەو کابرایەش بۆی دەرکەوت کە سـتەمی لە ژنەکەی کردووە و ژنە لەو تاوانە بێبەرییە.' پاشـــا کە ئەم قســـانەی بیســـت، فەرمانی کوشـــتنی کوڕەکەی دا. ئەوجار وەزیری دووەم چووە پێشـــێ و لاشـیپانی دەرگای دیوانی ماچ کرد و گوتی: 'لە کوشـتنی کوڕەکەتدا پەلە مەکە کە خودا دوای بێئومێدییەکی زۆر ئەو کوڕەی پێ بەخشـییت. ئێمە بە هیواین ئەو ببێتە یادگاری تۆ و وڵات بەڕێوە ببات. قوربان، تۆ دان بە خۆتدا بگرە، ڕەنگە کوڕەکەشت قسەیەکی هەبێ. لەوە دەترسم ئەگەر لە کوشتنیدا پەلە بکەی، دوایی پەشیمان ببیتەوە، هەر بەو جۆرەی کە کابرای بازرگان پەشیمان بووەوە.' پاشا گوتی: 'کامە بازرگان و چۆن پەشیمان بووەوە؟'

### چیرۆکی بازرگانی چرووک و نان

" 'وەزیر گوتی: 'بیســـتوومە بازرگانێک هەبوو، قۆز و لەبار و ڕێکوپێک کە خواردن و خواردنەوەی بەتام و خۆشـــی دەخوارد. ڕۆژێک لە ڕۆژان بە گەشـت چووە شـارێک و لە بازارەکەیدا دەگەڕا. پیرەژنێکی دی، دوو خەپلە نانی بە دەســـتەوە بوو و دەیفرۆشـتن. ئەو دوو خەپلەیەی بە نرخێکی هەرزان لێ کڕی و بردنییەوە بۆ مـاڵێ. ئەو ڕۆژە دوو خەپلە نانەکەی لە چێشـــتەنگاودا خوارد. ڕۆژی دواتر چووەوە هەمان جێ و پیرەژنەی نەدی. هەواڵی پرســی و هیچی دەسـت نەکەوت. ڕۆژێکیان لە کۆڵانێکی شـاردا چاوی بە پیرەژن کەوت. سڵاوی لێ کرد و لە هۆی پێواربوونی و لەبارەی دوو خەپلە نانەکەوەی پرسی. ژنە باســـەکەی دەگۆڕی و باســـەکەی بە لاڕێدا دەبرد. بازرگان ســـوێندی دا، لە کاری خۆی ئاگاداری بکاتەوە. پیرەژن گوتی: 'قوربان، ئێســـتا کە ســـوێندت دام، ناچارم پێت بڵێم؛ من خزمەتی کەسـێکم دەکرد، نەخۆشـی گوڵی گرتبوو، پشـتی بریندار ببوو. نۆژدار ئاردی بە ڕۆن بۆ دەگرتەوە و لە برینەکەی دەنا. بەیانیان هەویرەکەی لێ دەکردەوە و فڕێی دەدا. منیش ئەو هەویرەم هەڵدەگرتەوە و دەمبرد دوو خەپلە نانم لێ ســـاز دەکرد و بە تۆ و کەسـانی دیم دەفرۆشـت. جا ئەوە چەند ڕۆژێکە ئەو نەخۆشـە مردووە و ئەو دوو خەپلە نانە لە من براوە.' بازرگان کە ئەمەی بیســـت، دڵی تێکەڵ هاتوو، پەیتاپەیتا هێڵنجی دەدا و ڕشاوە تا نەخۆش کەوت.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و هەشتا و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! 'بازرگان نەخۆش کەوت و کردەپەشیمان بوو، بەڵام تازە پەشیمانی سوودی نەبوو. جا قوربان، تۆش لە دەهۆی ژنان خافڵ مەبە و باوەڕیان پێ مەکە.' پاشا لە کوشتنی کوڕەکەی پاشگەز بووەوە.

"کە ڕۆژی سێیەم هات، کەنیزەکە چووەوە دیوانی پاشا و لاشیپانی دەرگای دیوانی ماچ کرد و گوتی: 'پاشام، هەقم لە کوڕەکەت بستێنە و گوێ بە قسەی وەزیرەکانت مەدە چونکە وەزیری خراپ چاکەی لێ ناوەشێتەوە. وەزیری ناژیر شایانی ڕاوێژ نییە. گەورەم، وەک ئەو پاشایە مەبە کە بە گوێی وەزیرە ناژیرەکەی کرد و زیانی کرد.' پاشا گوتی: 'دا بۆم بگێڕەوە بزانم چۆناوچۆن بووە؟'

### چیرۆکی شازادە و کچەی ناشرین

"کەنیزەکە گوتی: 'پاشام، بیستوومە پاشایەک کوڕێکی هەبوو، زۆری خۆش دەویست و لە هەموو کوڕەکانی زیاتر لای ئازیزتر بوو. ڕۆژێکیان شازادە بە باوکی گوت: 'دەمەوێت بچمە ڕاو.' پاشا ڕێی دا. بە وەزیری گوت لەگەڵیدا بچێتە ڕاو و هاوڕێیەتی بکات. وەزیر خۆی ساز و تەیار کرد و دەستوپێوەندی ئامادە کرد. لەگەڵ شازادەدا بەرەو ڕاوگە چوو و ڕۆیشتن تا گەیشتنە دەشتێکی سەرسەوز کە نێچیری زۆر تێدا بوو. شازادە فەرمانی پاشگەزبوونەوەی دا. لە کاتی گەڕانەوەدا شازادە چاوی بە ئاسکێک کەوت کە لە ڕەوەکەی هەڵبڕابوو. بە وەزیری گوت: 'دەمەوێ دوای ئەو ئاسکە بکەوم.' وەزیر گوتی: 'چۆنت پێ خۆشە وا بکە.' ئیدی شازادە بە تەنیا دوای ئاسکەکە کەوت و تا دەمەو ئێوارە هەر حەولودەولی بوو. کە ئێوارە داهات، ئاسک بە کێوێکی هەڵەمووتدا هەڵگەڕا و تاریکی باڵی بە سەر وڵاتدا کێشا. شازادە ویستی بگەڕێتەوە، ڕێی دەرنەکرد. بە ترس و دڵەڕاوکێوە تا بەیانی بە سەر زینەکەوە بوو. دەمەو بەیان برسی و تینوو وەڕێ کەوت، نەشیدەزانی ڕوو لە کام لا بکا. هەر ئاوا ڕووی لە لایەک کرد و هەتا نیوە ڕۆیشت. لەو دەمەدا شارێکی گەورە و خاوەن باڵەخانەی باش باشی لێ وە دیار کەوت. ئەو شارە وێرانە بوو و جگە لە کوندەپەپوو و قەلەڕەش هیچی دیکەی تێدا نەبوو. شازادە لەو شارە ڕاوەستا. بە سەرسامییەوە سەیری ئەو شارەی دەکرد. لەناکاو چاوی بە کچێکی جوان و دەلال کەوت کە لە بن سێبەری دیوارێکدا دانیشتبوو و دەگریا. شازادە لێی نیزیک بووەوە و لێی پرسی: 'تۆ کێی؟' کچە گوتی: 'من تەمیمەی کچی تەیاخی پاشای شەهبام. ڕۆژێکیان کارێکم بوو، هاتمە دەرەوە. دێوێک ڕفاندمی و وە هەوای خستم. نەیزەکێک هات و ئەوی سووتاند. من

کەوتمە ئێرە و سێ ڕۆژە برسی و تینووم. ئێستا کە تۆم دی، هیوایەکم هاتەوە بەر.

ێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی پێنجسەد و هەشتا و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! 'کە شازادە چووە کن کچی تەیاخ، کچە گوتی: ' ئێستا کە تۆم دی، هیوا بە ژیانم تێدا بزووت.' شازادە بەزەیی پێیدا هات. ئەوی خستە پاشکۆی و پێی گوت: 'نیگەران مەبە ئەگەر من بە هۆزەکەم شـــاد ببمەوە ئەوە تۆش دەگەیێنەمەوە لای کەسوکارت.' ئیدی شازادە ئەسپی تاو دا و کچە کە بە پاشکۆیەوە بوو گوتی: 'شازادە، دامبەزێنە کاری دەست بە ئاو هەیە با هەتا پەنا ئەو دیوارە بچم.' ئەوجار شازادە دایبەزاند و لە سەری ڕاوەستا. کچە چووە پشت دیوارەکە و دوای ماوەیەک، بە سەر و سیمایەکی ناشـرینەوە گەڕاوە. شـازادە کە چاوی پێی کەوت، سـەراپای کەوتە لەرزە و لە ترسـاندا تەواو حاڵی تێک چوو. ئینجا کچەی دێوسیما گورج سواری ئەسپەکە بوو و لە شازادەی پرسی: 'ئەرێ ئەوە بۆچی ڕەنگت تێک چوو؟' شازادە گوتی: 'شتێکم بیر هاتەوە خەمباری کردم.' کچە گوتی: 'داوای یارمەتی لە سـوپای باوکت بکە و پەنا بۆ پاڵەوانەکانی بەرە.' شـــازادە گوتی: 'خەفەتی من بە ســوپای باوکم چارەی نایە.' کچە گوتی: 'ســـوود لە پاشـەکەوت و سـامانی باوکت وەرگرە.' شـازادە گوتی: 'بە ماڵ و سـامانی باوکیشـم هیچ ناکرێ.' کچە گوتی: 'تۆ پێت وایە کە خودایەک لە ئاسمان هەبێ و ببینێ، بەڵام ئەو نەبینرێ و توانای بەسـەر هەموو شتێکدا هەبێ؟' شازادە گوتی: 'بەڵێ. جگە لەو هیچ پەنایەکم نییە.' کچە گوتی: 'دەی داوای لێ بکە بەشکم لە چنگ من ڕزگارت بکا.'

" 'ئەوجار شـازادە ڕووی لە ئاسـمان کرد و بە دڵێکی خەمگینەوە گوتی: 'خودایە، تکات لێ دەکەم لەو بەڵایە ڕزگارم کە!' دەمودەسـت کچە کەوتە سـەر زەوی، سـووتا و وەک خۆڵەمێشی لێ هات. شازادە سپاسی خودای بەجێ هێنا و بە ئەسپەکەی غار دا تا وا بوو خودا فریای کەوت خستییە سەر ڕزگاری و گەیشتەوە شارەکەی. دوای بێهیواییەکی زۆر بە دیداری باوکی شـاد بووەوە. هەموو ئەم چۆرتمانەی بەسـەر شـازادەدا هاتن، بە هۆی بۆچوونی نادرووستی وەزیرەوە بوون کە دەیویست ئەو لەناو ببات، بەڵام خودای گەورە شـازادەی سـەر خسـت. جا گەورەم، من ئەم چیرۆکەم بۆیە بۆ گێڕایەوە تا بزانیت کە وەزیری ناخپیس دڵیان لە پاشـایان پاک نییە و چاکەیان پێ ڕەوا نابینن. جا پاشـام، تۆش گوێ لە قسەی وەزیر مەگرە و باوەڕ بە ستەمکاران مەکە!'

"پاشا کە قسەکانی کەنیزەکەی بیست، فەرمانی کوشتنی کوڕەکەی دا. ئەوجار وەزیری سێیەم کە لەوێ بوو، لاشیپانی دەرگەی دیوانی ماچ کرد و گوتی: 'پاشام، من چاکەخوازی تۆم و لەسـەرمە لە کاری ئاوا قورسدا ڕێنوێنیت بکەم. جا تۆ گوێ لە پەندی من بگرە و لە کوشـــتنی کوڕەکەت پەلە مەکە کە بینـایی چـاو و کوولەکەی ڕۆحتە. ئەگەری زۆرە

گوناحەکەی هەر زۆر بچووک بێ و ئەم کەنیزە لە لای تۆ وا زلی کاتەوە. هەر وەک ئەوەی کە خەڵکی دوو ئاوایی لەسەردڵۆپێ هەنگوین یەکدییان کوشت.' پاشا گوتی: 'دا دەی بۆم بگێرەوە بزانم چۆن بوو!'

## چیرۆکی دڵۆپە هەنگوینەکە

" بیستوومە کە ڕاوچییەک لە دەشت و دەر ئاژەڵی کێوی ڕاو دەکرد. ڕۆژێکیان لە قەڵەشتی کێوێک لەژێر بەردێکدا هەنگوینێکی زۆری دۆزییەوە. هەنگوینەکەی دەرهێنا، خیگەیەکی چکۆڵەی پێی بوو، کردییە ئەوەوە و دای بە کۆڵیدا و هاتەوە شار. جا ئەو ڕاوچییە سەگێکی هەبوو زۆری خۆش دەویست. ڕاوچی لەبەردەم دووکانێکدا ڕاوەستا و کەرەکی بوو هەنگوینی پێ بفرۆشێت. تۆزێکی هەنگوین دەرهێنا تا پیشانی بدا، دڵۆپێکی لێ داچۆڕایە سەر زەوییەکە. باڵندەیەکیش لەسەر هەنگوینەکەوە نیشتەوە. دووکاندارەکە پشیلەیەکی بوو کەوتە دوای باڵندەکە. سەگی ڕاوچییەکە بەدوای پشیلەکەدا ڕای کرد و گرتی. دووکاندار گورج هەڵمەتی بۆ برد و سەگی ڕاوچییەکەی کوشت. ڕاوچییەکەش پەلاماری دا و دووکانداری کوشت. ڕاوچی و دووکاندار هەریەکەی خەڵکی گوندێک بوون. خەڵکی ئەو گوندانە ئەم ڕووداوەیان بیستەوە. هاتن بۆ یارمەتییان و هەردووک لا گەیشتنە یەک و پێکیاندا دا. شیریان لێکدی هەڵکێشا و خەڵکێکی زۆر لەو شەڕەدا کوژرا.

## چیرۆکی برنجفرۆش

" 'پاشام دیسان لە بارەی فێڵی ژنانەوە بیستوومە، پیاوێک درەمێکی دا بە ژنەکەی برنج بکڕێت. ژنە درەمەکەی هەڵگرت و چوو بۆ دووکانی برنجفرۆش. برنجفرۆش درەمەکەی لێ وەرگرت و برنجی داێ، بەڵام بە ئامـاژە و هێمـاوە بەو ژنەی دەگوت: 'ئاخر برنج بە شەکرەوە باشە. ئەگەر شەکرت دەوێ، وەرە ژوورەوە و ماوەیەک لە لام دانیشە.' ژنە بەم قسانە نەرم بوو و خۆشی لە برنجفرۆش هات و چووە دووکانەکەیەوە. لەگەڵ برنجفرۆشدا دانیشت. برنجفرۆش بە ئاماژە بە بەردەستەکەی گوت کە بایی درەمێک شەکری بۆ بکێشە. بەردەستەکە پرێسکەکەی لە ژنە وەرگرت و ئەو برنجەی لە پرێسکەکەدا بوو، ڕۆی کرد و لەبریدا خێز و لە جێی شەکر خۆڵی بۆ تێ کرد. پرێسکەکەی بەست و لەوێ دایناَ. کە ژنە لای برنجفرۆش هاتە دەرێ، پرێسکەی هەڵگرت و بەرەو ماڵ بووەوە، وای دەزانی برنج و شەکری تێدایە.

" 'کە گەیشتە ماڵێ، پرێسکەکەی لەبەردەم مێردەکەی دانا و کردیەوە. تەماشایان کرد

هەموو خیز و خۆڵە. مێردەکەی گوتی: 'مەگەر دەمانەوێ ماڵەکەمان نۆژەن بکەینەوە وا بەرد و خۆڵت بۆ هێناوم؟' ژنە تێگەیشت کە برنجفرۆش فێڵی لێ کردووە و داوی بۆ ناوەتەوە. جا چونکە مەنجەڵیشی لەگەڵ خۆی هێنابووە ژوورەوە، بە مێردەکەی گوت: 'وەڵایی پیاوەکە، زۆر خەجاڵەتم لەوەی ڕووی داوە. دەبوو بێژنگ بێنم، کەچی مەنجەڵم هێنا.' مێردەکەی گوتی: 'کچێ، چی ڕووی داوە وا پەرێشان بووی؟' ژنە گوتی: 'ئەوەی ڕاستی بێ، ئەو درەمەی لەگەڵ خۆمم برد، لێم کەوت و شەرمم لە خەڵک کرد لەو کۆڵانە دانیشم و بەدوایدا بگەڕێم و دڵیشم نەهات هەر وا بە جێی بێڵم. ئیدی مەجبوور بووم خۆڵی شوێنەکەم کۆ کردەوە تا لە ماڵەوە دایبێژم. جا ئێستا چووم بێژنگ بێنم، مەنجەڵم هێنا.' ئەوجار هەستا چوو بێژنگی هێنا و دایە دەست مێردەکەی و پێی گوت: 'ئەم خۆڵە دابێژە؛ چاوی تۆ لە هی من حوکمی زیاترە. بەڵکو تۆ درەمەکە بدۆزیتەوە.' مێردەکەی دەستی بە خۆڵ دابێژتن و تۆز لە سەر و ڕیشی نیشت، نەشیدەزانی کە ژنەکەی فێڵی لێ کردووە. پاشام! ئەوەش فێڵێکە لە فێڵی ژنان. تۆ تەماشای فەرموودەی خودا گیان بکە کە فەرموویەتی: 'بە ڕاستی فێڵی ئێوەی ژنان گەورەیە!'[1] و 'ئەوەی ڕاستی بێت، فێڵی شەیتان لاوازە.'[2] ' پاشا کە پەندەی وەزیر و ئایەتەکانی بیست، بەرچاوی ڕوون و دڵی ڕۆشن بووەوە و بیری کوشتنی کوڕەکەی لە سەر دەرچوو. کە ڕۆژی چوارەم هات، کەنیز هاتە دیوانی پاشا و لاشیپانی دەرگای دیوانی ماچ کرد و گوتی: 'پاشای مەزن، من حەقی خۆمم بۆ تۆ ڕوون کردەوە. تۆ ستەمت پێ ڕەوا بینیم و حەقی منت لە کوڕەکەت نەستاندەوە. بەڵام بەم زووانە خودا سەرم دەخا و مافم دەستێنێ، هەر بەو جۆرەی شازادەی بەسەر وەزیرەکەی باوکیدا سەر خست و مافی ستاند.' پاشا گوتی: 'ئەو چیرۆکەشم بۆ بگێڕەوە بزانم چییە!'

### چیرۆکی کانی جادوویی

"کەنیزۆک گوتی: 'گەورەم، بیستوومە کە پاشایەک کوڕێکی هەبوو جگە لەو هیچ منداڵێکی دیکەی نەبوو. کاتێک ئەو کوڕە بوو بە چواردە ساڵ، باوکی کچی پاشایەکی بۆ هێنا کە زۆر دەلال و چەلەنگ بوو. ئەو کچەش مامێکی هەبوو کە چەند جار هاتبووە خوازبێنی بۆ کوڕەکەی، بەڵام کچە ڕازی نەبوو شوو بە ئامۆزاکەی بکا. جا کە ئامۆزاکەی بیستی کچەیان لە یەکێکی دیکە مارە کردووە، ئاگری ئیرەیی لە دڵیدا کڵپەی سەند و کەوتە بیری فێڵێکەوە. ڕۆژێکیان بە مێشکیدا هات کە دیارییەکی گرانبایی بۆ وەزیری ئەو پاشایە

---

[1]. بەشێک لە ئایەتی ٢٨ی سوورەتی یووسف.

[2]. بەشێک لە ئایەتی ٧٦ سوورەتی نیسائ.

ـیریت کە کچی ئامۆزاکەی شووی بە کوڕەکەی کردووە تا بۆ لەناوبردنی شازادە یارمەتی ـات. وا بوو ئاخری دیارییەکی شـــایســـتە و ماڵێکی زۆری بۆ نارد و داوای لێ کرد بە جورێک شـــازادە لە ناو بەرێت. یان کارێک بکا دڵی شـــازادە لەو کچە ســـارد کاتەوە و لە هینانی کچە پەژیوانی بکاتەوە. هەر بۆیە بە وەزیری گوت کە بێتوو ئەم کارەم بۆ بکەی، چەند بەرابەری ئەوانەت ماڵ و ســـامان دەدەمێ. ئەگەرنا لە خەم و خەفەت و ئیرەیییاندا ـەمرم. کە دیارییەکان گەیشـــتنە دەســـت وەزیر، قەبووڵی کرد و وەڵامی بۆ ناردەوە کە ئەرخەیان بە و خەمت نەبێ ئەوەی ویســـتووتە بۆت جێبەجێ دەکەم. کە چەند ڕۆژێک بەســـەر ئەم ڕووداوەدا تێپەڕی، باوکی کچە ناردی بەدوای شـــازادەدا تا کچەکەی پێ ســـپێرێ. نێردراو گەیشتە کن شازادە و پەیامی گەیاندێ. شازادە داوای مۆڵەتی لە باوکی کرد و باوکی ڕێی دا. ئینجا ئەو وەزیرەی دیارییەکانی لە ئامۆزای کچەوە پێ گەیشـــتبوو ـەگەڵ هەزار سواری ئازا و چالاک و دیاری و ماڵ و سامانێکی زۆر و کەژاوەی زێڕین و خیوەتی ئاوریشمیندا لەگەڵ شازادەدا نارد. بەو جۆرە وەزیر لەگەڵ شازادەدا کەوتە ڕێ و هەر لە بیری ئەوەدا بوو فێڵێکی لێ بکا تا وا بوو ڕۆژێکیان گەیشـــتنە چۆڵەوانییەک. وەزیر ـیری هاتەوە کە لە کێویکی ئەو نیزیکانەدا کانیاوێک هەیە کە "عەینی زەهرا"ی پێ دەڵێن و هەر پیاوێک لەو کانییە ئاو بخواتەوە، دەمودەست دەبێتە ژن. کە وەزیر ئەوەی بیر هاتەوە، فەرمانی بە سوپا دا لە بناری ئەو کێوەکەدا لا دەن و پشوویەک بدەن.

" 'دوای ماوەیەک وەزیر سوار بوو و بە شازادەشی گوت: 'ئەگەر پێت خۆشە وەر با ـچین ســـەرێکی ئەو لایانە بدەین و چاوێک بگێڕین.' شـــازادە گورج ســـوار بوو و لەگەڵ ـەزیر کەوت و ڕۆیشـتن بەبێ ئەوەی کەسیان لەتەکدا بێ. شـازادە نەیدەزانی چارەنووس بەرەو کوێی دەبا. ڕۆیشـتن ڕۆیشـتن تا گەیشـتنە کانییەکە. شـازادە لە ئەسپەکەی دابەزی، ـەست و دموچاوی لە کانییەکەدا شۆرد و لە ئاوەکەی خواردەوە. هێندەی بڵێی یەک و دوو بوو بە ژن. کە ئەمەی بۆ دەرکەوت، هاواری کرد و ئەوەندە گریا کە لە هۆش خۆی چوو. ـەزیر چووە کنی و بۆی گریا و پێی گوت: ' خودا خۆی فریات بێ! باشـــە ئەوە چۆنچۆن ـات لێ هات؟ باشـــە ئەوە بۆ وات لێ هات؟ ئەی هاوار خودایە ئەوە ئێمە دەچووین ژنت بۆ بینین. جا ئێستا کە تووشـی ئەو بەڵایە بووین دەبێ چبکەین، نازانم هەر لە سـەفەرەکەمان بەردەوام بین، یان بگەڕێینەوە؟ فەرمان فەرمانی تۆیە. هەرچی تۆ بڵێی، وا دەکەین.' شازادە گوتی: 'تۆ بگەڕێوە و باوکم لەم ڕووداوە ئاگادار بکەوە و من لێرە دەمێنمەوە و تا وەک خوم لێ نەیەتەوە نایەمەوە، جا یان چاک دەبمەوە یان لە داخان لێرە دەمرم.' ئەوجار شـازادە نامەیەکی بۆ باوکی نووسـی و لە بەســـەهاتەکە ئاگاداری کردەوە و دایە دەســـتی ـەزیر. وەزیر گەڕاوە بۆ لای پاشا و سوپا و دیارییەکانی لای شازادە بەجێ هێشت. وەزیر ـەوەی کە فێڵەکەی سـەری گرتبوو، کەیفی زۆر سـاز بوو. هەر وا ڕۆیشـت تا گەیشـتە لای

پاشا و لە بەسەرهاتی کوڕەکەی ئاگاداری کردەوە و نامەکەی دایێ. پاشا زۆر بۆ کوڕەکەی دڵی تەنگ بوو و گریا. گورج حەکیم و چارەزانانی بانگ کرد و باسی ئەو گرفتەی بۆ کردن کە بەسەر کوڕەکەیدا هاتبوو. هیچ کامیان وەڵامیان نەبوو. دوایی وەزیر نێردراوێکی نارد بۆ لای کوڕە مامی کچەکە و مژدەی ئەوەی دایێ کە بەسەر شازادەدا هاتبوو. کوڕە دڵخۆش بوو و ئەوەندەی دی تەماحی خوازبێنی ئامۆزاکەی گرتی و دیار و سامانێکی زۆری بۆ وەزیر نارد و سپاسی چاکەی کرد. بەڵام شازادە هەر لەسەر ئەو کانیاوە سێ شەو و ڕۆژ بەبێ خەو و خۆراک دانیشت و لەو چۆرتمەی بەسەریدا هاتبوو، پشتی بە خودا بەست.کە شەوی چوارەم هات، سوارێک کە لە شێوەی شازادەکاندا تاجێکی ڕازاوە بە گەوهەری بەسەرەوە بوو، پەیدا بوو و پرسی: 'کوڕە، کێ تۆی هێناوەتە ئێرە؟' شازادە بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕاوە و پێی گوت کە بۆ زەماوەند بەرەو شاری باوکی بووکێ دەڕۆیشتین و وەزیرەکەی باوکم منی هێنایە ئەم ئاقارە و لەم کانیاوەم خواردەوە و تووشی ئەم بەڵایە بووم.

" 'بە کورتی، شازادە گریا. کە سوارە قسەکانی بیست، بەزەیی پێیدا هات و پێی گوت: 'وەزیرەکەی باوکت تۆی تووشی ئەم گرفتاری و چەرمەسەرییە کردووە، چونکە لەنێو مرۆڤاندا جگە لەو کەس بەم کانییە نازانێ.' دوایی سوارەکە بە شازادەی گوت: 'لەگەڵم وەرە با بچین بۆ ماڵی ئێمە و ئەوشەو میوانم بە.' شازادە پێی گوت: 'پێم بڵێ تۆ کێی تا لەگەڵتدا بێم.' سوارەکە گوتی: 'من کوڕی پاشای جندۆکانم و تۆش کوڕی پاشای مرۆڤانی. خەمت نەبێ من دەتوانم لەو تەنگوچەڵەمەیە ڕزگارت کەم و ئەو خەمەت لە کۆڵ کەمەوە.' ئیدی شازادە سوپاکەی لەوێدا جێگیر کرد و بۆخۆی لەگەڵ کوڕی پاشای جندۆکاندا ڕۆیشت. تا نیوەشەو بەڕێوە بوون. ئەوجار کوڕی پاشای جندۆکان گوتی: 'دەزانی چەندەمان ڕێ بڕیوە؟' شازادە گوتی: 'نەوەڵا.' کوڕی پاشای جندۆکان گوتی: 'ڕێی ساڵێکمان بڕیوە.' شازادە واقی وڕ ما و گوتی: 'باشە من چۆن بگەڕێمەوە نێو خاک و هۆزەکەم؟' شازادەی جندۆکان گوتی: 'ئەوە کاری تۆ نییە و کاری منە. هەر ئەوەندەی تۆ ئەو خەمەت لە کۆڵ بێتەوە، من لە چاوترووکانێکدا دەتگەیەنمە هەر جێیەک تۆ بتەوێ و ئەمە بۆ من هەر زۆر ئاسانە.' کە شازادەی مرۆیان ئەم گوتەیەی لێ بیست، دڵی خۆش بوو و ئاهێکی بە بەردا هاتەوە و وای دەزانی خەو دەبینێ و دەیگوت: 'سوبحانەڵڵا لەو خودا بەدەسەڵاتە کە دەتوانێت چارەڕەش بەختەوەر بکا!

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و هەشتا و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! "شازادە ئەو قسەیەی زۆر پێ خۆش بوو. ئیدی هەروا بەردەوام ڕۆیشتن تا دەمەو بەیان گەیشتنە ناوچەیەکی سەرسەوزی خۆشی پڕ لە کانی و دار و باخ و مەلی دەنگخۆش و خانووی سەرنج ڕاکێش. شازادەی جنۆکان لە ئەسپەکە دابەزی و شازادەی مرۆیانی هێنا خوارێ. قۆڵی گرت و چوونە یەکێک لە کۆشکەکانەوە. لەوێ پشایەکی سەنگین و شکۆمەندیان بینی. ئەو ڕۆژەیان لای ئەو بە خواردن و خواردنەوە بەسەر برد و کە شەو داهات، شازادەی جنۆکان هەستا و لەگەڵ شازادەی مرۆیاندا سوار بوون. ئەو شەوە هەتا بەیان بە چوارناڵە ڕۆیشتن. لای بەیانی گەیشتنە ناوچەیەک کە زەوییەکی ڕش و برش و تەقتەقانی بێ ئاو، کە تەنانەت بەردەکانیشی ڕەش بوو. تۆمەز بەشێک لە دۆزەخ بوو. شازادەی مرۆیان پرسی: 'ئێرە کوێیە؟' شازادەی جنۆکان گوتی: 'ئێرە دەهمای پێ دەڵێن و پاشاکەی ناوی زولجەناحەینە[1] و گەورەترین پاشای جنۆکانە. هیچ کەس ناتوانێ زەفەری پێ ببات و هیچ کەسیش ناتوانێ بەبێ مۆڵەتی ئەو بێتە ئێرە. هەر لێرە بوەستە تا دەستوور وەردەگرم.' شازادەی مرۆیان وەستا. شازادەی جنۆکان ماوەیەک دیار نەما. دوایی هاتەوە. لەگەڵ شازادەی مرۆیاندا کەوتنە ڕێ تا گەیشتنە کانیاوێک کە لە کێوێکی ڕەشەوە سەرچاوەی دەگرت. شازادەی جنۆکان شازادەی مرۆیانی لە ئەسپەکە هێنا خوارێ و پێی گوت: 'لەم ئاوە بخۆوە.' شازادەی مرۆیان خواردیەوە و دەمودەست بووەوە بە پیاو. لە خۆشیان خەریک بوو بفڕێ، لە ڕادەبەدەر خۆشحاڵ بوو و لە شازادەی جنۆکانی پرسی: 'برا گیان، ئەم کانیاوە ناوی چییە؟' گوتی: 'ناوی کانیاوی ژنانە. ئەم کانیاوە ژن نییە لێی بخواتەوە نەبێتە پیاو. دەی ئێستاکە سپاسی خودا بەجێ بێنە و سواری ئەسپەکە بە.' شازادەی مرۆیان سپاسی خودای کرد و سورای ئەسپەکە بوو. ئەوەندەی پێیان کرا تیژتر ئاژۆتیان تا شەو داهات. شازادەی جنۆکان گوتی: 'پێتخۆشە ئەمشەو بتبەمەوە لای خزم و کەسەکانت؟' شازادەی مرۆیان گوتی: 'ئەرێ وەڵا لەخودام دەوێ و زۆریشم پێ خۆشە!'

" 'ئەوجار شازادەی جنۆکان یەکێک لە کۆیلەکانی باوکی بانگ کرد کە ناوی ڕاجز بوو و پێی گوت: 'هەر ئێستا ئەم لاوە لە کۆڵ دەکەیت و پێش ئەوەی تاو هەڵێ دەیگەیەنیتە لای خەزووری و دەسگیرانەکەی.' کۆیلەکە گوتی: ' بەسەر چاو.' ئیدی کۆیلەکە بوو بە نرناشێک و شازادەی مرۆیان لێی ترسا. شازادەی جنۆکان پێی گوت: 'مەترسە، زیانی بۆت نابێ.' ئیدی شازادەی مرۆیان لە ئەسپەکە دابەزی و چووە کۆڵی نرناشەکە و چاوانی

---

[1] زولجەناحەینە: دووباڵ.

نووقاندن. نرناش هەڵفڕی و بە هەوادا ڕۆیشت ڕۆیشت هێشتا سێیەکی شەوی کابوو گەیشتنە کۆشکی خەزووری شازادە و لەوێ هاتنە خوار. نرناش بە شازادەی گوت: 'دابەزە و چاوت بکەوە، ئێرە کۆشکی ماڵە خەزوورانتە.' شازادە چاوی هەڵێنا. لە چاوتروکانێکدا نرناشەکە ون بوو. کە ڕۆژ بووەوە شازادە ترسی ترسی شکا و لە سەربانی کۆشک هاتە خوارێ. لە هاتنەخوارێدا خەزووری دیتی، لە بەری هەستا و بە پیرییەوە چوو. پێی سەیر بوو، کە چۆناوچۆنە لە سەر بانی کۆشکەوە هاتە خوارێ. ئیدی خۆی پێ ڕانەگیرا و گوتی: 'تا ئێستا باو بووە خەڵک لە دەرگاوە دێنە ژوورێ ئەوە چۆناوچۆنە تۆ لە ئاسمانەوە دێی؟' شازادە سەربوردەی خۆی بۆ گێڕاوە. پاشا زۆری پێ سەیر بوو. خۆشحاڵ بوو لەوەی لەو بەڵایە ڕزگاری ببوو. کە ڕۆژ بووەوە، پاشا بە وەزیرەکەی گوت کە خەڵک نان دەن و ئاهەنگ بگێڕن. دوایی بەزم و ئاهەنگ ساز کرا و شازادەیان لەگەڵ دەستگیرانەکەیدا ناردە پەردەوە. تا دوو مانگ لەوێ ماوە و دوای ئەوە گەڕاوە شاری خۆیان.

" 'ئامۆزای کچەش لە ئێرەیی و بەرچاوتەنگیدا دیقی کرد. شازادەش بە باوکی خۆی شاد بووەوە و پشتی وەزیری لە زەوی دا. جا پاشام، هیوادارم تۆش بە سەر وەزیرەکەتدا زاڵ بی و نەهێڵی مافی من پێشێل بکرێ. پاشا کە ئەم قسانەی بیست، فەرمانی کوشتنی کوڕەکەی دا."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و هەشتا و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! پاشا فەرمانی کوشتنی کوڕەکەی دا. ئەوجار وەزیری چوارەم هاتە پێشــی و لاشــیپانی دەرگای دیوانی ماچ کرد و گوتی: 'قوربان، تکایە لە بڕیاردا پەلە مەکە. پیاوی ژیر نابێت کارێک بکا کە دوایە تووشی پەشیمانی بێ. پێشینییان گوتوویانە: 'شەیتان پەلەی کرد، چاوی خۆی کوێر کرد.' گەورەم، لەبارەی کەڵەکوکولۆکی ژنانەوە بەسەرهاتێکم بیستووە. ئەگەر ڕێم بدەی بۆت دەگێڕمەوە.' پاشا گوتی: 'دا بیگێڕەوە بزانم چۆنە.'

### چیرۆکی ژنێکی جوان و کوڕێکی گەنج و پیرەژنێک

"وەزیر گوتی: 'قوربان، بیســتوومە ژنێکی جوان و شــەنگ و شــەپاڵ هەبوو، ڕۆژێک هەرزەکارێـک چـاوی پێی دەکەوێ و ئۆگری دەبێ. ئەو ژنەش، ژنێکی داوێنپـاک بوو، چ ملاباتێکی نەدەدا بە کوڕە. بە هەڵکەوت ڕۆژێکیان مێردی ئەو ژنە چوو بۆ ســـەفەر. کوڕە هەموو ڕۆژێ کەســـێکی لێ ڕا دەســـپارد و پێی دەگوت. ژنە بە هیچ جۆرێک بە هێندی نەدەگرت. تا وا بوو ئەو لاوە چووە لای پیرەژنێکی دراوسێیان. هەموو هەست و سۆز و کەفوکوڵی لاوێتی بۆ باس کرد و تکای لێ کرد کارێکی بۆ بکا. پیرەژنە گوتی: 'هەی لە منت نەکەوێ جا ئەوە چییە بەڵێن بێ بۆت جێبەجێ دەکەم.' ئەوە بوو کوڕە دینـارێکی دایێ و چوو بە لای کاری خۆیەوە. بۆ بەیانییەکەی، پیرەژنە چووە کن ژنەی داوێنپاک و خۆی لێ نیزیک کردەوە. هەموو ڕۆژێ بە بۆنەیەکەوە ئاموشۆیی دەکرد و فراوێن و شێوی لای ئەو دەخوارد و خواردنی بۆ منداڵەکانیشــی دەبردەوە. گاڵتە و یاریی لەگەڵ ئەو ژنەدا دەکرد و دەیخستە کەنین تا وا بوو بە جۆرێک هۆگری خۆی کرد کە ئەو ژنە بۆ ساتێکیش بەبێ ئەو هەڵینەدەکرد. کاری پیرەژنە ئەوە بوو هەر ڕۆژێک کە لەو ماڵە دەهاتە دەرەوە، نانێکی لە ڕۆن هەڵدەسوو و بیبەری پێوە دەکرد و دەرخواردی سەگێکی دەدا. ماوەیکی زۆر ئەمەی لەگەڵ ئەو سەگەدا دەکرد تا دەسەمۆی کرد و دەچووە هەر جێیەک، سەگە بەدوایەوە بوو. ئەوە بوو ڕۆژێکیـان پیرەژن بیبەرێکی زۆری بە نـانە چەورەکەوە کرد و دەرخواردی ســەگەی دا. کە ســەگە خواردی، هێندە تیژ بوو ئاوی لە چاوی هات و کەوتە دوای پیرەژن و هاتە ماڵی ئەو ژنە. ژنە کە ســـەگەی بە چاوی فرمێســـکاوییەوە بینی، وای زانی دەگری. پێی ســەیر بوو، لە پیرەژنەی پرســی: 'دایە، ئەو ســەگە بۆ دەگری؟' پیرەژن گوتی: 'کچم، ئەوە بەسەرهاتێکی خۆشــی هەیە با بۆت بگێڕمەوە: ئەم سەگە کچێکی مانگڕوو بوو و بۆ من لە جێی خوشک بوو. لاوێک چاوی پێی کەوت و شەیدای ناسکی و دەلالییەکەی بوو و لە تاو ئەوینی ئەو حاڵی تێک چوو و کەوتە جێ. چەند جار خەڵکی ناردە لای بەشـــکوو

بەزەیی پێیدا بێ، بەڵام دڵرەقی نواند و بەزەیی بەو لاوەدا نەهات. من مۆچیاریم کرد و گوتم: 'خوشکێ، لەگەڵ ئەو کورەدا نەرم بە و بەزەییت بە حاڵیدا بێتەوە.' کەچی قسەی منی نەبیســـت تا وا بوو کورە ئارامی برا و لای یەکێک لە دۆســـتەکانی کە جادووگەر بوو، سـکاڵای کرد. ئەویش جادووی لە کچە کرد و کردیە سـەگ. دوای ئەوەی ئاوای لێ قەوما، جگە لە من لە کەســی را نەدەی پەنای بۆ بەرێ، هەر بۆیە هاتە ماڵەکەم و دەسـت و پێمی ماچ کرد و لالایەوە. منیش ناسیمەوە و گوتم: 'زۆرم پێ گوتی بە گوێت نەکردم؟

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و هەشتا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! 'پیرەژن بەسەرهاتی ئەو سەگەی بۆ ژنە گێڕاوە و گوتی: 'بەڵام، کچی خۆم، کە من ئەوم لەو حاڵەدا دی، بەزەییم پێیدا هات و دڵم بۆی سووتا. ئیدی لای خۆم ڕامگرت و ئەوە لەو کاتەوە لەو حاڵەدایە کە دەیبینی. هەر کاتێ ئەو سەردەمەی بیر بێتەوە، بۆ خۆی دەگری.' کە ژنە گوتەکانی پیرەژنەی بیست، زەندەقی چوو و گوتی: 'دایە، بە خودا منیشت ترساند!' پیرەژن گوتی: 'ئەیە ڕۆ کچم، لە چی دەترسی؟' ژنە گوتی: 'دایە، کوڕێکە عاشقم بووە و ئەو تا ئێستا زۆر کەسی لێ ڕاسپاردووم و وەڵامم نەداوەتەوە. جا ئێستا ترسی ئەوەم هەیە ئەوەی بەسەر ئەم سەگەدا هاتووە، بەسەر منیشدا بێ.' پیرەژن گوتی: 'وەی ڕۆ کچم، ئەی هاوار! دڵی ئەو لاوە مەشکێنە، من خەمی تۆمە. ئەگەر دەزانی بە جێ و ڕێی نازانی، پێم بڵێ دەنکێکی چۆنە بەشکوو بیبینمەوە و بیهێنمە لات. هەرگیز مەهێڵە دڵی کەست لێ بێشێ.' بەو جۆرە ژنەی چارەڕەش فریوی فێڵەکانی پیرێژنەی خوارد و دەستی کرد بە پەسنی کوڕە و پێی گوت دەنکێکی چۆنە. پیرێژنەش وای خۆ لە گێلی نابوو دەتگوت قەتی نەدیوە و نایناسێ. ئیدی بە ژنەی گوت: 'هەر لێرە بچمە دەرێ، بەدوایدا دەگەڕێم و دەیبینمەوە بۆت دەدۆزمەوە.'

" 'ئەوجار پیرەژنە ماڵاوایی لە ژنە کرد و هەستا هاتە دەرێ. بە تاڵووکە چووە لای لاوەکە و پێی گوت: 'چاو و دڵت ڕوون، مزگێنیم دەیە، چوومە بن ژنەوە و ڕازیم کرد. سبەینێ لای فراوین وەرە لەسەر سووچی کۆڵانەکەیان ڕاوەستە تا من دێمە لات و دەتبەمە لای. ئیدی بۆخۆت هەتا سبەینێ بەیانی هەر لە پاڵ ئەو گراوە شەکرلێوەدا بە خۆشی و ڕایبوێرە.'

" 'لاوەکە دڵی بەم قسەیە زۆر خۆش بوو و دوو دیناری زێڕی سووری دا بە پیرەژنەکە و گوتی: 'هەر کاتێک بە کامی دڵم گەیشتم، دە دیناری دیکەت دەدەمێ.' پیرەژن دەمودەست گەڕاوە لای ژنە و پێی گوت: 'چووم گەڕام و کوڕەم دیتەوە وادیار بوو زۆرت لێ تووڕە بوو، نیازی بوو زیانت پێ بگەیەنێ. زۆری لێ پاڕامەوە تا دڵیم چا کردەوە. سبەینێ بۆ فراوین لای تۆ دەبێ.' ژنە دڵی خۆش بوو گوتی: 'دایە، ئەگەر بێتوو دڵی چا بووبێتەوە و سبەینێ بێتە لام، ئەوە دە دیناری زێڕی سوورت دەدەمێ.' پیرەژن گوتی: 'کاری وا بە من بسپێرە و خەمت نەبێ.'

"کە بۆ سبەینێ هات، پیرەژن بە ژنەی گوت: 'تۆ خواردنێکی خۆش لێبنێ و جوانترین جلەکانت لە بەر بکە، با من بچم بەدوایدا و بیهێنم.' ژنە گورج هەستا چێشتی لێنا و خۆی تیفتیفە دا. پیرەژنە چوو لە سەر کۆڵانەکە ڕاوەستا و چاوەڕێ بوو کوڕە لە کاتی خۆیدا نەهات، لە دڵی خۆیدا گوتی: 'باشە ئەوە هات و ئەو کوڕە هەر نەیە من چی بکەم؟ خۆ ئەو

ژنەش لە خۆڕا زیڕەکانم ناداتێ! ئیستێک مات بوو ئینجا لە دڵەوە گەشاوە بە و خۆی گوت: کچێ خۆ دەست نییە لە گۆزەدا مابێ دەچم پیاوێکی دیکەی بۆ دەخەمە داوە و بۆی دێنم.'

" 'ئیدی پیرەژن بەم نیازەوە بە کۆلاناندا دەگەڕا وا بوو لاوێکی قۆز و پێکەوتەی بینی کە کاریگەریی سەفەر بە ڕوخسارییەوە بوو و لێی چووە پێشێ و گوتی: 'لاوۆ، حەزت لە چێشتی خۆش و کچی جوان هەیە؟' لاوەکە گوتی: 'جا ئەوە پرسیاری دەوێ؟ کێ هەیە حەزی لێی نەبێ؟ ئەوانە لە کوێ دەست دەکەون؟' پیرەژن گوتی: 'لە ماڵی من.' لاوەکە لەگەڵ پیرێژنە کەوتە ڕێ و پیرەژن نەیدەزانی کە ئەو لاوە مێردی هەمان ژنەی داوێنپاکە. ئەوە بوو گەیشتنە ماڵەکە و پیرەژن لە دەرگەی دا. ژنەکە دەرگای کردەوە. پیرەژنە چووە ژوورەوە، ژنەش بێ ئەوەی چاویان لێ بکا ڕایکرد، دەستێک بە ولاتدا بێنێ. کە لاوەکەی هێنایە ماڵەوە و ژنە چاوی بە پێی کەوت، دیتی ئەوە مێردەکەیەتی. چووە پێشێ و پێڵاوی مێردەکەی داکەند و پێی گوت: 'مەگەر بەڵێنمان وا نەبوو کە تۆ کەسم بەسەردا هەڵنەبژێری و ناپاکیم لێ نەکەی؟' مێردەکەی گوتی: 'چ ناپاکییەکم کردووە و کێم بەسەرتدا هەڵبژاردووە؟' ژنە گوتی: 'کە من زانیم هاتوویتەوە، ویستم تاقیت بکەمەوە و ئەو پیرەژنەم نارد تا پێشینیاری شوێنێکی ئاوات داتێ و تۆش لەگەڵی کەوتی. ڕاست ڕووت لەو شتەکە کرد کە من لێی دەترسام و ناپاکیتم بۆ دەرکەوت. بەر لەمە وام دەزانی داوێنپاکی، ئێستا کە تۆم لەگەڵ ئەم پیرەژنەدا دی، بۆم دەرکەوت کە لەو کارانەش ناپرینگێیەوە.'

" 'بە کورتی، هەر ژنە بە تا کەوش لە سەری کابرای دەدا و ئەویش سوێندی دەخوارد: کە قەتقەت کاری وای نەکردووە. هەر سوێندی دەخوارد و ژنەش لێی دەدا و دەگریا و هاواری دەکرد و دەیگوت: 'هۆ خەڵکینە وەرن بزانم چی کردووە.' پیاوەکەش دەستی دەخستە سەر دەمی تا دەنگی نەڕوات. ژنە گازی لێ دەگرت و پیاوەکە لە بەری دەپاڕاوە و دەست و پێی ماچ دەکرد، بەلام ژنە قایل نەدەبوو و دەستی لە لێدانی هەڵنەگرت تا بە ئامازەی پیرەژن وازی هێنا.

" 'ئەوجار پیرەژن هاتە پێشێ و دەست و پێی ژنەی ماچ کرد و لای مێردەکەیەوە داینیشاند. کە هەردووکیان دانیشتن، پیاوەکە دەستی پیرەژنی ماچ کرد و پێی گوت: 'ماڵت ئاوەدان بێ فریام کەوتی و لە دەست ئەو ژنەت ڕزگار کردم.' سەیر لەودا بوو، پیرەژن سەری لە ئاینوئۆینی ئەو ژنە سووڕ ما بوو. پاشام، سەیری فێڵی پیرەژن و داوی ژن بکە و خۆت لە ئاینوئۆینیان بپارێزە.' کە پاشا ئەو قسانەی بیست، لە کوشتنی کوڕەکەی پاشگەز بووەوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و هەشتا و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! بۆ ڕۆژی پێنجەم کەنیزۆکەکە لە بارەگەی پاشـــا ئامادە بوو و پیالەیەک ژەهریشی بە دەستەوە بوو. دەستی کرد بە تکا و ڕەجا و لە خۆ دان خۆ ڕنین و گوتی: 'گەورەم، ئەگەر ویژدانت نەخەیتە کار و هەقم لە کوڕەکەت بۆ نەســێنی، ئەم پیالە ژەهرە دەخۆمەوە و خۆم دەکوژم و ڕۆژی قیامەت ئۆبالْم بە ئەســتۆی تۆ دەبێ، مادەم وەزیرەکانت ئاوا من بە فێڵ و کەڵەکەبازی تاوانبار دەکەن. لە دونیادا فێڵبازتر لە پیاوان نییە. پاشـــام، مەگەر چیرۆکی کابرای زێڕنگەر و کیژەکەت نەبیســـتووە؟' پاشـــا گوتی: 'کەنیزۆک، دا بیگێڕەوە، بزانم چۆن بووە.'

### چیرۆکی کابرای زێڕنگەر و کیژۆڵەکە

" 'کـابرایەکی زێڕنگەر ئـالوودەی مەی و دڵـداری بوو. ڕۆژێـک لە ڕۆژان لە مـاڵی هاوڕییەکی وێنەی کیژێکی بینی بە دیوارەکەوە کێشـــرابووەوە کە هیچ چاوێک جوانتر و پاکتر لەو ســـیمایەی نەدیبوو. زێڕنگەر جوان لێی ورد بووەوە و ســـەری جوانییەکەی ســـوورِم و تەواو حەپەسـا و خۆشەویستیی ئەوی کەوتە دڵەوە. ئیدی شـەو و ڕۆژ لە بیر ئەو کچەدا بوو خۆی دەخواردەوە و ئاخی بۆ هەڵدەکێشـــا تا نەخۆش کەوت و ئەوەندەی نەما بمرێ. یەکێک لە هاوڕێکانی هات بۆ لای و هەواڵی پرســـی. زێڕینگەرەش گوتی: 'کاکە گیان، من نەخۆشی دەستی ئەو کیژەم وا وێنەکەی بە دیواری ماڵی فڵان هاوڕێمانەوە بوو.' هاوڕێکەی کەمێکی بەســـەردا هات و گوتی: بە خودا تۆش گەوجی. ئاخر چۆن مرۆڤی ژێر شیدای وێنەیەکی ڕەق و تەق و بێ گیانی سەر دیوار دەبی؟!' زێڕنگەر گوتی: 'ئاخر دەزانم ئەو وێنەکێشە هەر لە خۆیەوە ئەو وێنەیەی نەکێشاوەتەوە و لە کاتی کێشانەوەیدا سیمای ئافرەتێکی جوان و دەلالی هێناوەتە زەینییەوە کە بوونی هەیە.' هاوڕێکەی پێی گوت: 'دەی گاهەس ئەو کەســـەی کێشـــاویەتی، هەر خۆی دایهێنابێ.' زێڕنگەر گوتی: 'هەر کامیان بێ، خۆ خەریکە من لە ســـوێی دەمرم. جا ئەگەر وێنەی ئەوە لە دنیادا هەیە، داوام لەو خودایە ئەوەیە نەم کوژێ تا دەیبینم.'

" 'ئەوجار هاوڕێکانی کەوتنە سـۆراغی وێنەکێش. وێنەکێش چووبوو بۆ شـارێکی دیکە. نامەیەکیان بۆ نووســـی و هەواڵی هاوڕێکەیان دایێ و لێیان پرســـی کە داخۆ ئەو وێنەیە خۆت داتهێناوە یان لە دنیادا هاوشـێوەیەکی هەیە. وێنەکێش لە وەڵامدا نووسـیی: 'من ئەو وێنەیەم لەسەر شێوەی کەنیزێکی گۆرانیبێژ کێشاوەتەوە کە کەنیزی وەزیرێکە کە ئێستا لە شاری کشمیرە.' کە کابرای زێڕنگەر ئەو هەواڵەی بیست، لە وڵاتی فارسەوە سەری خۆی

هەڵگرت و بەرەو هیندستان کەوتە ڕێ. دوای تەنگ و چەڵەمەیەکی زۆر گەیشتە ئەو شارە. ڕۆژێکی چووە لای عەترفرۆشێک کە خەڵکی ئەوێ بوو، پیاوێکی ژیر و وریا بوو. زێڕنگەر لای عەترفرۆش دانیشت و لەبارەی پاشای ئەو شارە و خووخدەیەوە پرسیاری لێ کرد. عەترفرۆش گوتی: 'پاشاکەمان دادگەر و ڕەوشتبەرزە. زۆر قینی لە جادووگەرانە. ئەگەر جادووگەرێکی بکەوێتە دەست، دەیبا لە دەرەوەی شار لە چاڵێکدا بەندی دەکا تا لە برسان بمرێ.' دوایی زێڕنگەر هەواڵی وەزیر و خوو و خدەیی پرسی. عەترفرۆش باسی ڕەوشت و هەڵسوکەوتی وەزیری کرد تا باس چووە سەر کەنیزی گورانبیێژ. عەترفرۆش گوتی ئەو کەنیزەش لای فڵان وەزیرە. کابرای زێڕنگەر هەتا چەند ڕۆژ هەر لە بیری ئەو کەنیزەدا بوو تا شەوێک لە شەوان بوو بە با و بۆران و هەورەتریشقەیەکی زۆر توند. زێڕنگەر جلی دزانی پۆشی و بەرەو ماڵی وەزیر چوو. گوریس و قولاپی هەڵدایە سەر دیواری حەوشەکەیان و پێیدا هەڵگەڕا و چووە سەرێ و لەوێوە چووە حەوشەکەیانەوە. هەموو کەنیزەکانی بینی کە هەریەکەی لەسەر تەختێک نووستبوون، بەڵام کەنیزێکیان بە تەنیا لەسەر تەختێکی مەڕمەڕ نووستبوو و تەوێڵی وەک مانگی چواردە شەوقی دەداوە. هەڵوێستی گرت بچێتە لای ئەوەیان و چووە ژوورسەری و دیتی، دوو مۆمی عەنبەرین لە مۆمدانی زێڕیندا لای سەر و قاچی کەنیزەدا داییسێن و لەژێر تەختەکەشدا سندووقێکی چکۆلەی زیوینی لێیە کە گشت زێڕ و زیوی کەنیزەکەی تێدایە. ئەوجار زێڕنگەر چەقۆیەکی دەرکێشا و سمتی کەنیزەکەی پێ بریندار کرد. کەنیز لە ترساندا داچڵەکا. کە ئەو پیاوە بێگانەی لە جێگەکەیدا بینی، لە حەیەبەتی گیانی خۆی دەنگی دەرنەهات. بێدەنگ بوو و وایزانی دزە و نیازی ئەو خشڵانەی هەیە. پێی گوت: 'ئەم سندووق بە هەر چییەکەوە لەنێویدایە بۆ تۆ، بەس مەمکوژە و کوشتنم هیچ سوودت پێ ناگەیەنێ.' زێڕنگەر دەمودەست سندوقەکەی لێ وەرگرت و گەڕاوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و هەشتا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خـاوەنشـــکۆ! 'زێڕنگەر ســــندووقەکەی هەڵگرت و گەڕاوە. کە ڕۆژ بووەوە، جلەکانی خۆی کردە بەری، سندووقەکەی هەڵگرت، چووە لای پاشای شارەکە و کوڕنۆشی برد و گوتی: 'گەورەم، من خێر و خۆشـیم بۆ تۆ دەوێ و خەڵکی خۆراسـانم. کە ناوبانگی ڕەوشتبەرزی و دادگەریی تۆم بیست، پێم خۆش بوو لەژێر سایەی تۆدا بم. لە خۆراسانەوە کۆچم کرد و هاتمە خزمەت تۆ. دەمەو ئێوارە گەیشتمە ئەم شـارە و دەروازەکە داخرابوو. لە دەرووەی شار خەوتبووم، هێشتا باش خەوم لێ نەکەوتبوو، لە نیوەخەودا بووم، هەستم کرد دەنگێک هات، تەماشـام کرد، چوار ژنن، کە دوانیان سـواری گسـکێک و دوانەکەی دی سـواری باوەشێنێک[1] ببوون. زانیم ئەوانە جادووگەرن و دێن بۆ شارەکەی تۆ. یەکێکیان لێم نیزیک بووەوە و نووکە شـەقێکی لێ دام بە بەو کلکە ڕێوییەی بە دەستییەوە بوو، لێی دام. منیش ئێشـــم پێ گەیشـــت و تووڕە بووم، چەقۆیەکم پێ بوو دامهێنایە، ســـمتی گرت و برینداری کرد. گورج پشتی تێ کردم و بۆی دەرچوو. کاتی هەڵاتن ئەم سندووقە بچووکەی بە شتەکانی نێوییەوە لێ کەوت. منیش سندووقەکەم هەڵگرتەوە و کردمەوە و سـەیرم کرد ئەو شـــتە بەنرخانەی تێدا بوو. قوربان، ئەمەم لێ وەربگرە، ئاخر من پیاوێکی گەشـــتیار و گەڕۆکم و پێویسـتم پێیان نییە. خۆشـەویسـتی دنیاییم لە دڵم دەرهاویشـتووە و چاوم لە مـاڵی دنیا نییە. جگە لە خودای گەورە پەکم بە کەس نەکەوتووە.' ئیدی ســـندووقەکەی لەبەردەم پاشادا دانا و گەڕاوە.

" 'دواتر پاشـــا ســـەری ســـندووقەکەی هەڵگرت، خشـــڵەکانی دەرهێنا و لە نێویاندا ملوانکەیەک کە خۆی بە دیـاری دابووی بە خـاوەنی ئەو کەنیزە، دەرکەوت. خێرا داوای وەزیری کرد. کە وەزیر هات، پێی گوت: 'جوان سەیری ئەم ملوانکەیە بکە. مەگەر ئەمە هەر ئەوە نییە کە من بە دیاری بۆم ناردی؟' کە وەزیر ملوانکەکەی دی، ناســـییەوە و گوتی: 'بەڵێ، خۆیەتی. منیش بە دیاری دام بەو کەنیزە گۆرانیبێژەم.' پاشـا گوتی: 'هەر ئێسـتا ئەو کەنیزەم بۆ بێنە ئێرە.' وەزیر چوو کەنیزی هێنا. ئەوجار پاشا بە وەزیری گوت: 'دا سەیری سمتی بکە بزانە برینێکی پێوەیە یان نا.' وەزیر سەیری کرد، بینی برینی چەقۆیەکی پێوەیە. وەزیر گوتی: 'قوربان، برینی چەقۆیەکی پێوەیە.' پاشـــا گوتی: 'ئەم کەنیزە جادووگەرە و ئەوەی ئەو کابرا تەرکەدنیا پێی گوتم ڕاست بوو.' پاشـا فەرمانی دا کەنیزەکە بخەنە چاڵی جادووگەرانەوە. هەر ئەو ڕۆژە خســـتیانە چاڵەکەوە. کابرای زێڕنگەر ئاگای لە ڕووداوەکە بوو. کە تاریک داهات، چوو بۆ لای پاســـەوانی چاڵەکە و کیســـەیەکی لەگەڵ خۆی برد کە

---

[1]. باوەشێنی ئەودەم گەورە بوو. کەسێک بە دوو دەست هەڵیدەگرت و پادشای پێ باوەشێن دەکرد. ـ وەرگێڕ

هەزار دیناری زێڕی سوور تێدا بوو و لەگەڵ پاسەواندا تا سێیەکی سەرەتای شەو قسەی کرد. دوایی گوتی: 'کاکە، ئەم کەنیزە لەو ڕووداوە بێگوناحە و من تووشـــم کرد.' ئیدی چیرۆکەکەی بۆ گێڕاوە و پێی گوت: 'کاکی خۆم، ئەم هەزار دینارە زێڕەم لێ وەرگرە و لێم گەڕێ با لەگەڵ خۆم بیبەم بۆ شـــارەکەی خۆم. خۆ ئەم کەنیزە بمرێ هیچ قازانجێک بە تۆ ناگا.' کە پاسەوان چیرۆکەکەی بیست، سەری لەو فێڵە سووڕ ما و کیسەکەی لێ وەرگرت و کەنیزی دایە و مەرجی بۆ دانا کە بۆ ساتێک لەو شارە نەمێنێتەوە. دەمودەست زێڕنگەر دەسـتی کەنیزەی گرت و بە تاڵووکە لەو شـارە دەرچوون و یەکسـەر هەتا شـارەی خۆی ڕانەوەستا لەوێ بە خۆشی و شادییەوە پێکەوە ژیان. جا گەورەم، سەیری فڕوفێڵی پیاوان بکە. ئەگەر ئەمڕۆ وەزیرەکانت ناهێڵن تۆ دادم بسـتێنی، ئەوا خۆ سـبەینێ من و تۆ لە پێش دادوەرێکی دادگەردا ڕادەوەسـتین و ئەو هەقم دەسـتێنێ.' کە پاشـا ئەم قسـانەی کەنیزی بیســت، فەرمانی کوشـتنی کوڕەکەی دا. ئەوجار وەزیری پێنجەم هاتە پێشـێ و لاشـیپانی دەکری دیوانی ماچ کرد و گوتی: 'گەورەم، پەلە مەکە کە پەلەکردن پەشـــیمانی لە دوایە. ئاخر دەترسـم پەشـیمان ببیتەوە وەک پەشـیمانبوونەوەی ئەو کابرایەی تا کۆتایی تەمەنی پێنەکەنی.' پاشا گوتی: 'وەزیر، بۆ تا مرد پێنەکەنی دا بۆم بگێڕەوە.'

### چیرۆکی کابرای خەمبار

"وەزیر گوتی: 'گەورەم، بیســتوومە کابرایەک لە خانەدانە گەورەکان کە خاوەنی ماڵ و ســـامان و خزمەتکار و کۆیلە و کەنیزی زۆر بوو، مرد و کوورێکی لە پاش بەجێ ما. کە ئەو کوڕە گەورە بوو، دەســـتی دایە عەیش‌ونۆش و ڕابواردن و خۆشـــگوزەرانی و خەرجکردنی ئەو سامانەی لە باوکیەوە بۆی بەجێ مابوو. ئاوا سەری لەوەدا بوو تا ئەوەی کە هەموو سامانەکەی تەواو بوو.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# شەوی پێنجسەد و هەشتا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خـاوەنشــــکۆ! 'ئەو کوڕە بە تەواوی ســــامانی بـاوکی بە فیڕۆ دا. کۆیلە و کەنیزەکانیشــی فرۆشــت ئیدی هیچی نەما. لەگەڵ کرێکاراندا دەچووە کار. ســالانێک لەم ـەوشـەدا بوو تا ڕۆژێکیان لە پەنای دیوارێکدا دانیشـت و چاو لە ڕێ بوو تا یەکێک بێ و ـە کرێکاری بگرێ. لەپڕ پیاوێکی جوانچاک و پاک و خاوێن هات و ســلاوی لێ کرد. کوڕە ـلامی سلاوەکەی داوە و گوتی: 'مامە، پێشتر منت دەناسی.' پیاوەکە گوتی: 'نە وەڵا کوڕم. قەتم نەدیوی، بەڵام نیشــانەی گەورەیی و خانەدانیم تێدا بینیت. هەر لەبەر ئەوە ســلام لێ کردی.' لاوەکە گوتی: 'مـامە، کارێکی وات هەیە لە دەســـت من بێ و لە خزمەتتدا بم؟' ـیاوەکە گوتی: 'کوڕی خۆم، دەمەوێ کارێکی ئاســانت پێ بســپێرم و بتکەمە خزمەتکاری خۆم.' لاوەکە گوتی: 'مـامە گیـان، ئەو کـارە چییە؟' پیـاوەکە گوتی: 'ئێمە دە پیـاوی بە ـسالاچووین پێکەوە لە ماڵێکدا دەژین و کەسمان نییە کە پێداویستییەکانمان بۆ دابین بکا و کاریک شـتێک بوو بۆمان جێ بەجێ بکا. ئەگەر تۆ خزمەتمان بکەی، زیاد لەوەی ئاواتی بۆ ـدخوازی خواردنی خۆش و جلی گرانبایت دەدەینێ و دەســت دەگرین. بەشــکوو خودا ـگەڕێنیتەوە سەر باری پێشووت.' لاوەکە قەبووڵی کرد و گوتی: 'بەسەر چاو.'

'دوایی شـێخەکە گوتی: 'بەس مەرجێکم هەیە.' لاوەکە گوتی: 'چ مەرجێک؟' شـێخەکە گوتی: 'دەبێ ڕازمان بپۆشی و هەرچیت لێمان بینی لای کەس نەیدرکێنی. هەر کاتێک بینیت ـدگریین، لە هۆی گریانەکەمان نەپرســی.' لاوەکە گوتی: 'خەمت نەبێ، مامە.' شــێخەکەش گوتی: 'زۆر باشـە بە دوامدا وەرە.' ڕۆیشـتن تا گەیشـتنە گەرماوێک. ئەوجار خزمەتکارێکی ـرد جلوبەرگی جوانی هێنا و کردیە بەر لاوەکە و بردییەوە ماڵی خۆی. کە چوونە ژوور، لاوەکە ماڵێکی بەرزی بینی کە کۆڵەکەی ئەستوور و ژووری گەورە و ڕووبەڕووی یەکدی بوون و چەند هەیوانی هەبوو کە هەریەکەی حەوزی ئـاوی خۆی تێدا بوو و لە هەموو لایەکەوە پەنجەرەی بە ڕووی باخدا دەکراوە. کابرا لاوەکەی بردە یەکێک لە دیوەکان. کوڕە ـەیری کرد عەرزەکەی بەردی ڕوخامیان تێ گرتووە و میچەکەی ڕەنگی شینی ئاسمانییە و هێلی زێڕینی تێدا نەخش کراوە و فەرشی ئاوریشمیان تێدا ڕاخستووە. دە شێخ ئەڵقەیان ـەســتووە و جلی خەم و پەژارەیان پۆشـیوە و خەریکی گریە و زارین. لاوەکە ســەری لە کاریان سووڕ ما و ویستی پرسیار لە شیخەکە بکات و مەرجەکەی بیر هاتەوە و پاشگەز ـووە. ئەوجار شێخەکە سندووقێکی بە لاوەکە سپارد کە سی هەزار دیناری زێڕی سووری تێدا بوو و پێی گوت: 'کوڕم، لەم سـندووقە بۆ ئێمەش و بۆ خۆشـت خەرج بکە. لەوە بەدوا تۆ گەورەمانی و ئەو پەیمانەی لەگەڵ تۆدا بەستوومە، بیپارێزە.' ئیدی لاوە لە لایان ماوە و خزمەتی دەکردن و شتی بۆخۆشی بۆ ئەوانیش دەکڕی تا وا بوو یەکێک لە شێخەکان مرد.

هاوڕێکانی شۆردیان و کفنیان کرد و له باخێک که لەپشتەوەی ئەو ماڵەدا بوو، ناشتیان. هەر ئاوا بەردەوام مەرگ دانەدانەیانی بەسەر دەکردەوە تا وای لێ هات جگە لەو شێخەی کە لاوەکەی بۆ هێنابوو، کەسی دیکەیان نەما. هەر ئەو دوانە پێکەوە مانەوە.

" 'ساڵانی ساڵ بەم جۆرە بوو تا شێخەکەش نەخۆش کەوت. لاوەکە کە زانی تازە شێخەکە دەمرێ، گوتی: 'مامە، من خزمەتی ئێوەم کرد و لەم دوازدە ساڵەدا کەمتەرخەمیم نەنواد.' شێخەکە گوتی: 'وایە کوڕم هیچ گلەییەکمان لێت نییە.' لاوەکە گوتی: 'گەورەم. دەموێ بزانم ئەو شین و گریان و ناڕەحەتییەتان لەبەر چی بوو؟' شێخەکە گوتی: 'ڕۆڵە. تۆ کارت بەوەوە نەبێ. داوای شتێکم لێ مەکە کە دەرەقەتی نایەم. ئاخر داوام لە خودا گیان کردووە کە هیچ کەس تووشی ئەو زەلە نەکات کە من تێی کەوتووم. ئەگەر دەتەوێت تووشی ئەو ناڕەحەتییە نەبیت کە ئێمەی تێدا بووین و لێی دەرچیت، ئەو دەرگەیە مەکەوە.' بە دەستی ئاماژەی بۆ دەرگەیەک کرد و ئەوی لەو دەرگەیە ترساند و گوتی: 'ئەگەر دەتەوێت ئەوەی بەسەر ئێمەدا هات، بەسەر تۆش بێ، ئەوە ئەو دەرگەیە بکەوە بۆت دەردەکەوێ ئێمە بۆ ئاوام لێ هات، بەڵام پەشیمان دەبیتەوە و پەشیمانیش دادت نادا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی پێنجسەد و هەشتا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! 'دوای ئەوە نەخۆشـــییەکەی کابرا لێی توند کرد و مرد. لاوەکە شـوردی، کفنی کرد و لە لای هاوڕێکانی ناشتی. ئەوجار بۆخۆی بە تەنیا لەوێدا دانیشت و بە کاری ئەو شـێخانە رامابوو. ڕۆژێکیان ئەو قسـانەی شـێخی بیر هاتنەوە کە داوای لێ دەکرد دەرگەکە نەکاتەوە. گورج هەسـتا و چوو بۆ ئەو شـوێنەی کە شـێخ دەسـتی بۆ راداشـــت و پێی گوت ئەو دەرگایە مەکەوە. گەڕا لە قوژبنێکدا دەرگایەکی دیتەوە کە جالجالۆکە پێشـــەکەیان تەنی بوو، چوار کلۆمی پۆلایینی لێ درابوو. کە لاوەکە ئەو دەرگەیەی دی، هەرەشـــە شـــێخی بیر هاتەوە و گەڕاوە، بەلام لەگەل خۆیدا لە گفتوگۆ و ناشتدا بوو. دوودڵ بوو بیکاتەوە یان نا.

" 'حەوت ڕۆژان ئاوا لە مچۆمچۆدا بوو. هەشـتەم ڕۆژ بەسـەر ترسـەکەیدا زاڵ بوو و گوتی: 'دەبێ ئەو دەرگەیە بکەمەوە.' ئەوجار هەستا چوو کلۆمەکانی شکاندن و دەرگاکەی کردەوە. دالانێکی تەسکی دی. نیزیک سێ کاتژمێر لەو دالانەدا ڕۆیشت ڕۆیشت تا گەیشتە قەراخ ڕووبارێک. بە گوێ ڕووبارەکەدا دەڕۆیشـت و دەیڕوانییە ڕاسـت و چەپی خۆی کە لەپڕ هەڵۆیەکی زل لە ئاسـمانەوە بەرەو خوار هات و پڕی دا لاوەکە و بردی بۆ هەوا و ڕۆیشـت تا گەیشـتە دوورگەیەک و لاوەکەی لەوێ دانا و گەڕاوە. ئەو لاوە لە کاری خۆی پەرێشان بوو و ڕۆژ و شەوی لەو دوورگەیەدا بەسەر دەبرد و نەیدەزانی ڕوو بکاتە کوێ. ڕۆژێکیان هەر وا بە بێهیوایی دانیشـتبوو کە لەپڕدا چارۆکەی کەشـتییەک لە دەریادا وە دەرکەوت، وەک ئەسـتێرەیەک لە ئاسـماندا بدرەوشـێتەوە. لاوەکە تەواوی بیر و خەیاڵی لە سـەر ئەو کەشـتییە دەگەڕا کە ڕەنگە ئەو کەشـتییە ببێتە مایەی ڕزگاربوونی. چاوی تێ بریبوو تا وا بوو هاتە پێشێ. تەماشـای کرد گەمییەکی لە عاج و ئاونووسی چێ کرابوو و دە کەنیزی یەک لە یەک جوانتری تێدا بوو. کە کەنیزەکان ئەو لاوەیان دی، لە گەمییەکە دابەزین و دەستیان ماچ کرد و گوتیانێ: 'ئەتۆ زاوا پاشاکەی.' ئەوجار کەنیزۆکێکی ڕووپاک هاتە پێشێ و بوخچەیەکی ئاوریشـمی کردەوە کە بەرگێکی پاشـایانە و تاجێکی زێڕین، کە بە یاقووتی جۆراوجۆری گرانبایی ڕازێنرابووەوە، هێنا و کردییەوە و شـــتەکانی لە بەر لاوەکە کرد و بە باوەش هەڵیگرت و خســـتیە گەمییەکەوە. ئەوجار چارۆکەیان هەڵدا و بە دەریای بێبندا کەوتنە ڕێ.

" 'لاوەکە کە لەگەڵیـاندا چوو، بە گومـانی خۆی خەون دەبینێ و نەیـدەزانی بۆ کوێی دەبەن. کە لە کەناراو نیزیک بوونەوە، سـەیری کرد کەناری دەریا جمەی دێ لە سـوپا و خودا نەبێ کەس نەیدەزانی ژمارەیان چەندە. ئەوجار پێنج ئەسـپی نیشـانەکراو کە زینی

زێڕینیان لەسەر بوو، هێنا پێشێ. لاوەکە ڕەشمەی یەکێک لە ئەسپەکانی گرت و سوار بوو و چوارەکەی دیکەش بە یەخترمە بوون. کە لاوەکە سوار بوو، ئاڵاکان هەڵکران و تەپڵ لێ دران و سوپاکە لە ڕاست و چەپییەوە ڕیزیان بەست و ئەو نەیدەزانی داخۆ خەون دەبینی یان بێدارە و هەر ئاوا ڕۆیشت. بەڵام هەر باوەڕی بەوە نەدەکرد و وای دەزانی خەونە تا وا بوو گەیشتنە مێرگێکی سەرسەوز، کۆشکگەل و کانیاوی سازگار و باخ و باڵندەی خۆشخوێنی تێدا بوو کە ستایشی خودای تاقانەیان دەکرد. وا بوو سوپایەک لەنێو کۆشکەکانەوە وەدەر کەوت وەک لافاوێک کە لە بەرزانەوە بەرەو ژێر بێ و ئەو مێرگە پڕ بوو لە باڵباز. کە لە لاوەکە نیزیک بوونەوە، سوپاکەی ئەوان وەستا و پاشاکەیان تەنیا سواریان بوو. چەند کەس لە دەستوپێوەندە تایبەتەکانیان چوونە بەردەمی. کە پاشاکە لە لاوەکە نیزیک بووەوە، لە ئەسپەکەی دابەزی. کە لاوەکە بینی وا پاشا لە ئەسپەکەی هاتە خوارێ، ئەویش دابەزی. سلاویان لێکدی کرد و سواری ئەسپەکانیان بوونەوە و پاشا بە لاوەکەی گوت: 'لەگەڵ مندا وەرە. تۆ میوانی منی.' لاوەکە لەگەڵیدا چوو. بەدم ڕۆینەوە پێکەوە قسەیان دەکرد. سوپاکەش لە ڕاست و چەپیانەوە دەڕۆیشتن تا گەیشتنە کۆشکی پاشا. ئەوجار دابەزین و چوونە کۆشکەوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ! 'پاشا دەستی ئەو لاوەی گرت و چوونە کۆشکەوە، لەسەر کورسییەکی زێڕین دایینیشاند و خۆشی لە لایەوە دانیشت. ئەوجار ڕووبەند و کڵاوتاسی لا بردن، کچێکی خۆرسیما. کە لاوەکە چاوی ئەو هەموو جوانی و دەلالییەی کەوت، واقی وڕ ما. شاژن پێی گوت: 'پاشا، پێم خۆشە بزانی، من شاژنی ئەم خاک و ئاوەم و هەموو ئەو سوپایەش لە سوار و پیادەوە کە تۆ بینیت، کچ و ژن بوون و پیاویان تێدا نەبوو. لای ئێمە پیاوان خەریکی کاری کشتوکاڵ و وەرزێری و زیندووکردنەوەی زەوییەکان و ئاوەدانکردنەوەی شارەکانن و کار دەکەن، بەڵام ژنان فەرماندار و پلەدارن.' لاوەکە پێی سەیر بوو و هەر وا سەرقاڵی قسە بوو، وەزیر هات. وەزیر پیرەژنێکی بەشکۆ و سەنگین بوو. شاژن گوتی: 'وەزیر، بڕۆ قازی و شایەد بێنە.' وەزیر وەدەر کەوت. شاژن ڕووی کردەوە لاوەکە و دەیدواند و قسەی خۆشی بۆ دەکرد و ترسی لە دڵ دەڕەواندەوە. ئەوجار پێی گوت: 'ڕازی دەبی ببمە ژنت؟' لاوەکە خێرا هەستا و کڕنۆشی بۆ برد و گوت: 'خاتوونەکەم، من لەم خزمەتکارانەی تۆ کەمترم کە خزمەتت دەکەن، دەی چۆن شایانی ئەوەم ببمە هاوسەرت؟' شاژن گوتی: 'ئەم خزمەتکار و باڵبازانەی بینیتن، بە ماڵ و سامان و کۆگاکانەوە دەبنە هی تۆ.' دوایی شاژن ئاماژەی بۆ دەرگایەکی داخراو کرد و گوتی: 'هەرچیم هەیە لە ئیختیاری تۆ دایە، بەس ئەو دەرگەیە مەکەوە. بێتوو ئەو دەرگەیە بکەیتەوە بە بەرد لە چۆکی خۆت دەدەی.' هێشتا گوتەی شاژن تەواو نەبووبوو کە وەزیر قازی و شایەدی هێنا. هەموو پیرەژنی سەرسپی بوون. کە لە هەنتەشی شاژندا ئامادە بوون، شاژن فەرمانی دا لێکیان مارە بکەن. ئەوانیش شاژنیان لە لاوەکە مارە کرد.

" 'دواتر شاژن فەرمانی دا ئاهەنگیان گێڕا و خەڵک نان درا. ئەوجار لاوەکە لەگەڵ شاژندا جووت بوو. حەوت ساڵی ڕەبەق بە بەخێر و خۆشی پێکەوە بوون و لە ناز و نیعمەتدا ژیان. وا بوو ڕۆژێک لە ڕۆژان کوڕە کردنەوەی ئەو دەرگەیەی بە خەیاڵدا هات کە شاژن بڤەی لێ کردبوو. بە خۆی گوت: 'ئەگەر لەوێ کۆگەی گەورەتر و سامانی هەراوتری لێ نەبووایە، شاژن کردنەوەی ئەو دەرگەیەی لێ قەدەغە نەدەکردم.' دەمودەست هەستا و چوو دەرگەی کردەوە. کتوپڕ هەر ئەو هەڵۆیەی لاوەکەی بردە دوورگەکەوە، پەیدا بوو. کە هەڵۆکە چاوی بە لاوەکە کەوت، گوتی: 'نەفرەت لەو ڕووەی کە لەمەو دوا خۆشی نابینی.' کە لاوەکە ئەوی دیت و ئەو قسەیەی لێ بیست، هەڵات و ویستی لە دەستی ڕا بکا. بەڵام هەڵۆکە دوای کەوت و گرتی و ڕفاندی. هەڵفڕی و ئەوەندەی پێ نەچوو هەر لەو ئاقارەی سەرەتا کە لەوێ بردبووی، دایناوە و بۆخۆی بزر بوو.

" 'ئیدی لاوەکە لەوێ دانیشت و بیری لەو هەموو خۆشی و دەسەڵات و فەرمانڕەوایی و گەورەییەی دەکردەوە کە دیتبووی. لە تاوان دەستی کرد بە گریان و شین و ڕۆڕۆ. لە کەنار ئەو دەریایەدا دوو مانگ ماوە و ئارەزووی دەکرد بگەڕێتەوە لای ژنەکەی. وا بوو شەوێکی کە لاوەکە مات و خەفەتبار خەوی لێ زڕابوو، بیری لە کاری خۆی دەکردەوە، دەنگێک لە پێوارەوە بە دەنگێکی بەرز گازی کرد و گوتی: 'ئای چ خۆشیگەلێکی زۆرت لە دەست خۆت دا! هەزار حەیف و مەخابن تازە نایان بینییەوە.' ئیدی لاوەکە لە دیداری شاژن و گەڕانەوە بۆ نێو ئەو خۆشییانە تەواو بێهیوا بوو. ئەوجار گەڕاوە بۆ ئەو ماڵەی کە شێخەکانی لێ بوو و زانی کە ئەوانیش هەمان شتیان بەسەر هاتووە. هۆکاری گریانەکەیان ئەوە بووە. دوای ئەوە لاوەکە بەردەوام دەگریا و دەناڵا و دەکوڕووزاوە و وازی لە خواردن و خواردنەوە هێنا هەتا مرد و لەپاڵ ئەو شێخانەدا ناشتیان.

" 'جا قوربان، تۆش بزانە کە پەلەکردن پەسەند نییە و پەشیمانی بە دواوەیە. ئەوە من قسەی خۆم کرد. ئیدی بۆخۆت دەزانی و وەسسەلام.' پادشا کە گوێی لەو بەسەرهاتە بوو، کەوتە ژێر کاریگەری قسەکانی و لە کوشتنی کوڕەکەی پاشگەز بووەوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و نەوەد و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! که ڕۆژی شەشەم هات، کەنیز له بارەگای پاشادا ئامادە بوو و خەنجەرێکی ڕووتی بە دەستەوە بوو، گوتی: 'پادشام، ئەگەر بە هانامەوە نەیەی و هەقی من لە کوڕە ئاپاکەکەت نەستێنی و گوێ لە قسەی وەزیرەکانت بگری کە ژنان بە فێڵ و تەڵەکەبازی تۆمەتبار دەکەن، بەم خەنجەرە خۆم دەکوژم. بەڵام لەپێشدا چیرۆکی شازادەیەک و ژنی بازرگانێکت بۆ دەگێڕمەوە با بۆت دەرکەوێت فێڵ و دەهۆی پیاوان گەلێک لە هی ژنان زیاترە.' پاشا گوتی: 'باشە جارێ بیگێڕەوە بزانم چی ؟'

### چیرۆکی شازادە و ژنی بازرگان

"کەنیزەکە گوتی: 'گەورەم، بیستوومە بازرگانێکی دڵپیس ژنێکی باش و جوانی هەبوو کە مانگ و حۆری لە چاو ئەو هیچ نەبوون. ئەو بازرگانە هێندە دڵپیس بوو، دڵی لە ژنەکەی نەدەحەساوە و تا ڕادەیەک ژن بردبووە دەرەوەی شاری لەوێ خانوویەکی قایمی وای بۆ ساز کردبوو پشیلە نەیدەتوانی بە دیوارەکانی هەڵگەڕێ. دەرگەی ئاسنی بۆ چێ کردبوو، هەر کات کاری جێگایەکی هەبایە چەند قوفڵی لە دەرگەکە دەدا و کلیلەکانی لەگەڵ خۆی دەبرد. ڕۆژێک لە ڕۆژان بازرگان لە شار بوو کە کوڕی پاشای ئەو شارە بۆ سەیر و گەڕان چووە دەرەوەی شار. هەر وا کە دەڕۆیشت، چاوی بەملاولادا دەگێڕا بە ڕێکەوت چاوی بەو خانووە کەوت. ئەو ژنەی دیت کە لە پەنجەرەوە دەیڕوانی دەرێ. شازادە کە چاوی پێی کەوت، سەری لە جوانی و چەلەنگییەکەی سووڕ ما و پابەندی بوو و ویستی بە جورێک خۆی بگەیەنێتێ، بەڵام بواری نەدەدا. ئەوجار داوای قەڵەم و کاغەزی کرد و باسی حاڵی خۆی تێدا نووسی و بە نووکی تیرێکییەوەی کرد و بەرەو کۆشکەکەی هەڵدا. ئەو ڕوومانگە کە کاغەزەکەی دی، کەنیزەکێکی نارد هەڵیگرێتەوە. کەنیزە کاغەزی هەڵگرتەوە و بۆی برد و دایێ. کاغەزی خوێندەوە و لە حاڵی شازادە گەیشت. بەم جۆرە وەڵامی بۆ نووسی: 'منیش زیاد لە تۆ سەودای عەشقم لە سەردایە و حەز و شەوقم بۆت لە تۆ زورترە.' ئەوجار هاتە سەر بانێژە، شازادەی بینی و کاغەزەکەی بۆ بەرداوە خوارەوە. کە شازادە ئەوی بینی، هاتە بەر کۆشکەکە و گوتی: 'شتێکم بۆ شۆڕ کەوە با ئەم کلیلەی پێوە ببەستم و هەڵیکێشەوە با لای تۆ بێ.' ژنە پشتێندی ئاوریشمی شۆڕ کردەوە. شازادە کلیلەکەی پێوە بەست و ئەویش هەڵکێشاوە. دوای ئەوە گەڕاوە لای وەزیرەکەی باوکی و باسی ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە و داوای لێ کرد یارمەتی بدا و چارەیەکی بۆ بدۆزێتەوە. وەزیر گوتی: 'جا چارەی چی بۆخۆت ڕێگایەکت پێ شک دێ؟' شازادە گوتی: 'بمخە

سندووقیکه و به فلان بازرگانم بسپێره و پێی بڵێ با ئەو سندووقە لای تۆ بێ. وا بنوێنە کە سندووقی خۆتە، بۆ ئەوەی من دەستم بەو ژنە ڕابگا.' وەزیر شازادەی خستە نێو سندووقێکەوە و بەدوای بازرگانیدا نارد. کە بازرگان هات، دەستی وەزیری ماچ کرد و گوتی: 'ئەگەر وەزیر هەر داوایەکی هەبێت، خزمەتکاریم و پێی شادمانم.' وەزیر گوتی: 'دەمەوێ ئەم سندووقەم لە لای خۆت بۆ هەڵگرە و لە جێگایەکی باشی دانێ.' دەمودەست بازرگان کرێکاری هێنا و سندووقی بردە کۆشکەکەی خۆی و لە کۆگەدا دایناو. پاشان لە کۆشک هاتە دەرێ. دەرگەی داخست و چوو بەدوای کاری خۆیدا. ژنی بازرگان هەستا چووە لای سندووقەکە و بەو کلیلەی شازادە دابوویێ، سندووقی کردەوە. لاوێکی وەک مانگ لە سندووقەکە هاتە دەرێ. ژنی بازرگان کە ئەوی دی، جلوبەرگی گرانبایی و شکۆمەندانەی پۆشی و شازادەی بردە ژوورێکەوە. تا حەوت ڕۆژان لەگەڵ ئەودا بە خۆشی و شادی ڕایان دەبوارد. هەر کاتێک کە بازرگان دەهاتەوە، ژنە شازادەی دەخستەوە سندووقەکە و کلیلی دەدا. چەند ڕۆژ بەسەر ئەم ڕووداوەدا تێپەڕی و پاشا هەواڵی کوڕەکەی پرسی. وەزیر گورج چوو بۆ لای بازرگان و داوای سندووقەکەی لێ کرد.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی پێنجسەد و نەوەد و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! وەزیر داوای سندووقی کرد. بازرگان بە پێچەوانەی خووی خۆی، بە تالووکە بەرەو ماڵەوە تێی تەقاند. کە دەرگەی کوتا، ژنە زانی مێردەکەیەتی. گورج شازادەی خستەوە سندووقەکە بەڵام هێندە پەشۆکابوو، لە بیری چوو قفڵەکەی لێ بدات. ئەوجار بازرگان لەگەڵ باربەرەکان هاتنە ژوورێ. ویستیان سندووق هەڵگرن، سەرەکەی کراوە و شازادەیان لە سندووقەکەدا دی. بازرگان کە ئەوی ناسییەوە، هاتە دەرێ و چووە کن وەزیر و پێی گوت: 'تۆ وەرە بۆ کۆشکەکەم و خۆت کوڕی پاشا ببە. ئاخر کەسی دی ناتوانی شازادە دەربهێنێ.' ئەوجار وەزیر چووە کۆشک و شازادەی دەرهێنا و گەڕانەوە و بازرگان ژنەکەی تەڵاق دا و سوێندی خوارد کە هەرگیز ژن نەهێنێتەوە. پاشام، شتێکی دیکەشم بیستوومە ...

### چیرۆکی کۆیلە و زمانی باڵندەکان

" '... دەگێڕنەوە، پیاوێکی قۆز بە بازاڕدا دەڕۆیشت، دیتی وا کۆیلەیەک دەفرۆشن. کڕی و هێنایەوە ماڵ و بە ژنەکەی سپارد. ماوەیەکی زۆر کۆیلەکە لەو ماڵەدا خزمەتی کرد. ڕۆژێکیان پیاوەکە بە ژنەکەی گوت: 'بۆ گەڕان بچۆ باخ.' کە کۆیلەکە ئەو قسەی بیست، هەر ئەو شەوە خواردن و خواردنەوە و شیرینی و میوەی ئامادە کرد و بەرەو باخ وەڕێ کەوت و لەسەر ڕێی خانمەکەیدا خواردنەکەی لەبن دارێک و خواردنەوەکەی لەبن دارێکی دیکە و شیرینی و میوەکەشی لەبن دارێکی دیکەدا دانا. بەیانی زوو کابرا بە کۆیلەکەی گوت کە لەگەڵ خانمدا بچێ بۆ باخ. ئەوجار خانم هاتە دەرێ و سوار بوو و لەگەڵ کۆیلەکەدا ڕۆیشتن تا گەیشتنە باخەکە. کە چوونە باخەکەوە، قەلەڕەشێک قیڕاندی و کۆیلەکە پێی گوت: 'هۆ قەلەڕەش، زۆر باشە سپاس.' خانم گوتی: 'ئەو قەلەڕەشە دەڵێ چی؟' کۆیلە گوتی: 'خانمەکەم، ئەو قەلەڕەشە دەڵێت کە لە بن ئەم دارەدا خواردنی لێیە و وەرن بخۆن.' خانم گوتی: 'ئەوە زمانی باڵندانیش دەزانی!' غولام گوتی: 'بەڵێ خانمەکەم، زمانی باڵندان دەزانم.' خێرا خانم چووە لای دارەکە و خواردنێکی ئامادەی بینی. کە خواردنەکەیان خوارد، خانم زۆری پێ سەیر بوو، وای زانی کە کۆیلەکە زمانی باڵندان دەزانێ. هەر وا خەریکی سەیر و گەڕان بوون کە قەلەڕەشەکە قیڕەیەکی کرد. کۆیلەکە گوتی: ' سپاس قەلەڕەشی بەڕێز.' خانم گوتی: 'ئەوە قەلەڕەش دەڵێ چی؟' کۆیلە گوتی: 'خانمەکەم، دەڵێت کە لەژێر فلان داردا ئاوی پاک و خواردنەوەی لێیە.' ئەوجار خانم لەگەڵ کۆیلەکە چوون بۆ لای ئەو دارە و تەماشایان کرد ئاو و بادەی لێ بوو. خانم ئەوەندەی

دی سـەری سـوورِ ما و قەدری کۆیلەکەی لا زیاد بوو، دانیشـتن و دەسـتیان کرد بە مەیخواردنەوە. دوای مەیخواردنەوە هەستان بگەڕێن. ئەوجار قەلەڕەش قیڕاندییەوە. کۆیلە گوتی: 'سـپاس قەلەڕەش.' خانم گوتی: 'ئەی ئەم جار دەڵێ چی؟' کۆیلە گوتی: 'خانمەکەم، دەڵێ کە لەژێر فلان داردا شیرینی و میوەی لێیە.'

" 'ئینجا چوونە لای ئەو دارە و سـەیریان کرد ڕاسـت دەکا و شـیرینی و میوەی لێیە. شـیرینی و میوەیان خوارد و هەستان بەنێو باخدا گەڕان تا قەلەڕەشـەکە دیسان قیڕاندی. کۆیلەکە گورج دەسـتی دا بەردێک و تێی هەڵکرد. خانم گوتی: 'ئەوە بۆ بەردت تێ گرت؟' کۆیلە گوتی: 'خانمەکەم، قسـەیەکی کرد، کە ڕووم نایە پێت بڵێم.' خانم گوتی: 'بیڵێ شـەرم مەکە. من و تۆ خۆ ئەوانەمان نییە.' کۆیلە گوتی: 'نە وەڵا ناتوانم.' خانم گوتی: 'بیڵێ دەی.' ئەوجار کۆیلەکەی سـوێند دا. کۆیلە گوتی: 'خانمەکەم، قەلەڕەشـەکە گوتی کە لەگەڵ خانمەکەتدا ئەو کارە بکە کە مێردەکەی دەیکا.' کە خانم ئەم قسـەیەی بیسـت، ئەوەندە پێکەنی خەریک بوو بە پشـتدا بکەوێ. ئینجا بە کۆیلەکەی گوت: 'کوڕە ئەم کارە شـتێکی هەر زۆر سادەیە و بێ دڵێت ناکەم.'

" 'ئەوجار خانم چووە بن یەکێک لە دارەکان و ڕاخەرێکی ڕاخست. کۆیلەکەی بانگ کرد کە بێت کاری خۆی بکا. لەناکاو مێردی ژنە لەوێ پەیدا بوو و بە کۆیلەکەی گوت: 'ئەوە خانم چی لێ قەوماوە وا لەژێر ئەو دارەدا کەوتووە و دەگری؟' کۆیلەکە گوتی: 'گەورەم، لەسـەر درختێکەوە بەر بووەوە و ئەوەندەی نەمابوو بمرێ. خودا هەر خۆی فریای کەوت. ئێسـتا بۆ پشـوودان لێرەدا ڕاکشـاوە.' ژنە کە مێردەکەی لەوێ دیت، خۆی هێنایە حاڵی جاوی و دەسـتی کرد بە ناز و نووز و هاورا و لیلا و گوتی: 'ئای پشـتم! وای کەلەکەم! کوڕە فریام کەون خەریکە دەمرم.' پیاوە بە دیتنی ئەو دۆخە پەشۆکا و بە کۆیلەکەی گوت: 'یەڵا خێرا ئەسپەکە بۆ خانم بێنە.' کە ئەسپەکەی هێنا، لەگەڵ کۆیلەکەدا یەکی ئاوزەنگییەکی زینەکەیان گرت و خانمیان سـوار کرد و گوتیان: ' خودا لە دەرد و بەڵا بتپارێزێ.' کە کەنیزەکەکە قسـەکانی بێرە گەیاند، گوتی: 'پاشـام، ئەمە یەکێک بوو لە فێڵی پیاوان. نەکەی وەزیرەکانت ڕێت لێ بگرن لەوەی هەقی من بستێنی.' ئینجا دەستی بە گریان کرد. کە پاشا گریانەکەی دی و قسەکانی بیست، فەرمانی کوشتنی کوڕەکەی دا. ئینجا وەزیری شەشەم هاتە پێشێ و کوڕنۆشی برد. نزای بۆ پاشا کرد و گوتی: 'قوربان، من چاکەی تۆم دەوێ و لە دڵسۆزیمەوە ڕێنموونیت دەکەم. لە کاری ئەم کوڕەدا پەلە مەکە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و نەوەد و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! وەزیری شەشەم گوتی: 'لە سەرخۆ بە. درۆ لە تاریکی دەچێ و ڕاستی ڕووناکی. ڕووناکی ڕاستی، تاریکی درۆ دەرەوێنێت. جا بزانە کە فێڵ و دەهۆی ژنان بێ سنوورە و خودای گەورە لە کتێبەکەیدا دەفەرمووێت: 'بە ڕاستی فێڵی ئێوەی ژنان لە ڕادە بەدەرە.' بیستوومە ژنێک کڵاوێک لە سەر پیاوان و دەسەڵاتدارانی دەوڵەتێک دەنێ تا ئێستا هیچ کەسێک فێڵی وای نەکردووە.' پاشا گوتی: 'جا چۆن شتی وا ڕووی داوە؟ دا بۆم بگێڕەوە.'

### چیرۆکی ژنێک و پێنج چاونەزێر

"وەزیر گوتی: 'ژنێک کە کچی یەکێک لە بازرگانەکان بوو، مێردێکی هەبوو زۆر دەچوو بۆ ئەملاوئەولا و سەفەری زۆر دەکرد. جارێکیان کە دوور ڕۆیشتبوو، سەفەرەکەی زۆری خایاند و ژنە حەزی سەرجێیی زۆری بۆ هێنا. دڵی چووە کوڕێکی قۆز و کەشخە و هەردووکیان یەکتریان زۆر خۆش دەویست. وا بوو ڕۆژێک کوڕە لەگەڵ کابرایەک لێیان بوو کێشە و دە گژ یەک ڕۆچوون. کابرا لای میری شار شکایەتی کرد. میر کوڕەی خستە بەندەوە. کە ژنە بە ڕووداوەکەی زانی، دنیای لە بەرچاو تاریک بوو. هەستا، جلوبەرگی شکۆمەندانەی پۆشی و چووە کن میر و کاغەزێکی دایە کە نێوەڕۆکەکەی ئەمە بوو: 'ئەو کوڕەی بەندت کردووە، برامە و وادیارە لەگەڵ کابرایەکدا ناکۆکییان لە نێودا ساز بووە و ئەو شایەدانەش بە ناحەق لە دژی شایەدی درۆیان داوە. ئێستا بە ناحەق بەند کراوە و منیش بێ کەسوکارم و کەس نییە کارەکانم بۆ ڕاپەڕێنێ. ئێستا داوام وایە کە بۆم ئازاد بکەی.' میر نامەکەی خوێندەوە و خەمزە و نازی ئەو ڕوومانگە قەندی دڵی میری تواندەوە و گوتی: 'وەرە بۆ ماڵم تا براکەت بۆ بێنم و ڕادەستتی کەم.' ژنە گوتی: 'میرم، من بێگانەم. جگە لە خودا کەسم نییە و ناتوانم بچمە ماڵی هیچ کەسێکەوە.' میر گوتی: 'دەی منیش ئەو کوڕە بەر نادەم تا نەیەیتە ماڵم و حەزم دانەمرکێنی.' ژنە گوتی: 'ئێ ئەگەر بە تەمای ئەوەی ، دەبێ تۆ بێیتە ماڵی من و ماوەیەک لە لام بی و بحەسێیەوە من لە شوێنی دیکە دڵم ناحەسێتەوە ماڵی من باشترە.' میر ناونیشانی ماڵەکەی پرسی.

" 'ژنە ناونیشانی ماڵەکەی دایە و لای ئەو هاتە دەرەوە و بەرەو ماڵی قازی چوو، بە ئەبزێکی شیرینەوە پێی گوت: 'جەنابی قازی، چارەی کارم بکە، مەگەر خودا هەر خۆی پاداشت بداتەوە.' قازی پرسی: ' چیت لێ قەوماوە؟ ژنە گوتی: 'قوربان، من تاقە برایەکم هەیە کەسی دیکەم نییە. لە دژی ئەو شایەدی درۆ دراوە کە ئەو تاوانبارە. میریش بەو

هۆیەوە بەندی کردووە. داوام لێت ئەوەیە بچیتە کن میر و تکای بۆ بکەی.' کە قازی ئەو جوانی و قەد و بـالایەی دی، ئەویـنداری بوو و گوتی: 'دەی تۆ وەرە ژوورەوە و لای کەنیزەکانم دانیشـە تا من کەسـێ بنێرمە لای میر و براکەت بۆ بەر بدەم. هەر کە بزانم میر چەندە بۆ بەردانی داوا دەکا، من دەیدەم. بە ڕاسـتی گفتولفتت کەوتە بەر دڵم.' ژنە گوتی: 'جەنابی قازی، کە تۆ لەم کارانە بکەی، ئەی چۆن خەڵک سـەرکۆنە دەکەی؟' قازی گوتی: 'ئەگەر نەیەیتە ماڵەکەم، تکای بۆ ناکەم. یەڵا هەسـتە لێرە بڕۆ دەرەوە.' ژنە گوتی: 'دەی ئەگەر نیازی تۆ ئەمەیە، ئەوە ماڵەکەی من باشـتر و پارێزراوترە. ئاخر لێرە هاتوچۆی کەنیز و خزمەتکاران زۆرە. جا من ژنێکم سـەرم لەم کارانەوە دەرناچێ، بەڵام ناچاری پێم دەکا.' قازی پرسـی: 'ماڵی تۆ لە کوێیە؟' ژنە گوتی: 'لە فلان جێیە.' هەمان بەڵێنی ئەو ڕۆژەی بە میری دابوو، بە قازیشی دا.

" 'دوایی هاتە دەرێ و چووە لای وەزیر و چیرۆکی خۆی بۆ گێڕاوە و سکاڵای لا کرد. وەزیریش داوای لێ کرد و گوتی: 'ئەگەر بێ دڵیم نەکەی، براکەت بەر دەدەم.' ژنە گوتی: 'دە ئەگەر نیازی ئەوەت هەیە، دەبێ بێیتە ماڵی من کە ئەوێ بۆ هەردووکمان باشـترە.' وەزیر گوتی: 'ماڵت لە کوێیە؟' ژنە ناونیشـانی داێ. بەڵێنی ئەو ڕۆژەی بە وەزیریش دا کە بەوانی دیکەشـی دابوو. لەوێ وەدەر کەوت و چووە کن پاشـای شـار و بەسـەرهاتی خۆی بۆ گێڕاوە و هیوای خواسـت براکەی ڕزگار بکا. پاشـا پرسـی: 'کێ بەندی کردووە؟' ژنە گوتی: 'پاشـام، میر بەندی کردووە.' مەمنا پادشـاش شـەیدای جوانی و نازدارییەکەی بوو، پێی گوت: 'هەسـتە لەگەڵم وەرە با بچینە کۆشـکەوە تاوەکو من کەسـێ بنێرمە لای میر براکەت بەر بدا.' ژنە گوتی: 'گەورەم، ئەم کارە بۆ تۆ ئاسانە. من سەرپێچی ناکەم و مایەی خۆشحاڵییە و ئەوپەڕی بەختەوەریمە کە پادشـا بە من ڕازی بێ، بەڵام ئەگەر بێتوو پادشـا بە گەورەیی خۆی و بە هـاتنی مـاڵەکەی من پیرۆز بکـا، ئەوا قفڵی من و کلیلی ئەو پێک دەگەن، هەر وەک شاعیر گوتوویە:

> هێنـد خۆش دەبێ کۆڕی ئێمە، فریشـتە ئێرەیی دێتێ
> ئەگەر بێتـوو کەرەم بکـا، گوڵـی ڕووت لە کۆڕم بڕوێ

" 'پاشـا پێی گوت: 'من دڵت ناشـکێنم.' وا بوو، بەڵێنی ئەو ڕۆژەی کە بەوانی دیکەی دابوو بە پادشاشی دا و ناونیشانی ماڵەکەی داێ.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەوشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشـــكۆ! 'ژنە بەڵێنی هەمان ئەو ڕۆژەی دایە پاشـــا كە بە میر و قازی و وەزیری دابوو. گورج هاتە دەرەوە و چووە لای دارتاشـــێك و پێی گوت: 'ســـندووقێكی چوارقاتم بۆ دروســـت بكە كە هەر قاتێكیان دەرگەیەكی جیای هەبێت.' دارتاش گوتی: 'بەســەر چاو.' ژنە گوتی: 'هەقدەســتت چەند دەكا؟' دارتاش گوتی: 'چوار دینار. خۆ ئەگەر بیتوو چاوێكیشــت لێم و بێ دڵێم نەنكەی، ئەوە هەقدەســتم هەر ئەوە دەبێ و هیچی دیكەم ناوێ.' ژنە گوتی: 'دەی مادام وایە، ســـندووقەكە بكە پێنج قات.' دارتاش گوتی: 'هەرچی تۆ بیڵێی، بەســـــەر چـاو.' بەڵێنی ئەو ڕۆژ وكـاتەی دا بەویش و گوتی: 'فلان ڕۆژ وەرە و ســـــندووقەكەش بێنە.' دارتاش گوتی: 'خاتوونەكەم، كوڕە تۆ دانیشـــە و هەر ئا ئێســـتا سندووقەكەت وەربگرەوە. من خۆم لە ڕۆژی دیاریكراودا دێم.'

" 'ژنە دانیشت تا ئەوەی كە سندووقێكی پێنجقاتی بۆ درووست كرد و هێنایەوە ماڵێ و لە دیوێكی دانا. چوار دەســت جلوبەرگی هەڵگرت و بردنی بۆ لای خومچی و هەریەكەیانی بە ڕەنگێكی جودا ڕەنگ كرد. ئەوجار دەستی كرد بە ساز كردنی خواردن و خواردنەوە و میوە و شیرینی. كە ڕۆژی دیاریكراو هات، هەستا جلوبەرگی شكۆمەندانەی پۆشی، عەتری لە خۆی دا، خۆی تیفتیفە دا و عوودی ســـووتاند و فەرشـــی دیبای ڕاخســـت و لە چاوەڕوانییاندا دانیشتبوو كە قازی زووتر لەوانی دی پەیدا بوو. كە ژنە دیتی، هەستا چوو دەســتی گرت و هێنای لە ســەر قەنەفەیەكی دانا و لەگەڵیدا كەوتە دەســتبازی. قازی پەلەی بوو زوو بە ئامانجی بگا. ژنە گوتی: 'جەنابی قازی، وا نابێ. جامانەكەت دانێ و ئەم كراسە زەردە بكە بەرت و ئەم ســەرپۆشــە بەســەرتدا بدە تا نان و ئاوێ بخۆین. دوای ئەوە كاری خۆت بكە.' قازی جامانەی دانا و كراسی داكەند و كراسە زەردەكەی پۆشی و ســەرپۆشی بە ســەردا دا. ویستیان دەست بكەن بە خواردن و خواردنەوە كە لەپڕ لە دەرگە درا. قازی گوتی: 'ئەوە كێیە لە دەرگە دەدا؟' ژنە گوتی: 'جەنابی قازی، مێردەكەمە.' قازی گوتی: 'قوڕ بەسەرم! ئێستا من چی بكەم و ڕوو لە كوێ بكەم؟' ژنە گوتی: 'جەنابی قازی ترست نەبێ، من دەتخەمە نێو ئەم سندووقەوە.' قازی گوتی: 'چی دەكەی بیكە.'

" 'ژنە گورج هەســـتا قۆڵی قازی گرت و خســـتییە قاتی ژێرەوەی ســـندووقەكە و دەرگەكەی داخست. ئەوجار چوو دەرگەی كردەوە، دیتی میرە. سڵاوی كردێ، دەستی ماچ كرد، دەستی گرت و هێنایە ژوورەوە و پێی گوت: 'میرم، ماڵ ماڵی خۆتە و من لە كەنیزانی تۆم. ئەمڕۆ تا ئێوارە لای من دەبی. جا ئێستا هەستە جلەكانت داكەنە و ئەم جلە سوورانە لە بەر بكە كە ئەمانە جلی خەون.' جلی بە میر داكەند و جلە ســـوورەكانی پێ پۆشـــی و

کونەکانی لا برد و چوونە خەوگەوە و دەســـتیان کرد بە دەســـتبازی و قانەقدیلکە، میر دەســـتی بۆ برد و ویســـتی بە کامی دڵی بگا. ژنە گوتی: 'میرم، ئەمڕۆ ڕۆژ ڕۆژی خۆتە و کەس هاوبەشـــت نییە، دەی لە چاکە و گەورەیی خۆت کاغەزێکم بۆ بەردانی براکەم بۆ بنووسە تا خەیاڵم ئاسوودە بێ.' میر گوتی: 'وەی بەسـەر هەردوو دیدەم.' خێرا کاغەزێکی بەم نێوەڕۆکەوە بۆ گرتووخانە نووسی کە لە کاتی گەیشتنی ئەم کاغەزەدا بەبێ دواکەوتن فلان گیراو بەر بدەن و خاوەخاو مەکەن. ئەوجار کاغەزی مۆر کرد و دای بە ژنە و دەســـتیان بە دەســـتبازی کردەوە. کتوپڕ لە دەرگە درا. میر گوتی: 'ئەوە کێیە؟' ژنە گوتی: 'مێردەکەمە.' میر گوتی: 'ئێســـتـا چی بکەم و بۆ کوێ بچم؟' ژنە گوتی: 'تۆ بچۆ ئەم سندووقەوە تا من بچم بە جۆرێک بگێڕمەوە و بێمەوە لای تۆ.' میر گوتی زۆر باشە.

" 'ئەوجار ژنە میری کردە قاتی دووەمی ســـندووقەکەوە و دەرگەکەی کلۆم دا و قازی قســـەکانیانی لە ســـەرەتاوە تا کۆتا بیســـت. ئینجا ژنە بە دەنگ دەرگەوە چوو، کە کردیەوە، وەزیری لەپشتی دەرگەوە دی. دەستی ماچ کرد و هێنایە ژوورەوە. کەوتە خزمەتی و پێی گوت: 'قوربان، بەخێر بێی، گەورەت کردم وا کەنیزی خۆت بەسەر کردەوە. خودا سێبەری تۆمان لە سەر کەم نەکا!'

" 'ئەوجار وەزیری بردە خەوگەوە و پێی گوت: 'جل و جامانەکەت دانێ و ئەم جلە ناسکە شینە بپۆشە.' دەموودەست وەزیر جل و جامانەی داکەندن و جلە شینەکەی لە بەر کرد. ژنە گوتی: 'قوربان، جلەکانی تۆ جلی شـــکۆ و وەزارەت بوون. ئەمانە جلی خەو و هاودەمین.' کە وەزیر بەو ســـەر و ســـیمایەوە لە خەوگەدا دانیشـــت، ژنە لەگەڵیدا کەوتە دەستبازی و خۆ ڕێخستن. وەزیر ویستی کاری خۆی بکا کە دیسان لە دەرگە درا. وەزیر گوتی: 'ئـای لەو چەرەڕەشـــییە، بڵێی کێ بێ؟' ژنە گوتی: 'بە لە دەرگە دانەکەمدا دەبێ مێردەکەم بێ.' وەزیر گوتی: 'ئەی چـار چییە؟' ژنە گوتی: 'قوربـان هەســـتە بچۆ ئەو ســـندووقەوە تا من بچم بە بیانووی شـــتێک بیگەڕێنمەوە و فکرێکت بۆ بکەمەوە، هیچ نییە ترست نەبێ.' ئەوی کردە قاتی سێیەمی سندووقەکەوە و دەرگەکەی بەست و هاتە دەرێ. دەرگەی کردەوە و پادشـا بوو. ژنە ســێ جار کوڕنۆشــی بۆ کرد و بردییە ژوورەوە و لە لای ســـەرەوە داینیشـــاند و گوتی: 'پادشـــام، ئەگەر دنیا بە تەواوی ئەوەی تێیدایە بە منت دابایە، بارتەقای هەنگاوێکت نەدەبوو کە بۆ لای منت ناوە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی پێنجسەد و نەوەد و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! 'کە پاشا لەوێ دانیشت، ژنە گوتی: 'ئەگەر مۆڵەتم بدەی قسەیەک
ـکەم.' پاشا گوتی: 'چیت پێ خۆشە بیڵێ.' ژنە گوتی: 'پاشام، جلوبەرگی پاشایەتی داکەنە و
جلوبەرگی سەرجێیی بپۆشە بۆ جەنابت خۆشترە.' پاشا قسەکەی پێ جوان بوو، هەر بۆیە
جوبەرگەکەی کە بایی هەزار دینار دەبوو، داکەند و جلوبەرگێکی کۆنی کردە بەری کە
ـبی دە دینار دەبوو. ئەوجار لەگەڵ ژنەدا کەوتنە دەستبازی و ماچوموچ و تلانەوە.
ـەوانەی نێو سندووقەکەش گوێیان لە قسە و باسەی ئەوان بوو و هەرچی دەکرا ئاگایان
ـی بوو، بەڵام هیچیان نەیاندەوێرا دەنگ بکەن. ئینجا پاشا دەستی بۆ ژنە برد و ویستی
ـەگەڵی جووت بێ، ژنە گوتی: 'پاشا، ئەمڕۆ تا ئێوارە لە پرشنگی ڕووی پیرۆزت بەهرەوەر
ـدبم و ئەم کارەمان لە دەست دەرناچێ، تۆ تۆزێک دان بە خۆتدا بگرە.' ئەوە بوو لە
گەرمەی قساندا بوون کە لە دەرگەیان دا. پاشا گوتی: 'ئەمە کێیە؟' ژنە گوتی: 'وەک لە
ـەگەدانی مێردەکەم.' پاشا گوتی: 'بە جۆرێک ئەو بەڵایەم لە کۆڵ کەوە و بەڕێی بڕوا، دەنا
خۆم دێمە دەرەوە و بە ناخۆشی دەریدەکەم.' ژنە گوتی: 'دەرکردنی بە ناخۆشی شیاو نییە
و تۆ خەمت نەبێ، من بەو جۆرەی کە دەزانم، دەیگێڕمەوە.' پاشا گوتی: 'ئەی من چی بکەم
و بۆ کوێ بڕۆم؟' ژنە دەستی پاشای گەرت و کردیە قاتی چوارەمی سندووقەکەوە و
ـدگەکەی داخست. دوایی بەدەم دەرگەوە هات، کردیەوە و دیتی دارتاشە. دارتاش کە
جاوی بە ژنە کەوت، سڵاوی لێ کرد و هاتە ماڵەوە. ژنە لێی پرسی: 'ئەرێ بۆچی قاتەکانی
سندووقەکەت وا تەسکی دروست کردووە؟' دارتاش گوتی: 'خاتوون، مەگەر چۆنم
ـدروست کردووە؟' ژنە گوتی: 'ئەم قاتی پێنجەمەت زۆر تەسک دروست کردووە.'
ـارتاش گوتی: 'کچێ خاتوون، فراوانە.' ژنە گوتی: 'دا تۆ بچۆ ناو ئەم قاتەوە و تاقی کەوە
ـا تەسکی و فراوانییەکەیت بۆ دەرکەوێ، بزانە جێت دەبێتەوە؟' دارتاش گوتی: 'بڕوات بێ
خاتوون، ئەم قاتە بێجگە لە من، جێی چوار کەسی دیکەش دەبێتەوە.' ئەوجار دارتاش
چووە نێوییەوە و ژنە گورج دەرگەکەی داخست و کڵۆمێکی قایموقۆڵی لێ دا. ئەوجار
کاغەزی میری هەڵگرت و بە پەرتاو بەرەو گرتووخانە کەوتە ڕێ. کە بەندیوانەکە
کاغەزەکەی دی، خوێندیەوە و لاوەکەی دڵداری ژنەی بەر دا. ژنە هەر چییەکی کردبوو، بۆ
یارەکەی گێڕاوە. لاوەکە گوتی: 'دەی ئێستا چی بکەین؟' ژنە گوتی: 'دەچینە شارێکی دی.
ـدوای ئەم کارەی من کردوومە، ناتوانم لێرە بمێنمەوە.' ئیدی هەر چییەکیان بوو لە
وشترانیان نا و خێرا لەو شارە ڕۆیشتن و بەرەو شارێکی دیکە چوون.

ئەو چەند کەسەش سێ ڕۆژ بەبێ نان و ئاو لە نێو سندووقەکەدا بوون. ئەوە بوو
وەزیر لە خۆیەوە گوتی: 'ئەک لەعنەتی خودا لەم ژنە بێ کە بێجگە لە پاشا هەموو

گەورەکانی وڵاتی لێرەدا کۆ کردووەتەوە.' پاشا گوتی: 'کوڕە بێدەنگ بە. یەکەم کەسێک کە ئەم جندەیە خستوویەتە داوەوە، منم.' دارتاش کە قسەکانی ئەوانی بیست، گوتی: 'باشە گوناحی من چی بوو کە ئەم سندووقەم بە چوار دینار درووست کردبوو؟ کەچی کە هاتم پارەکەم وەرگرم، بە فێڵ و زۆر منیشی لێرە پەستاوت!' ئەو پێنجە پێکەوە ئەئاوا پێکەوە قسەیان دەکرد و دڵخۆشی پاشایان دەداوە. وا بوو دووسێ ڕۆژێکی پێچوو، چەند کەس لە دراوسێکانی هاتنە بەر دەرگاو گوتیان: سەیرە! ماڵێکی چۆڵ و هۆڵە. پاشان یەکدوانێکیان گوتیان: 'باشە خۆ دوێنێ خێزانی بازرگان، لە ماڵ بوو، بڵێی لە کوێ بێ وا دیار نییە و دەنگی نایە؟!! وەرن با دەرگەی حەوشەیان بشکێنین و شتێکمان بۆ ڕوون ببێتەوە، نەوەک شتێک رووی دابێ و دوایە ئێمە تووشی کێشە بین.' دەرگەیان شکاند و چوونە ماڵەکەوە. تەماشایان کرد دەنگی ناڵە و پاڕانەوە و کوڕووزانەوە دێ. سەمەنا هێندە برسی و تینوو بوون برستیان لێ بڕابوو ـــ کە جوان سەرنجی وڵاتیان دا، سەیریان کرد سندووقێک لەوێیە دەنگەکە لە سندووقەکەوە دێ. یەکێک لە هاوسێکان گوتی: 'بڵێی ئەو سندووقە جنۆکەی تێدا بێ؟' یەکێکی دیکەیان گوتی: 'وەرن دەست دەنێ با بیبەین بیسووتێنین. .' قازی لە جێوە هاواری لێ هەستا و گوتی: 'کوڕە بۆ خاتری خودا کاری وا نەکەن!

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ! قازی لە جێوە هاواری لێ بەرز بووەوە و گوتی: 'کورە خەڵکینە بۆ خاتری خودا کاری وا نەکەن!' ئەوان بە یەکدییان گوت: 'گومانی تێدا نییە کە ئەمان جنۆکەن. چونکە جاروبار جنۆکە دێنە سەر شێوەی مرۆڤ و وەک ئەوان قسە دەکەن.' کە قازی ئەو قسەیەی لەوان بیست، ئایەتێکی قورئانی خوێندەوە و بانگی خەڵکەکەی کرد و گوتی: 'دا ئێوە لە سندووقەکە وەرنە پێشێ با لێک حاڵی بین.' خەڵکەکە کەمێک نیزیک بوونەوە، قازی گوتی: 'من فڵان کەسم و لەگەڵ چەند کەسی دیکە لەو سندووقەکەدا گیرامان کردووە.' دراوسێکان پرسییان: 'کێ ئێوەی کردووەتە ئێرەوە؟'قازی بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە. ئەوجار ئەوانیش چوون دارتاشیان هێنا و سندووقەکەیان کردەوە و پاشا، وەزیر، میر، قازی و دارتاشیان لە سندووقەکە هێنا دەرێ. سەیر لەودا بوو هەر یەکەی جلوبەرگەکەی لە ڕەنگێک بوو. سەیری یەکتریان دەکرد و پێدەکەنین. بەدوای ژنی بازرگاندا گەڕان، کەچی لە هیچ کوێ دار نەبوو. سەیریان کرد هەموو شتەکانی ماڵەکەی لەگەڵ جلوبەرگەکانی ئەواندا بردووە. ئەوجار هەنتەشییان جلوبەرگیان بۆ هێنان و ئەوانیش لە بەریان کردن. کە وڵات تاریک بوو هەرکەسەی چووەوە ماڵەکەی خۆی.

" 'جا پادشام، تەماشاکە ئەو ژنە چۆن فێڵی لەو تاقمە کرد و خاپاندنی. من ئەم چیرۆکەم بۆ گێڕایەوە تا ئاگات لە فێڵ و دەهۆی ژنان بێ و بە قسەی ئەم ژنە نەکەیت و کورەکەت کە پارچەیەکە لە جەرگت، نەی کوژی و ناوی خۆت لە پەڕەی ڕۆژگاردا ڕەش نەکەیت.'

"کە وەزیر قسەکانی تەواو کرد، پاشا بە گوێی کرد و لە کوشتنی کوڕەکەی پەشیمان بووەوە. کە ڕۆژی حەوتەم هات، کەنیز بە هاتوهاوارەوە هاتەوە هەنتەشی پادشا و ئاگرێکی بە دەستەوە بوو و گوتی: 'پادشام، ئەگەر بە ویژدانەوە دادوەری نەکەی، ئاگر لە خۆم بەر دەدەم، چونکە ئیدی بەڕاستی لە ژیان تێر بووم. جا ئێستا کە ویستم بێمە هەنتەشی پاشا، وەسیێتی خۆم کرد و ماڵ و سامانەکەم دا بە هەژاران و ئامادەی مردنم. بەڵام پادشا ئەوەندە بزانە ئەگەر تۆ مافم نەستێنی پەشیمان دەبییەوە، هەر وەک ئەو پادشایەی لە ئازاردانی ژنێکی چاکەکار پەشیمان بووەوە.' پاشا گوتی: 'دادەی بیگێڕەوە با بزانم چۆن بووە.'

**چیرۆکی ملوانکەی دزراو**

"کەنیزە گوتی: 'پادشــام، بیســتوومە ژنێکی پەرواکار بەردەوام خەریکی خوداپەرسـتی بوو. جاروباریش دەچووە کۆشـــکی پاشـــایەک لە پاشـــایان و بە چوونی ئەو خێر و بەرەکەتیان بەســـەدا دەباری و بە هۆی دۆعای بەخێرییەوە ڕزق و ڕۆزیان زیادی دەکرد. ڕۆژێک هەر وەک جاری جاران چووە کۆشـــک و لە کن شــاژنەوە دانیشــت. ژنی پاشــا ملوانکەیەکی پێ ســـپارد کە بایی هەزار دینار بوو و گوتی: 'فلانی، ئەمە لای خۆت بپارێزە تا من دەچمە گەرماو و دێمەوە.' ژنەی پەرواکار ملوانکەی هەڵگرت و لە ماڵی شـــاژن دانیشت. شاژن چووە گەرماوی کۆشک و ژنەش ملوانکەکەی لەبەردەم بەرماڵەکەیدا دانا و نوێژەکەی دابەســـت. خەریکی نوێژ بوو کە باڵندەیەک هات و ملوانکەی ڕفاند و خســـتییە یەکێک لە درزەکانی کۆشـکەوە و ژنە ئاگای لەوە نەبوو. کە شــاژن لە گەرماو هاتە دەرێ، داوای ملوانکەی کرد، ژنە تەماشـــای کرد ملوانکەکە لەوێ نەمابوو. بۆی گەڕا و هیچ دیار نەبوو. بە شاژنی گوت: 'کچم، خودا خۆی شایەدە کەس نەهاتووەتە ئێرە و من ملوانکەکەم لەبەردەم بەرماڵەکەمدا دانابوو. نازانم ئاخۆ یەکێک لە خزمەتکارەکان بینیبێتی و بەدزیی منەوە هەڵیگرتبێت یان نا. خۆ جگە لە خوداش کەس ئاگای لە پێوار نییە.' کە پادشـــا بەو هەواڵەی زانی، بە شاژنی گوت کە ئازاری ئەو ژنە پەرواکارە بدا و داخی بکا.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ! شاژن بە شێوازی جۆراوجۆر سزای ئەو ژنە پەرواکارەی دا و ئەو سرووشتپاکەش هیچی لە خۆیدا بەدی نەدەکرد تا دانی پێدا بنێ و تۆمەتیشی وەپاڵ کەس نەدا. ئەوجار پاشا فەرمانی دا بیخەنە بەندیخانەوە و دەست و پێی زنجیر بکەن. پاشان رۆژێکیان پاشا لەگەڵ ژنەکەیدا لە کۆشکدا دانیشتبوون کە چاوی بە باڵندەیەک کەوت ئەو ملوانەکەیەی لە درزی دیوارێکدا رادەکێشا. لە جێوە پاشا بانگی کەنیزانی کرد. کەنیزان ملوانەکەیان لە باڵندەکە ستاندەوە. ئەوجار پاشا زانی ئەو ژنە ستەمی لێ کراوە و لە کردەی خۆی پەشیمان بوو و فەرمانی دا ژنە بێنن. کە هێنایان، پاشا سەری ماچ کرد و سامانێکی زۆری دایێ. ئەو داماوە کە دەستی لە ماڵی دنیا شۆردبوو، پارە و درەمەکەی وەرنەگرت و لەلای پاشا بە دڵێکی رەنجاوەوە چووە دەرێ و سوێندی خوارد کە تا زیندووە پێ نەنێتە ماڵی هیچ کەسێکەوە و لە دەشت و کێوان بژی. قسەکەشی بردە سەرێ. جا پاشام، لەبارەی فێڵ و تەڵەکەی پیاوانەوە بیستوومە ...

### چیرۆکی شازادە بارام و کچی پاشا

"'... کچە پاشایەک لە جوانی و دەلالی و رەزاسووکیدا لە دنیادا تای نەبوو، دەیگوت: ئەم سەردەمەدا کەس بە قەد من جوان نییە!' شازادەکان لە هەموو ولاتانەوە دەهاتنە خوازبێنی و هیچ کامیانی بە شایانی خۆی نەدەزانی و دەیگوت: 'کەس شیاوی ئەوە نییە بێ بە مێردی من، مەگەر ئەوەی لە گۆرەپانی شەردا بەسەرمدا زاڵ بێ. جا ئەگەر کەسێک هەبێ بەسەرمدا زاڵ بێ، ئەوە بە دڵی خۆم مێردی پێ دەکەم. خۆ ئەگەر من بەسەر ئەودا زاڵ ببم، ئەوا ئەسپ و چەکی لێ دەسێنم و لە تەوێڵی دەنووسم ئازادکراوی فلانە کەنیشکە.'

"'بە گشتی، کورە پاشاکان لە هەموو لایەکەوە دەهاتن، بەڵام کچە بەسەریاندا زاڵ دەبوو، ئەسپ و چەکی لێ دەستاندن و درۆشمێکی خۆی بە تەوێڵیانە دەنا. وا بوو شازادەیەک کە ناوی بارام بوو، ناوبانگی ئەو پەریسیمایەی بیست. بار و تفاق و سامانێکی زۆری پاشایانەی لەگەڵ خۆی هێنا و بە نیازی خوازبێنی ئەو کچەوە کەوتە رێ. کە گەیشتە شاری باوکی کچە، دیارییەکی شایان و گرانبایی بۆ پاشا نارد. دوایە وەزیرەکەی ناردە خوازبێنی کچەکەی. پاشا وەڵامی ناردەوە: 'کورم، بەشوودانی کچەکەم بە دەست من نییە و ئەو سوێندی خواردووە شوو بە کەس ناکا، مەگەر ئەوەی کەسێک بتوانێ لە گۆرەپانی شەردا بەسەریدا زاڵ بێ.' شازادە وەڵامی ناردەوە: 'منیش کە لە

شاری خۆم هاتم، ئەوەم دەزانی.' پاشا گوتی: 'کە وایە، سبەینێ دەیبینی.'

" 'ســـبەینێ پاشـــا هەواڵی بۆ کچەکەی نارد. کچە گورج خۆی بۆ شـــەڕ ســـاز کرد و چەکوچۆلی لە خۆی دا و هاتە گۆڕەپان. شـــازادەش بە مەبەســـتی شـــەڕ بۆی دەرچوو. خەڵکی کە ئەوەیان بیســـــت، لە دوور و نیزیکەوە پۆلپۆل هاتنە تەماشـــــایان و لێیان کۆ بوونەوە. دیتیان شـــازادە خانم ڕووبەندی بەســـتووە و جلی شـــەڕی لە بەر کردووە، کاکی شازادەش بە جەکی تەواوەوە هاتووەتە کێبڕکێ. ئیدی شاڵاویان بۆ یەکدی برد و ماوەکەی زۆر بەرەنگاری یەک بوونەوە، کچی پاشا ئازایەتییەکی لە شازادەدا بەدی کرد کە لە کەسی دیکەدا نەیدیبوو. بۆی دەرکەوت کە ئەگەر فێڵێک نەکات، شازادە بارام بەسەریدا زاڵ دەبێ. ئەوە بوو هەر بۆ فێڵ ڕووبەندی لا برد و ڕووی وەک مانگی تابانی دەرکەوت. شـــــازادە بارام بە بینینی هێزی لە بەر بڕا و دەســـت و پێی شـــکا. شـــازادە خاتوون کە ئەوەی دی. هێرشی بردێ و لەسەر ئەسپەکەی هەڵیگرت. شازادە بارام بە دەستیەوە وەک چۆلەکە بوو بە چنگ بازەوە. هێزی پەلکوتانی نەبوو خۆی ڕزگار کا. ئەوجار شـــــازادە خانم ئەســـپ و چەکی لێ ئەستاند و بە ئاسنی سوورەوەبوو درووشمێکی خۆی لە تەوێڵییەوە نا و داخی کرد. ئەوجار بەری دا.

" 'کە بارام هاتەوە ســـــەر خۆ و ئاســـــایی بووەوە، چەند ڕۆژێک لە داخان و لە تاوان حەجمینی نەبوو. خەو و خۆراکی نەما. لە تاو ئەوینی کچە حاڵی گۆڕا. دیســـــان پیاوی لە باوکی کچە ڕاسپارد و نامەیەکی بۆ نووسی پێی گوت: 'پێت وا نەبێ من دەگەڕێمەوە. یان گیانم دادەنێم، یان بە ئاواتی دڵم دەگەم.' کە نامەکە بە دەستی باوکی گەیشت، پەشۆکا و بۆ کوڕەکەی خەمبار بوو و ویســـتی ســـوپا بنێرێ بۆ یارمەتی. وەزیرەکانی نەیانهێشـــت. ئەوجار شـــازادە بارام بیری لە فێڵێک کردەوە بۆ ئەوەی بە ئاوات بگا. خۆی وەکوو پیرێکی بەســـاڵاچوو لێ کرد. چووە باخێک کە شـــازادە خاتوون زۆربەی ڕۆژەکانی لەوێ بەســـەر دەبرد و ســـــڵاوی لە باخەوانەکەی کرد. پێی گوت: 'من پیاوێکی غەریبەم. هەموو تەمەنم لە نێو باخدا بووم و خەریکی و بەخێوکردنی دار و گوڵان بووم. هیچ کەس هێندەی من لەم کارانە شـــــارەزا نییە، ئەگەر پێت خۆش بێ یارمەتیت دەدەم.' کە باخەوان ئەم قســـــەیەی بیســـت، دڵی خۆش بوو و بردییە باخەکەوە. بە ژێردەســـتەکانی گوت کە هەرچی گوتی بە گوێی بکەن. بارام لە نێو باخدا بۆخۆی خەریکی جوانکردن و هەڵپەرتاوتنی لکوپۆپی زیادی دارەکان بوو. تا ڕۆژێکیان تەماشـای کرد ئەوە چەند کەس خەریکن فەرش و دەفر و شـتی وا بە وشـتران دێننە ناو باخەکەوە. شـازادە بارام پرسـی ئەوە چ باسـە. گوتیان: شـازادە خاتوون دەیەوێت بۆ حەسانەوە و پشوودان بێتە ئێرە. بارام بە لەز خۆی گەیاندە دەرێ و بەشیک لەو خشڵە زێڕینانەی کە بە گەوهەر ڕازێنرابوونەوە و لە شاری خۆیرا هێنابوونی. لەگەڵ خۆی هێنانی بۆ باخەکەوە و لە جێیەک دانیشت. جل و بەرگی هەژارانە و پیرانەی لە

ـەر کرد و زێڕەکانی لە پێش خۆی ڕیز کرد. ئەندامیشـــی دەلەرزی و وای دەنواند کە بە هۆی پیری و بێهێزییەوەیە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی پێنجسەد و نەوەد و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ! بارام وای دەنواند کە بە هۆی پیرییەوە دەلەرزێت. پاش ماوەیەکی زۆر، کچی پاشـــا لەگەڵ کەنیزەکانی کە وەکوو مانگ دەچوو لە نێو ئەســــتێراندا، هاتنە باخەکەوە و خەریکی میوەڕنین بوون کە پیرەپیاوێکیان بینی لە بن دارێکدا دانیشـــتبوو. کە لێی نیزیک بوونەوە، دیتیان لە بەر پیرییان دەست و لاقەکانی دەلەرزن و زێڕ و گەوهەری لەبەردەمدایە. کە ئەو شـتانەیان بینی، سـەریان سـووڕ ما و پرسـییان: 'ئەم شتە پاشـایانە لەبەر چین؟' بارامی پیرنوێن گوتی: 'دەمەوێ بەوانە یەکێکتان بخوازم.' کەنیزان لە قاقای پێکەنینیان دا و پرسییان: 'ئەگەر یەکێک لە ئێمە بێنی، چی دەکەی؟' وەڵامی دانەوە: 'ماچێکی لێ دەســـتێنم و بەری دەدەم.' کچی پاشـــا ئاماژەی بۆ کەنیزێک کرد و گوتی: 'ئەوە ئەو کەنیزەم دایتێ.' بارام دەموودەســت بە لەرزۆکی و خۆگرتن بە گۆچانەکەیەوە هەســتا، ئەو کەنیزەی ماچ کرد و ئەوەی لەبەردەم خۆیدا دانابوو، دایێ. ئەو کەنیزە دڵی خۆش بوو و کەنیزەکانی دیکە پێی پێکەنین.

" 'بۆ ســـبەینێش هـاتنەوە بـاخ و چوونەوە بۆ لای پیرەپیـاو. دیتیـان لە هەمـان جێ دانیشتووە و لە دوێنێ زیاتر زێڕ و گەوهەری لەبەردەمدایە. پێیان گوتی: 'یا شێخ، چی لەم زێڕ و گەوهەرانە دەکەی؟' وەڵامی دانەوە: 'هەر وەکوو دوێنێ، بەمانە یەکێکتان دێنم.' کچی پاشا ئاماژەی بۆ کەنیزێک کرد و گوتی: 'دەی ئەوە ئەو کەنیزەم دایتێ.' بارام هەستا ماچی کرد و ئەوەی لەبەردەمیدا بوو دایێ. ئەوان بە پێکەنین گەڕانەوە جێی خۆیان.

" 'کە کچی پاشـــا دیتی ئەو هەموو زێڕ و گەوهەرانەی بە کەنیزەکان دا، لە دڵی خۆیدا گوتی: 'من شـایانی ئەم زێڕ و گەوهەرانەم. خۆ ئەگەر من ماچ بکا، هیچم لێ کەم نابێتەوە.' جا بۆ سبەینێ کچی پاشا لە شێوەی کەنیزێکدا بە تەنیا هاتە دەرەوە، چووە کن شێخ و پێی گوت: 'یا شـــێخ، من کچی پاشـــام. ئەی دەتەوێ من بێنی؟' بارام گوتی: 'بە گیان و دڵ دەمەوێ.' ئەوجار زێڕ و گەوهەری گرانباییتری دەرهێنا، دایێ و هەســـتا ماچی بکا. کچی پاشـــا بە گومانی خۆی پیرەپیاوێک ماچی دەکا، بەڵام کە بارام پێی گەشــت، توند گرتی و درێژی کرد و کردی بە ژن و پێی گوت: 'دەمناسـی؟' شـازادە خانم گوتی: 'تۆ کێی؟' گوتی 'شـازادە بارامم. کوڕی پادشـای ئێرانم سـەبارەت بە تۆ شـێوەی خۆمم گۆڕی و لە خاک و خەڵکی خۆم دوور کەوتمەوە.' کچی پاشـا کە ئەمەی بیسـت، هەسـتایەوە و سـەری لە فێڵی ئەو کوڕە سووڕ ما. لە شەرمان قسەی بۆ نەدەکرا و لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەگەر من ئەمە بە کوشـت دەم، سـوودی بۆم نابێ و چارەی ئەم ئابڕووچوونە ناکا. هیچم بۆ نەماوەتەوە جگە لەوەی لەگەڵی بڕم و بچمە شار و وڵاتەکەی ئەو.'

" 'هەســـتا چووەوە ماڵێ هەرچی پارە و زێڕ و گەوهەری بوو پێچایەوە و کەســـێکی نارده کن شـازاده بارام و ئەوی لە هەڵوێسـتەکەی ئاگادار کردەوە. بارامیش ئامادە بوو و بڕیاریان دا کە شـــەو پێکەوە هەڵێن. کە کاتی دیاریکراو هات، ســـوار بوون و کەوتنە ڕێ. ئەو شـەوە یەک تەکان بەڕێوە بوون هێشتا ڕۆژ نەبووەوە کە مەودایەکی دوور و درێژیان بڕی و بەم جۆرە هەر ڕۆیشـتن ڕۆیشـتن تا گەیشـتنەوە شـاری باوکی شـازادە. پاشـایان ئاگادار کردەوە و ئەویش بە ســـوپایەکی زۆرەوە هاتە دەرەوە. چاوی پێیان کەوت و دڵی خۆش بوو. دوای چەند ڕۆژێک نێردەیەکی ناردە لای باوکی کچە، دیاریگەلی گرانبایی نارد و نامەیەکی بۆ نووســی. ئاگاداری کردەوە کە کچەکەی لای ئەوە و داوای گیازەکەی دەکا. کە ڕاسـپاردەی باوکی کوڕە گەیشـتە لای باوکی کچەو دیارییەکان و نامەکەی دایە. باوکی کچە ئەوەی زانی، گەلێک ڕێزی لە ڕاســـپاردەکە گرت و بە هەواڵەکە دڵخۆش بوو. قازی و شـــــایەدی بانگ کرد و کچەکەی لە بارام مارە کرد. جلوبەرگی شـــکۆمەندانە و گیازی کچەکەی بە ڕاسـپاردەکەدا نارد. ئیدی بارام و کچی پاشـا لە خۆشـگوزەرانی و کامەرانیدا ژیان تا مەرگ لێکی هەڵبڕین. جا پاک و بێگەردیی بۆ ئەو خودایەی کە نامرێ.'

"کەنیزەکە کە ئەم چیرۆکەی گێراوە، دوایی گوتی: 'پادشـام، دەی تۆ تەماشـای فڕوفێڵی پیاوان کە و هەقی من مەفەوتێنە.' ئەوجار پاشـــا فەرمانی کوشـــتنی کوڕەکەی دا. ئەوجار وەزیری حەوتەم چووە دیوانی پاشـــا و لاشـیپانی دەرگەی دیوانی پاشـــایەتی ماچ کرد و گوتی: 'قوربان، تۆ بەس ئەوەندە مۆڵەتم بەرێ تا ئەم پەندەت بۆ باس بکەم کە هەرکەس لە کارێکدا دان بە خۆیدا بگرێ، بە ئاواتی خۆی دەگا و هەرکەس پەلە بکا، پەشیمان دەبێتەوە. پادشام، ئەم کەنیزە کەڵەکەبازە لەڕێی ناز و نووز و ئاین و ئۆینەوە داوای کارێکی گەورەت لێ دەکا و دەیەوێ کوڕەکەت بە دەست خۆت بە کوشت بدا، ئاگر لە جەرگت بەر بدا. بەڵام، قوربان، من کە پەروەردەی نێو ناز و خۆشـــــیم، ئامۆژگاری چاکەم بۆت هەیە و لەبارەی فێڵی ژنانەوە گەلێک چیرۆک دەزانم کە جگە لە من کەس نایانزانێ و یەکێک لەوانە چیرۆکی پیرەژن و کوڕە بازرگانە.' پاشا گوتی: 'تۆش ئەوە بگێڕەوە با بزانم چۆنە.'

## چیرۆکی کوڕە بازرگان و خانوویەکی خۆش

"وەزیر گوتی: 'بیستوومە بازرگانێکی دەست ڕۆیشتوو، کوڕێکی هەبوو گەلێ لای ئازیز بوو. ڕۆژێک کوڕە بە باوکی گوت: 'باوکە، داوایەکم لێت هەیە، ئەگەر جێبەجێ بێ زۆری پێ دڵخۆش دەبم.' باوکە گوتی: 'ڕۆڵە گیان، داواکەت چییە؟ ئەگەر پێویســـــت بکا بینایی دیدەم دەدەم، تا تۆ بە ئاوات بگەی.' کوڕە گوتی: 'پێم خۆشـە بڕێکم ماڵ و سـامان بدەیەی تا لەگەڵ بازرگاناندا بچمە بەغدا و کۆشـکی خەلیفە ببینم و بەسـەر دیجلەدا کەمێک بگەڕێم.

ئاخر کوڕه بازرگانەکان زۆر تاریفی بەغدا دەکەن. منیش زۆرم حەز لە بینینێتی.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پێنجسەد و نەوەد و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خـاوەنشـــکۆ! بـاوکی گوتی: 'کوڕم ئەخە چۆن دڵم تـاقەت بێنێ تۆ لێم دوور کەوییەوە؟' کوڕە بە باوکی گوت: 'باوکە جا ئەوە ئەمن پێم گوتی، هەر دەبێ بشـــچم جا ئەگەر ڕێم بدەی و بە خۆشـــی بەڕێم کەن ئەوە باشــــە دەنا بۆخۆم دەڕۆم. چونکە لە تاو دیتنی بەغدا ئەوە دڵم دەتۆقێ.' کە باوکی زانی کوڕەکەی لەسـەر قسـەی خۆی سـوورە، بایی ســـیهەزار دینـار شـــتومەک و کاڵای بۆ کڕی و لەگەڵ بازرگانانی بەهورم[1] و باوەڕپێکراودا ناردی. کوڕە لەگەڵ بازرگاناندا کەوتە ڕێ تا گەیشتنە بەغدا.

"کوڕە بازرگان چووە بازاڕ تا خانوویەک بە کرێ بگرێ. لە کۆڵانێکدا خانوویەکی زۆر گەورە و جوانی دی کە زەمینەکەیـان بە مەڕمەڕی جۆراوجۆر فەرش کردبوو و میچی هەیوانەکەی بە لاجوەردی شـــین و زێڕاو نەخشـــاندبوو. نرخی کرێی خانووەکەی لە دەرگەوانەکان پرســـی. گوتیان: 'مانگانەکەی دە دینارە.' کوڕە بازرگان گوتی: 'ئەوە بە ڕاسـتتانە یان گاڵتەم لەگەڵ دکەن؟' گوتیان: 'بە خودا بە ڕاسـتمانە! بەڵام هەرکەسـێک لەم ماڵەدا نیشـــتەجێ بێ، هەفتەیەک یان دووان زیاتر ناخایەنێ.' کوڕەکە هۆیەکەی پرســـی. دەرگەوانەکان گوتیان: 'گەنجۆ، ئەوەی بچێتە ئەم خانووەوە، یا نەخۆش دەکەوێ یا دەمرێ. ئەم خانووە لای هەمووان بەمە بە ناوبانگە و بەم هۆیەوە کەس نایەتە ناوی. ئەوە بۆیە کرێکەی ئەوەندەیە.' کە کوڕە ئەم قســـەیەی بیســـت، زۆری پێ ســـەیر بوو. گوتی: 'بە دڵنیاییەوە ئەم خانووە شتێکی تێدایە کە دەبێتە مایەی نەخۆشی و مەرگ.' ئینجا پشتی بە خودا بەست. ترس لە شەڕی شەیتان و جنۆکانی لە دڵ دەرکرد و لەو خانووەدا نیشتەجێ بوو و دەستی کرد بە کڕین و فرۆشتن.

" 'چەند ڕۆژ تێپەڕی و هیچ نەخۆشـییەکی تووش نەبوو و هیچ نیشـانەیەک لەوانە دیار نەبوو. کە دەرگەوانەکان باسـیان کردبوون. ڕۆژێکیان لە بەردەرگەی ماڵەکەی دانیشـتبوو پیرەژنێک هات کە تەسبیحات و نزای دەکرد و بەردی لەسەر ڕێی موسڵمانان لا دەبرد. کە ئەو کوڕەی لە بەردەرگەی ئەو خانووەدا دیت، ســـەری ســـووڕ ما و بە واقوڕماوییەوە ســـەیری کرد. کوڕەکە گوتی: 'دایە، ئەوە دەمناســـی یان منت لەگەڵ کەســـی دیکەدا لێ گۆڕاوە؟' پیرەژن کە قســـەکەی بیســـت، بەرەو لای چوو، ســـڵاوی کرد و گوتی: 'ڕۆڵە، چەندێکە لەم خانووە دای؟' کوڕە گوتی: 'ماوەیەکە.' پیرەژن گوتی: 'ڕۆڵە، نە دەتناسـم و نە لەگەڵ کەسـدا لێم گۆڕاوی، بەڵام ئەوەم پێ سـەیرە کە هەرکەس هاتبێتە ئەم خانووەوە، یا مردووە یا تووشی دەرد و نەخۆشی زۆر تووش بووە. کوڕم، ڕەنگە تۆ هێشتا نەچوو بێتە

---

1. هورم: جێی باوەڕ.

سەربانی کۆشکەکە و سەیری ئەو دیمەنەت نەکردبێ کە لەوێیە؟' پیرەژن ئەمەی گوت و لێیدا ڕۆیشت بە لای کاری خۆیەوە.

" 'کە پیرەژنە لەوێ دوور کەوتەوە، کوڕە بازرگان کەوتە بیرکردنەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی: 'من تا ئێستا نەچوومەتە سەربانی کۆشکەکە و سەیری ئەو دیمەنەم نەکردووە کە لەوێیە.' دەمودەست هەستا، لە حەوشەکەدا بە چواردەوری ماڵەکەدا سووڕاوە تا دەرگەیەکی بچووکی بینی کە جاڵجاڵۆکە بە تەون تەنیبووی. بە خۆی گوت: 'تەونی جاڵجاڵۆکە مانای ئەوەیە کە مەرگ لە نێو دایە.' ئەو هەموو ترسەی ناوێ وەک خودا دەفەرمێ:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَىٰنَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ ﴾ التوبة: ٥١

واتا: ﴿ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! پێیان بڵێ: ئەوەی کە خودا لەلەوحولمەحفوض دا بۆی نەنووسیبین نایەتە ڕێمان تووشمان نابێ. ئێمە لەژێر چاودێری مەشیئەتو قەزاو قەدەری خودا داین. ئەو سەرپەریشتیارو یارمەتیدەرو ڕەنگرێژی کارو بارمانە. با موسوڵمانان تەوەکولیان هەر بەخودا بێ، پشتیان هەر بەو ببەستن، واتە: بڵێ: ئێمە هەر بەخودا پشت دەبەستینو ئەومان بەسە، نابێ موسوڵمانان جگە لەخودا پشت بەهیچ کەسی تر ببەستن، ئەمجار بڕوا بەقەزاو قەدەری خوداو پشت بەستن بەخودا نابێ ببنە لەمپەڕ بۆ دابینکردنی پێویستیاتی ژیان لەشەڕو ئاشتی دا بەگوێرەی توانا، چونکە ئەوە فەرمانی خودایە بەڕونو ئاشکرا فەرمان بەموسوڵمانان دەکا: کە هەرچی لەتوانایان دا هەیە لەچەکو تفاق بۆ بەرامبەری کافران دابینی بکەن﴾.

ناوی خودای لێ هێنا و دەستی برد و دەرگەی کردەوە. پەیژەیەک لەوێدا بوو بەو پەیژەیەدا سەر کەوت. چووە سەربانی کۆشکەکە و لەوێ دیمەنێکی بینی و بۆ حەسانەوە و سەیران لەوێ دانیشت. سەیری شوێنێکی خۆش و پاکی کرد و بەسەر ئەو شوێنەوە ژوورێکی بڵندی بینی کە بەسەر تەواوی بەغدادا دەیڕوانی. لەو ژوورەدا کیژێک دانیشتبوو لە گوێن حۆری بەهەشتی. کە چاوی بەو کچە کەوت، خورپەیەک بە دڵیدا هات و هۆش و گۆشی لای خۆی نەما. تووشی ڕەنجی ئەییوب و خەمی یەعقووب بوو و بە خۆی گوت: 'ڕەنگە مەرگ و نەخۆشی دانیشتووانی ئەم ماڵەیش هۆیەکەی هەر ئەم کچە جوانە بووبێ. خۆزگە دەمزانی چۆن ڕزگارم دەبێ؟ شێت بووم، تاقەتم نەماوە!'

" 'دوای ئەوە هەستا چووەوە خوارێ و لە ژوورێ کەمێک دانیشت، بیری لە کاروباری خۆی دەکردەوە. ئارام و قەراری لێ بڕا. هەستا چوو لە بەردەگە دانیشت و ئەو ڕووداوانە کاسیان کردبوو. وا بوو لە ناکاو هەمان پیرەژن بە بەدەم تەسبیح و نزاوە پەیدا بوو. کە کوڕە دیتی، هەستا سڵاوی لێ کرد و گوتی: 'دایە گەورە، خودا خێرت بنووسێ کە ئەو قسەیەت بۆ کردم و بوویتە مایەی ئەوەی ئەو دیمەنە ببینم. شتێکم دی، وڕ و کاسی کردووم و گومانم وایە تێدا دەچم و تۆ نەبی کەس چارەی دەردم ناکا.' پیرەژن کە ئەم قسەی بیست، پێی پێکەنی و گوتی: 'ئیشەڵلا هیچت لێ نایە.' کوڕە کە ئەم قسەیەی بیست، خێرا چووە ماڵەوە و زوو هاتەوە دەرێ. سەد دینار زێڕی سووری لە دەستدا بوو. بە پیرەژنەی گوت: 'دایە گەورە، ئەمە بگرە و بەو جۆرە لەگەڵمدا بجووڵێرەوە کە گەوران لەگەڵ کۆیلەکانیاندا دەجووڵێنەوە. خێرا فریام کەوە، ئەگەر بمرم، لەو دنیا بەرۆکی تۆ دەگرم.' پیرەژن گوتی: 'بە سەر چاو کوڕم، بەڵام دەبێ من چیم پێ گوتی تۆش بە قسەم بکەیت.' کوڕە بازرگان گوتی: 'دایە گەورە، چۆن بڵێی وا دەکەم.' پیرەژن گوتی: 'بچۆ بۆ بازاڕی ئاوریشمفرۆشان دووکانی ئەبوولفەتح کوڕی قەیدام بدۆزرەوە. کە چوویتە دووکانەکەی، سڵاوی لێ بکە، دانیشە و پێی بڵێ: 'لەو کۆچکانەم دەوێ وا دەورەکەیان بە زێڕ داگیراوەتەوە.' کە کۆچکەکەی دەرهێنا، بە نرخێکی گران لێی بکڕە و بیهێنەوە تا من سبەینێ دێمە لات.' ئەوجار پیرەژنە ڕۆیشتەوە و کوڕەش ئەو شەوە هەرچۆنێک بوو ڕۆژی کردەوە. کە خۆر کەوت، هەزار دیناری نایە گیرفانی و چووە بازاڕی ئاوریشمفرۆشان کابرایەکی بازرگان دووکانی ئەبوولفەتحی پیشان دا. کە چووە دووکانەکەی، پیاوێکی سەنگینی دی لەوێ دانیشتبوو و خزمەتکار و کۆیلە لە بەردەمیدا ڕاوەستابوون. کوڕە بازرگانەش چووە پێشەوە و سڵاوی لێ کرد. ئەویش سڵاوەکەی ستاندەوە و فەرمووی کرد دانیشێ. کوڕە دانیشت و گوتی: 'کاکی بازرگان، هاتووم بۆ فلان کۆچکە دەڵێن تۆ هەیتە.' بازرگان کۆیلەیەکی نارد بوخچەیەکی ئاوریشمی بێنێ. کۆیلەکە لە پشتەوەی دووکانەکە بوخچەیەکی هێنا. بازرگان کردیەوە. چەند کۆچکەیەکی دەرهێنا کە کوڕە لە جوانییەکەیان سەرسام بوو. تێیان ڕاما تا وا بوو کۆچکە گۆرینەکەی ناسییەوە. کۆچکەکەی بە پەنجا دینار زێڕی سوور لە بازرگان کڕی. بە دڵێکی خۆشەوە گەڕاوە بۆ ماڵێ.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كه شەوى شەشسەدەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــكۆ! 'كوڕە بازرگان گەڕاوە بۆ ماڵەكەی خۆی. پیرەژن لەڕێوە لێی وە ژوور كەوت. كوڕە كە چاوی پێی كەوت، هەســـتا و كۆچكەكەی دایێ. پیرەژن گوتی: 'ئاگر بێنە.' كوڕە چوو ئاگری هێنا. پیرەژن چمكێكی كۆچكەكەی ســـووتاند. ئەوجار كۆچكەكەی هەڵگرت و چوو بۆ مـاڵی ئەبوولفەتح. كە گەیشـــتە مـاڵیـان، لە دەرگەی دا. ئـافرەتێكی پەریئاسا دەرگەی لێ كردەوە. جا چونكە دایكی كچە و پیرەژن ئاشنایەتییان هەبوو، كچە دەیناسـی و گوتی: 'دایە گیان، چیت دەوێ من لە خزمەتتدام؟ بەڵام ئەگەر كارت بە دایكمە. مـاوەیەک لەمەوبەر گەڕاوە بۆ مـاڵی خۆی.' پیرەژن گوتی: 'ڕۆڵە گیـان، دەزانم كە دایكت لێرە نییە و خۆم ئێســـتا لای ئەو بووم. بۆیەش هاتمە ئێرە، چونكە دەترســـم كاتی نوێژ بەسـەر بچێ و فریا نەكەوم نوێژەكەم بكەم. دەمەوێ لای تۆ دەسنوێژێ بگرم و نوێژەكەم بكەم، چونكە دەزانم تۆ پاكی و ماڵەكەشـــت خاوێنە.' كچە فەرمووی كرد. ئەوجار پیرەژن چووە ژوورەوە و سڵاوی كردێ و دۆعای خێری بۆ كرد. ئینجا مەسینەی هەڵگرت، چووە سەرئاو و دەسنوێژی گرت. نوێژەكەی دابەست. لەپڕدا نوێژەكەی بڕی و بە ژنەكەی گوت: 'كچم، پێم وا بێ ئێرە بۆ نوێژ بـاش نەبێ چونكە ئەگەری ئەوە هەیە خزمەتكاری وا پێی نـابێتە ئێرە كە پـاک و پیس لێک نەكـاتەوە. ئەوە بۆیە نوێژەكەمم بڕی. دەمەوێ جێیەكی دیكەم پیشـــان بدەی تا لەوێ نوێژەكەم بكەم.' ئافرەتەكە دەســـتی گرت و بردییە ســـەر بەرماڵی مێردەكەی و لەوێ بەجێی هێشـــت. پیرەژن لەوێدا نوێژی دابەســـت و خەریكی چەمانەوە و ڕاســـتبوونەوە و كڕنۆش بوو. لەو دەمەدا دەرفەتی لێ هێنا و ژنەی غافڵگیر كرد و كۆچكەكەی لەژێر پـاڵپشـــتێكدا دانـا و نوێژەكەی تەواو كرد. دۆعـای خێری بۆ ئافرەتەكە كرد و لەوێ هاتە دەرێ.

" 'ئێوارە بازرگان لە بازاڕ هاتەوە و نانی خوارد، دەستی شۆرد و پاڵی وە پاڵپشتەكەوە دا و دانیشـت. لە سـووچی پاڵپشـتەكە دەسـتی وە چمكی كۆچكەكە گرت و دەری كێشـا و ناســـییەوە. لە ژنە وە شـــک كەوت. بانگی ژنەی كرد و پرســـی: 'ئەم كۆچكەیە لە كوێوە گەیوەتە دەســـت تۆ؟' كچە ســـوێندی خوارد: 'جگە لە تۆ كەس نەهاتووەتە لام.' بازرگان لە ترســـی ڕســـوایی لەســـەری نەڕۆیشـــت. ئەو ژنە نێوی مەختییە بوو. بانگی كرد و گوتی: 'بیســـتوومە دڵی دایكت كەوتووەتە ژان و ناســـاغە، ژنان لێ كۆ بوونەتەوە و بەســـەریەوە دەگرین. تۆش هەستە بچۆ بۆ لای.' ژنە گورج هەستا و چوو بۆ لای دایكی. كەچی سەیری كرد ســـاغ و ســـەلیمە. ئەوەندەی پێ نەچوو كە كۆڵكێشـــان كەلوپەلی ژنەیان لە ماڵی مێردەكەیەوە هێناوە. كە دایكی كیژە ئەمەی دی، گوتی: 'كچم، ئەو چی بووە كێشەتان بووە ؟' كچە شتەكەی لە دایكی شاردەوە. ئیدی دایكی دەستی بە گریان كرد و زۆر پێ ناخۆش

بوو، کچەکەی ماڵی شـــێوا. چەند ڕۆژ دوایە پیرەژن هاتە لای دایک و کچە و ســـڵاو لێ کردن. دڵســـۆزی خۆی دەربڕی و گوتی: 'خوشـــکێ، ئەرێ چی لەنێوان کچەکەت و مێردەکەیدا قەوماوە وا تەڵاقی داوە؟ باشە چ گوناحێکی کردووە کە شایانی ئەم سزایە بێ؟' دایکی ژنە گوتی: 'دا تۆ خوشـکایەتی بکە بزانە کارێک ناکەی لە سـای پاکی تۆوە ئاشـت بنەوە! ئاخر تۆ هەمیشـە بەڕۆژوویت و نوێژ دەکەی.' دوایی پیرەژن ڕووی لە کیژە کرد و پێی گوت: 'ڕۆڵە گیان، خەففەت مەخۆ. ئیشەڵڵا هەر لەم ڕۆژانەدا ئاشتتان دەکەمەوە.' دوای ئەوە پیرەژن هەســتا ڕۆیشــت. چووە کن کوڕە بازرگان و پێی گوت: 'بەزم و میوانییەکی خۆش ســاز کە، ئەمشــەو ئەو ئافرەتە دێنمە لات.' بازرگانزادە لەڕێوە هەســتا خواردن و خواردنەوە و شــیرینی و میوەی ئامادە کرد. کە هەموو شــتێکی ســاز کرد، دانیشــت و چاوەڕێیان بوو. پیرەژن چووە کن دایکی ئافرەتەکە و گوتی: 'خوشــکێ، ئەوە میوانییەکمان داوە و پێم خۆش با کچەکەشــت بێ بەشــکوو تۆزێک خەمی دڵی ســووک بێ. دوای ئاهەنگەکەش چۆنم بردووە ئاوا بۆت دێنمەوە' دایکی ئافرەتەکە هەســـتا جلی جوان و ڕازاوەی بە کچەکەی لە بەر کرد و بە بەنرخترین زێڕ و زیو ڕازاندیەوە و لەگەڵ پیرەژندا ڕەوانەی کرد و خۆشی تا بەردەرگە لەگەڵیان چوو. ئەوجار کچەکەی بە پیرەژنە سپارد و گوتی: 'خوشـــکێ، درەنگ نەکەوی و زووم بۆ بێنیەوە. نەوەکوو یەکێ بە چاوێکی دیکەوە تەماشـــای بکا؛ خۆت پلەی مێردەکەی لای خەلیفە دەزانی!' ئیدی پیرەژن کیژی برد چووم بۆ ماڵی کوڕە بازرگان. کیژەکە پێی وا بوو، دەچێ ســـەر زەماوەندێک یان ئاهەنگێکی تایبەت. کە چووە ماڵەکەوە ...' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! 'کە چووە ماڵەکەوە، کوڕە بازرگان لە بەری هەستا، لە باوەشی کرد و دەست و قاچی ماچ کرد. کچە لە جوانی و قۆزی کوڕە سەری سووڕما و ڕووبەڕووی وشک بوو. پیرەژن سەیری کچەی کرد و گوتی: 'کچم، ترست نەبێ و مەپەشۆکێ، من لە لات دانیشتووم و بۆ ساتێکیش لێت جیا نابمەوە. ئەم کوڕە شایانی تۆیە و تۆش شایستەی ئەوی.' ئەوجار کچە تریق بووە و دانیشت. کوڕەش هەر بە دەوریدا دەهات و بە پێکەنینەوە دەیدواند. شیعر و نوکتەی خۆش بۆ دەگوت، هەتا ئاخی کچەی وە قسە هێنا و وردەوردە ڕووی کراوە. ئینجا خواردی و خواردییەوە. کاتێک مەیەکە کاری خۆی کرد، دەستی دا عوود و ژەندی، بەڵام کوڕەی هێندە پێ جوان بوو هۆشی هەر لای ئەو بوو. کوڕە کە ئەمی دی، هێشتا نەیخواردبووەوە، مەست بوو. ئەوجار پیرەژن هاتە دەرێ و دووبەدوو جێی هێشتن. بۆ بەیانییەکەی کە هاتەوە لایان بە کیژە شەنگ و شەپاڵەکەی گوت: 'دوێنێ شەوت چۆنت لێ گوزەرا؟' کیژ گوتی: 'لە چاکە و گەورەیی تووە زۆر خۆشم بەسەر برد.' پیرەژن پێی گوت: 'دەی هەستە با بچینەوە لای دایکت.' کوڕە بازرگان کە ئەمەی بیست، سەد دیناری زێڕی سووری دا بە پیرەژنەکە و پێی گوت: 'بۆ شەوێکی دیکەش ئەم ڕوومانگەم لا بەجێ بێڵە.' پیرەژن زێڕەکانی وەرگرت و لەلایان هاتە دەرەوە و چوو بۆ لای دایکی ژنەکە و پێی گوت: 'کچەکەت سڵاوی دەگەیاندی و دایکی بووکێ سوێندی دا کە ئەمشەویش لای بووکێ بمێنێتەوە.' دایکی ژنە بە پیرەژنی گوت: 'خوشکێ، سڵاوی منیش بە کچەکەم بگەیەنە و پێی بڵێ کە ئەگەر لە مانەوە لەوێ خۆشحاڵە، کێشە نییە. با ئەمشەویش لەوێ بمێنێتەوە و خەیاڵی ئاسوودە بێ و دڵی بکرێتەوە. جا هەر کاتێک خۆی دەیەوێ، با بێتەوە ماڵ. من هەر خەمی ئەوەمە ئەو خەمبار بێ.'

" 'بە کورتی، پیرەژن هەر ڕۆژەی بە فێڵێک دایکی ژنەی فریو دەدا تا وا بوو کیژەکەی حەوت ڕۆژان لای کوڕە بازرگان هێشتەوە و هەموو ڕۆژێکیش سەد دیناری زێڕی لە کوڕە وەردەگرت. کە ڕۆژی حەوتەم هات، دایکی ژنە بە پیرەژنی گوت: 'خوشکم، هەر ئێستا کچەکەم دەهێنیتەوە؛ لە مێژە لەوێیە و نگەرانیم و هەزار خەیاڵی خراپ بە مێشکمدا دێ.' پیرەژنە خێرا بە تووڕەییەوە چووە دەرێ و لە کاتێکدا کە کوڕە بازرگان لە جێگەکەدا نووستبوو، قۆڵی ئافرەتەکەی گرت و هێنایە دەرێ. بردییەوە دایە دەست دایکی. دایک بە بینینی کیژەکەی دڵی خۆش بوو و پێی گوت: 'کچم، ئەوە لە کوێ بووی خەریک بوو دڵم بۆت بتۆقێ. هەر بۆیە لەو هاوڕێیەشم تووڕە بووم و دڵی ئەویشم لێ ئێشا.' کچەکەی بە دایکی گوت: 'هەستە ئاشتی کەوە و دەست و پێی ماچ کە. ئەو چەند ڕۆژە ئەو وەک خزمەتکار بەدەممەوە بووە. جا ئەگەر ئەوە نەکەی کە پێم گوتی، کچی تۆ نیم.' گورج دایکی

ژنەکە هەستا دەست و پێی پیرەژنی ماچ کرد.

" 'کاتێک کوڕە بازرگان لە خەو هەســتا و ئافرەتەکەی لە خەوگەدا نەدی، بەڵام لەوەی بە ئاواتی دڵی گەیشــتبوو، گەلێک شــاد و کامەران بوو. لەو جەنگەیەدا پیرەژن خۆی بە ژووریدا کرد و گوتی: 'گەنجۆ، کارەکانمت پێ چۆن بوون؟' کوڕە بازرگان گوتی: 'کاری تۆ هەر زۆر بەجێیە و زیرەکیت لەوپەڕی دایە.' ئەوجار پیرەژن گوتی: 'دەی کوڕی خۆم، بێ با بچین ئەوەی تێکمان داوە، چاکی بکەینەوە و ئەو ژنە و مێردەکەی ئاشت کەینەوە. ئاخر ئێمە لێمـان هەڵاواردن.' کوڕە بـازرگـان گوتی: 'چۆنی بڵێی وا دەکەم.' پیرەژن پێی گوت: 'بچۆ بۆ دووکانی بازرگان و لەوێ دانیشـــە. من لەوێوە تێدەپەڕم. کە منت بینی، گورج هەســـتە و وەرە من بگرە و جنێوم پێ بـدە و هەڕەشـــم لێ بکە، پیلم بگرە و بەرەو دووکانەکەم بەرە و داوای کۆچکەکەم لێ بکە. بە بازرگان بڵێ، 'قوربان، ئەو کۆچکەیەی لە تۆم کڕی بە پەنجا دینار، ژنەکەم نەیزانی بوو سـووچێکی سـووتاندبوو. منیش کۆچکەکەم دا بەو پیرەژنە بیباتە لای ڤەچنێک[1] چاکی کاتەوە. کەچی لەو ڕۆژەوەی ئەم پیرەژنە ئەو کۆچکەیەی لێ وەرگرتووم، ون بووە و هەر نەمدیوەتەوە.' کوڕە بازرگان گوتی: 'زۆر باشە خەمت نەبێ، وا دەکەم.' کوڕە خێرا چووە لای بازرگان دانیشـت. ماوەکەی پێچوو پیرەژن بە تەســـبیحێکەوە پەیدا بوو و بەدەم تەســـبیحاتەوە بە بەر دووکانەکەدا ڕەت بوو. کوڕە بازرگان هەر کە چاوی پێی کەوت بۆی دەرپەڕی و قۆڵی گرت و جنێوی پێ دا. پیرەژنەش بە هێواشی قسەی دەکرد و دەیگوت: 'ڕۆڵە گیان، تۆ ڕاست دەکەی' خەڵکی بازاڕ لێیان کۆ بوونەوە و لەو کێشـمەکێشـەیان پرسـی. کوڕە بازرگان گوتی: 'خەڵکینە، من کۆچکەیەکم بە پەنجا دینار لەم بازرگانە کڕی، ژنەکەم ئەوەندە بەســـەریەوە نەبوو کە لە کەنار ئاگرێکەوە دانیشــت، ئاگر کڵپەی کرد و چمکێکی ســووتا. وا بوو ئەم پیرێژنە گوتی من دەیبەم چاکی دەکەمەوە و بۆتـان دێنمەوە. منیش دامێ، کەچی لەو ســـاوە تـا ئێســـتـا ئەم پیرەژنەم نەدیوەتەوە.' پیرەژن گوتی: 'ڕاسـت دەکا. من کۆچکەکەم لێ وەرگرت. چووم بۆ یەکێک لەو ماڵانەی کە هەمیشـــە ســـەردانیان دەکەم و لە یەکێک لەو ماڵانەدا بیرم چووە و لێم بەجێ ماوە. ئێســـتا هەرچی دەکەم نازانم لە چ ماڵێ جێم لە بیرم چووە. چونکە منیش هەژارم و بۆم نەدەکڕدراوە، لە ترســـی ئابڕووی خۆم نەمدەوێرا خۆمی پیشـــان بدەم و نەچوومەوە لای.' پیرەژن کە ئەم قسانەی دەکرد، بازرگان جوان گوێی دابووێ.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. ڤەچن: ئەو کەسانەی شتی چنراوی دڕاو چاک دەکەنەوە و دیسان دەیچننەوە.

## که شەوی شەشسەد و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! 'کە بازرگان قســـەکانی ئەو پیرەژنە فێڵباز و هەڵفریوێنەی بیســـت باوەڕی بە تەواوی ئەو فڕوفێڵانە کرد و دەســـــتبەجێ لە کردەی خۆی پەژیوان بووە و گوتی: 'ســـــوبحانەڵلا، ئەمن چۆنم لە بارەی ئەو ژنە پاکەمەوە بیر دەکردەوە و ڕاســـــتی ڕووداوەکە چۆنـــاوچۆنە! خودایە بۆخۆت پەنـــات بۆ دێنم و بۆخۆت لێم خۆش بە. بەڵام دیســـــان ســـپاس و ســـتایش بۆ خودا کە ڕاســـتی ئەو کارەی بۆ ڕوون کردمەوە. و دڵم لە ژنەکەم پاک بووەوە.' دوایە بازرگان ڕووی کردە پیرەژن و لێی پرســـــی: 'ئەرێ هەرگیز هـــاتوچۆی مـــاڵی ئێمەت کردووە؟' پیرەژن گوتی: 'کوڕی خۆم، من بۆ خێر، هـــاتوچۆی هەموو شـــــوێنێکم دەکرد؟' بـــازرگـــان گوتی: 'ئەی لە مـــاڵی ئێمە هەواڵی کۆچکەکەت پرسیوە؟'پیرەژن گوتی: 'کوڕم، من چووم بۆ ماڵتان، هەواڵم لە دراوسێکان پرسی، گوتیان کە کاک ئەبولفەتح ژنەکەی تەڵاق داوە. ئیدی منیش لەو دەمەوە بەو گەڕەکەدا نەچوومەوە.' ئەوجار بازرگان ڕووی کردە کوڕە بازرگان و گوتی: 'واز لەم پیرەژنە بێنە و کۆچکەکەت لای منە.' ئیدی چوو کۆچکەکەی لە دووکانەکەی هێنا دەر و پێشـــانی دان و پاشـــان لە بەر چاوی ئەوان دای ڤەچن بۆی چاک کاتەوە. ئەوجار کەوتە شوێن ژنەکەی. ماڵ و سامانێکی زۆری داێ و هێنایەوە ســەر ماڵ. داوای لێبووردنی لێ کرد و تۆبەی کرد. ئیدی ئاگای لەو فێڵە نەبوو کە پیرەژن کردبووی.

" 'قوربان، ئەمە نموونەیەکە لە فڕوفێڵی ژنانە. تۆ ســـــەیری بکە و لەوە بڕوانە کە بە پیاوانی دەکەن. جا گوێ بە قســـــەکانی ئەم کەنیزە چەپەڵە مەدە و خۆت لە کوشـــــتنی کوڕەکەت بپارێزە.'

"پاشـــا کە ئەو چیرۆکەی لە وەزیر بیســـت، لە کوشـــتنی کوڕەکەی پەشـــیمان بووەوە. بۆ ســـبەینێ کە ڕۆژی هەشـــتەم بوو، پاشـــا چووبووە دیوان و لەســـەر تەخت دانیشـــتبوو کە سەندبادی حەکیم دەستی شازادەی گرتبوو و هاتنەوە هەنتەشی پادشا. شازادە لاشیپانی دەرگای دیوانی ماچ کرد، بە زمانێکی پاراو ســـتایشـــی باوکی کرد و ســـپاســـگوزاری بۆ وەزیرەکان دەربڕی و لە کۆڕەدا زانایان و میران و گەورەگەورەکانی ســـوپا ئامادە بوون. هەمووان ســـەریان لە زمانپاراوی و ڕەوانبێژیی شـــازادە ســـووڕ ما. پادشـــاش بە دیداری کوڕەکەی خۆشـــــحاڵ بوو و تەوێڵی ماچ کرد و هۆکاری بێدەنگی کوڕەکەی لەو حەوت ڕۆژەدا لە ســـەندبادی حەکیم پرســـی. ســـەندباد گوتی: 'گەورەم، خێر لەوەدا بوو کە ئەم ماوەیە بێدەنگ بێ، ئەگینا دەکوژرا. من هەر ڕۆژی لەدایکبوونی ئەم حوکمەم زانیبوو. جا ئێستا سپاس بۆ خودا کە لە بەختی پاشا هەموو شتێکی بە خێر گێڕا.' پادشا خۆشی لەم

قسەیە هات و لە وەزیرەکانی پرسی: 'ئەگەر من کوڕەکەمم بکوشتبایە، من گوناحبار بووم یان کەنیزەکە یان حەکیم.' هەنتەشییان بێدەنگ بوون و متەقیان لێ نەهات. ئەوجار سەندباد بە شازادەی گوت: 'کوڕم، وەڵامەکەی بڵێ.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی شەشسەد و سێیەم هاتەوە

## چیرۆکی شیری ژەهراوی

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! شـــازادە گوتی: 'بیســـتوومە ڕۆژێک کابرایەکی بازرگان چەند میوانێکی لێ وە ژوور کەوت. بازرگان کاسـەیەکی دا بە کەنیزەکەی بچێ لە بازاڕ شـیریان بۆ بکڕێ.' کەنیزە چووە بازاڕ و شیری کڕی، لە هاتنەوەدا، لە ڕێگە کە دەڕۆیشت باڵندەیەک بەسـەریدا تێپەڕی، ئەو باڵندەیە مارێکی بە چنگەوە بوو توند دەیگوشـی بەرنەبێتەوە، مارە کە بە چنگ باڵندەکەوە هەر سـەری هەڵدەسووڕاند و ژەهری داویشت تکەیەک لەو ژەهرە لەو جەنگەیەی کە لە ڕاستی کچەکە بوون بەربووەوە و کەوتە نێو شیرەکەوە و کچە نەشی زانی. کە کەنیز گەیشـــتە ماڵەوە، خاوەنی شـــیرەکەی لێ وەرگرت و لەگەڵ میوانەکانیدا خواردیانەوە. هێشـــتا شـــیرەکە بە تەواوی لە گەروویان نەچووبووە خوارێ هەموویان بە لادا کەوتن و مردن. دەی ئێســـتا پێم بڵێن لەم ڕووداوەدا کێ گوناهبارە؟ یەکێک گوتی: 'میوانەکان گوناهبارن کە لەو شـــیرەیان خواردەوە.' یەکێکی دیکە گوتی: 'گوناهەکە لە ئەستۆی کەنیزەکەیە کە سـەری شیرەکەی دانەپۆشیوە.' سـەندبادی حەکیم گوتی: 'کوڕم. ئەی بۆچوونی خۆت لەم بارەیەوە چییە؟' شـازادە گوتی: 'من دەڵێم نە کەنیزە گوناهبارە و نە ئەوانی دیکەوە، بەڵکو قەزاوقەدەر وا بووە ڕۆژیان بەوە تەواو بێ.'

"کە هەنتەشییان وەڵامەکەی ئەویان بیست، زۆریان پێ سەیر بوو، دۆعای بەخێریان بۆ شـازادە کرد و گوتیان: 'شـازادە، وەڵامێکت داوە کە هیچ کەس ناتوانێت وڵامی وا بداتەوە. ئەمڕۆ تۆ لە زانستدا لە هەموو کەسێ لەسەرتری.' شازادە وەڵامی دانەوە: 'من زاناتر نیم. کابرا کوێرە و دوو منداڵە سێساڵان و پێنجسـاڵانەکە لە من زاناترن.' هەنتەشـییان گوتیان: 'ئەوانە کێن دا شازادە بۆمان باس کە.'

## چیرۆکی شێخە کوێرەکە

"شـازادە گوتی: 'بیستوومە بازرگانێکی سـاماندار و دەسـتڕۆیشتوو هاتوچۆی شـارانی دەکرد. ڕۆژێکیان بازرگانە ویســـتی بچێ بۆ شـــارێک، پرســـیاری لە کەســـانێک کرد کە شـــارەزای ئەو شـــارە بوون، : 'چ کاڵایەک لەوێ قازانج دەکا؟' گوتیان: 'داری ســـەندەل لە هەموو شـتێکی تر باشـتر؟' بازرگان تەواوی سـامانەکەی دا بە داری سـەندەل، بەرەو ئەو شارە کەوتە ڕێ و دەمەو ئێوارە گەیشتە ئەوێ. پیرەژنێکی دیت چەند سەر مەڕی وە پێش خۆی دابوو . کە پیرەژن چاوی بە بازرگان کەوت، لێی پرســـی: 'کاکە! تۆ کێی؟' گوتی:

پیاوێکی غەریب و بازرگان.' پیرەژنە گوتی: 'کاکە، وریای خەڵکی ئەم شـــارە بە؛ دز و درۆزنی زۆرە، کڵاو لە ســـەر غەریبە دەنێن و مـالەکەی دەخۆن. جـا من بەزەییم بە غەریبییەکەتدا هات، ئیدی کەیفی خۆت ئەمن ئەوە قسەی خۆم کرد. خودا حافیز.'

" 'کە ڕۆژ بووەوە، پیاوێک هاتە دیدەنی بازرگان و ســـڵاوی لێ کرد و گوتی: 'قوربان، لە کوێوە هاتووی؟' بازرگان گوتی کە لە فڵان شارەوە هاتووم. پرسی: 'ئەی چیت هێناوە؟' بازرگان گوتی: 'داری سـەندەلم هێناوە. بیسـتوومە لەم شـارەدا پارەی چاک دەکا.' پیاوەکە گوتی: 'هەرکەس ئەمەی پێ گوتووی، هەڵەی کردووە. لێرە وەک ســـووتەمەنی دەکاری دەکەن.' کە بازرگان ئەوەی بیسـت ئاوی ئەژنۆی چوو. خەم دایگرت. پاشـان چووە یەکێک لە کاروانســـەراکان. لەوێ بۆ ئاگرکردنەوە لەو دارە ســـەندەلانەی دەنایە ژێر مەنجەڵ و دەیسووتاند. هەمان ئەو پیاوەی یەکەم جار هاتە لای، هاتە کاروانسەراکە، بازرگانی دی کە باری سـەندەل دەسـووتێنێت و گوتی: 'ئەم دارانە بە سـاعێک[1] لە هەر چییەک دەتەوێ، پێم بفرۆشـــە.' بازرگان گوتی: 'ئەوە فرۆشـــتم.' دەمودەســـت ئەو پیاوە دارەکانی لەوێ بردە دەرەوە و پێشـــی وا بوو، کە ئەگەر لە بری دارەکان زێڕی ســـوور بدا، هێشـــتا زیانی نەکردووە و یەک بە دە قازانج دەکا. دوایی بازرگان لە کاروانســـەرا هاتە دەرەوە و لەنێو شـاردا دەگەڕا کە تووشـی پیاوێکی چاوشـینی یەکچاو بوو. کتوپڕ باوەشـی پێدا کرد و گوتی: 'تۆ چاوێکی منت کوێر کردووە و تازە قەتت بەرت نادەم.' دەستی کرد بە هاتوهاوار، بازرگان کاس ببوو، نەیدەزانی بڵێ چی و هەر نکوڵی لێ دەکرد و کێشـــەکەیان گەورە بووەوە و خەڵکیان لێ کۆ بووەوە. مۆڵەتی ڕۆژێکیان لە یەکچاو خواســـت کە بازرگان خوێنبایی چاوەکەی بدا. ئیدی یەکچاو دەستەبەری لە بازرگان وەرگرت و بەری دا.

" 'کە بـازرگـان لە یەکچـاو ڕزگـاری بوو، چووە بەردەرگەی دووکـانی پینەچی و پێڵاوەکەی دایێ. گوتی: 'ئەمەم بۆ چاک بکەوە. شتێکت دەدەمێ پێی قایل ببی.' ئەمەی گوت و چوو. تووشی تاقمێک بوو، خەریکی قومار بوون. هێندە ناڕەحەت بوو، بۆ ئەوەی تۆزێک ســـەرقاڵ بێ لە لایان دانیشـــت. بانگیان کرد، قوماریان لەگەڵ بکا. ئەویش قەبووڵی کرد و لەگەڵیان و دەستی بە قومار کرد. لێیان بردەوە و پێیان گوت: 'یەکێک لەم دوو کارە بکە: یا دەریا بخۆرەوە یا واز لە تەواوی ماڵ و ســـامانەکت بێنە.' بازرگان مۆڵەتی ڕۆژێکی لێ خواستن. بە خەمبارییەوە هەستا و سەری شۆڕ کردەوە و بەدم بیر کردنەوەوە دەڕۆیشت کە تووشـی پیرەژنە گورین بووەوە. پیرەژن کە دیتی ئاوا مات و پەشـێوە، پێی گوت: 'پێم وایە خەڵەتاندوویانی کڵاویان لە سەر ناوی.' بازرگان تەواوی بەسەرهاتی خۆی بۆ پیرەژن گێڕاوە. پیرەژن پرسی: 'ئەوە کێیە کە دارە سەندەلەکانتی بەو جۆرە بردووە لە کاتێکدا لەم شـارەدا ســـەندەل ڕەتڵی بە دە دینارە؟ گوتم وریا بە بە گوێت نەکردم، بەلام شـتێکت فێر

---

[1] . صاعێک: بەرابەری سێ کیلۆگەڕەمە.

دەکەم، هیوادارم بە قازانجت تەواو بێ. ئەویش ئەوەیە کە بچۆ بۆ فلان ماڵ. شێخێکی کوێر و بەساڵاچووو و زانای لێیە کە شارەزای هەموو کارێکە. خەڵکی دەچنە لای و بۆ کارەکانیان پرسی پێ دەکەن. ئەوە هەرکەسێک بۆ ئەو شتە ڕێنمایی دەکا کە خێری بۆی تێدا بێ. ئاخر ئەو هەرچی فێڵ و تەڵەکەبازییە دەیزانێ و ئەو سەری مارەکەیە. شەوانە فێڵبازان لای کۆ دەبنەوە. تۆش بچۆ ئەوێ و خۆت لە ڕکابەرەکانت بپۆشە و ڕەنگە قسەیەکی لێ ببیستی کە بە کارت بێ ڕزگارت بکا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی شەش‌سەد و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! 'بازرگان مالآوایی لە پیرەژنە کرد و چوو بۆ ئەو شوێنە کە پیرەژن پێی گوتبوو. لەوێ لە نیزیکی شـــێخە کوێرەکەوە دانیشـــت. خۆی داپۆشـــیبوو، ئەوەندەی پێنەچوو کە کۆمەڵێک هاتنە لای شێخ و سڵاویان لێ کرد و لەتەنیشتیدا دانیشتن. بازرگان ســـــەیری کردن، چوار ڕکابەری خۆی لەنێویاندا دیت. دوایە شـــێخ خواردنی بۆ دانان و خواردیان. ئەوجار هەرکەســـــەی بەســـــەرهاتی ئەو ڕۆژەی خۆی گێڕاوە. لەو دەمەدا ئەو کابرایەی ســـەندەلەکەی کڕیبوو، هاتە پێشـــەوە و بە شـــێخی گوت کە ســـەندەلی بە هەرزان کڕیوە و لەگەڵ فرۆشیارەکە وا ڕێککەوتوون کە فرۆشیار داوای ساعێک لە هەرچی بکات، بیداتێ. شـــێخ گوتی: 'ئەو پیاوە براوەیە.' کابرا گوتی: 'چۆن براوەیە؟!' شـــێخ گوتی: 'ئەگەر ئەو داوای ســـاعێک زێڕ و زیو بکات، دەیدەیتێ یان نا؟' کابرا گوتی: 'دەیدەمێ و قازانجیش دەکەم.' شـــێخ گوتی: 'ئەگەر گوتی ســـــاعێک کێچی نێر و مێم لێت دەوێ، ئەتۆ چی جواب دەدەیتەوە؟' کابرا زانی کە دەدۆڕێ.

" 'ئێنجا یەکچاو هاتە پێشـێ و گوتی: 'یا شێخ، ئەمڕۆ کابرایەکی غەوارەم دیت، ئاوقای بووم و گوتم: 'تۆ چـاوێکی منـت کوێر کردووە.' دەســـــتم لێ هەڵنەگرت تـا ئەوەی کە دەستەبەریم لێ وەرگرت کە بگەڕێتەوە و خوێنبایی چاوەکەم بدا.' شـێخ گوتی: 'ئەگەر ئەو کابرا غەوارەیە بزانێ، لێت دەباتەوە.' یەکچاو گوتی: 'یا شـێخ، چۆنم لێ دەباتەوە؟!' شـێخ گوتی: 'ئەو پێت دەڵێ، چاوی خۆت دەربێنە و منیش چاوی خۆم دەردێنم و هەردووکیان دەکێشـــین. ئەگەر چاوی من و چاوی تۆ هاوســـەنگ بوون، ئەوە تۆ ڕاســـت دەکەی، بەڵام ئەگەر هـاوســـــەنگ نەبوون، ئەوا دەبێ تۆ خوێنبـایی چـاوی من بـدەی. ئەوجـار هەردوو چاوەکە هاوســـــەنگ نابن و ئەو پیاوە خوێنبایی چاوی خۆیت لێ دەســـــێنێ و تۆ هەردوو جاوت کوێر دەبن و ئەو هەر چاوێکی دەمێنێ.' ئیدی کابرای یەکچاو زانی دەدۆڕێ.

" 'کابرای پینەچی هاتە پێشـــــێ و گوتی: 'قوربان، ئەمڕۆ کابرایەکی نەناســـــراو هات پێڵاوەکانی دانا و گوتی: 'ئەمانەم بۆ چاک بکەوە و شتێکت دەدەمێ کە قایل ببی.' جا من تا هەموو سامانەکەی لێ نەسێنم، قایل نابم.' شێخ گوتی: 'ئەگەر ئەو پیاوە نەناسراوە بیەوێ پێڵاوەکانی لە تۆ وەربگرێتەوە و هیچیشت نەداتێ، دەتوانێ.' پینەچی پرسی: 'شتی وا چۆن دەبێ؟' شێخ گوتی: 'زۆر چاک، دەڵێ، سوڵتان شکستی بە دژمن هێنا و بەدخوازانی تووشی مەینەت بوون و ســـوپاکەی ســـەر کەوت. ئایا بەوە قایلی یا نا؟ ئەگەر بڵێی قایلم، ئەوە ئەو پێڵاوی خۆی وەردەگرێتەوە. ئەگەر بڵێی قایل نیم، ئەوە پێڵاوەکانت لێ وەردەگرێ و بە پێڵاوەکان لە سەر و گوێلاکت دەدا.' پینەچی کە ئەم قسەیەی بیست، زانی دەدۆڕێ.

" 'پاش ئەو، ئەو کابرایە هاتە پێشـــەوە کە بازرگان قومارەکەی پێ دۆڕاندبوو و گوتی: 'یا شـــێخ، قومارم لەگەڵ کەســـێکدا کرد و لێم بردەوە. پێم گوت، 'یا دەریا بخۆرەوە و من ماڵ و ســـامانی خۆمت دەدەمێ، یا تۆ ماڵ و ســـامانی خۆتم دەدەیتێ. شـــێخ گوتی: 'ئەگەر بیهەوێ، لێت دەباتەوە.' کابرا گوتی: 'کوڕە یا شـــێخ چۆن دەتوانێ بیباتەوە؟' شـــێخ گوتی: 'پێت دەڵێ، دا دەریام بۆ بێنە با هەڵی قوڕێنم. خۆ تۆش دەریات پێ نایە و ئەوە دەیدرۆڕێنی و هیچ پێ ناکرێ. بەو جۆرە لێت دەباتەوە.'

" 'کە بازرگان ئەم قســـانەی لە شـــێخ بیســـت، زانی چۆن بەرەنگاریان بێتەوە. دوایی ئامادەبووان لای شێخ هەستان و بازرگانیش هەستا و گەڕاوە بۆ شـوێنی خۆی. کە ڕۆژ بووەوە، یەکەمین کەس ئەوەیان هات کە لەســـــەر خواردنەوەی دەریا گرەویان کردبوو. بازرگان پێی گوت: 'زۆر باشـــە بۆم بێنە با بیخۆمەوە.' ئەو پیاوە کە دەریای پێ نەدەهات دۆڕاندی و بازرگان لێی بردەوە و سـەد دیناری لێ سـتاند. ئەوجار چوو بۆ لای پینەچی و کەوشەکانی لێ وەر گرتەوە و گوتی جا با خۆشحاڵیشت بکەم، پاشا بەسەر دوژمنانیدا زاڵ بوو و نەیارانی تێداچوون و وەچەکانی زۆر بوون. بەوە قایلی یان نا؟' پینەچی گوتی: 'قایلم.' بەوجۆرە بازرگان پێڵاوەکانی بەبێ حەقدەست وەرگرتەوە. پاشان یەکچاو هات و داوای خوێنبایی چاوەکەی کرد. بازرگان پێی گوت: 'تۆ چاوی خۆت دەربێنە و منیش هی خۆم دەردێنم و دەیانکێشـــین. ئەگەر هاوســـەنگ بوون، ئەوە تۆ ڕاســـت دەکەی و من خوێنبایی چاوەکەتم دەدەمێ. ئەگەر نا من خوێنبایی چاوی خۆمت لێ دەســـێنم.' ئەوجار یەکچاو داوای مۆڵەتی کرد و بازرگان مۆڵەتی نەدایێ تا ئەوەی کە بە ســـەد دینار پێک هاتن. دوایی ئەو کابرایە هات کە ســـەندەلەکانی کڕی بوو و بە بازرگانی گوت: 'هاتووم نرخی ســـەندەلەکانت دەمێ، داوا بکە بزانم چیت دەوێ.' بازرگان گوتی: 'چی لە بری نرخی سەندەلەکاندا دەدەی؟' ئەو پیاوە گوتی: 'لەگەڵ تۆدا لەسەر ساعێک ڕێک کەوتووین! ئەگەر دەتەوێ، ســـاعێک زێڕ و زیو وەربگرە.' بازرگان گوتی: 'من جگە لە ســـاعێک کێچی نێر و مێ، هیچی دیکەم ناوێ.' کابرا گوتی: 'ئەمەی تۆ دەیڵێی، بە من دابین ناکرێ.' بەو جۆرە بازرگان لەویشـــی بردەوە و ســـەندەلەکانی لێ ســـتاندەوە و بە ویســـتی خۆی فرۆشـــتنی و گەڕاوە بۆ شارەکەی خۆی.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی شەشسەد و پێنجەم هاتەوە

## چیرۆکی منداڵە سێساڵانەکە

گوتی: "خاوەنشکۆ! دوای ئەوە شازادە گوتی: 'بەڵام چیرۆکی منداڵە سێساڵانەکە ئەوەیە کە پیاوێکی بەدکارە کە دایمە بە دوای ژنانەوە بوو. ناوبانگی ژنێکی جوان و دەڵالی بیست کە لە شارێکی دیکە بوو. ئەو پیاوە هەستا لە شارەکە خۆیرا وەڕێ کەوت بۆ ئەو شارە بە هیوای بینینی ئە ژنە، دیاریگەلی زۆریشی بۆ ئەو ژنە برد. نامەیەکی بۆ نووسی و تێیدا باسی هەست و سۆزی ئەڤیندارانەی خۆی بۆ کرد. ئەو ژنەش خۆشەویستی و ڕەزامەندی خۆی بۆ دەربڕی و ڕێی دا بچێتە ماڵەکەی. کاتێک ئەو عاشقە دووڕووە چووە ماڵەکە، ژنە هەستا بە ڕوویەکی خۆشەوە پێشوازی لێ کرد و ڕێزی لێ نا و دەستی ماچ کرد. میواندارییەکی شایستەی لێ کرد. ئەو ژنە منداڵیکی سێساڵانەشی هەبوو. ئەوی لە لایەکەوە دانا و دەستی بە چێشتلێنان کرد. کابرا بە ژنەی گوت: 'وەرە با تێخزێین.' ژنە گوتی: 'کوڕەکەم دانیشتووە، سەیرمان دەکات.' کابرا گوتی: 'ئەم مناڵە سێساڵانە هیچ نازانێ و ناتوانێ قسە بکا.' ژنە گوتی: 'ئەگەر ئاگات لە زانست و زانیاری ئەو بووایە، هەرگیز وات نەدەگوت.'

" 'کوڕەکە کە زانی چێشتەکە کوڵیوە، گریا. دایکی گوتی: 'ڕۆڵە، ئەوە بۆ دەگریت؟' منداڵەکە گوتی: 'ڕۆن بەسەر ئەو چێشتە کولیوەدا بکە و بۆم بێنە.' ژنە گورج برێک چێشتی بۆ لە دەفرێک کرد و ڕۆنی بەسەردا کرد و بۆ کوڕەکەی هێنا. منداڵەکە لێی خوارد و دیسان گریا. دایکی گوتی: 'ئەرێ ڕۆڵە بۆ دەگریت؟' منداڵەکە گوتی: 'دای، تۆزێ شەکری پێدا بکە.' کابرا لێی تووڕە بوو و گوتی: 'بچکۆل، دەزانی زۆر گەوجی!' دەمودەست منداڵەکە وەڵامی داوە: 'وەڵا کەس لە تۆ گەوجتر نییە وا بەو هەموو ڕەنج و مەینەتییەوە بۆ شتێکی حەرام لە شارێکەوە دەچی بۆ شارێکی دیکە. جا من بۆ شتێک دەگریم کە لە بەرچاومدایە و هەر کە لێی بخۆم، ژێر دەبمەوە. ئێستا خۆت بڵێ لە من و تۆ کاممان گەوجترین؟' کە پیاوەکە ئەو قسەیەی بیست، شەرمەزار بوو، پەندی منداڵەکە بە گوێیدا چوو و دەستدرێژی نەکردە سەر ژنەکە. هەستا گەڕاوە بۆ شارەکەی خۆی و تۆبەی کرد و هەتا مرد هەر بە تۆبەکاری ژیا.'

## چیرۆکی منداڵە پێنجساڵانەکە

"کە شازادە ئەم چیرۆکەی تەواو کرد، گوتی: 'بەڵام چیرۆکی منداڵە پێنجساڵانەکە

ئەوەیە کە چوار بازرگان لە هەزار دیناردا هاوبەش بوون. پارەکەیان تێکەڵ کرد و لە هەمبانەیەکیان نا و چوون کاڵا و شتومەک بکڕن. لە ڕێگەدا تووشی باخێک بوون. هەمبانەی پارەکەیان بە ژنەی باخەوان سپارد و چوونە ژوورەوە. بەنێو باخدا گەڕان تا گەیشتنە جۆگەیەک و لەوێ دانیشتن و ئەو خواردنەی پێیان بوو خواردیان. ئەوجار یەکێکیان گوتی: 'عەترێکم لەگەڵ خۆم هێناوە. بێن با لەم ئاوە زوڵاڵە سەر و ڕوومان بشۆین و خۆمان بۆنخۆش کەین.' یەکێکیان گوتی: 'ئاخر شانەشمان دەوێ.' یەکێ دیکەیان گوتی: 'لە باخەوانەکە دەپرسین. ڕەنگە شانەی هەبێ.' خێرا یەکێکیان هەستا چوو بۆ لای باخەوانەکە و پێی گوت: 'هەمبانەی پارەکەم بدەیە.' باخەوان گوتی: 'با هاوڕێکانیشت بێن یان ئەوەی ئەوان بە دەنگی بەرز پێم بڵێن کە هەمبانەکەت بدەمێ.' هاوڕێکانی ئەو پیاوە لە جێیەک دانیشتبوون کە باخەوان لێی دیار بوون و دەنگیانیشی دەبیست. ئەو کابرایە هەرای لە هاوڕێکانی کرد: 'ئەم باخەوانە هیچم ناداتێ.' ئەوانیش هەرایان لە باخەوانەکە کرد: 'هەر چییەکی دەوێ، بیدەرێ.' کە باخەوان ئەو قسەی ئەوانی بیست، هەمبانەی پارەکەی دا بە کابرا. کابرا هەمبانەی وەرگرت و لە باخەکە چووە دەر و هەڵات. کە درەنگ کەوت و نەگەڕاوە لای هاوڕێکانی، ئەوانی دیکە هەستان چوونە کن باخەوانەکە و پێیان گوت: 'باشە بۆچی شانەی نادەیتێ؟' باخەوان گوتی: 'هاوڕێکەتان بێجگە لە هەمبانەی پارەکە، داوای هیچی دیکەی لە من نەکرد. منیش تا ئێوە نەتان گوت بیدەیە نەمدایە. کە هەمبانەکەی لێ وەرگرتم و چووە دەرەوە.' کە بازرگانەکان قسەکەی ئەویان بیست، بە چەپۆک بە سەروگوێلاکی خۆیاندا دا و باخەوانیان گرت و گوتیان: 'ئێمە جگە لە شانە نەمان گوتووە هیچی دیکەی بدەیە.' باخەوان گوتی: 'هاوڕێکەتان هەر ناوی شانەی نەبرد.' بازرگانانەکان کە وایان زانی ژنەیان گرت و بردیانە لای قازی. کە لای قازی گوێی لێ گرتن و بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕاوە، قازی فەرمانی دا کە باخەوان بۆیان بیبژێرێ. ئیدی بازرگانانەکان هەڵیانپێچا بۆ هەمبانە پارەکەیان.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كه ئەوی ئەشسەد و ئەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشكۆ! ژنە باخەوانەكە وڕ و سەرگەردان ڕۆیشت و ڕاستەڕێی لە لاڕێ جیا نەدەكردەوە. منداڵێكی پێنجساڵان سەرگەردانی و پەرێشانییەكەی بینی و پێی گوت: 'دایە گیان، ئەوە بۆ ئاوا پەرێشانی؟' باخەوانەكە بە چكۆڵە و كاڵفامی زانی و وەڵامی نەداوە. منداڵەكە هەمان پرسیاری دووپات كردەوە. باخەوان گوتی: 'چەند كەسێك هاتنە باخەكەم، هەمبانەیەک پارەی زێڕیان پێ سپاردم و مەرجیان بۆ دانام تا هەموو لەوێ نەبن، هەمبانەكە نەدەم بە هیچ كامیان. ئەوجار چوونە باخەكەوە و خەریكی سەیر و گەڕان بوون. دوایە یەكیان هاتە لام و گوتی: 'هەمبانەی پارەكەم بدەیە.' منیش پێم گوت: 'هەتا ئەوانی دیكەش نەیەن، ناتدەمێ.' گوتی: 'هاوڕێكانم ناردوویانم لێت وەرگرم.' من باوەڕم پێ نەكرد و نەمدایێ. ئەویش هەرای لە هاوڕێكانی كرد گوتی ئەوە باخەوان نامداتێ. هەرایان لێ كردم: 'هەر چی دەوێ، بیدەیە.' ئەوجار منیش هەمبانەكەم دایێ. كە لێی وەرگرتم، لە باخ چووە دەر و ڕۆیشت بە لای كاری خۆیەوە. دوای ماوەیەک هاوڕێكانی هاتنە لام و گوتیان: 'باشە بۆچی شانەی نادەیتێ؟' گوتم: 'ئەو داوای شانەی لە من نەكردووە و بێجگە لە هەمبانەكە ناوی هیچی دیكەی نەبردووە و منیش هەمبانەكەم دایێ.' كە ئەوان ئەم قسەیەیان بیست، گرتمیان و بردیانمە لای قازی. قازیش فەرمانی دا بۆیان ببژێرم.'

" 'منداڵەكە گوتی: 'دایە گیان، تۆ درەمێكم بەرێ با كەمێك شیرینی بكڕم و قسەیەكت بۆ بكەم، ڕزگارت بكا.' باخەوان درەمێكی دایێ و پێی گوت: 'دەی قسەیەكە چییە؟' منداڵەكە گوتی: 'دایە گیان، بچۆرەوە لای قازی و پێی بڵێ كە مەرجی ئێمە ئەوە بوو كە هەمبانەكە نەدەمەوە تا هەموو ئامادە نەبن. هەر كاتێک هەر چواریان پێكەوە هاتن، منیش هەمبانەكەیان دەدەمەوە.' باخەوان گورج گەڕاوە كن قازی و ئەوەی منداڵەكە فێری كردبوو، بە قازی گوت. قازی لە بازرگانانی پرسی: 'ئەم مەرجە لەنێوانتاندا هەیە یا نا؟' گوتیان: 'بەڵێ، مەرجمان وا بوو.' قازی گوتی: 'دەی مادەم مەرجەكەتان وایە، هاوڕێكەتان بێنن و هەمبانەكەتان وەربگرنەوە.' بەوجۆرە باخەوان لە دەستی ئەوان ڕزگاری بوو و چوو بە لای كاری خۆیەوە.'

### كۆتایی چیرۆكەكە

"كە ئامادەبووان ئەم قسانەیان لە شازاە بیست، گوتیان: 'جەنابی پاشا، كوڕەكەت لە منداڵانی سەردەم زاناتر و داناترە.' ئەوجار پاشا كوڕەكەی بە سنگەوە گرت، تەوێڵی ماچ كرد و بابەتی كەنیزەكەی لێ پرسی. شازادە سوێندی بە خودا و بە پێغەمبەر خوارد كە

ئەو کەنیزە پێی گوتم وەرە با ئەو کارە بکەین. پاشا باوەڕی بە قسەکانی کرد و پێی گوت: 'ئەوە بڕیاردان لە سەر ئەوم دا بە تۆ. حەز دەکەی بیکوژە، حەز دەکەی ئازادی کە.' شازادە گوتی: 'لە شار دەری دەکەم.' ئیدی شاربەدەری کرد و لەگەڵ باوکیدا بە خۆشی و کامەرانی ژیان هەتا وا بوو سوپای مەرگ بەسەریدا دان. پاک و بێگەردی بۆ ئەو خوایەیە نامرێت.

## چیرۆکی جووزەر

"هەروەها بیستوومە کە بازرگانێک بە ناوی عومەر، سێ کوڕی هەبوو بە ناوەکانی: سەلیم و سالم و جووزەر. بازرگان پەروەردەی کردن تا گەورە بوون، بەڵام جووزەری لە دووانەکەی دی خۆشتر دەویست. براکان ئیرەییان بە جووزەر دەبرد و خۆشیان نەدەویست. چونکە بازرگانیش بەساڵاچوو بوو، ترسی ئەوەی هەبوو بمرێ و پاش مەرگی ئەو دوو برایە بەڵایەک بە سەر جووزەر بێنن. هەر بۆیە چەند کەسێک لە کەسوکار و قازی و دمڕاستی بانگ کرد و پێی گوتن: 'ماڵ و سامانی من ئەوە و ئەوەیە تکایە بۆخۆتان بیکەنە چوار بەش.' ئەوانیش بەشیان کرد.

"بازرگان هەر بەشەی بۆ کوڕێکی دانا و بەشێکیشی بۆ خۆی گل داوە و گوتی: 'ئەوە من لە ژیانی خۆمدا سامانەکەمم بەسەردا بەش کردن تا دوای خۆم تووشی کێشە نەبن و ئەم بەشەی کە بۆ خۆمم هەڵگرت، بۆ گوزەرانی خۆم و ژنەکەمە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی شەشسەد و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! 'بازرگان ماڵەکەی بەسەر کوڕەکانیدا دابەشی و بەشێکیشی بۆ خۆی گل داوە. ئەوەندەی پێ نەچوو کە بازرگان مرد. منداڵەکان بە دابەشکارییەکەی باوکیان ڕازی نەبوون و گەلەکۆمەیان لە جووزەر کرد و داوای سامانەکەی باوکیان لەو کرد و گوتیان: 'ماڵ و سامانی باوکمان لای تۆیە.' ئەویان بردە لا دادوەر. ئەو کەسانەی لە ماڵبەشکردنەکەدا لەوێ بوون، بە قازانجی جووزەر شایەدییان دا و جووزە گەلێک ماڵ و سامانی وەک قەرەبوو وەرگرت و براکانی بە هۆی ئەو ململانێیەوە گەلێک زیانیان لێ کەوت تا وا بوو کە دادوەرەکان لێکیان جودا کردنەوە. پاش تێپەڕبوونی ماوەیەکی دیکە، دیسان کێشەکە سەری هەڵداوە و دیسان ئەو برایانە گەلێک زیانیان کرد و بەردەوام لە هەوڵی ئازاردانی جووزەردا بوون و ئەویان لە دادوەرێکەوە بۆ دادوەرێکی دیکە دەبرد تا گشت دارونەداریان بە دادوەران دا و هەرسێکیان دەستکورت بوون. ئەوجار براکانی جووزەر هاتنە کن دایکیان و بە ڕووی خۆش، ماڵەکەیان لێ ستاند و هەڵوەدایان کرد. دایکە چووە کن جووزەر و ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە و گوتی: 'دەستیان لە تەختە بەستم و ماڵەکەیان لێ ستاندم.' ئەم قسانەی دەکرد و دەگریا و تووکی و دۆعای لێ دەکردن. جووزەر گوتی: 'دایە گیان، تووک و دۆعایان لێ مەکە، خودا خۆی هەقیان لێ دەکاتەوە، هەروەک شاعیر گوتوویەتی:

تۆ بگرە ڕێگەی پاکی و ڕاستی
ئاکامی کاریش بسپێرە بە خوا
کارت بە کاری ئەم و ئەو نەبێ
ئەوەی فێڵ بکا، فێڵ سەری دەخوا

" 'ئەوجار بە دایکی گوت: 'تۆ لای من بمێنەوە. پاروێ نانێک پەیدا بکەم، پێکەوە دەیخۆین. تۆش دۆعای خێرم بۆ بکە بەشکوو خودایە ڕزق و ڕۆزیمان زیاد کا و بە ئاسوودەیی بژین.' دایکی دڵخۆش بوو و لای ئەو ماوە. جووزەر تۆڕێکی هەبوو، ڕۆژانە دەچووە ڕۆخ دەریا و گۆلەکان بایی دە، بیست یان سی درەم ماسی دەگرت، دەیفرۆشت و خۆی و دایکی پێب دەژیان و هەمیشە دڵیان خۆش بوو، بەڵام براکانی هیچ کار و پیشەیەکیان نەبوو و ئەوەی لە دایکیشیان ستاندبوو، بە فیڕۆیان دا و وەک پارسەکان، ڕووتوڕەجاڵ بوون و دەرک بە دەرک دەگەڕان بۆ پاروێ نانێک. جاروبار دەهاتنە کن دایکیان و لێی دەپاڕانەوە و نانێک، چێشتێک شتێکیان داتێ، دایکەش دڵی بۆیان دەسووتا و

ئەگەر خۆراکێک شـــەو مـابووایەتەوە، دەیدانێ و دەیگوت: 'هـا خێرا بیخۆن و بڕۆن تـا براکەتان نەهاتووەتەوە، ئاخر ئێوە ئەوەندەتان ئەو ئازار داوە پێی قەبووڵ ناکرێ ئێســـتا ئێوە لێرە ببینێ. دڵی لە منیش دێشـێ.' ئیدی ئەوانیش خێرا نانەکەیان دەخوارد و دەچوونە دەرێ. ڕۆژێک لە ڕۆژان براکان هاتنە لای دایکیان، دایکە چێشـــتی بۆ دانان و خەریکی خواردن بوون کە جووزەر بەسەردا هاتەوە. دایکە تریق بووەوە و خەمی بوو جووزەر لێی توورە ببێ. ســـەری شـــۆڕ کردەوە و ڕووزەردی کوڕەکەی بوو، بەڵام جووزەر بە بزەوە سـڵاوی لێ کردن و بەخێر هاتنی کردن و گوتی: 'ئای چ ڕۆژێکی بەفەڕە! ئەوە چۆنە منتان بیر هاتەوە؟' ئیدی لە باوەشـــی گرتن و بەزەیی پێیاندا هات و گوتی: 'گومانم نەدەکرد کە پشـــتمان تێ کەن و بە لای من و دایکمدا نەیەنەوە.' گوتیان: 'برا، قەســـەم بە خودا زۆر تـامەزرۆی دیـدارت بووین، بەڵام بە هۆی ئەوەی لەنێوانمـانـدا گوزەرا بوو، لە ڕوومـان هەڵنەدەهات. ئێستا زۆر پەشیمانین. شـەیتان بەسـەری هێناین. خۆ ئێمە جگە لە تۆ و دایکم کەسێکی ترمان نییە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەوشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی شەشسەد و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! کاتێک جووزەر هاتەوە ماڵێ و ئەوانی لەوێ دیت، ســـڵاوی لێ کردن و پێی گوتن: 'ئێوە خێروبێری ئەم مـاڵەن.' دایکی بە جووزەری گوت: 'حەک ڕۆڵە خودا ســـەربەرزی هەردوو دنیات کا و بەرەکەتت بەســـەردا برژێنێ.' ئیدی براکان لەگەڵ یەکدی ئاشت بوونەوە و براکانی ئەو شـەوە لە ماڵە جووزەر بوون. بۆ بەیانی هەسـتان و نانیان خوارد. جووزەر تۆڕی هەڵگرت وەدەر کەوت بۆ ماسیگرتن چوو و براکانیش چوونە دەرەوە و تـا نیوەڕۆ دیـار نەبوون. نیوەڕۆ هـاتنەوە لای دایکیـان و فراوینیـان خوارد و چوونەوە دەرێ. ئێوارە هاتنەوە و جووزەریش هاتەوە و گۆشـــت و نانیان خوارد و تا ئانگێک ئاوایان گوزەراند. جووزەر ماسـی دەگرت، دەیفرۆشـت و پارەکەی لەگەڵ دایکی و براکانیدا خەرج دەکرد.

" 'بە هەڵکەوت، ڕۆژێک جووزەر تۆڕی هەڵگرت و بەرەو دەریـا چوو. تۆڕی هەڵدا و پاش ماوەیەک تۆڕی دەرهێناوە و هیچی پێوە نەببوو. چوو بۆ جێیەکی دیکە و تۆڕی هەڵدا و هیچ پێوە نەبوو. بە خۆی گوت: 'دەڵێی ئەم شوێنە ماسی تێدا نەماوە!' هەر بۆیە ئەوێشی جێ هێشـت و بە پەلە چوو بۆ جێیەکی دی هەر ئەم شـوێن و ئەو شـوێنی بوو تا بوو بە دەمەو ئێوارە و هیچی نەگرت. لە بەر خۆیەوە گوتی: 'ســـوبحانەڵلا! باشــە مەگەر دەریا ماســـی تێدا نەماوە، بڵێی چی بێ ؟' ناچار تۆڕی بە کۆڵیدا دا و بەرەو ماڵ بووەوە. خەمی دایک و براکانی بوو و بیری لەوە دەکردەوە کە چی بخۆن. ئاوا بەڕێوە بوو تا گەیشـــتە نانەواخانەکە. کۆمەڵێکی دی کە بۆ نانکڕین لە بەردەمیدا خڕ بوونەتەوە و نانەوا ســـەیریان ناکا. ئەوجار جووزەر دوور لە خەڵکەکە ڕاوەستا. کە نانەوا ئەوی دی، بانگی کرد، سڵاوی لێ کرد و گوتی: 'ئەوە نانت دەوێ؟' جووزەر وەڵامی نەداوە. نانەوا گوتی: 'ئەگەر پارەشت پێ نەبێ، کێشـــە نییە. هەرچەندەت دەوێ، نان ببە.' جووزەر گوتی: 'بایی دە درەمم نان دەوێ.' نانەوا نانەکەی دایێ و دە درەمیشی نایە مشتی و گوتی: 'سبەینێ بایی بیست درەم ماسیم بۆ بێنە.' جووزەر نانی هەڵگرت و چوو گۆشتی کڕی و بە خۆی گوت: 'ئەگەر ئەمڕۆ نەهامەتیم بوو، ئیشـەڵلا سبەینێ خودا دەرووم لێ دەکاتەوە.' دوایی نان و گۆشتی بردەوە ماڵ و دایکی گۆشـتی کردە چێشـت و نانیان خوارد و خەوتن. بەیانی زوو جووزەر هەسـتا تۆڕی هەڵگرت، دایکی پێی گوت: 'دانیشە ناشتاکەت بخۆ.' گوتی: 'لەگەڵ براکانمدا بیخۆ. من دەبێ بچم ماسی بگرم.'

" 'بەرەو دەریا چوو. جارێک و دووان و ســـیان تۆڕی هەڵدا و بە خاڵی دەریهێناوە. تا لای ئێوارە هەر لە جێیەکەوە دەچووە جێیەکی دی و تۆڕی هەڵدەدا و هیچ پێوە نەدەبوو. بە خەمباری و پەشـــێوییەوە تۆڕی هەڵگرت، گەڕاوە و ڕێی بەرەو نانەواخانەکە گرتە بەر.

که گەیشـــته ئەوێ، نانەوا چاوی پێی کەوت و لە جێوە بایی دە درەم نانی داێ و دە درەمیشـــی بۆ ژمارد و پێی گوت: 'ئەگەر ئەمڕۆ هیچت نەگرتووە، ســـبەینێ دەیگری.' جووزەر ویستـی داوای لێ بووردن بکا، نانەوا گوتی: 'پێویسـت بەوە ناکا. ئەگەر ماسـیت بگرتایە، لەگەڵ خۆتدا دەتهێناوە. که تۆم بە دەســـتی بەتاڵەوە دی، زانیم هیچت نەگرتووە. ئەگەر سـبەینێیش هیچت نەگرت، وەرەوە نان و درەمت دەدەمێ و شـەرم مەکە؛ لەسـەرت دەوەستم.'

" 'بۆ ڕۆژی ســـێیەم جووزەر چوو بۆ گۆلاوێک و تا نیزیکی پالێن هەوڵی دا و لەوێش هیچی دەسـت نەکەوت. گەڕاوە لای نانەوا و نان و درەمی لێ وەرگرت. تا حەوت ڕۆژ بەم جۆرە بوو. ئەوجار بە خۆی گوت: 'ئەمڕۆ دەچمە گۆلی قاڕوون، بەشـــکم شـــتێک بگرم.' تۆڕی هەڵگرت و چوو بۆ گۆلی قاڕوون ویســـتی تۆڕ هەڵبدات که لە ناکاو کابرایەکی مەغریبیی بینی که جلوبەرگی شـکۆمەندانەی پۆشـیبوو و بەسـەر هێسـترێکەوە بوو، زینی یەسترەکەی ئاوریشـم و پەراوێزەکانی زێڕ بوون و هەگبەیەکی زێڕینیشـی بە پاشـکۆیەوە بوو. ئەو کابرایە لە هێسـترەکە هاتە خوار و سـڵاوی لە جووزەر کرد و گوتی: 'کوڕەکەی عومەر، کارێکم پێتە. ئەگەر بۆم بکەی، زۆر قازانجت پێ دەگەیەنم و دەمکەیتە خزمەتکاری خۆت.' جووزەر گوتی: 'قوربـان کـارەکەت بڵێ. لە خزمەتتـدام.' کـابرای مەغریبی گوتی: 'جووزەر ئەڵحەمد بخوێنە.' جووزەر ئەڵحەمدی خوێند. ئەوجار کابرای مەغریبی پەتێکی ئاوریشـــمی دەرهێنا و بە جووزەری گوت: 'دەســـتەکانم بەم پەتە توند ببەســـتە و بمخە گۆلەکەوە و ماوەیەک چاوەڕێ که. ئەگەر بینیت دەســـتم هاتە دەرەوە، ئەوە تۆڕەکەم بۆ هەڵدە و خێرا دەرمبێنەوە. ئەگەر لاقم هاتە دەرەوە، ئەوە بزانە که من مردووم. من جێ بێڵە و هێســـتر و هەگبەکەم بەرە، بچۆ بۆ بازاڕی بازرگانان و لەوێ جوولەکەیەک بە ناوی شەمیعە بدۆزەرەوە و هێسترەکەی پێ بسپێرە که ئەو سەد دیناری زێڕت دەداتێ. زێڕەکان وەرگرە و تۆ بچۆ بە لای کاری خۆتەوە و ئەم نهێنییەش لە لای کەس مەدرکێنە.'

" 'ئیدی جووزەر دەستی بەست و خستیە گۆلەکەوە. جووزەر ماوەیەک چاوەڕێ بوو، لەناکاو دیتی وا لاقەکانی کەوتنە سـەر ئاو. زانی که مەغریبییەکە مردووە، گورج هێسـتری برد، ئەوی لە ئاوەکەدا جێ هێشـــت، چوو بۆ بازاڕی بازرگانان و جوولەکەکەی دیتەوە، لەســـەر کورســـییەک دانیشـــتبوو. که جوولەکەکە چاوی بە هێســـترەکە کەوت، گوتی: 'بە دڵنیاییەوە ئەو کابرایە تێدا چووە و جگە لە هەڵپە هیچ شـــتێکی تر لەناوی نەبرد.' ئەوجار هێستری لە جووزەر وەرگرت و سەد دیناری زێڕی داێ و داوای لێ کرد ئەو نهێنییە لای کەس نەردکێنێ. جووزەر زێڕەکانی وەرگرت و چوو بۆ لای نانەوا نانی کڕی و دینارێکی داێ. نانەوا قەرزەکەی لێ ژمارد و گوتی: 'نانی دوو ڕۆژت لای منە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! 'دوایی جووزەر چووە لای گۆشتفرۆش و دینارێکی دا و گۆشتی کری و وردەی دینارەکەی لای گۆشتفرۆش جێ هێشت. نان و گۆشتەکەی هەڵگرت و بەرەو ماڵ بووەوە. تەماشای کرد براکانی داوای چێشت لە دایکی دەکەن و ئەویش دەڵێت: 'نان بە خۆتاندا بگرن تا براکەتان دێتەوە.' ئیدی دایکی چێشتی بۆ لێنان و براکانی وەک دێو دەستیان بە خواردن کرد. دوایی جووزەر دینارە زێڕەکانی دا بە دایکی و پێی گوت: 'دایکە گیان، ئەم زێڕانە بگرە و با لات بن. هەر کاتێک براکانم هاتن و داوای خواردنیان لێ کردی، بەم زێڕانە خواردنیان بۆ بکڕە بۆ ئەوەی تا هاتنەوەی من بە برسێتی نەمێننەوە.' جووزەر شەوی بە دڵێکی ئاسوودەوە خەوت و لەگەڵ تاوهەڵاتی بەیانی تۆڕی هەڵگرت و بەرەو گۆلی قاروون وەڕێ کەوت و ویستی تۆڕەکە هەڵبدا، کابرایەکی مەغریبیی بە سواری هێسترێکەوە پەیدا بوو. لە مەغریبییەکەی دوێنێ کۆک و پۆشتەتر بوو. هەگبەیەک بە پاشکۆی هێسترەکەیەوە بوو کە هەر لایەی قوتوویەکی تێدابوو. سلاوی لە جووزەر کرد. جووزەر گوتی: 'سلاو لە تۆش.' کابرا گوتی: 'دوێنێ مەغریبییەکی وەک من بە سواری هێسترێکی وەک ئەمەوە، هاتە ئێرە یا نا؟' جووزەر ترسی لێ نیشت و شتەکەی شاردەوە و گوتی: 'ئاگام لە شتی وا نییە.' کابرا گوتی: 'مەگەر تۆ دەستیت نەبەستەوە و نەتخستە گۆلەکەوە؟ ئەی پێی نەگوتی: 'ئەگەر دەستم لە ئاوەکە هاتە دەر، خێرا تۆڕەکەم بۆ هەڵدە و دەرمبێنە. ئەگەر لاقەکانم هاتنە سەرێ، وازم لێ بێنە و هێسترەکە بەرە بۆ شەمیعەی جوولەکە، ئەویش سەد دینارت دەداتێ'؟ جا کاتێ تۆ ئەوت خستە گۆلەکەوە، لاقەکانی ئەو سەرئاو کەوتن و تۆ هێسترەکەت برد بۆلای جوولەکەکە، ئەویش سەد دیناری دایتێ.' جووزەر گوتی: 'باشە کە خۆت هەموو ئەم شتانە دەزانی، بۆ دەپرسی؟' مەغریبییەکە گوتی: 'ئاخر دەمەوێ ئەوەی بە براکەمت کرد، بە منیشی بکەی.' ئەوجار پەتێکی ئاوریشمینی دەرهێنا و دای بە جووزەر و پێی گوت: 'دەستم ببەستەوە و بمخە گۆلەکەوە. ئەگەر منیش وەک براکەمم لێ هات، ئەوا هێسترەکە بەرە بۆ جوولەکەکە و ئەو سەد دینارت دەداتێ.' جووزەر کە قسەکانی بیست، گوتی: 'وەرە پێشەوە.' مەغریبی هاتە پێشێ و جووزەر توند دەستی بەست و خستیە گۆلەکەوە. کابرا نوقم بوو. جووزەر ماوەیەک چاوەڕێی کرد، لەپڕ لاقی هاتە دەرەوە. جووزەر لە بەر خۆیەوە گوتی: 'ئەمەش چوو. ئەگەر خودا بیەوێ، ئەوا هەموو ڕۆژێ لەو مەغریبییانە دێنە لای من و دەیانبەستمەوە و دەیانخەمە ئاوەکەوە و دەمرن و بۆ هەر مردوویێکیش سەد دینارم پێ دەبڕێ.' ئەوجار هێستری برد و چوو بۆ لای شەمیعە. کە شەمیعەی جوولەکە چاوی پێی کەوت و گوتی: 'یەکێکی دیکەش مرد! کوڕە چش لە مردنی. تۆ خۆش بی، پاداشی چاوچنۆک و هەڵپەکاران

هەر ئەمەیە.' دوایی هێسترەکەی لێ وەرگرت و سەد دیناری زێڕی دایێ.

" 'جووزەر زێڕەکانی لە کۆشـــی کرد و بەرەو لای دایکی تێی تەقاند. دایکی گوتی: 'ئەم زێڕانەت لە کوێ بوون؟' جووزەر بەســــەرهاتەکەی بۆ گێڕاوە. دایکی گوتی: 'ئیدی بە لای گۆلی قاڕووندا نەچی. من دەترسم ئەو مەغریبییانە شتێکت بەســەر بێنن.' جووزەر گوتی: 'دایکە گیان، خۆ من بە ئارەزووی خۆیان نەبێ، نایانخەمە گۆلەکەوە. ئینجا چۆن دەســـت لەم کارە هەڵبگرم کە لە ماوەیەکی کەمدا ســــەد دیناری زێڕم دەســـت دەکەوێ؟ بە خودا وازی لێ نـاهێنم و پێم لە گۆلی قـاڕوون نـابڕم تـا تووی مەغریبییەکـان نەبڕێتەوە و تاقەواریان مابێ.'

" 'وا بوو بۆ ڕۆژی ســـێیەمیش چووەوە بۆ گۆلی قاڕوون. لە ناکاو مەغریبییەکی دیکە بە سواری هێسترەوە پەیدا بوو، بەڵام لە دوو مەغریبییەکەی دیکە کۆک و پۆشتەتر بوو و ڕووی کردە جووزەر و گوتی: 'ســــڵاو جووزەری کوڕی عومەر.' جووزەر لە دڵی خۆیدا گوتی: 'باشــە ئەوە چۆنە کە گشـــت مەغریبییەکان دەمناســـن؟' کە جووزەر ســـڵاوەکەی ســــتاندەوە، کابرا گوتی: 'بۆم بگێڕەوە، کەس لە مەغریبییەکان لێرەوە تێپەڕیون؟' جووزەر گوتی: 'بەڵێ، دووانم دیوە.' کابرا گوتی: 'ئەی چییان لێ هات؟' جووزەر گوتی: 'دەســـتیانم بەســـەتەوە و خســـتمنە ئەم گۆلەوە و نوقم بوون. جا ئێســـتا نۆرەی تۆیە.' مەغریبییەکە پێکەنینی بە قسەکەی هات و لە هێسترەکە دابەزی و هاتە پێشــەوە و بە جووزەری گوت: 'چیت بەوان کرد، بە منیشـــی بکە.' پەتێکی ئاوریشـــمی دەرهێنا و گوتی: 'خێرا وەرە دەستەکانم ببەستەوە وا کات تێدەپەڕێ.' جووزەر چووە پێشـەوە و دەستەکانی توندتر لە دووانەکەی دیکە بەســت و خســتیە گۆلەکەوە و چاوەڕوانی بوو تا لە ناکاو دەســـتەکانی مەغریبییەکە لە ئاوەکە هاتنە دەرەوە و بە جووزەری گوت: 'تۆڕەکەم بۆ هەڵدە.' جووزەر تۆڕەکەی بۆ هەڵدا و ڕایکێشـا. تەماشـای کرد کابرای مەغریبی دوو ســوورەماســی وەک مەرجانی بە دەســـتەوەیە. کابرا بە جووزەری گوت: 'ئەو دوو قوتووەی بە خوجێنەکەوەن بیانهێنە سەرەکەیان بکەوە.' جووزەر قوتووکانی هێنا و سەرەکانیانی هەڵگرت. مەغریبییەکە هەر ماسییەکی خستە قوتوویەکەوە و سەرەکانیانی توند بەست. باوەشی لە جووزەر دا و ماچی کرد و پێی گوت: 'ئەو خودایە تۆ لە هەر ســـەختی و بەڵایەک ڕزگار بکا. بە خودا ئەگەر تۆ ئەو تۆڕەت بۆ هەڵنەدامایە و دەرتنەهێنابامـاوە، من دەستـم لەم دوو ماسـییە بەر نەدەدا تا ئەوەی لە ئاوەکەدا نوقم دەبووم و دەخنکام.' جووزەر گوتی: 'قوربان، ســـوێندت دەدەم بە خودا کە من لە کاری ئەو دوو مەغریبییەی دیکە کە نوقم بوون، ئاگادار بکەوە و ڕاستیی ئەم دوو ماسییەم پێ بڵێ و باسی ئەو جوولەکەیەشم بۆ بکە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی شەشسەد و دەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــــکۆ! کاتێک جووزەر داوای کرد ڕاســـــتی بابەتی ئەو مەغریبییانە و جوولەکەکەی پێ بڵێ، مەغریبییەکە گوتی: 'ئەو دوو مەغریبییەی خنکـان، برام بوون. یەکێکیان ناوی عەبدوســــــــەلام و ئەوی دیکەیان ناوی عەبدولئەحەد بوو. منیش ناوم عەبدوسسەمەد و جوولەکەکەش ناوی عەبدوڕڕەحیمە. ئەویش هەر برامانە و جوولەکە نییە و موســـڵمانی مالیکی مەزهەبە. باوکمان کردنەوەی بوخچەی نهێنی و زانســـتی پێوار و دیتنەوەی گەنج و زانســـتی داهاتووبینی فێر کردین. وا بووو زانســـــتمان لە پلەیەکدا بوو، نرناش و جنۆکان گوێڕایەڵمان بوون. باوکمان ناوی عەبدولوەدوود بوو. کە کۆچی دوایی کرد، ســـامانێکی زۆری بۆ جێ هێشــتین. ئێمە ســـامانەکەیمان لەنێو خۆماندا بەش کرد و کتێبەکانیش هەروەتر. بۆ کتێبێک کێشــە کەوتە نێوانمانەوە. مامۆستاکەی باوکمان کە ناوی 'کەهینولئەبتەن' بوو، هات کێشـــەکەمان چارەســـــەر بکات، گوتی: 'ئەو کتێبەم بۆ بێنن.' کتێبەکەمان بۆ برد. کتێبەکە ناوی 'ئەســـــاتیرولئەووەلین' بوو و هاوشـــێوەی نەبوو. هیچ نرخێک بەرابەری نەبوو، چونکە ناوی هەموو گەنجینەکان و وەڵامی ڕازەکان و گشــــت زانستێکی داهاتووبینی و جادووی تێدا بوو. مامۆستا گوتی: 'ئێوە وەکو نەوەی منن. ستەم لە هیچ کامتـان ناکەم. هەر کـامتـان بیهەوێ، دەتوانێ کتێبەکە بۆ ئەو بێت، بەڵام دەبێت گەنجی شـەمردڵ بکاتەوە. گۆی گەردوونی و ســوورمەدان و ئەنگوســتیلە و شـمشـێرەکەی ناوی دەربهێنێت. جا ئەو ئەنگوستیلەیە نرناشێکی هەیە 'شریخەی هەورەگرمە'ی پێ دەڵێن.' هەرکەس ببێتە خاوەنی ئەو ئەنگوســتیلەیە، هیچ پاشـایەک بەســەریدا زاڵ نابێ. جا ئەگەر بیهەوێ هەموو ســەر زەوی بخاتە ژێر دەســەڵاتییەوە، ئەوە دەتوانێ. ئینجا شـمشـێرەکەش ئەگەر کەســـێک لە کێلانەکەی هەڵبکێشــــێت و بەرەو ڕووی ســــوپایەک ئاماژە بکا و بیجووڵێنێتەوە، ئەوا ئەو سوپایە لە جێوە شکست دەهێنێ. ئەگەر هەڵگری شمشێرەکە بڵێت ئەو سوپایە بکوژە، هەر لەو ساتەدا تیشکی ئاگرێک دەردەپەڕێت. بەڵام تایبەتمەندیی گۆی گەردوونەکە ئەوەیە کە ئەگەر هەرکەســێک ببێتە خاوەنی و بیهەوێت هەموو شــارەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە تـا ڕۆژئـاوا ببینێ، دەتوانێ. نیـازی هەر لایەکی هەبێ، گۆیەکە بۆ ئەو لایە دەجووڵێنێ و سـەیری دەکا و شـارەکانی ئەو ناوچەیە بە خەڵکەکانیانەوە دەبینێ. ئەگەر لە شـــــارێک توورە ببێ، گۆیەکە ڕووەو خۆر دەگرێ و داوای ســــووتانی ئەو شـــــارە دەکا، دەمودەســـت ئەو شـارەش دەسـووتێ. ئەوجار هەرکەسـێک لەو سـورمەیە لە چاوی بدا، گەنجینەکانی ژێر زەوی دەبینێ. بەڵام من مەرجێکم بۆتان هەیە. ئەویش ئەوەیە هەرکەس نەیتوانی ئەو گەنجینە بکاتەوە، ئەم کتێبەی نادرێتێ. هەرکەسـێکیش ئەو گەنجینە بکاتەوە و ئەو چوار شتەم بۆ بهێنێ، کتێبەکە با لە من وەربگرێ.'

که مامۆستاکەی باوکمان ئەم قسەیەی کرد و مەرجەکەی دانا، ئێمە بە مەرجەکە قایل بووین. ئەوجار گوتی: 'ڕۆڵەکانم، ئەوە بزانن کە گەنجینەی شەمردڵ لەژێر دەسەلاتی کوڕانی ئەحمەر پادشا دایە و باوکی ئێوە زۆری هەوڵی کردنەوەی گەنجینەکەی دا، بەلام نەیتوانی. کوڕانی ئەحمەر پاشا لە ولاتی میسر چوونە گۆلێکەوە کە گۆلی قاڕوونی پێ دەلێن و باوکی ئێوەیان دەستەوسان کرد. باوکتان چوو بۆ ئەو گۆلە و نەیتوانی دەستی پێیان بگا. ئاخر گۆلی قاڕوون جادووی بەسەردا کرابوو.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی شەشسەد و یازدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! کەهینولئەبتەن بە منداڵەکانی عەبدولوەدوودی گوت: 'کاتێک باوکتان نەیتوانی گەنجینەی شەمەردڵ بکاتەوە، دەردی دڵەکەی بۆ من هەڵڕشت و منیش بە ژمارە بۆم لێکداوە دیتم ئەو گەنجینەیە بەسەر کوڕێکدا نەبێ ناکرێتەوە ئەویش ناوی 'جوورزەر'ە، کە ئەو دەبێتە هۆی ئەوەی کوڕانی ئەحمەر پاشا بگیرێن. ئەو کوڕە، ماسیگرە و لە گۆلی قارِوون تووسب دەبن. بەڵام جادووی ئەو گۆلە بەتاڵ نابێ هەتا ئەو جوورزەرە دەستەکانی ئاواکارەکە نەبەستێتەوە و نەیخاتە نێو گۆلەکەوە. ئینجا داواکار دەبێت لەگەڵ کوڕانی ئەحمەر پاشادا بەشەڕێ. ئەگەر گەنجینەی شەمەردڵی بە قسمەت بووبێ، ئەوە کوڕانی ئەحمەر پاشا دەگرێت. ئەگەریش بەختی نەیهێنێ، ئەوە تێدا دەچێت و لاقەکانی لە ئاوەکە دێنە دەرەوە. ئەو کەسەی ڕزگاریشی ببێ و بە سەریاندا زاڵ بێ، دەستەکانی دێنە دەرەوە. ئەودەم دەبێت جوورزەر تۆڕی بۆ بۆ بهاوێت و لە گۆلەکە دەری بهێنێتەوە.' کاتێک کەهینولئەبتەن ئەم قسانەی بۆ کردین، ئەو دوو برایەم گوتیان: 'ئێمە دەچین کوڕانی ئەحمەر پاشا دەگرین.' منیش هەر بەو نیازەوە هاتمە دەر. بەڵام ئەو برایەمان کە خۆی خستووەتە سەر شێوەی جوولەکان، گوتی: 'من نە پێویستم بەو کتێبەیە و نە بە دوای کردنەوەی ئەو گەنجینەیەشدا دەچم.' ئیدی ئەو سیانەمان لەگەڵ ئەودا ڕێککەوتین کە ئەو بە بیچمی جوولەکەیەکی بازرگاندا بێتە میسر تا ئەگەر هەر کامێکمان مردین، ئەو هەگبە و هێسترەکە وەربگرێتەوە و سەد دینار بدات بە تۆ. وا بوو یەکەم برام کە هاتە لات، کوڕانی ئەحمەر پاشا کوشتیان و دووەمیش هەروەتر، بەڵام نەیانتوانی بەسەر مندا زاڵ ببن. من ئەوانم گرت.' جوورزەر گوتی: 'ئەی کە گرتنت، ئێستا لە کوێن؟' مەغریبییەکە گوتی: 'ئەی مەگەر نەتدی خستمنە نێو ئەو دوو قوتووەوە و بەندم کردن؟' جوورزەر گوتی: 'خۆ ئەوانە ماسی بوون.' مەغریبی گوتی: 'ئاخر ئەوانە درنجن چوونە قالبی ماسییەوە، بەڵام جوورزەر، ئەوە بزانە گەنجینەی شەمەردڵ بە ڕووی تۆدا نەبێ، ناکرێتەوە. ئایا بە گوێم دەکەی لەگەڵ مندا بێی بۆ شاری فاس و مەکناس، بۆ ئەوەی گەنجینەکە بکەیتەوە هەتا منیش تۆ بێنیاز بکەم و بە دڵی خۆشەوە بگەڕێیتەوە نێو خزم و خوێشانت؟' جوورزەر گوتی: 'قوربان، دایکم و براکانم لە ئەستۆی منن.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ! 'جووزەر بە مەغریبییەکەی گوت: 'من ئەگەر لەگەڵ تۆدا بێم، کەس نییە نانیان بۆ پەیدا بکا.' مەغریبی گوتی: 'کوڕە ئەمە خۆ کێشـــە نییە. تۆ ئەگەر خەمی گوزەرانی ئەوانتە، ئەمن هەزار دینارت دەدەمێ و بیدە بە دایکت با تا تۆ دێیتەوە، لەوە خەرج بکا. بە هاتن و گەڕانەوەت زیاد لە چوار مانگت پێ ناچێ.' جووزەر کە باسـی هەزار دیناری بیســـت، گوتی: 'قوربان تۆ هەزار دینارەکە بێنە تا من بیدەم بە دایکم.' کابرا هەزار دینارەکەی دەرهێنا و دایێ. جووزەر وەریگرت و بردییەوە دای بە دایکی و پێشـــی گوت سـەفەرێکی ئاوام لە پێشـە، تۆ ئەم هەزار دینارە بگرە بۆ خۆت و براکانمی خەرج بکە. من لەگەڵ ئەو مەغریبییەدا دەچم بۆ مەغریب و لەچوار مانگ زیاتریشـــم پێ ناچێ و لەم ماوە کەمەدا قازانجێکی زۆر دەکەم. جا دایکە گیان، تۆش دۆعای خێرم بۆ بکە.' دایکی گوتی: 'ڕۆڵە جووزەر، مەمخە ترس و دڵەڕاوکێوە. ئاخر دەترسـم شـتێکت بەسـەر بێ.' جووزەر گوتی: 'کەســێک کە خودای گورە ئاگای لێی بێ، باکی بە هیچ نییە. ئینجا ئەو کابرا مەغریبییەش کەســێکی باشــە.' دایکی گوتی: ' خودا دڵی ئەو مەغریبییە بە پاکی بێڵێتەوە. ڕۆڵە گیان، بڕۆ بەشکم شتێکت بداتێ.'

" 'جووزەر ماڵاوایی لە دایکی کرد و چووەوە لای عەبدوســـەمەد، ئەویش پێی گوت: 'ڕاوێژت بە دایکت کرد یا نا؟' جووزەر گوتی: 'بەڵێ قسـەم لەگەڵ کرد و ماڵاواییم لێ کرد.' ئەوجار مەغریبی بە جووزەری گوت: 'وەرە ســوار بە.' جووزەر لە پاشـــکۆی مەغریبی سـوار. لە نیوەڕۆوە تا عەسر بەڕێوە بوون. جووزەر برسـی بوو و هیچ خواردنێکیشـی بە مەغریبییەکە نەبینی، گوتی: 'قوربان دەڵێی بیرت چووە توێشـوو بێنی؟' کابرا گوتی: 'مەگەر برســیتە؟' جووزەر گوتی: 'ئەرێ وەڵا برسـیمە.' کابرا گورج لەگەڵ جووزەردا دابەزین و خوجێنەکەی هێنا و بە جووزەری گوت: 'کاکە، چیت دەوێ؟' جووزەر گوتی: 'هەرچی هەبێ خراپ نییە.' مەغریبی گوتی: 'تۆخودا حەزت لە چییە پێم بڵێ.' جووزەر گوتی: 'نـان و پەنیرم پێ خۆشە.'

" 'کابرا گوتی: 'کوڕە داماو، ئەوە چییە، داوای دەکەی؟ ئەتۆ شــایانی زیاتری. داوای خواردنێکی باش بکە.' جووززە گوتی: 'ئێستا بە لای منەوە هەموو شـتێک باش و خۆشـە.' مەغریبی گوتی: 'جووزەر، حەزت لە مریشــکی برژاو هەیە؟' جووزەر گوتی: 'ئا.' کابرا گوتی: 'ئەی برنج کە شـــەکری پێوە کرابێ؟' جووزەر گوتی: 'ئا.' ئیدی هەر ئاوا هەر ئەو نێوی چێشــت و خواردەمەنی خۆشــی جوارجۆری هێنا و ئەویش گوتی: 'ئا.' تا بیسـت و چوار جۆر خواردنی ناودێر کرد. جووزەر لە دڵی خۆیدا گوتی: 'باشــە ئەم کابرایە شـێتە.

چی؟ ئەم گشــتە خواردنە لە کوێ دێنێ؟ خۆ نە کەل‌وپەلی پێیە و نە ئاگردانێ شــتێ هەیە! خۆ من هیچی پێ نابینم!' کابرا دەســتی بە نێو هەگبەکەدا کرد، مەنجەڵێکی زێڕینی دەرهێنا کە دوو مریشــکی برژاوی تێدا بوو. دیســان دەســتی بەنێودا کردەوە، دەفرێکی زێڕینی دەرهێنا کەبابی تێدا بوو. هەروا لە هەگبەکەوە دەفر دوای دەفری دەر دەهێنا تا ئەو بیست و چوار جۆر خواردنەی دەرهێنا کە گوتبوونی. جووزەر بە بینینی ئەمە واقی وڕ ما. کابرا گوتی: 'کوڕە داماو، بخۆ.' جووزەر گوتی: 'باشــە قوربان، مەگەر تۆ لەم هەگبەیەدا ناندینت دروســت کردووە و چێشــتلێنەرت هەیە؟' مەغریبی پێی پێکەنی و گوتی: 'ئەم هەگبەیە جادووییە و خزمەتکارێکی تێدایە کە ئەگەر لە یەک کاتدا داوای هەزار خواردن بکەی، بۆت دێنێ.'

" 'دوایی دەستیان بە خواردن کرد و ئەوەی لە دەفرەکاندا ماوە، مەغریبییەکە هەر لەوێ ڕشــتنی و دەفرەکانی خســتنەوە نێو هەگبەکە. ئەوجار دەســتی برد مەســینەیەکی دەرهێنا. ئاومان خواردەوە و دەســتنوێژمان شــوشــت و نوێژی ئێوارەمان کرد. مەســینەکەی لە هەگبەکە خســتەوە. هەگبەکەی لە هێســترەکە نا و ســوار بوو. ئەوجار بە جووزەری گوت: 'یاللا ســوار بە.' دوایی لێی پرســی: 'دەزانی لە میســرەوە تا ئێرە چەندە ڕێمان بڕیوە؟' جووزەر گوتی: 'نەوەڵا نازانم.' کابرا گوتی: 'یەک مانگەڕێمان بڕیوە.' جووزەر ســەری ســووڕ ما. کابرا گوتی: 'جووزەر پێت ســەیر نەبێ. ئەم هێســترە جنۆکەیە و لە ڕۆژێکدا ساڵەڕێیەک دەبڕێ، بەڵام من سەبارەت بە تۆ هێواشی لێ دەخورم.' ڕۆیشتن و لای ئێوارە لە جێیەک دابەزین. نان و شــتیان خوارد و وەڕێ کەوتنەوە، ئیدی هەر ئاوا هەتا چوار ڕۆژان، ڕۆژان تا نیوەشــەو دەڕۆیشــتن و نیوەشــەو تا بەیانی دەخەوتن. جا هەر شــتێک جووزەر لە مەغریبی بویستایە، کابرا دەمودەست لە هەگبەکە بۆی دەر دەهێنا. ڕۆژی پێنجەم گەیشــتنە شــاری فاس و مەکناس. چوونە ناو شــارەوە. لە ناو شــار هەرکەس تووشــیان با ســڵاوی لە کابرای مەغریبی دەکرد و دەســتی ماچ دەکرد. ئەوە بوو گەیشــتنە دەرگەی ماڵێک، لە دەرگەی دا. دەنگێک گوتی کێیە لە درەگە دەدا. مەغریبی گوتی: 'ڕەحمەت، کچێ دەرگەکە بکەوە.' کە دەرگە کراوە، کچێکی ڕوومانگ دەرکەوت. کچە بە لەنجە و خەرامانەوە کەوتە پێشــیان و ســمتی با دەدا. جووزەر بە بینینی هۆشــی لەســەر خۆی نەما و لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەمە دەبێ کچە پاشــا بێ.' کابرا هەگبەکەی لە هێســترەکە کردەوە و گوتی: 'بەگەڕێوە.' لەپڕ زەوی شــەقی برد و هێســتر ڕۆچوو و زەوی یەکی گرتەوە. جووزەر زیرەی کرد. کابرا گوتی: 'کوڕە جووزەر مەترســە. فەرموو بچووە ژوورێ.' کە چوونە ژوورێ، جووزەر بە بینینی ئەو هەموو فەرشــە گرانبایی و کەلوپەلە دانســقە و جوان و گەوهەرانە واقی وڕ ما. ئەوجار مەغریبی بە کچەی گوت: 'ڕەحمەت، دا فلان بوخچەم بۆ بێنە.' کچە بوخچەکەی بۆ هێنا. مەغریبی کەوایەکی دەرهێنا کە بایی هەزار دینار بوو و بە

جووزەری گوت: 'ئەمە لە بەر کە.' جووزەر لە بەری کرد، وەک یەکێک لە پاشـــاکانی مەغریبی لێ هات. دوایی کابرا دەســـتی بەنێو هەگبەکەدا کرد و خواردەمەنی جۆراوجۆری لە دەفری زێڕیندا دەرهێنا و لەســەر ســفرە داینان. هەتا گەیشــتە چل جۆرە خواردەمەنی. ئەوجار بە جووزەری گوت: 'بخۆ و گلەیی مەکە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەوشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و سێزدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! 'مەغریبی گوتی: 'کامیانت پێ خۆشە لەو بخۆ. شەرمی ناوێ، ئێمە نازانین حەزت لە چییە. ئەگەر چێشتێکی دیکەشت پێ خۆشە دەنگ بکە با بۆت بێنین.' جووزەر گوتی: 'قوربان، بە خودا من حەزم لە گشت خواردنێکە و ڕقم لە هیچ نییە. تۆ لە من مەپرسە. ئەوەی بە خەیاڵتدا دێ، داینێ.' جووزەر بیست ڕۆژ لای کابرای مەغریبی ماوە و هەر ڕۆژێ جلوبەرگێکی لە بەر دەکرد. کابرا خواردنی جۆراوجۆری لە هەگبەکە دەر دەهێنا و هیچی نەدەکڕی و هیچی لێنەدەنا. کە ڕۆژی بیست و یەکەم هات، مەغریبی گوتی: 'جووزەر هەستە ئەمڕۆ ڕۆژیەتی.' جووزەر لەگەڵ مەغریبیدا هەستان و چوونە دەرەوەی شار. جووزەر بە سواری یەسترێک و کابراش بە سواری یەسترێک. هەتا دەمەو نیوەڕۆ بەڕێوە بوون تا گەیشتنە ڕووبارێکی شینی بەخوڕ.

" 'عەبدوسسەمەدی مەغریبی دابەزی و بە جووزەری گوت: 'تۆش دابەزە.' جووزەریش دابەزی. عەبدوسسەمەد بە دوو کۆیلەی گوت: ئێوە بڕۆن. ئیدی یەکی یەسترێکیان برد و ڕۆیشتن. دوای ماوەیەک یەکێک لەو دوو کۆیلەیە خێوەتێکی هێنا و هەڵیدا و دایبەست. ئەوی دیکەشیان فەرشی هێنا و لە خێوەتەکەدا ڕایخست و دۆشەک و پشتی لە هەر چواردەوری خێوەتەکەدا دانا. یەکێکیان چوو ئەو دوو قوتووە بێنێت کە کابرای مەغریبی ماسییەکانی تێخستبوو. ئەوەی دیکەشیان هەگبەکەی هێنا. مەغریبی هەستا لە هەگبەکە چێشت و شتی دەرهێنا و نانیان خوارد. ئەوجار مەغریبی قوتووەکانی بە دەستەوە گرت، چاچۆلی[1] بەسەردا خوێندن تا شکان و پارچەپارچە بوون. لەنێویاندا دوو دەستی بەستراو دەرکەوتن کە دەیانگوت: 'بمانپارێزە ئەی کاهینی دنیا! بە تەمای چیمان لێ بکەی؟' مەغریبی گوتی: 'یا دەتانسووتێنم، یا گەنجینەی شەمردڵم بۆ دەکەنەوە.' گوتیان: 'بەڵێن بێ گەنجینەی شەمردڵت بۆ بکەینەوە، بەو مەرجەی جووزەری ڕاوچی ئامادە بکەی. ئاخر ئەو گەنجینەیە بە ڕووی ئەودا نەبێ، ناکرێتەوە. هیچ کەسێکیش ناتوانێت بچێتە نێو گەنجینەکەوە، جووزەری کوڕی عومەر نەبێ.' مەغریبی گوتی: 'ئەو کەسەی ئێوە دەتانەوێ، هێناومە و ئێستا لێرەیە. گوێی لە قسەکانتانە و دەتانبینێت.' بەڵێنیشیان دا گەنجینەی شەمردڵ بکەنەوە. ئەوجار مەغریبی دەستی کردنەوە.

" 'دوای ئەوە لوولەک و چەند تەتەڵەی عەقیقی سووری دەرهێنا و تەتەڵەکانی بەو لوولەکانەوە هەڵواسی و ئاگردانێکی ئامادە کرد و ئاگری تێدا هەڵگیرساند و بخووری هێنا. ئینجا بە جووزەری گوت: 'کاتێک من خەریکی ویرد خوێندنم. نابێ قسە بکەم، ئەگینا بەتاڵ

---

[1] . چاچۆل: تەلەسم، جادوو.

دەبێتەوە. ئێســـتا فێرت دەکەم کە چی بکەیت تا کارەکەمان جێبەجێ بێ.' جووزەر گوتی: 'زۆر بـاشــــەفێرم کە.' مەغریبی گوتی: ''کـاتێ من ویرد دەخوێنم و بخورەکە دەکەمە ئاگرەکەوە، ئاوی ئەم ڕووبارە وشک دەبێ و دەرگەیەکی زێڕین بە قەد دەروازەی شـارێک دەردەکەوێ کە دوو ئەڵقەی گەوهەرینی پێوەیە. تۆ بچۆ لای ئەو دەرگەیە و لەســـەریەک ســـێ جاری لێ دە. ئەوجـار گوێت لە دەنگێک دەبێت کە دەڵێ: 'ئەوە کێیە لە دەرگەی گەنجینەکـان دەدا؟' تۆش لە وەلامیـدا بڵێ: 'منم جووزەری ڕاوچی کوڕی عومەر.' دەمودەست دەرگەکە بە ڕووتدا دەکرێتەوە و کەسێک بە شـیری ڕووتەوە دێتە دەرەوە و دەڵێ: 'ئەگەر تۆ جووزەری، گەردنت بێنە تا سەرت لە لەشت جیا بکەمەوە.' تۆ ترست نەبی و ملت مەکشـــێنەوە. ئەو هەر کە دەســـت بەرز بکاتەوە لە ملت دا، لە جێوە لەبەردەمتدا دەکەوێ و دەمرێ و ناتوانێ هیچت لێ بکا. ئەگەر ســـەرپێچی بکەی، ئەوە دەتکوژێ.جا کاتێک جادووەکەی ئەو هەڵدەوەشـــێنیتەوە، لە دەرگەکە دەچیتە ژوورەوە و دەرگەیەکی دیکە دەبینی. لەو دەرگەیەش بدە، سوارێک کە ڕمبێکی لە سەر شانە دێتە دەرەوە و دەڵێت: 'چۆنە هاتوویتە ئێرە خۆ نە مرۆ و نە جنۆکە کەس نەیتوانیوە بێتە ئێرە؟' ئەوجار ڕمەکەت تێ دەگرێت، تۆ ســنگی وەبەر بدە. هەر کە بەرت کەوت، دەمودەســت کابرا خۆی دەمرێ. بەلام ئەگەر ســەرپێچی بکەی، ئەوە دەتکوژێ. دوایی لە دەرگەکەوە بچۆ ژوور و کابرایەک بە تیر و کەوانەوە پەیدا دەبێ و تیرت تێ دەگرێ و تۆش ســـنگتی بۆ بکە قەڵغان. کە تیرەکەت وێ کەوت، کـابرا لە جێوە گیـانی دەردەچێ، بەلام ئەگەر ســـەرپێچی بکەی. دەتکوژێ. دوایی لە دەرگەکە وەژوو کەوە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! 'مەغریبییەکە بە جووزەری گوت: 'لە دەرگەکە وەژوور کەوە و لە دەرگەی چوارەم بدە. کە دەرگەکە کراوە، درندەیەکی زەبەلاح دێتە دەرەوە و تۆ دەســت لە زاری ڕۆ بکە. کە بیهەوێ قەپ لە دەستت بگرێ، لە جێوە خۆی دەتۆپێ و هیچ زیانێکت پێ ناگا. ئەوجار بەرەو دەرگەی پێنجەم بچۆ و بڵێ: 'هۆ عیســـا، بە مووســـا بڵێ کە دەرگەکە بکاتەوە.' کە دەرگەکە دەرکریتەوە، دوو ئەژدیها دەبینی کە دەمیان کردووەتەوە و بەرەو ڕووت دێن. تۆ لێیان مەترســـە و دەســـتەکانت بە دەمیاندا بکە و هەر کە گازت لێ بگرن، خۆیان دەتۆپن و ئەگەر ســـڵ بکەی نەتهەوێ بەرەو ڕوویان بییەوە دەتکوژن. دوای ئەوە بچۆ لای دەرگەی حەوتەم و لێی بدە. دایکت دێتە دەرەوە و پێت دەڵێ: 'ســـڵاو، ڕۆڵە گیان! من دایکتم. تۆ بڵێ لێم دوور کەوەوە و جلەکانت داکەنە. ئەویش پێت دەڵێ: 'من هەقی نۆ مـــانـگ و نۆ ڕۆژەم بە ســـــەرتەوەیە، چۆن من ڕووت دەکەیتەوە؟' تۆ بڵێ: 'ئەگەر جلوبەرگەکەت دانەکەنی، دەتکوژم.' ئەوجار سەیری لای دەستی ڕاستت بکە کە شیرێک بە دیوارەکەوەیە. ئەو شـیرە هەڵگرە و پێی بڵێ: 'جلەکانت داکەنە.' ئەو لێت دەپاڕێتەوە و فێڵت لێ دەکات. تۆ بەزەییت پێیدا نەیە. ئەگەر کراســـێکی داکەند، بڵێ: 'ئەوانی دیکەش داکەنە' و هەڕەشـەی کوشـتنی لێ بکە، تا تەواوی جلەکانی دادەکەنێ. کە ئاخرین کوتی داکەند، گیانی دەردەچێ و دەکەوێ. لەوێدا تەواوی جادووەکان بەتاڵ دەبنەتەوە. لە هەموو مەترسییەکان ڕزگارت دەبێ. ئەوجار بچۆ نێو گەنجینەکەوە و زێڕ و زیو بە خەروار لەوێ هەڵڕێژراوە. گوێیان مەدەرێ و لە لای سەرەوەی گەنجینەکەدا تەختێک هەیە کە پەردەی بەسەردا دراوە. پەردەکە لا بدە. شەمردڵی جادووگەر لەسەری دانیشتووە. شتێکی گۆیینی بەسەرەوەیە کە وەک مـــانـگ دەدرەوشـــــێتەوە. ئەوە گۆی گەردوونییە. شـــــیرێکی بە لاقەدەوەیە و ئەنگوســـــتیلەیەک لە قامکیدا، ملوانکەیەکیش بە گەردنیەوەیە کە کلدانێکی پێوەیە. ئەو چوار شـــتەم بۆ بێنە. نەکا هیچ یەک لەوانەی پێم گوتی، لە بیرت بچنەوە، ئەگیان پەشـــیمان دەبیتەوە و ترس باڵت بەســـەر دەکێشـــێ. مەغریبی هەر وا قســـەکانی چەندپات کردەوە تا جووزەر گوتی: 'هەمووم لە بەرکردن، بەڵام کێ توانایی بینینی ئەم بیچمە ترســـناکانەی هەیە؟ باشە چۆن دەکرێ لە ئاست ئەم مەترسییە گەورانەدا دان بە خۆتدا بگری؟' مەغریبی گوتی: 'هیچ ترست نەبێ، جووزەر، ئاخر ئەوانە هەموو قاڵبی بێگیانن.'

" 'جووزەر پشـــتی بە خودا بەســـت و، مەغریبی بخوری لە ئاگردا ســـووتاند و ویردی خوێند تا ئاوی ڕووبارەکە وشـــک بوو و دەگەی گەنجینەکە دەرکەوت. جووزەر چووە لای دەرگەکە و لێی دا. دەنگێک هات، گوتی: 'ئەوە کێیە نازانێ ڕازەکان بکاتەوە و لە دەرگەی گەنجینە دەدات؟' جووزەر گوتی منم، جووزەری کوڕی عومەر. دەمودەســـت دەرگە کراوە

و کەسێک بە شیری ڕووتەوە هاتە دەرەوە و شیری لە جووزەر هەڵکێشا و گوتی: 'ئێستا ملت دەپەڕێنم.' جووزەر ملی بردە پێشەوە. کە ڕاسا بە شیرەکە لە ملی جووزەر دا، لەڕێوە بە لادا هات و گیانی دەرچوو. بە هەمان شێوە لای دەرگەی دووە و سێیەم تا شەشەم هەر وای کرد کە مەغریبییەکە پێی گوتبوو. لە دەرگەی حەوتەمدا دایکی هاتە دەرەوە و سڵاوی لێ کرد و گوتی: 'سڵاو، ڕۆڵە گیان!' جووزەر گوتی: 'تۆ کێی؟' ژنە گوتی: 'من دایکتم. هەقی شــــیر و بەخێوکردنتم بەســــەرتەوەیە. ڕۆڵە گیان، نۆ مانگ و نۆ ڕۆژم بە کۆڵ گێڕاوی.' جووزەر گوتی: 'جلەکانت داکەنە.' گوتی: 'تۆ منالّی منی، چۆن ڕووتم دەکەیتەوە؟' جووزەر دەستی برد و شیرەکەی لە دیوارەکە کردە و گوتی: 'دایدەکەنی یان هەر ئێستا بەم شیرە بتکوژم؟' دوای مشــــتومڕێکی زۆر، ژنە یەکێک لە جلەکانی داکەند. دیســــان جووزەر ترســــاندی تا جگە لە دەرپێیەک، هیچی لە بەردا نەما. ژنە گوتی: 'ڕۆڵە گیان، مەگەر دڵت لە ئاســن و پۆڵایە وا دەتەوێ ڕســوام کەی و عەورەتم دەرخەی؟ مەگەر ئەمە حەرام نییە؟' جووزەر گوتی: 'ڕاســەکەی. قەیناکا دەرپێکەت دامەکەنە.' کە ئەمەی گوت، ژنە هاواری کرد و گوتی: 'جووزەر هەڵەی کرد. لێی دەن.' خزمەتکارانی گەنجینەکە لە هەموو لایەکەوە وەک لێزمەی باران بەســەریدا دابارین هەتا بێهۆش بوو. هەڵیانگرت و بردیانە دەرەوەی گەنجینەکە و دەرگەکانیان داخســــتەوە. کە ئەویان کردە دەرەوە، مەغریبی هەڵیگرتەوە و ئاوی ڕووبارەکە وەک خۆی لێ هاتەوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتایی پێ هات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشـــكۆ! 'عەبدوســـــــەمەد گوتی: 'كوڕە داماو، ئەوە چیت كرد؟' جووزەر گوتی: 'تەواوی بەربەســتەكانم تێپەڕاند و جادووەكانم پووچەڵ كردنەوە تا گەیشــتمە دایكم و قســــە لەنێوانماندا درێژەی كێشــــا و ئەو دانەدانە جلەكانی داكەند تا جگە لە دەرپێیەك، هیچی لە بەردا نەما. ئەوجار گوتی: 'ڕســــوام مەكە. دەرخســــتنی عەورەت حەرامە.' منیش بەزەییم پێیدا هــات و دەرپێكەیم پێ دانەكەنـد. ئیـدی ئەویش یەكبەخۆی هــاواری كرد: 'جووزەر هەڵەی كرد و لێی دەن.' دەمودەســــت كۆمەڵێكم لێ كۆ بوونەوە كە نەمزانی لە كوێوە پەیدا بوون. ئەوەندەیان لێ دام، لە زمانیان خســتم و بێهۆش بووم.' مەغریبی گوتی: 'ئەی پێم نەگوتی ســـــەرپێچی قســــەكانم مەكە؟ ئەگەر تۆ دەرپێكەت پێ داكەندبایە، ئێســــتا كارمان تەوان ببوو، بە ئاوات دەگەیشتین. بەڵام مادەم هەڵەت كرد، تازە دەبێ هەتا ساڵێكی دیكە ئەمڕۆ لای من بمێنییەوە.' ئەوجار مەغریبی و جووزەر سـواری یەسـترەكان بوونەوە و گەڕانەوە بۆ شاری فاس.

" 'جووزەر لای مەغریبی ماوە و هەر ڕۆژێ دەستێك جلی شكۆمەندانەی لە بەر دەكرد تا وا بوو ســــاڵێك تێپەڕی و ڕۆژی دیاریكراو هات. مەغریبی بە جووزەری گوت: 'ئەمڕۆ ڕۆژی دیاریكراوە. هەستە با بچین بە لای گەنجینەكەمانەوە.' جووزەر گوتی: 'بەسەر چاو.' ئیدی مەغریبی ئەوی لەگەڵ خۆی برد بۆ دەرەوەی شــار. دوو كۆیلەكە بە دوو یەســترەوە ئەوێ وێستابوون. خێرا سواری یەسترەكان بوون و وەڕێ كەوتن تا گەیشتنە ڕووبارەكە. كۆیلەكان خێوەتیان هەڵدا و فەرشــیان ڕاخســت. مەغریبی دەســتی بەنێو هەگبەدا كرد و خواردنی دەرهێنا و چێشــــتیان خوارد. دوایی لوولەك و تەتەڵەكانی دەرهێنا و ئاگری كردەوە و بخوری ئامادە كرد. بە جووزەری گوت: 'وەرە با لەسەرڕاوە پێت بڵێم چی بكەی و ڕاســپاردەكانت پێ بڵێم.' جووزەر گوتی: 'قوربان، ئەگەر ناوی خۆمم لە بیر چووبێتەوە، ئەوانەم لە بیر نەچوونەتەوە.' مەغریبی گوتی: 'ئاگات لە گیانی خۆت بێ و وا مەزانە ئەو ژنە دایكتە، بەڵكو چاچۆڵە و لە تەشكی دایكتدایە بۆ ئەوەی تۆ بە هەڵەدا ببا. جاری پێشــوو بە زیندوویی لە دەســــتیان دەرچووی، ئەم جارە هەڵە بكەی، دەرناچی.' جووزەر گوتی: 'ئەگەر هەڵە بكەم، هەقم ئەوەیە بمسووتێنن.'

" 'ئەوجار مەغریبی بخوری لە ئاگرەكەدا سووتاند و ویردی خوێند تا ئاوی ڕووبارەكە وشــــك بوو، دەرگەكە دەركەوت. جووزەر چوو لە دەرگەكەی دا. دەرگە كراوە. هەموو جادووەكانی بەتاڵ كردەوە تا گەیشــتەوە دایكی. دایكی گوتی: 'ســڵاو، ڕۆڵە گیان.' جووزەر گوتی: 'لە كوێ من ڕۆڵەی تۆم، گڵاو؟ یاڵڵا جلەكانت داكەنە.' ژنە بە تەما بوو دیســــان فێڵی

لێ با، خاوە خاوی دەکرد و دانەدانە جلەکانی داکەند، جگە لە دەرپێکەی، هیچی لە بەردا نەما. جووزەر گوتی: 'گڵاو، دەرپێکەشت داکەنە.' ژنە دەرپێی داکەند و دەمودەست گیانی دەر چوو. جووزەر چووە ژوورەوە سەیری کرد، زێڕ و زیو وەک خیز و خۆڵ هەڵڕژاوە. بە هێندی نەگرتن. لە سەرووی گەنجینەکەدا چووە ژوورێکەوە شەمردڵی جادووگەری دی. تەماشای کرد شیرێکی بە قەدییەوەیە و ئەنگوستیلەیەک لە قامکیدا، کلدانێک لە ملیدا و گۆی گەردوونییشی بە سەرەوەیە. جووزەر لێی چووە پێشەوە و شیرەکەی لە قەدی کردەوە و ئەنگوستیلەکەی لە قامکی دەر هێنا و کلدانەکەی لە ملی داکەند و گۆی گەردوونییەکەشی لە سەری هەڵگرت و هاتە دەرەوە. دەنگی تەپڵێکی بیست کە دیانکوتا و خزمەتکارانی گەنجینەکە هەموو دەیانگوت: 'جووزەر، پیرۆزت بێت ئەو گەنجەی پێت بەخشرا.' ئیدی بەردەوام تەپڵیان لێدا تا جووزەریان بەڕێ کردە دەرێ و گەیشتەوە لای مەغریبی. ئەوجار مەغریبی بخور و شتەکەی خستە لاوە و هەستا و جووزەری لە باوەش گرت. جووزەر ئەو چوار شتەی دایێ کە لە گەنجینەکە هێنابوونیە دەرەوە. مەغریبی شتەکانی لێ وەرگرت و بانگی کۆیلەکانی کرد. کۆیلە خێوەتیان هەڵگرت و یەستریان بۆ هێنان و سوار بوون و گەڕانەوە بۆ شاری فاس. مەغریبی دەستی برد لە نێو هەگبەکەدا خواردنی جۆراوجۆری هێنا دەر و لە سەر سفرەکەی دانا و بە جووزەری گوت: 'بخۆ، برا گیان.' جووزەر هەتا تێری خوارد، خواردی. دوایی مەغریبی چێشت و شتەکەی کردە دەفری دیکەوە و دەفرەکانی خستەوە نێو هەگبەکە و بە جووزەری گوت: 'جووزەر، لەبەر خاتری من لە شار و خزم و کەسوکاری خۆت دوور کەوتیتەوە و ئاواتی منت وەدی هێنا، ئەگەر هەر ئاواتێکت هەیە داوای بکە—تۆ شایانی هەموو شتێکی.' جووزەر گوتی: 'قوربان، ئاواتی من بە خودا بەدی دێ، بەڵام من پێم خۆشە ئەو هەگبەیەم بدەیەی.' مەغریبی هەگبەکەی دایێ و گوتی: 'ئەگەر لەمەیش باشترت داوا بکردایە، دەستم بە رووتەوە نەدەنا. بەڵام داماو، خۆ ئەم هەگبەیە جگە لە خواردن هیچ سوودێکی دیکەی نییە. ئاخر تۆ گەلێک سەختیت چەشتووە، من بەڵێنم دابوویتێ کە بە دڵی شادەوە بتگەڕێنمەوە نێو خزموخوێشت. ئێستا لەم هەگبەیە بخۆ و هەگبەیەکی دیکەشت دەدەمێ کە پڕە لە زێڕ و گەوهەر. جا کە گەڕایتەوە شاری خۆت دەست بە بازرگانی بکە. چۆنیەتی دەرهێنانی خواردنەکان لە هەگبەکەش بەو جۆرەیە کە دەستی بۆ درێژ دەکەی و دەڵێی: 'ئەی خزمەتکاری ئەم هەگبەیە، بیکە بە خاتری ئەو ناوانەی لەم هەگبەیەدان فڵان جۆر خواردنم بەری.' دەمودەست ئەو جۆرە خواردنەت دەداتێ کە داوات کردووە و ئەگەر ڕۆژی داوای هەزار خواردن بکەی، سستی نانوێنێ.' دوای ئەوە ناردی کۆیلەیەک بە یەسترێکەوە هات و هەگبەیەکی پڕ لە زێڕ و گەوهەریشی هێنا و بە جووزەری گوت: 'سواری ئەم یەسترە بە و ئەو کۆیلەیەش لەپێشتەوە دەڕوا و ڕێنوێنت دەبێ و دەتخاتە سەر ئەو ڕێیەی کە بەرەو ماڵ و وڵاتی خۆت دەچێ. کاتێکیش گەیشتییەوە ماڵێ، هەگبەکە لە یەسترەکە بکەوە و

یەسـتـرەکە بە کۆیلەکە بسـپێرە. لای کەسـیش باسـی ئەو نەهێنییە مەکە. دەی بە خودام سپاردی.' جووزەر گوتی: 'خودا لێت بە زیاد کا.'

" 'جووزەر هەگبەکەی لە یەسترەکەی نا و بۆخۆیشی سوار بوو، کۆیلەکەش لەپێشیەوە دەرۆیشت. ئیدی بەو شێوەیە ڕۆیشتن ئەو ڕۆژە و شەوەکەشی هەتا بەیانی بەڕێوە بوون. لەگەڵ تاوهەڵاتی بەیانی لە دەروازەی میسر وەژوور کەوتن. بە نێو شاردا دەڕۆیشتن کە جووزەر چاوی بە دایکی کەوت دانیشتبوو سوالّی دەکرد. هەرکە دایکی دیت، تەواو تێک چوو، خێرا لە یەسترەکە دابەزی و خۆی بەسەر لاقی دایکیدا دا. دایکی کە جووزەری دیت ناسییەوە و دەستی بە گریان کرد. دوای کەمێک گریان و دڵخۆشی دانەوە، جووزەر دایکی سـواری یەسـترەکە کرد و بۆخۆشـی لە دواوەی سـوار بوو. چوونەوە ماڵەوە. دایکی لە یەسـترەکە دابەزاند و هەگبەکەشـی داگرت و یەسـترەکەی بە کۆیلەکە سـپارد. کۆیلە یەسترەی وەرگرت و گەڕاوە. ئەویش و یەسترەکەش هەردووکیان درنج بوون.

" 'جووزەر بە سـوالّکردنی دایکی زۆر ناڕەحەت بوو، گوتی: 'دایکە گیان، براکانم چۆنن خۆ شوکور باشن؟' گوتی: 'باشن.' پرسی: 'ئەی بۆچی پارسەکیت[١] دەکرد؟' گوتی: 'ڕۆڵە گیان، لە برساندا.' جووزەر گوتی: 'خۆ هەزار و سێسەد دیناری زێڕم دایتێ!' دایکی گوتی: 'ئاخر براکانت بە فێڵ لێیان سـتاندم و گوتیان کە کەلوپەلی پێ دەکڕن و بازرگانی پێوە دەکەن. کە زێڕەکانیان لێ وەرگرتم، دەریانکردم و منیش لە برسـاندا دەسـتم کرد بە پارسـەکی.' جووزەر گوتی: 'دایکە گیان، ئێسـتا کە من هاتوومەتەوە، خەفەت مەخۆ. ئەم هەگبەیە، پڕ لە زێڕ و گەوهەرە و شـتی دیکەشـم پێیە.' دایکی گوتی: 'ڕۆڵە گیان، تۆ بەختەوەریت. خودا گەورە و سـەربەرزت بکا. جا ئێسـتا هەسـتە شـتێکم بۆ بێنە با بیخۆم؛ دوێنشەو هەر بە برسێتی خەوتووم.' جووزەر بزەی هاتێ و گوتی: 'دایکە گیان، ئیشتیات لە هەر شتێکە پێم بڵێ، هەر ئێستا بۆت ئامادە دەکەم. نە پێویستی بە کڕینە و نە بە کەسێک کە لێینێت.' دایکی گوتی: 'ئاخر ڕۆڵە، من هیچت پێ نابینم.' جووزرە گوتی: 'لەم هەگبەیەدا هەموو جۆرە خواردنێک هەیە.' دایکی گوتی: 'هەر شتێک برسێتی بشکێنێ، باشە.' جووزەر گوتی: 'دایکە گیان، قەناعەتکردن ئەو کاتە باشـە کە هیچ لە دەسـتدا نەبێ. جا ئێسـتا کە هەموو شتێک لە بەر دەستدایە، کاتی قەناعەت نییە و کام شت خۆشترە دەبێ ئەوە بخورێ، هەر خواردنێکت بوێ ئامادەیە. ئەتۆ شـایانی ئەوەی شـتی زۆر باش بخۆی. دەی پێم بڵێ چیت دەوێ.' دایکی گوتی: 'ڕۆڵەگیان، خۆت حاڵی من دەزانی، کامەیان بۆ من گونجاوە، ئەوەیان بێنە.' جووزەر گوتی: 'حاڵی تۆ ئەوەیە کە مریشـکی برژاو و برنجی شـەکر بەسـەرداکراو و هەنگوین و سـەوزە و خواردنێک بخۆی کە بیبەر و زەعفەرانی بەسـەردا کرابێ.'

---

[١]. پارسەک: سوال.

" 'دایکی پێی وا بوو، کە جووزەر گاڵتەی پێ دەکا و گوتی: 'پێم ســـەیرە قســـەی وا دەکەی! ئەوە خەون دەبینی یان شـێت بووی؟' جووزەر گوتی: 'باشـە چیم کردووە و چیم گوتووە کە بە شـێتم بزانی؟' دایکی گوتی: 'تۆ باســی ئەو هەموو خواردنە گرانبایییانەم بۆ دەکەی کە نەکەس دەتوانێت بیانکڕێ و نە بە کەس لێدەندرێن.' جووزەر گوتی: 'بە گیانی تۆ، ئەوەی گوتم، هەر ئا ئێســـتا ئامادەی دەکەم.' دایکی گوتی: 'خۆ من هیچ بە تۆ نابینم.' جووزەر گوتی: 'دا ئەو هەگبە خاڵییەم بۆ بێنە.' دایکی هەگبەی هەڵگرت، سەیری کرد بەتاڵە و هیچی تێدا نییە، هێنای بۆ جووزەر. جووزەر دەســتی بە هەگبەکەدا کرد و یەک بە دوای یەکدا دەفری زێڕینی دەرهێنا تا تەواوی ئەو خواردەمەنیانەی دەر هێنا کە گفتی بە دایکی دا. دایکی گوتی: 'ڕۆڵە، خۆ ئەم هەگبە بچووکە هیچی تێدا نەبوو! ئەوە چۆن ئەم هەموو شــتانەت لێ دەر هێنا؟' جووزەر گوتی: 'دایکە گیان، ئەم هەگبەیە کابرای مەغریبی پێی دام و چاچۆلی بەســـەردا خوێندراوە. خزمەتکارێکی تێدایە ئەگەر هەر چییەکت بوێ، ناوەکەی پێ دەڵێی و دەڵێی، 'ئەی خزمەتکاری هەگبەکە، فلان خواردنم بۆ بێنە.' دەمودەســـت بۆت دێنێ.' دایکی گوتی: 'منیش دەســـتی تێخەم و داوای خواردنی لێ بکەم؟' جووزەر گوتی: 'تۆش دەستی تێخە و داوا بکە.' دایکی دەسـتی پێدا کرد و گوتی: 'ئەی خزمەتکاری هەگبە، بیکە بە خـاتری ئەو نـاوانەی لە هەگبەکەدان فلان خواردنم بۆ بێنە.' لە جێوە دەفرێک لە هەگبەکەدا پەیدا بوو، ئەو خواردنەی تێدا بوو. تەماشـای کرد ڕاسـت ئەو شـتەیە کە داوای کردبوو. ئیدی هەر داوای خواردنی دەکرد و ئامادە دەبوو. ئەوجار جووزەر گوتی: 'دایە گیان، کە نانەکەمان خوارد، ئەم خواردنانە بکە دەفرێکی دیکەوە و دەفرەکانی خۆیان بخەوە هەگبەکەوە. مەرجە ئەم دەفرانە لەوێدا بن. جا ئاگات لە هەگبەکە بێ و ڕازەکەی لە هەمووان بپۆشە. هەر کاتێکیش پێویستت بە هەرچی بوو، لە هەگبەکەی دەربێنە. بخۆ و لێی ببەخشە و لەم هەگبەیە خواردن بۆ براکانیشم دەربێنە، من لێرە بم یان لێرە نەبم.'

" 'جووزەر و دایکی دانیشـــتبوون نانیان دەخوارد کە براکانی وەژوور کەوتن. هەواڵی هاتنەوەی جووزەریان لە دراوســـێکان بیســـتبوو. جووزەر لە بەریان هەســـتا و ڕێزی لێ گرتن و گوتی: 'فەرموو دانیشـن و نانەکەتان بخۆن.' ئەوانیش دانیشـتن و خواردیان. لە تاو برســـێتی لاواز و بێهێز بووبوون. مـاوەیەک هەر خەریکی خواردن بوون تـا تێر بوون. ئەوجار جووزەر پێی گوتن: 'ئێوارەش هەر چێشـــتی خۆشـــمان دەبێ.' براکانی خواردنە زیادییەکەیان بردە دەرێ و تووشـــی هەر هەژارێک دەبوون، بەشـــیان دەدا تا دەفرەکان هیچیان تێدا نەما و تەواو بوو. ئەوجار دەفرەکانیان هێناوە و جووزەر دەفرەکانی دا بە دایکی گوتی: 'دایکە، دەفرەکان بخەوە هەگبەکەوە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەوشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی شەشسەد و شازدەیەم

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! 'جووزەر بە دایکی گوت: 'دەفرەکان بخەوە هەگبەکە.' دەمەو ئێوار جووزەر گەڕاوە ماڵ و چل جۆر خواردنی لە هەگبەکە دەرهێنا و خۆی چووە دەر. چوو لای دایکی و براکانی دانیشـــت و بە دایکی گوت: 'چێشـــتمان بۆ بێنە.' کە دایکی چوو بۆ شـــوێنی هەگبەکە، تەماشـــای کرد دەفرەکان پڕن لە چێشـــت. ســـفرەی ڕاخســـت و هەر چل دەفرەکەی یەک‌یەک هێنایە ســـەر ســـفرەکە. کە نانیان خوارد، جووزەر گوتی: 'چێشـــتە زیادییەکە بەرن بیدەن بە هەژار و نەداران.' ئەوانیش چێشـــتەکەیان برد و دابەشـــیان کرد. دوایی جووزەر شـــیرینی بۆ لە هەگبەکە دەر هێنان. کە خواردیان، جووزەر گوتی: 'ئەوەی ماوەتەوە بیبەن بیدەن بە دراوســـێکان.' ڕۆژی دواتریش بەو جۆرە بوو. هەتا دە ڕۆژ هەموو ژەمێک ئاوایان کرد. ئەوجار سالم بە سەلیمی گوت: ' ئەرێ کاکە، ئەوە چۆناوچۆنە ئەو برایەمان هەموو ژەمێ ئەو گشـتە شـیرینی و خواردنە ئامادە دەکا و پاشـان بە سـەر خەلکی هەژار و نەداریـدا بلاوی دەکـاتەوە، ئەوە کـارە کـاری پاشـــایـانە؟! نـازانم ئەم خۆشـــبەختییەی ئەو لە کوێوەیە کە نە شـــتێک دەکڕێ و نە ئـاگرێـک هەڵـدەکـا و نە چێشتلێنەریشی هەیە!' سەلیم گوتی: 'برا، بە خودا منیش حەپەسـاوم و بەڕاستی ئەم کارە منیشی گێژ کردووە، دەبێ لە دایکم پرسین. دایکم نەبێ کەس بەو ڕازە نازانێ.'

" 'کە جووزەر چووە دەرێ، سەلیم و سالم بە فێڵێک چوونە لای دایکیان و پێیان گوت: 'برســـیمانە.' دایکیان دایـنیشـــاندن و خۆی چوو بۆ شـــوێنی هەگبەکە و داوای خواردنی لە خزمەتکاری هەگبەکە کرد. خواردنی گەرمی بۆ هێنان. گوتیان: 'دایە، خۆ ئەو چێشتە گەرمە و تۆش ئاور و شـــتت نەکردووەتەوە ئەو چۆناوچۆنە؟!' دایکیان گوتی: 'ئەوە چێشـــتی هەگبەی جادووییەکەیە.' ئیدی ئەوجار هەموو شـــتێکی بۆ گێڕانەوە و پێی گوتن شـــتەکە چۆناوچۆنە. پێشی گوتن: 'ئامان لە لای کەس باسی ئەو نهێنییە نەکەن.' ئەوانیش گوتیان: 'نانا، چۆن باسی دەکەین. بەڵام، ئێمەش فێر بکە بزانین چۆنی داوا لێ بکەین.' دایکیان فێری کردن چۆنی کەڵک لێ وەر گرن. ئەوانیش دەســـتیـان برد و هەر چییەکیـان ویســـت، دەمودەست ئامادە دەبوو.

کە شێوازی کاری هەگبەکەیان زانی، سالم بە سەلیمی گوت: 'کاکە، ئەرێ تا کەی وەک نۆکەر لای جووزەر بە لارەملی خێری دەستی ئەو بخۆین؟ بۆ کارێک نەکەین ئەو هەگبەی لە دەســـت دەر نەهێنین؟' ســـەلیم گوتی: 'برا، جا چۆن ئەو کارە بکەین؟' ســـالم گوتی: 'جووزەر بە ســـەرۆکی دەریا دەفرۆشـــین.' ئیدی ســـالم و ســـەلیم چوونە لای ســـەرۆک و گوتیان: 'سەرۆک، پێویستییەکمان پێتە دەشبێتە مایەی دڵخۆشیت.' گوتی: ' چییە؟' گوتیان:

'ئێمە براین، برایەکی دیکەشـــمان هەیە کە زۆر شـــەڕانی و خراپە. کە باوکمان مرد، ماڵ و سـامانێکی زۆری بۆ جێ هێشـتین و دابەشـمان کرد. ئەو بەشـی خۆی وەرگرت و کەس نازانێ چی لێ کرد. کە دەستی تەنگ بوو، ڕووی لێ ناین و لای دادوەر شکایەتی لێ کردین و داوای بەشـــە ماڵی کرد و حاشـــای لەو بەشـــە کرد کە وەری گرتبوو. ئێمەش دژی وەستاینەوە و سکالامان کرد. بەڵام لەبەر چەچۆلیانی ئێمە زیانمان کرد. ماوەیەک دەستی لێ هەڵگرتین. کەچی دیسان شکایەتی لێ کردینەوە تا وا بوو هیچی بە دەستەوە نەهێشتین. ئێســـتاش وازمان لێ ناهێنێ و ژیانی لێ تاڵ کردووین. جا دەمانەوێ ئەومان لێ بکرێ.' سـەرۆک گوتی: 'دەتوانن بە جۆرێک و بیهێننە لای من، تا من گورج لە کەشـتی هاوێم و بەرێی کەم؟' گوتیان: 'ئێمە ناتوانین ئەو بێنین، بەڵام تۆ وەرە ببە میوانمان و دوو کەسـی دیکەش لەگەڵ خۆت بێنە. کاتێک ئەو خەوت، بە هەر پێنجمان دەیگرین و دەمی دەبەسـتین و لە تاریکی شـەودا بیبە دەر و بۆ هەر کوێیەکت دەوێ، بیبە. سـەرۆکی دەریا پێی فێڵی چاک بوو. وا بوو گویتان: تۆ لای ئێوارە وەرە فلان کۆلان. یەکمان لە سـەرسـووچی کۆلانەکە ڕادەوەستین و چاوەڕێت دەبین.' سەرۆک گوتی: 'زۆر باشە ئێوە بڕۆن.'

" 'ئەوان چوونەوە، ماوەیەک لای جووزەر دانیشتن. سالم چووە پێشـەوە و دەسـتی جووزەری مـاچ کرد. جووزەر گوتی: 'برا، ئەوە چی بووە؟' سـالم گوتی: 'برا گیـان، هاوڕێیەکمان هەیە تا ئێسـتا چەندین جار لە ماڵی خۆیدا میوانداری کردووین و هەزار چاکەی هەزار چاکەی لەگەڵ کردووین، ئەمڕۆ دیتم و بانگهێشـتی کردم، گوتم: 'من ناتوانم لە براکەم جیا ببمەوە.' گوتی: 'دەی براکەشـت لەگەڵ خۆت بێنە.' گوتم: 'ئەو ناچێتە ماڵی کەس. جا ئەگەر تۆ لەگەڵ براکانتدا میوانی ئێمە بن، منەتبارمان دەکەن.' من پێم وا نەبوو بـانگێشـتنەکەی من قەبووڵ بکا، کەچی قەبووڵی کرد و گوتی: 'دەی بیینە کوێ؟' منیش نێونیشانی ئێرەم دایە و گوتم کە لە سەرسووچی کۆلانەکەدا چاوەڕێتان دەبم. ئێستا لەوە دەترسـم کە ئەوان بێن و بارگرانی بن لەسـەر تۆ. ئایا لەبەر خاتری ئێمە ئەمشـەو میوانداریان دەکەی یا؟ جا ئەگەر پێتخۆش نییە، ئەوە دەیانبەینە ماڵی یەکێک لە دراوسێکان.' جووزەر گوتی: 'بۆچی ماڵی دراوسـێکان؟ مەگەر ماڵی خۆمان تەنگە و هیچی تێدا نییە؟ عەیبە بۆ تۆ پرس بە من دەکەی! ئەگەر خودا بیەوێ، ئەوەندە چێشـت و شـیرینیتان بۆ دادەنێم، ئەگەر کۆمەڵێک میوانیش بهێنیت، هێشـتا نیوەی چێشـت و شـیرینییەکان بمێننەوە. ئەگەر منیش لێرە نەبووم، هەموو شـتێک لە دایکم داوا بکەن. دەی ئێسـتا بڕۆ میوانەکانت بێنە.' سالم دەستی جووزەری ماچ کرد و چوو لە سەرسووچی کۆلانەکەدا ڕاوەستا. نیزیک شێوخوران میوانەکان پەیدا بوون. سالم بردنییە ماڵەوە. کە جووزەر چاوی پێیان کەوت، لە بەریان هەستا و سڵاوی لێ کردن و داینیشاندن، بەڵام ئەو نەیدەزانی چیان لە بن سەردایە. ئەوجار داوای شـێوی لە دایکی کرد. دایکی چێشـتی لە هەگبەکە دەر دێنا و جووزەر لێکدا

ـيكدا دەيگوت: 'فلأن چێشــــت بێنە و فلأن كەباب بێنە' تا چل جۆر خواردن داندرا. كە نان خورا ، سفرەيان كۆ كردەوە و دەرياوانەكان وايان دەزانى ئەم ميوانداريية هى سالمە.

" 'نيزيك خەوتنان، شـيرينييان بۆ هێنان و سـالم خزمەتى دەكردن و جووزەر و سـەليم ـانيشـتبوون. وا بوو كاتى خەو هات و خەوتن. ئەوجار ئەوان هەسـتان و بە هەر پێنجيان ـدم و دەستى جووزەريان بەست و برديانە دەرێ.' "

لێرەدا بوو، مـاوەى چيرۆكى ئەوشـــەويش كۆتـايى پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەى چيرۆكەكەى هەلگرت بۆ شەوێكى ديكە.

# که شەوی شەشسەد و هەڤدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! 'سەرۆک ئەوی بردە نێو کەشتییەکە و کاری پێ سپارد. کاری جووزەر بێرە گەیشت.

که ڕۆژ بووەوە، براکانی هاتنەوە لای دایکی و گوتیان: 'دایە، ئێمە لە خەودا بووین کە جووزەر لەگەڵ میوانەکاندا ڕۆیشتبوو. دایە، ئەو برایەمان خووی بە غەریبییەوە گرتووە و هەر لەبیر دیتنەوەی گەنج دایە. ئێمە ئاگامان لێ بوو کە لەگەڵ مەغریبییەکان باسی ئەوەیان دەکرد کە گەنجێکیان دیوەتەوە قەرارە بچن دەری بێنن، دەشیان گوت دەبێ تۆش لەگەڵمان بێی دەنا بە ئێمە جێبەجێ نابێ.' دایکی لێی پرسیین: 'مەگەر ئەمشەو جووزەر لەگەڵ مەغریبییاندا بوو؟' گوتیان: 'ئەی مەگەر نەتزانی دوێشەو میوانی مەغریبیمان بوو؟ بە دڵنیاییەوە، جووزەر لەگەڵ ئەوان چووە. دەی خودا ڕێی ڕاستی پیشان بدا، خۆ ئەو شوکور بەختی هەیە. دیسان زۆر شتمان بۆ دێنێتەوە.'

" 'ئیدی دایکیان لە تاوی جووزەر دەستی کرد بە گریان. کوڕەکان گوتیان: 'گلاو، ئەوە بۆ بۆ جووزەر ئاوا دەکەی و ئەوەندەت خۆش دەوێ. کەچی بۆ ئێمە ئەگەر دیاریش نەبین، هەر بە دڵیشتدا نایە و خەمت نابین و بە دیتنەوەشمان دڵخۆش نابی. ئەی مەگەر ئێمەش کوڕی تۆ نیین؟' دایکیان گوتی: 'با ئێوەش کوڕی منن، بەڵام ئێوە لاسار و خراپەکارن و چاکەتان بۆ من نییە. لەو ڕۆژەوەی باوکتان مردووە، خێرم لێتان نەدیوە. بەڵام چاکەی زۆرم لە جووزەر دیوە و زۆری چاو بە سەرمەوە بووە. ئێستا هەقی خۆیەتی بۆی بگریم، چونکە زۆری چاکە بۆ منیش و بۆ ئێوەش بووە.' کە کوڕەکان ئەم قسانەیان لێ بیست، جنێویان بە دایکیان دا و لێیان دا و چوونە ژوورێ هەگبەکانیان هێنا و بە دایکیان گوت: 'ئەمانە هی باوکمانن.' زێڕ و گەوهەرەکانیان لە نێوان خۆیاندا بەش کرد و لەسەر هەگبە جادووییەکە لێیان بوو کێشە. سالم گوتی: 'ئەمەیان دەبێ بۆ من بێ.' سەلیم گوتی: 'نەخێر، دەبێ بۆ من بێ.' لێیان بوو هەرا و بگرەوبەردە. دایکیان گوتی: 'حەک ڕۆڵە، بەزیاد نەبن! زێڕ و گەوهەرەکانتان دابەش کرد، ئێستا دەتانەوێ ئەمەش بەش کەن؟ ئەم هەگبەیە دابەش ناکرێ و هیچ پارە و سامانێک بەرانبەری نییە. ئەگەر شتێکی لێ بکەن، ئەوە جادووەکەی بەتاڵ دەبێتەوە و تایبەتمەندییەکەی نامێنێ. ئەمە لای من دانێن، هەر کاتێک هاتنەوە نان و چێشتی خۆتان بخۆن، منیش پارووێکتان لەگەڵ دەخۆم. ئەگەر پۆشتەوپەرداخم بکەن، ئەوە لە پیاوەتی خۆتانە. ئێوە کوڕی منن و منیش دایکتانم. لەپێناو ئێوەدا زۆرم ڕەنج کێشاوە. لێم گەڕێن با بە دەردی خۆمەوە بناڵێم، هەربینا براکەتان گەڕاوە و شەرمەزاری بوون.' قسەی دایکیان بە گوێیاندا نەچوو و ئەو شەوەیان بە ناکۆکی بردە سەر. پیاوێک لە

نیزیکانی دەرباری پادشـــا، لە مالّی یەکێک لە جیرانەکانیان میوان بوو، گوێی لە ناکۆکییەکەیان بوو زانی چ باسە. کە ڕۆژ بووەوە، ئەو کابرایە چووە لای پادشا کە ناوی شەمسوددەولە بوو و لەو سەردەمەدا پادشای میسر بوو. ئەوی لە بابەتەکە ئاگادار کردەوە. پادشا لەڕێوە ناردی براکانی جووزەریان هێنا و ئەشکەنجەی دان تا دانیان بە هەگبەکەدا نا. هەگبەی لێ ستاندن و کردنیە زیندانە و بە ئەندازەی پێویست مووچەی بۆ دایکی جووزەر بڕییەوە. ئەوان ئاوایان لێ بەسەر هات.

" 'جووزەر سالێک لە خزمەتی سەرۆکدا بوو. پاش سالەکە، ڕۆژێک لە کەشتیدا بوون کە بایەکی توند هەلّیکرد و کەشتییەکەی بە تەنگەی کێوێکدا دا و کەشتی تێک شکا و هەموو خەلّکەکەی ناو کەشتییەکە خنکان جگە لە جووزەر کە گەیشتە کەناراوەکە. لەوێوە ڕێی گرتە بەر هەتا تووشی کاروانێکی عەرەب بوو. بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕانەوە. پیاوێکی بازرگانی خەلّکی جەددە لەگەلّ کاروانەکە بوو، بەزەیی بە جووزەردا هات و پێی گوت: 'کوڕی چاک، لەگەلّ من وەرەوە، ئەگەر کارێک شتێکم بوو، بۆم جێبەجێ بکە و خورد و خۆراک و پۆشاکیشت لە سەر من بێ تا دەتبەمەوە جەددە.' جووزەر زۆری پێ خۆش بوو. ئیدی تا گەیشتنەوە جەددە لە خزمەتیدا بوو. بازرگان زۆری ئاگا لە جووزەر بوو، ڕێزی بۆ دادەنا. کە وەرزی حەج هات، بازرگان هەلّوێستی گرت بچێ بۆ کەعبەی و جووزەریشی لەگەلّ خۆی برد بۆ مەککە. جووزەر بۆ تەواف چووە حەرەمەوە. لە ناکاو چاوی بە عەبدوسسەمەدی هاوڕێ مەغرىبییەکەی کەوت، خەریک بوو تەوافی دەکرد.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەلّگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ! جووزەر چاوی بە عەبدوسسەمەد، هاوڕێ مەغریبییەکەی کەوت. خەریک بوو تەوافی دەکرد. مەغریبی کە ئەوی دی، سڵاوی لێ کرد و هەواڵی پرسی. جووزەر گریا و بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕاوە . مەغریبی بردییەوە ماڵێ و ڕێزی گرت و دەستێک جلی بێوێنەی دایە و پێی گوت: 'نارەحەت مەبە، چونکە پیسی و چەڵێت لێ دوور کەوتەوە.' ئینجا تەختەڕەڵمی هێنا و فاڵێکی بۆ گرتەوە. ئەوەی بەسەر براکانی جووزەردا هاتبوو، بۆی گێڕاوە و گوتی: 'ئێستا ئەوان لە زیندانی پاشای میسردان، تو حەجی خۆت بکە و دڵنیا بە جگە لە خێر هیچی دیکەت نایەتە ڕێ.' جووزەر گوتی: 'قوربان. من دەبێ بچمە لای بازرگانە جەددەییەکە و ماڵاوایی لێ بکەم، جا بێمەوە لای تو.' مەغریبی گوتی: 'بڕۆ ماڵاوایی لێ بکە و وەرەوە.'

" ئەوجار جووزەر چووە لای بازرگان و گوتی: 'هاوڕێیەکم لە کاتی تەوافدا دیت.' بازرگان گوتی: 'بڕۆ بیهێنە و میوانداری لێ بکە.' جووزەر گوتی: 'ئەو خاوەنی سەر و سامانێکی زۆرە و گەلێک خزمەتکار لە بەردەستیدان و نیازی بە میوانداری من نییە.' بازرگان بیست دیناری دایێ و پێی گوت: 'گەردنم ئازاد کە.' جووزەر ماڵاوایی لێ کرد و لای ئەو هاتە دەرێ. لە ڕێدا تووشی کابرایەکی هەژار بوو. بیست دینارەکەی دایێ و ڕۆیشت بۆ لای عەبدوسسەمەدی مەغریبی. چەند ڕۆژ لای ئەو بوو تا حەجیان بەجێ هێنا. ئەوجار مەغریبی ئەو ئەنگوستیلەیەی دا بە جووزەر کە لە گەنجینەی شەمردڵدا دەریهێنابوو و پێی گوت: 'ئەمە بگرە، ئاواتی دڵت وەدی دێنێ. خزمەتکارێکی تێدایە کە شریخەی هەورەگرمەی پێ دەڵێن. هەر کاتێک دەست بە نەخشی نقێمەکەیدا بهێنی، خزمەتکارەکەی ئامادە دەبێ و هەر چییەکی پێ بڵێی بۆت جێبەجێ دەکا.' ئیدی مەغریبی لە بەرچاوی ئەو. دەستی بە نقێمەکەدا هێنا و دەسبەجێ خزمەتکار ئامادە بوو و گوتی: 'سڵاو، گەورەم! چیت دەوێ هەر ئێستا بۆت ئامادە کەم؟ ئایا دەتەوێ شارێکی وێرانەت بۆ ئاوەدان بکەمەوە یان شارێکی ئاوەدانت بۆ وێران کەم یان دەتەوێ پاشایەک بکوژم و سوپاکەی تێک بشکێنم؟' مەغریبی گوتی: 'هۆ شریخەی هەورەگرمە، ئەم لاوە بوو بە گەورەی تۆ. هەر چییەکی گوت بە گوێی بکە.' ئەوجار خزمەتکار گەڕاوە جێی خۆی. جووزەر گوتی: 'قوربان، بیری وڵاتی خۆم دەکەم.' مەغریبی گوتی: 'خزمەتکار بانگ کە. سواری پشتی ببە، ئەگەر بڵێی هەر ئەمڕۆ بمگەیەنەوە وڵاتی خۆم، سەرپێچیت ناکا.' جووزەر ماڵاوایی لە مەغریبی کرد و دەستی بە نقێمەکەدا هێنا. لە جێوە شریخەی هەورەگرمە ئامادە بوو و گوتی: 'سڵاو گەورەم! لە خزمەتت دام.' جووزەر گوتی: 'هەر ئەمڕۆ بمگەیەنەوە میسر.' خزمەتکار ئەوی خستە سەر پشتی و فڕی. لە بەیانی زووەوە وەڕێ کەوتن و بۆ شەو لە حەوشەی ماڵی

خویاندا نیشـــتەوە. ئەوجار جووزەر چوو بۆ لای دایکی. کە دایکی ئەوی بینی، هەســـتا و دەســـتی بە گریان کرد. ئەوەی پاشـــا بە براکانی کردبوو، بۆ جووزەری گێڕاوە کە چۆن ئەشکەنجەیان داون و هەگبەی جادوویییەکە و هەگبەی زێڕ و گەوهەرەکانی لێ ستاندوون. جووزەر ئەم باسەی بە دڵ نەگرت و بە دایکی گوت: 'خەمی ڕابردوو مەخۆ. ئێستا پیشانت دەدەم چی دەکەم و چۆن براکانم دەهێنمەوە.' ئەوە بوو دەستی بە ئەنگوستیلەکەدا هێنا و خزمەتکار ئامادە بوو و گوتی: 'ســـڵاو، گەورەم! چیت دەوێ؟' جووزەر گوتی: 'دەمەوێ براکانم لە زیندانی پاشا بێنییە دەرێ.' لە جێوە خزمەتکار بە زەویدا ڕۆچوو. سالم و سەلیم کە لە ڕەنج و مەینەتییەکی زۆردا بوون و مردنیان بە ئاوات دەخواســـت. لەو جەنگەیەدا بە یەکدییان دەگوت: 'ڕەنج و چەرمەســـەری ئێمە تازە کۆتایی نایە، بڵێی تاکەی لەم زیندانەدا بین؟ وەڵایی خۆ مردن بۆ ئێمە زۆر خۆشـــترە.' ئەمان لەم گفتوگۆیەدا بوون کە زەویی زیندان شـەقی برد، شـریخەی هەورەگرمە دەرکەوت و هەردووکیانی هەڵگرت و بە زەویدا ڕۆچوو. ئەوان لە حەیبەتاندا بوورانەوە. کە وە هۆش هاتنەوە، ســەیریان کرد ئەوە لە ماڵی دایکیان و لەلای جووزەری برایاندان. جووزەر ســڵاوی لێ کردن. ئەوان ســەریان شــۆڕ کردەوە و دەستیان کرد بە گریان. جووزەر پێی گوتن: 'مەگرین. ئەوە شەیتان و تەماح بوو کە وایان لێ کردن من بفرۆشـن، بەڵام من چاو لە یوسـف پێغەمبەر دەکەم کە براکانی ئەو زۆر لەوە زیاتریان بەو کرد کە ئێوە بە منتان کرد و ئەویان خستە بیرەوە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و نۆزدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! جووزەر گوتی: 'تازە قەیناکا، ئێستا تۆبە بکەن و داوای لێخۆشبوون لە خودا بکەن. خودا خۆی بەخشـــەر و دلاوایە و، منیش بەش بە حاڵی خۆم لێتان خۆش دەبم و خەمی هیچتان نەبێ.' ئیدی جووزەر دڵخۆشـــی دانەوە تا خەیاڵیان ئاســـوودە بوو. دوایی باسی ئەو سەختی و چەرمەسەرییانەی بۆ کردن کە لەگەڵ سەرۆکدا چەشتبوونی. ئەوەشـــی بۆ گێڕانەوە کە چۆن تووشـــی شـێخ عەبدوســـەمەدی مەغریبی بووە. باســـی ئەنگوستیلەکەشی بۆ کردن. براکانی گوتیان: 'برا گیان، بەس ئەم جارە لێمان بە دڵ مەگرە. ئەگەر جارێکی تر کاری وامان کردەوە، چۆنت پێ خۆشـــە ســـزامان بدە.' جووزەر گوتی: 'تازە بیر لەوە مەکەنەوە. ئێوە باسی ئەوەم بۆ بکەن، پادشا چی لێ کردن؟' گوتیان: 'زۆری ئەشکەنجە داین و هەگبەکانیشی لێ ستاندین.' ئەوجار جووزەر دەستی بە ئەنگوستیلەکەدا هێنا و خزمەتکار ئامادە بوو. براکانی کە خزمەتکارەکەیان بینی، زیرەیان کرد. وایان زانی بۆ کوشـــتنی ئەوانی بانگ کردووە. ڕایان کردە لای دایکیان و گوتیان: 'دایکە، بۆ خاتری خودا تکامان بۆ بکە.' دایکیان گوتی: 'مەترسن، براکەتان لە من میهرەبانترە.'

" 'ئینجا جووزەر بە خزمەتکاری گوت: 'ئەوەی لە گەنجینەی پاشادایە بۆم بێنە و هیچی تێدا نەهێڵی. هەگبەی جادوویین و هەگبەی زێڕ و گەوهەرەکانیشـــم بۆ بێنە.' خزمەتکار هێندەی بڵێی یەک و دوو، ڕۆیشـــت هەگبەکان و ئەوەی لە گەنجینەی پاشـــادا بوو هێنانی و گوتی: 'گەورەم، هیچم لە گەنجینەکەدا بەجێ نەهێشـــــت.' جووزەر هەگبەی زێڕ و گەوهەرەکانی دا بە دایکی و هەگبەی جادوویی لەبەردەم خۆیدا دانا و بە خزمەتکاری گوت: 'دەمەوێ هەر ئەمشەو کۆشکێکم بۆ بنیاد بنێی و بە زێڕکەفت و نەخش و نیگار دەرگەکانی برازێنیتەوە و فەرشـــــی ئاوریشـــــمی تێدا ڕابخەی. تا ڕۆژ نەبووەتەوە، دەبێ ئەم کارانە جێبەجێ بکەی.' خزمەتکار فەرمانی وەرگرت و بە زەویدا ڕۆچوو. دوایی جووزەر خواردنی لە هەگبەکە دەرهێنا و خواردیان و خەوتن. لەولاشـــەوە خزمەتکار دەســـتوپێوەندی خۆی کۆ کردەوە و سەرقاڵی بنیادنانی کۆشک بوون.

" 'هەندێکیان بەردیان دێنا، بەشـــێکیان وەســـتاییان دەکرد، کۆمەڵێکیان خەریکی سـپیکردنەوە بوون و دەسـتەیەکیشـیان فەرشـیان ڕادەخسـت. هێشـتا خۆر نەکەوتبوو کە کۆشک تەواو بوو و خزمەتکار گەڕاوە کن جووزەر و گوتی: 'گەورەم، کۆشک تەواو بوو. ئەگەر دەتەوێ بیبینی، فەرموو ئامادەیە.' ئەوجار جووزەر لەگەڵ دایک و براکانیدا وەڕێ کەوتن. چاویان بە کۆشـکێکی جوان و قایم و ســـەرنجڕاکێش کەوت، بە جۆرێک مرۆڤ لە بینینی تێر نەدەبوو. جووزەر دڵی خۆش بوو و بە دایکی گوت: 'ئەم کۆشـــکەم بۆ تۆ

ـڕووست کرد.' دایکی دۆعای بە خێری بۆ کرد و لە کۆشکەکەدا نیشتەجێ بوو.

" 'پاشـان جووزەر دەسـتی بە ئەنگوسـتیلەکەدا هێنا، خزمەتکار ئامادە بوو و پێی گوت: هەزار کەنیزی سپی و سۆڵ و شنگ و شۆخ و چل کەنیزی قولەڕەش و چل کۆیلە و چل ـەنجبەرم بۆ ئامادە کە.' دەمودەست خزمەتکار لەگەڵ چل کەس لە دەستوپێوەندەکانی بە ـوڵاتانی هێند و ئێراندا گەڕان و لە هەر جێیەک چاویـان بە کچ و کوڕی جوان کەوتبا، ـدیانڕفاند و دەیانهێنا، تا ئەو جێیەی جووزەر گوتی، بەســـــــە تەواو بوو. هێنانیانەوە کۆشـــک و پێشـــانی جووزەریان دا. جووزەر پەســـــندی کردن و گوتی: 'بۆ هەرکامیان جلوبەرگی جوان و ڕازاوە بێنن و بۆ من و دایکیشـــم جلوبەرگی شـــکۆمەنـدانە بێنن.' خزمەتکار هەموو ئەو شـــتانەی هێنان کە جووزەر گوتبوونی. جلوبەرگی جوانیان لە بەر کەنیزەکان کرد. جووزەر خۆشی دەستێک جلی شیاوی کردە بەری و جلی شکۆمەندانەشی ـا بە براکانی. ئەوجار جووزەر دانیشـــت و کەنیز و کۆیلان لە ڕاســـت و چەپیەوە بوون. جووزەر لە پاشا و براکانیشی لە وەزیر دەچوون. کاری ئەوان بێرە گەیشت.

" 'بەڵام خەزنەداری گەنجینەی میسر کە چووە گەنجینەوە، هیچی تێدا نەبینی.

لە تـــاوان کەوت و هـــۆشــــــی تــیـــا نەمـــا
تـــرس وەک مـــارێـــک لە قەدی هـــاڵا

لە جێوە قیژاندی و بووراوە و بە زەوییدا دا. کە وە هۆش هاتەوە، خێرا چووە لای پاشا ـو گوتی: 'پاشام سڵامەت بێ گسکیان لە گەنجینەکە داوە.' پاشا گوتی: 'چۆن شتی وا دەبێ؟ کێ دەتوانێ ماڵ و سامانی گەنجینەی من بەرێ؟!' خەزنەدار گوتی: 'بە خودا دوێنێ هەموو شتێک لە جێی خۆی بوو، دەست لە هیچ نەدرابوو، هەر چی بووە ئەمشـەو کراوە. سـەیر ـەوە دایە، دەرگەکـان هەر داخراوبوون و هیچ کون و کەلەبەرێکیشـــم نەدی و دزیش نەچووەتە ئەوێ. نازانم ئەمە چییە و چۆنچۆنییە؟!' پاشا پرسی: ' هەگبەکانیشیان بردووە؟' خەزنەدار گوتی: 'بەڵێ، قوربان.' پاشا چاوی پەڕییە تەوقی سەری.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی شەشسەد و بیستەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆی! پاشا بە پەشۆکاوییەوە هەستا و لەگەڵ خەزنەداردا چوون بۆ خەزێنە و سەیری کرد هیچی تێدا نەماوە. زۆر دڵ تەنگ بوو و گوتی: 'ئەوە کێیە ترسی لە زیپک و زاکوونی من نەبووە و خەزێنەی منی تالان کردووە؟' غەزری و هاتە دەرێ و چوو لە دیوان دانیشت. ئەوجار فەرماندەکانی سوپا بە ترسەوە هاتنە هەنتەشی. پاشا گوتی 'فەرماندەکان، ئەمشەو خەزێنەکەمیان تالان کردووە. جا نازانم کێیە وێراوییە شان لە شانی مندا و گسک لە خەزێنەم دا؟' گوتیان: 'چۆن شتی وا دەبێ؟!' پاشا گوتی: 'لە خەزنەدار بپرسن.' لە خەزنەداریان پرسی. ئەویش گوتی: 'بەڵێ بە داخەوە راستە و هیچیان تێدا نەهێشتووە. بێ ئەوەی کڵۆمێک بشکێنن یان کون و کەلێنێکی تێ خەن.' هەموو حەپەسان و واقیان وڕ ما. دەمیان بۆ بە تەڵەی تەقیو. تەنیا ئەو کابرایەی کە شۆفاری بەسەر سالم و سەلیمەوە کردبوو و گوتی: 'پاشام، ئەو شەو هەتا بەیانی تاقێک هەر خەریکی ڕۆنانی کۆشکێک بوون تا تەواویان کرد. کە ڕۆژ بووەوە، بالاخانەیەکم دیت بێ هاوتا. پرسیم ئەو کۆشکە ئی کێیە. گوتیان کە جووزەر هاتووەتەوە و ئەم کۆشکەی ساز کردووە. گەلێک کەنیز و کۆیلەی هەیە و لەم گەشتەیدا ماڵ و سامانێکی زۆری هێناوەتەوە و براکانی لە زیندان ڕزگار کردووە و ئێستا لە ماڵەکەیدا پاشایانە دەژی.' پاشا گوتی: 'دا خێرا برۆن سەیری زیندان کەن.' چوون سەیریان کرد سالم و سەلیم لەوێ نەبوون. هاتنەوە شتەکەیان بۆ پاشا گێڕاوە. پاشا گوتی: 'تەواوە، دوژمنەکەم ئاشکرا بوو. ئەوەی سالم و سەلیمی لە زیندان بردووەتە دەر، هەر ئەویشە خەزنەکەمی بە تالان بردووە.' وەزیر پرسی: 'کێیە، قوربان؟' پاشا گوتی: 'جووزەرە کە براکان و هەگبەکانی بردووە. وەزیر ڕابە. پەنجا باڵبازی ئازا و بەجەرگ بنێرە، دەست بە سەر تەواوی ماڵ و سامانەکەیاندا بگرن و مۆر لە دار و نەداری بدەن، ئینجا جووزەر و براکانی بگرن و بیانهێننە ئێرە تا بیانکەمە پەندی زەمانە.' وەزیر گوتی: 'قوربان، تووڕە مەبە. ئاخر کەسێک کە بە شەوێک کۆشکێکی بینا کردبێت، لە دنیادا کەس دەرەقەتی نایە. دەترسم ئەگەر فەرماندەیەک بنێری، شتێکی بە سەر بێ. جارێ دان بە خۆتدا بگرە تا من تەگبیرێک بکەم و ڕاستی شتەکەم بۆ دەرکەوێ.' پاشا گوتی: 'دەی یەلا تەگبیرێک بکە.' وەزیر گوتی: 'بانگهێشتی بکە و دۆستایەتی لەگەڵ بگرە و لێی نیزیک بەوە. ئەگەر زانیت بەدەسەلاتە، ئەوە دەبێت فێڵێک بۆ گرتنی بکەین. ئەگەر زانیت لاوازە، دەمودەست فەرمان بدە بیگرن.' پاشا گوتی: 'دەی فەرماندەیەک بنێرە و بانگهێشتی بکە.' وەزیر فەرماندەیەکی نارد. ناوی عوسمان بوو و فرە بێمێشک و خۆبەزلزان بوو. کە عوسمان گەیشتە دەرگەی کۆشکەکەی جووزەر، دەرگەوانێکی دی لە سەر کورسییەک دانیشتبوو. دەرگەوانەکە لە بەری هەڵنەستا. عوسمان بە پەنجا باڵبازەوە،

ـی چووە پێشـەوە و گوتی: 'هەتیو گەورەکەت لە کوێیە؟' دەرگەوانەکە بێ ئەوەی لە بەری هەسـتێ و ڕێزی لێ بگرێ هەر بە بێ موبالاتی وڵامی داوە و گوتی: 'ئەوە لە ژووریێە.' عوسـمان زۆر لەو هەڵسوکەوتەی تووڕە بوو و گوتی: 'گوێلک! ئەوە شـەرم ناکەی، من قسەت لەگەڵ دەکەم تۆش وەک ژنی دووگیان پان بوویەتەوە؟' دەرگەوان گوتی: 'زۆربڵێیی مەکە و بڕۆ بە لای کاری خۆتەوە.' عوسـمان کەللەیی بوو و شـیری هەڵکێشـا و ویسـتی دەرگەوانەکە بکوژێ، ئیدی نەیزانی ئەوە نڕناشـە. کە دەرگەوان تەماشـای کرد عوسـمان شیری لێ هەڵکێشا، هەستا و شیرەکەی لێ ستاند و بە دەسکەکەی چەند دانەی لێ دا. ئەم کارە لە دڵی باڵبازەکانی عوسـمان گران هات کە کۆیلەیەک لە گەورەکەیان بدا، ئیدی بە شـیرەوە بۆی هاتن. دەرگەوان کە ئاوای دیت، دەسـتی دا گۆپاڵێک و لێیان ڕاسـا. گۆپاڵی لە هەر کامێکیان دەدا، وەک گا دەیهۆڕاند و لە خوێنی خۆیدا دەتلاوە. ئیدی ئەوان هەڵدەهاتن و دەرگەوانیش کەوتبووە سـەریان تا تەواو لە کۆشـک دووری خستنەوە و پاشـان بۆخۆی گەڕاوە، لەسەر کورسییەکەی دانیشت وەک نە بای هاتبێ و نەبۆران.'

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشكۆ! 'فەرماندە عوسمان و دەستوپێوەندەكەی بە پڕژوبڵاوی و دەست و لاق شـكاوی گەڕانەوە. چوونە هەنتەشـی پاشـا و ئەوەی ڕووی دابوو بۆیان گێڕاوە. عوسمان گوتی: 'پاشای جیهان، كە گەیشتینە كۆشكەكە، دەرگەوانێک لەسەر كورسییەكی زێڕین دانیشـتبوو و زۆر لەخۆبایی بوو. كە چاوی بە ئێمە كەوت، ڕووی وەرگێڕا و بە هێندی نەگرتین و لە بەرم هەڵنەسـتا. من لەگەڵ ئەودا قسـەم دەكرد، كەچی ئەو پان بووبووەوە و بە لالووتەوە وەڵامی دەدامەوە . ئیدی منیش تووڕە بووم و شـیرم لێ هەڵكێشـا. ئەو شـیرەكەی لێ ئەسـتاندم و بە دەسـكەكەی چەند دانەی لێ دام. ئەوجار بە گۆپاڵ كەوتە نێو باڵبازەكان و ئەوەی لێی دەدا هەڵنەدەسـتاوە. وا بوو نەمتوانی بەرگری بكەم و هەڵاتم.' پاشـا بەم قسـەیە تووڕەییەكەی زیاد بوو و گوتی: 'سـەد باڵبازی ئازا و نەترس بۆی بچن.' خێرا سـەد باڵباز بەرەو كۆشـك چوون. كە دەرگەوان ئەوانی دیت. دەسـتی دا گۆپاڵ و بۆیان هەسـتا و تێیان كەوت دەردێكی دانێ هەتا شـكسـتیان خوارد و هەڵاتن. ئەویش گەڕاوە و لەسـەر كورسـییەكەی دانیشـتەوە. ئەو سـەد باڵبازە ئازایە كە هەڵاتبوون، گەڕانەوە لای پاشا، ڕووداوەكەیان بۆ گێڕاوە و باسی هەڵاتنی خۆیان بۆ پاشا كرد. پاشا گوتی: 'با دووسەد كەس بچن.' دووسەد باڵباز چوون. شكستیان هێنا و هەڵاتن و بە سـەرشـۆڕی گەڕانەوە لای پاشـا. پاشـا بە وەزیری گوت: 'دەمەوێت بە پێنجسـەد كەسـەوە بچی و ئەوم بۆ بێنی و جووزەر و براكانیشـیم بۆ بگری.' وەزیر گوتی: 'قوربان پێویستم بە سوپا نییە. من بە تەنیا دەچم.' پاشا گوتی: 'خۆت چۆنت پێ باشە، وا بكە.'

" 'ئەوجار وەزیر چەكی لە خۆی كردەوە و بەرگێكی سـپی پۆشـی و تەسـبێحێكی بە دەستەوە گرت و بە تەنیا چوو تا گەیشتە كۆشكی جووزەر. دەرگەوانەكەی دی كە لەسەر كورسـییەک دانیشـتبوو. بە ڕێزەوە چوو كنی و دانیشـت و سـڵاوی لێ كرد. دەرگەوان سڵاوەكەی ستاندەوە و گوتی: 'ئەی ئادەمیزاد، چیت دەوێ؟' كە وەزیر گوێی لێ بوو ئەوی بە ئادەمیزاد بانگ كرد، زانی ئەو دەرگەوانە جنۆكەیە و لە حەیبەتاندا هەموو لەشـی كەوتە لەرزین و گوتی: 'قوربان، گەورەكەت لە ژوورەوەیە؟' گوتی: 'بەڵێ، لە كۆشـكدایە.' وەزیر گوتی: 'گەورەم، بچۆ لای و پێی بڵێ كە پاشا شـەمسوددەولە لەبەر ئەو ئاهەنگێكی گێڕاوە. میوانداری لێ دەكا، سڵاوی بۆی هەیە و دەڵێ كە ماڵەكەمان بە هاتنی پیرۆز بكا.' دەرگەوان گوتی: 'تۆ لێرەدا بوەسـتە تا من دەچمە ژووری عەرزی دەكەم بزانم دەسـتوور بە چی دەدا.' وەزیر ڕاوەسـتا و دەرگەوانی جنۆكە چووە كۆشـكەوە و بە جووزەری گوت: 'گەورەم، با پێت بڵێم كە پاشـا فەرماندەیەک و پەنجا باڵبازی بۆ ناردی، من لێم دان و بەسـەریاندا زاڵ بووم. دوایی سـەد كەسـی نارد، دیسـان ئەوانیشـم ڕاو نا. هەمدیسـان

دووسەد کەسی ناردەوە، لێم دان و شکاندنم. وا ئێستا وەزیر خۆی هاتووە لە دوات و عەرزت دەکا بانگهێشتی پادشای و دەڵێ میوانداری لێ دەکەین. ئێستا وەڵامی تۆ چییە؟' جووزەر گوتی: 'وەزیر بێنە ژوورەوە.' دەرگەوان چوو وەزیری هێنا. وەزیر جووزەری گەورەتر لە پاشا هاتە بەرچاو و سەری لە جوانی کۆشکەکەی سوور ما و خۆی لە چاو جووزەردا زۆر بە کەم زانی. ئەوجار کورنۆشی برد و دۆعای خێری بۆ جووزەر کرد. جووزەر گوتی: 'دەی وەزیر، چ کارێکت هەیە؟' وەزیر گوتی: 'گەورەم، پاشا شەمسوددەولە خۆشی لێت دێ، سڵاوی بۆت هەبوو و گەلێک تامەزرۆی دیدارتە. ئاهەنگێکی ساز کردووە و دەیەوێ میوانداریت لێ بکا.' جووزەر گوتی: 'مادەم ئەو خۆشی لە من دێ، سڵاوی منی پێ بگەیەنە و با ئەو بێتە لای من.' وەزیر ویستی بگەڕێتەوە، جووزەر ئەنگوستیلەکەی دەرهێنا و دەستی پێدا هێنا، خزمەتکار ئامادە بوو و پێی گوت: 'جلوبەرگێک لە باشترینەکانم بۆ بێنە.' خزمەتکار جلوبەرگەکەی هێنا، جووزەر بە وەزیری گوت: 'ئەمانە لە بەر کە.' وەزیر کردنیە بەری. ئینجا جووزەر پێی گوت: 'ئێستا برۆ و ئەوەی پێم گوتیت، بە پاشای بڵێ.'

" 'وەزیر هاتە دەرەوە و ئەو جلوبەرگەی زۆر پێ جوان بوو. تا ئێستا شتی وای لە بەر نەکردبوو. کە چووەوە لای پاشا، پادشای لە بارودۆخی جووزەر ئاگادار کردەوە و جوانی کۆشکەکە و ئەوەی دیبووی، هەمووی بۆ پاشا گێڕاوە. ئینجا گوتی: 'جووزەر داوای کرد جەنابت بچییە میوانی ئەو و بانگهێشتی کردی.' پاشا لەگەڵ هەموو سوپاکەیدا سوار بوو و بەرەو کۆشکی جووزەر کەوتە رێ. لەولاشەوە جووزەر بە خزمەتکاری نێو ئەنگوستیلەکەی گوت کە لە دەستوپێوەندەکانی کۆمەڵێک لە شێوەی مرۆڤدا کۆ بکاتەوە کە لە دەوروبەری کۆشکدا وەک سوپا ریز ببەستن تا پاشا ترسی لێ بنیشێ و بزانێ کە دەسەلاتی من لە هی ئەو زیاترە. خزمەتکار گورج دووسەد کەسی لە نڕناشان لە شێوەی سوپادا ئامادە کرد کە گشتیان شیری گرانباییان لە لاقەدی بەستبوو. کە پاشا گەیشتە کۆشکی جووزەر و ئەوانەی دیت، ترس نیشتە دڵی. ئەوجار چووە لای جووزەر و تەماشای کرد، وەک پاشایان دانیشتووە. سڵاوی لێ کرد. جووزەر لە بەری هەستا و رێزی لێ نەنا و فەرمووی دانیشتنی لێ نەکرد.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی شەشسەد و بیست و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! کە پادشا چووە لای جووزەر، جووزەر ڕێی نەدا پادشا دانیشێ و هەر بۆیە پادشا ترسی ڕێنیشت. نە توانی دانیشێ و نە بچێتە دەرەوەش. بە خۆی گوت: 'ڕەنگە هێشتا ستەمی منی لە بیر مابێ. ئاخر براکانیم زۆر ئەشکەنجە داوە.' ئەوجار جووزەر پێی گوت: 'پاشا! تۆ و هاوشێوەکانت هی ئەوە نین ستەم لە خەڵک بکەن و ماڵ و سامانیان لێ بستێنن.' پادشا گوتی: 'قوربان، بمبوورە؛ هەڵپە و تەماح وایان لێ کردم. خۆ ئەگەر تاوان نەبووایە، لێخۆشبوونیش نەدەبوو.' پاشا داوای لێبووردنی کرد، لەبەر ئەو هەڵانەی کردوونی و ئەم شێعرەی خوێندەوە:

کۆیلە ئاسا ملکەچی فەرمانی تۆم
بەزەت بێ، بێ دەسەڵات لە دەرکی تۆم

" 'بەردەوام خۆی چووک کردەوە تا جووزەر پێی گوت: 'ئەوجاریش لێت خۆش بووم.' ئیدی جووزەر فەرمووی کرد دانیشێ. پادشا دانیشت. ئینجا جووزەر بۆ دڵنیایی، دیاری و خەڵاتی دایێ و بە براکانی گوت کە بڵێن سفرە ڕاخەن. دوای نانخواردن دیاریی دا بە سوپاکەشی و ڕێزی لێ گرتن و پاشان بەڕێی کردنەوە. پاشا لە کۆشکی جووزەر هاتە دەر. ئیدی دوای ئەوە هەموو ڕۆژێک دەچووە لای جووزەر و دیوانی خۆی هەمیشە چۆڵ بوو. خۆشەویستی نێوان جووزەر و پاشاد گوڵی کرد و ماوەیەکی زۆر بەم شێوەیە بوون. ڕۆژێکیان پاشا بە تەنیا لەگەڵ وەزیرەکەیدا دانیشت و گوتی: 'وەزیر، زۆر دەترسم جووزەر بمکوژێ و وڵاتەکەم لە دەست دەربێنێ.' وەزیر گوتی: 'ئەگەر لێی دەترسی، ئەوە کچەکەتی بدەیە. چونکە ئاوا دەبنە کەسی گیانیبەگیانی.' پاشا گوتی: 'دەی وەزیر تۆ وەرە نێوانمانەوە.' وەزیر گوتی: 'بانگهێشتی بکە. بە کچەکەشت بڵێ خۆی بە زێڕ و زیو برازێنێتەوە و بە جۆرێک خۆی پیشانی جووزەر بدا. جا کە جووزەر ئەو ببینێ، دڵی بۆی لێ دەدا. دوایی مینش ئاگاداری دەکەمەوە کە ئەوە کچی پاشایە. ئینجا هەموو ڕۆژێک بە جۆرێک لەو بارەیەوە قسەی لەگەڵ دەکەم کە نەزانێت تۆ ئاگات لە بابەتەکەیە تا وا دەبێت ڕۆژێ بێتە خوازبێنی کچەکەت. کە تۆ کچەکەتت دایێ، موو ناچێ بەنێوانتاندا و تۆ لەو ئەرخەیان دەبی. ئەگەر بیشمرێ، تۆ دەبیە میراتگری.' پاشا گوتی: 'بە خودا ڕاست دەکەی.' ئەوجار میوانییەکی ڕێک خست و جووزەری بانگ کرد. جووزەر هاتە دیوانی پاشا و ئەو ڕۆژە تەواو بە خۆشییەوە خەریکی گفتوگۆ بوون. پاشا ژنەکەی ڕاسپاردبوو کە کچەکەیان برازێنێتەوە و بە بەر دەرگەی دیوەکەیاندا تێیپەڕێنێ. ژنەش وای کرد کە پاشا ڕایسپاردبوو.

که کچه تێپەڕ بوو، جووزەر چاوی پێی کەوت، دەماری شل بوو و دڵی بۆی بزوا و ڕەنگی پەڕی. وەزیر گوتی: 'قوربان، ئەوە چۆنە ڕەنگت گۆڕاوە؟' جووزەر گوتی:

دێت و دەڕوا شـــــنەی، دڵـم دەبـزێـوێ
تـیری نـیگـای سـیبلی دڵم دەنگێوێ

" 'جووزەر گوتی: 'وەزیر، ئەم کیژە کێ بوو کە دڵ و هۆشی بردم؟' وەزیر گوتی: 'ئەمە کیژی شەمسوددەولەیە. ئەگەر بە دڵتە، بڵێ تا لەگەڵ پاشادا قسە بکەم و بخوازم.' جووزەر گوتی: 'وەزیر، قسـەم بۆ لێ بکە. بەڵێن بێ، هەر چییەکت بوێ، دەتدەمێ. پادشـاش بۆ مارەیی کچەکەی هەر چییەکی بوێ، دەسـت ناگێڕمەوە تا دۆسـتایەتی و خزمەیەتیمان بەهێزتر بێ.' وەزیر پێی گوت: 'خەمت نەبێ؛ بۆت دەسـتێنم.' دوایی وەزیر باسـەکەی بۆ پادشـا گێڕاوە لە نیازی جووزەر ئاگاداری کردەوە کە بۆ مارەیی کچەکەی هەر چییەکی بوێ، دەسـت بە ڕوویەوە نانێ. پادشـا گوتی: 'مارەیی کچم پێ گەیشـتووە و کچەکەم لە کەنیزەکانیەتی. ئەوا کچەکەمم لێ مارە کرد. ئەگەر ئەو پەسندی کا، گەورەییم لەگەڵ دەکا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و بیست و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! 'پاشا گوتی: ' ئەگەر ئەو پەسندی کا، گەورەییم لەگەڵ دەکا.' ئیدی ئەو شەوەیان بە خێر و خۆشی بردە سەر. کە ڕۆژ بووەوە شەمسوددەولەشا لە دیوان دانیشتبوو، شێخولئیسلام و جووزەر هاتن. جووزەر خوازبێنی کچەی لە پادشا کرد. پادشا گوتی: 'مارەیی کچم دراوەتێ.' کاغەزی گرێبەستی مارەییەکەیان نووسی. جووزەر فەرمانی دا، هەگبەی زێڕ و زیوەکان بێنن. کە هێنایان، جووزەر مارەییەکەی دا بە پاشا. ئەوجار تەپڵ لێ درا و مۆسیقا ژەنرا و بەزم و خۆشیان گێڕا. جووزەر چووە لای کچی پاشا و بە ئاواتی خۆیان گەیشتن. ئەوجار جووزەر و پاشا موو بەنێوانیاندا نەدەچوو. تا ماوەکی زۆر ئاوا بە خۆشی و شادی و پێکەوە حوکمڕانییان کرد. تا وا بوو پاشا مرد و داوایان لە جووزەر کرد، ببێتە پاشا و زۆریان لە بەر هەڵخوێند تا قەبووڵی کرد و لە سەر تەختی پاشایەتی دانیشت. فەرمانی دا کە گومەز لەسەر گڵکۆی پاشا شەمسوددەولە درووست بکەن و خێری بۆ کرد. ئیدی کۆشک و سەرای جووزەر لە ناوچەی یەمانییە بوو. دوای ئەوەی لە سەر تەختی پاشایەتی دانیشت، تەکیە و مزگەوتی درووست کرد و ئەو ناوچەیە بە ناوی ئەوەوە ناو نرا و پێیان دەگوت جووزەرییە. ساڵێک پاشایەتی کرد و سالم و سەلیمی برای وەزیرانی ڕاست و چەپی بوون. دوای ساڵەکە سالم بە سەلیمی گوت: 'ئەرێ برا تا کەی ئێمە لەم حاڵەدا بین. بە خودا تا جووزەر زیندوو بێ، ئێمە قەت بە هیچکوێ ناگەین.' سەلیم گوتی: 'ئەی باشە چ بکەین چۆنی بکووژین و ئەنگوستیلە و هەگبەکەی لێ بسێنین؟ جا خۆت لە من زاناتری.' سالم گوتی: 'ئەگەر بە جۆرێک بیکوژم، ڕازی دەبی من ببمە پادشا و تۆ ببیتە وەزیری دەستەڕاستم و ئەنگوستیلەکە بۆ من بێ و هەگبەکەش بۆ تۆ؟' سەلیم گوتی: 'من بەمە ڕازیم.'

" 'ئیدی ئەو دوو برایە لەبەر خاتری دەسەلات و ماڵی دنیا لە سەر کوشتنی جووزەر ڕێک کەوتن. ئەوە بوو بە فێڵ بە جووزەریان گوت: 'براله، جارێکی ورە ماڵمان با ئێمەش دڵمان خۆش و لە لای خەڵک شاییمان بە خۆمان بێ و بڵێین براکەمان بەسەرمان دەکاتەوە.' جووزەر گوتی: 'دەست بە رووتانەوە نانێم، بەڵام بێمە ماڵی کامتان؟' سالم گوتی: 'وەرە بۆ ماڵی من و دواییش بچۆ بۆ ماڵی سەلیم.' جووزەر گوتی: 'باشە، وا دەکەم.' ئیدی چوو بۆ ماڵی سالم. زۆریان بەخێرهاتن کرد و سفرە و خوانیان ڕازاندەوە. هەرکە جووزەر یەکەم پارووی لە چێشتە ژەهراوییەکەی خوارد، دەمودەست گۆشتی لەشی دارزا. سالم ویستی ئەنگوستیلەکە لە قامکی دەربێنێ، نەیتوانی.

" 'ئیدی بە وێرد قامکی بڕی و دەستی بە نقێمی ئەنگوستیلەکەدا هێنا. لە جێوە شریخەی

هەورەگرمە ئامادە بوو و گوتی: 'سلاوت لێ بێ گەورەم. هەرچیت دەوێ، داوای کە.' سالم گوتی: 'سەلیمی برام بکوژە. ئینجا ژەهرخواردکراوەکە و کوژراوەکە ببە لە پێش چاوی سوپا فڕێیاندە.' خزمەتکاری ئەنگوستیلەکە سەلیمی کوشت و هەردووکیانی بردە دەرێ و لە پێش گەورەکانی سوپا داینان. کە ئەوان جووزەر و سەلیمیان بە کوژراوی بینی، پەشۆکان و ترسیان لێ نیشت و گوتیان: 'ئەوە کێ پاشا و وەزیرەکەی کوشتووە؟' خزمەتکار گوتی: 'سالمی برایان.' لە ناکاو سالم هات بۆ لایان و گوتی: 'گەورەکانی سوپا، من ئەنگوستیلەکەم لە جووزەری برام ستاند و ئەمەی لەبەر چاوتاندایە نڕناشێکە و بە فەرمانی من پاشا و وەزیری کوشت تا لە پاشایەتیدا کەس ڕکابەریم نەکا. ئێستا کە پاشاکەتان کوژراوە، من پاشاتانم. ئەگەر بە پاشایەتی من ڕازی نین، با بە خزمەتکاری ئەنگوستیلەکە بڵێم ورد و درشتتان بکوژێ.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشكۆ! 'سالم كە ئەو هەرەشەیەی لێ كردن، هەموو پێكەوە گوتیان: 'بە پاشایەتی تۆ ڕازیین.' ئیدی فەرمانی پێ كردن كە براكانی بە خاك بسپێرن. كۆمەڵێكیان چوون ئەو دووانە بنێژن و كۆمەڵێكیشیان لەگەڵ سالمدا چوونەوە بۆ بارەگای پاشایەتی. سالم لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت. گەورەگەورەكانی ولات پەیمانیان لەگەڵ بەست. ئەوجار سالم گوتی: 'دەمەوێ براژنم مارە كەم.' گوتیان: 'باشە، با ئاقێرەكەی[1] تەواو ببێ ئەوجار .' سالم گوتی: 'من ئاقێر و ماقێر نازانم. دەبێ هەر ئەمشەو سەرجێی بكەم.' بە زۆر لەخۆی مارە كرد و چون بە كچی پاشا شەمسوددەولە یان، ژنی جووزەریان گوت كە پادشا لە خۆی مارە كردووی. گوتی: ' باشە پێی بڵێن شەو با بێتە لام.' كە شەو هات، سالم چووە زگ براژنی. كچی شەمسوددەولە خۆشحاڵی خۆی دەربڕی و بە ڕوویەكی كراوەوە قسەی لەگەڵ كرد. ژەهرێكی كایگەری بۆ كردبووە ئاوەوە، ئاوی دایێ و كوشتی. ئەنگوستیلەی هەڵگرت و شكاندی، هەگبەی جادووییی هەڵدڕی و كردی بە دوو پارچەوە تا كەس نەتوانێ بیبێتە خاوەنیان. دوایی كەسێكی نارده لای شەیخولئیسلام و لە ڕووداوەكەی ئاگادار كردەوە بۆ ئەوەی كەسێك بۆ پاشایەتی هەڵبژێرن. ئەوە بوو، چیرۆكی جووزەر كە من بیستوومە.'

### چیرۆكی عەجیب و غەریب

"ئینجا پاشام، بیستوومە كە سەردەمانی زوو پاشایەكی مەزن هەبوو ناوی 'گەنم' پاشا بوو. پاشایەكی بە تەمەن و چاونەترس بوو. لە سەری پیریدا خودا كوڕێكی دایە. لەبەر ئەوەی كوڕەكەی زۆر جوان و خوێنشیرین بوو، ناوی نا 'عەجیب.' ئەویان بە دایەن سپارد تا گەورە بوو، بوو بە حەوت ساڵان. باوكی زانایەكی بۆ گرت. زاناكە لە سێ ساڵدا ئایین و شەریعەتی ئەو ولاتەی فێر كرد تا وای لێ هات لە ئاییندا زۆر شارەزا بوو. لەگەڵ زانایاندا هەڵدەستا و دانیشت كرد. ئەوجار هونەری ئەسپسواری فێر كرد. ئەوە بوو وای لێ هات بوو بە سوارچاكێكی لێهاتوو. تەمەنی لە دە ساڵی تێنەپەڕیبوو كە لە هەموو كارەكاندا لە خەڵكی سەردەمی خۆی هەڤیازتر بوو. فێری هونەری جەنگ بوو و هەر جارێك بۆ ڕاو بچووایە، هەزار سواری لەگەڵ خۆی دەبرد. هۆزەكانی تاڵان دەكرد و كاروانەكانی دەڕووتاندەوە و كچی پاشایانی دەڕفاند تا وا بوو لە هەر لایەكەوە سكاڵایان لە دژی بردە

---

[1]. ئاقێر: ئەو دەورەیەی كە بۆ ژن داندراوە كە دوای جیابوونە لە پیاوێك نابێ نیزیكی لەگەڵ پیاوێكی دیكە بكا.

لای باوکی. باوکی به پێنج کەس لە کۆیلەکانی گوت بیگرن. کۆیلەکان گەلەکۆمەیان لێ کرد و گرتیان، قۆڵبەســتیان کرد و بە فەرمانی پادشــا لە زیندانیان کرد. شــەو و ڕۆژێک لە زینداندا بوو. دوایی میر و وەزیران چوونە لای پاشــا و زەوییان ماچ کرد و تکایان بۆ عەجیب کرد. پاشا ڕزگاری کرد. عەجیب دە ڕۆژ دانی بە خۆیدا گرت. دوای ئەوە شەوێکیان بۆ باوکی چووە ژوورێ و خەنجەری لێ هەڵکێشا و لە خەودا سەری باوکی لە لەشی جیا کردەوە. کە ڕۆژ بووەوە، عەجیب لەسەر تەخت دانیشت و بە پیاوەکانی خۆی گوت: زرێ لە بەر بکەن و بە شیری ئاماە بن. ئەوجار کە میر و وەزیران هاتن، دیتیان پاشا کوژراوە و کوڕەیان لەسەر تەختی پاشایەتی دیت، تاس بە سەریاندا هات و واقیان وڕ ما. عەجیب پێی گوتن: 'خەڵکینە، بینیتان پاشاکەتان چی بەسەر هات؟ هەرکەس سەرپێچیم بکات وای لێ دەکەم.' ترسیان لێ نیشت و گوتیان: 'تۆ پاشا و پاشازادەمانی.' کوڕنۆشیان بۆ برد و زەوییان ماچ کرد. دەســتیان کرد بە پێدا هەڵدانی. عەجیب دڵی بە گوێڕایەڵییان خۆش بوو، فەرمانی دا کە دەرگەی گەنجینەکان بکەنەوە و دیاریی بێژمار و پۆشاکی شکۆمەندانەیان بدەنێ. ئەوانیش بەڵێنی گوێڕایەڵییان دایێ. دوای ئەوە عەجیب دیاری بۆ گەورەی هۆزە عەرەبەکان نارد و وڵاتی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و خەڵکیش ملکەچی ئەویان بە ئەرکی خۆیان زانی.

"پێنج مانگ بوو، لە سەر تەخت دانیشتبوو. شەوێکیان خەونێکی دیت وا بوو، لە ترسان ڕاچڵەکی و ئیدی خەوی لێ نەکەوتەوە. کە ڕۆژ بووەوە، چووە دیوانی پاشایەتی دانیشت. ئەوجار فەرماندە و گەورەکان هاتن ڕیز بوون. خەونلێکدەرەوە و ئەســتێرەناســانی بانگ کرد و پێی گوتن: 'دوێنێ شەو لە خەونمدا بوو، باوکم هاتە لام، چووکی دیار بوو، شتێکی وەک هەنگ لە ســەرەکەیەوە هاتە دەرەوە و بەرەبەرە گەورە بوو تا ئەوەندەی دێوێکی لێ هات. چرنووکەکانی وەک خەنجەر بوون. من زراوم لێی چوو و حەپەسام. لە ناکاو ڕووی لە من کرد، چرنووکێکی لێ دام و ســکمی دڕی. وا بوو لە ترســان داچڵەکام. ئێســتا خەونەکەم بۆ لێک دەنەوە.' خەونلێکدەرەوەکان ســەیری یەکدییان کرد و بیریان لە وەڵامەکەی کردەوە و دوایی گوتیان: 'قوربان، ئەوە مانای ئەوەیە باوکت منداڵێکی هەیە کە دەردەکەوێ و لە نێوان تۆ و ئەودا دژمنایەتی پەیدا دەبێ. کارێک بکە بەرەنگاری نەبییەوە.' عەجیب گوتی: 'باوکی من هیچ منداڵێکی نییە تا لێی بترسم. ئەم لێکدانەوەیە تەواو هەڵەیە.' خەونلێکدەرەوەکان گوتیان: 'ئەوەی زانیمان، هەر ئەوەمان عەرزی پادشا کرد.' پادشا دوای ئازار دانیان دەری کردن و خۆی هەســتا و چووە کۆشــکی باوکی. لە ژنەکانی باوکی کۆڵییەوە، سەیری کرد، کەنیزێک دووگیانە کە حەوت مانگی تێپەڕاندووە.گورج دوو کۆیلەی بانگ کرد و گوتی: 'ئەم کەنیزە بەرنە بێشــەڵانەوە و لەگەڵیدا ڕابوێرن.' کۆیلەکان کەنیزیان برد و چەند ڕۆژێک ڕۆیشــتن تا لە شــار دوور کەوتنەوە. بردیانە بێشــەڵانێکەوە کە دار و

درەختی زۆر لێ بوو و لەوێ بڕیاریاندا، لەگەڵ کەنیزەکەدا ڕابوێرن، بەڵام کێشـەیان کەوتە بەینەوە لەسـەر ئەوەی ئەم دەیگوت من لە پێشـدا ئەو کارەی لەگەڵ دەکەم. ئەوەی تر دەیگوت نەخێر دەبێ من لە پێشـدا لەگەڵی جووت بم. ئیدی لێیان بوو هەراوهوریا. وا بوو لەو جەنگەیەدا تاقمێک لە قولە ڕەشـەکان پەیدا بوون و شیریان لێ هەڵکێشـان و هێرشـیان بردنە سـەر. هەردووکیان لەوێ کوژران و کەنیز لە بێشـەڵانەکەدا تەنیا ماوە. لەوێ میوەی دەخوارد لە کانیاوەکانی ئاوی دەخواردەوە تا وا بوو کوڕێکی جوانکیلەی بوو و بە هۆی غەریبییەکەیەوە ناوی نا 'غەریب.' نێوکی بڕی و یەکێک لە کراسەکانی خۆی تێوە پێچا."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەش‌سەد و بیست و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! کەنیزەکە بە ترس و دڵەڕاوکێوە لە بێشەڵانەکەدا دەژیا و ئاگاشی لە کوڕەپەکەشی بوو. ڕۆژێکیان لەپڕ سوارێک پەیدا بوو کە کۆمەڵێکی پێڕەو بە شوێنەوە بوو. تانجی و تاژپڵنگیان پێ بوو. کە هاتنە بێشـــەڵانەکەوە، تەماشـــایان کرد ئافرەتێک لەوێیە و کوڕەپەیەکی لە باوەشـــدایە. لێیان پرســـی: 'تۆ جنۆکەی یان مرۆی؟' گوتی: 'کچی گەورانی عەرەبم، مرۆڤم.' ئیـدی چوونە لای گەورەکەیـان و لە بـابەتەکەیـان ئـاگـادار کردەوە. گەورەکەیان ناوی میر مەرداس بوو و گەورەی قەحتان بوو. لەگەڵ پێنج‌ســـەد کەس لە هۆزەکەی و ئامۆزاکانی هاتبوو بۆ ڕاو. کاتێک کەنیزەکە باســـی خۆی بۆ کرد و هەموو شتێکی بۆ گێڕاوە. میر مەرداس زۆری پێ سەیر بوو. هەڵیگرت و هێنایەوە. کە گەیشتنەوە نێو هۆزی قەحتان، میر مەرداس کەنیزی لە جێیەکی جیا دانا و پێنج کەنیزی بۆ تەرخان کرد، لە خزمەتیدا بن و زۆری خۆش دەویست.

"شـــەوێک لە شـــەوان میر چووە زگ کەنیز و لەگەڵی جووت بوو. هەر ئەو شـــەوە دووگیان بوو. کە نۆ مانگ و نۆ ڕۆژەی تەواو بوو، کوڕێکی مانگئاســـای بوو و ناویان نا 'سەهیموللەیل.' بە دایەنیان سپارد و لەگەڵ غەریبی برایدا پەروەردە کران و گەورە بوون. میر مەرداس ئەوانی بە زانایەک ســـپارد تا زانســـت و ئەدەبیان فێر بکا. دوایی ئەوە دانێ دەست ئازا و سوارچاکانی عەرەب تا فێری سوارچاکییان بکا. هێشتا نەبوونە پازدەساڵ کە فێری هەموو هونەرەکـان ببوون و لە هەموو پـاڵەوانـانی هۆزەکە هەڤیـازتر بوون و هەریەکەی دەرەقەتی هەزار ســـوار دەهات. جا مەرداس دژمنی زۆری هەبوو، لە پەنا ئەوانەوە میرێکی لێ بوو بە نێوی حەسسانی کوڕی سابت کە دۆستایەتییان پێکەوە هەبوو. میر حەســـــــان کچێکی هەبوو، کچەکەی دا بە یەکێک لە گەورەکانی هۆزەکەی. میر مەرداســیشــی بانگهێشــت کرد. میر مەرداســیش قەبووڵی کرد و پێنج‌ســەد ســواری لەگەڵ خۆی برد و چوارســەد ســواری بەجەرگیشــی بۆ پاســەوانی ناوچەکەی خۆی جێ هێشــت. ڕۆیشتن تا گەیشتنە لای حەسسان. حەسسان پێشوازی لێ کرد، بردییە ماڵەوە و وە لای سەرووی خست. گەورە و سوارچاکانی هۆزەکانیش هاتن. میر حەسسان ئاهەنگی گێڕا و نانی دا تا وا بوو ڕۆژانی خۆشـــی و ئاهەنگ تەواو بوو. عەرەبی هۆزەکانیش گەڕانەوە ناوچەکانی خۆیان.

"میر مەرداس کە دەگەڕاوە بۆ نێو هۆزەکەی، دوو کەســـی بە کوژراوی بینی کە باڵندە بەســـەریانەوە نیشـــتبوون. کە چووە نێو هۆز، غەریب بە پێشـــوازییەوە هات و دیتی چەکی بەســـتووە و زرێی لە بەر کردووە. گوتی: 'غەریب، ئەوە چی قەوماوە؟' غەریب گوتی:

'حەملی کوڕی ماجید هێرشــــی کردینە ســــەر.' ئەویش لەبەر ئەوە بوو کە میر مەرداس کچێکی بە ناوی مەهدییە هەبوو کە تا ئەمڕۆ هیچ دیدەیەک لەوە جوانتری نەدیبوو. حەملی کوڕی ماجیدی گەورەی بەنی تیهان کە ناوبانگی جوانییەکەی دەبیســتێت، پێنجســەد ســوار لەگەڵ خۆی دەبات و دەچێتە لای میر مەرداس بۆ خوازبێنی کچە. مەرداس نائومێدی دەکا و کچەی ناداتێ. ئیدی حەمل بەردەوام خۆی لە مەرداس مەڵاس دەدا و لێی دەخەفتێ تا ئەوەی کە مەرداس دەچێتە میوانییەکەی حەســـــــان و لە هۆزەکەی دوور دەکەوێتەوە، لێرەدا حەمل دەرفەت دێنێ و لەگەڵ ســوارچاکانی هۆزەکەیدا شـاڵاو بۆ بەنی قەحتان دێنێ و کۆمەڵێک لە پیـاوەکانیـان دەکوژێ و ئەوانی دیکە بەرەو کێوەکـان هەڵدێن. غەریـب و براکەشی لەگەڵ سـەد کەسدا چووبوونە ڕاو. کاتێک دێنەوە، تەماشـا دەکەن حەملی کوڕی ماجید، بەســەر هۆزەکەیانیدا داوە و باڵبازەکانی شـکسـت داوە. کچ و ژنانی هۆزی بە دیل گرتووە و مەهدییەشیان بردووە.

"کە غەریب ئەو دۆخەی بینی، بەر چاوی ڕەش بوو و سـەهیموللەیلی برای بانگ کرد و گوتی: 'بڕوانە ئەو شیرپیسە، ماڵ و سامانی هۆزی بە تاڵان بردووە و کچ و ژنەکانیشی بە دیلی گرتوون!' گورج غەریب و سەهیم لەگەڵ سەد سواری بەجەرگدا هێرشیان کردە سەر دوژمنەکانیان. شەڕ دەستی پێ کرد و غەریب تا دەهات تووڕەتر دەبوو. یەک لە دوای یەک ســەری ئازایانی دوژمنی لە لەشـیان جیا دەکردەوە پێکی مەرگی پێ دەنۆشـین تا گەیشـتە ســەر حەملی کوڕی ماجید. ســەیری کرد وا مەهدییە دەبا. ئیدی شـاڵاوی بردێ و ڕمێکی هاویشتێ و لەسەر ئەسپەکە بەری داوە. کە سوارەکانی بەنی تیهان ئەمەیان بینی، هەڵاتن. غەریب دیلەکانی ڕزگار کرد و ئەو شیعرەی خوێندەوە:

بێتوو ژیـان بە کەیفی مـــــــــن نەگەڕێ
ناتوانم من لێی گەڕێـــــــــــم وا بگەڕێ
هەر ملهوڕێک بێـــــــــــــــهەوێ ملم بادا
گەوجەپیـاوە و ســـەری خـۆی بە بـا دەدا
خوێڕی نیـم و لەتـم لە بێــــــــهێز نـاکەم
بەهێزێـک لەتم بـــــــــــکا وردی دەکەم

"هێشـتا ئەو شـیعرەی تەواو نەکردبوو کە مەرداس گەیشـتەوە و بە بینینی ئەو دۆخە چاوی پەڕییە تەوقی سـەری. غەریب هێوری کردەوە و نزای سـاغی و سـلامەتی بۆ کرد و هەموو شـتێکی بۆ گێڕاوە. مەرداس سـتایشـی کارەکەی و سـپاسـی چاکەکەی کرد و پێی گوت: 'سوپاس بۆ خودا کە ڕەنجم بە با نەچووە.' دوایی هاتەوە نێو دەوارکەی و پیاوان لە هەنتەشـیدا ڕاوەسـتان. خەڵکی هۆز سـتایشـی غەریبیان کرد و بە مەرداسـیان گوت: 'میری

مەزن، ئەگەر غەریب نەدەبوو، هۆزی سالم کەسی تێدا نەدەما.' مەرداس سپاسی کرد."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی شەشسەد و بیست و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! کە غەریب مەهدییەی کچی مەرداسی لە دەستی حەمل ڕزگار کرد، خۆی بەندی ئەوینی بوو و تیری برژانگی ســـینەیان ئەنگوت و کەوتە داوی ئەوینیەوە و هیچ کاتێک خەیاڵی مەهدییە لە ســـەری غەریب دەرنەدەچوو. خواردن و خەوی لێ حەرام بوو. هەموو ڕۆژێک ســـوار دەبوو و دەیدایە کێوان و شـــێعری دەخوێندەوە تا وا بوو شـوێنەواری ئەوینی لێ دەرکەوت. ڕازی خۆی بە هەندێک لە دۆستانی گوت و هەواڵەکەی لەنێو هۆزدا تەشـــەنەی ســـەند تا وا بوو بە مەرداس گەیشـــتەوە. مەرداس تووڕە بوو و غەزری و هەڵدەستا و دادەنیشت و جنێوی بە مانگ و خۆر دەدا و گوتی: 'هەرکەس بیژوو گەورە بکا، پاداشـــەکەی دەبێ هەر ئەوە بێ، ئێســـتا ئەگەر غەریب نەکوژم، ئەوە ئەو پەڕۆ شینەم هەر بە شانەوە دەبێ.' ئەوجار لەگەڵ پیاوێکی ژیروزانای هۆزدا لەبارەی کوشتنی غەریبەوە ڕاوێژی کرد. ئەو کابرایە گوتی: 'میرم، ئەوەندە نابێ غەریب کچەکەتی ڕزگار کردووە، ئەگەر هەر ناچاری بیکوژی، کارێک بکە بە دەستی کەسێکی دی بکوژرێ تا هیچ کەس گومان لە تۆ نەکا.' مەرداس بۆچوونەکەی لا پەسند بوو، سەد و پەنجا سوارچاکی نەترس و ئازای هۆزەکەی هەڵبژارد و هانی دان کە غەریب بکوژن. وا بوو ڕۆژێکیان غەریب چوو بۆ ڕاو. مەرداس سوارەکانی برد و لەسەر ڕێی غەریبدا بۆسەیان ناوە. بە هەڵکەوت لەو دەمەیدا ئەوان لەنێو دارەکاندا لە غەریب خەفتابوون، کەچی پێنجسەد سواری چالاک و بوێر هێرشیان کردنێ. شەست کەسیان لێ کوشتن و نەوەدیان لێ بە دیل گرتن. میر مەرداسیشـــیان قۆڵبەســـت کرد. ئەو ڕووداوە ئاوا ڕووی دا کە، کاتێک حەملی کوڕی ماجید دەکوژرێ و ئەوانی دیکە هەڵـدێن، دەچنە لای براکەی و لە ڕووداوەکەی بۆ دەگێڕنەوە. دنیا لە بەرچاوی تارێک دەبێ، ســـوارەکانی هۆز کۆ دەکاتەوە و پێنجســـەد سواری بەجەرگیان هەڵدەبژێرێ و بۆ تۆڵەی خوێنی براکەی وەڕێ دەکەوێ و لەو شوێنەدا کە میر مەرداس لە بۆسەدا بوو، دەیانگەنێ. تاقمێکیان لێ دەکوژن و ئەوانی دیکە قۆڵبەست دەکەن. چەند فرسەخێک ڕۆیشتن و لە شوێنێک لایان دا بحەسێنەوە. بە دەستوپێوەندەکەی گوت: 'بوتەکان پشـــتیوانییان کردین و تۆڵەســـەندنەوەکەیان بۆ ئاســـان کردین. جا ئێســـتا ئاگاتان لە مەرداس بێ تا دوایە بە خراپترین شێوە بە سزای خۆی دەگەیەنین و دەیکوژین.' هۆزی حەملی کوڕی مەرداس خەوتن، مەردان و هاوڕێکانیشی دەستیان لە ژیان شۆرد. کاری ئەمان بێرە گەیشت.

بەڵام ســـەهیمولڵەیل کە بریندار بوو، چووە لای مەهدییەی خوشکی. مەهدییە لە بەری هەســـتا و دەســـتی ماچ کرد و گوتی: 'یا خودا دەســـتت خۆش بێ و لە تانە و تەشـــەری دوژمنانت بە دوور بی! ئەگەر تۆ و غەریب نەبوونایە، ئێمە تازە ڕزگارمان نەدەبوو. برا

گیان، تۆ خەبەرت هەیە کە باوکمان لەگەڵ پێنجسەد سواردا چووە بۆسەی بۆ غەریب ناوەتەوە، بە تەمایە بیکوژێ؟ بۆخۆت دەزانی کوشتنی غەریب زیانێکی گەورەیە. ئاخر ئەو ناموسی ئێوەی پاراستووە و ماڵ و سامانتانی گەڕاندووەتەوە.'

"سەهیم کە ئەم قسەیەی بیست، تووڕە بوو، خێرا جلوبەرگی شەڕی پۆشی، سوار بوو و بەرەو ئەو ڕاوگەیە چوو کە براکەی چووبوو. تەماشای کرد براکەی ڕاوێکی زۆری کردووە. لێی چووە پێشەوە و سڵاوی لێ کرد و گوتی: 'ئەرێ برا، کەی بەڵێنی ئێمە وا بوو؟ ئەوە بۆچی بێ من هاتووی بۆ ڕاو؟' غەریب گوتی: 'بە خودا لەبەر ئەوەی بریندار بووی، گوتم با پشوو بدەی.' سەهیم گوتی: 'برا گیان، ئاگات لە خۆت بێ، باوکم بە پێنج سەد کەسەوە دوات کەوتووە و دەیەوێ بتکوژێ.' غەریب گوتی: ' خودا گرفتاری فێڵی خۆی دەکا. ئەوەی چاڵ بۆ هەرکەس هەڵکەنێ، خۆی تێ دەکەوێ.'

"ئەوجار غەریب و سەهیم بەرەو شار گەڕانەوە و لە تاریکی شەودا گەیشتنە دەشتێک کە هۆزی بەنی ماجیدی لێ بوو. کە حیلەی ئەسپی ئەو هۆزەیان هاتە بەر گوێ، سەهیم گوتی: 'برا گیان، پێم وایە باوکم لەگەڵ سوارەکانیدا لێرە بۆسەی بۆ ناویتەوە.' غەریب لە جێوە لە ئەسپەکەی دابەزی و لغاوەکەی دا بە براکەی و گوتی: 'تۆ هەر لێرا بوەستە تا من هەواڵێک دەزانم.' ئیدی غەریب بە پێدزە چووە بەرەوە. سەیری کرد ئەوە مەرداس و ئەوان نین، بەڵام گوێی لێ بوو کە باسی مەرداسیان دەکرد و دەیانگوت کە دەبێ لە نێو هۆزەکەی خۆیدا بیکوژین. ئیدی زانی کە مەرداس گیراوە. بە خۆی گوت: ' قەسەم بە گیانی مەهدییە، لێرە ناڕۆم هەتا مەرداس ڕزگار نەکەم، با مهدییە دڵبەخەم نەبێ.' ئەوجار بەدوای مەرداسدا گەڕا تا بە قۆڵبەستکراوی دۆزییەوە. لەپاڵیدا دانیشت و گوتی: 'مامە گیان، ئەمە چییە و بۆ وات لێ هاتووە؟' مەرداس کە چاوی بە غەریب کەوت، لە خۆشییاندا خەریک بوو شاگەشکە بێ و گوتی: 'ڕۆڵە گیان، سوێند بە ئایین و دابونەریتم، مەهدییە هی تۆیە.' خێرا دەستی کردەوە و پێی گوت: 'بەرەو لای ئەسپەکان بچۆ، سەهیمی کوڕیشت لەوێیە.' مەرداس بەرەو لای ئەسپەکان چوو و سەهیموللەیلی کوڕی لەوێ بوو. غەریبیش دانەدانە دەستی دیلەکانی کردەوە تا هەمووی بەر دا و لە دژمنانی دوور خستنەوە. ئەسپ و چەکی بۆ هێنانەوە و پێی گوتن: 'ئێستا سوار بن و بە چواردەوری دژمندا بڵاو ببنەوە و بە سەریاندا بگوڕێنن.' وا بوو پێکەوە کوڕاندیان: 'بژی بەنی قەحتان، بژی!' دەنگیان لە کێوەکانەوە دەدراوە. دژمنان وایان زانی کە هۆزی مەرداس هێرشیان بۆ هێناون. هەر بۆیە دەستیان دایە چەک و کەوتنە گیانی یەکدی."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و بیست و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! تا تاوهەڵاتی بەیانی لە یەکتریان کوشـــت. لەو کاتەدا غەریب بە سوارەکانیەوە هێرشی بردنە سەر، قاقمێکی زۆری لێ کوشتن و ئەوانەی مان هەڵاتن. ئیدی سوارەکانی بنی قەحتان دەستکەوتێکی زۆریان لە ئەسپ و چەک وەگیر کەوت و گەڕانەوە و هاتنەوە نێو هۆزکەی خۆیان. خەڵکەکە بە پیریانەوە هاتن و بالۆرەیان لێدا و هەرکەس چووەوە تاوڵی خۆی. غەریبیش چووەوە تاوڵەکەی و لاوانی هۆز لەلای کۆ بوونەوە و ورد و درشت هاتنە سڵاوی.

"کە مەرداس دیتی وا لاوەکان لە دەوری غەریب کۆ بوونەتەوە، ئەوەندەی دیش ڕقی لێی هەستا. چووە نێو هۆزەکەی و پێی گوتن: 'ئەوەندەی دیکەش ڕقم لە غەریب هەڵگرتووە و پێم ناخۆشە کە ئەو لاوانە لە دەوری کۆ بوونەتەوە. سبەینێ بە زۆر و زۆراری مەهدییەم لێ دەســـێنێ.' ڕاوێژکارێک پێی گوت: 'میرم، داوای شـــتێکی لێ بکە کە لە توانایدا نەبێ.' مەرداس ئەو بۆچوونەی بە دڵ بوو. ئەو شەوە بە ئاسوودەیی نووست.

"کە ڕۆژ بووەوە، لەسەر تەخت دانیشت و گەورەگەورەکانی عەرەب لای کۆ بوونەوە و غەریب و لاوەکانیش هاتن و یەکیەک کوڕنۆشـــیان بۆ برد. میر مەرداســـیش بە ڕووی خۆشەوە، هەستا و بەخێرهاتنی کردن و غەریبی لە لای خۆیەوە دانا. غەریب گوتی: 'مامە. بەڵێنی خۆت ببە سەر.' مەرداس گوتی: 'مەهدییە جگە لە تۆ شایانی کەس نییە، بەڵام ڕۆڵە. خۆ تۆ ماڵ و ســـامانت نییە.' غەریب گوتی: 'مامە، هەرچیت دەوێ، داوای کە با گەورەی هۆزەکان و پاشـای شـارەکان تاڵان کەم و ئەوەندەت ماڵ و سـامان بۆ بێنمەوە لە ئەژمار نەیە.'

"مەرداس گوتی: 'ڕۆڵە، من سوێندم بە گشت بوتەکان خواردووە کە مەهدییە بە کەسێک بدەم کە تۆڵەم بۆ لە دژمنەکانم بستێنێ و بیانکوژێ و پەڵەی نێوچاوانم بسڕێتەوە.' غەریب گوتی: 'مامە، بڵێ کام پاشا دژمنتە با تەخت و تاراجی لە بن بێنم و بۆت بە دیل بگرم.' میر مەرداس گوتی: 'ڕۆڵە، من کوڕێکم هەبوو لەگەڵ ســـەد ســـواردا چوو بۆ ڕاو و گەیشـــتە شیوی گوڵان و کۆشکی حامی کوڕی شیسی کوڕی شەدداد[١]. لەو شوێنەدا پیاوێکی ڕەشی لێ بوو کە بالای حەفتا باڵ بوو و دارانی لە ڕەگەوە لە زەوی هەڵدەکێشـــا و شـــەڕی پێ دەکردن. کە کوڕەکەم گەیشتە ئەو شیوە، ئەو ڕەشە کوڕەکەم و سوارەکانی کوشت و جگە لە سـیانیان، کەسـیان بە سـاغی دەرنەچوو. ئەوان گەڕانەوە و منیان لە ڕووداوەکە ئاگادار کردەوە. ئـازایـانی هۆزم کۆ کردوە و بۆی دەرچووین و دەرەقەتی نەهـاتین. جـا چونکە

---

[١]. لە هێندێک نوسخەدا شەددادی کوڕی خولد نووسراوە.

نەمتوانی هەقی کوڕەکەم بسـێنم، سـوێندم خوارد کە کچەکەم بە کەس نەدەم مەگەر بە کەسـێک کە تۆڵەی خوێنی کوڕەکەمم بۆ لەو بکاتەوە و ئەو پەڵە ڕەشـە لە ناوچاوانم بکاتەوە.'

"کە غەریب ئەوەی بیست، گوتی: 'مامە گیان، من دەچم بۆ گیانی و ئیشەڵلا بە یارمەتی خودا تۆڵەی کوڕەکەتی لێ دەکەمەوە.' مەرداس گوتی: 'غەریب! ڕۆڵە، ئەگەر تۆ بەسەریدا زاڵ ببی، ئەوە دەستکەوتێکی بێئەندازەت گیر دەکەوێ.' غەریب گوتی: 'مامە گیان، تۆ بەڵێن بدە کە کچەکەتم بدەیتێ و شـێخ و گەورەکانی هۆز بکە بە شـایەد، تا من بە دڵنیایی و تین و توانێکی زیاترەوە بەرەنگاری ببمەوە.' میر مەرداس گفتی داێ و شـێخ و گەورەکانی هۆزی بە شـایەد گرت.غەریب بە دڵی خۆشـەوە لای مەرداس هاتە دەرەوە و چوو بۆ لای دایکی و دایکی لە بابەتەکە ئاگادار کردەوە. دایکی گوتی: 'ڕۆڵە، مەرداس لێت بە ڕقدا چووە و بە دوژمنایەتی دەتنێرێ بۆ ئەو کێوە مەترسـیدارە تا بەکوشـتت بدا. تۆ من لەگەڵ خۆت ببە تا لە بەرچاوی ئەم ستەمکارە دوور کەوینەوە.' غەریب گوتی: 'لێرە دوور ناکەومەوە تا بەسەر دژمنەکەمدا زاڵ نەبم و بە ئاواتی خۆم نەگەم.'

"غەریب ئەو شـەوەش ڕۆژی لێ بووە و بۆ بەیانی لاوەکانی هۆز کە دووسـەد کەس بوون و غەریبیان خۆش دەویسـت، ئامادە بوون و هەموو چەکوچۆلیان پێ بوو و بە غەریبیان گوت: 'ئێمەش لەگەڵ خۆت ببە تا یارمەتیت بدەین.' غەریب سـپاسـی کردن و کەیفی سـاز بوو، گوتی: ' خودا پاداشـی چاکەتان بداتەوە.' بەو جۆرە غەریب و لاوەکانی هۆز سـوار بوون و کەوتنە ڕێ. سـێ ڕۆژ بەڕێوە بوون تا دەمەو ئێوارە گەیشـتنە بناری کێوێکی بڵند و هەڵەموت. غەریب بە تەنیا بەو کێوەدا هەڵژنا و گەڕا گەڕا تا ئەشـکەوتێکی دۆزییەوە. ڕووناکییەک لە ئەشـکەوتەکەدا بوو. شـێخێکی لێ بوو، سـێ‌سـەد و چل سـاڵ تەمەنی بوو. لەبەر پیریان برۆ و سـمێڵی تێکەڵ ببوونەوە و بە سـیمایدا هاتبوونە خوارێ. کە غەریب چاوی بەو شـێخە کەوت، شـکۆی ئەوی کەوتە دڵ و بە گەورەی هاتە بەرچاو. ئەوجار شێخ گوتی: 'کوڕم، ئەوە تۆ کافری و بوت دەپەرستی و ئەو خودایە ناپەرستی کە زەوی و ئاسمان و خۆر و مانگی بەدی هێناوە؟' کە غەریب ئەم قسەیەی بیست، سەرتاپای کەوتە لەرزە و گوتی: 'شـێخ، ئەو خودایەی باسـی دەکەی، کێیە و لە کوێیە تا ببینم و بیپەرستم؟' شێخ گوتی: 'کوڕم، ئەو خودایە کەس ناتوانێ ببینێ، ئەو هەمووان دەبینێ. ئەو بە هۆی دەسـەڵاتییەوە شـوێنەواری لە هەموو جێیەک ئامادەیە. ئەوە گەردوونی ئافراندووە و مرۆ و جنۆکانی بەدی هێناوە. پێغەمبەرانی بۆ ڕێنوێنی کۆیلەکانی ناردووە و هەرکەسێک گوێڕایەڵ بێ، دەینێرێتە بەهەشـتەوە و هەرکەسـێکیش سـەرکەش بێ، دەیخاتە دۆزەخەوە.' غەریب گوتی: 'شێخ، چۆن دەبی بە کۆیلەی ئەو خودایە؟' شێخ گوتی: 'کوڕم، من لە هۆزی عادم کە سـەرکەشـییان کرد. خودا پێغەمبەرێکی بۆ ناردن، ناوی هوود بوو. ئەوان گاڵتەیان

پێ کرد و کردیانه تیزەجاڕ باوەڕیان پێ نەکرد. خودا ڕەشـــەبایەکی بۆ هەڵکردن و لەناوی بردن. من و کۆمەڵێک لە هۆزەکەم باوەڕمان هێنابوو، هەر بۆیە لەو سـزایە ڕزگارمان بوو. دوای ئەوە هۆزی سـەموودم بینی. دیتم کە ئەوانیش چیان بە سـاڵحی پێغەمبەر کرد. دوای ئەویش پێغەمبەرێک بە ناوی ئیبراهیمی کوڕی خەلیل بۆ لای نەمروودی کەنعان نێردرا و لە نێوانیـاندا ئەوە ڕووی دا کە ڕووی دا. ئەو خەڵکەی لە هۆزی من بـاوەڕیـان هێنـابوو، دانەدانە مردن و من لەم ئەشکەوتەدا خەریکی خودا پەرستی بووم. خودا لە شوێنێکەوە کە خۆشم فکرم بۆی ناچێ ڕۆزیم دەدا.' غەریب گوتی: 'دەی باشە ئێستا من دەبێ بڵێم تا ببمە عەبد و کۆیلەی ئەو خودایە؟' شـــێخ گوتی: 'بڵێ، لائیلاهە ئیللەڵڵا، ئیبراهیم خەلیلولڵلا تـا موسڵمان ببی.' غەریب بە دڵ و زمان موسڵمان بوو. ئەوجار شێخ بەشێک لە فەرزەکان و تۆزێک لە کتێبی خودای فێر کرد و لێی پرســـی: 'ناوت چییە؟' گوتی: 'ناوم غەریبە.' شـــێخ گوتی: 'ئەی بە تەمـای بۆ کوێ بچی؟' غەریب بەســـــەرهـاتەکەی مووبەموو بۆ گێڕاوە تـا گەیشتە باسی دێوی کێوییەکە."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و بیست و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! گەیشتنە باسی دێوە کێوییەکە و شێخ گوتی: 'مەگەر شێت بووی، بە تاقی تەنیا بە گژ ئەو دێوەدا دەچی؟' غەریب گوتی: 'دووسـەد گەنجی ئازا و دلێرم لەگەڵە.' شێخ گوتی: 'کوڕە ئەگەر دەهەزاریشت لەگەڵ بێ دەرەقەتی نایەن. ئاخر ئەوە دێوە و گۆشـتی مرۆڤ دەخوا و لە نەوەی حامە. کاتی خۆی ئەو وڵاتی هیندی ئاوەدان کردەوە و ناوی هیندسـتانی لێ نا و ناوی ئەو دێوە سـوعدانە. کوڕە ڕۆڵە، ئەو شـەیتانێکی ئاپلە. خواردنی گۆشـتی مرۆیە و کاتی خۆی باوکی ئەمەی لە قەدەغە کرد، بەڵام بە گوێی باوکی نەکرد و ڕۆژبەڕۆژ ملهوڕتر دەبوو. باوکی دەری کرد و دوای شـەڕ و دەردەسـەرییەکی زۆر لە هیندستان شاربەدەری کرد و هات لێرە نیشتەجێ بوو. ڕێی لە کاروانییان دەگرت، ڕووتی دەکردن و دەگەڕاوە شـوێنی خۆی. پێنج کوڕی ئازای هەیە کە هەریەکەی لە خۆی ڕادەبینێ پەلاماری هەزار کەس بدا. ئەوەندەیان ماڵ و سـامان و ئاژەڵ کۆ کردووەتەوە کە لە ژمار نایە. ئینجا ڕۆڵە من خەمی تۆمە و نیگەرانتم. لەو خودایە دەپاڕێمەوە کە بیکا بۆ خاتری پیرۆزیی وشـەکانی یەکتاپەرسـتی سـەرکەوتووت بکا. بەڵام لە بیرت نەچێ، هەر کاتێک پەلاماری کافرانت دا، بڵێ 'ئەڵڵاهوئەکبەر' کە دەبێتە هۆی ئەوەی نەترەی دوژمن بچێ و بەسەریاندا زاڵ بی.'

"دوای ئەوە شـێخ ڕمبێکی پۆڵای دا بە غەریب کە سـەد ڕەتڵ کێشـی بوو و دە گەوی زێڕینی پێوە بوو، هەر کاتێک دەیانجووڵاندەوە دەنگێکی وەک هەورەتریشـقەی لێوە دەهات. شـیرێکی درەوشـاوەشـی دایە کە سێ باڵ درێژ و سێ بست پان بوو کە ئەگەر لە بەردت دابایە دوو قاشـی دەکرد. هەروەها زرێ و مەتاڵ و کتێبێکی ئاسـمانیشـی دایە و پێی گوت: 'ئیسـتا برۆ ئیسـلام بە هۆزەکەت بناسـێنە.' غەریب بە دڵێکی خۆش، لەوەی کە موسـوڵمان بووە لە لای شـێخ هاتە دەرێ و گەڕاوە لای هاوڕێکانی. هاوڕێکانی لێیان پرسـی بۆ وا درەنگ هاتەوە کە ئەویش باسـەکەی بۆ گێڕانەوە و ئیسـلامی پێ ناسـاندن. وا بوو گشـتیان موسڵمان بوون. ئەو شەوە خەوتن.

"بەیانی زوو غەریب سـوار بوو چوو بۆ لای شـێخ بۆ ماڵاوایی. ماڵئاوایی لێ کرد و لەگەڵ سـوارەکاندا وەڕێ کەوتن. هەر وا کە خەریک بوون دەڕۆیشـتن لەپڕ سـوارێک کە سەرتاپا ئاسنی پۆشی بوو، پەلاماری غەریبی دا و پێی گوت: 'ئەی ڕسواترینی نێو عەرەب، جلوبەرگت داکەنە، ئەگینا خەڵتانی خوێنت دەکەم.' غەریب بەرەنگاری بوو. شـەڕێکی ئەوەندە قورس لەرنێوانیاندا هاتە ئاراوە کە لاوان لە ترسانا پیر دەبوون و بەرد لە دەتواوە. هەتا سوارەکە ڕووبەندی لا دا و پێکەنی! تەماشـا دەکەن ئەوە سـەهیمولڵەیلی برای غەریب

و کوڕی میر مەرداسـە. هۆی هاتنەکەی بۆ ئەم شـوێنە ئەوە بوو کە غەریب هەڵدەسـتێ وەڕێ دەکەوێ بچێ بۆشـەڕی دێوی کێوی، سـەهیم لەوێ نابێ و کاتێک گەڕابووەوە، غەریبی نەدیبوو. چووبووە کن دایکی و ئەوەی بە گریـانەوە دیتبوو. هۆی گریـانەکەی پرسـیبوو، دایکی سـەهیمی لە ڕووداوەکە ئاگادار کردبووەوە. سـەهیم خۆی پێ نەگیرابوو، چەک‌وچۆلی لە خۆی بەستبوو و سواربببوو و وە دوای غەریب کەوتبوو ئەسپی تاو دا بوو تا گرتبوونییەوە. کە غەریب زانی براکەیەتی، خۆشـحاڵ بوو، گوتی: 'ئەرێ برا، ئەوە بۆ خۆت لێ گۆڕیوم و بە گژمدا دێیت؟' سەهیم گوتی: 'تا ئازایەتی خۆمت پێ تاقی بکەمەوە.'

"دوایە هەردووکیان لەگەڵ سوارەکاندا ڕۆیشتن و غەریب ئیسلامی بە سەهیم ناساند و ئەویش موسڵمان بوو و بە دڵی خۆشـەوە ڕۆیشـتن تا لەو شـیوە نیزیک بوونەوە کە دێوە کێوییەکەی لێ بوو.

"کە سـوعدان تەپوتۆزی سـوارەکانی دی، گوتی: 'یەڵا کوڕینە سـوار بن و ئەو دەسـتکەوتە بێننەوە.' هەر پێنج کوڕەکەی سـوار بوون و بەرەو تەپوتۆزەکە چوون. کە غەریب ئەوانی دی، ئەسپی بەرەو ڕوویان چوارناڵە کرد و گوتی: 'ئێوە لە چ ڕەچەڵەکێکن و چیتان لێمان دەوێ؟' فلحۆن کە کوڕە گەورەی سـوعدان بوو، هاتە پێشـێ و گوتی: 'لە ئەسـپەکانتان بێنە خوار. دەسـتی یەکدی ببەسـتنەوە تا بتانبەینە لای باوکمان و هەندێکتان ببرژێنێت و بەشـێکیشـتان بکوڵێنێت کە لە مێژە گۆشـتی مرۆی نەخواردووە.' غەریب کە ئەمەی بیسـت، پەلاماری فلحۆنی دا، ڕمبی جوولاندەوە و لە گەوەکانیەوە دەنگێکی وەک هەورەتریشـقەی لێ بەرز بووەوە. فلحۆن کاس بوو. غەریب ڕمبێکی تێ گرت کە شـانی فلحۆنی گرت و وەک دارخورمای بڕاو تەختی زەوی بوو. سەهیموللەیل هەڵیکوتایە سەری و قۆڵی بەسـت و گوریسـی کردە ملی و وەک گامێش ڕایکێشـا. کە براکانی فلحۆنی برا گەورەیان بە دیلی بینی، هێرشـیان بردە سـەر غەریب. غەریب سـیانیانی دەسـتگیر کرد. پێنجەمینیان هەڵات و چووەوە لای باوکی. سـوعاد گوتی: 'کوڕە، ئەوە چیت لێ قەوماوە و براکانت کوان؟' گوتی: 'باوکە گیان، لاوێک کە چل باڵ باڵایەتی و هێشـتا خەتی نەداوە، براکانمی دیل کردا' کە دێوی کێوی ئەو قسـەیەی بیسـت، گوتی: 'ئەک لە تیشـکی خۆر بێ بەش بن و پیت و فەڕی ئاگرتان لێ ببڕێ!' ئیدی لە قەڵاکەی هاتە دەرێ، دارێکی گەورەی لە بنەوە هەڵکەند و بە پێڕەو بەرەو غەریب ڕۆیشت، کوڕەکەشی بەدوایەوە بوو. کە گەیشتە لای غەریب و وان، دەنگی نەکرد و یەکسـەر پەلاماری دان. بەو دارەی بە دەسـتیەوە بوو لێی دان. پێنج کەسیان تەختی زەوی کرد. ئەوجار پەلاماری سەهیمی دا و سەهیم خۆی لا دا و دارەکەی لەو لاوە کەوتە سەر زەوی. دێوە تووڕە بوو. داری تووڕ دا و بەرەو سەهیم چوو، گرتی و وەک چۆلەکە بە دەسـتییەوە فڕکەفڕکی بوو. کە غەریب براکەی لە مشـتی دێوەکەدا دیت، بە دەنگی بەرز گوڕاندی: 'ئەڵڵاهوئەکبەر!' و ناوی ئیبراهیمی هێنا."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی شەشسەد و بیست و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ! غەریب پەلاماری دێوەکەی دا و ڕمبەکەی تێ هەڵکرد. ڕمبەکە کە جووڵاوە و ئاڵقەکانی لەرینەوە وەک گرمەی هەورەتریشــــقە دار و بەردی لەراندەوە و لە کەلەکەی دێوە چەقی. دێوە هۆڕاندی و کەوتە ســەر زەوی و بێهۆش بوو. ســەهیمولڵەیل لە دەستی دەرباز بوو. دێوە کاتێک وە هۆش هاتەوە، دەست و پێی بەسترابوو. کە کوڕەکەی ئەوەی بینی، هەڵات. غەریب ئەسپی بۆ تاو دا و کەوتە سەری، ڕمبێکی لە نێوشانی دا. ئەو بەچکە دێو لەجێوە لە ســەر ئەســپەکەی بەر بووەوە. غەریب خێرا قۆڵی بەســت و هێنایەوە لای باوکی و براکانی. گوریســیان لە مل کردن و هەتا قەڵا ڕایانکێشــان. تەماشــایان کرد ئەوێ پڕە لە زێڕ و زیو و جلوبەرگی گرانبایی. هەزار و دووســەد کەســی ناعەڕەب لەوێ بەند کرابوون. ئەوجار غەریب لەسەر کورسی دێوەکە دانیشت کە بە ڕەســەن دەچووەوە سەر ساسی کوڕی شیسی کوڕی شەددادی کوڕی عاد. سەهیم لە دەستی ڕاستی و جەنگاوەرەکانی دی هەموویان لە دەستی چەپیەوە ڕاوەستان.

غەریب بە دێوە کێوییەکەی گوت: 'حاڵت چۆنە گڵاو؟' دێوە گوتی: 'جا چۆن بم گەورەم، ئەوە خۆم و مناڵەکانم لەوپەڕی کەنەفتی و بێدەسەڵاتیداین و کۆت و بەند کراوین.' غەریب گوتی: 'پێمخۆشــە بێینە ســەر دینی ئیســلام و باوەڕ بە بێهاوتایی خودا و پێغەمبەرایەتی ئیبراهیم بهێنن.' ســوعدانی دێو و منداڵەکانی ئیســلامیان قەبووڵ کرد. بە فەرمانی غەریب دەست و لاقیان لە کۆت و بەند کردنەوە. ئەوجار لە دێوەی پرسی: 'سوعدان، ئەمانە کێن؟' ســـوعدان گوتی: 'قوربان، ئەمانە ئێرانین[1] و ڕاوم کردوون. تەنیا نین و فەخرتاجی کچی شــاپووری پاشــای فارســیشــیان تێدایە و لەگەڵ ســەد کەنیزی ڕوومانگدا بەندن.' غەریب گوتی: 'باشە ئەمانەت چۆن گرتووە؟' سوعدان گوتی: 'من و پێنج کوڕەکەم و پێنج کۆیلەوە دەرۆیشــتین و بە دوای دەســتکەوتدا دەگەڕاین کە تەپوتۆزێک لە دوور دەرکەوت. کۆیلەیەکم نارد تا بزانێت چ باسە. کۆیلە ماوەیەکی پێ چوو، پاشان هاتەوە، گوتی: 'گەورەم، ئەوە شــازادە فەخرتاجی کچی شــاپووری پاشــای ئێرانە و دووهەزار ســواری لەگەڵدایە.' ئیدی من و کوڕەکانم هێرشمان کردنە سـەر و سێسـەد کەسمان لێ کوشتن و ئەوانی دیکەیانمان قۆڵبەســت کرد و کچی شــاپوورمان بە ماڵ و کەلوپەلە دانســقەکانەوە بە دەستکەوت هێناوە.' کە غەریب ئەم قسەیەی بیست، گوتی: 'چیت لە شازادە فەخر کردووە؟' سوعدان گوتی: 'سوێند بەو دینەی هاتمە سەری! بە چاوی خیانەتەوە تەماشام نەکردووە.'

---

[1]. لە نوسخەکانی دیکەدا عەجەم نووسراوە، عەجەمیش واتە ناعەڕەب. بەڵام وشەی ئێرانی کە لە ئارییەوە هاتووە کورد و فارس و هێندێک نەتەوەی دیکەش دەگرێتەوە کە لە جوغرافیای ئێراندا بوون.

غەریب گوتی: 'باشت کردووە. چونکە شاپوور باوکیەتی و پاشای حەوت هەرێمە، سوپای بەدوادا دەنێرێت و شـــاران خاپوور و ئەوانە دیل دەکا کە کچەکەیان دەســـتگیر کردووە. هەرکەس بیر لە سەرئەنجامی کاری نەکاتەوە، تووشی ڕەنجی هەتاهەتایی دەبێ. سوعدان! ئیسـتا پێم بڵێ ئەو کچە لە کوێیە؟' سـوعدان گوتی: 'لەگەڵ کەنیزەکانیدا لە کۆشـکێک دان.' غەریب گوتی: 'شوێنەکەیم پیشـان بدە.' دێوە گورج هەستا و لەگەڵ غەریبدا چوون بۆ ئەو شوێنەی شازادەی تێدا بەند کردبوون.

"کە چوونە ئەوێ و غەریب شـــازادەی دیت، سـەری لە جوانی کچە سـوور ما کە یانی دەکرێ شـــتی ئەوەندە جوان لە مرۆڤدا هەبێ. شـــازادە فەخرتاجیش کە چاوی بە غەریب کەوت، بە ئازا و نەترســـی هاتە بەرچاوی و گەورەیی لە تەوێڵیدا بینی. شـــازادە خێرا لە بەری هەســـتا، دەســـتی ماچ کرد، خۆی بەســـەر پێیدا دا و گوتی: 'ئەی ســـەرداری دلێران، پەنات بۆ دێنم! لە دەسـتی ئەو دێوە قوتارم کە؛ دەترســـم کچێنیم لێ بسـێنێ و بێبنم کا بۆ ئەو کارێکی ئاسانە. زۆر دەترسم بمخوا. دەستم بە داوێنت بمکە بە کەنیزی خۆت!' غەریب گوتی: 'تۆ لە داڵدەی منډای تا بە باوکت شاد دەبیتەوە.' شازادەش نزای خێری بۆ کرد.

"ئیدی بە فەرمانی غەریب دەســـــت و پێی ئێرانییەکانیان کردوە. ئەوجار ڕووی لە فەخرتاج کرد و پرسی: 'لەبەر چی لە کۆشکی خۆت هاتوویتە دەرێ و ڕووت لەم دەشت و کێوە کردووە تا تووشـــت بە تووشـــی ئەم دێوەوە بێ؟' فەخرتاج گوتی: 'گەورەم، باوکم و خەلکەکەی و خەڵکی تورک و دەیلەم مەجووسین و ئاگر دەپەرستن. لە وڵاتدا پەرستگەیەک هەیە کە ئاتەشـــگەی پێ دەڵێن و هەموو جەژنێک کچانی مەجووســی و پەرســتیارانی ئاگر لەوێ کۆ دەبنەوە و تێیدا مانگێک نیشـــتەجێ دەبن. دوای ئەوە دەگەڕێنەوە بۆ شـــارەکانی خۆیان. منیش وەک دابی هەمیشـــەیی لەگەڵ کەنیزەکانمدا بۆ ئەو پەرســـتگەیە خۆم ئامادە کرد و باوکم دووهەزار ســـواری بۆ پاســـەوانی لەگەڵ خســـتم. لە ڕێدا ئەم دێوانە لەپڕ بەسەریاندا داین، هەندێکمانیان کوشت و ئەوانی دیکەشمانیان بە دیل گرت و هێناینیانە ئەم قەلایەوە و بەندیان کردین. ئیدی چۆنم بۆ گێڕایەوە، ئاوا بوو.' غەریب گوتی: 'مەترســە، من دەتبەمەوە بۆ وڵاتی خۆت لای بنەماڵەکەت.' فەخرتاج نزای بۆ کرد و دەســـــت و پێی ماچ کرد.

"دوای ئەوە غەریب فەخرتاجی بەجێ هێشت و ئەو شـەوە لە لای سـوعدان بوو. بەیانی زوو هەسـتا لەگەڵ باڵبازەکان و دیوەکان نوێژیان کرد. پاشـان غەریب ڕووی لە سـوعدان کرد و گوتی: 'بمبە بۆ ســـەیری شـیوی گولان.' ســـوعدان خێرا هەســـتا لەگەڵ غەریب و سوارچاکەکانی و فەخرتاج و سوپاکەی هاتنە دەرەوە. سوعدان فەرمانی بە کۆیلەکانی کرد کە مەڕ ســـەر ببڕن و چێشـت لێبنێن. ئەو ســـەد و پەنجا کەنیز و هەزار کۆیلەی هەبوو کە مەڕ و هێســـتریان بۆ دەلەوەڕاند. غەریب بەرەو شـیوی گولان وەڕێ کەوت و ئەو گشـتە

خەڵکەی لەگەڵ بوو. کە گەیشتنە شیوی گوڵان، غەریب سەری لە جوانی ئەو شوێنە سوور ما و بەو جۆرە هاتە بەرچاوی وەک شاعیر دەڵێ:

باخی لە ناخـــــــــــیا چەم داڕژیایە
مەل لە ناو دار بەرزا ئەخـــــــــــوێنێ
لەویانا فـــــــــــەڕش گوڵ ڕاخرییایە
لەمیـا میوەگەل، ســـەد ڕەنـگ ئەنوێنێ

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی شەشسەد و سییەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــــکۆ! کە غەریب و ئەو خەڵکە پێیان نایە شـــیوی گوڵانەوە، دیتیان گوڵزارێکی خەملیوە و پڕە لە باڵندەی خۆشخوێن کە هەریەکەی لەسەر لقێک هەڵنیشتووە و دەخوێنێ، داری جۆراوجۆری میوە لە هەموو لایەکەوە وە بەر چاو دەکەوێ بە جۆرێک کە زمان لە پەســـنیدا کورتی دێنێ و شـــاعیر ئەم دوو بەیتەی لە پەســـنی ئەو شـــوێنەدا گوتووە:

ســــروشـــت بزەی لە ســــەر لێوە، شــیو و دۆڵ خەملیوە بە گوڵ
ئاوێتە بوون گوڵ و بــــــــــــولبول، ستڕانی مەل و لەرەی چڵ
ســرتەی شــنە و بۆنی ڕیـــــــحان، وە بەر مردووش دێننەوە گیان
گیانی چی وزە و گوڕ و تــــــــــــین، ئەوانەی پێویستن بۆ ژیان

"غەریب ئەو جێیەی پێ خۆش بوو، فەرمانی دا، تاوڵی کەســـــرایی فەخرتاج هەڵ بدەن. تاوڵ لەنێو داراندا دابەســترا و فەرشــی ڕازاوە و شــکۆمەندانەیان تێدا ڕاخســت. غەریب دانیشــت و فەرمانی دانیشــتنی بە دەوروبەرییانیشــی دا. ئەوجار چێشــتیان ئامادە کرد. لە کاتی نانخواردندا غەریب گوتی: 'ئەری ســـوعدان، بادە وەگیر دەکەوێ ؟' ســـوعدان گوتی: 'بەڵێ قوربان، بە کووپە هەمە.' غەریب گوتی:

بێنە لەو بــادەیەی دەڵێی ڕووحی یــاقووتـــــــــــی بێخەوشــــە
وەکوو شــیری کە ڕاســابێ، لە دوورەوە لێــــــــــــی دێ ورشــــە
گوڵاوێکە لە پاکیدا، لە ناو جامــــــــــــــــــــــدا کە دەیبینی
دەریــای چــاوی خومــارێکە هێنـد مەســـــتە دەڵێی پەرۆشــــە

"ســوعدان بە دە کۆیلەی گوت: مەیان بۆ بێنن، دەســتیان بە خواردنەوە کرد. غەریب بە هۆی کاریگەریی مەیەکەوە وازی لە بەزم و ئاهەنگەکە هێنا و کەوتەوە یادی مەهدییە و ئەم دوو بەیتەی گوت:

یادی بە خێر جاری جاران دڵماڵی لە گـــــــــــــــەڕەکتان بوو
تۆز و خۆڵی دەرکی ئێوە، بۆم کلە و ســـــــــــــــۆمای چاوان بوو
قەت پێم وا نەبوو ڕۆژێ بێ، هـــــــــــــــــەڵبکەم لەم ژینە بێ یار
چیبکەم خۆزگەم وەدی نەهــات، هەرچەنـد هەوڵم بێ وچــان بوو

"بە کورتی، هەتا سێ ڕۆژان خواردیان و خواردیانەوە و بەزم و ئاهەنگیان گێڕا. دوایە گەڕانەوە کۆشکەکە و غەریب سەهیمی برای بانگ کرد و پێی گوت: 'سەد سوار لەگەڵ خۆت ببە و بچۆرەوە لای دایک و باوکت و بیانهێنە ئێرە با چەند ڕۆژێک خۆشی ڕابوێرن و منیش شازادە فەخرتاج دەبەمەوە لای باوکی.' ئەوجار بە دێوەشی گوت: 'سوعدان! تۆش هەر لەم قەلایەدا بمێنەوە تا من دەگەڕێمەوە لات.' سوعدان گوتی: 'ئەی باشە بۆچی من لەگەڵ خۆت نابەی؟' غەریب گوتی: 'لەبەر ئەوەی تۆ کچی شاپوورشات دیل کردووە. ئەگەر چاوی پێت بکەوێ، گۆشتت دەخوا و خوێنت دەخواتەوە.' دێوە دایە قاقای پێکەنین و گوتی: 'قوربان، بە گیانی تۆ قەسەم، ئەگەر هەموو عەجەم و دەیلەم بۆم بێن، ناهێڵم تاقیان دەر چن.' غەریب گوتی: 'ڕاست دەکەی، لە دەستت دێ. بەڵام هەر لە قەڵاکەتدا بمێنەوە تا من دێمەوە.' سوعدان گوتی: 'بەسەر چاو، گەورەم.' سەهیم گەڕاوە بۆ لای بەنی قەحتان. غەریبیش لەگەڵ دەستوپێوەندەکانیدا فەخرتاجیان بردەوە. کاری ئەوان بێرە گەیشت.

"شاپوورپاشا چاوەڕێ بوو، کچەکەی لە ئاگردانی پیرۆز بگەڕێتەوە. وا بوو کاتی هاتنەوەی هات و فەخرتاج نەگەڕاوە. شاپوور چل وەزیری هەبوو و سەرۆکوەزیرانی بانگ کرد و پێی گوت: 'ئەوە کچەکەم نەگەڕاوە و کات تێپەڕی. تاقمێک بنێرە بۆ ئاگردانەکە و هەواڵێکی لێ بزانە.' لەڕێوە وەزیر فەرماندەیەکی بانگ کرد و ناردی بۆ ئاگردانی پیرۆز. نێردراو گەیشتە ئاگردان و هەواڵی فەخرتاجی لە مووغەکان پرسی. مووغەکان گوتیان: 'ئەمساڵ فەخرتاج نەهاتووەتە ئێرە.' فەرماندە گورج گەڕاوە و وەزیری چی بیستبوو بۆ وەزیری گێڕاوە. وەزیر بە پەشۆکاوی چوو بۆ لای پاشا و قسەی مووغەکانی بۆ گێڕاوە. پاشا ڕەنگی تێک چوو و تاجی لە سەری فڕێ دا و بە چەپۆک بەر بووە سەروگوێلاکی خۆی تا لە هۆش خۆی چوو. گوڵاویان بەسەردا هەڵپڕژاند تا وە هۆش هاتەوە و بە دڵێکی پڕ خەمەوە گریا و گوتی:

کچم ئەمن سۆماییم بۆ بینینی تـــــــــــۆ دەوێ
گەر تۆ لە ژیندا نەبی، ســــــــــۆمایی و ژینم ناوێ
خۆشـــی و شـــانازی دونیا، هەمووی بە تۆوە خۆشـــە
ژیان تۆی تێدا نەبێ، کاولاشێــــــــــــکە و نامەوێ
بزەی شیرین و جوانت، ژینی شیــــــــــرین کردبوو
سووکنایی و ئارامیم بووی، دڵ لە سوێی تۆ ناسرەوێ

"ئەوجار دە فەرماندەی بانگ کرد و فەرمانی پێ دان؛ دەهەزار سوپا سوار بن و هەر فەرماندەیەک بۆ وڵاتێک بچێ و بە دوای شازادە فەخرتاجدا بگەڕێن و سۆراخێکی بکەن. دەمودەست فەرماندەکان هەریەکە و بەرەو وڵاتێک وەڕێ کەوت. با ئەوان بڕۆن بگەڕێن."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی شەشسەد و سی و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! شاپوورشا سوپای نارد بە دوای فەخرتاجدا بگەڕێن. غەریب و سوارەکانیشی دە ڕۆژ بوو بەڕێوە بوون و لە ڕۆژی یازدەیەمدا لە دوور تەپوتۆزێکی زۆری بینی. بە یەکێک لە فەرماندە عەجەمەکانی گوت دا بچووە بزانە ئەو تەپوتۆزە چییە. نێردراوەکە ئەسپی بەرەو تەپوتۆزەکە غاردا چوو هەواڵی پرسین. گوتیان: 'ئێمە لە هۆزی بەنی هەتالین و گەورەکەمان سەمسامی کوڕی جەڕڕاحە و پێنج هەزار سوارین و بە دوای دەستکەوتدا دەگەڕێین.' نێردراو گەڕاوە لای غەریب و بۆ گێڕاوە. غەریب بە سوارانی بەنی قەحتان و عەجەمی گوت کە بۆ شەڕ ئامادە بن. ئامادە بوون و وەڕێ کەوتن تا گەیشتنە عەرەبەکان. وا بوو هەر دوورەوە هاواریان کرد: 'دەستکەوت، دەستکەوتە!' ئەوجار غەریب هەرای لێ کردن: 'ئەی سەگگەلی عەرەب، ئەو خودایە ڕسوا و سەرشۆڕتان بکا!' هێرشی کردن و ناوی خودای لێ هێنا. لە نێوان ئەو دوو کۆمەڵەیەدا شەڕێکی قورس ڕووی دا و تا دەمەو ئێوارە لە یەکیان دا و لێکدییان کوشت.

"کە تاریکی باڵی بە سەر زەویدا کێشا، هەردوولا لێک جیا بوونەوە. غەریب سوپاکەی بە سەر کردەوە. سەیری کرد پێنج کەس لە بەنی قەحتان و حەفتا کەس لە عەجەمەکان کوژراون و لە سوپاکەی سەمسامیش زیادتر لە پێنجسەد کەس کوژرابوون. سەمسام بە خۆی گوت: 'لەوەتی هەم شەڕی وەک شەڕی ئەم لاوەم نەدیوە. جارێ بە شیر و جارێ بە ڕمب شەڕ دەکا. بەڵام سبەینێ، بۆخۆم شەڕی لەگەڵ دەکەم و دەیکوژم و شەڕەکە تەواو دەکەم.' غەریب کە گەیشتەوە نێو خەڵکەکەی، شازادە فەخرتاج بە پێشوازییەوە چوو و بەم ڕووداوە زۆر خەمبار بوو، تۆزێ ترس لە ڕوخساری نیشتبوو. هاتە پێشەوە و ڕکێفی ئەسپەکەی ماچ کرد و پێی گوت: 'ئەی سەرداری دلێران و بەهێزترینی ئازایان، دەستت نەڕزێ و دژمنانت خۆشییان نەیەتە ڕێ.' سپاس بۆ ئەو خودایە کە بە سەلامەتی لەو تەنگەژە و هەرایە بە ساغ و سەلامەتی گەڕایەوە. زۆرم خەمی تۆ بوو. کە غەریب ئەم گوتەیەی بیست، بزەی هاتێ، دڵخۆشی داوە و گوتی: 'ئەی شاژنی جیهان، خەمت نەبێ. ئەگەر ئەم دەشتە پڕ بێ لە دژمن، بە یارمەتی خودا هەمووی لەنێو دەبەم.' فەخرتاج سپاسی کرد و دۆعای سەرکەوتنی بۆ کرد. غەریب لە ئەسپەکەی هاتە خوارێ، تۆزی ڕووخساری تەکاند و خوێنی دوژمنانی لە دەستی شۆردەوە و نۆبەداری لە دەوری هێزەکەی دانا. ئەو شەوە نووستن. کە ڕۆژ بووەوە، هەردوولا سوار بوون و لە گۆڕەپاندا ڕیزیان بەست. یەکەم کەس کە ئەسپی لە گۆڕەپاندا تاو دا، غەریب بوو. چووە گۆڕەپان و لە دوژمن نیزیک بووەوە و هەرای کردنێ: 'ئەرێ پاڵەوانتان تێدایە؟!' وا بوو، یەکێک لە پاڵەوانەکانیان بۆی هاتە مەیدان و پەلاماری غەریبی دا و گورزێکی ئاسنینی بیست مەنی

بە دەستەوە بوو. گورزێکی داهێنایە غەریب، باش بوو خۆی لادا وە زەوی کەوت و نیزیک مەترێک لە زەوی چووە خوارێ. هێشـتا ئەو پاڵەوانە گورزەکەی هەڵنەهێنابووەوە کە غەریب ڕمبێکی لێ دا و نێوچەوانی تلیشی برد و بەرێی دۆزەخی کرد.

"پاشـان غەریب داوای پاڵەوانێکی دیکەی کرد. یەکێکی دی بۆ ملە هاتە گۆڕەپانەوە و کوژرا و تا دە کەس هاتن و کوژران. کە دوژمنان ئازایەتی غەریبیان دیت، خۆیان بۆ نەگیرا و هەڵاتن. گەورەکەیان خوێن بەری چاوی گەت و خۆی هاتە مەیدانەوە و بەرانبەر بە غەریب ڕاوەستا و پێی گوت: 'سەگی عەرەب، تۆ وات لێ هات، پیاوانی من بکوژی؟' غەریب گوتی: 'دمت گرێ بدە و دەست بکەوە.' سەمسام پەلاماری دا و غەریبیش بە دڵێکی ڕەقتر لە بەرد بەرەنگاری بووەوە. هەردووکیان ئازایانە بە گژ یەکدا چوون و زیاد لە حەفتا جاریان ڕمب و زەرگ تێک گرت. هەردوو سوپاکە سەریان لە شەڕی ئەو دووانە سوور مابوو. وا بوو لە ناکاو غەریب ڕمبێکی تێ هەڵکرد و تەپڵی سەری پاڵەوانەی گرت و تەختی زەویی کرد. سوپاکەی کە ئەوەیان دی، هێرشیان کردە سەر غەریب. غەریبیش بەرەنگایان بووە و یەکبەخۆی نەڕاندی و گوتی: 'ئەڵڵاهوئەکبەر! کافران بەو دروشمە نەترەیان چوو!'
"

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و سی و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! غەریب ئەویشی کوشت. که دژمنان ناوی خودایان بیست، به یەکتریان گوت: 'ئەم گوتەیە چییە که دڵمانی وه لەرزه خست و ئاوا بێ هێزی کردین ؟ لەوەتی هەین شتی وامان نەبیستووە!' ئیدی له نێو خۆیاندا له سەر ئەوه ساغ بوونه که: 'باش وایه دەست له شەڕ هەڵبگرین و ده کەس بنێرینه لای ئەوم لاوه و پرسیاری ئەو ناوەی لێ بکەین که به زمانیاندا هێنا.' ئەوجار ده کەسیان له ناودارانی سوپا نارد. نێردراوەکان چوونه لای غەریب و کڕنۆشیان بۆ برد و نزایان بۆ کرد. غەریب لێی پرسیان: 'بۆچی وازتان له شەڕ هێنا؟' گوتیان: 'قوربان، تۆ بەو وشانه ئێمەت شیواند و دڵمان داکەوت.' غەریب گوتی: 'ئێوه کێ دەپەرستن؟' گوتیان: 'یەغووس و یەعووق.' غەریب گوتی: 'ئێمه خودای تاک و تەنیا دەپەرستین که بەسەر هەموو شتێکدا زاڵه. هەموو شتێکی ئافراندووه و ڕۆزیی کۆیلەکانی دەدا. ئەوه ئاسمانی هەڵداوه و زەویی ڕاخستووه.' ئەوان که گوتەکانی غەریبیان بیست، دڵیان کراوه و ئارەزوویان بۆ باوەڕهێنان به خودای تەنیا زیاد بوو و گوتیان: ' خودای بەڕاستی و ڕەها ئەمەیە.'

"دوایی به غەریبیان گوت: 'چی بڵێین تا بێینه سەر دینی ئێوه؟' گوتی: 'بڵێن، لائیلاهه ئیللەڵلا، ئیبراهیم خەلیلوڵلا.' ئیدی ئەو ده کەسه موسڵمان بوون و غەریب پێی گوتن: 'ئێستا بڕۆنەوه بۆ لای هۆزەکەتان و باسی ئیسلامیان بۆ بکەن و ڕێی ڕاستیان پیشان بدەن.' ئەوان لەڕێوه چوونەوه بۆ نێو هۆزەکەیان و ڕێوشوێنی ئیسلامەتیان بۆ باس کردن و بنەماکانیان بۆ شی کردنەوە. ئەندامانی هۆزەکەش له ناخی دڵیانەوه ئیسلامیان قەبووڵ کرد و قایل بوون ببنه فەرمانبەری غەریب. ئەوجار هەموو هاتن بۆ لای غەریب و نزای سەرکەوتن و پایەبەرزییان بۆ کرد. ئینجا گوتیان: 'قوربان، ئێمه بەردەستی تۆین و هەر چییەکت دەوێ فەرمانمان پێ بکه له ژێر فەرمانی تۆ داین و هەرگیز لێت جیا نابینەوه؛ ئاخر خودا تۆی کرده مایەی ڕێنوێنیمان.' غەریب دڵخۆشی دانەوه و پێی گوتن: 'بەگەڕێنەوه ماڵەکانی خۆتان و ماڵ و منداڵتان لەگەڵ خۆتان بێنن و بچن بۆ شیوی گولان. من شازاده فەخرتاج دەبەمەوه لای باوکی و دەگەڕێمەوه.' ئەوانیش گوتیان: 'بەسەر چاو، قوربان.'

"ئیدی ئەوان گەڕانەوه نێو هۆزەکەیان و به موسڵمانبوونیان دڵخۆش بوون. ئیسلامیان به هۆزەکەیان ناساند و ئەوانیش موسڵمان بوون. ئەوجار تاوڵ و ڕەشماڵ و سامانیان لەگەڵ خۆیان برد و چوون بۆ شیوی گولان. که لەوێ نیزیک بوونەوه، دیوی کێوی و منداڵەکانی به پیرییانەوه چوون و به ڕوویەکی خۆشەوه پێشوازییان لێ کردن و هەواڵیان پرسین. ئەوانیش بەسەرهاتی خۆیانیان بۆ گێڕانەوه. سوعدان به هاتنیان دڵخۆش بوو و له

شوێنێکی باشدا نیشتەجێی کردن و زۆری چاکە لەگەڵ کردن.

"غەریبیش لەگەڵ شازادە فەخرتاجدا درێژەیان بە سەفەرەکەیان دا. پێنج ڕۆژ ڕۆیشتن. ڕۆژی شەشەم کە غەریب بیستی شاپوورشا بە دوای شازادە فەخرتاجدا دەگەڕێ، فەرمانی دا کە لا بدەن و تاوڵ هەڵبدەن. ئازایانی بەنی قەحتان و سوپای عەجەم لایان دا و تاوڵیان هەڵدا تا وا بوو، سوپای شاپوورشا گەیشت. پیاوانی عەجەم کە لە سوارانی شازادە فەخرتاج بوون، بە پێشوازییانەوە چوون و هەواڵی هاتنەوەی شازادە فەرخرتاجیان بە فەرماندەی سوپاکە دا. ئەو چاکانەی لە میر غەریبیان دیبوو، بۆیان گێڕانەوە. فەرماندەی سوپاکە هاتە لای میر غەریب و سەری ڕێزی دانەواند و هەواڵی شازادە فەخرتاجی پرسی. غەریب ئەوی ناردە تاوڵی شازادە. فەرماندە چووە تاوڵەکەی و بەردەرگەکەی ماچ کرد. هەموو ئەو شتانەی بۆ شازادە گێڕاوە کە دوای ئەو بەسەر دایک و باوکیدا هاتبوون. شازادەش بەسەرهاتی خۆی و چۆنیەتی ڕزگاربوونی لە دێوەکە بە هۆی میر غەریبەوە بۆ گێڕاوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی شەشسەد و سی و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـکۆ! شـازادە گوتی: 'ئەگەر بەزەیی خودا و یارمەتی غەریب نەبوونایە، دێوەکە دەیخواردم. ئێستا ئەرکی سەر شانی باوکمە کە نیوەی وڵاتەکەی بە نێوی ئەوەوە بکا.' پاشان فەرماندە هەستا و چووە کن غەریب، دەستی ماچ کرد سپاسی چاکەکانی کرد و گوتی: 'گەورەم، دەمەوێ بە مۆڵەتی جەنابتان بگەڕێمەوە شـاری ئەسـبانیری مەدایین و مژدە بدەم بە پادشـا.' غەریب گوتی: 'بڕۆ مژدەی لێ وەرگرە.' ئیدی فەرماندە خێرا وەڕێ کەوت و بە غاردان ڕۆیشـت هەتا گەیشـتە شـاری ئەسـبانیری مەداین. چووە هەنتەشـی پادشا و کورنۆشی برد. پاشا گوتی: 'ها، دەڵێی خەبەری خۆشت پێیە! بڵێ بزانم چ باسە؟' فەرماندە گوتی: 'تا مژدەم نەدەیتێ، هیچ ناڵێم.' پاشـا گوتی: 'تۆ هەواڵە خۆشـەکەت بڵێ، منیش خۆشـحاڵت دەکەم.' فەرماندە گوتی: 'پاشـام، چاو و دڵت ڕوون، شـازادە فەخرتاج هاتەوە.'

"کە شاپوور ناوی فەخرتاجی کچی بیست، بووراوە. گوڵاویان پێدا هەڵپرژاند، وە هۆش هاتەوە، بانگی فەرماندەی کرد، بردییە لای خۆی و گوتی: 'دەی قسـەم بۆ بکە.' فەرماندە بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕاوە. کە پاشا ئەو قسانەی بیست، دەستەکانی بە یەکدا هێنان و ئاخی بۆ دۆخی فەخرتاج هەڵکێشـا. ئەوجار دەهەزار دیناری زێڕی سـووری دا بە فەرماندەکە و کردیە فەرمانداری ئیسـفەهان و دەوروبەری. ئەوجار بە فەرماندە و گەورەکانی سـوپای گوت کە بچن بە پێشوازیی شازادەوە. کۆیلەکان چوونە کن دایکی شازادە و داوای مژدەیان لێ کرد. دایکی دڵخۆش بوو و کەوایەکی گرانبایی و هەزار دینـاری زێڕی سـووری بە مژدەدەر دا. کە خەڵکی شـار هەواڵەکەیان بیسـت، شـاریان ڕازاندەوە و ئاهەنگیان گێڕا. شـاپوورشـا سـوار بوو و ڕۆیشـت ڕۆیشـت تا غەریبی بینی. لە جێوە دابەزی و چەند هەنگاوێک بە پێ بە پێشوازییەوە چوو. غەریبیش دابەزی و ڕووبەڕووی پاشا هات.

"کە پێک گەیشـتن، یەکدییان لە باوەش گرت. غەریب دانەوییەوە و دەسـتی پاشـای ماچ کرد. پاشـا سـپاسـی چاکەی کرد. تاوڵیان بەرانبەر یەکدی هەڵدا و شـاپوورشـا چووە لای کچەکەی و باوەشی پێدا کرد. شازادە فەخرتاج هەموو بەسەرهاتی خۆی بۆ باوکی گێڕاوە و باسی جوامێری غەریبی کرد. باوکی گوتی: 'ئەی شاینازاران، ئەی خۆری جوانان، سوێند بە گیانی تۆ دەبێ ئەوەندەی شـت دەمێ و چاکەی لەگەڵ بکەم، لە باس نەیە.' کچە گوتی: 'بابە، بیکە بە زاوای خۆت تا لە شـەڕی دژمناندا یارمەتیت بدا، ئاخر زۆر زۆر ئازایە.' شـازادە ئەم قسـەی لەبەر ئەوە کرد کە شـەیدای پێکەوتەیی و دلێری غەریب ببوو. پادشـا گوتی: 'کچم، مەگەر نازانی کە پاشـای شـیراز چەندین فەرشـی دیبای ڕاخسـتووە و

سـەدهەزار زێڕی بەخشـیوە و خاوەنی سـەرزەمین و سـوپای بێئەژمارە؟' شـازادە گوتی: 'بابە، ئەو کەسەی باست کرد، من ئەوم ناوێ و ئەگەر ناچارم بکەی شوو بەو بکەم، خۆم دەکوژم.' ئەوجار پاشـا لای فەخرتاج هاتە دەرەوە و چووە تاوڵی غەریب. غەریب لە بەری هەستا و پاشا دانیشت. بەڵام چاوی لێ کلا نەدەکرد و لە بینینی تێر نەدەبوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'بە خودا کچەکەم ناهەقی نییە کە ئەم لاوەی خۆش دەوێ.' دوایی نـانیـان هێنـا و خواردیان و خەوتن.

"کە ڕۆژ بووەوە، سوار بوون و گەڕانەوە بۆ شار. کە گەیشتنە شار، شاپوور و غەریب پێکەوە لە دەروازەوە چوونە شـار. ئەو ڕۆژە فرە لە شـادیدا بوون و بە هاتنەوەی فەخرتاج شادمان بوون و ئاهەنگ گێڕا. شاپوور لەسەر تەخت دانیشت و غەریبی لەتەنیش خۆیەوە دانا. وەزیر و بریکار و گەورەکانی دەوڵەت و پەردەدارەکان ڕیزیان بەسـت و پیرۆزبایی گەڕانەوەی شازادەیان لە پاشا کرد. پاشا بە گەورەگەورەکانی وڵاتی گوت: 'هەرکەس منی خۆش دەوێ، با غەریب خەڵات بکەن.' ئیدی وەک باران خەڵاتی بەسـەردا داباری. تا دە ڕۆژ میوانداری لە غەریب کرا. ئەوجار غەریب ڕوخسـەتی خواسـت بگەڕێتەوە. پادشـا جلوبەرگێکی شـکۆمەندانەی پێ بەخشـی، بە دینی خۆی سـوێندی دا کە تا یەک مانگ نەگەڕێتەوە. غەریب گوتی: 'جەنابی پادشـا، من کچێکی عەرەبم خواسـتووە و دەمەوێ بگەڕێمەوە ئەوێ، زەماوەند سـاز بکەم و ئەو کچە بێنم.' پادشـا گوتی: 'دەسـگیرانی تۆ باشـترە یا فەخرتاج؟' غەریب گوتی: 'قوربان، زێڕ لە کوێ و خاک لە کوێ؟ کەنیز و خانم کەی دەبنە یەک؟' پاشـا گوتی: 'مادەم تۆ فەخرتاجت لە دەسـتی ئەو دێوە ڕزگار کردووە، ئەوە بووەتە کەنیزی تۆ و جگە لە تۆ کەس بۆی نییە ببێتە مێردی.' دەمودەسـت غەریب هەستا زەویی ماچ کرد و گوتی: 'گەورەم، تۆ پاشـایت و من گەدا. ڕەنگە داوای مارەییەکم لێ بکەی کە بە من هەڵنەسووڕێت.' پاشـا گوتی: 'ڕۆڵە، با بزانی کە پادشـای شـیراز داوای فەخرتاجی کرد و سـەدهەزار زێڕی سـووری دا، بەڵام من تۆ بە شـیاوی ئەو دەزانم و تۆ دەکەمە تیری وڵات و مەتاڵی بەردەم ڕووداوەکان.'

"دوایی ڕووی لە سـەرانی وڵات کرد و گوتی: 'ئەی گەورەکانی وڵاتەکەم، ئێوە شـایەد بن کە فەخرتاجم دا بە غەریب.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی شەشسەد و سی و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! ئەوجار غەریب بە پادشای گوت: 'مارەبییەکم بۆ دابنێ تا بۆت بێنم، ئاخر لە قەڵای ساسی کوڕی شیسی کوڕی شەددادی کوڕی عاد ماڵ و سامانێکی بێژمارم هەیە.' شاپوور گوتی: 'کوڕم، من جگە لە سەری جومەرقانی پادشای ئەهواز، ماڵ و سامانم وەک مارەیی لە تۆ ناوێ.' غەریب گوتی: 'قوربان، من دەچمەوە لای هۆزەکەم و لەگەڵ ئەواندا دێمەوە و هێرش دەکەمە سەر دوژمن و وڵاتەکەی وێران دەکەم.' پاشا ستایشی کرد؛ گومانی وا بوو ئەگەر غەریب بۆ جومەرقان بچێ، بە زیندوویی ناگەڕێتەوە. کە ڕۆژ بووەوە، پادشا سوار بوو، بە غەریبیشی گوت کە سوار بێ و سوپاش سوار بوون. پادشا بە سوارچاکانی گوت خەریکی ڕمبازی و جریتبازی بن. پاڵەوانانیش پێکەوە سەرقاڵی مەشق و ڕاهێنان بوون. غەریب گوتی: 'پادشام، دەمەوێ لەگەڵ پاڵەوانانی عەجەم یاری بکەم، بەڵام مەرجێکم هەیە. ئەویش ئەوەیە کە ڕمبێکی بێ نووکم بدەنێ و پەڕۆکۆنێکی لە نووکەکەی بەستن کە زەعفەرانی پێدا کرابێ. هەر پاڵەوانێکت هەیە بۆ بەرەنگاری بۆم بنێرە با ڕمبێکی نووکداریشی پێ بێ، ئەگەر بەسەرمدا زاڵ بوو، خوێنی خۆمی حەڵاڵ دەکەم، ئەگەر منیش بەسەریدا زاڵ بووم، بە ڕەنگی زەردی زەعفەرانی ڕمبەکەم نیشانەیەک لە سەر سنگی دەدەم.' ئەوجار پادشا بانگی لە سوپاسالار کرد کە ناودارانی سوپا جودا بکاتەوە. هەزار و دووسەد کەسی جودا کردەوە. پادشا بە زمانێکی تایبەت پێی گوتن کە هەرکەس ئەم دەشتەکییەم بۆ بکوژێ، هەر ئاواتێکی هەبێ، بۆی بەدی دێنم. ئەوجار پاڵەوانان لە غەریب چوونە پێشێ و هێرشیان کردێ. غەریب پشتی بە خودا بەست و داوای یارمەتی لە ئیبراهیمی خەلیل کرد. ئەو پاڵەوانەی بۆ غەریب چووبوو، دەرەقەتی نەهات و غەریب نیشانەیەکی زەردی لەسەر سنگی دا. کاتێک ویستی لە دەستی هەڵێ، غەریب بە ڕمبەکە لە ملی دا و لەسەر ئەسپەکەی بەری داوە. کۆیلەکان ئەویان هەڵگرتەوە. ئەوجار پاڵەوانێکی دیکە هاتە گۆڕەپان و، نیشانەی لە سنگی ئەویش دا. سێیەمین و چوارەمین و پێنجەمینیش بۆی هاتن و ئیدی هەر ئاوا پاڵەوانان دانەدانە دەهاتن و غەریب نیشانەی لێ دەدان تا وا بوو بەسەر هەموویاندا سەر کەوت و لە گۆڕەپانەکە هاتە دەرەوە و هاتن لە دیوەخاندا دانیشتن، سفرەیان ڕاخست و نانیان خوارد. ئەوجار پاشا داوای مەی کرد و خەریکی مەیخواردنەوە بوون. لەو دەمەدا غەریب ئاوەزی لای خۆی نەما و لە کۆڕەکە چووە دەر و بە مەستی ڕۆیشت تا گەیشتە کۆشکی شازادە فەخرتاج. شازادە کە ئەوی دی، لە خۆشییاندا هۆشی لای خۆی نەما. دەنگی کەنیزەکانی دا و پێی گوتن خێرا بچنەوە هۆدەکانیان. کەنیزەکان بە لەز بڵاوەیان کرد. شازادە هەستا دەستی غەریبی ماچ کرد و پێی گوت: 'ئافەرین بۆ ئەو سەروەرەی منی لە دێو ڕزگار کرد و من تا هەم کەنیزی ئەوم.'

شازاده بردییه خەوگەی خۆیەوە. دوای دەستبازی و قانەقدیلە غەریب هەوەسی بەسەریدا زاڵ بوو لەگەڵیدا تێ خزی و کردی بە ژن و تا بەیانی لای خەوت.

"بۆ بەیانی غەریب چووە لای پادشا. پادشا لە بەری هەستا و لەپاڵ خۆیدا دایینیشاند. ئەوجار گەورەکانی وڵات هاتن و لە هەنتەشی پاشادا ڕاوەستان و باسی ئازایەتی غەریبیان کرد و دەیانگوت: 'پاک و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی بەو تەمەنە کەمەوە ئەوە هەموو ئازایەتی و نەترسییەی تێدا خوڵقاندووە.' ئەوان لەو قسانەدا بوون کە لە دوور تەپوتۆزێک وە دیار کەوت بەری ئاسمانی گرت و بەرەو شاریش دەهات. پاشا بانگی کرد: هەواڵێک لەو تەپوتۆزە بزانن. خێرا سوارێک دەرچوو و هەواڵی زانی. گەڕاوە و گوتی: 'پادشام، ئەوە تەپوتۆزە سەد سوارن کە گەورەکەیان ناوی سەهیموللەیلە.' کە غەریب ئەوەی بیست، گوتی: 'قوربان، ئەوە برای منە.' گورج غەریب سوار بوو و سەد سوار لە بەنی قەحتان و هەزار سوار لە عەجەم لەگەڵی وەڕێ کەوتن و بەرە پیری سەهیم چوون. کە گەیشتنە یەک هەردوو برا دابەزین و یەکتریان لە باوەش گرت. پاشان سوار بوونەوە و غەریب گوتی: 'ئەرێ برا، خزم و کەسی خۆتت بردە قەڵای ساس و شیوی گوڵان؟' سەهیم گوتی: 'برا، ئەو سەگە پیسە، ئەو مەرداسە گڵاوە کە زانی تۆ دەستت بەسەر قەڵای دێوەکەدا گرتووە، ئەوەندەی دیکە باری گران بوو. لە ترسی ئەوەی نەکا تۆ مەهدییەی کچی لێ بستێنی، دەستوپێوەندی خۆی برد و بەرەو عێراق چوون. داوای یارمەتی لە عەجیبپاشا کردووە و دەیەوێ مەهدییەی بداتێ.' کە غەریب ئەو قسەی سەهیمی بیست، هێندە نارەحەت بوو خەریک گیانی دەرچێ. گوتی: 'قەسەم بە ئیبراهیمی خەلیل بەرەو عێراق دەچم و لەوێ دەیان شەڕ هەڵدەگیرسێنم.' بە دم قسەکردنەوە گەیشتنەوە شار و لەگەڵ براکەیدا چوونە لای پادشا. پادشا لە بەر غەریب هەستا. ئەوجار غەریبپاشای لە ڕووداوەکە ئاگادار کردەوە و مۆڵەتی ڕۆیشتنی لێ خواست. کە پادشا ڕوخسەتی دا ڕۆیشت تا گەیشتە قەڵای ساس. دێوی کێوی و منداڵەکانی بە پیر غەریبەوە هاتن و پێیان ماچ کرد. غەریب لە بابەتەکەی ئاگادار کردنەوە. سوعدان گوتی: 'قوربان، تۆ لە قەڵاکەدا دانیشە با من و منداڵەکانم بچین عێراق کاول بکەین و هەموو سوپاکەیان دەستگیر بکەین و بیانهێنینە خزمەتت.' غەریب گوتی: 'سوعدا، هەموومان پێکەوە دەچین.' سوعدان فەرمانی ڕۆیشتنی دا و هەزار سواریشی بۆ پاسەوانی قەڵاکە جێهێشت. ئەوجار هەموو بەرەو عێراق وەڕێ کەوتن. کاری ئەوان بێرە گەیشت.

"میر مەرداسیش لەگەڵ هۆزەکەیدا وەڕێ کەوتن و گەیشتنە عێراق. دیاریی باشی ئامادە کردبوو و لە کووفە خستییە خزمەتی عەجیبپاشا و کڕنۆشی برد و زەویی ماچ کرد و داوای لێ کرد داڵدەی بدا."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی شەشسەد و سی و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! کە مەرداس داوای دالّدەی لە عەجیب کرد، عەجیب گوتی: 'کێ ستەمی لێ کردووی تا ستەمت لەسەر لا بەم، گەرچی شاپوورشـای عەجەم و پاشـای دەیلەمیش بێت؟' مەردەاس گوتی: 'پاشـــام، کەس ســـتەمی لێ نەکردووم، منالّێک نەبێ کە بخۆم گەورەم کردووە. لەگەڵ دایکی لە قامیشـەلانێکدا دۆزیمەوە. دایکیم هێنا و ئەو ژنە لە من کوڕێکی بوو کە ناوم نا ســـەهیمولله‌یل. کوڕی ئەو ژنەش ناوی غەریب بوو. جا ئەو کوڕە لە مالّی مندا گەورە بوو. کەچی ئێســـتا وەک مار لە لاقم ئالاوە. میر حەســـــانی گەورەی بەنی تیهانی کوشـتووە و چەندین پیاوی دیکەشـی لەنێو بردووە و کەس بەرگەی ناگرێ. من کچێکم هەیە کە جگە لە تۆ شـــایانی کەس نییە. غەریب داوای ئەو کچەی لێ کردم. منیش لەبری مارەییەکەیدا داوای ســـەری دێوی کێویم کرد. ئەو کوڕە چوو بۆو دێوە و بە دیلی گرت. ئێستا دێو یەکێکە لە خزمەتکارەکانی. بیستووشمە کە موسڵمان بووە و خەڵک بۆ دینی خۆی بانگ دەکا. کچی شاپوورشای لە دەستی دێوەکە ڕزگار کردووە و بووەتە خاوەنی قەڵای ساسـی کوڕی شـیسـی کوڕی عاد کە هەرچی گەنجینەیە تێیدایەتی. گەنجینەی سسەردەمانی زووی تێدایە. ئەو کوڕە کچی شاپوورشای بردووەتەوە بۆ باوکی. جا لەوێ ئەگەر بێتەوە، بە ســـەر و ســـامانێکی زۆرەوە دێتەوە.' کە عەجیب گوتەکانی مەرداسـی بیسـت، ڕەنگی زەرد بوو و حالّی تێک چوو و خۆی بۆ مردن ساز کرد. ئەوجار عەجیب گوتی: 'مەرداس، دایکی ئەو لاوە لای تۆیە یان لای ئەو؟' مەرداس گوتی: 'لای منە لە تاوڵەکەمدایە.' عەجیب پرســـی: 'ناوی چییە؟' مەرداس گوتی: 'ناوی نوســـرەتە.' عەجیب گوتی: 'دا بیهێنە.' کە هێنایان، عەجیب ســـەیری کرد و ناســـییەوە و گوتی: 'هەی گلاو، ئەو دوو کۆیلەیە چییان لێ هات کە لەگەڵ تۆم ناردن؟' نوســـرەت گوتی: 'لەســـەر من یەکتریان کوشـــت.' عەجیب لە جێوە شـــیری هەڵکێشـــا و دوو لەتی کرد. ئەوجار ترس و دڵەڕاوکێ هەناویان کوڵی و گوتی: 'مەرداس، کچەکەتم لێ مارە کە.' مەرداس گوتی: 'ئەو یەکێکە لە کەنیزەکانت و منیش کۆیلەتم.' عەجیب گوتی: 'ئاخر من نیازم ئەوەیە ئەو غەریبە شیرپیسە ببینم و ئازاری جۆراوجۆری پێ بچێژم و ئینجا بیکوژم.' سیهەزار دیناری زێڕی سووری مارەیی دا بە مەرداس و ســـەد تۆپ حەریری پەراوێز زێڕینی خەلات کرد. مەرداس ئەو مارەییە زۆرەی وەرگرت و سەرقاڵی گیازی مەهدییە بوو. کاری ئەمان بێرە گەیشت.

"لەو لاوە غەریبیش چووە قەڵای دێوی کێوی. دوایی گەیشـتە دوورگەیەک لە عێراق کە شارێکی گەورە و شوورە قایم بوو. غەریب فەرمانی بە سوارەکان دا کە لەوێ لا بدەن. کە خەڵکی شـــار دیتیان ئەو ســـوپایە لای دا، دەروازەکانی شـــاریان داخســـت و کۆنگرەکانی چاودێرییان توند کرد. پادشـــایان لە بابەتەکە ئاگادار کردەوە. پاشـــا لە بەرجەوەندی

کۆشکەوە سەیری کرد، سوپایەکی زۆروزەبەندی دی و گوتی: 'باشە ئەم عەجەمانە چییان دەوێ؟' گوتیان: 'نازانین!'

"ئەو پادشـایە ناوی دامیغپاشـا بوو. لە گۆڕەپانی جەنگدا سـەری سـوارچاکانی لە بەرد دەدا و بەسـەر پاڵەوانانیدا زاڵ دەبوو. یەکێک لە خزمەتکارەکانی پیاوێکی زۆرزان بوو بە ناوی سـەبعوقەفار. هێند چالاک بوو لە ڕەشـەبای دەکرد. پاشـا پێی گوت: 'خێرا بچۆ نێو سـوپاکەوە و هەواڵم بۆ بێنەوە.' ئەو کابرا چالاکە تیژ دەرپەڕی و ڕۆیشـت و چووە نێو تاوڵەکانی سوپای غەریبەوە چەند کەس لێیان پرسی تۆ کێیت و چیت دەوێ؟ گوتی: 'من لە لایەن خاوەنی ئەم شارەوە هاتووم، ڕایانسپاردووم بۆ لای گەورەکەتان.' ئەویان بردە لای تاوڵەکەی غەریبەوە و لە هاتنی ئاگاداریان کردەوە. غەریب داوای کرد بیبەنە ژوورێ. کە لەبەردەم غەریبدا ئامادە بوو، زەویی ماچ کرد و ستایشی کرد. غەریب داواکەی لێ پرسی. گوتی: 'من پەیامهێنی خاوەنی ئەم دوورگەیەم کە برای گەنم پاشـایە.' کە غەریب ئەو قسـەیەی بیسـت، فرمێک بە چاوانیدا هاتە خوار و گوتی: 'ناوت چییە؟' کابرا گوتی: 'سـەبعوقەفار.' غەریب گوتی: 'بچۆوە بۆ لای دامیغپاشـا و پێی بڵێ کە خاوەنی ئەو تاوڵانە غەریبی کوڕی گەنمپاشـایە و هاتووە تۆڵەی خوێنی باوکی لە عەجیبپاشـای سـتەمکار بکاتەوە.' کابرا گورج ڕۆیشت و بە تاڵووکە گەڕاوە کن دامیغپاشا. کە چووە لای پاشا، بە دڵخۆشییەوە زەویی ماچ کرد. پاشا گوتی: 'سەبعوقەفار، چ هەواڵێکت پێیە؟' گوتی: 'پاشام، خاوەنی ئەم سوپایە برازاکەتە.' ئیدی هەر چییەکی لە غەریب بیستبوو، بۆ پاشای گێڕاوە. پاشا وای دەزانی خەون دەبینێ و بە سەبعوقەفاری گوت: 'سوێندت دەدەم بە خودا، ئەمەی گوتت ڕاستە یا نا؟' سـەبعوقەفار گوتی: 'سـوێند بە گیانی پیرۆزت، جگە لە ڕاسـتی هیچی دیکەم نەگوتووە.' ئیدی پادشـا فەرمانی بە گەورەکانی وڵات دا سوار بن. ئەوان و پاشـاش سوار بوون. ڕۆیشتن تا گەیشتنە تاوڵەکانی غەریب. کە غەریب لە هاتنی دامیغپاشا ئاگادار بووەوە، بە پێشـوازییەوە چوو. باوەشـیان بە یەکتردا کرد و چوونەوە تاوڵەکە و بە خۆشـییەوە دانیشـتن. ئەوجار پاشـا ڕووی لە غەریب کرد و گوتی: 'منیش مەراقی تۆڵەی باوکتم لە دڵدا بوو، بەڵام توانای بەرەنگاربوونەوەی براکەتم نەبوو؛ ئاخر سوپایەکی زۆری هەبوو.' غەریـب گوتی: 'مـامۆ، ئەوەتـا من بۆ تۆڵە هـاتووم تـا ئەو پەڵە ڕەشـە بە نێوچاوانمانەوە لا بەم.' پاشـا گوتی: 'برازا خۆشـەویسـتەکەم، تۆ دەبێ تۆڵەی دوو کەس بکەیەوە: یەکیـان بـاوکت و ئەویدیکەیـان دایکت.' غەریب گوتی: 'بۆ دایکم چی بەسـەر هاتووە؟!' پاشا گوتی: 'عەجیبی برات ئەویشی کوشت.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی شەشسەد و سی و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! دامیغپاشا رووداوەکەی دایکی غەریبی گێڕاوە و پێی گوت: 'مەرداس کچەکەی داوە بە عەجیب و ئێستا نیزیک زەماوەندیانە.' غەریب کە ئەو قسەیەی مامی بیست، ئەقڵ لە کەللەیدا نەما و بووراوە و خەریک بوو بمرێ. دوای ماوەیەک وە هۆش هاتەوە و بانگی لە سوپا کرد کە ئامادە بن. دامیغ گوتی: 'رۆڵە گیان، پەلە مەکە با منیش خۆم ساز کەم و لەگەڵت بێم.' غەریب گوتی: 'مامۆ گیان، ئارام و مارامم لێ هەڵگیراوە. تۆ خۆت ساز کە و لە کووفە پێم بگە.'

"ئیدی غەریب بە خێرایی کەوتە رێ تا گەیشتە بابل. خەڵکی ئەو شارە لە هاتنی غەریب ترسان. پاشاکەیان ناوی جەمەک بوو و بیستهەزار سواری لە بەردەستدا بوو. غەریب لەبەردەم شاری بابلدا بە سوپاکەی گوت کە بار بخەن و لا دەن. ئەوجار نامەیەکی بۆ پاشای ئەو شارە نووسی. کە نامەبەرەکەی چووە بەردەم شار، هاواری کرد: 'من نێردراوی غەریبم.' دەرگاوانەکان بردیانە لای جەمەکپاشا و لە هاتنی نێردراوەکە ئاگاداریان کردەوە. پاشا فەرمانیدا رێبکەن بچێتە ژوورێ. کە نێردراوەکە چووە هەنتەشی پادشا، زەویی ماچ کرد و نامەی غەریبپاشای داێ. پاشا نامەکەی کردەوە و خوێندییەوە. نێوەرۆکەکەی ئەمە بوو: 'پاش سپاسی پەروەردگار، ئاگادار بە کە ئەم نامەیە لەلایەن غەریبی کوڕی گەنمپاشای خاوەنی عێراقەوە بۆ جەمەکپاشا نێردراوە. جا لەگەڵ گەیشتنی ئەم نامەیەدا هیچ وەڵامێکت نابێ جگە لەوەی بوتەکان بشکێنی و باوەڕ بە خودای تاک و تەنیا بێنێ. ئەگەرنا رۆژت لێ دەکەم بە شەو. سڵاو لە کەسێ کە شوێن راستی دەکەوێ.'

"کە جەمەکپاشا نامەکەی خوێندەوە، زیرەی کرد و رەنگی زەرد هەڵگەڕا. هاواری لە نێردراوەکە کرد و پێی گوت: 'بگەڕێوە بۆ لای گەورەکەت و پێی بڵێ کە سبەینێ دەمەو بەیان من و ئەو رووبەڕووی یەکدی دەبینەوە.' نێردراو خێرا گەڕاوە و غەریبی ئاگادار کردەوە. غەریب بە سوپاکەی گوت، بۆ شەڕ ئامادە بن. ئەوجار جەمەکپاشا فەرمانی دا، تاوڵ و هۆبە رووبەڕووی سوپاکەی غەریبپاشا هەڵبدەن. سوپا وەک شەپۆلی دەریا لە شارەوە هاتە دەر. ئەو شەوە هەردوو هوردوو بەدەم ئاهەنگی شەڕەوە خەوتن. کە رۆژ بووەوە، هەردوو لا سوار بوون و ریزیان بەست و تەپڵی شەڕیان کوتا. یەکەم کەس کە بۆ شەڕی دەستەویەخە هاتە دەرەوە، دێوی کێوی بوو کە دارێکی لەرسەر شانی دانابوو. هاواری کرد: 'من سوعدانم، کێ لە خۆی رادەبینێ با خێرا بێتە شەڕم.' ئەوجار بانگی کوڕەکانی کرد: 'ئەنجینە بێنن و ئاگر بکەنەوە؛ زۆرم برسییە.' دار و ئەنجینەیان کۆ کردەوە و لە نێوەراستی گۆڕەپانکەدا ئاگریان کردەوە. ئەوجار پاڵەوانێک لە کافران بۆ ڕکابەری

هاته دەرەوە و ڕمبێکی ئاسنینی چل مەنی بەسەر شانەوە بوو. پەلاماری سوعدانی دا و گوتی: 'سوعدان دەبێ ئەوڕۆ بەلایەکت بەسەر بێنم، دایکت ڕۆڵەڕۆت بۆ بکا.' کە سوعدان ئەو قسەیەی ئەوی بیست، ڕق بەرچاوی گرت و دارێکی داهێنایە کە ڕمبەکەی خۆی گرت و هەردووکیان بوونە بەڵای گیانی و تەواوی جەستەیان تێک شکاند. سوعدان هاواری کرد: 'ئەم گوێرەکە قەڵەوەم بۆ بخەنە سەر ئاگر و بۆم ببرژێنن.' کوڕەکانی گورج کەوڵیان کرد و خستیانە سەر ئاگر و برژاندیان و بردیانە بەردەم سوعدان. سوعدان خواردی و ئێسقانی کرۆشت. کە کافران سوعدانیان ئاوا بینی، کەوتنە لەرزە و ڕەنگیان گۆڕا. بە یەکتریان گوت: 'هەرکەس بچێتە شەڕی ئەو دێوە، بەو دەردە دەچێ.'

ئیدی سوپای کافران دەستیان لە شەڕ هەڵگرت و ترسی سوعدان و منداڵەکانییان لێ نیشت و بەرەو شاری خۆیان هەلاتن. ئەوجار غەریب هاواری لە سوپاکەی کرد: 'هێرش بەرنە سەر هەلاتووان.' ئازا و لێهاتووانی عەرەب و عەجەم پەلاماری شاری بابل و سوپاکەیان دا و بیست هەزار کەسیان لێ کوشتن و چوونە شارەوە و هێرشیان بردە سەر کۆشکی جەمەکپاشا. سوعدانی دێو بە ڕمبێکی ئاسنینەوە بەرەو کۆشک چوو. جەمەکپاشا چووە پێشەوە. سوعدان ڕمبێکی لێ دا و لەوێ خستی. هەرکەس کە بۆی دەچووە پێش، لە ڕمبێک زیاتری لێ نەدەدا. ئیدی وا بوو لە نێو خەڵکەکەوە دەنگی بەزەییتان بێ و پەنامان بدەن، پەنامان بدەن بەرز بووەوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی شەشسەد و سی و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! خەڵکی شـــار داوای داڵدەیان کرد. ســـوعدانی دێو پێی گوتن کە دەســـتی جەمەکپاشـــا ببەســـتن. ســـوعدان هەمووی وەک ڕانە مەڕ وە پێش خۆی دا تـ گەیشـــتنە لای غەریب. جەمەکپاشـــا وە هۆش هاتەوە، خۆی بە دەســـتبەســـتراوی بینی و سوعدانی دێوی بە سەر سەریەوە بوو و دەیگوت: 'ئەمشەو گۆشتی جەمەکپاشا دەخۆم' کە جەمەکپاشـــا گوێی لەم قســـەیە بوو، بە غەریبپاشـــای گوت: 'پاشـــا، داڵدەم بدە' غەریبپاشا گوتی: 'موسڵمان بە تا لە دەست ئەم دێوەش لە سزای ئەو دونیاش ڕزگارت بێ.' جەمەکپاشا لەجێوە بە دڵ و گیان موسڵمان بوو. غەریبپاشاش فەرمانی کردنەوەی دەســـتی دا. ئەویش بە خەڵکەکەی گوت کە موســـڵمان بین، گشـــتیان موســـڵمان بوون جەمەکپاشـــا چووەوە شـــارەکەی خۆی و خواردن و خواردنەوەی بۆ غەریبپاشـــا و سوپاکەی نارد و ئەو شەوەیان لەو مەڵبەندە بەسەر برد.

"کە ڕۆژ بووەوە، غەریب فەرمانی ڕۆیشـــتنی دا. ڕۆیشـــتن تا گەیشـــتنە میافارقین ســـەیریان کرد چۆڵ کراوە. خەڵکەکەی کە ڕووداوی بابلیان بیســـتبوو، بەرەو کووفە هەڵاتبوون و عەجیبپاشـــایان لێ ئاگادار کردبووەوە. عەجیبیش بە بیســـتنی ئەو هەواڵە تووڕە بوو و ئازا و دلێرانی خۆی کۆ کردەوە و هەواڵی هاتنی غەریبی دانێ. پێی گوتن کە ئامادەی شـــەڕ بن. جا عەجیبپاشـــا ســـیهەزار ســـوار و دەهەزار پێرەوی هەبوو و لە دەوروبەری کووفەیشەوە داوای سوپای کرد. بەوجۆرە پەنجاهەزار سوار و پێرەوی بۆ کۆ بووەوە. ئەوجار سوار بوو و وەڕێ کەوت. پێنج ڕۆژ ڕۆیشتن تا گەیشتنە سوپای غەریبی برای کە لە مووسڵ خێوەتیان هەڵدابوو. کە گەیشتنێ عەجیبیش فەرمانی دا لا دەن و تاوڵ و خێوەت هەڵدەن. ئیدی بەرانبەر بە تـاوڵەکـانی ئەوان خێوەتیـان هەڵدا. دوایی غەریـب نامەیەکی بۆ براکەی نووسی و ڕووی لە پیاوەکانی کرد و گوتی: 'کامتان ئەم نامەیە دەبەن بۆ عەجیب؟' ســـەهیمولڵەیل هەســـتا ســـەر پێ و گوتی: 'قوربان، من دەیبەم و هەواڵت بۆ دەهێنمەوە.' غەریب نامەکەی دایە. سەهیم نامەی برد و ڕۆیشتب تا گەیشتە تاوڵی عەجیب و ئەویان لە هاتنی ئاگادار کردەوە. عەجیب داوای کرد، بچێتە ژوورێ. کە ســـەهیم چووە لای، عەجیب گوتی: 'لە کوێوە دێی؟' ســـەهیم گوتی: 'لای پاشـــای عەڕەب و عەجەمەوە. زاوای شـــاپوورشـــا. نامەیەکی بۆ نووســـیویت. بیخوێنەوە و وەڵامەکەی بۆ بنووســـەوە.' عەجیب گوتی: 'دا ئەو نامەیەم بەرێ.' سەهیم نامەکەی دایە. عەجیبپاشا نامەی کردەوە و خوێندییەوە و بینی نووســـراوە: 'بە ناوی خودای بەخشـــندەی میهرەبانەوە، ســـڵاو لە ئیبراهیمی خۆشـــەویســـتی خودا! لەگەڵ گەیشـــتنی ئەم نامەیەدا، واز لە بوتپەرســـتی بهێنە و دان بە بێ هـاوتـایی خودای بوونەوەردا بێنە. ئەگەر موســـڵمان ببی، ئەوا برامی و لەو

تـاوانەت خۆش دەبم کە بەرانبەر بـاوکم و دایکم کردت. ئەگەر ئەوەی گوتم جێبەجێی نەکەیت، دەتکوژم و شـارەکەت وێران دەکەم. جا ئەمە ئاگادارکردنەوەیەک بوو و پێم دایت. ئیدی بڕیار بە خۆتە.'

"کە عەجیبپادشـا ئەم نامەیەی خوێندەوە، چاوی پەڕییە تەوقی سـەر و نامەکەی دڕاند. ئەم کارە بە لای سـەهیمەوە سـەخت بوو، بە سـەر پادشـایدا گوڕاند: 'دەک دەسـتت بشـکێ!' پاشا بە دەستوپێوەندەکەی گوت: 'ئەم گلاوە ڕاگرن.' ئەوە بوو پەلەماری سـەهیمیان دا و ئەویش شـیری لێ هەڵکێشـان و زیادتر لە پەنجا کەسـی ئازای لێ کوشـتن و بە کەلێنێکدا خۆی دەرباز کرد و هەڵات تا گەیشتەوە لای براکەی. سەرتاپای شەلاڵی خوێن بوو. غەریب گوتی: 'ئەرێ سـەهیم ئەوە بۆ وای؟' سـەهیم ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە. غەریبپاشـا بەو هەواڵە زۆر تووڕە بوو و هاواری کرد 'ئەڵڵاهوئەکبەر' و فەرمانی دا کە تەپڵی شـەڕ لێ دەن. سـوار بوو، ئازا و سـوارچاکان ڕیزیان بەسـت، ئاسـنبەندیان لە بەر کرد، شـیریان لە قەدیان دا و ڕمبیان لەسەر شان دانا. ئەوجار هەردوو هوردوو هێرشیان بۆ یەکدی برد."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەش‌سەد و سی و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! هەردوو بەرە هێرشیان کردە سەر یەک. ئاگری شەڕ گەرم بوو. خوێن لە بەر پێیاندا جۆگەلەی بەست. تا ڕۆژ ئاوا بوو، هەر شەققە شەققی شیر و مەتاڵ و ڕمب بوو. لە یەکتریان کوشت و دەستوپەل و قاچوقولی یەکتریان پەڕاند. کە وڵات تاریک داهات و بوو بە شەو. هەردوو بەرە لێک جیا بوونەوە و گەڕانەوە تاوڵەکانیان و تا بەیانی هەر باسی چۆنییەتی شەڕەکەیان کرد. کە ڕۆژ بووەوە، چەکوچۆلیان هەڵگرت و تەپڵی شەڕیان کوتا. سواری ئەسپە فیلاساکانیان بوون و وەک دوو دەریای بە پێل بەرانبەر یەکدی ڕاوەستان. یەکەم کەس کە هاتە گۆڕەپانەوە، سەهیموللەیل بوو کە تاوێ بە شیر و جارێ بە ڕمب و کەڕەتی بە زەرگ شەڕی دەکرد. تەماشاکەران سەریان لە ئازایی و لێهاتووییەکەی سووڕ مابوو. ئەوجار پاڵەوانێک لە کافران بۆی هاتە دەر. سەهیم دەرفەتی نەدا و بە ڕمێک ئەوی ڕەوانەی لای هاوڕێکانی پێش خۆی کرد. دوای ئەو پاڵەوانێکی دیکە و یەکی دیکە و یەکی دی تا بەو جۆرە دووسەد کەس لە پاڵەوانان بۆی هاتنە مەیدان و هەموویانی کوشت.

"ببوو بە نیوەڕۆ کە عەجیب سوپاکەی دەنگ دا و فەرمانی هێرشی دا. دەستبەجێ هێرشیان کرد و ئەمانیش بۆیان چوون ئاگری شەڕ خۆش بوو، خوێن سەری دەبرد و هەر تەرمی پاڵەوانان بوو لە بەر پێیاند کەوتبوو. تا شەو دهات و هەوا تاریک بوو. شەڕ درێژەی کێشا. ئینجا هەردوو سوپا لێک جودا بوونەوە و گەڕانەوە تاوڵەکانیان و ئەو شەوەیان بەڕێ کرد. بەیانی هات و موسڵمانان چاوەڕێی غەریب بوون کە وەک ڕۆژان سوار بێ و بێتە ژێر ئالای سوورەوە. ماوەیەک تێپەڕی و غەریب نەهات. سەهیم چووە تاوڵی براکەی و ئەوی لە وێ نەدیت. هەواڵی لە خزمەتکارەکان پرسی، گوتیان: 'هیچ هەواڵێکمان لێی نییە.' سەهیم زۆر مات و خەمگین بوو. سوپای ئاگادار کردەوە، لە جەنگ وەستان و گوتیان: 'ئەگەر غەریب‌پاشامان لەگەڵ نەبێ، ئەوا دوژمنان لەنێومان دەبەن.' ونبوونی غەریب هۆکارێکی سەیر و سەمەرەی هەبوو. ئەویش ئەوە بوو کە عەجیب‌پاشا لە شەڕی براکەی گەڕاوە، پیاوێک لە خزمەتکارەکانی بانگ کرد، ناوی سەییار بوو و پێی گوت: 'سەییار، من تۆم بۆ ڕۆژێکی وا نەبێ، ناوێ. دەبێت هەر ئێستا بچیتە نێو بەرەی غەریبەوە و ئەوم بۆ بێنی و زۆرزانی خۆتم بۆ بسەلمێنی.' سەییار گوتی: 'بەسەر سەر و سەر چاو.' سەییار بە پەڕتاو دەرچوو، خۆی گەیاندە تاوڵی غەریب. لەو دەمەدا هەرکەس لە تاوڵی خۆیدا بوو. سەییار لەپشت تاوڵەکەوە لێی خەفتابوو. وا بوو غەریب‌پاشا تینووی بوو و داوای ئاوی کرد. سەییار گورج گوزەیەکی هەڵگرت، دەرمانی بێهۆشیی تێ کرد و گوزەی دایە دەست غەریب. غەریب لێی خواردەوە و هێشتا گوزەی دانەنابوو کە بێهۆش

بوو. ســـەییار کەواکەی تێوەپێچاوە و لە کۆڵی کرد و گەڕاوە هوردووەکەی خۆیان لای عەجیب و خۆی بە تاوڵی عەجیبدا کرد و غەریبی لەبەردەمیدا دانا. عەجیب گوتی: 'سـەییار، ئەمە چییە؟' ســەییار گوتی: 'ئەمە غەریبی براتە.' پاشــا زۆر خۆشــحاڵ بوو و پێی گوت: 'ئەوە بوتان یارمەتیان داوی. جا ئێســتا بیکەرەوە و وە هۆشـــی بێنەوە.' ســـەییار داوای سرکەی کۆنی کرد و غەریبی وە هۆش هێناوە. غەریب کە وە هۆش هاتەوە، تەماشای کرد ئەوە دەســت و پێی بەســتراوە و لە هۆدەیەکی دیکە دایە، گوتی: 'ســوبحانەڵلا ئەمە چییە؟' ئەوجار عەجیب بە ســـەریدا گوڕاند: 'هەتیوە زۆڵە، ئەوە دەتویســـت من بکوژی و تۆڵەی خوێنی دایکت و باوکتم لێ بکەیتەوە؟! ئێستا دەتنێێرمە لایان و دنیا لە شەڕی تۆ ئاسوودە دەکەم.' غەریب گوتی: 'هەی ســـەگی کافر، زۆر زوو دەبینی کە خودای تاق و تەنیا چۆن تۆڵەت لێ دەکاتەوە. تۆ بەزەییت بە گیانی خۆتدا بێتەوە و ڕوون و ڕەوان بڵێ: لائیلاهە ئیلەڵلا، ئیبراهیم خەلیلوڵلا.' کە عەجیب ئەوەی بیســـت، ئارامی شـــڵەژا و بانگی میرغەزەبی کرد و چەرمی ســـەربڕینی ڕاخســـت. ئەوجار وەزیری عەجیب کە لە بە دڵ موســـڵمان بوو، هاتە پێشـــەوە، کوڕنۆشـــی برد و گوتی: 'قوربان، پەلە مەکە تا براوە و دۆڕاو دەردەکەون. کوشـــتنی ئەم کابرایە بۆ ئێمە ئاســـانە. ئەگەر دۆڕاین، ڕەنگە مانی ئەمە ســـوودێکی بۆمان بێ.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی شەش‌سەد و سی و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! عەجیب فەرمانی دا غەریبی برای بە دوو زنجیر و دوو کۆت ببەستنەوە و هەزار پیاوی ئازای کردە پاسەوان. کە سـوپای غەریب گەڕان و ئەویان نە دۆزییەوە، وەک مەڕی بێ شـوانیان لێ هات و نەیاندەزانی چی بکەن. هەر بۆیە سـوعدانی دێو هاواری کرد: 'هۆ خەڵکینە، پشـت بە خودا ببەسـتن. ئەو، هەموو خراپەیەکتان لێ دوور دەخاتەوە.' ئەوجار عەرەب و عەجەم ئاسنبەندیان پۆشـی و سـواری ئەسـپە فیلاسـاکانیان بوون. یەکەمین کەس کە بۆ شـەڕی دەسـتەویەخە هاتە گۆڕەپانەوە، دێوەکە بوو، ڕمبێکی دووسـەد مەنی بەدەسـتەوە بوو. دێوە هاواری لە کافران کرد: 'هۆ بوتپەرسـتان، وەرن ڕووبەڕووم ببنەوە. ئەمڕۆ ڕۆژی تێداچوونتانە. هەرکەس من دەناسـێ، با خۆ لە من نەدا و نەیەتە شـەڕی من. هەرکەسـیش نامناسـێ، من خۆمی پێ دەناسـێنم. من سـوعدانی دێوم. کۆیلەی غەریبم. ئەگەر ئازاتان تێدایە، با بێتە دەر.' لەو دەمەدا پاڵەوانێک لە کافرەکان هاتە دەرەوە و پەلاماری سوعدانی دا. سوعدان بەرپەرچی داوە و ڕمبێکی وای لێ دا کە هەرچی ئێسکی بوو تێکوپێک شکان. ئەوجار سوعدان بانگی کوڕەکانی کرد و گوتی: 'ئاگر هەڵکەن و هەر کام لە کافران کوژران، بیانبرژێنن. بۆم بێنن با بیخۆم.' کوڕەکانی لە گۆڕەپانەکەدا ئاگریان کردەوە و هەمان ئەو کوژراوەیان برژاند. بۆ سـوعدانیان برد، ئەویش گۆشـتەکەی خوارد و ئێسقانەکانی کرۆشت. کە کافران ئەوەیان لە سوعدان دیت، لێی تۆقین. عەجیب کە وایزانی هەرای لە سـوپاکەی کرد؛ پەلاماری ئەو دێوە بدەن. لە جێوە بیسـتهەزار سـوار هێرشیان کردە سەر سوعدان و تیربارانیان کرد. بیست و چوار برینی کاری لە جەستەی کرا. ئیدی ئازایانی ئیسلام هێرشیان کرد و پەنایان بۆ خودا برد. شەڕ و کوشتار هەر ئاوا بەردەوام بوو تا ڕۆژ ئاوا بوو. هەردوو سـوپا لێک جودا بوونەوە. سـوعدانی دێو بە دیل گیرا. چونکە گەلێک خوێنی لە بەر ڕۆیشـتبوو، وەک مردووی لێ هاتبوو. ئەوجار قۆڵیان بەست و خستیانە زیندانەوە، بردیانە لای غەریب. کە غەریب ئەوی بە قۆڵبەستکراوی دیت. گوتی: 'سـوعدان، ئەوە تۆش ئاوات لێ هات و کەوتییە ئەو حاڵەوە؟' سـوعدان گوتی: 'قوربان، هەموو کەس خۆشـی و ناخۆشـی و هەوراز و نشـێوی لەپێشـە.' غەریب گوتی: 'ڕاست دەکەی، سوعدان.' عەجیب ئەو شەوە خۆشحاڵ بوو و بە سوپاکەی گوت: 'سبەینێ کە ڕۆژ بووەوە، هێرش بکەنە سەر موسڵمانان و یەک کەسیان لێ بە زیندوویی نەهێڵنەوە.' ئەوانیش گوتیان: 'فەرمانتە، قوربان.' بەڵام موسڵمانان مات و زگار بوون و بۆ غەریبپاشا و سـوعدان گریان. سـەهیموللەیل پێی گوتن: 'خەڵکینە خەم مەخۆن؛ خودای ئیبراهیم سەرمان دەخا.' دوای ئەوە سەهیم تا نیوەشە ڕاوەستا و خەو نەچووە چاوییەوە. کە بوو بە نیوەشـەو، ئەوجار هەسـتا چوو بۆ هوردووی عەجیب، بەنێو تاوڵەکاندا گەڕا تا وا بوو

عەجیبی بینی کە لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتووە و گەورەگەورەکان لەلای کۆببوونەوە. سەهیم، گوڵ و مۆمی هەڵگرت، بەنگی بۆنداری پێوە کرد و دایگیرساند. ئینجا وەک خزمەتکاران چووە پێشێ و ماوەیەک چاوەڕێ بوو تا عەجیب و هەنتەشییانی دوکەڵی بەنگەکەیان هەڵمژی و هەموو وەک مردوو بە لادا کەوتن. سەهیم ئەوانی لەوێ جێ هێشت و بەرەو زیندان چوو. سەیری کرد هەزار پیاوی ئازایان بۆ پاسەوانی غەریب و سوعدان داناون و خەو زۆری بۆ هێناون. سەهیم بانگی لە پاسەوانەکان کرد: 'هەی قوڕ بەسەرتان، هەستن لە خەو و مەشخەڵەکان داگیرسێنن.' جا سەهیم خۆشی مەشخەڵێکی هەڵگرت و پری کرد لە بەنگ. پاسەوانان دوکەڵی بەنگیان هەڵمژی و هەموو بێهۆش بوون و وەک مردوو درێژ بوون. لە گیرفانی چاکەتەکەیدا سرکە و کوندەری[1] پێ بوو و غەریب و سوعدانی وە هۆش هێنانەوە. زنجیر و کۆتەکەیانی کردنەوە. کە ئەوان سەهیمیان دی، خۆشحاڵ بوون. سەهیم پێی گوتن: 'هەر ئێستا بچنەوە هوردووی خۆمان.' بەڵام سەهیم چووەوە لای عەجیب و لیفەیەکی تێوە پێچا و خستییە سەر شانی و بەرەو هوردووی موسڵمانان تێی تەقاند. کە گەیشتەوە کن غەریب، ئەو شتە پێچراوەی لەپێشی دانا و. غەریب لیفەکەی لە سەر لا دا، چاوی بە عەجیبی برای کەوت بە قۆڵی بەستراو و حاڵەتی. نزای بۆ سەهیم کرد و پێی گوت: 'سەهیم، وە هۆشی بێنەوە.' سەهیم چووە پێشێ و سرکە و کوندەری لە لووتی کرد. عەجیب وە هۆش هاتەوە، کە جوان لە خۆی و دەوروبەر ڕاما تەماشای کرد ئەوە بە قۆڵبەستکراوی لە بەر دمی غەریب کەوتووە. ئیدی لە تاوان سەری داخست."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. کوندەر: شیرەی وشکەوەبووی گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ و کاتی سووتاندنی بۆنێکی خۆشی لێ دێت.

گوتی: "خاوەنشکۆ! عەجیب لە تاوان سەری داخست. غەریب پێی گوت: 'هەی ناڕەسەن سەرت بەرز کەوە.' عەجیب سەری هەڵێنا و سەیری کرد هەر چوار دەوری بە عەرەب و عەجەم گیراوە و غەریبی براشی لە سەر کورسییەک بە شکۆوە دانیشتووە. هیچی نەگوت. ئەوجار غەریب گوتی: 'ئەم سەگە ڕووت کەنەوە.' ئیدی جلیان لە بەر داکەند و بە قامچی ئەوەندەیان لێ دا تا هەموو گیانی خوێنی تێزا و لە هۆش خۆی چوو. کە غەریب لە سزادانی ئەو بووەوە، گوێی لە دەنگی هەلهەلە و تەپڵ و شادی بوو لە تاوڵی کافرەکانەوە دەهات. ئەویش لەبەر ئەوە بوو کە دامیغپاشای مامی غەریب دوای ئەوەی غەریب بە جێی هێشتبوو، دە ڕۆژان لە شوێنی خۆی ماوە، دوایی بە بیست هەزار سوارەوە کەوتە ڕێ و شەو و ڕۆژ بەڕێوە بوو تا لە هوردووەکان نیزیک بووەوە. ئەوجار هەواڵگرێکی نارد تا هەواڵی بۆ بزانێت. کابرای هەواڵگر ڕۆژەڕێیەک ڕۆیشت و گەڕاوە و دامیغپاشای لە بەسەرهاتەکە ئاگادار کردەوە. دامیغپاشا دانی بە خۆدا گرت تا بوو بە شەو، ئەوجار بە پارێزەوە هێرشی کردبووە سەر سوپای کافران.

"جا کە غەریب دەنگی 'ئەڵلاهوئەکبەر' و تەپڵی بیست، سەهیمی برای بانگ کرد: 'بزانە ئەو تەکبیرە چییە و چی ڕووی داوە. زوو وەرەوە پێم بڵێ.' لە جێوە سەهیم بەرەو هوردووی کافران چوو و هەواڵی پرسی. پێیان گوت کە دامیغپاشای مامی غەریبپاشا بە بیستهەزار سوارەوە هەڵیکوتاوەتە سەر کافران. سەهیم گەڕاوە و بابەتەکەی بۆ براکەی گێڕاوە. غەریب فەرمانی بە سوپاکەی کرد کە گورج چەک هەڵگرن و بچن یارمەتی مامی بدەن. باڵبازانی سوپا خێرا سوار بوون و بە شیری ڕووتەوە پەلاماری کافرانیان دا. هێشتا ڕۆژ نەبووبووەوە کە پەنجاهەزار کەس لە کافران کوژران، سێهەزار کەسیش گیران و ئەوی دیکەشاین هەڵاتن. لەو شەڕەشدا موسڵمانان گورزی خۆیان وەشاند و مەستی بادەی سەرکەوتن گەڕانەوە.

"غەریبپاشا سوار بوو، چوو بۆ پێشوازی مامی و بە دیداری شاد بوو، سپاسی یارمەتییەکانی کرد. دامیغپاشا گوتی: 'نازانم ئەم سەگە ستەمکارە لەم شەڕەدا چی لێ هات؟' غەریب گوتی: 'مامە! ئەومان بە دیل گرتووە و لە لای منە.' دامیغپاشا هەر زۆر خۆشحاڵ بوو. ئەوجار هەردووکیان دابەزین و چوونە تاولەکەی غەریب. کەچی سەیریان کرد عەجیب لەوێ نەمابوو. غەریب شڵەژا و مات بوو. مامی گوتی: 'خەم مەخۆ، ناتوانی بۆ هیچکوێ بچێ.' وادیار بوو، سەیاری هەواڵگر و پیاوی عەجیب لە هوردووەکەی غەریبدا خۆی حەشار دابوو و هەر لەو ساتەدا کە غەریب سوار بوو و چوون بۆ یارمەتی هێزەکەی

مامی و کەس لە پاسەوانان لە لای عەجیب نەماوە، سەییار خۆی دەگەیەنێتێ و هەڵیدەگرێ و لە هوردووەکەی دەباتە دەرێ. ئەو شەوە و ڕۆژی دواییش هەر بردی بردی تا گەیشتنە سەر کانییەک. دارسێویک لە پەنا کانییەکە بوو. لەوێ سەییار عەجیبی دانا و دموچاوی بۆ شوت. عەجیب چاوی کردەوە و سەییاری دیت. گوتی: 'سەییار، بمبەوە کووفە تا سوپاکەم ڕیک خەمەوە و تۆڵە لە دژمنەکەم بکەمەوە. بەڵام سەییار، چم لێ دەکەی زۆرم برسییە.' قامیشەڵانێک لەوێ بوو، سەییار خۆی گەیاندێ و لەوێ بێچووی مروشترێکی ڕاو کرد، هێنایەوە سەری بڕی. کەمێکی ویشکە دار و چرپی و شت کۆ کردەوە، ئاوری کردەوە و برژاندی و لە پێش عەجیبی دانا. عەجیب خواردی و لە کانییەکەش ئاوی خواردەوە. ئەوجار سەییار خۆی گەیاندە هۆزێکی عەرەب و ئەسپێکی لێ دزین و هێنایەوە. عەجیبی سوار کرد و چوونە کووفە. میری کووفە لە هاتنی ئەو ئاگادار بووەوە و بە پێشوازییەوە چوو. سەیری کرد، هێندە ئەشکنجە داربوو، هێزی لێ بڕابوو. بردییەوە شار و نۆژدار و شتی هێنا سەر. پاشا بە نۆژدارەکانی گوت: 'دەبێ بە دە ڕۆژ چاکم کەنەوە.' نۆژدار و حەکیمان وە خۆ کەوتن تا لە ماوەیەکی کەمدا چاک چاکیان کردەوە. دوای ئەوە وەزیرەکەی بانگ کرد و فەرمانی پێ کرد کە نامە بۆ گشت میرەکانی ئەو چواردەورە بنێرێ. وەزیر بیست و یەک نامەی نووسی و ناردنی. ئەوانیش سوپایان کۆ کردەوە و تەیاریان کرد و خێرا بەرەو کووفە وەڕێ کەوتن."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و چل و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ!کاتێک هەواڵبەر نامەی عەجیبی دایە دەســـت میری ناوچەکان. میرەکان هەرکەســـەی ســـوپای خۆی کۆ کردەوە و تەیاری کرد و بەرەو کووفە وەڕێ کەوتن چوونە لای عەجیبپاشا.

"غەریبپاشا بە هەڵاتنی عەجیب زۆر ناڕەحەت بوو، هەزار باڵبازی ئازای وە دوا خست، بیدۆزنەوە. باڵبازەکان بە هەموو لایەکدا بڵاو بوونەوە و گەڕان و هیچ هەواڵێکیان دەســـت نەکەوت و دەست لە گونان درێژتر هاتنەوە لای غەریب. غەریبپاشا داوای سەهیمی برای کرد و دیار نەبوو. ترســی ئەویشــی لێ نیشــت. لەناکاو ســەهیم پەیدا بوو. هاتە پێشــی و کورنۆشـــی برد. غەریب کە ئەوی بینی، هەســـتا ســـەر پێ و گوتی: 'ئەرێ ئەوە لە کوێ بووی؟' گوتی: 'قوربان، بەرەو کووفە چووم. ئەو سەگە گڵاوە گەیشـتەوە شـوێنی خۆی و چووەوە ســـەر تەختەکەی. نامەی بۆ گشـــت میرەکانی وڵاتەکەی نووســـی. ئەوانیش بە ســوپایەکی لە قەدەر ئەســتێرەی ئاســمان، بە دەنگییەوە هاتن.' ئەوجار غەریب فەرمانی دا سوپا وەڕێ کەوێ و سوپا بەرەو کووفە بزووت. کە لە کووفە نیزیک بوونەوە. سوپایەکیان بینی وەک دەریای عوممان کە سەرەتا و کۆتایی نەبوو.

"غەریب و ســوپاکەی بەرانبەر ســـوپای کافران وەســـتان و تاوڵیان هەڵدا و کێلەک و ئاڵایان داچەقاند. ئەوڕۆژە درەنگ بوو، تاریکی شـــەو دنیای داپۆشـــی و هەردو هوردوو ئاگریان هەڵکرد و پاسـەوانانیان خستنە ئێشـکەوە تا ڕۆژ بووەوە. کە ڕۆژ بووەوە غەریب هەســتا بەپێی دەســتووری ئایینی ئیبراهیم نوێژی کرد و فەرمانی کوتانی تەپڵی دا. ئاڵایان شـەکاندەوە و چەکیان هەڵگرت، سـوار بوون و چوونە گۆڕەپانی شـەڕەوە. یەکەمین کەس کە پێی خستە گۆڕەپانەکەوە، دامیغپاشای مامی غەریب بوو کە ئەسپی بەرەو پێشەوە تاو دا و داوای ڕووبەڕووبوونەوەی کرد. سـوارێکی ئازا لە لایەن کافران هاتە دەرەوە، قسـەی نەشـیاوی بە دامیغپاشـا گوت و هێرشـی بۆ برد. هەرکە دەسـتی بەرز کردەوە، دامیغپاشـا ڕمێکی لەسـەر سنگی چەقاند و ڕەوانەی دۆزەخی کرد. دوای ئەو پاڵەوانێکی دیکە و دوای ئەویش یەکی دیکە و یەکی دیکە هات تا گەیشـــتە حەفتا کەس و گشـــتیانی کوشـــت. ئیدی کافران دەستیان لە خۆیان شورد و کەس نەیدەوێرا بۆی بێتە پێشێ. عەجیب کە ئاوای دیت دەنگی هەڵبڕی و گوتی: 'ئەگەر هەر هەمووتـان دانەدانە ڕووبەڕووی ببنەوە، گشـــتتـان دەکوژێ. بۆیە وا باشە هەمووتان بە یەک جار پەلاماری بدەن و لەسەر زەوی بیسڕنەوە.' ئیدی هەردوو ســوپا لێکدی چوونە پێشــەوە و پێک وەربوون و خوێن وەک ســێڵاو جمەی دەهات. ئازایان ئازایەتیان دەنواند و ترسـنۆکان پشـتیان لە دوژمن دەکرد و هەڵدەهاتن. تا

تاریکان شـەڕ هەروا بەردەوام بوو. کە بوو بە شـەو تەپڵی گەڕانەوەیان کوتایی شـەڕ لێ درا. غەریبپاشـا قایل نەبوو دەسـت هەڵگرێ و دیسـان هێرشـی کردەوە سـەر کافران و ئازایانی ئیسلامیش دوای کەوتن. گەلێک سەر پەڕان، گەلێک پشت شکان و زۆر تاوڵیشیان تالان کرد. پیر و لاوێکی زۆر بە دیل گیران. هێشـتا ڕۆژ نەبووبووەوە کە کافران هەڵاتن و سوپای موسڵمانان تا بەیانی ڕاویان نان و زیاد لە بیستهەزار کەسیان لێ بە دیل گرتن. غەریب لە دەروازەی کووفەوە چووە ژوورێ و بە بانگدەری گوت کە بانگی پاراسـتن و داڵدەدان بدا و بڵێ: 'هەرکەس واز لە بوتپەرسـتی بێنێ و باوەڕ بە خودای تاقانە بێنێ، لە داڵدەی غەریبپاشـادایە.' بانگدەر لە کۆلانەکانی شـاردا بانگی دا و ورد و درشـتی شـار موسڵمان بوون و هەموو هاتنە دەرەوە و موسڵمانبوونی خۆیان بە غەریبپاشا ڕاگەیاند. پادشاش دڵی زۆر بەوە خۆش بوو. تەواو حەساوە.

"دوای ئەوە هەواڵی مەرداس و مەهدییەی کچی پرسـی، گوتیان کە بەرەو پشـتی کێوەسـوور هەڵاتوون. ئەوجار غەریب سـەهیمی برای بانگ کرد و پێی گوت: 'هەواڵی باوکتم بۆ بێنە.' سـەهیم سـوار بوو و ڕمبێکی هەڵگرت و بەرەو کێوەسـوور کەوتە ڕێ. کە چووە ئەوێ، کەس دیـار نەبوو. پیرەپیاوێکی عەڕەب لەوێ بوو، هەواڵی مەرداسـی لێ پرسی. کابرا گوتی: 'ڕۆڵە، مەرداس کە زانی غەریب زەفەری پێ بردووە، کچەکەی هەڵگرت و لەگەڵ هۆزەکەیدا ڕێی بیابانیان گرتە بەر. جا نازانم بەرەو کام لا ڕۆیشـتن.' سـەهیم کە ئەو قسـەیەی لە کابرا بیسـت، گەڕاوە بۆ لای براکەی و باسـەکەی بۆ گێڕاوە. غەریبپاشـا لەسـەر تەختی باوکی دانیشـت، کۆگەکانی کردنەوە و ماڵ و سـامانی بە سـەر باڵباز و سوارچاکانیدا دابەش کرد. شۆفارگەلی بۆ هەموو وڵاتان نارد تا عەجیب ببیننەوە. گەورە و پیاوماقووڵانی شاری بانگ کرد و خەڵاتی شیاوی دانێ و مسکێنی پێ سپاردن."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و چل و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! غەریب لەگەڵ سەد سوار چووە دەرێ بۆ ڕاو. ڕۆیشت تا گەیشتە مێرگێکی خۆش و سەرسەوز. ئەو ڕۆژە لەو ئاقارە باری خست و تاوڵی هەڵدا و شەویشی هەر لەوێ بەسەر برد. بەیانی زوو نوێژی کرد و سپاسی خودای بەجێ هێنا. لەناکاو لە لایەکی مێرگەکەوە هاوارێک هات. غەریب بە سەهیمی برای گوت: 'خێرا بڕۆ هەواڵێکم بۆ بزانە.' سەهیم گورج دەرپەڕی، تەماشای کرد گەلێک ماڵ تالان کرابوون و ژنەیلێکی زۆریش بە دیل گیرابوون. سەهیم هۆکاری ئەم دۆخەی پرسی. گوتیان: 'ئێمە کەس‌وکاری مەرداسی گەورەی بەنی قەحتانین و ئەم ماڵانە هی هۆزەکەی ئەون کە دوێنێ جومەرقان مەرداسی کوشت و ماڵ و سامانەکەی تالان کرد و ژن و کچەکانی بە دیل گرتوون.' جومەرقان کاری هەر ڕێگری و تالان و بڕۆی هۆزەکان بوو. هیچ پاشایەک دەستی پێی نەدەگەیشت و گوێڕایەڵی فەرمانی کەسیش نەبوو.

"کە سەهیم کوژرانی باوکی و گیرانی ژنەکانی ئەوی بیست، خێرا گەڕاوە و هەواڵەکەی بۆ غەریب گێڕاوە. غەریب غیرەتی خزمایەتی جووڵا و بۆ تۆڵەسەندنەوە و سڕینەوەی ئەو پەڵە ننگە سوار بوو، کەوتە شوێن ئەو هۆزە گرتنییەوە. بەدەم گوتنی 'ئەڵڵاهوئەکبەر' هێرشی کردنە سەر و لە یەکەم پەلاماردا بیست کەسی لێ کوشتن. دوایی بە گوڕ و تینەوە لە نێوەڕاستی گۆڕەپاندا وەستا و گوتی: 'جومەرقان لە کوێیە تا بۆم بێتە مەیدان و جامی مەرگی پێ بنۆشم و زەوی لە گڵاوی ئاوا پاک کەمەوە؟' هێشتا غەریب قسەکەی تەواو نەکردبوو کە جومەرقان وەک کێوێکی بڵند پەیدا بوو. قەڵافەتێکی زۆر بەرز و ڕێکوپێک و بەخۆوەی بوو کەسێکی ئازا و نەترس. بەبێ قسە و باس پەلاماری غەریبی دا و غەریبیش هەروەتر. جومەرقان ڕمبێکی ئاسنی پێ بوو کە ئەگەر لە کێوی دابایە، هەتا ناخی دەڕۆیشتە خوارێ. ڕمبێکی بۆ سەری غەریب داهێناوە، غەریب گورج خۆی لا دا و ڕمبە ئەژنۆیەک لە زەوی ڕۆ چوو. غەریب خێرا شیرێکی لە باسکی دا. پەنجەکانی جومەرقان سست بوون و ڕمبی لە دەست بەر بووەوە. دەمودەست غەریب لەسەر ئەسپەکەوە خۆی دانەواندەوە و ڕمبەکەکەی لە زەوی دەرکێشا و یەکبەخۆی لە پشتی جومەرقانی دا، جومەرقان وەک دارخورمای بڕاو کەوتە سەر زەوی.

"ئەوجار سەهیم گرتی، قۆڵی بەست و گوریسی لە میلی کرد و ڕایکێشا. ئەوجار سوارەکانی غەریب و جومەرقان پێک وەربوون. پەنجا کەس لە هۆزی جومەرقان کوژرا و ئەوانی دیکە هەڵاتن و چوونەوە نێو هۆزەکەیان. داوای یارمەتییان کرد، ئەوان هەواڵیان پرسی و لە ڕووداوەکە ئاگادار کرانەوە. ئیدی خەڵکی هۆزەکەی سوار بوون و بە تاڵووکە

بۆ ڕزگارکردنی جومەرقان تێیان تەقاند. غەریب‌پاشـــا کە جومەرقانی قۆڵبەســـت کرد و سوپاکەی ئەو هەلات، لە ئەسپەکەی دابەزی و جومەرقانی بانگ کرد. جومەرقان خاکەڕایی نواند و گوتی: 'ئەی پاڵەوانی ســەردەم، خۆم دەدەمە پەنای تۆ!' غەریب گوتی: 'باشــە هەی ســـەگی عەرەب، بۆچی ڕێ لە خەڵک دەگری و لە خودای ئاســـمان و زەوی ناترســـی؟' جومەرقان گوتی: 'قوربان، خودای ئاسمان و زەوی کێیە؟' غەریب گوتی: 'هەی خودانەناس، مەگەر چی دەپەرستی؟' جومەرقان گوتی: ' خودایەک کە لە ڕۆن و هەنگوینی بەستوو چێ کراوە. جاروبار لێی دەخۆم و هی دیکە لە بریدا ســـاز دەکەمەوە.' غەریب پێکەنی و گوتی: 'هەی نەفام، ئەی بۆچی خودای تاق و تەنیا ناپەرســتی کە بەســـەر هەموو شــتێکدا زاڵە؟' جومەرقـان گوتی: 'ئەو خودا گەورەیەی دەڵێی لە کوێیە تـا بیپەرســـتم؟ غەریـب گوتی: 'گەوجە، ئەو خودایە ناوی ئەڵلایە. ئەو خودایەکە زەوی ئاســـمانەکانی ئافراندووە و دار و گژوگیای ڕوواندووە. ڕۆزی هۆڤی و باڵندان دەدا و لە چاوان ونە. هەموو شـــتێک دەبینێ، بەڵام خۆی نابینرێ.'

"جومەرقان کە قسەکەی غەریبی بیست، دەلاقەکانی دڵی کرانەوە و گوتی: 'قوربان، چی بڵێم تا موســڵمان ببم؟' غەریب گوتی: 'بڵێ، لائیلاهە ئیللەڵڵا.' جومەرقان شـایەدمانی هێنا و شـــانازی موســـوڵمانەتی پێ برا. غەریب‌پاشـــا فەرمانی دا کە کۆت و زنجیری لێ بکەنەوە. ئەوجار جومەرقان کوڕنۆشـــی بۆ غەریب‌شـــا برد. لەو دەمەدا تەپوتۆزێک لە دوورەوە هەستا."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و چل و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! لەو دەمەدا تەپوتۆزێک لە دوورەوە هەستا. غەریب گوتی: 'سەهیم. هەواڵی ئەو تۆز و خۆڵەم بۆ بێنە.' سەهیم وەک باڵندە دەرچوو و هەواڵی هێناوە و گوتی: 'پاشام، ئەوە تۆز و خۆڵە هۆزی جومەرقانە.' غەریب گوتی: 'جومەرقان هەستە، بڕۆ بۆ لای هۆزەکەت و ئیسلامیان پێ بناسێنە. ئەگەر ملیان دا ئەوە باشە دەنا بە شیر ڕووبەڕوویان دەبینەوە.' دەمودەست جومەرقان سوار بوو، خۆی گەیاندە هۆزەکەی و بە دەنگێکی بەرز هەرای لێ کردن. ئەوان دەنگی گەورەکەیان ناسییەوە و دابەزین و بە پێشوازییەوە چوون و بە سلامەتی ئەو دڵخۆش بوون. جومەرقان پێی گوتن: 'هەرکەس بە گوێم بکا، ڕازگاری دەبێ. هەرکەسیش پێمل نەبێ، بەم شیرە دوولەتی دەکەم.' گوتیان: 'قوربان، فەرمان فەرمانتە و هەرچی تۆ بیڵێی نافەرمانیت ناکەین.' جومەرقان گوتی: 'بڵێن. لائیلاهە ئیللەڵڵا، ئیبراهیم خەلیلوڵڵا.' گوتیان: 'قوربان، تۆ لە کوێ و ئەم قسانە لە کوێ؟!' ئیدی جومەرقان هەموو شتێکی بۆ گێڕانەوە. پێی گوتن: 'خەڵکینە، ئێوە دەزانن کە لە شەڕدا خۆم بە تەنیا دەرەقەتی هەر هەمووتان دێم، بەڵام تەنیا کەسێک منی دەستگیر کرد.' کە هۆزەکەی ئەو قسەیەیان بیست، شایەدمانیان هێنا. ئەوجار جومەرقان بردنیە لای غەریب و لەوێش ئیسلامبوونیان تازە کردەوە و نزای بەردەوامی و پایەداربوونیان بۆ غەریب کرد. غەریب پێی گوتن: 'بگەڕێنەوە و ئیسلام بۆ ئەوانی دیکەش شی کەنەوە.' گوتیان: 'جەنابی پاشا، لەمە بەدوا لێت جیا نابینەوە، بەڵام ئیستا دەچین بۆ لای هۆزەکەمان و زوو دێینەوە.' غەریب گوتی: 'بڕۆن. ئەگەر دەتانەوێ بۆ لای من بێن، ئەوا لە کووفە دەمبینن.' جومەرقان و خەڵکەکەی سوار بوون و گەڕانەوە. کە گەیشتنەوە لای هۆزەکەیان، باسی ئیسلامیان بۆ ژن و منداڵەکانیان کرد و بۆیان شی کردنەوە. بەوجۆرە هەموو هۆزەکە بە ژن و پیاو و ورد و درشتەوە موسڵمان بوون. تاوڵ و ڕەشماڵەکانیان تێکەوە پێچا و نان و مەڕ و ماڵاتیان کۆ کردەوە و بەرەو کووفە کەوتنە ڕێ.

"ئینجا غەریبپاشاش کە گەیشتە کووفە، چووە کۆشکی باوکی و لەسەر تەخت دانیشت و گەورە و فەرماندەکان لە ڕاست و چەپیەوە وەستان. دوایی شوفارەکان هاتنەوە و هەواڵیان هێنا کە عەجیبی برای بەرەو یەمەن ڕۆیشتووە و پەنای بردووەتە بەر جولەندی کوڕی کەرکەڕی پاشای عوممان. غەریب بە خەڵکەکەی گوت کە تا سێ ڕۆژ خۆیان بۆ سەفەر ئامادە کەن. ئینجا ئیسلامی بۆ ئەو سیهەزار کەسە شی کردەوە کە لە شەڕی یەکەمدا دیلی کردبوون. بیستهەزاریان موسڵمان بوون و ئەو دەهەزارەیان کە موسڵمان نەبوون، کوژران. لەو جەنگەیەدا جومەرقان و هۆزەکەی گەیشتن و کڕنۆشی بۆ غەریبپاشا برد. غەریب هەموویانی خەڵات کرد. جومەرقانی کردە سەرکردەی سوپا و پێی

گوت: 'جومەرقان، لەگەڵ خزم و کەستدا سوار بە و بیستهەزار سوار لەگەڵ خۆت ببە و بە سەرکردەیی سوپا بچۆ بۆ ولاتی جولەندی کوڕی کەرکەڕ.'

"جومەرقان فەرمانی بەجێ هێنا. ژن و منداڵەکانی لە کووفە جێ هێشــــت و هەر ئەو ڕۆژە وەڕێ کەوت. ئەوجار غەریبپاشــا بەدوای ژن و کچی هۆزەکەی مەرداســدا گەڕا و لەنێویاندا جاوی بە مەهدییە کەوت. لە جێوە بووراوە. گوڵاویان بەســـەردا هەڵپرژاند تا وە هۆش هاتەوە و ئەوی لە باوەش گرت و بردییەوە ماڵی خۆی. بە داوێنپاکییەوە لەگەڵی خەوت. دەمەو بەیان نوێژی کرد و چوو لەسەر تەخت دانیشت. پۆشاکێکی شکۆمەندانە و گرانبایی دا دامیغپاشـــــای مامی و ئەوی لە عێراقدا کردە جێگری خۆی و مەهدییەی پێ سپارد. بۆخۆشی لەگەڵ بیستهەزار سوار و دەهەزار پێڕەودا بەرەو شاری عوممان لە خاکی یەمەن کەوتە ڕێ.

"کاتێک عەجیب لەگەڵ شـــکســـتخواردووەکانی هۆزەکەیدا گەیشـــتە شـــاری عوممان، جولەندی کوڕی کەرکەڕ سـەری لە هاتنی ئەو سـووڕ ما و لەگەڵ دەستوپیوەندەکانیدا بە پیشـــوازییەوە چوون. عەجیب بە گریان و خەفەتەوە چووە لای جولەند. کچی عەجیب ژنی جولەند بوو و چەند منداڵێکی لێی هەبوو. کە جولەند عەجیبی بەو حاڵەوە بینی، پێی گوت: 'ئەوە چی بووە پێم بڵێ.' عەجیب بەسەرهاتی خۆی لە سەرەتاوە بۆ گێڕاوە و گوتی: 'پاشا، غەریبی برام خەڵکی بۆ پەرســتنی خودای ئاســمان بانگ دەکا و ڕێیان لی دەگرێ کە بوت بپەرســتن.' کە جولەند ئەم قســـەیەی بیســت، تێک چوو و خرۆشــا و گوتی: 'ســـوێند بە ئاســمان، تاقە یەک کەس لە شـــوێنکەوتووەکانی براکەت لەســـەر زەویدا ناهێڵم. دا پێم بڵێ ئەوان ئێســتا لە کوێن و چەند هەزار کەســن؟' عەجیب گوتی: 'ئەوان ئێســتا لە کووفەن و پەنجاهەزار کەسن.'

"جولەندپاشــا جەوامەردی وەزیری بانگ کرد و پێی گوت: 'ســـەدهەزار ســـوار لەگەڵ خۆت ببە و برۆ ســـەر موســـڵمانان.هەموویان بە زیندووی بە دیل بگرن و بیانهێننە ئێرە بۆخۆم دەزانم چیان لێ بکەم.' ئیدی جەوامەرد خێرا بە ســـوپایەکی زۆرەوە ســـوار بوو و بەرەو کووفە کەوتە ڕێ. ڕۆژی حەوتەم گەیشـــتنە شـــوێنێک کە پڕ بوو لە دار و باخ و باخات و سەوزایی، چەم و ڕووباریش بە نێویدا دەخوشی. جەوامەرد فەرمانی بە سوپا دا کە دابەزن و لا دەن."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەش‌سەد و چل و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! جەوامەرد فەرمانی بە ســـوپا دا، دابەزن و لا بدەن. تا نیوەشـــەو لەوێ مانەوە. لە نیوەشـــەودا فەرمانی دا ســـوپا وەڕێ کەوێتەوە. بۆخۆشـــی ســـوار بوو و لەپێشـیانەوە ڕۆیشـت. دەمەو بەیان گەیشـتنە مێرگێک، گوڵووک تازە دەکراوە و باڵندەکانی بەسەر دارانەوە دەیانخوێند. لەو دەمەدا جەوامەرد ڕەگی غیرەتی هەستا و دەستی کرد بە فڕوفیشاڵ و با لە خۆ کردن و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

دێوی ڕەش قەت خۆ لە شـــــــــانم نادا، دەزانێ سەری خۆی بە با دەدا
بەور و پڵینگ و نەهەنگ لە دەریـــــــــــا، لە بەر دەستی من کەوتوونە نزا
هەزاران عەگید و ئازا و جوامـــــــێر، بە زەبری شیرم هەموو بوون گلێر
ئەو عەگیدانەی، ئازا بوون وەک شـێر، تەختی شـاگەلیان دەکرد سـەرەوژێر

"هێشتا جەوامەرد شێعرەکەی تەواو نەکردبوو کە سوارێکی ئاسنپۆش لەنێو دارەکانەوە دەرکەوت و هەرای لێ کرد: 'هۆی ســـووکترین عەرەب، گەر دەتهەوێ نەکوژرێی چەک و جلەکانت دانێ و لە ئەسپەکەت وەرە خوارێ.' کە جەوامەرد ئەم قسـەیەی بیست، دنیای بەرچاو تاریک بوو، لە جێوە شـیری هەڵکێشـا و پەلاماری جومەرقانی دا و گوتی: 'خوێڕی. ئەتۆ کێی تا ڕێ لە من بگری؟ من کە ســـەرکردەی ســـوپای جولەندی کوڕی کەرکەڕم و دەمەوێ غەریب و هۆزەکەی بە دیل بگرم و بیانبەمەوە' کە جومەرقان ئەو قسەیەی بیست. پەلاماری جوامەردی دا و ئەم بەیتانەی خوێندنەوە:

یەکێ لە ناودارانی ئێـــــــــــــــرانم
پێڕەوکەیی ناو شـــــــــــــەڕی شێرانم
گەلێ ســـــەر، کەوتوون لە لەش هەڵبڕاو
بێ کـــــــــفن و دفن و لە خۆڵ وەردراو
چیـــــــــــها شا و میر، من دیلم کردوون
فیـــــــــــــلی زلزلم بە کەمەند گرتوون

"هۆی هاتنی جومەرقان بۆ ئەو جێیە ئەوە بوو، کە لەگەڵ هۆزەکەیدا لە کووفەوە هاتنە دەرێ بەرەو وڵاتی جولەندی کوڕی کەرکەڕ کەوتە ڕێ، دە ڕۆژان بە دەشـــت و دەردا بەڕێوە بوون هەتا ڕۆژی یازدەیەم لە شوێنێک لایان دا. لە نیوەشەودا، جومەرقان فەرمانی ڕۆیشـــتنی دا و بۆخۆشـــی لەپێشـــیانەوە دەڕۆیشـــت تا وا بوو گەیشـــتە ئەو مێرگە و

ڕووبەڕووی جوامەرد بووەوە و بە شەڕ هاتن. شیرێکی لێ دا و دوولەتی کرد. ماوەیەک لەوێ ڕاوەستا تا سوارەکانی خۆی گەیشتنێ. ڕووداوەکەی بۆ گێڕانەوە و پێی گوتن: 'بەم دەوروبەرەدا بڵاو ببنەوە و من لێرەدا لەگەڵ پیاوانی بەنی عامر خۆم مات دەدەم. کە سوپای دژمن گەیشتێ، هێرشیان بۆ دەبەم و هاوار دەکەم 'ئەڵڵاهوئەکبەر.' کە دەنگی منتان بیست، لە هەموو لایەکەوە بەدم گوتنی ئەڵڵاهوئەکبەرەوە پەلاماریان بدەن.' ئیدی سوپا بڵاو بوونەوە و بەو دەوروبەردەدا گەڕان تا ڕۆژ بووەوە. ئەوجار سوپای جەوامەردی دی کە وەک ڕانە مەڕ تێکەڵ بووبوون و دەشت و دەریان تەنیبوو. لەو ساتەدا جومەرقان تەکبیری کرد و سوپای ئیسلام لە هەموو لایەکەوە هێرشی کردە سەریان. نیوەی سوپای کافران کوژران و نیوەکەی دیکەیان هەڵاتن. موسڵمانان ڕاویان نان و تا نیوەڕۆ لێیان کوشتن و قڕلبەسیتان کردن. نیوەڕۆ موسڵمانان بە حەوتهەزار دیلەوە گەڕانەوە و کافران جگە لە بیست و شەش هەزار کەس کە زۆربەیان بریندار بوون، هیچیان لێ نەگەڕاوە. جومەرقان دەستکەوتەکانی بە هەزار سواردا ناردەوە بۆ کووفە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و چل و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! جومەرقان داب و نەریت و بنەماکانی ئیسلامی فێری دیلەکان کرد. ئەوانیش بە گیان و دڵ باوڕیان بە ئیسلام هێنا و ئازادی کردن. شەو و ڕۆژێک لەو شوێنە مانەوە. دوایە فەرمانی ڕۆیشتنی دا و بەرەو عوممان وەڕێ کەوتن. هەزار سوارەکەش دەستەکەوتەکانیان گەیاندنە کووفە و بەسەرهاتەکەیان بۆ غەریبپاشا گێڕاوە. ئەوجار پاشا ڕووی لە سوعدانی دێو کرد و پێی گوت: 'بیستهەزار سوار لەگەڵ خۆت ببە و بچۆ بۆ لای جومەرقان.' سوعدان منداڵەکانی و بیستهەزار سواری برد و بەرەو عوممان وەڕێ کەوت.

"ئەو کافرانەی هەڵاتیشن بە شین و گریانەوە خۆیان بە شاری عوممان‌دا کرد، جولەندی کوڕی کەرکەڕ کە ئەوەی دی بە پەرۆشەوە گوتی: 'ئەوە چیتان بەسەر هاتووە؟' باسەکەیان بۆ گێڕاوە. ژمارەی سوپای موسڵمانانی پرسی. گوتیان: 'قوربان، بیست بەیداخیان هەیە و لەژێر هەر بەیداخێکدا هەزار سوار.' جولەند کە ئەمەی بیست، گوتی: 'حەک داوەشێن! باشە چۆن بیستهەزار کەس بەسەر ئێوەدا زاڵ بوون؟ خۆ ئێوە حەفتاهەزارا کەس بوون؟ و هەر جەوامەرد خۆی بە تەنیا غەنیمی سێهەزار کەس بوو.' ئەوجار هێندە ڕق لێیان هەستا فەرمان دا هەموویان بکوژن. باڵبازەکانی شیریان لێ هەڵکێشان و هەموو کوشتن. ئەوجار جولەند بانگی کوڕەکەی کرد و گوتی خۆت ساز کە و بە سەدهەزار سوارەوە بچۆ بۆ عێراق و یەکسەر کاولی کە. کوڕی جولەند ناوی قورجان بوو و لەنێو سوپادا لەو ئازاتری تێدا نەبوو و لە گۆڕەپانی شەڕدا غەنمی سێهەزار باڵبازی ئازا بوو. خێرا قورجان تاولی ناردە دەرەوە و سوپا لە هەموو لایەکەوە کۆ بوونەوە و بۆ ڕۆژی دووەم کەوتنە ڕێ. قورجان لەپێشی سوپاکەوە ڕۆیشت و بەو جۆرە بە خۆی هەڵدەگوت:

سوارچاکی وەک من ئەسپ نەیدیوە
ناوم ببیستێ، دوژمن بەزیوە
لە خۆی دەردەچێ هەر ئەسپێ بێتوو
ئەمن سواری بم، باڵ دەگرێ زوو
لە خۆشیان لووتکەی شاخیش بێ دەچێ
دەی دوژمن چۆن لە دەستم دەردەچێ

"دوازدە ڕۆژ بوو بە بێروونددا دەڕۆیشتن کە لەناکاو تەپوتۆزێک لە دوورەوە هەستا. قورجان هەرای لە دەستوپێوەندی کرد: 'خێرا بزانن ئەو تەپوتۆزە چییە؟' چەند باڵباز

بەلەز چوون و گەڕانەوە و گوتیان: 'شازادە، ئەوە تەپوتۆزی سوپای ئیسلامە.' قورجان دڵی خۆش بوو و گوتی: 'سوێند بە ئایینی خۆم، نابێ کەسیان بە زیندوویی بهێڵمەوە. بە تاقی تەنیا هەڵدەکوتمە سەریان و کەللەیان دەکەمە پێخوسێتی ئەسپان. دیارە ئەوە تەپوتۆزی سوپای جومەرقان بووە.' لەو لاوە کە جومەرقان سەیری سوپای کافرانی کرد، دیتی لە ئەسپتێران زیاترن. ئەوجار فەرمانی دا لا دەن و تاوڵ هەڵدەن. ئالا و کێلەکیان داچەقاندن. سوپای کافرانیش تاوڵیان هەڵدا و قورجان پێی گوتن: 'چەک لە خۆتان نەکەنەوە. کە نیوەشەو لای دا، سوار بن. ئەو نەختە خەڵکە بکوژن و لە نێویان بەرن.'

"لەو دەمەیدا کە قورجان ئەو قسانەی دەکرد، شۆفاری جومەرقان لەوێ بوو. شۆفار گەڕاوە لای جومەرقان و لە پیلانی کافران ئاگاداری کردەوە. ئەمان خۆیان گرت تا کافران خەوتن، ئەوجار جومەرقان فەرمانی بە سوپاکەی دا کە سوار بن. ئیدی سوپا پشتیان بە خودا بەست، زەنگۆڵەیان بە وشتر و چوارپێکانیانەوە کرد، سوار بوون و شالاویان بۆ کافران برد. دەنگی زەنگۆڵەکان بەرز بووەوە و موسڵمانانیش بە ئەڵڵاهوئەکبەڕ ئەڵڵاهوئەکبەڕ. دەشت و کێو پڕ کرد."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی شەشسەد و چل و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! لەو دەمەیدا کە سوپای کافران لە خەودا بوون، سوپای جومەرقان بە سواری ئەسپ و یەستر و بە ئەڵلاهوئەکبەر و زرینگەزرینگی زەنگولانەوە هەڵیکوتایە سەریان. کافران لە خەو ڕاپەڕین و سەریان لێ شێوا، بە پەلەپەل دەستیان دا شیر و شەڵم کوێرم کەس نابوێرم کەوتنە گیانی یەکتر، دۆست و دوژمنیان بۆ لێک نەدەبووە و تا وەخو هاتنەوە سەیریان کرد، تەرمی موسڵمانێکیان لە بەر دەست نییە و هەمووی ئی خۆیانە تازە زانیان کە موسڵمانان فێڵیان لێ کردوون. ئەوجار قورجان بە پاشماوەی سوپاکەی گوت: 'ئەوەی ویستمان بەوانی بکەین، ئەو ناپاکانە پێیان کردین. دەی خێرا هێرشیان بۆ بەرن.' لەو دەمەدا تەپوتۆزێک هەستا و لەژێریدا زرێبەند و ئاسنبەند دەدرەوشانەوە. سوار دەرکەوتن کە شیری هێندییان لە کەمەر دابوو و ڕمی پۆلاییینیان بە دەستەوە بوو. کە کافران ئەو تۆزەیان دی، ڕاوەستان. ئەو تۆزوخۆڵە دێوی کێوی بوو. کە دێو گەیشتە سوپای ئیسلام، جومەرقان لەگەڵ سوپاکەیدا پەلاماری کافرانیان دا. لە تاو چڕی تەپوتۆز بەری ئاسمان تاریک داهات. ئازایان ئازایەتییان دەنواند و خوێن شەپۆلی دەدا. هەر وا لە کوشتوبڕدا بوون کە ڕۆژ ئاوا بوو و هەردوو سوپا لێک جودا بوونەوە و چوونەوە تاوڵەکانیان. کە شەو ڕابرد و بەیان ئەنگوت، موسڵمانان نوێژیان کرد. ئەوجار هەردوو سوپا سوار بوونەوە، شیریان لێک هەڵکێشا و ڕیزیان بەست. یەکەمین کەس کە دەرگەی شەڕی کردەوە، قورجانی کوڕی جولەند بوو کە هاتە گۆڕەپانەوە و داوای شەڕی دەستەویەخەی کرد. جومەرقان و سوعدان لەژێر ئالا و کێلەکەکاندا بوون کە فەرماندەیەک لە بەنی عامر بۆ قورجان چوو. پەلاماری یەکدییان دا، ماوەیەک یەکتریان هێنا و برد. ئەوە بوو قورجان هێرشی بردێ، مەچەکی گرت و لە زینەکەی هەڵیگرت و بە زەوییدا دا. کافران قۆڵیان بەست و بردیانەوە نێو تاوڵەکانیان ئەوجار قورجان بە ڕاست و چەپیدا جریتی کرد و داوای پاڵەوانی کرد. فەرماندەیەکی دیکە بۆی چووە مەیدان و ئەویشی دیل کرد. تا حەوت فەرماندەی موسڵمانانی دیل کرد. ئەوجار جومەرقان بە دەنگێکی ئەوەندە بەرز هاواری کرد کە گۆڕەپانەکە پڕ بوو لە دەنگی ئەو و دڵی هەردوو سوپا لەرزی. هێرشی بۆ قورجان برد و ئەم شێعرەی خوێندنەوە:

کاتێ کە زرێ دەکەمە بەرم
کام دێو بەهێزە هەڵدێ لە بەرم
تۆش باشە هەڵێی زوو خۆت وەشێری
لای من مشکیش نی، پێت وایە شێری

"کە قورجان گوێی لە شـــێعرەکەی جومەرقان بوو، کەڵلەیی بوو، تێک چوو، جنێوی بە مانگ دا، پەلاماری جومەرقانی دا و ئەم شێعرەی گوت:

شەڕی گــــــــــــــرانت تۆ لە کوێ دیوە
گورز و گۆپاڵت بە دەست کــــــــــێ دیوە
هێشتا مــــــــــــــنداڵی نابی بۆ مەیدان
زوو خۆت پیس دەکەی دەگری لە ترســــان
ســــــــــــــەرت دەبڕم گۆشاوگۆش ئێستا
با دایکت لە بــــــــــــۆت، قوڕ کا بە سەردا

"کە جومەرقان ئەو شــێعرەی لێ بیســت، زۆر بە ڕقەوە بۆی چوو. ماوەیەکی زۆر بە شـیر خەریک بوون و لێکیان دا. ئەوجار ڕمیان هەڵگرت، بەو جۆرە هەر جارەی بە شـتێک لە شـەڕدا بوون تا دەمەو عەسر. ئەوجار جومەرقان هەڵیکوتایە سـەر قورجان، ڕمبێکی لە ســـنگی دا و وەک دارخورما بە زەوییدا دا. خێرا موســـڵمانان لێی کۆ بوونەوە و قۆڵیان بەســـت و گوریســـیان لە ملی کرد و وەک وشـــترە ڕایانکێشـــا. کە ســـوپای کافران ســـەرکردەکەیان بە دیلکراوی دیت، غیرەتیان بزووت و پەلاماری جومەرقانیان دا. ســوپای موســـڵمانانیش بەرەنگاریان بوونەوە و خەڵکێکی زۆریان لێ کوشـــتن. ئەوەی ماشـــەوە موســـڵمانان ڕاویان نان و هەر یەکەی هەلات بۆ دۆڵ و دەرەیەک . دەســتکەوتێکی فرەیان کۆ کردەوە. ئەوجار جومەرقان ئیسلامی بۆ قورجان شی کردەوە، بەلام قورجان موسڵمان نەبوو. ناچار ســـەری بڕی و کەللە ســـەرەکەی بە ســـەری ڕمبێکەوە کرد. ئەوجار بەرەو عوممان کەوتنە ڕێ.

"هێندێک لەو کافرانەی توانیان دەرباز بن و بگەڕێنەوە بۆ عوممان، جولەندپاشـــایان لە تێکشکانی سوپاکە و کوژرانی کوڕەکەی ئاگادار کردەوە. ئیدی پادشا تاجی بە زەویدا دا و بە چەپۆک بە ســـەر و گوێلاکی خۆیدا دا تا خوێنی لووتی پژا و بووراوە. کە وە هۆش هاتەوە، وەزیرەکەی بانگ کرد و گوتی: 'نامە بۆ هەموو شـــوێنەکان بنووســـە کە هیچ شـیروەشـێن و ڕمباز و تیرئەنگێوێک جێ نەمێنێت و هەموو بێن.' وەزیر نامەکانی نووسـین و بۆ هەموو ناوچەکانی ولاتی نارد. میری شارەکان سوپایان کۆ کردەوە و تەیاریان کردن و ناردیانە خزمە پادشا. وا بوو سەد و هەشتاهەزار سوار لە هەنتەشی جولەندپاشا ئامادە بوون. چاوەڕێی فەرمان بوون، بڕۆن بۆ گیانی موسـڵمانان. لەپڕ جومەرقان و سـوعدان بە چلهەزار سوارەوە گەیشتنێ.

"کە جولەند ئەو هەواڵەی بیست، خۆشحاڵ بوو و گوتی: 'بەو خۆرە قەسەم، بۆ دەرمان

دانەیەکیشیان ناهێڵمەوە و تۆڵەی خوێنی کوڕەکەمیان لێ دەسێنم.' پاشان ڕووی لە عەجیب کرد و گوتی: 'هەی سەگی عێراق، تۆ مایەی ئەم بەڵایەیت. قەسەم بە خۆر، ئەگەر تۆڵە لە دژمنەکەم نەکەمەوە، تۆ بە خراپترین ئەشکەنجەوە دەکوژم.' کە عەجیب ئەو قسەیەی بیست، پێی ناخۆش بوو و سەرزەنشتی خۆی کرد، بەڵام دانی بە خۆیدا گرت تا موسڵمانان نیزیک بوونەوە و تاوڵیان هەڵدا. کە تاریکایی شەو دنیای داگرتەوە، عەجیب بە پاشماوەی هۆزەکەی گوت: 'من ترسم لە موسڵمانان هەیە و دەشزانم کە جولەند ناتوانێت من لە شەڕی براکەم بپارێزێ، جا ئێستا دەڵێم شەو کە زۆربەی سوپا خەوتن، بە پەنایەکدا خۆمان بدزینەوە و لێرە بڕۆین و پەنا بۆ خاکی یەعرەبی کوڕی قەحتان ببەین. ئەو سوپاییەکی گەورە و زۆری هەیە و گەلێک بەهێز و بەدەسەڵاتە.' خزم و کەسەکەی عەجیب هەموو پێیان فکری چاک بوو، گوتیان: 'وا نەکەین یەکمان دەرناچین.'

"کە سێیەکی شەو تێپەڕی، عەجیب لەگەڵ هۆزەکەیدا خۆیان دزییەوە و هەڵاتن. کە ڕۆژ هەڵات، جولەندپاشا لەگەڵ دووسەد و شەستهەزار سوارچاکی زرێپۆشدا سوار بوون، تەپڵی شەڕیان کوتا. لەو بەریشەوە جومەرقان و سوعدان لەگەڵ چلهەزار پیاوی بوێر و ئازا سوار بوون.

"بەو جۆرە هەردوو سوپا ڕیزیان بەست. یەکەمین کەس کە چووە گۆڕەپانی شەڕەوە، سوعدانی دێو بوو کە وەک کێوێکی ئاسنین بە پرتاو چووە گۆڕەپانەکەوە. پاڵەوانێک لە کافران بۆی هاتە دەرەوە. سوعدان کوشتی و بانگی لە کوڕەکانی کرد کە ئاگر بکەنەوە و بۆی ببرژێنن و بۆی بەرن. کوڕەکانی وایان کرد. سوعدان گۆشتەکەی خوارد و ئێسقانەکانی کرۆشتن. کافران لە دوورەوە ڕاوەستابوون و زەق تەماشایان دەکرد و دەیانگوت: 'ئەی خۆرەتاو، لەم دێوە ڕزگارمان کە!' ئەوجار جولەند بانگی لە سوپاکەی کرد: 'ئەم نارەسەنەم بۆ بکوژن.' کە وای گوت، فەرماندەیەک هاتە دەرەوە. سوعدان ئەویشی کوشت. هەر وا کافران یەکیەک دەهاتن تا چلی لێ ڕەوانەی دۆزەخ کردن. کافران دەستیان لە شەڕی سوعدان هەڵگرت و گوتیان: 'شەڕ لەگەڵ دێو و جنۆکاندا ناکرێ!' جولەند هاواری کرد: 'بە سەد سوارەوە بۆی بچن. یا بیکوژن، یا بیگرن و بۆم بێنن.' سەد سوار بۆی چوون. سوعدان بە دڵێکی سەختتر لە ئاسن بەرەنگاریان بووەوە و شیری لێ ڕاکێشان و سەریانی کردە گۆی گۆڕەپان. حەفتا و چواریانی کوشت و ئەوانی تر هەڵاتن.

"جولەندپاشا بانگی لە دە فەرماندە کرد کە هەر یەکەیان هەزار پاڵەوانی لەژێر دەستدا بوو و پێی گوتن: 'بە تیر لە ئەسپی ئەم دڕندەیە بدەن. کە ئەسپەکەی کەوت، بیگرن و بۆم بێنن.' خێرا دەهەزار سوار پەلاماری سوعدانیان دا. کە جومەرقان دیتی وا هەزاران کەس هێرش بۆ سوعدان دەبەن، بە سوپای ئیسلامی گوت کە یارمەتی سوعدان بدەن. ئیدی موسڵمانان بەدەم تەکبیرەوە پەلاماری کافرانیان دا. هێشتا موسڵمانان نەگەیشتبوونە لای

ســوعدان كە كافران ئەســپەكەی ئەویان كوشــت و ســوعدانیان دەســتگیر كرد. لەو دەمەدا هەردوو ســوپا پێك وەربوون و شــیر تێك دەگیران. موســڵمانان لەنێو كافراندا لە نقمییێك دەچون كە لەنێو دەریادا بێ."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆكی ئەمشـــەویش كۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆكەكەی هەڵگرت بۆ شەوێكی دیكە.

## که شەوی شەشسەد و چل و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! موسڵمانان لەنێو کافراندا لە تاڵە موویەکی ڕەش دەچوون لە سەر جەستەی مانگایەکی ڕەشدا. هەر وا لە کوشتوبڕدا بوون تا ڕۆژ ئاوا بوو و لێک جودا بوونەوە. کافرەکان زۆریان لێ کوژرا. جومەرقان بە سوپاوە گەڕاوە نێو هۆزەکەیان، زۆریشیان خەمی سوعدان بوو. سوپاکەیان بەسەر کردەوە کەمتر لە هەزار کەسیان لێ کوژرا بوو. دوایی جومەرقان گوتی: 'خەڵکینە، سبەینێ خۆم دەچمە گۆڕەپان و قڕ لە پاڵەوانەکانیان دەخەم و تۆڵەی سوعدان دەکەمەوە.' ئیدی موسڵمانان بە ئاسوودەییەوە گەڕانەوە تاوڵەکانیان. لەو لاشەوە جولەند چووەوە تاوڵەکەی و لەسەر تەخت دانیشت و خەڵکەکەی لێی کۆ بوونەوە. داوای سوعدانی کرد و پێی گوت: 'گەماری هیچوپووچ، کێ کوڕەکەمی کوشت؟' سوعدان گوتی: 'جومەرقان. منیش برژاندم و خواردم.' جولەند خوێن بەری چاوی گرت و فەرمانی کوشتنی سوعدانی دا. کە میرغەزەب لێی هاتە پێش، سوعدان بە هەموو هێز و توانایی خۆیەوە زنجیری پساند و شیری لە دەستی میرغەزەب دەر هێنا، سەری ئەوی لە لەشی جیا کردەوە. ئەوجار ڕووی لە جولەند کرد. جولەند خۆی بەژێر تەختەکەیدا کرد و هەڵات. سوعدان ڕووی لە ئامادەبووان کرد و بیست کەس لە نیزیکەکانی پاشای کوشت. دوای ڕووی لە باڵبازان کرد و لێی دان و کوشتنی تا بە قوونەشەڕ لە نێو ئەوان ڕزگاری بوو، بەرەو هوردووی موسڵمانان گەڕاوە. کە موسڵمانان گوێیان لە هات و هاواری کافران بوو، لایان وا بوو، هێزی پشتیوانیان بۆ هاتووە. تا ڕادەیەک ترسی و ینگەرانی کەوتە دڵیانەوە. کەچی لەناکاو سوعدان پەیدا بوو و موسڵمانان وەک گوڵ گەشانەوە. جومەرقان گیانێکی تازەی هاتەوە بەر، سڵاوی لە سوعدان کرد. موسڵمانان پیرۆزباییان لێ کرد. کاری موسڵمانان بێرە گەیشت.

"بەڵام کافران لەگەڵ جولەندپاشادا گەڕانەوە تاوڵەکانیان و جولەند گوتی: 'خەڵکینە، سوێند بە خۆر، بە خەیاڵمدا نەدەهات کە لە مەرگ ڕزگارم بێ. خۆ ئەگەر ئەو دێوە بیگرتمایە، ڕێک دەیخواردم.' گوتیان: 'قوربان، کەسمان نەدیوە وەک ئەم دێوە ئازا بێ.' جولەند پێی گوتن: 'کە ڕۆژ بووەوە، چەکەکانتان هەڵگرن، سواری ئەسپەکانتان بن و موسڵمانان بکەنە پێپەستی ئەسپەکانتان.'

"موسڵمانان بە خۆشحاڵییەوە لە دەوری جومەرقان کۆ بوونەوە و، جومەرقان پێی گوتن: 'بە خودا دەبێ سبەینێ دەبێ بەڵایەک بە سەر کافران بێنم و ئەوەندەیان لێ بکووژم دەنکیان بۆ توو نەمێنێ و لە ناویان ببەم. وا بە چیرۆک بیگێڕنەوە.'

"بە کورتی، هەر چۆنێک بوو، هەردوو سوپا ڕۆژیان کردەوە. کە ڕۆژ بووەوە،

هەردوولا ڕیز بوون. یەکەم کەس جومەرقـان هـاتە گۆڕەپـانەوە و داوای غەنیمی کرد. جولەند گەرەکی بوو بە ســـوپاکەیەوە هێرش بکاتە ســـەر جومەرقان، لەنەکاو تۆزێک لە دوورەوە هەستا و لەژێریدا شیری هێندی و ڕمی پۆلایین دەدرەوشانەوە و پیاوانێکی وەک شێری برسی دەرکەوتن. کە هەردوو سوپا ئەو تۆزەیان بینی، شەڕیان ڕاگرت و خەڵکیان نارد هەواڵ بزانێ. نێردراوی کافران دوای ماوەیەک گەڕاوە و هەواڵی دانێ کە ئەوە سوپای موســڵمانانە بە ســەرۆکایەتیی غەریبپاشــا. نێردراوی موســڵمانانیش مژدەی گەیشــتنی غەریبپاشـــای دا بە موســـڵمانان و دڵیان خۆش بوو و بە پێشـــوازییەوە چوون. لە ئەسپەکانیان دابەزین و کوڕنۆشیان برد."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ! سوپای ئیسلام کە چاویان بە غەریب پاشا کەوت، کەیفیان ساز بوو. کورنۆشی شوکریان برد و گەڕانەوە هوردووەکەیان هۆدەی غەریب‌پاشایان ئامادە کرد. غەریب‌پاشا لە سەر تەخت دانیشت و تەواوی گەورەگەورەکان لە ڕاست و چەپیەوە ڕاوەستان و هەموو ڕووداوەکانیان بۆ گێڕاوە.

"کافرانیش لەو لاوە کە کۆ بوونەوە تەماشایان کرد عەجیب دیار نییە. ئەملا عەجیب، لای دی عەجیب. عەجیب لە هیچ دیار نەبوو. بە جولەندیان ڕەنگە ڕای کردبێ. ئیدی جولەند وەک شێتی لێ هات و بە بەرد لە ئەژنۆی خۆی دەدا. گوتی: 'قەسەم بە خۆر ئەو گەمارە ناپاکە لەگەڵ هۆزەکەیدا ڕای کردووە بەرەو بێروونەکان. بەڵام ورەتان بەرز بێ و بەجەرگ بن و لە موسڵمانانیش خافڵ نەبن.'

"بە کورتی، هەردوولا شەویان بەڕێ کرد. کە ڕۆژ بووەوە، غەریب نوێژی کرد و نامەیەکی نووسی دای بە سەهیمی برای و گوتی بیبە بۆ کافران. کە سەهیم لە کافران نیزیک بووەوە، گوتیان: 'چیت دەوێ؟' گوتی: 'کارم بە پاشاکەتانە.' گوتیان: 'بۆستە تا مۆڵەتت بۆ وەربگرین.' لەوێ ڕاوەستا. ئەوانیش جولەندپاشایان لە هاتنی سەهیم ئاگادار کردەوە. جولەند داوای سەهیمی کرد و پێی گوت: 'کێ ناردووتی؟' سەهیم گوتی: 'نێردراوی غەریب‌پاشام. نامەکەم لێ وەربگرە و وەڵام بدەرەوە.' جولەند نامەی وەرگرت و کردییەوە؛ نووسرابوو: 'بە ناوی خودای بەخشندەی دلۆڤان و سڵاو لە ئیبراهیم. جگە لە خودا کەس شایانی پەرستن نییە کە زەوی و ئاسمانی ئافراندووە، پێغەمبەرانی ناردووە، ئاسمانی هەڵداوە و دارانی ڕوواندووە. بە نێوی ئەو خودایەی کە هەمووان دەبینێ و خۆی نابینرێ. ئەی جولەند، بزانە کە جگە لە دینی ئیبراهیم هیچ دینێکی دیکە نییە و موسڵمان ببە تا لە سزای شیر و ڕۆژی ڕەستاخێز ڕزگارت ببێ. دڵنیا بە ئەگەر موسڵمان نەبی، تێدا دەچی. ئینجا ئەو سەگە ستەمکارە، واتە عەجیبم، بۆ بنێرە تا هەقی خوێنی دایک و باوکمی لێ بسێنم.' جولەند بە سەهیمی گوت: 'بگەڕێوە و بڵێ کە عەجیب لەگەڵ هۆزەکەیدا هەڵاتووە. هەروەها جولەند واز لە دینی خۆی ناهێنێ و سبەینێ بۆ شەڕ ئامادە بە. ئێمە خۆر پشتیوانمان دەبێ.' سەهیم گەڕاوە کن براکەی و باسەکەی بۆ گێڕاوە.

"کە ڕۆژ بووەوە، موسڵمانان چەکیان هەڵگرت، سواری ئەسپە فیلاساکانیان بوون، تەپڵی شەڕیان کوتا و بەدەم گوتنی ئەڵڵاهوئەکبەرەوە چوونە گۆڕەپانی شەڕەوە. یەکەم کەس جومەرقان چووە گۆڕەپانەوە و داوای ڕکابەری کرد و گوتی: 'من بکوژی قورجانی کوڕی جولەندم. کێیە دەیهەوێ بێتە شەڕی من و تۆڵەی خوێنی قورجانم لێ بکاتەوە؟' کە

جولەند ناوی قورجانی کوڕی بیست، لە سوپاکەی خوڕی و گوتی: 'ئەو سوارەم بۆ بێنن تا گۆشتی بخۆم و خوێنی بنۆشم.' لە جێوە سەد سوار پەلاماریان دا. زۆربەیان کوژران و فەرماندەکەیان هەڵات. کە جولەند ئازایەتی جومەرقانی بینی، هاواری کرد: 'خێرا هێرشی بۆ ببەن.' ئیدی کافران ئالای سووریان هەڵدا و ڕوو بە موسڵمانان شەکاندیانەوە. هەردوو سوپا پێک وەر بوون و کەوتنە گیانی یەک. تۆ بڵێی کە دوو دەریا تێکەڵ بە یەک بوون. سەری سەران ببووە پێپەستی ئەسپان و ئازایان لێوەشاوەیی خۆیان دەنواند. هەر بەو جۆرە ئاگری شەڕ بڵێسەی دا تا شەو داهات. ئەوجار هەردوو سوپا لێک جودا بوونەوە و گەڕانەوە تاوڵەکانیان.“

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەش‌سەد و چل و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! که ڕۆژ ئاوا بوو، ســـوپاکان له یەک جیا بوونەوە و گەڕانەوە بۆ خێوەتگەکانی خۆیان. غەریب‌پاشـا لەسـەر تەخت دانیشـت و گەورەکان لەدەوری بوون. بە خەڵکەکەی گوت: 'من لە داخی هەلاتنی عەجیب خەریکە شـــەق دەبەم و نازانم بۆ کوێ چووە. ئەگەر نەیدۆزمەوە و تۆڵەی خوێنی دایک و باوکمی لێ نەکەمەوە، لە داخان دەمرم.' سەهیم چووە پێشەوە و کڕنۆشی برد و گوتی: 'گەورەم، من دەچمە نێو سوپای کافرانەوە و هەواڵی ئەو نەگریســەت بۆ دێنم.' غەریب ڕێی دا. سـەهیم خێرا جلوبەرگی کافرانی کردە بەری و خۆی وەک ئەوان لێ کرد و ڕۆیشت خۆی گەیاندە نێویانەوە.

"کە گەیشـــتە هوردووی کافران، سـەیری کرد خەوتوون و جگە لە پاسـەوانان کەس بەخەبەر نییە. ئەوجار چووە تاوڵی جولەندپاشـا، ئەویش خەوتبوو. بەنگی بۆنداری بردە بن لووتی وەک مردوو لێ کرد. ئەوجار هێســتریکی هێنا و بەڕەیەکی لە پاشـــاوە پێچا و نایە سەر وشتر و لێی خوڕی تا گەیشتەوە تاوڵی غەریب‌پاشـا. هەنتەشییان بە سـەرسامییەوە ســـەیریان کرد و گوتیان: 'کێیت؟' ســـەهیم پێکەنی و خۆی ئاشـــکرا کرد، ناســـییانەوە. غەریب‌پاشـــا گوتی: 'دەی ســـەهیم، چیت لە باراندایە؟' ســـەهیم گوتی: 'جولەندی کوڕی کەرکەڕم هێناوە.' کە جولەند بەڕەکەی کردەوە، غەریب‌پاشا جولەندی دی و گوتی: 'سەهیم، وە هۆشی بێنەوە.'

"ســـەهیم ســـرکە و کوندەری خســـتە بەر لووتی و وە هۆش هاتەوە و چاوی کردەوە. تەماشـــای کرد لە نێو موســـڵماناندایە و گوتی: 'ئەم خەوە ناخۆشـــە چییە دەیبینم؟!' دەم‌ودەست چاوی قووچاندەوە و خەوتەوە. سەهیم شەقێکی لێ دا و گوتی: 'چاوت هەڵێنە خوێڕی.' جولەنـد چـاوی کردەوە و گوتی: 'ئێرە کوێیە؟' ســـەهیم گوتی: 'بـارەگـای غەریب‌پاشـایە.' کە جولەند ئەم قسـەیەی بیسـت، گوتی: 'پاشـا، تکات لێ دەکەم داڵدەم بدە. من هیچ تاوانێکم نییە. عەجیبی برات شـەڕی لەنێوان من و تۆدا هەڵگیرسـاند و خۆی بۆی دەرچوو.' غەریب گوتی: 'دەزانی بۆ کوێ چووە؟' جولەند گوتی: 'ســـوێند بە خۆر، نازانم!' غەریب گوتی بیبەستنەوە و ئاگاتان لێی بێ.

"ئەوجار هەر کەســـەی چووەوە ناو هۆدەکەی خۆی. جومەرقان بە هۆزەکەی گوت: 'نیازم وایە ئەم شـەو کارێک بکەم، ببێتە مایەی ڕووســـووریم.' گوتیان: 'چی دەکەی، بیکە. ئێمە گوێڕایەڵتین.' گوتی: 'چەکەکانتـان هەڵگرن و هێواش‌هێواش بەرەو هوردووی کـافران بڕۆن و بڵاو ببنەوە. هەر کاتێک دەنگی ئەڵلاهوئەکبەڕی منتان بیســـت، ئێوەش تێکڕا بڵێن ئەڵلاهوئەکبەڕ و لە تاوڵەکان دوور کەونەوە.' لە جێوە هۆزی جومەرقان چەکیان هەڵگرت

و بەرەو هوردووی کافران ڕۆیشـــتن. دوای کاتکۆیەک جومەرقان بە دەنگی بەرز گوتی ئەڵڵاهوئەکبەڕ. دەنگی ئەڵڵاهوئەکبەر وڵاتی پڕ کرد و کـافرانی لە نەترە برد. کـافران لە ترسـان بە پەلەپڕووزە و پەشـۆکاوی و خەواڵوویی ڕاپەڕین و دەسـتیان دا شـیر و کەوتنە گیانی یەک. موسڵمانان لێیان دوور کەوتنەوە و بەرەو دەروازەی شار چوون. دەرگاوانیان کوشـت و چوونە شـارەوە. ماڵیان تاڵان کردن و ژنەکانیان بە دیل گرتن. کاری جومەرقان بێرە گەیشت.

بەڵام کاتێک غەریبپاشا گوێی لە دەنگی ئەڵڵاهوئەکبەڕ بوو، گورج هەستا سوار بوو و سـوپاش ئامادە بوو، سـەهیم لە پێشـدا چووە هوردووی کافرانەوە و تەماشـای کرد ئەوە جومەرقان و هۆزی بەنی عامر شەو پەلاماریان داون و کافرانیان لە گیانی یەک بەرداوە.

کە ئەوەی دیت خێرا گەڕاو بۆ لای غەریبپاشـا و بابەتەکەی بۆ گێڕاوە. بەڵام کافران تا بەیانی لە یەکتریان کوشـت و دەسـتیان لێک نەپاراسـت. بەیانی غەریبپاشـا بە سـوپاکەی گوت: 'ئەی یەکتاپەرسـتان، هێرش بکەنە سـەر کافران!' موسـڵمانان پەلاماری کافرانیان دا و کردنیانە خۆراکی شیر و تیرەکانیان. ئەوانەی نەکوژران، ویستیان بچنەوە شار. جومەرقان لەو لاوە بۆیان هاتە دەرەوە و خەڵکێکی زۆری لێ کوشتن و ئەوانەی دەریش چوون ڕوویا دەشت و کێوان.“

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: خاوەنشکۆ! سوپای موسڵمانان چوونە شاری عوممانەوە. غەریبپاشا چووە کۆشکی جولەند و لەسەر تەختەکەی دانیشت. گەورە و فەرماندەکان لای کۆ بوونەوە. ئەوجار داوای کرد جولەند بێنن. هێنایان و، ئیسلامی بۆ شی کردەوە و پێی ناساند. جولەند قەبووڵی نەکرد. غەریبپاشا فەرمانی دا کە لە داری بدەن. ئەوەندەیان تیر پێوە نا شێوەی ژیشکی دەدا. دوای ئەوانە غەریبپاشا کەوایەکی شۆڕی شکۆداری بە جومەرقان بەخشی. شارەکەی پێ سپارد و گوتی: 'ئەم شارە تۆ گرتت؛ بۆ تۆیە.' لە جێوە جومەرقان کورنۆشی برد و زەوی ماچ کرد و نزای بەردەوامی و شکۆمەندی بۆ کرد. ئەوجار کۆگەکانی جولەندی کردنەوە و تا دە ڕۆژ زێڕ و زیوی بە سەر باڵبازاندا پەخش کردەوە.

"ماوەیەکی پێ چوو، شەوێکیان غەریب خەوتبوو و خەونێکی زۆر ناخۆشی دیت، لە ترسان ڕاچڵەکا و سەهیمی برای لە خەو هەستاند و گوتی: 'لە خەونمدا بوو لە دەشتێک بووین. دوو باڵندەی زەبەلاح بۆمان هاتن، قاچیان دەتگوت ڕمبە. پەلاماریان داین.' سەهیم گوتی: 'قوربان، ئەوە دوژمنێکی گەورەیە و ئاگات لە خۆت بێ.' غەریبپاشا خەوتەوە. کە ڕۆژ بووەوە، داوای ئەسپی کرد و سوار بوو. سەهیم گوتی: 'کاکە، بۆ کوێ دەچی؟' غەریب گوتی: 'زۆر دڵتەنگم. دەمەوێ دە ڕۆژێک بگەڕێم تا دڵم بکرێتەوە.' سەهیم گوتی: 'دەی هەزار سوار لەگەڵ خۆت ببە.' غەریب گوتی: 'یا هەر تۆ دەبەم، یا کەس نابەم.'

"ئیدی غەریب و سەهیم سوار بوون و ڕوویان لە دەشت و دەر کرد. بە بێروون و مێرگەکاندا دەڕۆیشتن و بەردەوام لەم مێرگەوە دەچوون بۆ ئەو مێرگ تا گەیشتنە مێرگێکی خۆش و سەرسەوز کە پڕ بوو لە دار و سەوزایی و کانی. ئەو مێرگەیان وەبەر دڵ کەوت و لە ژێر دارێکدا دانیشتن، میوەیان خوارد و لە کانییەکانی ئاویان خواردەوە. پاشان درێژ بوون تاوێک بحەسێنەوە کە خەویان لێ کەوت. لەپڕ دوو نڕناشیان لێ پەیدا بوو یەکەی یەکێکیانی بە شانیدا دا و فڕی. کە غەریب و سەهیم وە خەبەر هاتن، تەماشایان کرد ئەوە بە ئاسمانەوەن و لە سەر شانی نڕناشێکن. یەکیان سەری وەک سەری سەگ بوو و ئەوی دیکەیان وەک سەری مەیموون. مووی لەشیان لە کلکی ئەسپ دەچوو و چڕنووکیان وەک هی دڕندەکان بوو. کە غەریب و سەهیم ئەمەیان بینی، گوتیان: 'سوبحانەڵڵا ئەمە چ بەڵایەک بوو تووشی بووین؟'

"هۆکاری ئەم ڕووداوە ئەوە بوو کە پاشایەکی جنۆکان بە ناوی مەرعەش، کوڕێکی بە ناوی ساعیقە هەبوو. کچێکی لە جنۆکان خۆش دەویست ناوی نەجمە بوو. ساعیق و نەجمە لە تەشکی باڵنداندا لەو مێرگەدا بوون. غەریب و سەهیم کە ئەوانیان دیت، وایان زانی

باڵندەن و تیریان تێ گرتن، تیرێک لە ســـــاعیق درا. نەجمە زۆری پێ ناخۆش بوو، گورج هەڵیگرت و فڕی. بردییەوە لە بەردەگەی کۆشـــکی باوکی ســــاعیقدا داینا. دەرگەوانەکان هەڵیـانگرت و بردیـانە کن بـاوکی. کە مەرعەش چـاوی بە کوڕەکەی کەوت و تیری بە پشـتیەوە دیت، هاواری کرد ئەی ڕۆڵەڕۆ. ئەوە کێ وای لێ کردووی تا ڕۆژی ڕووناکی لێ بکەم بە شـــەو؟' کوڕە چاوی هەڵهێنا و گوتی: باوکە! لە مێرگی عویون پیاوێکی مرۆ تیری پێوە نام... هێشتا ساعیق قسەکەی تەواو نەکردبوو کە گیانی دەرچوو. ئیدی باوکی بە سەر و گوێلاکی خۆیدا دا و بە دوو نڕناشـی گوت: 'هەر ئێسـتا بچن بزانن کێ لە مێرگی عویونە بیهێننە ئێرە.' ئەو دوو نڕناشـە چوون، تەماشـایان کرد غەریب و سـەهیم لەوێ خەوتوون، ئیدی هەر لە خەودا هەڵیانگرتن و بردیاننە لای مەرعەش."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی شەشسەد و پەنجا و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! کاتێک ئەو دوو دێوە غەریب و سەهیمیان هێنایە لای پادشای جنۆکان. غەریب و سەهیم تەماشایان کرد کە مەرعەش وەک کێوێکی بڵند لەسەر تەختی وڵات دانیشتووە و چوار سەری هەیە. یەکەمیان لە شێر، دوومیان لە فیل، سێیەمیان لە پڵنگ و چوارەمیان لە ورچ دەچێ. ئەوجار نرناشەکان گوتیان: 'قوربان، ئەم دووانەمان بە خەوتوویی دۆزییەوە.' مەرعەش بە توورەییەوە چاوی لێ کردن. تێک چوو و هەڵچوو و بڵێسە لە دەمیەوە هاتە دەرێ و گوتی: ''هەی خوێڕیترینی مرۆان، کوڕەکەی من ئێوە کوشتووتانە و ئاگرتان لە جەرگم بەر داوە.' غەریب گوتی: 'بە خودای تاقانە و بە ئیبراهیم ئێمە کەسمان نەکوشتووە!' کە مەرعەش گوێی لێ بوو ناوی خودای یەکتا و ئیبراهیمی هێنا، زانی کە موسڵمانن. ئاخر مەرعەش ئاگرپەرست بوو. لە جێوە فەرمانی دا: 'دا خوداکەی من بێنن.' گورج تەنوورێکی زێڕینیان هێنا ئاگریان تێدا کردەوە هەزوێڵەیان بە ئاگرەکەوە کرد. ئەوجار بڵێسە ئاگری سەوز و زەرد و سوور هەستا. مەرعەشپاشا و هەنتەششییان کڕنۆشیان بۆ برد، بەڵام غەریب و سەهیم گوتیان ئەڵڵاهوئەکبەڕ و شایەدمانیان هێنا. کە مەرعەشپاشا سەری هەڵهێنا، دیتی غەریب و سەهیم کڕنۆشیان نەبردووە و گوتی: 'هەی نەگریسانە، ئەوە بۆچی کڕنۆشتان نەبرد؟' غەریب گوتی: 'خۆت نەگریسی. جگە لە خودا، کەس شایانی ئەوە نییە کڕنۆشی بۆ بەری.' کە مەرعەش ئەو قسەیەی بیست، چاوەکانی سوور هەڵگەڕان و گوڕاندی: 'کوڕە ئەم دوو سەگەم بۆ ببەستنەوە و لە خودای من نیزیکیان خەنەوە!' دەمودەست بەستنیانەوە و گەرەکیان بیانخەنە تەنوورەکەوە کە لەپڕ سووچی یەکێک لە بورجەکانی کۆشکەکە داڕما و کەوتە سەر تەنوورەکە، تەنووری شکاند و ئاگری دامرکاندەوە. دیسان غەریب گوتی: 'ئەڵڵاهوئەکبەڕ.' مەرعەش گوتی: 'هەی سووک و چرووک، بە خودای گەورەم، تۆ جادووگەری، بۆیە ئاوای لێ هات.' غەریب گوتی: 'شێتە، ئەگەر خوداکەت هیچی بزانیبایە، خۆی لەمە دەپاراست.' مەرعەش بەو قسەیە تێک چوو و کەللەیی بوو و جنێوی بە غەریب دا و گوتی: 'بە دینم قەسەم، بە ئاگر نەبێ، ناتکوژم.' ئەوجار فەرمانی دا کە بیانخەنە زیندانەوە. سەد نرناشی ڕاسپارد کە چرپی و ئەنجینەیەکی زۆر کۆ بکەنەوە. کە کۆیان کردەوە، فەرمانی دا گڕی دەن. ئاگریان هەڵکرد و تا دەمەو بەیان ئاگر بڵێسەی دەدا. ئەوجار مەرعەش لەسەر تەختێکی زێڕینی ڕازاوە بە نەخش و نیگار بەسەر فیلێکەوە دانیشت و دەستوپێوەندەکەی لە ڕاست و چەپییەوە ڕیز بوون. دوایە غەریب و سەهیمیان هێنا. کە ئەمان ئاگرەکەیان دی، پەنایان بە خودای تاک و تەنیا برد. هەر وا لە خودا دەلالانەوە و دەپاڕانەوە کە هەورێک لە ڕۆژئاواوە هات و بە خوڕەم دایکردە باران و ئاگری

کوژاندەوە پاشـا و سـوپاکەی ترس نیشـتە دڵیان و خێرا خۆیان بە کۆشـکدا کرد. ئەوجار پاشا ڕووی لە وەزیر و گەورەکانی وڵات کرد و گوتی: 'لەبارەی کاری ئەم دووانەوە دەڵێن چی؟' گوتیان: 'قوربان، ئەگەر ئەوان لە سـەر حەق و ڕاسـتی نەبان، ئاگرەکە وای لێ نەدەهات. ئێمە لامان وایە کە لەسـەر هەقن و ڕاسـتگۆن.' مەرعەش گوتی: 'منیش بۆم دەر کەوتووە کە ئاگر شـیاوی پەرسـتن نییە. ئەگەر بە ڕاسـتی خودا بایە، دەیتوانی خۆی بپارێزێ. هەر بۆیە ئەوە لە ئێسـتاوە باوەڕم بە بەدیهێنەری ئاگر هێنا. ئەی قسـەی ئێوە چییە؟' گوتیان: 'قوربان، ئێمە لە پەیڕەوانی تۆین.' ئەوجار پاشـا داوای غەریب و سـەهیمی کرد. کە هێنایانن، پاشـا هەسـتایە سـەر پێ، غەریبی لە باوەشـی گرت و تەوێڵی ماچ کرد. جنۆکەکانیش لە غەریب و سەهیم کۆ بوونەوە و سەر و دەستیان ماچ کردن."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشكۆ! مەرعەش، پادشای جنۆكان لە هۆزەكەی كەوتنە سەر ڕێی ڕاست و غەریب و سەهیمیان بانگ و دەست و تەوێڵیان ماچ كردن. ئەوجار پاشا لەسەر تەختی دەسەلات دانیشت و غەریب و سەهیمی لە ڕاست و چەپی خۆیەوە دانا و گوتی: 'وەچەی ئادەم، بڵێین چی تا موسڵمان ببین؟' غەریب گوتی: 'بڵێن، لائیلاهە ئیللەڵلا.' ئیدی پاشا و خەڵكەكەی شایەدومادیان هێنا. ئینجا غەریب فێری داب و نەریتی ئایینی كردن. ئینجا غەریب خەڵكەكەی بیر هاتەوە و ئاخێكی قووڵی هەڵكێشا. پاشای جنۆكان گوتی: 'دەی ئێستا كە ناخۆشی و مەینەت بەسەر چوو و كاتی خۆشی و شادییە، ئەو ئاخە چی بوو هەڵت كێشا؟' غەریب گوتی: 'جەنابی پاشا، من دوژمنم زۆرە، دەترسم بزانن من لە هەوێڵدا نیم و شتێك بەسەر خەڵكەكەمدا بێنن.' ئەوجار بەسەرهاتی خۆی و عەجیبی بۆ گێڕاوە. پاشا گوتی: 'گەورەی مرۆیان، هەر ئێستا یەكێك دەنێرم هەواڵیانت بۆ بێنێ. تۆش ماوەیەك لێرە بمێنەوە تا چاوم لە بینینت تێر دەبێ.'

"پاشان مەرعەش دوو درنجی بانگ كرد، یەكێكیان ناوی كولیجان و ئەوی دیكەیان ناوی قوریجان بوو. كە درنجەكان هاتن و كوڕنۆشیان برد. مەرعەش پێی گوتن: 'هەر ئێستا بچن بۆ یەمەن و هەواڵی سوپاكەی غەریب و سەهیم بێننەوە.' لە جێوە درنجەكان بۆی دەرچوون. كاری غەریب و سەهیم بێرە گەیشت.

"كە ڕۆژ بووەوە، سوپای موسڵمانان بەرەو كۆشكی غەریبپاشا چوون. خزمەتكارەكان پێیان گوتن كە پاشا كازیوەی بەیانی لەگەڵ سەهیمی برایدا لە كۆشك چوونە دەرێ. فەرماندەكانی سوپا كە ئەمەیان بیست، خێرا بڵاو بوونەوە و بە دەشت و كێودا گەڕان تا گەیشتنە مێرگی عویون. سەیریان كرد چەكەكانیان لەوێ كەوتوون و ئەسپەكانیان هەر وا دەسووڕێنەوە. بەوەدا زانیان كە غەریب و سەهیم هەر لەو شوێنەدا ون بوون. ئەوە بوو بڵاو بوونەوە و تا سێ ڕۆژ كێو و شیو و دەشت و دەر گەڕان و شوێنەوارێكیان لێ نەدۆزینەوە. شۆفارەكانی عەجیب هەواڵی دیارنەمانی غەریبیان گەیاندێ. عەجیب خۆشحاڵ بوو و چووە لای یەعرەب پاشای كوڕی قەحتان. پاشا دووسەد هەزار پیاوی ئازای دایێ. بە سوپایەكی گەورەوە وەڕێ كەوت تا گەیشتنە شاری عوممان. جومەرقان و سوعدان بەرەنگاری بوونەوە. خەڵكێكی زۆر لە موسڵمانان كوژران. ئەوانەی مانەوە كشانەوە و چوونەوە شار. دەروازەكانیان داخست و لە قەڵادا پاسەوانییان كرد. لەو دەمەدا كولیجان و قوریجان گەیشتنێ و دیتان موسڵمانان گەمارۆ دراون. ڕاوەستان تا شەو داهات. ئەوجار هەردوو درنجەكە بە شیری تیژ كە درێژییەكەیان دوازدە باڵ دەبوو، پەلاماری كافرانیان دا

و به ئەڵلاهوئەکبەڕ ئەڵلاهوئەکبەڕ نەترەیـان برد. کـافران به ترس و شـــڵەژاوییەوە لە تاوڵەکانیان هەڵاتنە دەرێ. دەڵەرزین و ســـەریان لێ شـــێوابوو. ئیدی چەکیان هەڵگرت و کەوتنە گیـانی یەکـدی. درنجەکـان به دەنگێکی بەرز دەیـانگوت: 'ئێمە کۆیلەکـانی غەریبپاشاین.'

"به کورتی، تا نیوەشەو به شیرەوە لە سەریان بوون و کافران وایان دەزانی کە دەشت و کێو پڕ لە جنۆکەیە. هەر بۆیە دەســـتیان کرد به هەڵاتن. یەکەم کەس کە هەڵات، عەجیب بوو."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی شەش‌سەد و پەنجا و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! گوتمان کافران هەر یەکەی بە لایەکدا هەڵاتن و عەجیب لە پێش هەموویاندا هەڵات. موسڵمانان سـەریان سـوورِ مابوو. ئەو دوو درنجە پشـتملی کافرانیان دەگرت و دەیان کوشـــتن، بەو جۆرە هەموویان ڕاو نان بە دەشـــت و دەردا بڵاوەیان پێ کردن. جگە لە پەنجـاهەزار کەس، هیچیـان ڕزگـاری نەبوو و ئەوانیش بە برینـداری و ڕســـواییيەوە گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەیان. ئەوجار درنجەکان بانگی موســـڵمانانیان کرد: 'هۆ سـوپای ئیسلام پاشاکەتان و براکەی لای مەرعەشی پاشـای جنۆکان میوانن. سڵاوتان لێ دەکەن و بەم زووانە دەگەڕێنەوە.'

"کە موسڵمانان هەواڵی ساغ و سلامەتی غەریب و سەهیمیان بیست، خۆشحاڵ بوون. درنجەکانیش گەڕانەوە و هەواڵەکەیان بۆ غەریب‌پاشـا گێڕاوە و ئەویش خەیاڵی ئاسـوودە بوو. ئینجا مەرعەش‌پاشـا گوتی: 'برا، پێم خۆشـە بە وڵاتەکەماندا بگەڕێین و شـاری یافسـی کوڕی نووحت پیشان بدەم.' غەریب گوتی: 'زۆر باشە، پێم خۆشە.' ئەوجار مەرعش داوای دوو لە ئەسـپەکانی کرد و غەریب و سـەهیم سـوار بوون. مەرعەش و هەزار نرِناشـیش سوار بوون و بۆ سەیر و پیاسە بە کێو و بێرووندا کەوتنە ڕێ تا گەیشتنە شاری یافسی کوڕی نووح. ورد و درشتی شار بە پێشوازییانەوە هاتن و مەرعەش و غەریب‌پاشا لەگەڵ خەڵکێکی زۆردا چوونە شـاری یافسـی کوڕی نووحەوە و لەسـەر کورسـییەکەی دانیشـتن. ئەو کورسـییە لە مەرمەڕ بوو، پێچکە زێڕەکانی نەخشـێنراو بوون. بەرزییەکەی دە باڵ بوو و فەرشـی ڕەنگاورەنگیان لە سـەر ڕاخسـتبوو. کاتێک خەڵکی شـار لەبەردەم مەرعەشـدا ڕاوەستان، مەرعەش پرسی: 'ئەری نەوەکانی یافس، باوباپیرانتان کێیان دەپرست؟' گوتیان: 'ئێمە دیتمان ئەوان ئاگرپەرســـت بوون و ئێمەش پەیرەویمان لێ کردن.' مەرعەش گوتی: 'دەی خەڵکینە، من بۆم دەرکەوت کە ئاگر بەدیهێنراوێکە لە بەدیهێنراوەکانی خودای یەکتا و باوەڕم بە بەدیهێنەری ئاسـمانەکان و زەوی هێنا. جا ئێوەش موســـڵمان بن تا لە ســـزای خودا پارێزراو بن.' لەڕێوە هەموویان بە گیان و دڵ موســـڵمان بوون. مەرعەش دەســـتی غەریبی گرت و بە کۆشـکی یاسـفیدا گێڕای و شـتە سـەیر و سـەمەرەکانی ئەو کۆشـکەی نیشان دا.

"ئەوجار بردییە جبەخانەوە و چەکی یافسـی کوڕی نووحی پێشـان دا و غەریب چاوی بە شـیرێک کەوت کە بە بزمارێکی زێڕینەوە هەڵیانواسـیبوو. غەریب گوتی: 'جەنابی پاشـا، ئەم شـیرە هی کێیە؟' مەرعەش گوتی: 'ئەوە هی یافســە کە بەوە زەفەری بە مرۆ و جنۆکە دەبرد. ئەو شـیرە جوردومی دانا دروسـتی کردووە و ناوی گەورەکانی لەسـەر نووسـیوە.

ئەگەر ئەو شیرە لە کێو دەن، کێو دوولەت دەکا. ناویشی ماحیقە.' غەریب کە ئاوا پەسنی شیرەکەی بیست، دەستی برد دایگرت. وەک خۆر دەدرەوشاوە، درێژییەکەی دە و پانییەکەی سێ بست بوو. غەریب ویستی لەگەڵ خۆی بیبا، مەرعەش گوتی: 'ئەگەر بتوانی بەکاری بێنی، دەستت بە رووتەوە نانێم.' گوتی: 'ئەیچۆن، دەتوانم.' ئیدی توند گرتی، بەکاری هێنا و لە دەستیدا وەک گۆچانێکی دار بوو. هەنتەشییان پێیان سەیر بوو، گوتیان: 'ئەی ئافەرین، شاسوار.' ئینجا مەرعەش بە غەریبی گوت: 'ئەم کۆگایانە کە پاشایانی سەر زەوی بە تاسەیانەوەن، لەمەودوا هی تۆن. دەی ئێستا سوار بە تا بگەڕێین.' غەریب و مەرعەش سوار بوون و مرۆ و جنۆکانیش لە خزمەتیاندا بوون."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی شەشسەد و پەنجا و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! غەریبپاشا و مەرعەشپاشا هەر وا لە نێو شاردا دەگەڕان و سەیری خانوو و گەڕەک و کۆڵانەکانیان دەکرد. ئەوجار لە شار هاتنە دەرەوە و چوون بۆ سەیری باخ و باخات و تا ئێوارە خەریکی پیاسە و گەڕان بوون. ئەوجار گەڕانەوە کۆشکەکەی یافسی کوڕی نووح. سفرەیان بۆ ڕاخستن. مەرعەش و غەریب و سەهیم نانیان خوارد. ئەوجار غەریب بە پاشای جنۆکانی گوت: 'جەنابی پاشا، دەمەوێ بچمەوە لای خەڵکەکەم.' مەرعەش گوتی: 'برا، قەسەم بە خودا لێت جیا نابمەوە و هەتا مانگێک ناهێڵم لێرە ببزوویت.' ناچار غەریب مانگێک لە شاری یافسی کوڕی نووح ماوە. مەرعەشپاشا دیار و شتی دانسقەی وای دەداین کە هیچیان لای پاشایانی مرۆ دەست نەدەکەوتن. تاجێکی گەوهەرنیشانی داین کە نرخەکەی لە گوتن نەدەهات. دوایی ئەو دیارییانەی کردە سندووقانەوە و پازدە نڕناشی بانگ کرد و پێی گوتن: 'خۆتان بۆ سەفەر ئامادە کەن و غەریبپاشا و براکەی بگەیەننەوە وڵاتی خۆیان.' ئەو شەوە خەوتن. کە ڕۆژ بووەوە، حەفتا هەزار نڕناش کە گەورەکەیان ناوی بورقان بوو، بە تەپڵ و کەڕەناوە هاتن. هاتنەکەشیان لەبەر شتێکی سەیر بوو. ئەویش ئەوە بوو کە بورقان خاوەنی شاری عەقیق بوو کۆشکێکی زێڕینی هەبوو و حوکمڕانی پێنج قەڵا بوو و هەر قەڵایەک پێنجسەد هەزار نڕناشی تێدا بوو، ئامۆزای مەرعەش بوو. نڕناشێک لە هۆزی مەرعەش کە بە ڕووالەت موسڵمان و لە دڵدا کافر بوو، لە هۆزی خۆی دادەبڕێ و دەچێتە شیوی عەقیق و خۆی گەیاندبووە کۆشکی بورقانپاشا. هەواڵی موسڵمانبوونی مەرعەشی دابووێ و هەموو باسەکەی بۆ گێڕابووەوە. جا بورقانپاشاش بە بیستنی ئەم قسەیە تووڕە بووبوو و گوتبووی: 'بە دینم، ئامۆزاکەم و خەڵکەکەی و ئەو مرۆیانەش لەناو دەبەم و جووقەواریان لێ ناهێڵمەوە.' ئەوجار خێڵی جنۆکانی بانگ کردبوو و حەفتاهەزار نڕناشی لێ هەڵبژاردبوون و وەڕێ کەوتبوون تا گەیشتبوونە شاری مەرعەشپاشا. لەوێ لە دەرەوەی شار دابەزیبوون و تاوڵیان هەڵدابوو. ئەوە بوو لە جێوە مەرعەشپاشا نڕناشێکی بانگ کرد و پێی گوت: 'بڕۆ بۆ لای ئەو سوپایە و زوو هەواڵیانم بۆ بێنەوە.' نڕناش چووە هوردووی بورقانپاشاوە. لێیان پرسی: 'کێیت؟' گوتی: 'نێردراوی مەرعەشپاشام.' بردیانە لای بورقانپاشا. نڕناش کڕنۆشی بۆ برد و گوتی: 'جەنابی پاشا، من مەرعەشپاشا ناردوومی تا نیازتان بزانم.' بورقانپاشا گوتی: 'بچۆوە بۆ لای مەرعەشپاشا و پێی بڵێ کە بورقانی ئامۆزات سڵاوی بۆت هەبوو.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی شەشسەد و پەنجا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! بورقانپاشـــا گوتی: بچۆوە بۆ لای مەرعەشپاشـــا و پێی بڵێ بورقانپاشا سڵاوی دەگەیاندی. نێردراوەکە لەڕێوە گەڕاوە و هەواڵەکەی گەیاند. مەرعەش بە غەریبی گوت: 'تۆ لەسەر تەخت دانیشە تا من دەچم سەرێ لە ئامۆزاکەم دەدەم.' ئیدی چوو بۆ لای بورقان. بورقان خۆی خۆش کردبوو کە ئەگەر مەرعەشپاشـــا چوو لەوێ قۆڵبەســـتی بکەن و بیگرن. فەرمانی دا دێوەکان هەموو کۆ بوونەوە و پێی گوتن: 'هەر کاتێک من باوەش بە ئامۆزاکەمدا دەکەم، ئێوە خێرا بیگرن و دەست و لاقی شەتەک دەن.' وا بوو مەرعەش بە خۆشحاڵییەوە چوو بۆ لای ئامۆزاکەی، بورقانپاشا لە بەری هەستا و باوەشی پێدا کرد. خێرا نڕناشەکان پەلاماریان دا و گرتیان. مەرعەش سەیری بورقانی کرد و بورقـان گوتی: 'خوێڕی، ئەوە چییە؟ ئەی هیچوپووچترینی جنۆکـان، ئەوە تۆ وازت لە دینی خۆت و باوباپیرانت دێنی، ها؟' مەرعەش گوتی: 'ئامۆزا گیان، من بۆم دەرکەوت دینی ئیبراهیم لە سەر حەقە و دینەکانی تر پووچەڵن.' بورقان گوتی: 'کێ باسی دینی ئیبراهیمی بۆ کردووی؟' مەرعەش گوتی: 'غەریبپاشـــا—پاشـــای عێراق. ئێســـتا لای منە.' بورقان گوتی: 'سوێند بە ئاگر و ڕووناکی و مانگ و خۆر، دەبێ هەمووتان بکوژم.'

"کە کۆیلەکەی مەرعەش ئەوەی بینی، بەرەو شـار ڕای کرد. خێڵەکانی مەرعەشپاشـای لە ڕووداوەکە ئاگادار کردەوە. ئەوانیش دەمودەست سوار بوون. غەریبپاشا گوتی: 'ئەوە چی قەوماوە.' ڕووداوەکەیان بۆ گێڕاوە. غەریب ســـەهیمی بانگ کرد و گوتی:'یەکێک لەو دوو ئەســپەم بۆ زین بکە کە مەرعەشپاشـا دابووینێ.' ســەهیم گوتی: 'برا، ناشـێ بتەوێ لەگەڵ جنۆکاندا بجەنگی؟' غەریب گوتی: 'با، بە شــیری یافس دەجەنگم و خودای ئیبراهیم پشتیوانمە.'

"گورجێ ســەهیم ئەســپێکی لە ئەسـپی جنۆکان بۆ زین کرد. غەریبپاشـا چەکوچۆڵی شـەڕی لە خۆی شـەتەک دا و سـوار بوو، لەگەڵ خێڵی جنۆکاندا چوو بۆ دەرێ. بورقانیش لەگەڵ خێڵەکەیدا سوار بوون و هەردوو سوپا بۆ شەڕ ڕیز بوون. یەکەم کەس کە دەرگەی شـەڕی خسـتە سـەر پشـت، غەریبپاشـا بوو، کە ئەسـپی تاو دا و شـیری یافسـی کوڕی نووحی هەڵکێشا. چاو لە تیشکی ئەو شیرە شەوارە بوون و ترسی خستە دڵی دوژمنەوە. ئەوجار غەریب جریتی بە ئەســپەکەی کرد و پڕ بەو شــەڕگەیە نەڕڕاندی ئەڵڵاهو ئەکبەڕ، ئەڵڵاهوئەکبەڕ. پاشــا گوتی: 'من غەریبم، پاشــای عێراق. جگە لە دینی ئیبراهیم هیچ دینێکی تر نییە.' کە بورقان ئەم قسـەیەی بیست، گوتی: 'کەوایە ئەوەیە ئامۆزاکەمی لاڕێ کردووە؟ بە دینم، لەسەر تەخت دانانیشم تا نەیکەمە پەند و ئامۆزاکەم و خێڵەکەی نەگەڕێنمەوە سەر

دینه ڕەســـەنەکەیان.' ئیدی بورقانپاشـــا ســـواری فیلێک بوو و لە فیلەکە خوڕی، فیل بە مرخەمرخ بەرەو گۆڕەپان تێی تەقاند تا لە غەریب نیزیک بووەوە. بورقان گوتی: 'هەی مرۆی نەگریس، تۆ چۆن ڕێت کەوتە خاکی ئێمەوە و بۆچی ئامۆزاکەمت لە دین دەرکرد؟ بزانە ئەمڕۆ دوایین ڕۆژی ژیانتە.'

"کە غەریب ئەو قســـەیەی بیســـت، گوتی: 'ســـەری باوکت فلتە فلت.' لە جێوە بورقان خەنجەرێکی دەرهێنا و لە غەریبی هەڵکرد. خەنجەر وێی نەکەوت و بە زەوییدا دا. یەکی دیکەی دەر هێنا و تێی هەڵکرد، غەریب لە هەوادا گرتییەوە و بە فیلەکەوەی نا. خەنجەر بە تەنیشـــتێکی فیلدا درا و لە تەنیشـــتەکەی دیکەیەوە هاتەوە دەرێ. دەمودەســـت فیلە تەپەی هات و بورقان بەسەر فیلەکەوە وەک دارخورمای بڕاو کەوتە سەر زەوی. خێڵی مەرعەش پەلاماریان دا و قۆڵیان بەســـت. کە خێڵی بورقانپاشـــاکەی خۆیان بەو جۆرە دی، بۆ ڕزگارکردی هێرشـــیان کرد. غەریب لەگەڵ جنۆکە موســـڵمانەکاندا بەرەنگاریان بوونەوە و بەو شـــیرە جادوو کراوە لە هەر کەســـی دەدا، دوولەتی دەکرد و ئەو دوو لەتەش خێرا دەبوونە خۆڵەمێش. وای لێ هات جنۆکە موســـڵمانەکان و کافرەکان پێک وەربوون و یەکتریان ئاورباران کرد. دووکەڵ گۆڕەپانی تەنی و غەریبپاشـــا لە گۆڕەپانەکەدا بە چەپ و ڕاســـتدا ڕمبازێنی دەکرد تا وا بوو جنۆکە کافرەکانی پرش و بڵاو کرد و خۆی گەیاندە تاوڵی بورقانپاشـــا. کولیجان و قوریجانی لەگەڵ بوو. پێی گوتن: 'خێرا دەســـت و پێی مەرعەشپاشا بکەنەوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و پەنجا و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ! کولیجان و قوریجان خێرا کۆت و زنجیریان لە دەســت و پێی مەرعەش کردەوە. مەرعەشپاشــا گوتی: 'دا چەکوچۆڵ و ئەســپە باڵدارەکەم بۆ بێنن.' جا مەرعەشپاشــا دوو ئەســپی هەبوو وەک باڵندە دەفڕین. یەکێکیانی دابوو بە غەریب. چوون ئەسپیان بۆ هێنا. جلوبەرگی شــەڕی پۆشــی و دەســتی دا چەک و ســوار بوو. غەریبیش لە ســەر ئەســپە باڵدارەکەی خۆی بوو. ئینجا مەرعەشپاشــا و غەریب پێکەوە بە هەوادا بە ئەڵلاهوئەکبەڕ گوتن بۆی دەرچوون. دوای ئەوەی سیهەزار جنۆکەیان لە کافران کوشت، گەڕانەوە شاری یافسی کوڕی نووح. مەرعەش لەسەر تەخت دانیشت، داوای بورقانی کرد، دیار نەبوو. ئەویش لەبەر ئەوە بوو، دوای ئەوەی دیلی دەکەن، ســەرقاڵی شــەڕ دەبن و ئاگایان لەو نامێنێ. یەکێک لە نڕناشــەکانی بورقان کە خزمەتکاری بوو دێت دەیکاتەوە و دەیباتەوە نێو خێڵەکەی. کە دەبینێت وا ســوپاکەیان نیوەی کوژراوە و نیوەکەی دیکەشــی هەڵدێ، خێرا دەیبا بۆ شــاری عەقیق و کۆشــکی زێڕین. کە بورقانپاشــا لەســەر تەخت دادەنیشــێت، ڕزگاربووانی شــەڕەکە دەگەنەوە و پیرۆزبایی ســلامەتی لە پادشــا دەکەن. بورقانپاشاش گوتی: 'کوڕە کەی کاتی پیرۆزباییە لە کاتێکدا سوپاکەمانیان بەزاند و منیان دیل کرد و لەنێو خێڵی جنۆکاندا ئابڕوویان بردم؟!' گوتیان: 'قوربان، پاشــایان تووشــی هەوراز و نشــێو و ســەرکەوتن و دۆڕان دەبن. ئەوانە چ نین.' گوتی: 'من دەبێ تۆڵەی خۆم هەر بستێنمەوە و ئەو پەڵەی ناوچاوانم بسڕمەوە.'

"ئەوجار نامەی نووســی و ناردی بۆ خێڵە جنۆکەکان. خێڵ و هۆزەکان، خێرا هەموو بەدەم پاشاوە هاتن. ئینجا بورقان سەیری کردن و لێکی داوە، بۆی دەرکەوت کە سیسەد هەزار دیون. گوتیان: 'قوربان، فەرمانت چییە؟' گوتی: هەتا ســێ ڕۆژی دیکە خۆتان ســاز کەن.' کاری بورقانپاشا بێرە گەیشت.

"کاتێک مەرعەشپاشــا گەڕاوە بۆ شــاری یافســی کوڕی نووح. داوای کرد بورقانی بۆ بێنن. چوون گەڕان، بورقانیــان نەدیتەوە. زۆری پێ نــاخۆش بوو، گوتی: 'ئەگەر ســەد نڕناشــمان بۆ دانابایە، نەیدەتوانی هەڵێ، بەلام خۆ لە دەســتمان دەرباز نابێ.' ئینجا ڕووی لە غەریب کرد و گوتی: 'کاکە گیان، خۆت دەزانی کە ئەو بە دوایی تۆڵەوەیە و نــاچارە خێڵەکانی جنۆکە کۆ بکاتەوە و بۆمان بێ. جا دەڵێم تا ئەو هێزی بە دەســت نەهێناوە، با ئێمە بەســەریدا بدەین و دەســتی خۆمانی لێ بوەشــێنین.' غەریب گوتی: 'قســەیەکی جوانە.' دوایی مەرعەش بە غەریبی گوت: 'وا باشــە نڕناشــەکان هەڵتبگرن و بتگەیەننەوە یەمەن و شەڕی کافران بۆ من بەجێ بێڵی.' غەریب گوتی: 'سوێند بە خودای تاک و تەنیا، لێرە ناڕۆم

تا گشت کافرانی جنۆکە لەنێو نەبەم. بەڵام سەهیم دەنێرمەوە بۆ عوممان، بەشکوو لەوێ چاک بێتەوە.' ئاخر سەهیم چەند ڕۆژێک بوو نەخۆش بوو. لە جێوە مەرعەش بانگی دوو نرپاشی کرد و گوتی: 'هەر ئێستا سەهیم و ئەم ماڵ و دیارییانە هەڵگرن و بیانگەیەننەوە عوممان.' ئەوجار مەرعەش نامەی بۆ ئەو جنۆکانەی چواردەور نووسی کە لەژێر دەسەڵاتی ئەودا بوون و داوای لێ کردن کۆ بنەوە. ئەوانیش بە دەنگییەوە هاتن. ژمارەیان سەد و شەستهەزار کەس دەبوو. ئەوجار بەرەو شاری عەقیق وەڕێ کەوتن. بە ڕۆژێک ڕێی ساڵێکیان بڕی و لە دەشتێک لایان دا پشوویەک بدەن. ئەو شەوە لەوێ مانەوە و بۆ بەیانی زوو ویستیان وەڕێ کەون کە پێشەنگی سوپای جنۆکان دەرکەوت. بە دوای ئەواندا جنۆکە و نرپاش وەک دەریا شەپۆلی دا و هەردوو سوپا گەیشتنە یەک. شەڕێکی سەخت و خوێناوی لەنێوانیاندا ڕووی دا و غەریب بە هەموو لایەکدا پەلاماری دەدا. سەری دوژمنان وەک گۆ خلۆر دەبوونەوە تلیان دەدا. تا ئێوارە حەفتاهەزار کەس لە کافران کوژرا. ئەوجار تەپڵی گەڕانەوە لێ درا و هەردوو سوپا لێک جودا بوونەوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە. لێرەدا دونیازادی خوشکی گوتی: "دادە گیان، ئەو چیرۆک و شێوەی گێڕانەوەیەت چەند خۆش و بە تامە!" شەهرزاد گوتی: "ئەگەر پاشا نەمکوژێ و زیندوو بمێنم، سبەی شەو ئی لەوەشت خۆشتر بۆ دەگێڕمەوە." پاشا گوتی: "بە خودا تا چیرۆکەکەی تەواو نەبیستم، نایکوژم."

## که شەوی شەشسەد و پەنجا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! که ســـوپاکان بڵاوەیان کرد و شـــەڕگەیان چۆڵ کرد، مەرعەش و غەریب چوونەوە تاوڵەکانیان و شیرەکانیان له خوێنی دژمنان پاک کردنەوە. ئەوجار نانیان خوارد. خۆشحاڵیش بوون بەوەی که ساغ و سلامەت بوو. زیادتر له دەهەزار کەسیش له سوپای ئەوان کوژرابوو.

"بورقانیش چووەوە تاوڵەکەی خۆی و زۆریش ناڕەحەت بۆ ئەو زەبرەی له ســوپاکەی بوو. گوتی: 'خەڵکینە، ئەگەر سێ ڕۆژ لەگەڵ ئەمانەدا شـەڕ بکەین، هەموومان تێدا دەچین.' گوتیان: 'دەی قوربان چی بکەین؟' بورقان گوتی: 'ئەمشـــەو له کاتی خەودا شـــەوخوون دەکەین و نایەڵین تاقیان دەربچن. جا ئێســـتا چەکەکانتان هەڵگرن و خۆتان ســـاز کەن.' نرناشێک له نێویاندا بوو که دڵی بۆ ئیسلام لێی دەدا. که زانی کافران به تەمای چین، خۆی گەیاندە لای مەرعەش و غەریب و پێی گوتن که چ پیلانێکیان به دەســـتەوەیە. ئەوجار مەرعەش ڕووی کردە غەریب و گوتی: 'برا، ڕاتان چییە، چی بکەین؟' غەریب گوتی: 'بە پشـــتیوانی خودا، ئەمشـــەو کافران لەو دەشـــت و کێوەدا پڕش و بڵاو دەکەین.' ئەوجار فەرماندەکانی ســـوپای بانگ کرد و پێی گوتن: 'چەکەکانتان هەڵگرن. که تاریکی شـــەو باڵی بەســـەر دنیادا کێشـــا، له تاوڵەکانتان بچنە دەرەوە و لەم کێوانەدا خۆتان مەلاس دەن. هەر کاتێک دژمن هاتە نێو هوردووەکەمانەوە، له هەر چوار لاوە بەســـەریاندا دەن. بەجەرگ بن و پشت به خودا ببەستن. سەرکەوتن بۆ ئێوەیە.' که تاریک بوو، کافران بەسەر هوردووی موســـڵمانانیاندا دا و چوونە نێو تاوڵەکانەوە. ئەوە بوو موســـڵمانان له هەر چوار لاوە هێرشیان کردنێ و بەدەم گوتنی ئەڵڵاهوئەکبەرەوە شیریان لێ هەڵکێشـان. هێشتا خۆر له کەل دەر نەکەوتبوو که زۆرینەی ســـوپای کافران کوژرابوون و ئەوانی دیکەش هەڵاتن. مەرعەش و غەریبیش به سەرکەوویییەوە گەڕانەوە و ماڵی کافرانیان به دەستکەوت برد. که ڕۆژ بووەوە، بەرەو شاری عەقیق و کۆشکی زێڕین وەڕێ کەوتن.

"بەلام بورقان لەگەڵ ڕزگاربووانی خێڵەکەیدا هەڵات تا گەیشـــتەوە شـــارەکەی و چووە کۆشکەوە. خێڵەکانی جنۆکەی کۆ کردەوە و گوتی: 'کێ هەر چییەک له ماڵ و سامانی هەیە کۆی بکاتەوە و بیهێنێ و خۆی به بگەیەنێتە من له کێوی قاف لای ئەزرەق پاشـای خاوەنی کۆشـــکی ئەبڵەق. جا ئەو تۆڵەم بۆ له دژمنم دەکاتەوە.' ئیدی ئەوان ژن و ماڵ و منداڵیان برد و بەرەو کێوی قاف وەڕێ کەوتن. پاشـان مەرعەش و غەریب گەیشتنە شاری عەقیق. سـەیریان کرد دەروازەکانی لەســەر پشـتن و کەسـیان له شـاردا نییە. مەرعەش به شـاردا گەڕا. بناغەی ئەو شـــارە له زومرود و دەروازەکانی له عەقیقی ســـوور بوو که بزماری

زیوین و زێڕینیان پێدا داکوتیبوون. میچی خانووەکان دەجوولانەوە. لەو کۆشـکەدا شـتی ئەوەندە سـەیر و سـەمەرەیان دیت کە سـەریان سـووڕ ما. لە کەناری ئەسـتێرێکدا کورسییەکی زێڕینیان دی کە بە دوڕ و گەوهەر ڕازێنرابووەوە.

"ئەوجار مەرعەش و غەریب لەسەر تەختی بورقان دانیشتن و فەرماندەکانی سوپاش لە ڕاست و چەپیانەوە ڕیزیان بەست و سوپایەکی گەورە لەو کۆشکەدا کۆ بوونەوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی شەشسەد و پەنجا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! فەرماندەکان لە راســـت و چەپی غەریب و مەرعەش ڕیز بوون. ئەوجار غەریب بە مەرعەشی گوت: 'پاشا، دەڵێی چی؟' مەرعەش گوتی: 'پاشا، سەد سوارم لە مرۆیان ناردووە تا هەواڵی بورقانمان بۆ بێننەوە و شـــوێنی هەڵبگرم.' ســـێ ڕۆژ بوو ئەوان لە کۆشکی زێڕین مابوونەوە کە نێردراوەکان هاتنەوە و هەواڵی بورقانیان هێناوە کە چووە بۆ کێوی قاف و پەنای بردووەتە بەر ئەزرەق پاشا. مەرعەش بە غەریبی گوت: 'برا، دەڵێی چی بکەین؟' غەریب گوتی: 'ئەگەر ئێمە بەســـەریاندا نەدەین، ئەوان بەســـەرماندا دەدەن.' ئەوجار مەرعەش و غەریب بە ســـوپایان ڕاگەیاند هەتا ســـێ ڕۆژی دیکە خۆتان ســـاز کەن دەڕۆین. کە ســـێ ڕۆژە تەواو بوو ســـوپا تەواو ئامادە بوو. لەو جەنگەیەدا ئەو نڕناشـــانەی ســـەهیمیان بردەوە، گەڕانەوە و لەبەردەم غەریبدا زەوییان ماچ کرد. غەریب هەواڵی خەڵکەکەی پرسی. گوتیان: 'عەجیبی برات کە لە شەڕەکە هەڵات و بەرەو هێندستان چوو. داوای یارمەتی لە پاشای ئەوێ کرد. ئەویش پەنای دا و نامەی بۆ دەوروبەر نووسی و ســـوپایەکی زۆری کۆ کردەوە. ئێســـتا بەرەو عێراق بەڕێوەیە.' غەریب کە ئەو قســـەیەی بیست، گوتی: 'خودای گەورە بەم زووانە سەرم دەخات و ئەوان لەنێو دەبا.'

"ئەوجار مەرعەش بە غەریبی گوت: 'ئەی پاشـــای مرۆیان، ســـوێند بە خودا ناچارم لەگەڵتدا بێم و دژمنانی تۆ لەنێو ببەم و تۆ بە ئاواتت بگەیەنم.' غەریب سپاس و ستایشی کرد. ئەو شەوە بە نیازی ڕۆیشتنەوە خەوتن. کە ڕۆژ بووەوە، وەڕێ کەوتن و هەتا ئێوارە یەک تەکان بەرەو کێوی قاف ڕۆیشتن. بۆ ڕۆژی دووەم بە نیازی کۆشکی ئەبلەق و شاری مەڕمەڕ درێژەیان بە ڕۆینەکەیان دا. ئەو شـــارە باریقی کوڕی فاتیح لە مەڕمەڕ ســـازی کردبوو و کۆشـــکی ئەبلەقیش یەکێک لە تەلارەکانی ئەو شـــارە بوو. بۆیە بەو کۆشـــکەیان دەگوت ئەبلەق، چونکە خشـــتی دیوارەکانی یەکیان لە زێڕ و یکیان لە زیو بوو و لە دونیادا تای نەبوو.

"کە لە شـــاری مەڕمەڕ نیزیک بوونەوە و لە نێوان ئەوان و شـــارەکەدا مەودای دانێک زیاتر نەما، لایان دا سوپا پشـــوویەک بدا. ئەوجار مەرعەش نڕناشـــێکی بۆ هەواڵگری نارد. کە نڕناش هاتەوە، گوتی: 'پاشام، لە شاری مەڕمەڕدا زیاد لە گەڵای داران و دڵۆپەی باران لە خێڵەکانی جنۆکان گرد بوونەتەوە.' مەرعەش بە غەریبی گوت: 'ئەی گەورەی مرۆیان، ڕات چییە؟' غەریب گوتی: 'جەنابی پاشـــا، ســـوپاکەت بکە بە چوار بەشـــەوە. کە بوو بە نیوەشـــەو، هەر بەشـــەی لە لایەکەوە هێرش بکەنە ســـەر کافران و بە دەنگی بەرز بڵێن ئەڵڵاهوئەکبەر، ئەڵڵاهوکبەر و لێیان دوور بکەونەوە. ئینجا ببینە خێڵەکانی جنۆکە چییان

بەسەر دێ.' مەرعەش خێرا خۆی ئامادە کرد و بەو جۆرەی کرد کە غەریب گوتی. سوپا چەکیان هەڵگرت و تا نیوەشەو خۆیان گرت. ئەوجار لە هەرچوار لاوە دەوری سوپای کافرانیان دا و بە دەنگی بەرز گوتیان ئەڵڵاهوئەکبەڕ. کافران بە پەشۆکاوییەوە لە خەو داپەڕین و دەستیان دا چەکەکانیان و کەوتنە گیانی یەکتری و تا دەمەو بەیان خۆیان لە خۆیان کوشت. ئەوجار غەریب بە سوپای موسڵمانانی گوت: 'هێرش بکەنە سەر پاشماوەکانیان، خودا سەرتان دەخا.' ئیدی مەرعەش و سوپاکەی هێرشیان کردە سەر کافران. غەریب شیری یافسی هەڵکێشا و دڕی بە ڕیزی سوپای کافران دا و خۆی گەیاندە بورقان. ئەویش و ئەزرەق پاشاشی کوشت. هێشتا نەببووە نیوەڕۆ قڕانیان لە کافران خست و تاقیان نەهێشت.

"ئەوجار مەرعەش و غەریب چوونە کۆشکی ئەبلەقەوە و دیتیان خشتێکی زێڕە و یەکی زیو. لەوێ ماڵ و سامان و کەلوپەلی بێژماریان دیت. دوایە چوونە حەرەمسەرای ئەزرەق پاشاوە. غەریبپاشا لەوێ لەنێو ژناندا چاوی بە کچێکی جوان و مانگئاسا کەوت، کەوایەکی لە بەردا بوو سەدهەزار دینار نرخی بوو و سەد کەنیزەی شەنگ و شەپال لە دەوری بوون. غەریبپاشا کە ئەو کچەی دی، ئەقڵ و هۆشی نەما و لە یەکێک لە کەنیزانی پرسی: 'ئەم کچە کێیە؟' کەنیز گوتی: 'ئەوە کەوکەبوسسەباحی کچی ئەزرەق پاشایە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ! گوتیان ئەوە «کەوکەبوسسەباحی» کچی ئەزرەقپاشایە. ئەوجار غەریب ڕووی لە مەرعەش کرد و گوتی: 'گەورەم، دەمەوێ ئەو کچە بێنم.' مەرعەش گوتی: 'پاشا گیان، ئەو کۆشکە و ئەوەی لە نێویدایە هەقدەستی تۆن؛ تۆ نەبوویتایە و ئەو فێڵەت نەکردایە، بورقان و ئەزرەق خێڵی ئێمەیان لە نێو دەبرد. جا ئێستا ئەو ماڵ و سامانە هی تۆیە و ئەو کچانەش کەنیزی تۆن.' غەریبپاشا سوپاسی سۆز و گەورەیی ئەوی کرد. چووە بەردەم کچە و جوان سەیری کرد. وای وەبەر دڵی کەوت کە فەخرتاجی کچی شاپوورشا و مەهدییەی کچی مەرداسی لە بیر چوونەوە. دایکی ئەو کچە کچی پاشای چین بوو کە ئەزرەق پاشا لە کۆشکەکەی باوکیدا ڕفاندبووی و لەگەڵی جووت ببوو، سکی بەو کچە جوانە پڕ کردبوو. جا بە هۆی جوانی لە ڕادەبەرییەوە ناویان نابوو کەوکەبوسسەباحی خوێنشیرین. کە چلەی چووبوو، دایکی مردبوو. دایەن و خزمەتکاران گەورەیان کردبوو تا گەیشتبووە حەڤدەساڵان. کە باوکی کوژرا، غەریب عاشقی بوو و هەر هەمان شەو چووە زگی و تەماشای کرد هێشتا بوخچەی نەکراوەیە. ئەو کچە قینی لە باوکی بوو و بە کوژرانی خۆشحاڵ بوو.

"پاشان غەریب فەرمانی کاولکردنی کۆشکی ئەبڵەقی دا و خشتە زێڕ و زیوەکانی بەسەر جنۆکاندا دابەش کرد و زێڕ و زیو و گەوهەری زۆری لەو کۆشکە هێنا دەرێ. ئەوجار بەرەو قەڵاکەی مەرعەش کەوتە ڕێ. پێنج ڕۆژ لەوێ ماوە و دوایە غەریب هەڵوێستی گرت بگەڕێتەوە بۆ شارەکەی خۆی. مەرعەش گوتی: 'پاشا، منیش لە خزمەتتدا دێم تا دەتگەیەمەوە وڵاتی خۆتت' غەریب گوتی: 'بە هەقی ئیبڕاهیم! ناهێڵم بکەویە نارەحەتییەوە و لە خێڵی تۆ جگە لە کولیجان و قوریجان کەسی تر لەگەڵ خۆم نابەم.' مەرعەش گوتی: 'کوڕە پاشا، دەهەزار سوار لە جنۆکان لەگەڵ خۆت ببە با لە خزمەتتدا بن.' غەریب گوتی: 'هیچ کەس نابەم، مەگەر ئەوەی کە گوتم.' ئەوجار مەرعەش بە هەزار نڕناشی گوت کە ماڵ و سامانی غەریب بگەیەننەوە وڵاتەکەی و بە کولیجان و قوریجانیشی گوت کە بەردەوام لە خزمەتی غەریبدا بن. دوایە غەریب بە نڕناشەکانی گوت: 'ئێوە ئەو ماڵ و سامانە و کەوکەبوسسەباح هەڵگرن و بیانبەنەوە کووفە.' غەریب ویستی سواری ئەسپە باڵدارەکە بێ، مەرعەش گوتی: ' ئەو ئەسپە لێرە نەبێ لە هیچ کوێ ناتوانێ بژێ، بەڵام ئەسپێکی دیکەم هەیە هاوتای نییە لە دونیادا، ئەوت دەدەمێ.' ناردی ئەو ئەسپەیان هێنا. غەریب کە چاوی پێی کەوت، واقی لە جوانییەکەی وڕ ما. ئەوجار مەرعەش باوەشی بە غەریبدا کرد، گریا و گوتی: 'برا گیان، ئەگەر شتێکت بە سەر هات و نەتتوانی بەرپەرچی بدەیتەوە، کەسێکم لێ ڕاسپێرە، من سوپایەکی فراوانت لە جنۆکان بۆ دەنێرم.' غەریب

سپاسی چاکە و پیاوەتییەکانی کرد. ئەوجار کولیجان و قوریجان غەریبیان بە ئەسپەکەیەوە هەڵگرت. بە دوو ڕۆژ و شـــەوێک ڕێی پەنجا ســـاڵیان بڕی و لە شـــاری عوممان نیزیک بوونەوە و لەوێ لایان دا پشـــوویەک بدەن. غەریب بە کولیجانی گوت: 'بچۆ بۆ شـــاری عوممان و هەواڵی ئەوێم بۆ بێنە.' کولیجان ڕۆیشـــت و لە چاوتروووکاندنێکدا گەڕاوە و گوتی: 'ســـوپای کافران لە نیزیک شـــارەکەتدا زیاد لە ژمارەی ئەســـتێرانن و هۆزەکەت لەگەڵیاندا لە شەڕدان.' غەریب کە ئەو قسەیەی بیست، گوتی: 'دەی کولیجان، ئەسپەکەم بۆ زین کە و چەکەکەم بۆ بێنە.' کولیجان خێرا ئامادەی کردن. غەریبپاشا جلوبەرگی شـەڕی پۆشی، شیری یافسی کوڕی نووحی لە قەدی دا، خۆی هاویشتە سەر زین و ویستی بەرەو ســـوپای کافران مل بنێ. کولیجان و قوریجان گوتیان: 'جەنابی پاشـــا، تۆ خەمت نەبێ و ئاســوودە بە و مۆڵەتمان بدە با ئێمە بچینە ســەر کافران و پرش و بڵاویان بکەین و تاقیان لێ نەهێڵین.' غەریب گوتی: 'بە ئیبراهیمی خەلیل ناهێڵم ئێوە شـــەڕیان لەگەڵ کەن. من خۆم شەڕیان لەگەڵ دەکەم.' جا ئەوە سوپایە لەبەر ئەوە هاتبوو کە..."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی شەشسەد و شەستەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! هۆی هاتنی سوپاکە ئەوە بوو کە کاتێک عەجیب چوو سوپای یەعرەبی کوڕی قەحتانی هێنا و گەمارۆی موسڵمانانی دا. جومەرقان و سوعدانیش بەرەنگاریان بوونەوە. کە کولیجان و قوریجان گەیشتنێ و سوپای کافران لاواز بوو، عەجیب هەڵات بۆ لای هۆزەکەی و پێی گوتن: 'ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ لای یەعرەب و سوپاکەی بە شکاوی ببینێ، پێمان دەڵێ کە ئەگەر ئێوە نەبوونایە سوپا و هۆزەکەی من تووشی ئەو شەڕ و سەرشۆڕییە نەدەبوون. جا ئەو کاتە هەمووومان دەکوژێ. من وام پێ باشە بەرەو هیندستان بچین و پەنا ببەینە بەر تورکەنانپاشا.' هۆزەکەی گوتیان: 'قسە قسەی تۆیە.'

"ئیدی کەوتنە ڕێ. شەو و ڕۆژ بەڕێوە بوون تا گەیشتنە هیندستان. عەجیب مۆڵەتی وەرگرت، چووە لای تورکەنانپاشا، شێیانەی دیوانی ماچ کرد، نزای بۆ کرد و داوای لێ کرد پەنای بدا. پاشای هیندستان گوتی: 'تۆ کێی و چیت دەوێ؟' گوتی: 'من عەجیبم پاشای عێراق. براکەم ستەمی لێ کردووم. بووەتە پەیڕەوی ئیسلام، ولاتەکەمی داگیر کردووە و خەڵکەکەمی خستووەتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. سەرەڕای ئەوەش منیش لە شوێنێک بۆ شوێنێک و لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێک ڕاو دەنێ. هەر بۆیە ئەوەتا پەنام بۆ تۆ هێناوە.' پاشای هیندستان کە قسەی عەجیبی بیست، تووڕە بوو، هەستا و دانیشت و گوتی: 'سوێند بە ئاگر و ڕووناکی! دەبێ تۆڵەت بۆ بکەمەوە و جگە لە ئاگرپەرستان کەس لەسەر زەویدا نەهێڵم.' ئەوجار کوڕەکەی بانگ کرد و پێی گوت: 'کوڕم، خۆت بۆ سەفەر ئامادە کە. بچۆ بۆ عێراق و هەرکەسی لێیە بیکوژە.' ئەوجار هەشتاهەزار سواری ئازا و هەشتاهەزار فیلسواری هەڵبژارد و لەگەڵ کوڕەکەیدا ناردی. کوڕی پاشاش ئازای ڕۆژگاری خۆی بوو و ناوی ڕەعدشا بوو. دوو مانگ کێو و بێروونیان بڕی تا گەیشتنە شاری عومان. گەمارۆی شاریان دا. عەجیب زۆر بەمە دڵخۆش بوو و پێی وا بوو سەر دەکەون. جومەرقان و سوعدان لەگەڵ هەموو جەنگاوەرەکاندا بۆیان هاتنە دەرەوە و شەڕیان کرد. لەو دەمەدا بوو کولیجان هات و ئەو دیمەنەی دیت و هەواڵەکەی بۆ غەریبپاشا بردەوە. غەریب سوار بوو و خۆی بە نێو سوپای کافراندا کرد. لەو ساتەدا سوعدان لە گۆڕەپانەکەدا چاوەڕێی ڕکابەری دەکرد. پاڵەوانێکی هیندی بۆی چوو. سوعدان ڕمێکی لێ دا و هەموو ئێسکلەشی تێک شکاند. پاڵەوانی دووەم و سێیەمیش بۆی چوون و سوعدان ئەوانیشی کوشت. بەردەوام پاڵەوان بۆی دەچوون و یەکیەک دەیکوشتن تا سی کەسی لێ کوشتن. ئەوجار پاڵەوانێکی هیندییەکان کە ناوی بەتاش و مامی تورکەنانپاشا بوو. غەنیمی پێنجهەزار کەس بوو، بۆی چووە مەیدان.

"که له سـوعدان نیزیک بووەوه، پێی گوت: 'هەی خوێڕی، ئەوە تۆ وات لێ هات پاڵەوانانی پاشـای هێند بکووژی؟ جا بزانە ئەمڕۆ دوا ڕۆژت دەبێ یان نا.' که سـوعدان ئەمەی بیسـت، تووڕە بوو و پەلاماری بەتاشـی دا و ویسـتی بە ڕمبەکەی لێی دا، بەلام سـەری کرد و بەری نەکەوت. سـوعدان لەگەڵ ڕمبەکەدا کەوت سـەر زەوی و هێشـتا هەڵنەسـتابووەوه که کافران گوریسـیان لێ ئالان، بەندیان کرد و بەرەو تاوڵەکانیان ڕایان کێشـا. که جومەرقان ئەوەی بینی، ئەسـپەکەی چوارناڵ کرد و هێرشـی بۆ بەتاش برد. بەتاشـیش بەرەنگاری بووەوه، پشـتێنەی گرت و لەسـەر ئەسـپەکەی بەرزی کردەوه و بەزەوییدا دا. کافران ئەویشـیان قۆڵبەسـت کرد و بردیانە نێو تاوڵەکانیان. ئیدی بەو جۆرە بەتاش هەر ئاوا پاڵەوانانی ئیسلامی دیل دەکرد تا گەیشتنە بیست و چوار. که موسڵمانان دۆخەکەیان ئاوا دیت، زۆر خەمبار بوون. غەریبیش که پالەوانەکانی خۆی ئاوا دیت، ڕمبە زێڕەکەی که هی بورقانپاشای جنۆکان بوو و بیست مەنیش قورسایی بوو، دەر کێشا."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەش‌سەد و شەست و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ! غەریب ڕمبەکەی دەر کێشــا و ئاوزەنگی لە ئەســپی دەریایی دا و جڵەوی بۆ شل کرد. بەدەم گوتنی ئەڵلاهوئەکبەڕەوە هێرشی کردە سەر بەتاش. ڕمبێکی لێ دا و لە جێوە بەتاش کەوتە ســەر زەوی. غەریب ڕووی لە موسڵمانان کرد، ســەهیمی برای بینی و گوتی: 'قۆڵی ئەو نەگریسە ببەستە.' سەهیم خێرا گەیشتە سەری و قۆڵی بەتاشی بەست. ســوپای موســڵمانان ســەریان لەو ســوارە ســووڕ ما. کافران بە یەکتریان دەگوت: 'باشــە ئەو ســـوارە کێ بوو وا لە نێو خۆمانەوە چوو گەورەکەمانی بەند کرد؟' هەردوو سوپا حەبەسابوون کە غەریب داوای ڕکابەری کرد. ئیدی فەرماندەیەک لە هێندییەکان هاتە دەرەوە. غەریب ڕمبێکی لێ دا و تەختی کرد. کولیجان و قوریجان قۆڵیان بەســـت و رادەستی سەهیمیان کرد. غەریب بەردەوام فەرماندەکانی بە دیل دەگرت تا گەیشتنە پەنجا و دوو کەس و ڕۆژئاوا بوو. کە ڕۆژ ئاوا بوو؛ شــەڕ ڕاوەســتا و تەپڵی گەڕانەوە لێ درا. غەریبیش گەڕاوە نێو سوپای موسڵمانان و یەکەمین کەس کە چووە لای، سەهیمی برای بوو، چووە بەرەوە و لە نێو ئازەنگەکەدا قاچی ماچ کرد و گوتی: 'ئەی پاڵەوانی جیهان، پێمان بڵێ کە تۆ کێی؟' غەریب ڕووبەندی زێڕینی هەڵدایەوە و ڕوخساری خۆی دەرخست و ســـەهیم ناســـییەوە و گوتی: 'کوڕە خەڵکینە! ئەمە غەریب‌پاشـــای خۆتانە و لە وڵاتی جنۆکانەوە گەڕاوەتەوە.'

"کە موســڵمانان ناوی غەریبیان بیســت، لەســـەر ئەســـپەکانیان دابەزین و خاکی بەر ئەسپەکەیان ماچ کرد و زۆر خۆشحاڵ بوون. ئەوجار چوونەوە نێو شاری عوممان. غەریب لەسەر تەخت دانیشت و خەڵک لێی کۆ بوونەوە و نانیان خوارد. دوایی غەریب هەموو ئەو شـــتانەی بۆ گێڕانەوە کە لە کێوی قاف لەگەڵ جنۆکاندا ڕووی دابوو. ئەوان ســـەریان لەو باســـە ســـووڕ ما. دوایی غەریب پێی گوتن کە بچنەوەماڵەکانیان. ئەوانیش بڵاوەیان کرد و جگە لە کولیجان و قوریجان کەس لای غەریب‌پاشـــا نەماوە. غەریب پێی گوتن: 'دەتوانن بمبەن بۆ کووفە تا چاوم بە ژنەکەم بکەوێ و لە کۆتایی شـــەودا بمهێننەوە ئێرە؟' گوتیان: 'قوربان، ئەوە بۆ ئێمە هەر زۆر ئاســـانە.' لە عوممانەوە تا کووفە دوو مانگ ڕێ بوو. کولیجان بە قوریجانی گوت: 'من دەیبەم و تۆ بیهێنەوە.'

"پاشـــان کولیجان هەڵیگرت و قوریجانیش لەگەڵی چوو، ڕۆیشـــتن تا گەیشـــتنە کووفە. ئەوەندەی پێ نەچوو کە غەریب‌پاشایان گەیاندە کۆشکەکەی خۆی و چووە کن دامیغ‌پاشای مامی. دامیغ کە ئەوی بینی، لە بەری هەســـتا و ســـڵاوی لێ کرد. غەریب هەواڵی ژنەکانی پرســـی. دامیغ گوتی: 'زۆر باشـــن.' ئەوجار خزمەتکار مژدەی هاتنەوەی بۆ ژنەکانی برد.

ئەوانیش خۆشـــحاڵ بوون و وەک مزگێنی زێڕ و زیویان دایە. ئەوجار غەریبپاشـــا چووە لای ژنەکانی. ئەوان لە بەری هەستان و سڵاویان لێ کرد و بە دیداری یەکتر شاد بوونەوە. دامیغپاشاش خەوت. کە شەو لە کۆتایی نیزیک بووەوە، غەریبپاشا ماڵاوایی لە ژنەکانی و دامیغپاشـــای مامی کرد و ســـواری کۆڵی قوریجان بوو. هێشـــتا ڕۆژ نەبووبووەوە کە گەیشـــتەوە شـاری عوممان، جلوبەرگی شـــەڕی پۆشـــی و چەکی هەڵگرت. ســـوپاش ئامادە بوون. غەریب فەرمانیدا کە دەروازەکان بکەنەوە، لەناکاو ســـوارێکی کافران گەیشـــتێ، ئەو چووبوو کۆت و زنجیری لە دەست و پێی جومەرقان و سـوعدان کردبووە. موسـڵمانان بە ســـڵامەتی ئەوان خۆشـــحاڵ بوون و تەپڵی شـــەڕیان کوتا و خۆیان بۆ شـــەڕ ئامادە کرد. کافرانیش سوار بوون و ڕیزیان بەست.“

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی شەشسەد و شەست و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! کە دوو سوپاکە ڕووبەڕووی یەک ڕاوەستان، یەکەم کەس کە پێی نایە گۆڕەپانی شەڕەوە غەریبپاشا بوو. غەریبپاشا دەستی دا شیری یافسی ئەسپی دەریایی تاو دا و لە مەیداندا دەستی کرد بە ڕمبازێن و هەرای لە سوپای دوژمن کرد: 'ئەوەی دەمناسێ، با خۆ لە شەڕی من نەدا. ئەوەی ناشمناسێ، با بزانێ کە من غەریبپادشام، پادشای عێراق و یەمەن.' ڕەعدپادشا کە ئەو قسەی بیست، فەرماندەکانی بانگ کرد و گوتی: 'دا عەجیبم بۆ بێنن.' پێی گوت: 'تۆ دەزانی کە مایەی ئەو ئاژاوەیە تۆی و ئەوە براکەتە لە گۆڕەپانەکەدا وەستاوە و داوای ڕکابەر دەکا. دەی ئێستا خۆت بۆی بچۆ و بیگرە و قۆڵبەستی کە. با سەرەوخوار بە وشترەوە هەڵی هاوەسم و بە تەواوی هیندستاندا بیگێڕم.' عەجیب گوتی: 'یەکێکی تر بنێرە؛ ئەوڕۆ نەخۆشم.' ڕەعدشا بەم قسەیەی دەهری بوو، وای ڕق هەستا، گوتی: 'بە ئاگر و ڕووناکی! ئەگەر بۆی نەچی و خێرا دەستگیری نەکەی، ڕێک دەتکوژم و ماوت دەسڕمەوە عەجیب ناچار سواری ئەسپ بوو و بەرەو گۆڕەپانەکەی ئاژۆت و لە براکەی نیزیک بووەوە و پێی گوت: 'هەی سەگی عەرەب، ئەوە ملبەملەی پاشایان دەکەی؟ ئێستا خۆت بۆ مردن ئامادە کە.' غەریب کە ئەو قسەیەی بیست، گوتی: 'تۆ کێی؟' گوتی: 'من عەجیبی براتم و ئەوڕۆ دوا ڕۆژتە.' غەریب کە زانی ئەوە عەجیبە، بە سەریدا نەڕاند و گوتی: 'خوێنی دایک و باوکم لە گەردنی تۆیە.' ئەوجار شیرەکەی بە کولیجان سپارد و پەلاماری دا. گورزێکی لە پشتی دا و ئێسکی لەشی وەک خرخاڵ ورد کرد. ئیدی باوەشی پێدا کرد و خستی. کولیجان و قوریجان قۆڵیان بەست و بە ڕسوایی و سەرشۆڕییەوە ڕاکێشیان کرد. غەریب کە عەجیبی بە دیل گرت زۆر خۆشحاڵ بوو گوتی: 'سپاس بۆ ئەو خودایە

ئێستا من پادشای حەوت وڵاتانم
گەورە و سەروەری گوند و شارانم
زاڵم لە هیچ کوێ جێی نابێتەوە
کە ناوی منی وە بیر دێتەوە
دەستی ئایلان، کورت دەکەمەوە
خۆر بۆ ژینی تار دەگێڕمەوە

"کە ڕەعدشا ئەوەی دیت، داوای ئەسپی کرد، چەکی هەڵگرت و بەرەو گۆڕەپانەکەی تاو دا. کە لە غەریب نیزیک بووەوە، هەرای لێ کرد: 'هەی خوێڕیترینی عەرەب، ئەوە وات لێ

هاتووه ئازا و پاشـــایان دیل کەی؟ لە ئەســـپەکەت دابەزە و پێیەکانم ماچ کە. ئینجا ئەو پاڵەوانانەشـــم ئازاد کە تا من لێت خۆش بم و بتکەمە گەورەی هۆزەکەت کە لەوێ پارووە نانێک بخۆی.' غەریب کە ئەو قســـەیەی بیســـت، پێکەنی و گوتی: 'هەی نەگریس، دەبینی چیت بەسـەر دێ.' سـەهیمی بانگ کرد و گوتی: 'دیلەکانم بۆ بێنە.' سـەهیم هێنانی و غەریب شیری لێ هەڵکێشان و گشتیانی کوشت. ڕەعدشا کە ئەوەی دیت پەلاماری غەریبی دا. ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە لێکیان دا و یەکتریان هێنا و برد. کە ڕۆژ ئاوا بوو، تەپڵی گەڕانەوە لێ درا."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەوشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی شەش‌سەد و شەست و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خـاوەنشـــکۆ! ئەوان لێکـدی جیـا بوونەوە و هەردوو ســــوپـا گەڕانەوە هوردووەکانیان. موسڵمانان بە غەریبیان گوت: 'قوربان، تۆ خوو و خدەت وا نەبوو شەڕت ئەوەندە بخایەنێ؟' غەریب گوتی: 'خەڵکینە، من لەگەڵ زۆر مرۆ و جنۆکەی ئازا و نەبەزدا شـەڕم کردووە. تا ئێسـتا کەسـی ئەوەندە بە جەرگ و دەسـتەوەکەرم نەدیوە . خۆ ئەگەر بمویستایە بە شیری یافس دەمکوشت، بەڵام دەمویست بە زیندوویی بیگرم. ڕەنگە خێریکی بۆ ئیسلام تێدا بێ.' کاری غەریب‌پاشا بێرە گەیشت.

"لەو لاشەوە کە ڕەعدشا چووەوە تاوڵەکەی و گەورەکان لێی کۆ بوونەوە و پرسیاری ڕکابەرەکەیان لێ کرد، ڕەعدشـا گوتی: 'بە ئاگر و ڕووناکی، ئازای وام لە ژیانمدا نەبینیبوو! ســبەینێ دەسـتگیری دەکەم.' کە دیســان ڕۆژ بووەوە، دەمەو بەیان تەپڵی شــەڕ کوترا و سوپاکان لە گۆڕەپاندا ڕیز بوون. یەکەم کەس پێی نایەوە شـەڕگە، شێری بێشـەی ئازایان، غەریب‌پاشـــا بوو کە لە گۆڕەپاندا تەراتێنی کرد و بە ئەڵڵاهوئەکبەڕ، ئەڵڵاهوئەکبەڕ داوای غەنیمی کرد. هێشـــتا قســـەکەی تەواو نەکردبوو کە ڕەعدشـــا بەســـواری فیلێکەوە بەرەو گۆڕەپان هـات. کە لێی نیزیک بووەوە، ئەســـپەکە لە ترســـی فیلەکە خۆی نەدەگرت و غەریب‌پاشـا ئەسـپەی بە کولیجان سـپارد، شـێری یافسـی هەڵکێشـا، بۆ ڕەعدشـا چوو و بەرانبەر بە فیل ڕاوەســـتا. ڕەعدشـــا خووخدەی وا بوو، هەر کاتێک بیزانیبا دەرەقەتی ڕقەبەرەکەی نایە، سواری فیل دەبوو. تۆڕێکی لەگەڵ خۆی دەبرد کە لای خوارەوەی هەراو و لای سەرەوەی تەنگ بوو، داوێنەکەی ئەڵقەی پێوە بوو و ئەڵقەکانیش بەندی ئاوریشمیان تێدا بوو و جۆرە کەمەندێ بوو. ڕەعدشـــا تۆڕی بۆ ســـوارەکە هەڵدەدا و ســـوار دەکەوتە نێویەوە و کۆیلە ئاوریشـمینەکەی ڕادەکێشـا و دەسـتگیری دەکرد. تا ئەوڕۆ زۆر جار بەو فێڵە بەسەر زۆریەک لە ئازایاندا زاڵ بووبوو.

"کە غەریب لێی نیزیک بووەوە، ڕەعدشا دەستی بۆ تۆڕەکەی برد و بۆ غەریبی هەڵدا و غەریبی لە داو کەوتووی بۆ لای خۆی ڕاکێشـــا. فیلی دەنگ دا کە بەرەو هوردووەکەی خۆیـان بگەڕێتەوە. کولیجـان و قوریجـان کە لە غەریب جیـا دەنەدبوونەوە، فیلیان گرت و نەیانهێشـــت بڕوا. ئەوجار غەریب بە شـــیرەکەی کەمەندی بڕی. کولیجان و قوریجان پەلاماری ڕەعدشایان دا و گرتیان و بەستیانەوە. ئەوجار سوپاکان وەک دوو دەریا تێکەڵ بوون و کێواسا پێکیاندا دا. کوشت و کوشتار دەستی پێ کرد و تا تاریکان بەردەوام بوو. ئینجا تەپڵی گەڕانەوە کوترا. هەردوو سوپا لێک جودا بوونەوە. خەڵکێکی زۆر لە موسڵمانان کوژرا و گەلێکیش بریندار بوون. برینەکانیان بە بۆنەی فیل و ئاژەڵانی دڕندەوە بوو. ئەوە

به لای غەریبەوە زۆر دژوار بوو و فەرمانی دا کە بریندارەکان تیمار بکرێن. دوایی ڕووی لە گەورەکان کرد و گوتی: 'ڕا و بۆچوونتان لە سەر ئەو چییە؟' گوتیان: 'قوربان، ترسی ئێمە لە فیل و ئاژەڵانی دڕندەیە، ئەگەر ئەوانە نەبن، بەسەر دوژمندا زاڵ دەبین.' کولیجان و قوریجان گوتیان: 'پاشا، ئێمە شیر هەڵدەکێشین و فیل و دڕەندەکان دەکوژین.' ئەوجار پیاوێک لە عوممانییەکان کە دەمڕاستی جولەندپاشا بوو، بۆ زۆر کار پرسی پێ دەکرا، گوتی: 'پاشام، ئەگەر تۆ قسەی من پەسند کەی، من پاراستنی ئەو سوپایەت لە ئەستۆ دەگرم.' غەریب ڕووی لە فەرماندەکان کرد و گوتی: ' ئەو مامۆستایە هەرچیتان پێ بڵێ، بە گوێ بکەن.' ئەوانیش گوتیان: 'فەرمانتە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەو شەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ! ئەوجار ئەو پیاوە دە کەسی لە فەرماندەکان هەڵبژاردن و پرسی: 'چەند باڵبازتان لەژێر دەستدایە؟' گوتیان: 'دەهەزار سوار.' ئەو پیاوە لەگەڵ خۆی بردنی بۆ جبەخانەی جولەند. پێنج‌هەزار بەرووەجی[1] دانێ و فێری بەکارهێنانی کردن. لەگەڵ تاوهەڵاتی بەیانی کە سوپای کافران ئامادە بوون و فیل و هۆڤییەکانیان هێنا. غەریب لەگەڵ پاڵەوانانددا سوار بوون و ڕیزەکانیان ڕێک خست. سەرانی کافرانیش فیل و دڕندەکانیان وە پێش خۆیان دا. مامۆستا هاواری لە بەرووەجهاوێژان کرد کە گوللەکانیان بهاوێن. کە گوللەکان کەوتنە بەر پێی فیل و دڕندەکان و تەقینەوە هەموویان زراویان چوو ڕوویان وەرگێڕا و هەڵاتن بۆ نێو سوپاکەی خۆیان و پان و فلیچیان کردنەوە. موسڵمانانیش هێرشیان کردە سەریان و لە ڕاست و چەپەوە لێیان دان و تار و ماریان کردن. بە دەشت و کێواندا پرش و بڵاو بوونەوە و موسڵمانان دوایان کەوتن. لە فیل و دڕندان جگە لە کەمێک، هیچ نەماوە. غەریب‌پاشا بە سەرکەوتوویی و دڵی خۆشەوە گەڕاوە.

"کە ڕۆژ بووەوە، دەستکەوتەکانیان بەش کردن. ئەوجار غەریب‌پاشا داوای عەجیبی برای کرد. عەجیبیان هێنا لای. پێی گوت: 'هەی نەگریس، لەبەر چی پاشایانمان لێ دەورووژێنی؟ مەگەر نازانی کە خودای تاقانە پشتیوانی منە. دەی ئێستا موسڵمان ببە تا ڕزگارت ببێ و لە خوێنی دایک و باوکم خۆش ببم و لە وڵاتێکدا بتکەمە پاشا.' عەجیب گوتی: 'هەرگیز لە دینی باوباپیرانم پاشگەز نابمەوە.' غەریب فەرمانی دا؛ کۆت ئاسنی لە پێ و کەلەپچەی لە دەست بکەن و سەد وەردیانی توورە و تۆسنی بۆ دانێن. ئەوجار ڕووی لە ڕەعدشا کرد و گوتی: 'لەبارەی ئیسلامەوە دەڵێی چی؟' گوتی: 'جەنابی پاشا، من دێمە سەر دینی ئێوە. ئەگەر ئەو دینەتان ڕاستەقینە نەبووایە، نەتاندەتوانی بەسەر ئێمەدا زاڵ بین. جا ئەوە شایەدی دەدەم کە جگە خودای یەکتا خودای دیکە نییە و ئیبراهیمیش پێغەمبەری خودایە.' غەریب‌پاشا خۆشحاڵ بوو و گوتی: 'جەنابی پاشا، دەگەڕێیتەوە بۆ وڵاتی خۆت یا نا؟' ڕەعدشا گوتی: 'قوربان، ئەگەر من بگەڕێمەوە بۆ وڵاتی خۆم، لەبەر ئەوەی وازم لە دینەکەم هێناوە، باوکم دەمکوژێ.' غەریب‌پاشا گوتی: 'من لەگەڵتدا دێم و دەتکەمە پاشای ئەو خاک و ئاوە.' ڕەعدشا کە ئەو قسەیەی بیست، دەست و پێی ماچ کرد. ئەوجار غەریب‌پاشا ڕووی لە کولیجان و قوریجان کرد و گوتی: 'دەمەوێ بمبەن بۆ هیندستان و جومەرقان و سوعدانیش بێنن.' قوریجان جومەرقان و سوعدانی هەڵگرت و

---

[1]. بەرووەج: سەرەتاییترین جۆری تفەنگ بوو، کە بریتی بوو لە ئاسنێک کە شۆرەی (باڕووتی) پێ فڕێ دەدرا بۆ لای دوژمن.

کولیجان غەریبپاشا و ڕەعدشای هەڵگرت و بەرەو هیندستان وەڕێ کەوتن."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی شەشسەد و شەست و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! تەنگی ئێوارە بوو کە گەیشتنە کشمیر. نرناشەکان لە سەربانی کۆشک نیشتنەوە و لە پەیژەکانەوە هاتنە خوار. جا تورکەنانپاشا هەڵاتنی سوپاکە و بەسەرهاتی کوڕەکەی بیستبوو. خواردن و خەوی لێ حەرام بووبوو و شەو و ڕۆژ خۆی خزاندبووە ژوورەوە. تورکەنانپاشا بیری لە کاری کوڕەکەی دەکردەوە کە پێرەکە لەبەردەم پاشادا ئامادە بوون. کە پاشا کوڕەکەی لەگەڵ ئەو پێرەدا بینی، واقی وڕ ما و لە نرناشەکان تۆقی. ئەوجار ڕەعدشا بە باوکی گوت: 'ئەی ئاگرپەرست، واز لە ئاگرپەرستی بێنە و خودای یەکتا بپەرستە.'

"کە باوکی ئەو قسەیەی بیست، خەنجەرێک کە پێی بوو، تێی گرت و سەری گرت و بەر سووچێکی ژوورەکە کەوت. تورکەنانپاشا بە کوڕەکەی گوت: 'هەی خوێڕی، سوپاکەمت تێدا برد و وازت لە دینی خۆت هێنا، کەچی ئێستا هاتووی منیش لە دین دەرکەی؟' لە جێوە غەریب لێی چووە پێشێ و زللەیەکی بە پشتەملیدا دا و خستی. کولیجان و قوریجان بەستیانەوە. ئەوجار غەریب لەسەر تەخت دانیشت و بە ڕەعدشای گوت: 'باوکت موسڵمان بکە.' ڕەعدشا چووە لای باوکی پێی گوت: 'ئەی پیری گومڕا، موسڵمان بە تا ڕزگارت بێ.' تورکەنان گوتی: 'ئەگەر لەسەر دینی خۆم نەبێ، نامەوێ بمرم.' لە جێوە غەریب شیری یافسی لێ ڕاکێشا و دوولەتی کرد و فەرمانی دا لە دەروازەی کۆشک هەڵیواسن. ئەویان هەڵواسی. ئەوجار غەریب فەرمانی بە ڕەعدشا دا کە جلوبەرگی پاشایەتی بپۆشێ و لەسەر تەخت دانیشێ. ڕەعد جلوبەرگی پاشایەتی کردە بەری و لە سەر تەخت لە جێی باوکی دانیشت. ئینجا غەریبپاشا لەپاڵیەوە دانیشت. کولیجان، قوریجان، جومەرقان و سوعدانیش لە ڕاست و چەپیانەوە ڕاوەستان. ئینجا غەریب پێی گوتن: 'میر و سەران و گەورە و فەرماندەکان هەرکەس هاتە ئێرە، بیگرن و نەهێڵن تاقیان دەرچن.' گوتیان: 'بەسەر چاو.' کە ڕۆژ بووەوە، گەورەگەورەکانی وڵات بەرەو کۆشک چوون. یەکەم کەس کە گەیشتە کۆشک، فەرماندەی باڵا بوو کە تورکەنانپاشای دیت دوو لەت کراوە و لە کۆشک هەڵواسراوە، حەپەسا و واقی وڕ ما. کولیجان لێی چووە پێشەوە، گرتی و قۆڵی بەست و بردییە ژوورەوە. هێشتا نەبووە قاوەڵتوون کە سێسەد و پەنجا فەرماندەی تورکەنانیان بە قۆڵبەستکراوی لەبەردەم غەریبدا دانابوون. غەریب پێی گوتن: 'خەڵکینە، خۆ پاشاتان بینی بە دەروازەی کۆشکدا هەڵواسرابوو؟' گوتیان: 'بەڵێ، بەڵام نازانین کێ وای لێ کردووە!' غەریب گوتی: 'من وام لێ کردووە. هەرکەس سەرپێچیم بکا، وای لێ دەکەم.' گوتیان: 'چیت لێمان دەوێ؟' گوتی: 'من غەریبپادشام، پادشای عێراقم کە سوپاکەتانم تێک شکاند، ڕەعدشا دینی یەکتا پەرستی قەبووڵ کرد. لەمڕۆوە ئەو پادشاتانە. جا موسڵمان بن تا

پارێزراو بن، ئەگیان پەشـــیمان دەبنەوە.' خێرا هەموو شـــایەدمانیان هێنا. غەریب گوتی: 'شـــیرینی باوەڕتان چەشـــت یا نا؟' گوتیان: 'بەڵێ، شـــیرینی باوەڕ لە دڵ و زمانماندایە.' بە فەرمانی غەریبپاشا ئیسلامیان بۆ شی کردنەوە و ئازادیان کردن، پۆشاکی شکۆمەندانەی دانێ و پێی گوتن: 'بچنەوە نێو هۆزەکانتان و ئیســـلامیـان بۆ شـــی کەنەوە. هەرکەس موسڵمان نەبوو، بیکوژن.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەوشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و شەست و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! فەرماندەکان گەڕانەوە نیو هۆزەکانیان. بەسەرهاتیان بۆ گێڕانەوە و ئیسلامیان بۆ شی کردنە و پێیان ناساند. تاقمێکیان موسلمان نەبوون و کوژران. غەریبپاشا گوتی: 'سپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی ئەو کارەی بەبێ شەڕ و دەردەسەری بە دەستەوە داین.'

"غەریب چل ڕۆژ لەوێ ماوە. ئاورگەکانی کاول کرد و مزگەوتی لە جێدا درووست کردن. ڕەعدشا بە کەشتی دیاریی بۆ غەریبپاشا ئامادە کرد. دوایی غەریب سواری کۆڵی کولیجان بوو و جومەرقان و سوعدانیش سواری کۆڵی قوریجان بوون و گەڕانەوە. هێشتا ڕۆژ نەبووبووەوە کە گەیشتنەوە شاری عوممان. سوپا بە هاتنەوەیان خۆشحاڵ بوون، لەوێوە بەرەو کووفە وەڕێ کەوتن. کە گەیشتنە دەروازەی کووفە، غەریب داوای عەجیبی برای کرد. عەجیبیان بۆ هێنا. فەرمانی دا بە دەروازەی شارەوە هەڵیواسن و تیربارانی کەن. ئیدی هەڵیانواسی و ئەوەندەیان تیر تێ گرت دەتگوت ژیشکە.

"ئەوجار غەریب ڕۆیشتە ناو شارە و چووە کۆشکەوە و لەسەر تەخت دانیشت. ئەو ڕۆژە حوکمی کرد تا ڕۆژ ئاوا بوو. پاشان چووە لای ژنەکانی. کەوکەبوسسەباح لە بەری هەستا و لە باوەشی گرت. کەنیزەکان بەخێرهاتنەوەیان کرد. ئەو شەوە لە لای کەوکەبوسسەباح ڕایبوارد. بەیانی زوو هەستا خۆی شۆرد و نوێژی کرد و چوو لە سەر تەخت دانیشت. ئاهەنگی بۆ مەهدییە گێڕا. سیهەزار مەڕ و دووهەزار مانگا و پێنجسەد وشتر و چلهەزار مریشکی سەربڕی. تا ئەو ڕۆژە ئاهەنگی وا لە ئیسلامدا نەگێڕدرابوو. ئەوجار غەریب لەگەڵ مەهدییە تێ خزا و لەگەڵی جووت بوو. دە ڕۆژ لە کووفە ماوە. دوایی وەسیەتی بۆ دامیغپاشای مامی کرد کە دادگەر بێت. ئینجا ژن و منداڵەکانی برد، ڕۆیشتن تا گەیشتنە کەشتیگەلی دیارییەکانی. ئەوەندەی دیاری و خەڵات دا بە باڵبازەکانی کە لە هەموو شتێک بێنیازی کردن. ئەوجار وەڕێ کەوتنەوە تا گەیشتنە شاری بابل. کەوا و پۆشاکی پاشایەتی بە سەهیمی برای بەخشی و کردییە پاشای ئەو شارە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەو شەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی شەشسەد و شەست و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! غەریب دە ڕۆژ لە بابل ماوە. دوای ئەوە ڕۆیشت تا گەیشتە قەڵای سەعدانی دێو. پێنج ڕۆژیش بۆ پشـوودان لەوێ مانەوە. ئەوجار بە کولیجان و قوریجانی گوت کە بچن بۆ ئەسبانیری مەداین و هەواڵی فەخرتاجی لە کۆشکی کیسرا بۆ بێننەوە و کابرایەک لە نیزیکانی شاپوورشام بۆ بێنن تا هەموو شتێکم بۆ ڕوون بکاتەوە. گورج فڕین و بە ئاسـماندا دەڕۆیشـتن کە لە ناکاو چاویان بە سـوپایەکی بێژمار کەوت. کولیجان بە قوریجانی گوت: 'بنیشـەوە با هەواڵێکی ئەو سـوپایە بزانین.' خێرا نیشـتنەوە. چوونە نێو سـوپاکەوە و لێیان پرسـین: ' ئەو سـوپایە هی کێیە و بۆ کوێ دەچێ؟' گوتیان: 'دەچین بۆ شـەڕی غەریبپاشـا تا ئەو و سـوپاکەی لەنێو بەرن.' کە ئەوەیان بیسـت، چوون بۆ لای هۆدەی سەرۆکی سوپاکە کە ناوی ڕۆستەم بوو. دانیان بە خۆیاندا گرت تا سوپای عەجەم خەوتن و ڕۆسـتەمیش خەوت. ئەوجار ڕۆسـتەمیان بە تەختەکەیەوە هەڵگرت و هێنایانەوە لای غەریبپاشـا. هێشـتا شـەو نیوەی نەڕۆیشـتبوو کە گەیشـتنەوە. مۆڵەتیان خواسـت و چوونە ژوورەوە. ڕۆسـتەمیان بە تەختەوە لەبەردەم غەریبپاشـادا دانا. غەریب گوتی: ' ئەوە کێیە؟' گوتیان: 'قوربان، ئەوە فەرماندەیەکی عەجەمە کە بە سـوپایەکی گەورەوە بە ڕێوەیە و دەیەوێ تۆ و دەسـەڵاتەکەت لە بەین بەرن. ئێمە ئەومان بۆ تۆ هێنا تا چۆنت پێ خۆشەوە وا بکەی.' غەریب فەرمانی دا سەد پیاوی ئازا بێنن. پێی گوتن: 'شیر هەڵکێشن و بە ڕاسەریەوە بوەستن.' ئەوانیش بەو جۆرەیان کرد.

"ئەوجار فەرمانی دا، ڕۆستەم خەبەر کەنەوە. کە ڕۆستەم چاوی هەڵهێنا و ئەو هەموو شـیر بە دەسـتەی دیت ، چاوی لێک نایەوە و گوتی: ' ئەو خەوە شـوومە چییە دەیبینم؟' ئەوجار کولیجان نووکە شەقێکی تێ سرەواند، ڕۆستەم قنج دانیشت و گوتی: 'ئێرە کوێیە؟' کولیجان گوتی: 'بارەگای غەریبپاشـای زاوای شـاپوورشـایە. دەی بڵێ ناوت چییە و بە نیازی کوێی؟' کە ڕۆستەم ناوی غەریبی بیست، کەوتە بیرکردنەوە و بە خۆی گوت: 'باشە من خەوتووم یان بەخەبەرم؟!' سـەهیم زللەیەکی لێ دا و گوتی: 'ئەوە بۆ وەڵام نادەیتەوە؟' ڕۆستەم سەری داخست و گوتی: 'کێ منی هێنایە ئێرە؟' غەریب گوتی: ' ئەو جنۆکانە.' کە ڕۆستەم سەیری کولیجان و قوریجانی کرد، سپی هەڵگەڕا. ئەوجار هەردوو جنۆکە شیریان لێ هەڵکێشـا و بۆی چوون و گوتیان: 'بۆچی کوڕنۆش نابەی بۆ پادشـا؟' ڕۆسـتەم کە وای زانی لێیان ترسـا و زانی بەخەبەرە، خێرا هەسـتا و کوڕنۆشـی برد و گوتی: 'پاشـا، ئاگر بتپارێزێ و تەمەنت درێژ کا.' غەریب گوتی: 'هەی سـەگی گڵاو، ئاگر هی پەرسـتن نییە؛ ناتوانێ سـوود و زیان بەگەیەنێ.' ڕۆسـتەم گوتی: 'ئەی خودای ڕاسـتەقینە کێیە؟' غەریب گوتی: 'ئەوەیە کە زەوی و ئاسـمانی ئافراندوون.' ڕۆسـتەم گوتی: 'ئەی چی بڵێم تا ببمە

کۆیلەی ئەو خودایە؟' غەریب گوتی: 'بەڵێ، لائیلاهە ئیللەڵلا، ئیبراهیم خەلیلولڵلا.' ڕۆستەم شایەدمانی هێنا و گوتی: 'پاشا، ئەوە بزانە کە شاپوورشا نیازی کوشتنی تۆی هەیە و منی بە سەدهەزار سواری ئازاوە بۆ کوشتنی تۆ نارد.'

"کە غەریب ئەو قسەیەی بیست، گوتی: 'مەگەر پاداشی من ئەوەیە کە کچەکەیم ڕزگار کرد و نەنگیم لەسەر لا برد؟ خودا هەقی لێ بسێنێ! ناوت چییە؟' گوتی: 'من ڕۆستەمم. فەرماندەی باڵای سوپای شاپوورشام.' غەریب گوتی: 'ئێستا فەرماندەی سوپای منی. دەی بڵێ، بزانم حاڵی شازادە فەخرتاج چۆنە؟' ڕۆستەم گوتی: 'قوربان گیان، بۆخۆت خۆش بی، تەمەنی درێژی بۆ تۆ جێ هێشت.' غەریب گوتی: 'باشە بۆ مرد؟' ڕۆستەم گوتی: 'کاتێک تۆ دوای عەجیبی برات کەوتی، کەنیزێک لە کەنیزانی شاپوورشا چووە لای پاشا و گوتی: 'پاشام، تۆ گوتووتە کە غەریبپاشا لەگەڵ شازادە فەخرتاجدا بخەوێت؟' شاپوورشا گوتی: 'بە ئاگر و ڕووناکی، شتی وام نەگوتووە!' ئیدی شیری هەڵگرت و چووە کن فەخرتاج و پێی گوت: 'هەی قەحبە، چۆن ڕێت دا ئەو دەشتەکییە بێتە لات کە نە مارەییەکەتی داوە و نە ئاهەنگی بۆ گێڕاوی؟' فەخرتاج گوتی: 'بابە، تۆ مۆڵەتت دا کە لای من بخەوێ؟' پاشا گوتی: 'بڵێ، بزانم لێت نیزیک بووەوە؟' فەخرتاج سەری داخست و هیچی نەگوت. پاشا بانگی مامان و شتی کرد و گوتی: ' ئەو قەحبەیە ببەستنەوە و بزانن کچە یا نا.' بەستیانەوە و مامانەکان، چاویان لێ کرد و گوتیان: 'بێبنی کردووە.' پاشا پەلاماری دا و ویستی بیکوژێ، دایکی فەخرتاج نەیهێشت پاشا بیکوژێت و گوتی: 'پاشا، مەیکوژە؛ دوایی خۆت سەرزەنشت دەکەی، بەڵام بیخە زیندانەوە تا لەوێ بمرێ.' پاشا خستیە زیندانەوە. کە شەو داهات، دوو کەسی لە پیاوەکانی خۆی نارد کە لە شار بیبەنە دەرەوە و بیخەنە ڕووباری جەیحوونەوە. ئەوانیش فەرمانیان بەجێ هێنا و فەخرتاج سەروسۆراخی نەما.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و شەست و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! کە غەریب ئەوەی بیست، دنیای لە بەرچاو تاریک بوو، هەڵچوو و گوتی: 'بە هەقی خەلیلوڵلا ئەو گلاوە دەکوژم و تەخت و تاجی ویران دەکەم.' ئەوجار نامەی بۆ جومەرقان و میری شاری میارقین و موسڵ نووسی و بە ڕۆستەمی گوت: 'چەند هەزار باڵبازت لەگەڵ بوو؟' گوتی: 'سەدهەزار سوار.' غەریب گوتی: 'دەهەزار بەرە و لەگەڵ ئەواندا بکەوە ڕێ و شەڕی گەلەکەت بکە. منیش بەدواتدا دێم.' دەمودەست ڕۆستەم لەگەڵ دەهەزار سواردا کەوتە ڕێ و گوتی: 'دەبێت کارێک بکەم ببێتە مایەی ڕووسووریم.' بەو مەبەستە ڕۆستەم حەوت ڕۆژ بەڕێوە بوو تا لە سوپای عەجەم نیزیک بووەوە مەودای دانەڕێیەکی تەواو نەمابوو. ئەوجار سوپاکەی کردە چوار بەشەوە و پێی گوتن: 'دەوری سوپای عەجەم بدەن. کە بوو بە نیوەشەو، هەڵکێشنە شیر و تێیان کەون.' سوپاکە سوار بوون و نیوەشەو بوو کە لە چوار لاوە پەلاماری عەجەمانیان دا. سوپای عەجەم خەبەریان بووەوە و بە پەلەپرووزە و پەشۆکاوی دەستیان دا شیر و کەوتنە گیانی یەک. ڕۆستەمیش کارێکی پێ کردن، با بە دەواڕی شڕی نەکردبێ. هێشتا ڕۆژ نەببووەوە کە زۆربەی سوپای عەجەم کوژران و بریندار بوون و ئەوەشی ماشەوە، هەڵات. موسڵمانان تاوڵ و کەلوپەلەکانیان بە دەستکەوت بردن و لەوێ پشوویان دا تا غەریبپاشا گەیشت و کاری ڕۆستەمی دی. غەریب خەڵاتێکی شیاو و شکۆمەندانەی دایە و پێی گوت: 'ڕۆستەم، یەکەم سوپای عەجەم تۆ شکاندت. دەستکەوتەکە هەمووی بۆ خۆت.' ڕۆستەم سپاسی پاشای کرد و ئەو ڕۆژە لەوێ پشوویان دا. هەڵاتووانی عەجەم چوونەوە لای شاپوورشا و لە ڕووداوەکە ئاگاداریان کردەوە. پرسی: 'کێ هێرشی بۆ هێنان؟' گوتیان: 'ڕۆستەمی فەرماندەی باڵات کە لەسەر دەستی غەریبپاشا موسڵمان ببوو.' کە پاشا ئەوەی بیست، تاجەکەی لە زەوی ڕاکێشا و ڕووی لە وەردشای کوڕی کرد و گوتی: 'ڕۆڵە، تۆ نەبی، کەس ناتوانێ بەر بەم بەڵایە بگرێ.' وەردشا گوتی: 'باوکە، بە گیانی تۆ، دەبێ غەریب و هۆزەکەیت بۆ پەت کەم و بۆت بێنم.' ئەوجار شاپوورشا چوو سوپاکەی بەسەرکردەوە، دیتی دووسەدهەزار کەس دەبوون. شەو بە نیازی ڕۆیشتنەوە خەوتن. دەمەو بەیان ویستیان وەڕێ کەون، لەپڕ تەپوتۆزێک هەستا بەری ڕۆژی گرت. شاپوورشا کەسێکی بۆ هەواڵگری نارد. نێردراوەکە چوو و هاتەوە، گوتی: 'پاشام، غەریب و سوپاکەیەتی ئەو دەگاتێ.' ئیدی لەڕێوە لە سەفەرەکەی پەژیوان بوونەوە و لەجیاتییان خۆیان بۆ شەڕ و بەربەرەکانی ئامادە کرد. سوپاکەیان لە بەرابەر سوپای غەریبدا ڕیز کرد. کە غەریب لێیان نیزیک بووەوە و دیتی وا عەجەم ئاهەنگی شەڕ دەگێڕن، لەڕێوە هێرشی کردنە سەر. عەڕەب و عەجەم پێک وەربوون و کەوتنە گیانی یەک، خوێن جۆگەلەی بەست و تا تەنگی

ئێواره لێكیان كوشـت. ئەوجار تەپڵی گەڕانەوە لێ درا و هەردوو سـوپا لێك جودا بوونەوە و چوونەوە تاولەكانیان."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆكی ئەوشـــەویش كۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆكەكەی هەڵگرت بۆ شەوێكی دیكە.

## كە شەوی شەش‌سەد و شەست و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ! کە ڕۆژ بووەوە، هەردوو ســوپا ســوار بوون و چوونە گۆرەپانی جەنگ. یەکەم کەس کە پێی خســـتە گۆڕەپانی شـــەڕەوە، ڕۆســـتەم بوو کە بەدەم گوتنی ئەڵلاهوئەکبەرەوە ئەســـپی بەرەو گۆڕەپان تاو دا و گوتی: 'من ســـەرهەنگی پاڵەوانانی عەرەب و عەجەمم. کێ ئازایە بێتە شەڕی من؟' پاڵەوانێکی عەجەم هاتە دەرەوە. هێرشی بۆ ڕۆستەم برد. ئەویش بەرەنگاری بووەوە. لە نێوانیاندا شەڕ هاتە ئاراوە تا وا بوو ڕۆستەم بەو ڕمبەحەفتا مەنییەکەی، دانەیەکی لێ دا، ســەری برد لە ملییەوە و کەوتە ســـەر زەوی. شـــاپوورشـــا ئەوەی بۆ قووت نەچوو و فەرمانی بە ســوپاکەیدا کە هێرش بکەن. ســوپای عەجەم هێرشـــیان بۆ موســـڵمانان برد و هاواریان لە ئاگر و ڕووناکی و مانگ و هەور دەکرد. موســڵمانانیش هاواریان لە خودای تاق و تەنیا دەکرد. لەو دەمەدا غەریب گوڕاندی و شـــیری یافســـی هەڵکێشـــا و پەلاماری ســـوپای عەجەمی دا. کولیجان و قوریجانیش بەدوایەوە بوون. ئیـدی بەو شـــیرە وەک گیـا عەجەمی دەدرووەوە تـا گەیشـــتە بەیداخ‌هەڵگرەکەیان و بە شـــیرێک دوولەتی کرد. کە عەجەم دیتیان بەیداخەکەیان کەوت، بەرەو شـــار هەڵاتن. موســـڵمانان دوایان کەوتن و ئەوان نەیانتوانی دەروازەکان داخەن. ئەوجار ڕۆســـتەم و جومەرقان و ســـوعدان و کولیجان و قوریجان و تەواوی ســـوپای غەریب‌پاشا هێرشیان کردە سەر عەجەم و لە کۆلانەکانی شاردا خوێن جۆگەلەی بەست. ئیدی عەجەم داوای داڵدەیان کرد. موســـڵمانان دەســـتیان هەڵگرت و وەک مەڕ بەرەو تاوڵەکان وە پێش خۆیان دان. غەریب‌پاشـــا گەڕاوە تاوڵەکەی و لەســـەر تەخت دانیشـــت. ئەوجار داوای کرد پاشـــای عەجەمی بۆ بێنن. هێنایان و لەبەرانبەر غەریبەوە ڕایانگرت. غەریب گوتی: 'چی وای لێ کردی وا لە کچەکەت بکەی و بۆ چی منت بە شـــیاوی میردی کچەکەت نەزانی؟' شـــاپوور گوتی: 'هەر لێم گەڕێ و ســـەرکۆنەم مەکە. ئێســـتا بۆخۆم پەشـیمانم. من لە ترســاندا هاتمە شــەڕی تۆ.' کە غەریب ئەوەی لێ بیســت، فەرمانی دا لە ســـەر زەوی درێژی کەن و لێی دەن. ئەوەندەیان لێ دا تا نیوەگیان بوو. ئەوجار خســـتیە زیندانەوە. ســـوپای عەجەم کۆ کردەوە و بنەمای باوەڕی ئیســـلامیان بۆ شـــی کردنەوە و پێیان ناساندن. سەدوبیست هەزاریان موسڵمان بوون و ئەوانی دیکە کوژران. هەرکەس لە شاردا بوو، موسڵمان بوو. ئەوجار غەریب‌پاشا سوار بوو و چووە ئەسبانیری مەداینەوە و لەسەر تەختی پاشایانی عەجەم دانیشت. دەستکەوتەکانی بەسەر سوپای عەجەمدا بەش کرد و ئەوانیش سپاس و ستایشیان کرد.

"پاشـــان دایکی فەخرتاج یادی کچەکەی کردەوە و پرســـەی بۆ گێڕا. کۆشـــک پڕ بوو لە شـین و ڕۆڕۆ. غەریب چووە کنیان و لێی پرســین: 'بۆچی دەگرین؟' دایکی فەخرتاج گوتی:

'کە تۆ هاتی، کچەکەمم بیر هاتەوە. ئەگەر ئەو زیندوو بووایە، بە هاتنی تۆ زۆر خۆشحاڵ دەبوو.' غەریبپاشاش گریا و گەڕاوە بۆ سەر تەختەکەی. داوای شاپووری کرد. ئەویان بە کۆت و زنجیری قورسەوە هێنا. پێی گوت: 'چیت لە کچەکەت کرد؟' گوتی: 'فلانی و فلانیم راسپارد تا بیبەن بیخەنە ڕووباری جەیحوونەوە.' غەریب ئەو دوو کەسەی بانگ کرد و لێی پرسین: 'ئەوەی شاپوور دەیڵێ، ڕاستە؟' گوتیان: 'بەڵێ، پاشا ڕاست دەکا، بەڵام ئێمە نەماخستە ڕووبارەکەوە؛ بەزەییمان پێیدا هات و لە کەنار جەیحووندا جێمان هێشت و پێمان گوت: 'خۆت ڕزگار کە و مەگەڕێوە بۆ شار.'

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی شەش‌سەد و حەفتایەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! کە ئەو دوو پیاوە باسی فەخرتاجیان بۆ غەریب‌پاشا گێڕاوە، پاشا ئەستێرەناسانی بانگ کردن و پێی گوتن: 'چاوی بۆ لە تەختەفال کەن بزانن چارنووسی فەخرتاج بەرەو کوێی بردووە، بزانن زیندووە یا مردوو.' چاویان لە تەختەفال کرد و گوتیان: 'قوربان، زیندووە و کوڕێکیشی بووە. ئێستا هەردووکیان لای خێڵێکی جنۆکانن، بەڵام بیست ساڵ لە تۆ دوور دەبێ.' غەریب‌پاشا ئەژماری کرد، دیتی ئەوە هەشت ساڵە لێی دوورە. ئەوجار پیاوی نارد بۆ ئەو قەڵایانە کە لەژێر فەرمانی شاپووردا بوون. هەموو هاتن تا وا بوو ڕۆژێک لە ڕۆژان لە کۆشکدا دانیشتبوو، تەپوتۆزێکی چڕ لە دوور بەری ئاسمانی گرت. غەیریب‌پاشا کولیجان و قوریجانی نارد هەواڵێک بزانن. ئەوان فڕین و سوارێک لە سوارەکانی سوپایان ڕفاند و هێنایانە لای غەریب‌پاشا و گوتیان: 'قوربان، ئەوە یەکێک لە باڵبازەکانی ئەو سوپایەیە.' غەریب گوتی: 'ئەوە سوپای کێیە؟' باڵبازەکە گوتی: 'ئەوە سوپای وەردشای[1] پاشای شیرازە هاتووەتە شەڕی تۆ.'

هۆکاری هاتنەکەشی ئەوە بوو کاتێک شەڕ لەنێوان شاپوور و غەریبدا هەڵگیرسا و شاپوور ئاوای بە سەر هات کە هات، کوڕی شاپوور لەگەڵ کەمێک لە سوپاکەدا بەرەو شیراز هەڵات و پەنای بۆ وەردشا برد. ئەوەی غەریب بەسەری هێنابوون، بۆی گێڕاوە. وەردشا پێی گوت: 'پێم بڵێ، ژنەکەم ساغ و سەلامەتە یا نا؟' گوتی: 'ژنەکەت غەریب گرتوویەتی.' ئیدی وەردشا گوتی: 'بە گیانی خۆم، دەبێ دەردێک بدەم بەو دەشتەکی و موسڵمانان تاقیان بۆ دەرمان نەهێڵم.' ئەوجار نامەی بۆ میری وڵاتانی ژێر دەستی نارد، ئەوانیش سوپایان بۆ نارد. ژمارەی سوپا هەشتا و پێنج هەزار بوو. خێرا جبەخانەی کردەوە و خەڵکەکەی چەکدار کرد و بۆ سبەینێ وەڕێ کەوت تا گەیشتنە ئەسبانیری مەداین و لە نیزیک شار تاوڵیان هەڵدا. کولیجان و قوریجانیش هاتنە پێشەوە و ئەژنۆی پاشایان ماچ کرد و گوتیان: 'قوربان، تکای ئێمە قەبووڵ بکە و شەڕی ئەو سوپایە بە ئێمە بسپێرە.' غەریب گوتی: 'ئەوە سوپا و ئەوە ئێوە. هەرچی دەتوانن، بیکەن.' لە جێوە هەردوو جنۆکە فڕین و لە تاوڵی وەردشادا نیشتنەوە. دیتیان لەسەر تەخت دانیشتووە و کوڕی شاپووریش لە دەستەڕاستیەوە ڕاوەستاوە و فەرماندەکانیش لە چەپ و ڕاستەوە ڕیزبوونە و لەبارەی کوشتنی موسڵمانانەوە ڕاوێژ دەکەن. ئەوجار کولیجان چووە پێشەوە کوڕی شاپووری ڕفاند و قەلیجانیش وەردشا و بردنیانە لای غەریب‌پاشا. بە فەرمانی غەریب

---

[1]. پێشتر کوڕی شاپووریش ناوی وەردشا بوو، بەڵام لێرەدا دەڵێت کە پاشای شیراز ناوی وەردشایە و ناوی کوڕی شاپوور ناباتەوە. (و. ک.)

ئەوەندەیان لێ دان کە لە هۆش چوون. دوایی کولیجان و قولیجان شـــیریان هەڵکێشـــا و بەرەو کافران چوون و ســەرپاکیان کوشــتن و گەڕانەوە کن غەریب و دەســتیان ماچ کرد. غەریب کارەکەیان پەسـند کرد و دەسـتکەوتی کافرانی پێ بەخشـین. ئەوانیش دۆعایان بۆ پاشا کرد و گەڕانەوە دەستکەوتەکانیان کۆ کردەوە. کاری غەریب بێرە گەیشت."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەوشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و حەفتا و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! تاقمێکی کەم لە سوپای کافران کە لە شیری کولیجان و قوریجان ڕزگاریان ببوو، بەرەو شـیراز هەڵاتنەوە و پرسـەیان بۆ کوژراوەکانیان دانا. وەردشـا، برایەکی هەبوو سەیرانی جادووگەریان پێ دەگوت. لەو سەردەمەدا کەس لەو جادووگەرتر نەبوو. دوور لە براکەی و لە یەکێک لە دوورگەکان لە قەڵایەکدا دەژیان و لەوێ نیشـتەجێ بوو. ڕێگەی دانێک لە شـێراز دوور بوو. هەڵاتووان کە گەیشـتنەوە شـیراز، بە شـین و گریانەوە چوون بۆ لای. سەیرانی جادووگەر پرسی: 'ئەوە چی بووە بۆ دەگرین؟' ئەوانیش بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕاوە. باسی ئەوەشیان بۆ کرد کە جنۆکە وەردشای برایان ڕفاندووە. کە سـەیران ئەوەی بیسـت، ئاسـمانی لە بەرچاو تاریک بوو گوتی: 'بە دینم، غەریب و پیاوەکانی دەکوژم و یەک کەسـیان بە زیندوویی لێ ناهێڵم.' ئەوجار جادووی خوێند و ئەحمەر پاشـای بانگ کرد. ئەحمەر پاشـا ئامادە بوو و پێی گوت: 'بچۆ بۆ ئەسـبانیری مەداین و غەریبم بۆ قۆڵبەسـت بکە لەو کاتەدا لەسـەر تەخت دانیشـتووە.' ئەحمەر پاشـا فەرمانی وەرگرت و بە سوپاکەیەوە بەرەو ئەسبانیر کەوتە ڕێ.

"کە غەریب دیتی، شـیری یافسـی هەڵکێشـا و کولیجان و قوریجانیش بەرەو سـوپای ئەحمەر پاشا چوون. پێنجسەد و سی کەسیان لێ کوشتن و ئەحمەر پاشاشیان بە سەختی بریندار کرد. ئەحمەر پاشا بە برینداری لەگەڵ سوپاکەیدا هەڵات و خۆیان گەیاندەوە قەڵای میوەکانی سـەیرانی جادووگەر و پێیان گوت: 'ئەی زانای زەمان، غەریبپاشـا شـیرێکی نووشتە لێ کراوی پێیە و دوو جنۆکەی کێوی قافیشی لەگەڵە کە مەرعەشپاشا داوییەتییە. هەر ئەو ئەزرەق پاشـا و بورقانپاشـای لە کێوی قاف کوشـتووە گەلێک لە جنۆکانی لەنێو بردوون.' کە سەیرانی جادووگەر ئەوەی لە ئەحمەر پاشا بیست، گوتی: 'تۆ خەریکی کاری خۆت بە.' دوایە سـەیران جادوویەکی خوێند و نرناشێکی بانگ کرد کە ناوی زەعازیع بوو. هێندەی درەمێک بەنگی بۆنداری دایە و گوتی: 'بچووە بۆ ئەسـبانیری مەداین لەوێ لە بیچمی باڵندەیەکدا بچووە بۆ کۆشکی غەریبپاشا. ڕاوەستە تا غەریب دەخەوێ و کەس لە خزمەتکـارەکـان لە لای نـامێنن. ئەوجـار بەنگەکە بنێ بەر لووتی و ئەوم بۆ بێنە ئێرە.' زەعازیع فەرمانی وەرگرت و گورج کەوتە ڕێ تا گەیشـتە ئەسـبانیری مەداین. لە بیچمی باڵندەیەکدا چووە کۆشکی پاشا. لەسەر تاقێک هەڵنیشت، تا نیوەشەو دانی بە خۆیدا گرت کاتێک پاشـا دەوری چۆڵ بوو، خەڵکەکە بڵاوەیان کرد و غەریبپاشـا لەسـەر تەختەکەی درێژ بوو خەوی لێ کەوت. ئەوجار زەعازیع لە تاقەکە هاتە خوارەوە، بەنگی خسـتە بەر لووتی غەریبپاشا. غەریبپاشا لە جێوە لە هۆش خۆی چوو، ئەوی پێچاوە و وەک ڕەشەبا ڕفاندی و هێشتا شەو تەواو نەبووبوو کە گەیشتەوە قەڵای میوەکان و چووە لای سەیرانی

جادووگەر. سـەیران دەسـتخۆشـی لێ کرد و ویسـتی غەریب بکوژێ، بەڵام پیاوێکی دونیادیتووی هۆزەکەی نەیهێشـت و گوتی: 'ئەی حەکیم، ئەگەر بیکوژیت، مەرعەشپاشـا هێرشمان بۆ دێنێ و خێڵی جنۆکان شارەکانمان وێران دەکەن.' سەیران گوتی: 'ئەی دەڵێی چی لێ بکەین؟' ئەو کابرایە گوتی: 'بیخە جەیحوونەوە، با هیچ کەس ئاگای لە ڕازی ئەو کارە نەبێ.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و حەفتا و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! غەریبی هەڵگرت و چووە ڕۆخ ڕووباری جەیحوون. ویستی بیخاتە نێوییەوە، دڵی بەم کارە بەرایی نەدا و بەزەیی بە غەریبدا هات. داری هێنا و پێکەوەی بەستن، غەریبی خستە سەر ئەو دارانە، دای بەدەم جەیحوونەوە و ئاوەکە بردی. کاری غەریب بێرە گەیشت.

"هۆزی غەریبیش بەیانی کە لە خەو هەستان چوونە خزمەتی، تەماشایان کرد لەوێ نەبوو بەڵام تەسبێحەکەی لەسەر تەختەکە بوو. زۆری چاوەڕێ بوون، بەشکوو بێتەوە. کەچی هەر دیار نەبوو، پەردەداریان بانگ کرد و گوتیان: 'دا بزانە هەواڵێکی پاشا نازانی؟ ئەو خووی وا نەبوو تا ئەوکاتانە دوا بکەوێ.' پەردەدار لە پیاوە ماڵییەکانی پرسی، گوتیان: 'لە دوێنێوە تا ئێستا نەمانبینیوە.' پەردەدار گەڕاوە گوتی کە کەس بە هەواڵی نازانێ. هەموو سەریان سووڕ ما و بە یەکدییان گوت: 'با بچین باخەکان بگەڕێین، ڕەنگە چووبێ هەوایەک بگۆڕێ' ئیدی چوونە لای باخەوانەکان و هەواڵی پاشایان لێ پرسین، ئەوانیش گوتیان: 'نەمانبینیوە.' ئیدی ئێوارە بە مات و مەلوولی گەڕانەوە. کولیجان و قوریجان هەموو شارەکان گەڕان و هیچ سەرەداوێکیان دەست نەکەوت. ئیدی سوپا و خەڵکی شار ڕەشیان پۆشی. کاری ئەوانیش بێرە گەیشت.

"غەریبپاشاش لەولاوە پێنج ڕۆژان وەک مردوو لە سەر داروتەختەکان بوو، ئاو هەر دەیبرد و دەیبرد. ئەوجار گەیشتە دەریای سوێر و بە هۆی ڕەشەباوە بەنگەکە لە لووتی دەرچوو. غەریب چاوی کردەوە و تەماشای کرد ئەوە لە نێوەڕاستی دەریادا دایە. گوتی: 'سوبحانەڵڵا، ئەوە کێ وای بەسەر هێناوم؟' هەر ئاوا بێ دەسەڵات، لەوپەڕی سەرگەردانی و واقوڕماندا بوو کە کەشتییەک دەرکەوت. غەریب بە دەستی ئاماژەی بۆ سەرنشینەکانی کرد. ئەوانیش خێرا بەدەمیەوە هاتن، گرتیان و بردیانە نێو کەشتییەکەوە و لێیان پرسی: 'تۆ کێیت و خەڵکی کام شاری؟' غەریب گوتی: 'جارێ لەوەگەڕێن شتێکم دەنێ با بیخۆم، هێزم بێتەوە بەر، ئەوە لە برسان دەمرم. ئەوجار بەسەرهاتی خۆمتان بۆ دەگێڕمەوە.' کە وای گوت، سەرنشینەکان خواردن و خواردنەوەیان بۆ هێنا. جا غەریب کە خواردی و خواردیەوە، گوتی: 'خەڵکینە، ئێوە کوێنەرین و چی دەپەرستن؟' گوتیان: 'کورجیین[1] و بوتێک بە ناوی مینقاش دەپەرستین.' غەریب گوتی: 'ئەک نەفرەتی خودا لە خۆتان و لە بوتەکەتان ئەڕێوەڵڵا! گلاوینە، جگە لەو خودایەی کە هەموو شتێکی ئافراندووە، هیچ شتێک شیاوی پەرستن نییە.' هێندەیان پێ ناخۆش بوو پەلاماری غەریبیان دا و گەرەکیان بوو

---

[1]. لە نوسخە عەرەبییەکان و یەک-دوو نوسخەی ئینگلیزیدا نووسراوە: کەرەج. (هەڵەچنی فارسی)

بیگرن، ئەو مســتێکی لە هەر کامێکیان دەدا، لە جێوە دەیکوشــت تا وا بوو چل کەســی لێ کوشـــتن. ئەوجار، هەموو پێکەوە پەلاماریان دا، گرتیان و قۆڵیان بەســـت. لە نێو خۆیاندا هاتنە ســـەر ئەوە کە لەوێ نەیکووژن تا نەیبەنەوە خاکی خۆیان و لای پاشــاکەیان.' هەر بۆیە لە کەشتییان خست و بردیان تا گەیشتنەوە شاری گورج."

لێرەدا بوو، مــاوەی چیرۆکی ئەوشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی شەشسەد و حەفتا و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! کەشتییەکە گەیشتەوە شاری گورج. ئەو شارە فەرماندەیەکی ئازا و نەترســـەوە ڕۆ نرابوو، لەبەر ژیری و لێزانییانی لە هەر دەروازەیەکیدا کەســێکی لە مس دانابوو. ئەگەر بێگانە بیویســـتایە بچێتە ئەو شـــارەوە، ئەو کەســـە کەڕەنای لێ دەدا و هەرکەس کە لەو شارەدا بوو دەنگەکەی دەبیست. دەمودەست ئەو کەسە بێگانەیان دەگرت. ئەگەر نەچووبایەتە سەر ئایینی ئەوان، دەیانکوشت. جا کە غەریبیان بردە نێو شارەوە، ئەو پەیکەرە مسییە وا فووی بە کەڕەنادا کرد کە ناوکی پاشاشی خست. هەستا چووە بوتخانە. تەمەشـــای کرد لە دمی بوتەکەوە ئاگر و دوکەڵ هەڵدەســـتێ. شـــەیتان چووبووە نێو ئەو بوتەوە و لەســـەر زاری ئەوەوە قســـەی دەکرد. ئیدی دەنگێک لە بوتەکەوە هات و گوتی: 'پاشا، کەسێک بە ناوی غەریبەوە هاتووەتە شارەکەت کە پاشای عێراقە و خەڵکی لە سەر ئایینی خۆیان لادەبا. کە هێنایانە لات، بیکوژە.' پاشـــا گورج لە بوتخانە چووە دەرەوە و لە سەر تەخت دانیشت. ئەوان غەریبیان هێنا و لە بەردەم پاشا ڕایانگرت و گوتیان: 'قوربان، ئێمە ئەو گەنجەمان لە ناو دەریا لە خنکان ڕزگار کرد. کە ئەومان لە دەریا دەرێناوە، دیتمان نکۆڵی لە خودای ئێمە دەکا.' تەواوی بەســەرهاتەکەیان ئاوا بۆ گێڕاوە. پاشـا گوتی: 'بیبەنە بوتخانە و لەبەردەم گەورەی بوتاندا ســـەری ببڕن. ڕەنگە کەیفی پێ بکا.' وەزیر گوتی: 'قوربان، سەربڕینی کارێکی باش نییە، ئاخر دەستبەجێ گیانی دەردەچێ. باشتر وایە جارێ بیخەینە بەندیخانەوە تا ئاگرێکی گەورە دەکەینەوە ئینجا بیخەینە ئاگرەکەوە.' وا بوو خســـتیانە بەندیخانەوە و خزمەتکاران چوون دار و چرپی و چاڵیان کۆ کردەوە و ئاورێکی گەورەیان کردەوە، تا بەری بەیان بڵێســـەی دەدا. بەیانی زوو پاشـــا هاتە دەرەوە و خەڵکی شـــار کۆ بوونەوە و خزمەتکاران بە تاڵووکە چوون غەریب بێنن. ســـەیریان کرد، لە بەندەکەیدا نەماوە. گورج گەڕانەوە و پاشایان ئاگادار کردەوە. پاشا گوتی: 'چۆنچۆنی بەو هەموو کۆت و بەندە قورس و دەرگا داخراوانەوە لە بەندیخانە هەڵاتووە؟!' پاشـــا ســـەری ســـووڕ ما و گوتی: 'باشـــە ئاســـمان هەڵیکێشـــا یان زەوی قووتی دا؟!' کەس ســـەری لێ دەرنەدەکرد. پاشـا گوتی: 'من دەچمەوە لای خودای خۆم و هەواڵی غەریب لەو دەپرسـم و ئەو دەزانێ.' دەمودەست پاشا هەستا چووە بوتخانە تا کوڕنۆش بۆ بوتەکەی ببا، سەیری کرد بوتەکە لەوێ نییە. چـاوی هەڵگلۆفـت و گوتی: 'ئەرێ ئەوە خەون دەبینم یـان بە خەبەرم؟!' دوایی چووە لای وەزیر و گوتی: 'ئەرێ وەزیر، خوداکەی من و زینـدانییەکە چییان لێ بەسـەر هات؟ وەزیری گڵاو، ئەگەر تۆ باسـی سـووتاندی ئەو کابرایەت نەکردایە، من خێرا کوشـتبووم. خۆم دەزانم ئەوە خوداکەمی دزیوە و لە بەندیخانە هەڵاتووە. ناچارم دەبێ تۆڵەی خوێنی خوداکەم لە تۆ بکەمەوە.' ئیدی شیری هەڵکێشا و وەزیری کوشت.

ڕووداوی هەڵاتنی غەریب شـــتێکی ســـەیر بوو. کە غەریبیان بەند کرد، بەندەکەی لە تەنیشـــت بوتخانەکەوە بوو، غەریب دەســـتی کرد بە ڕازونیاز لەگەڵ خودای خۆی. ئەو دیلمانجەی دەچووە نێو بوتەکان و لە جێی بوتەکان قســـەی دەکرد، بە بیســـتنی ناوی پەروەردگار دڵی نەرم بوو و گوتی: 'ئەی خەجاڵەت خۆم بەرانبەر کەســـێک کە ئەو من دەبینێ و من نایبینم!' ئەوجار هەســـتا چوو خۆی بەســـەر پێی غەریبدا دا و گوتی: 'قوربان، چی بڵێم کە بێمە ســـەر ئۆلی تۆ؟' غەریب گوتی: 'بڵێ، لائیلاهە ئیللەڵلا، ئیبڕاهیم خەلیلوڵلا.' دیلمانجەکە بەو شێوەیە موسوڵمان بوو، شایەدمانی هێنا. ئەو شەیتانە ناوی زیلزالی کوڕی موزەلزیل بوو. باوکی لە گەورە پیاوانی جان بوو. ئەوجار کۆت و زنجیری لە غەریب کردەوە. ئەوجار غەریب و بوتەکەی هەڵگرت و فڕی بۆ ئاسمان."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی شەشسەد و حەفتا و چوارەم هاتەوە

گوتی: "پاشا وەزیری کوشت. کە گەورەکانی سوپا بەو هەواڵەیان زانی، ڕقیان لە بوت پەرستی هەستا و هێرشیان کردە سەر پادشا و کوشتیان. ئیدی پەلاماری یەکتریان دا و کەوتنە گیانی یەک. هەتا سێ ڕۆژان لە یەکتریان کوشت تا وا بوو جگە لە دوو پیاو، کەسی زیندوویان لێ نەماوە. لەو دوانەش یەکیان ئەوی دیکەیانی کوشت. ئەوجار منداڵان هێرشیان بۆ ئەو پیاوەش برد و ئەویشیان کوشت. منداڵەکانیش کەوتنە گیانی یەکتر هەتا هەموو تێدا چوون. دوایە ژنان و کچان لە شار هاتنە دەرەوە و ڕوویان لە هەندەران کرد و شار کەسی تێدا نەما و چۆڵ بوو. کاری ئەوانیش بێرە گەیشت.

"غەریبپاشاش کە زیلزالی کوڕی موزەلزیل هەڵیگرتبوو، بردی بەرەو شاری خۆی لە دوورگەی کافوور و کۆشکی بلوور. موزەلزیل پاشا گوێرەکەیەکی هەبوو کە جلوبەرگی زیوین و ڕازاوەیان لە بەر کردبوو و ئەوەیان دەپەرست. ڕۆژێکیان موزەلزیل و هۆزەکەی بۆ پەرستنی گوێرەکەکە چوون، دیتیان قەڵسە. موزەلزیل گوتی: 'خودایە گیان، بۆچی قەڵسی؟' شەیتانی نێو گوێرەکەکە وەڵامی داوە: 'هۆی موزەلزیل، کوڕەکەت لەسەر دەستی غەریبپاشای عێراق موسڵمان بووە و باوەڕی بە ئیبراهیم هێناوە.' دوای ئەوە تەواوی بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕاوە. کە پاشا ئەوەی بیست، شێت و هار بوو و لە بوتخانە هاتە دەرەوە، چوو لەسەر تەختی پاشایی دانیشت و داوای گەورەکانی وڵاتی کرد. کە ئەوان ئامادە بوون، پاشا ئەوەی لە گوێرەکەکەی بیستبوو، بۆی گێڕانەوە، ئەوانیش سەریان سووڕ ما. گوتیان: 'قوربان، چی بکەین؟' پاشا گوتی: 'کە کوڕەکەم هاتەوە و ئێوە دیتتان من باوەشم پێدا کرد، پەلاماری بدەن، بیگرن و بیبەستنەوە.' دوو ڕۆژ بەسەر ئەو دەنگوباسەدا تێپەڕی، زیلزال بە غەریب و بوتی پاشای گورجەوە گەیشتەوە شار. کە چووە کۆشکەوە، باڵبازەکانی کۆشک پەلاماری ئەو و غەریبیان دا و گرتیانن و بردیاننە بەردەم پاشا موزەلزیل. پاشا بە تووڕەییەوە لە کوڕەکەی ڕوانی و گوتی: 'هەی خوێڕی، ئەوە پشتت لە ئایینی خۆت و باوباپیرانت کردووە؟' گوتی: 'بەڵێ، ئایینێکی ڕاستەقینەم هەڵبژاردووە. تۆش موسڵمان ببە تا لە سزای خودا پارێزراو بی.' پاشا تووڕە بوو و گوتی: 'کوڕە هەی نارەسەن، ئەوە تۆ وات لێ هاتووە بەم جۆرە قسەم لەگەڵدا بکەی؟' ئەوجار فەرمانی دا، بەندی بکەن. ئەوجار ڕووی لە غەریب کرد و گوتی: 'هەی خوێڕیترین مرۆڤ، ئەوە چۆنت مێشکی کوڕەکەم شۆردەوە و لاڕێت کرد؟' غەریب گوتی: 'ئەوم لاڕێ نەکردووە بەڵکوو لە لاڕێییەوە خستە سەر ڕێی ڕاست.' پاشا بانگی نرناشێکی کرد، ناوی سەییار بوو و پێی گوت: ' ئەو نەگریسە بەرە و بیبە لە نێو دەشتی ئاگردا بەرەڵای کە با بمرێ.' ئەو دەشتەش هێندە گەرم بوو، هیچ کەس نەیدەتوانی تاوێک بە زیندوویی تێیدا

بەرگە بگرێ و خێرا تێدا دەچوو. بە کێوی بڵندیش دەوری وا درابوو، ڕێی دەرچوونی نەبوو. سەییار غەریبی هەڵگرت و فڕی. بەرەو ئەو دەشتە ڕۆیشت تا لەنێوانیاندا فرسەخێک زیاتر نەما. نڕناشەکە لەبەر گەرمی و قورسی غەریب ماندوو ببوو، هەر بۆیە لە مێرگێکی سەرسەوز و دڵگیر نیشتەوە کە داری زۆر و کانیاوگەلی سازگاری هەبوو. لەبەر ماندوویێتی خەوی لێ کەوت. غەریب بە هەزار زەحمەت کۆت و بەندەکانی لە خۆی کردەوە. ئەوجار بەردێکی زل و قورسی هەڵگرت و بە سەری نڕناشەکەیدا دا و لە جێوە کوشتی. غەریب بەو جۆرە ڕزگاری بوو، بە مێرگەکەدا ڕۆیشت."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی شەشسەد و حەفتا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ! غەریب بەو ئاقارەدا ڕۆیشـــت هەتا گەیشـــتە دوورگەیەکی پڕ لە میوەی جۆراوجۆر. لەو دوورگەیە میوەی جۆراجۆری دەخوارد و لە کـانییەکـان ئـاوی دەخواردەوە. ماسی ڕاو دەکرد. ئیدی هەتا حەوت ساڵان بەوجۆرە ژیان. دوای حەوت ساڵ ڕۆژێک هەر وا دانیشــتبوو کە دوو نڕناش لە ئاســمانەوە نیشــتنەوە و یەکی پیاوێکیان پێ بوو. کە ســەیری غەریبیان کرد، گوتیان: 'تۆ کێیت و لە کام خێڵی؟' چونکە ســەر و ڕیشــی غەریبیش زۆر تێک ئاڵۆزابوو، وایان زانی جنۆکەیە. غەریب گوتی: 'من جنۆکە نیم.' ئیدی بسەرهاتی خۆی بۆ گێڕانەوە. بەزەییان پێیدا هات و یەکێکیان پێی گوت: 'هەر لەم شوێنەدا دانیشە تا ئێمە ئەو دوو ئادەمیزادە دەبەین بۆ پاشا تا بۆ فراوین و شێو بیانخوات. ئەوجار دێینەوە لات و دەتگەیەنینەوە شاری خۆت.' غەریب زۆری سپاس کردن و داوای یارمەتی لە خودای تاقانە کرد و دروودی بۆ ئیبراهیم نارد.

"ئەوجار نڕناشـەکان فڕین و غەریب لە وێ دانیشت و چاوەڕێیان بوو. دوای دوو ڕۆژ یەکێک لە نڕناشـــەکان هاتەوە، جلی پاک و جوانی کردە بەر غەریب و هەڵیگرت و فڕی بۆ ئاســمان. ئەوەندە بەرز بووەوە کە غەریب گوێی لە دەنگی تەســبیحاتی فریشــتان دەبوو. ئەوە بوو بەردئەســـتێرەیەک بەرەو نڕناشـــەکە هات و ئەویش بەرەو زەوی بووەوە و ئەوەندەی نەمابوو لە زەوی درێ کە بەردەســتێرەکە وێی کەوت لەجێوە نڕناشـەکە بوو بە تۆز و غەریب کەوتە دەریاوە. هێندەی باڵای دوو مرۆڤ بە دەریادا ڕۆچوو و ئەوجار هاتەوە ســەر ئاو. دوو ڕۆژان بە ســەر ئاوەکە بوو، ئەوەندەی مەلە کردبوو، باسـکی تەواو شـل ببوو. دەسـتی لە خۆی شـۆردبوو. لە ڕۆژی سـێیەمدا کێوێکی بەرز وە دەر کەوت و غەریب هەر چۆنێک بوو، خۆی گەیاندێ. ئەوجاریش لە مردن ڕزگاری بوو. شـــەو و ڕۆژ لەو بنارە دەژیا و ئەگەر برســـیشـــی دەبوو لە ڕووەکەکانی ئەوێی دەخوارد. ڕۆژێک بە کێوەکەدا هەڵگەڕا و لەو دیوەی دیکەوە داگەڕا. دوو ڕۆژ لە سـەر یەک ڕۆیشت تا گەیشتە دەروازەی شـــارێکی گەورە. دەرگاوانەکان گرتیان و بردیانە لای شـــاژنی شـــار کە ناوی جانشـــا بوو و پێنجسـەد سـاڵ تەمەنی بوو. هەرکەس بچووبایەتە ئەو شـــارەوە، شـــاژن شەوێک لای خۆی دەیهێشتەوە و ئەوجار داوای لێ دەکرد دەستی لەگەڵ تێکەڵ بکا. دوای ئەوەی کارەکەی جێبەجێ دەبوو، ئەو کەسـەی دەکوشت. تا ئێستا گەلێک کەسی بەو جۆرە کوشتبوو. کە غەریبیان بردە کن شاژن، شاژن پەسندی کرد و جوانییەکەی بە دڵ بوو. لێی پرســـی: 'ناوت چییە و خەڵکی کام شـــاری و لە ســـەر چ دینێکی؟' گوتی: 'ناوم غەریبە و پاشای عێراقم و موسڵمانم.' شاژن گوتی: 'واز لە دینی خۆت بێنە و وەرە سەر دینی من تا بتکەمە مێردم و پاشـــایەتیت بدەمێ.' غەریب تووڕە بوو گوتی: 'نەفرەتی خودا لە تۆ و

دینەکەت بێ.' شـــاژن بە ســـەریدا گوڕاند و گوتی: 'ئەوە جنێو بە بوتی من دەدەی کە لە عەقیقی سووورە و بە زێڕ و گەوهەر ڕازێنراوەتەوە؟!' ئەوجار شاژن بە خزمەتکارانی گوت: ' بیبەنە بوتـخانە بەندی کەن، بەشـــکوو دڵی نەرم ببێ.' ئیدی بردیان لە بوتـخانە بەندیان کرد."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەوشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی شەش‌سەد و حەفتا و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! دەرگەکانیان لەسەر داخست. غەریب سەیری ئەو بوتەی کرد کە لە عەقیقی ســـوور چێ کرابوو و ملوانکەی دوڕ و گەوهەریان بە ملیدا کردبوو. هەڵیگرت، بە زەوییدا دا و شکاندی و تا بەیانی بۆ خۆی خەوت. کە ڕۆژ بووەوە، شاژن لە سـەر تەخت دانیشـــت و داوای غەریبی کرد. کە کۆیلەکانی هاتن دەرگەی بوتخانەیان کردەوە، دیتیان بوتەکان شـکاون، ئیدی بە چەپۆک ئەوەندەیان بە ســەر و گوێلاکی خۆیاندا دا تا خوێن لە دم و لووتیانەوە ســـەری کرد. ئەوجار دەنکێکیان ویســـتی غەریب بگرێ. غەریب بە یەک مست کوشتی. دانەیەکی دیکەش بۆی چووە پێشـەوە، ئەویشـی کوشت. ئاوا تا بیست و پێنجی لێ کوشـــتن و ئەوانی دیکە بە هاتوهاوارەوە گەڕانەوە بۆ لای شـــاژن. شـــاژن لێی پرســـین ئەو هاتوهاوار و زیق و هۆڕەتان لە چییە، گوتیان: 'ئەی شـــاژنی ســـەر زەوی، بەندییەکە بوتەکانی شـکاندووە و پیاوەکانیشـتی کوشـتووە.' لەجێوە شـاژن لەگەڵ هەزار باڵبازدا چوو بۆ بوتخانە، تەماشای کرد غەریب لە بوتخانە هاتووەتە دەرەوە، شیرێکی پێیە و جەنگاوەران دەکوژێ. جانشـــا کە ئازایەتی و گورجوگۆڵی غەریبی دیت، بە خۆی گوت: 'من ئەو گەنجەم بێ تازە بوت و موت ناوێ.' ئەوجار شـاژن بە پیاوەکانی گوت لێی گەڕێن و لێی دوور کەونەوە. بۆخۆی چووە پێشـــێ و جادوویەکی بە ســـەردا خوێند کە لە جێوە دەستەکانی غەریب شل بوون و شیر لە دەستی بەر بووەوە. ئەوجار گرتیان و دەست و لاقیان بەست. جانشا گەڕاوە، لەسەر جێی خەو دانیشت. داوای کرد دەوری چۆڵ کەن. کە دەوری چۆڵ بوو، بە غەریبی گوت: 'هەری عەرەبی خوێڕی، تۆ وات لێ هاتووە بوتی من بشـــکێنی و پیـاوانم بکوژی؟!' غەریـب گوتی: 'هەی نەگریس، ئەگەر ئەو بوتە خودای ڕاســـتەقینە بووایە، ئەو دەیتوانی پارێزگاری لە خۆی بکا و نەیدەهێشـــت زیانی پێ بگا.' شـاژن گوتی: 'دەی تۆ دەســتم لەگەڵ تێکەڵ کە با لێت خۆش بم و چیت پێ خۆشـە بیکە، ئەگەرنا، بە دینم! چۆن خراپە و ســـەختە، دەڵێم ئاوات لەگەڵ بجووڵێنەوە.' ئەوجار شـــاژن جامێک ئاوی هەڵگرت، جادوویەکی بەســـەردا خوێند و فووی پێدا کرد و ئاوی بەســـەر غەریبدا هەڵپرژاند. غەریب بوو بە مەیموون. شـــاژن ئەوی لە جێیەکدا بەند کرد و نان و ئاوی دەدایە و تا دوو ســـاڵ ئاوا لە بەندا بوو. وا بوو، ڕۆژێکیان شـــاژن ئەوی هێنا لای خۆی و پێی گوت: 'بە گوێم دەکەی؟' ئەویش بە ئاماژە گوتی: 'بەڵێ.' شاژن دڵخۆش بوو و جادووەکەی لێ بەتاڵ کردەوە. داوای خواردنی کرد و لەگەڵیدا نانیان خوارد و دەســـتیان کرد بە دەستبازی. کە شەو داهات، شاژن پاڵ کەوت و گوتی: 'هەستە وەرە کارەکەت بکە.' غەریب هەسـتا، چووە ســەر سـینگی، دەسـتی خسـتە بینەقاقای و بەری نەدا هەتا گیانی دەرچوو. ئەوجـار دۆلابێـک لەوێ بوو کردییەوە، چـاوی بە شـــیرێـک کەوت لەوێ

هەڵواســرابوو، هەڵیگرت و لە قەدی بەســت و تا بەری بەیان خۆی گرت. بەیانی زوو هاتە دەرەوە و لە بەردەرگەی کۆشـــکدا ڕاوەســـتا. گەورەگەورەکانی دەربار و میران هاتنە هەنتەشـی شـاژن، ویسـتیان بچنە ژوورێ، تەماشـایان کرد غەریب جلی شـەڕی پۆشـیوە و شـــیری بە لا قەدەوەیە. غەریب گوتی: 'خەڵکینە، واز لە بوتپەرســـتی بێنن و خودای تاقانە بپەرسـتن.' کە خەڵکەکە ئەوەیان بیسـت، پەلاماری غەریبیان دا. غەریبیش پەلاماری دان و خەڵکێکی زۆری لێ کوشتن."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كه شەوی شەشسەد و حەفتا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــكۆ! غەریبیش پەلاماری دان و خەڵكێكی زۆری لێ كوشـــتن تا شـــەو داهات. كە بوو بە شـــەو ئەوان تێكڕا پەلاماری غەریبیان دا و ویسـتیان بیگرن كە لە ناكاو هەزار نڕناش بە شیری ڕووتەوە هێرشیان كردە سەر كافران. سەرۆكی ئەو دێوانە زیلزالی كوڕی موزەلزیل بوو. نڕناشـــەكانی زیلزال لێیان دان و كەسـیان لێ نەهێشـتنەوە. ئەوجار زیلزال سڵاوی لە غەریب كرد و خۆشحاڵی خۆی بۆ سڵامەتی دەربڕی. غەریب پرسی: 'كێ هەواڵی منی دایتێ؟' زیلزال گوتی: 'قوربان، كە باوكم تۆی بۆ دەشـــتی ئاگرین نارد، منی كردە زیندانەوە و دوو سـاڵ لەوێ مامەوە. دوایی بەری دام. سـاڵێك لای مامەوە و پاشـان كوشـتم. خەڵك و سـوپاش گەورەیی منیان قەبووڵ كرد و ئەوە چەند سـاڵە حوكمڕانییان دەكەم. شـــەوێكی لە شـــەوان بیرم دەكردی و خەوتم. لە خەمنمدا دیتم تۆ لەگەڵ هۆزی جانشـادا شـەڕتە. گورج ئەم هەزار نڕناشـەم هێنا و هاتم بۆ لات.' غەریب سـەری لەم كارە سـوورِ ما. ئینجا ماڵ و سـامانی جانشـای كۆ كردەوە و گەورەیەكی بۆ ئەو شـارە دانا. دێوەكان ماڵ و سـامانەكە و غەریبیان هەڵگرت و وەڕێ كەوتن. هێشـتا خۆر نەكەوتبوو، گەیشـتنەوە شـارەكەی زیلزال. غەریب شـەش مانگ لەوێ میوان بوو. ئەوجار بیری ماڵێی دەكرد. زیلزال هەزار نڕناشی خستە خزمەتی و پێی گوتن كە دیاری و ماڵ و سامانەكەی غەریب هەڵگرن و زیلزال خۆشـــی غەریبی هەڵگرت و بەرەو ئەسـبانیری مەداینی وەڕێ كەوتن. هێشتا نیوێكی شەو نەڕۆیشتبوو كە گەیشتنە ئەسبانیری مەداین و غەریب سەیری شـاری مەداینی كرد، سـوپایەكی دی كە لە ئەسـتێرەی ئاسـمان زۆرتر بوون و گەمارۆی شـــاریان دابوو.غەریب بە زیلزالی گوت: 'كاكە ئەرێ، بڵێی ئەو ســوپایە ئی كوێ بێ و بۆ گەمارۆی شـاری داوە؟' زیلزال غەریبی لە سـەربانی كۆشـك دانا. غەریب هەرای ژنەكانی كرد و گوتی: 'كەوكەبوسـسـەباح! مەهدییە!' ئەوان لە ترسـاندا لە خەو ڕاپەڕین و گوتیان: 'ئەوە كێیە لەم ناوەختەدا بانگمان دەكا؟' غەریب گوتی: 'منم، پاشـــای مرۆ و جنۆكان.' كە مەهدییە و كەوكەبوسـسـەباح دەنگی ئەویان بیسـت، خۆشـحاڵ بوون. ئەوجار غەریب هاتە خوارەوە و كەنیزان خۆیان بەسـەر پێیدا دا و كردیانە گۆرانی و سـەما. كۆشـك پڕ بوو لە دەنگی مۆسـیقا و گۆرانی. خزمەتكارەكان هۆكارەكەیان پرسـی، كەنیزان گوتیان: 'مژدەتان لێ بێ، غەریبپاشـا گەڕایەوە!' فەرماندە و گەورەكانی وڵات بە هاتنەوەی خۆشـحاڵ بوون. پاشا لەسەر تەخت دانیشت، ناردی بەرپرسانی دەوڵەتی و فەرماندەكان هاتن. ئینجا هەواڵی ئەو سـوپایەی پرسـی كە گەمارۆی شـاریان دابوو. گوتیان: 'قوربان ئەوە سـێ ڕۆژە لە دەرەوەی شـــار تاوڵیان هەڵداوە و مرۆ و جنۆكانیان لەگەڵە. ناشـــزانین نیازیان چییە و تا ئێسـتاش شـــەڕ لەنێوانماندا ڕووی نەداوە و هیچ قسـەیەكیش نەكراوە.' غەریب گوتی:

'سبەینێ کەسێک دەنێرم تا نیازیان بزانم.' ئەوجار گوتیان کە پاشاکەیان ناوی مورادشایە. سەدهەزار سوار، سێ سەدهەزار پێڕەو و دووسەد کەسیش لە خێڵەکانی جنۆکانی لەژێر دەسەڵاتدایە. جا هاتنی ئەو سوپایە هۆی خۆی هەبوو."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی شەشسەد و حەفتا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! هۆکاری هاتنی ئەو سوپایە بۆ شاری مەداین سەیر و سەمەرە بوو. ئەویش ئەوە بوو شاپوورشا فەرەختاجی کچی لەگەڵ دوو خزمەتکاریدا نارد تا بیخەنە جەیحوونەوە، ئەوان فەخرتاجیان بردە دەرەوە و لە شوێنێک بەریان دا و پێیان گوت: 'بچۆ بە دوای کاری خۆتدا و خۆت دەرمەخە با باوکت نەتبینێ، ئەگەرنا ئێمەش و تۆش دەکوژێت.' فەخرتاج سەرگەردان بوو و نەیدەزانی بۆ کوێ بچێ و ڕوو لە کوێ کا. هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و گوتی: 'ئاای غەریب، تۆ لە کوێی تا حاڵی من ببینی؟' ئیدی سەری خۆی هەڵگرت و ڕۆیشت. هەر شەوێک لێرە و شەوێک لە شوێنێکی دیکە بوو. لە دەشتێکەوە بۆ دەشتێکی دی و لە باخێکەوە دەچوو بۆ باخێکی دی. وا بوو ڕێی کەوتە ناو مێرگ و سەوزەلانییەکی پڕ لە دار و درەخت و کانیاو لە خۆشی و جوانیدا لە باخی بەهەشت نەدەماوە. هەر وا لەوێدا دەگەڕا تووشی حەوشەیەکی گەورە بوو کە بە دیواری بڵند دەوری درابوو. فەخرتاج چووە حەوشەکەوە. دیتی فەڕشگەلی ئاوریشمی لێ ڕاخراوە. دەفر و قاپ و قاچاخی زێڕینی زۆری لێ بوو و سەد کەنیزی جوان و دەلال لەوێ بوون.

"کە کەنیزەکان فەخرتاجیان دی، لە بەری هەستان و سڵاویان لێ کرد. ئەوان بە گومانی خۆیان فەخرتاج لە خێڵی پەرییانە. پرسیاریان لێ کرد. فەخرتاج گوتی: 'من کچی پاشای عەجەمم'، بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕانەوە. کەنیزەکان بەزەییان پێدا هات و دڵخۆشییان داوە و پێیان گوت: 'خەیاڵت ئاسوودە بێ، هەر چییەکت بۆ خواردن و خواردنەوە بوێ، ساز و ئامادەیە و ئێمە گشتمان کەنیزی تۆین.' فەخرتاج نزای بۆ کردن. ئەوجار کچە جوانەکان چێشتیان بۆ هێنا. فەخرتاج نانی خوارد و پرسی: 'کێ خاوەنی ئەم کۆشکەیە و ئێوە لەژێر دەستی کێدان؟' گوتیان: 'لەژێر فەرمانی سەلسال پاشای کوری داڵ داین. مانگی شەوێک دێتە ئێرە و بەیانی زوو بۆ حوکمڕانی خێڵەکانی جنۆکان دەڕواتەوە.' فەخرتاج لە مانگ و ڕۆژی خۆی نیزیک ببووەوە. وا بوو، پێنج ڕۆژ لایان ماوە و منداڵەکەی بوو. منداڵەکە کوڕێکی وەک مانگی چواردەی بوو، ناوکیان بڕی و کلەیان لە چاوی کرد و ناویان نا مورادشا. دایکی بەخێوی دەکرد. دوای چەند ڕۆژێک سەلسال پاشا بە سواری فیلێکی سپییەوە هات و خێڵی جنۆکان لە ڕاست و چەپیەوە بوون. کە چووە کۆشکەوە، سەد کەنیز چوونە پێشەوە و زەوییان ماچ کرد و فەخرتاجیش لەنێویاندا بوو. کە پاشا چاوی بە فەخرتاج کەوت، گوتی: 'ئەم کچە کێیە؟' گوتیان: 'کچی شاپوورپاشای عەجەم و دەیلەمە.' گوتی: 'ئەی کێ هێناویەتە ئێرە؟' کەنیزان بەسەرهاتی فەخرتاجیان بۆ گێڕاوە. پاشا گوتی: 'مات و زگار مەبە و دان بە خۆتدا بگرە تا کوڕەکەت گەورە دەبێ، ئەو کات دەتنێرمەوە وڵاتی خۆت و سەری باوکت دەپەڕێنم و کوڕەکەت دەکەمە پاشای عەجەم و دەیلەم.'

فەخرتاج هەستا پێی پاشای ماچ کرد و نزای بۆ کرد. ئەوجار بێخەم چوو خەریکی بارهێنانی کوڕەکەی بوو تا بوو بە حەوت ساڵ. لەگەڵ کوڕەکانی پاشادا سوار دەبوو و دەچووە ڕاو و دڕندەیان دەگرت و گۆشتەکەیان دەخواردن. تا وای لێ هات دڵی مورادشا لە بەرد ڕەقتر بوو. کە تەمەنی بووە پازدە ساڵ، بە دایکی گوت: 'دایە، باوکم لە کوێیە؟' فەخرتاج گوتی: 'ڕۆڵە گیان، باوکی تۆ غەریبی پاشای عێراقە و منیش کچی شاپوورشام.' ئەوجار چیرۆکی خۆی بۆ کوڕەکەی گێڕاوە. مورادشا گوتی: 'یانی باپیرم فەرمانی کوشتنی تۆ و باوکمی دا؟' فەخرتاج گوتی: 'بەڵێ کوڕم.' مورادشا گوتی: 'سوێند بە شیری پاکت، دەبێ بچم بۆ شاری شاپوورشا و سەری ببڕم و بیهێنمە لای تۆ.' فەخرتاج دڵی بە قسەکەی خۆش بوو."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و حەفتا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! موورادشا سوار بوو، دووسەد نڕناشی لەگەڵ خۆی برد، تالانی و بڕۆی زۆری کرد تا گەیشتە شیراز و هێرشی کردە سەر ئەو شارە. موراد پەلاماری کۆشکی پاشای دا و ئەوی لەسەر تەختەکەی کوشت و خەڵکێکی زۆری ئەو شارەی لەناو برد. ئەوانەی مانەوە داوای داڵدەیان کرد و هەوساری ئەسپی موورادشایان ماچ کرد. ئەویش ژماردنی و دیتی دەهەزار سوارن. ئەوجار بەرەو بەلخ وەڕێ کەوت و پاشای ئەوێشی کوشت و سوپاکەی تەفروتوونا کرد. لەوێشڕا بە هەزار سوارەوە بەرەو نوورین چوو و پاشای ئەو شارە ملی بۆ کەچ کرد و ماڵ و سامانێکی زۆری دانێ. ئینجا بەرەو سەمەرقەند کەوتەڕێ و گرتی. چوو بۆ ئەخلات و ئەوێشی گرت. هەر ئاوا بەرەو هەر شارێک دەچوون، دەیانگرت و موورادشا سوپایەکی بێژماری کۆ کردەوە و ئەوەی لە ماڵ و سامان دەستی دەکەوت، بەسەر سوپاکەیدا دابەشی دەکرد. باڵبازەکانی بە هۆی ئازایی و دەستئاواڵەییەوە خۆشیان دەویست. ئەوە بوو گەیشتنە ئەسبانیری مەداین و بە سوپاکەی گوت: 'دان بە خۆتاندا بگرن تا تەواوی سوپاکە دێن، ئەوجار باپیرم دەگرم و دەیکوژم و بە کوشتنی ئەو ئاگری دڵی دایکم دادەمرکێنمەوە.' جا لەبەر ئەوە بوو کە شەڕ هەتا سێ ڕۆژان لەنێوانیاندا هەڵنەگیرسابوو.

"جا کاتێک غەریبپاشا لەگەڵ زیلزال و چلهەزار نڕناشدا کە ماڵ و سامانەکەیان هەڵگرتبوو، گەیشتنەوە مەداین، پێوشوێنی ئەو سوپایەیان گرت کە گەمارۆکەیان دابوو، گوتیان: 'نازانین ئەمانە کێن و سێ ڕۆژە لەوێدا لایان داوە و شەڕ لەنێوانماندا ڕووی نەداوە.'

"جا موورادشا بە فەخرتاجی دایکی گوت: 'تۆ لە تاوڵەکەدا بە تا من باوکت بۆ بێنم.' فەخرتاج دوعای سەرکەوتنی بۆ کرد. کە ڕۆژ بووەوە، موورادشا لەگەڵ دووسەت لە نڕناش و گەورەی مرۆدا سوار بوو، تەپڵیان کوتا. غەریب دەنگی تەپڵی بیست و خەڵکەکەی بۆ شەڕ بانگ کرد. سوپای جنۆکان لە ڕاستییەوە و سوپای مرۆیان لە چەپییەوە بوون. موورادشا لەنێو چەکوچۆڵدا نوقم ببوو، بۆ شەڕی یەکبەیەک ئەسپی بەرەو گۆڕەپان تاو دا و هەرای کرد: 'هۆ خەڵکینە، جگە لە پاشاکەتان، کەستان بۆم نەیە! ئەگەر ئەو بەسەرمدا زاڵ بوو، ئەوە پاشایەتی هەردوو سوپا بۆ ئەوە و، ئەگەر من بیکوژم، وەک ئەوانەیە کە تا ئێستا کوشتوونم.'

"کە غەریب قسەی موورادشای بیست، گوتی: 'هەی سەگی گڵاو، بێدەنگ بە!' ئیدی پەلاماری یەکتریان دا. گەلێک ڕمب شکان و شیر لە کار کەوتن. هەتا نیوەڕۆ هەر یەکتریان

هێنان و برد. ئەسپەکانیان هێند هیلاک بوون لە پێ کەوتن و هەردووکیان دابەزین بۆ یەک. لەو دەمەدا مورادشا پەلاماری غەریبی دا و گرتی و بەرزی کردەوە و ویستی بە زەوییدا بدا، غەریب هەردوو گوێی مورادشای ئەوەندە توند گرت وەخت بوو لە بن دەریان کێشێ. مورادشا وای زانی ئاسمان بەسەریدا ڕووخا و هاواری کرد: 'ئەی گەورەی نەکەی دالّدەم دە.' غەریبپاشا گرتی و قۆڵبەستی کرد."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و هەشتایەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! ئەو دێوانەی لەگەڵ مورادشـــادا بوون، ویســـتیان هێرش بکەن ومورادشا ڕزگار بکەن، بەڵام غەریب گورج لەگەڵ دەهەزار نرناشدا هێرشی کردە سەریان. وا بوو کە زانیان دەروەست نایەن چەکەکانیان دانا و داوایان کرد پەنایان بدەن. غەریبپاشا پەنای دان و گەڕاوە. لە تاوڵەکەیدا دانیشت و داوای کرد مورادشا بێننە هەنتەشی . ئەویان بە کۆت و زنجیرکراوی هێنا. مورادشا لە شەرمان سەری داخستبوو. غەریب گوتی: 'چی وای لێ کردی لە پاشـایان یاخی بووی؟' گوتی: 'جەنابی پاشـا، لۆمەم مەکە ناحەقم نییە.' غەریب گوتی: 'ئەی حەقەکەت چییە؟' مورادشـا گوتی: 'جەنابی پاشـا، من بە تەما بووم تۆڵەی باوکم و دایکم لە شـاپوورشـا بکەمەوە و بیکوژم. دایکم لە دەسـتی ڕزگاری بووە، بەڵام نازانم باوکم کوژراوە یان نا.' غەریب گوتی: 'ئەگەر ئاوا بێ حەقتە. دا دەی پێم بڵێ بزانم دایک و باوکت کێن؟' مورادشا گوتی: 'باوکم ناوی غەریبە و پاشای عێراقە. دایکیشم ناوی فەخرتاجە و کچی شاپووری پاشـای عەجەمە.' کە غەریب قسـەکەی بیست، هاواری لێ هەسـتا و لە جێی خۆیدا بووراوە. گوڵاویان بەسـەردا هەڵپرژاند تا وە هۆش هاتەوە و گوتی: 'یانی تۆ کوڕی غەریب و فەخرتاجی؟' گوتی: 'بەڵێ.' غەریب گوتی: 'تۆ فارسـی کوڕی فارسی.'

بانگی کرد گوتی: وەرن دەسـت و پێی کوڕەکەم بکەنەوە. کولیجان و قوریجان چوونە پێشـەوە و کۆت و زنجیرەکەیان لێ کردەوە. غەریبپاشـا کوڕەکەی لە باوەش گرت و لەتەنیشـت خۆیەوە دایینیشـاند و هەواڵی دایکی پرسـی. مورادشـا گوتی: 'لە هۆدەکەمدایە.' غەریب گوتی: 'هەسـتە بچۆ بیهێنە.' مورادشـا هەسـتا چووەوە و خەڵکەکەی بە سـاغ و سەلیمی ئەو دڵخۆش بوون و هەواڵیان پرسی. مورادشا گوتی: 'کاتی پرسیار نییە.' بەرەو لای دایکی تێی تەقاند و باسەکەی بۆ گێڕاوە. فەخرتاج لە خۆشیان باوەڕی نەدەکرد، گورج هەستا چوو بۆ لای غەریب. کە گەیشتنە لای یەک زۆر خۆشحاڵ بوون، پاشان فەخرتاج و مورادشا موسڵمان بوون و ئیسلامیان بۆ سوپاکەشیان شی کردەوە، ئەوانیش موسڵمان بوون. غەریبیش دڵی بە موسڵمانبوونیان خۆش بوو.

"ئەوجار شاپوورشایان هێنا و سەرکۆنەیان کرد و ئیسلامیان جوان بۆ شی کردەوە، کەچی ئەو ئیسلامی قەبوو نەکرد. وا بوو لە دەرەوەی شار بە داریاندا کرد. دوایی شاریان ڕازاندەوە و خەڵکی شار ئاهەنگیان گێڕا. مورادشا تاجی لەسەر نا و کردیانە پاشای عەجەم و دەیلەم. غەریبپاشاش دامیغی مامی کردە پاشای عێراق. ئیدی لەمەوبەدوا هەر لە خۆشی و کامەرانیدا ژیان تا خۆری ژینیان ئاوا بوو. پاک و بێگەردە ئەو خودایەی کە نامرێ.

## چیرۆکی عەبدوڵلای کوڕی موعەممەرقەیسی

"دەگێڕنەوە، عەبدوڵلای کوڕی موعەممەرقەیسی گوتوویەتی: 'ساڵێکیان چووم بۆ حەج و کە ڕێوشوێنەکانی حەجەکەم بەجێ گەیاند، چووم سەری گۆڕی پێغەمبەرم (د – س) دا. شەوێک لە شەوان لە باخچەیەکی نێوان گۆڕەکە و دوانگەکەدا[1] دانیشتبووین دەنگێکی خەمگینم بیست کە دەیگوت:

ئازیزەکەم کاتێتی دڵ بە خۆشەویستی بسپێری
تاقەت بڕا هەتا کەنگێ خۆ لە ئەڤینم دەبوێری
پێم وایە تۆ وا دەزانی دڵم شاخێکی ئەستەمە
بۆیە چی تۆف و کڕێوە و شەختەیە بۆ منی دەنێری
نانا گیانە وا مەزانە دڵ گوڵپەڕکێکی ناسکە
بۆوەی نەژاکێ و سیس نەبێ دەبێ جوان نیگای بدێری

" 'دوای ئەوە دەنگی بڕا و نەمزانی ئەو دەنگە لە کوێوە هات. سەرم سووڕ ما. وا بوو دیسان دەنگە مەلوولەکە هاتەوە گوێم و گوتی:

جێژوانم بۆ دیاری دەکەی، کەچی کە من دێم تۆ دەڕۆی
گفت و بەڵێنت هەزارن، ڕوو لە کوێ کەم فێرە درۆی
دانەخۆرەی دەکەی دڵم، بە ئاماژە بانگی دەکەی
کەچی کە هات مەلی ئەڤین، دەیگریت و باڵی دەکەی
هێندەم مەلە کردووە لە نێو ئاسمانی خۆزگەی ئەویندا
پەڕ و باڵم سپی بووە، هەر بێ هێلانەم لە ژیندا
گەلێ جاران بە خۆم دەڵێم، بەسە شێتێتی هەتا کەی
کەچی پێم دەڵێ خۆت شێتی، بەبێ ئەو تۆ پووشێ ناکەی

"عەبدوڵلا گێڕاوییەتەوە کاتێک خاوەن دەنگەکە دیسان دەستی پێ کردەوە، من بەرەو دەنگەکە ڕۆیشتم. هێشتا شیعرەکەی تەواو نەکردبوو کە چوومە لای. کوڕێکم لەوپەڕی جوانیدا دی کە هێشتا خەتی نەدابوو و فرمێسک بەسەر هەردوو گۆنایدا ڕیزیان بەستبوو.'"

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. دوانگە: مینبەر.

## که شەوی شەشسەد و هەشتا و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! کە چوومە لای کوڕە، ســـڵاوم لێ کرد. گوتی: 'تۆ کێی؟' گوتم: 'عەبدوڵڵای کوڕی موعەممەرقەیســـی.' گوتی: 'چیت دەوێ؟' گوتم: 'من لەو باخچەیەدا دانیشـــتبووم، کە گوێم لە دەنگی تۆم بوو، گوتم بزانم ئەوە کێیە ئەوەندە داخدارە.' کوڕە گوتی: 'دانیشـــە.' منیش دانیشـــتم. گوتی: 'من عوتبەی کوڕی جینانی مونزیری ئەنســـاریم. چوومە مزگەوتی ئەحزاب و لەوێ ئیعتیکافم[1] کردبوو. لەپڕ چەند ژنی مانگئاســـا هاتن، کچێکیان لەگەڵ بوو، لە جوانیدا بێوێنە. هاتە لام و پێی گوتم: 'عوتبە، کەســـێ حەز بکا پێت بگا، تۆش حەز بکە پێی بگەی.' ئەوەی گوت و ڕۆیشت و جێی هێشتم و لەو دەمەوە نازانم چی لێ هات و چوو بۆ کوێ، ئێستا بە دوایەوە سەرگەردانم تاوێ لێرە و تاوێ لە شوێنێکی دی.' ئەوەی گوت، هاوارێکی لێ هەســـتا و بووراوە. دوای ماوەیەک وە هۆش هاتەوە و دەتگوت گۆنای بە زەعفەران ڕەنگ کراوە، لە بەر خۆیەوە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

هـــــــــات و ڕابرد و بە جارێ گسکی دا ناو ماڵی دڵ
چـــــــــۆڵ و هۆڵە هۆدەی هیوام هات و ڕنی باخی دڵ
تازە بێ ئەو ڕووی تێ ناکا، تیشـــک و ڕووناکی ئەبەد
پـــــــــێی بڵێن بێت و ببا ئەو، قاوغی بێ گیانی دڵ

" 'گوتم: 'عوتبە گیان، ڕوو لە خودا بکە، دان بە خۆتا بگرە. خودا گەورەیە.' گوتی: 'گەورەم تاقەتم بڕاوە و لەوە زیاتر ناتوانم دان بە خودا بگرم، دەزانم ئاخری شێت دەبم لە تاوانی.' ئەو شەوە تا بەیانی لە لای بووم.

" 'کە ڕۆژ بووەوە، گوتم: 'هەســـتە با بچینە مزگەوت.' هەســـتا و چووینە مزگەوت. تا نوێژی نیوەڕۆ لەوێ دانیشـــتین. ئەوە بوو فەرزی نیوەڕۆمان بەجێ هێنا، لەو جەنگەیەدا ژنەکان هاتنەوە و کچەیان لەگەڵ نەبوو. گوتم: ' ئەی ئەوە هاوڕێکەی کەتان کوا؟' گوتیان: 'کوڕە، ئەو کچەی بە هەویای تۆ بوو، باوکی بەرەو سەماوەی برد.' پرسیم ئەرێ ناوی چ بوو؟ گوتیان: 'ناوی ڕیای کچی غەتریفی سەلیمییەیە.' ئەوجار عوتبە سەری داخست و ئەم بەیتانەی خوێندنەوە:

جەســـــتەی بە بێ گیان کەلاوەیەکە

[1]. ئیعتیکاف: مانەوەیە لە مزگەوتدا بۆ چەند ڕۆژێک بۆ خواپەرستی بەبێ ئەوەی ڕۆژ و شەو بێتە دەرەوە. (و. ک.)

فـــــــــــريام كەوە دەرکێکم لێوەکە
خـــــــــــوایە ئەو نەبێ، ژینی من تاڵە
بۆچـــــــــــیمە ژینی پڕ ئاهـ و ناڵە[1]

" 'پێم گوت: 'عوتبە گیان، ماڵ و سامانێکی زۆرم هەیە. پێم خۆشە لەڕێی تۆدا خەرجی بکەم و بەشـــکوو بتوانم تۆ بە ئاوات بگەیەنەم و تۆش لە من ڕازی بی. هەســـتە با بچینە کۆڕی ئەنسارەوە.' هەستاین و چووینە کۆڕی ئەنسارەوە. سڵاومان لێ کردن و بە جوانی وەڵامیان داینەوە. گوتم: 'براینە، ئەرێ ڕاتان لەبارەی عوتبە و باوکییەوە چییە؟' گوتیان: 'لە گەورەکانی عەرەبە.' گوتم: 'دەی بزانن کە گرفتاری دەردی ئەوین بووە. جا داواتان لێ دەکەم لەگەڵ مندا بێن بۆ ســـەماوە.' گوتیان: 'بەســـەر چاو.' ئیدی ئێمە ســـوار بووین و ئەوانیش لەگەڵمان سوار بوون تا گەیشتینە ناوچەی بەنی سەلیم. غەتریف بە گەیشتنمانی زانی، بە پێشـــوازیمانەوە هات و ســـلاوی لێ کردین. گوتمان: 'میوانی تۆین.' غەتریف بە خزمەتکارەکانی گوت: 'لا دەن و بار بخەن.' ئیدی تاوڵیان هەڵدا و چەند ســـەر ماڵاتێکیان ســـەر بڕی و خواردنێکی باشـــیان ســـاز کرد. گوتمان: 'نمەکت ناکەین تا لەگەڵمان ڕێک نەکەوی.' گوتی: 'لە ســـەر چی ڕێک کەوم، قســـەکەتان بکەن ؟' گوتمان: 'کچەکەت بدە بە عوتبەی کوڕی مونزیر کە لە گەورەکانی هۆزە.' غەتریف گوتی: 'براینە، ئەو کچەی ئێوە هاتوونەتە داوای، بە دەست خۆیەتی. جا ئێستا من دەچمە لای و ئاگاداری دەکەمەوە.'

" 'ئەوجار بە تووڕەییەوە هەســـتا چووە کن کچەکەی. ڕیا گوتی: 'بابە گیان، ئەوە چی بووە بوا تووڕەی؟' غەتریف گوتی: 'کەسـانێک لە ئەنســـار هاتوون و داوای تۆ دەکەن.' ڕیا گوتی: 'دەی ئەنســـــار هۆزێکی بەڕێز و ئازیزن. پێغەمبەر گیان داوای لێخۆشـــبوونی بۆ کردوون. جـا بڵێ بزانم داخوازییەکە بۆ کـامیـانە؟' غەتریف گوتی: 'بۆ لاوێکە بە نـاوی عوتبەی کوڕی جینانی کوڕی مونزیر.' کچە گوتی: 'بیستوومە ئەم لاوە بەڵێنی خۆی دەباتە ســـەر و دەســـت بداتە هەر کارێک، تا کۆتایی بە دواوەی دەبێ.' غەتریف گوتی: 'ســـوێندم خواردووە قەتت نادەم بەو، چونکە هەندێک لە باس‌وخواســـی تۆم پێ گەیشـــتووەتەوە.' ڕیا گوتی: 'شـتی وا ڕووی نەداوە. بەڵام من ســـوێندم خواردووە کە وەڵامی نەشـیاو نەدەمەوە بە ئەنســـــار. جا تۆش بە جوانی جوابیان کە.' غەتریف گوتی: 'جا چۆن جوابیان کەم؟' ڕیا گوتی: 'مارەییەکەیان ئەوەندە لەســـــەر زیاد بکە کە لەم داوایە پاشـــگەز ببنەوە.' غەتریف گوتی: 'ئەی ئافەرین.'

" 'خێرا چووە دەرەوە و گوتی: 'کچەکەم وەڵامی داواکەتانی داوە، بەڵام مارەییی خۆی

---

[1]. ئەو میسرەعە دەقاودەق لە تاریک و ڕوونی مامۆستا هێمنیشدا هاتووە. (وەرگێڕ)

دەوێ. ئێســـتا بڵێن کێ مارەییەکە دەدا؟' من گوتم: 'من دەیدەم.' غەتریف گوتی: 'هەزار دەستبەندی زێڕی سوور و پێنجهەزار درەمی دوای کۆچ و سەد کەوا لە قوماشی یەمەنی و پێنج قوتوو عەنبەرم وەک شــیربایی.' گوتم: 'گوتم ئەگەر ئەوانەتان دەینێ ڕازی دەبن؟' غەتریف گوتی: 'ڕازی دەبم.' لە جێوە کابرایەکم ناردەوە بۆ مەدینەی مونەووەرە و هەموو ئەو ماڵەی لە ئەســـتۆم گرتبوو، هێنای. ئەوجار ماڵات و شـــتمان ســـەر بڕی و خەڵکێکی زۆرمان بانگ کردن و ئاهەنگ و شـــاییمان گێڕا. هەتا چل ڕۆژ بەو جۆرە لەوێ ماینەوە. ئەوجار غەتریف گوتی: 'ئەگەر پێتان خۆشە، بووکێ بگوازنەوە و بڕۆن.'

بووکێمان خستە کەژاوەیەکەوە و، غەتریفیش سێ وشتری گیازی دانسقە و گرانبایی لەگەڵ بار کرد. ماڵاواییمان لێ کرد و بەرەو مەدینە گەڕاینەوە. تا وا بوو، ئەوەندەمان نەمابوو بگەینەوە مەدینە کە چەتە هەڵیانکوتایە سەرمان. عوتبە هێرشـــی بۆ بردن و چەند پیاوێکی لێ کوشتن و گەڕاوە و برینی سەختی تێ ببوو. ئێمە داوای یارمەتیمان لە خەڵکی ئەو ناوچەیە کرد و ئەوان چەتەکانیان لێ دوور خستینەوە، بەڵام عوتبە بە هۆی کاریگەری برینەکانییەوە مرد. ئێمە لە تاوانی دەســـتمان کرد بە هات و هاوار. کچە کە دەنگی ئێمەی بیست، لە کەژاوەکە دابەزی و دەستی کرد بە شین و ڕۆڕۆیەکی ئاوری لە دڵ بەر دەدا و ئەم دوو بەیتەی خوێندەوە:

برینی قووڵی کۆچت جەرگی کون کردم
داڵـــــــــــی مەرگی بێبەزە جووتەکەی بردم
کـــــــــوا تازە من دەژیم بێ تۆ لەم دونیایە
خـــــــــــــۆر کە ئاوا بوو ناگەڕێتەوە دوایە

" 'دوایی قیژەیەکی لێ هەســـتا و گیانی دەرچوو. ئیدی گۆڕێکمان بۆ هەڵکەندن و هەردووکیانمان لە گۆڕێکدا پێکەوە ناشتن. ئەوجار من گەڕامەوە نێو هۆزەکەم حەوت ساڵ لەگەڵیاندا مامەوە. پاشـــان نیازی حیجازم کرد و چوومە مەدینەی مونەووەرە و بە خۆم گوت: 'با بچم سەرێکی گۆڕی عوتبە و دەزگیرانەکەی بدەم.' کە چوومە سەر گۆڕەکەیان، دارێکی بەرزم دی کە گەڵای سوور و زەرد و ســـەوزی هەبوو. لە خەڵکی ئەو شـــوێنەم پرســـی: 'ئەم دارە ناوی چییە؟' گوتیان: 'ناوی داری بووک و زاوایە.' ئەوجار شـــەو و ڕۆژێک لەوێ مامەوە. دوایی گەڕامەوە و ئەوە گەڕانەوەی دوا جارم بوو.'

### چیرۆکی هێندی کچی نوعمان

"هەروەها دەگێڕنەوە کە هێندی کچی نوعمان جوانترین ئافرەتی ســـەردەمی خۆی بوو.

حەجاج ناوبانگی جوانی و دەلالییەکەی دەبیستێت. خوازبێنی کرد و ماڵێکی زۆری بۆ نارد. هێنای و دووسەد هەزار درەمی کردە مارەیییەکەی و ماوەکەی زۆر لەگەڵیدا ژیا. ڕۆژێک لە ڕۆژان بەسەردا چوو، سەیری کرد لەبەردەم ئاوێنەدا ئەم شێعرە دەخوێنێتەوە:

من دەڵێی ماینی کەحـــیلم خاوەن تۆرەمەی ڕەسەن
مێردم قـــەپە و لەندەهۆرە یەسترێکی نارەسەن
ئەگەر جـــوانوو ماینمان بێ وەک خۆم شووش و لەبار دەبێ
بێتوو جوانوو ئەســپمان بێ ڕێک وەک ئەو خێچ و خوار دەبێ

"کە حەجاج ئەوەی بیســت، بڕیاری دا تەلاقی بدا و چوو بۆ لای عەبدوللای تاهیر تا بینێرێتە لای و هەواڵی تەلاقدانی پێ بگەیەنێ. عەبدوڵلا چووە کن هێند و گوتی: 'حەجاج دەیەوێ تەلاقت بدا. جا منی کردووەتە بریکاری خۆی و ئەو دووسەد هەزار درەم زێڕەش مارەییتە، ئەوەتا پێمە و ئامادەیە.' هێند گوتی: 'کاک عەبدوڵلا، دەمێکە لەگەڵیدا دەژیم، بە خودا قەتم خۆشــی لێ نەدیوە. جا ئەگەر ئێســتا جیا دەبینەوە، پەشــیمان نابمەوە و ئەو دووسەد هەزار درەمەش مزگێنی بێ بۆ تۆ وا ئەو هەواڵە خۆشەت لەو سەقەفییە پیسەوە بۆ هێناوم.' دوایە هەواڵی هێند و جوانی و خوێنشیرینییەکەی بە گوێی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان گەیشتەوە و ناردییە خوازبێنی."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەش‌سەد و هەشتا و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! عەبدولمەلیک ناردییە خوازبێنی هێند. هێند نامەیەکی بۆ خەلیفە نووسـی کە تێیدا پاش سـپاس و سـتایشـی پەروەردگار و سـڵاوات لە دیداری موحەممەد، نووسـیبووی: 'سـەگێ لەو قاپەدا شـتی خواردووە.' کە خەلیفە نامەکەی هێندی خوێندەوە، پێکەنی و بۆی نووسـی: 'پێغەمبەر سـڵاوی خودای لێ بێ فەرموویەتی: 'ئەگەر سـەگێک لە قاپی هەرکەسێکتاندا شتی خوارد، با حەوت کەڕەت بیشواتەوە.' کە هێند چاوی بە نامەکەی خەلیفە کەوت، نەیتوانی سـەرپێچی بکا. نامەیەکی بۆ نووسـی کە تێیدا پاش سـپاس و سـتایشـی پەروەردگار نووسـیبووی: 'جەنابی خەلیفە، بزانە من خۆمت لێ مارە ناکەم هەتا حەجاج بە پێی پەتی و بە هەمان کەوای دەسەڵاتدارییەکەیەوە کەژاوەکەی من تا شـاری تۆ بەدوای خۆیدا ڕانەکێشـێت.' کە عەبدولمەلیک نامەکەی خوێندەوە، قاقای لێ کێشـا، کەسێکی نارد و لە حەجاجی ڕاسپارد ئەو کارە بکا.

"کە حەجاج نامەکەی خەلیفەی خوێندەوە، نەیتوانی سـەرپێچی بکا. ئەوجار کەسـێکی نـاردە لای هێنـد تـاوەکو ئـامـادە بێ. هێنـد کەژاوەیەکی ڕازانـدەوە. حەجـاج لەگەڵ خزمەتکارەکانیدا چوونە بەردەرگەی هێند. کە هێند لە کەژاوەکەدا دانیشـت، کەنیز و خزمەتکارەکانی لە ڕاسـت و چەپیەوە لای خۆیانەوە سـوار بوون. حەجاجیش پەیدا بوو، پێڵاوی داکەند و هەوساری وشترەکەی گرت و ڕایکێشا. هێندیش گاڵتەی پێ دەکرد و پێی پێدەکەنی و کەنیزەکانیش لەگەڵی پێدەکەنین. ئەوجار هێند بە کەنیزێکی گوت کە پەردەی کەژاوەکە لا دە. کەنیزە پەردەی لا دا. هێند چاوی بە چاوی حەجاج کەوت و پێکەنی. حەجاج ئەم شێعرەی خوێندەوە:

پەکـــــــم بە بوونی تۆ نەکەوتووە
وا نـــــــەزانی دڵ کۆستی کەوتووە
هێنـدەم ئـازار دای شـــەو تـا بەیـانی
قەت پـێ نـاکەنـی، بە خـۆت بـزانـی

"هێند بەم شێعرە وەڵامی داوە و گوتی:

هەرچەندە چێشتم تاڵی و مـــــــەینەتی
دڵ بوو گیرۆدەی داوی نـــــــەگبەتی
سپاس بۆ خـــــــودا وا کۆتایی هات
شەو ڕۆی، ڕۆژی گەش وا لە کەل دەرهات

"هێند بەردەوام پێی پێدەکەنی و گاڵتەی پێ دەکرد تا گەیشـتنە شـاری خەلیفە. ئەوجار هێند دینارێکی بەر داوە سـەر زەوی و بە حەجاجی گوت: 'هۆی وشـترەوان، درەمێکم لێ کەوت، بیدۆزەوە و بمدەوە.' حەجاج سـەیری زەویی کرد، دینارێکی دی و گوتی: 'خاتوون، ئەمە دینـارە؟' هێنـد گوتی: 'نەوەڵا، درەمە.' حەجـاج گوتی: 'ئەوەتـا دینـارە.' هێنـد گوتی: 'سـوپاس بۆ ئەو خودایەی درەمەکەمی کرد بە دینار.' حەجاج تازە لە قسـەکەی حاڵی بوو، تریق بووەوە و سەری داخست. ئەوی گەیاندە کۆشکی خەلیفە. هێند لای خەلیفە پێگەیەکی بەرزی پەیدا کرد."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەوشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی شەشسەد و هەشتا و سێیەم هاتەوە

**بەسەرهاتی خوزەیمە**

گوتی: "خاوەنشــکۆ! لە ســـەردەمی ســـولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیکدا لە هۆزی بەنی ئەسەددا پیاوێک بە ناوی خوزەیمە هەبوو کە زۆر دەستودڵباز و بە دەست خەڵکەوە بوو. هەمیشــە لە ســەختی و نەهامەتیدا بوو تا ڕۆژێک لێی قەوما و تووشــی دەســتتەنگی بوو. ئەوجار ئاتاجی ئەو کەســـانە بوو کە ڕۆژی خۆی یارمەتی دابوون. وا بوو ئەوان ڕوویان گرژ کرد و ئاوڕیان لێ نەداوە. ناچار گەڕاوە چووەوە ماڵێ و بە خێزانی کە ئامۆزاشی بوو گوت: 'ئامۆزا، وا دیارە کەس بە کارم نایا. تازە لە ژووریَ دادەنیشـــم و لە ماڵێ ناچمە دەریَ تا لە برسان دەمرم.' ئیدی دەرگەی ماڵی داخست و بەوەندە قایل بوو کە لە ماڵەکەیدا بووی. وردە وردە وای لێ هتا ئەو نەختە پاشە کەوتەشی تەواو بوو. تەواو پەکیان کەوت. عەکرەمەی کوڕی فەییازی ڕەبعی ئەوی دەناســـی. ڕۆژێکیان لە کوڕی ئەودا باســـی خوزەیمەی کوڕی بۆشر کرا. عەکرەمە هەواڵی ئەوی لە هەنتەشییان پرسی، گوتیان: 'وەڵا قوربان حاڵی ئەوەندە خراپە لە باس نایە. ئێســـتا دەرگەی لەســـەر خۆی داخســـتووە و خزاوەتە کونجی ماڵەوە.' عەکرەمە گوتی: 'ئەوە لەبەر دڵاوایی زۆر ئاوایی زۆر ئاوای لێ هاتووە کە شـەو داهات، عەکرەمە چوارهەزار دیناری زێڕی سووری کردە کیسـەیەک و بە مەیتەرەکەی گوت کە ئەســـپەکەی بۆ ئامادە بکا. کە ئەســـپیان زین کرد، ســـوار بوو و کیسەکەی دایە دەست یەکێک لە کۆیلەکانی و بە دزیی هەمووانەوە وەدەر کەوت. چوو هەتا گەیشـــتە ماڵی خوزەیمە. کیســـەکەی لە کۆیلەکە وەرگرت و ئەوی ناردەوە ماڵێ. بە تەنیا چوو لە دەرگەکەی دا. خوزەیمە هات دەرگەی کردەوە و، عەکرەمە کیسەکەی دایێ و گوتی: 'ئەم زێڕانە بۆ خۆت خەرج کە.' کە خوزەیمە کیسەکەی وەر گرت، هەستی کرد قورسە. بە دەستێکی کیسەکەی هەڵگرت و بە دەستەکەی دیکەی هەوساری ئەسپەکەی گرت و گوتی: 'بە قوربانت بم، تۆ کێی؟' عەکرەمە گوتی: 'من بۆیە بە تەنیا هاتووم تاوەکوو نەمناســـی.' خوزەیمە گوتی: 'هەتا خۆتم پێ نەناســـێنی، هەوســـاری ئەســـپەکەت بەر نادەم.' عەکرەمە گوتی: 'من قەرەبووکەرەوەی چاکەی بەخشندەکانم. دەســتگیرۆی دەسـگیرۆیانم.' خوزەیمە گوتی: 'ئێ، چی تر؟'

"عەکرەمە لەوە زیاتری نەگوت و گەڕاوە. خوزەیمەش کیســەی بردە ژوورەوە و چووە کن ئـامۆزاکەی و مژدەی کرانەوەی دەرووی خێری دایێ و گوتی: 'ئەگەر ئەمە هەمووی درەم بێ، زۆر زۆرە. دا هەســتە چراکە داگیرســێنە.' ژنە گوتی: 'نازانم لە کوێیە.' خوزەیمە دەستی بەسەردا هێنان و هەستی بە زێڕبوونەکەیان کرد، بەڵام بڕوای نەدەکرد کە زێڕیش

بن.

"ئینجا عەکرەمە گەڕاوە ماڵێ و دیتی ژنەکەی بەدوایدا گەڕاوە، ئاگای لێ بووە سـوار بووە و گومانی خراپی لێ کرد. کە ژنەکەی دیدتی، گوتی: 'میری ولات بە نیوەشـەو ناچێتە دەرەوە مەگەر بۆ لای ژنێک، کەنیزێک!' عەکرەمە گوتی: ' خودا دەزانێ کە من بۆ هیچ کام لەمانە نەچووم کە تۆ بیری لێ دەکەیەوە.' ژنەکەی گوتی: 'دەی پێم بڵێ بەو نیوەشـەوە بۆ کوێ چووی؟' عەکرەمە گوتی: 'من بۆیە بەو نیوەشـەوە چوومەتە دەرەوە، تا کەس بە کارەکەم نەزانێ.' ژنەکەی گوتی: 'هەر دەبێ من بزانم.' عەکرەمە گوتی: 'ئەگەر بیپۆشـی، پێت دەڵێم.' ژنە گوتی: 'باشـە، دەیپۆشـم.' ئیدی عەکرەمە باسـەکەی بۆ گێڕاوە و گوتی: 'ئەگەر دەتەوێ، سـوێندت بۆ دەخۆم.' ژنە گوتی: 'نا، نا، دڵم دامرکایەوە. و باوەڕت پێ دەکەم.'

"جا کە ڕۆژ بووەوە، خوزەیمە قەرزەکانی دانەوە و باری خۆی هەستاندەوە و بە نیازی سـەردانی سـولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیک وەڕێ کەوت. لەو سـەردەمەدا سـولەیمان لە فەلەستین بوو. کە گەیشتە بەردەرگەکەی، مۆڵەتی لە دەرگاوان خواست. دەرگاوان چووە ژوورەوە و داوای مۆڵەتی بۆ کرد، سـولەیمان مۆڵەتی دا.کە خوزەیمە لەبەردەم خەلیفەدا ئامادە بوو، سـڵاوی کرد. سـولەیمان گوتی: 'ئەرێ خوزەیمە، ئەوە بۆ بەینێکە دیار نی سـەرمان بدەی؟' خوزەیمە گوتی: 'قوربان لەبەر گیروگرفتی زۆری خۆم بوو. دەنا لە خزمەتت دام'. خەلیفە گوتی: 'ئەی بۆچی نەهاتییە لای من و چی وای لێ کردی کە نەیەی؟' خوزەیمە گوتی: 'قوربان، لە توانامدا نەبوو.' خەلیفە گوتی: 'ئەی ئێسـتا چۆن هاتووی؟' خوزەیمە باسەکەی بۆ گێڕاوە. خەلیفە گوتی: 'ئەی ئەو پیاوە دەناسی؟' خوزەیمە گوتی: 'نە بە خودا، خەلیفە. بەس ئەو پیاوێکی گەورە و سەنگین بوو و لەم قسەیە زیاتر، هیچی ترم لێ نەبیسـت کە گوتی: ' من قەرەبووکەرەوە چاکەی بەخشـندەکانم.' سـولەیمان ئاخی هەڵکێشا و گوتی: 'ئەگەر دەمانناسـی، هەر ئێسـتا پاداشـی پیاوەتییەکەیمان دەداوە.' دوای ئەوە خەلیفە خوزەیمەی کردە کاربەدەسـتی جەزیرە کە لە شـوێنی عەکرەمەی فەییازدا دابنیشـێ. خوزەیمە بەرەو جەزیرە چوو، کە نیزیـک بووەوە، عەکرەمە هـاتە دەرە و پێشوازیی لێ کرد و خەڵکی جەزیرەش سەردانیان کرد و سڵاو و چاک و خۆشییان لەگەڵ کردن و لەگەڵیان ڕۆیشتن تا چوونە نێو شارەوە. خوزەیمە چوو لە کۆشکی میری دابەزی و داوای حیسـاب و کیتابی لە عەکرەمەی وەزیر کرد.' کە حیسـابەکەیان دی، سـامانێکی گەلێک زۆر لە ئەسـتۆی عەکرەمە بوو. خوزەیمە داوای کرد. عەکرەمە گوتی: 'هیچم لە دەسـتدا نییە.' خوزەیمە گوتی: 'دەی مادام وایە، دەبێ لە ماڵ و سـامانی خۆت بیدەی.' عەکرەمە گوتی: 'هیچ ماڵ و سامانیشم نییە. هەرچیت پێ خۆشە، بیکە.' خوزەیمە فەرمانی دا کە عەکرەمە بەند بکەن."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی شەش‌سەد و هەشتا و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! کە عەکرەمەیان خستە بەندەوە، خوزەیمە کەسێکی ناردە لای تا داوای سامانەکەی لێ بکا. عەکرەمە گوتی: 'من ئەو کەسەم کە ماڵ و سامان دەکەمە قەڵغانی ئابڕوو. هەرچیتان لە دەست دێ، بیکەن.' خوزەیمە فەرمانی دا کۆت و زنجیری لە دەست و پێ کەن. عەکرەمە مانگێک پتریش بەو حاڵە لە زینداندا ماوە. وای لێ هات زۆر نارەحەت بوو. ژنەکەی بیستییەوە چەند نارەحەتە. زۆری خەم بوو. کەنیزێکی پیتۆڵ و زرنگی هەبوو، بانگی کرد و پێی گوت: 'هەر ئێستاکە بچۆ بەر دەرگەی میر خوزەیمە و بڵێ کارێکی گرینگم بە میرە. ئەگەر کەسێک لێی پرسی چییە، بڵێ بە میر خوزەیمە نەبێ، بە کەسی دیکەی ناڵێم. ئەوجار میر داوات دەکا. کە رێیان دای بچییە ژووری، داوا بکە دەورتان چۆڵ کەن. کە دووبەدوو مانەوە، پێی بڵێ ئەمە پاداشی قەرەبووکەرەوەی چاکەی بەخشندەکان نەبوو کە بیخەیتە بەندەوە و کۆت و زنجیری کەیت.' کەنیزە رێک ئەوەی پێ گوت کە خانمەکەی پێی گوتبوو. کە خوزەیمە قسەکەی ئەوی بیست، بە سەری خۆیدا دا و فەرمانی دا ئەسپی بۆ زین کەن و گەورەگەورەکانی شاری بانگ کرد و لەگەڵ ئەواندا بەرەو زیندان چوو و دەرگەی زیندانی کردەوە. خوزەیمە لەگەڵ ئامادەبواندا چوونە زیندانەوە، عەکرەمە بە رەنگێکی هەڵبزرکاو و کەنەفتییەوە دانیشتبوو. کە عەکرەمە چاوی بە خوزەیمە کەوت، سەری داخست. خوزەیمە چووە پێشەوە و سەری ماچ کرد. عەکرەمە سەری هەڵبڕی و گوتی: 'ئەوە چی بووە ؟' خوزەیمە گوتی: 'کردەوەی چاکی تۆ و پاداشی نارەوای من!' عەکرەمە گوتی: ' خودا لە من و تۆش خۆش بێ.' خوزەیمە فەرمانی بە وەردیان دا کۆت و زنجیرەکانی لە دەست و پێی عەکرەمە بکەنەوە و گوتی: 'بیانکەنە دەست و پێی من.' عەکرەمە گوتی: 'مەبەستت چییە؟' خوزەیمە گوتی: 'مەبەستم ئەوەیە ئەوەم لەگەڵ بکەی کە من لەگەڵتم کرد.' عەکرەمە گوتی: 'هەستە بە خودا قەت شتی وا نابێ.' ئاخری پێکەوە گەڕانەوە تا گەیشتنە ماڵی خوزەیمە. عەکرەمە ماڵاوایی لێ کرد و ویستی بگەڕێتەوە، خوزەیمە نەیهێشت. گوتی: 'دەبێ دەستێک بە خۆتدا بێنی جا بڕۆیەوە. بە ڕاستی من لە خۆت زیاتر شەرمەندەی خێزانتم و قەت ناهێڵم ئاوا بڕۆیەوە.'

"ئەوجار خوزەیمە فەرمانی دا بچنە گەرماوەوە و خۆی لە خزمەتی عەکرەمەدا بوو. کە لە گەرماو هاتنە دەرەوە، جل‌وبەرگێکی شکۆمەندانەی کردە بەری و سواری ئەسپی کرد و ماڵێکی زۆری داین و خۆشی لەگەڵیدا بەرەو ماڵی عەکرەمە وەڕێ کەوتن. داوای لێبووردنی لە ژنەکەی کرد. ئەویش لێی خۆش بوو. ئەوجار خوزەیمە داوای لە عەکرەمە کرد کە پێکەوە بچن بۆ لای خەلیفە سولەیمان. عەکرەمە قەبووڵی کرد. وا بوو ڕۆژێک پێکەوە چوون بۆ لای خەلیفە. پەردەدار خەلیفەی ئاگادار کردەوە کە خوزەیمە هاتووە. سولەیمان

پرسی: 'ئەوە چۆنە خوزەیمە بەبێ پرسی من هاتووە؟ شتی وا نابێ، دەبێ ڕووداوێکی گەورە قەوما بێ.' مۆڵەتی دا بچێتە ژوورێ. هەر کە خوزەیمە وە ژوور کەوت، بەر لەوەی سڵاو بکات، خەلیفە پرسی: 'خوزەیمە، چی قەوماوە و بۆچی هاتووی؟' خوزەیمە گوتی: 'جەنابی خەلیفە، هاتووم عەرزت بکەم کە قەرەبووکەرەوەی چاکەی بەخشندانم پەیدا کردووە. لە بیرمە زۆرت پێ خۆش بوو بزانی کێیە و بیبینی. هەر بۆیە ویستم بە دیداری ئەو دڵخۆشت بکەم.' خەلیفە گوتی: 'کێیە؟' خوزەیمە گوتی: 'عەکرەمەی فەییازە.' خەلیفە گوتی با بێتە ژوورەوە. عەکرەمە هاتە ژوورێ، خەلیفە ڕێزی لێ نا و لە نیزیک خۆیەوە داینا و پێی گوت: 'عەکرەمە، چاکەی تۆ بووە قەرزێک لە گەردنی خوزەیمەدا. جا هەر داخوازییەکت هەیە، بیاننووسە.' عەکرەمە داخوازییەکانی نووسی. خەلیفە گورج بۆی دابین کرد و دەهەزار زێڕی سوور و بیست تەختە کەوا و پاتۆڵی داێ، وێڕای ئەوەش کە نووسیبووی. ئینجا میرایەتی جەزیرە و ئارمانییەی بەو سپارد و پێی گوت: 'کاری خوزەیمەش بە دەستی خۆتە. پێت خۆشە لە سەر کاری لا دە و یان لەسەر کار بیهێڵەوە.' عەکرەمە گوتی: 'قوربان لەسەر کاری خۆی دەیهێڵمەوە.' ئیدی هەردووکیان پێکەوە گەڕانەوە بۆ جەزیرە و لە سەردەمی خەلافەتی سولەیماندا نوێنەری ئەو بوون.

### چیرۆکی یۆنسی نووسەر

"هەروەها دەگێڕنەوە کە لە سەردەمی دەسەڵاتی هێشامی کوڕی عەبدولمەلیکدا پیاوێک هەبوو بە ناوی یۆنسی نووسەر. جارێکیان لەماڵێ وەدەر کەوت بچێت بۆ شام. کەنیزێکی جوانیشی لەگەڵ خۆی برد کە بایی سەدهەزار درەمی هەر جلوبەرگی گرانبایی لە بەردا و زێڕی پێوە بوو. کە لە شام نیزیک بوونەوە، کاروانەکە لە لای کانی و ئەستێرێک لای دا و خواردن و خواردنەوەی دەرهێنا. لەو دەمەدا سوارێکی فۆز و ڕێک و پێک بە سواری ئەسپێکی کوێتەوە و دوو کۆیلەی لەگەڵ پەیدا بوو، سڵاوی لێ کرد و گوتی: 'میوان ڕادەگری؟' یۆنس گوتی: 'بەڵێ، فەرموو.' ئەو لاوە گورج دابەزی. دوای بە خێر هاتن، یۆنس پێکێکی بۆ تێ کرد و گوتی: ' ها با ماندووت بحەسێتەوە دوایەش شتێکمان بۆ بڵێ.' ئەو لاوە لە جێوە ئەم بەیتەی گوت:

گوڵان ڕازاندییەوە وڵات سەد قات لە بەهەشتیش جوانتر
پیاڵێکمان لەو بادە وێدە هەستە ئەی لە بوتیش جوانتر

"یۆنس تەواو لە حاڵی خۆیدا بوو، یەک بە دوای یەکدا پێکی بۆ تێ دەکرد تا لاوەکە مەست بوو و بە یۆنسی گوت: 'دەی بە کەنیزەکەت بڵێ گۆرانییەکمان بۆ بڵێ.' یۆنس پێی

گوت ئەویش ئەو دوو بەیتەی بە دەنگ بۆ گوتن:

ئەڤـــــــــــیندار دەتلێنەوە لــــە نێو خرمــــــانی گوڵان
خەمـیـــان لە بـیــر کـردووە و لەگەڵ یـــار چـــوونەتە ژوان

"ئەو لاوە لە خۆشـــییاندا ئاگای لە خۆی نەما و پێک لە دوای پێکی فڕ دەکرد تا بانگی بەیانی. ئەوجار بە یۆنسی گوت: 'چتۆنە هاتەووی بۆ ئەم شارە؟' گوتی: 'بۆ ئەوەی قەرزی خۆم بدەمەوە و لە پەریشـانی ڕزگارم ببێ.' لاوەکە گوتی: 'ئەم کەنیزە بە سـیـهەزار درەم دەفرۆشـی؟' یۆنس گوتی: 'خۆ لە بەخشـندەیی خودا بێهیوا نەبووم!' لاوەکە گوتی: 'ئەی بە چلهەزاری دەدەی یا نا؟' گوتی: 'گوتی چلهەزار هەر بەشـی خاوەنقەرزەکان دەکا و خۆم دەبێ بە دەستی بەتاڵ بگەڕێمەوە.' لاوەکە گوتی: 'بە پەنجاهەزار دەیکڕم و هەموو شـتێکی تۆش لەسەر منە.' یۆنس گوتی: 'دەی ئەوە پێم فرۆشتی.' لاوەکە گوتی: 'متمانەم پێ دەکەی کەنیزەکە لەگەڵ خۆم ببەم و ســـبەینێ پارەکەت بۆ بنێرم، یا کەنیزەکە لات بێ و کاتێ پارەکەم هێنا، ئەویش ببەم؟' یۆنس لەبەر مەستییەکەی لێی ترسا و تا ڕادەیەکیش لە ڕوودا ما و گوتی: 'ئەرێ، باوەڕم پێتە. کەنزەکە بەرە و پیرۆزت بێ.' ئەوجار لاوەکە بە یەکێک لە کۆیلەکانی گوت کە کەنیزەکە سـواری ئەسـپەکەی بکا و بیبا. دوایی خۆشـی سـوار بوو و مـاڵاوایی کرد. ئەوەندەی پێ نەچوو یۆنس پەژیوان بووە و بە بەرد لە ئەژنۆی خۆی دا. تازە زانی کە کارێکی خراپی کردووە. بە خۆی گوت: 'ئەرێ ئەوە چ کارێ بوو کردم؟ تا بەیانی هەر وەک کاس و گێژان فکری جۆراجۆری بە زەیندا هات. بەیانی زوو نوێژی کرد و هاوڕێکانی چوونە دیمەشـــقەوە و ئەو هەر وەک بە دار لە ســـەریت دابێ، وڕ و کاس دانیشتبوو و نەیدەزانی چی بکا.

"بە کورتی، ئەوەندە دانیشـــت کە خۆر تینی بۆ هێنا و بێزاری کرد. ویســـتی بچێتە نێو شـاری دیمەشق، بە خۆی گوت: 'ئەوە هاتوو من چوومە نێو شـار و ئەویش پارەکەی هێنا. کوڕە تازە خۆ کارەکەم هەر کردووە با جارێ چاوەڕێ بم بەشـــکوو بێ.' ئیدی هەســـتا چووە لە بن ســـێبەرێک دانیشـــت. لای خۆرئاوابوون تەماشـــای کرد ئەوە یەکێک لەو دوو کۆیلەیەی کە لەگەڵ لاوەکە بوون، بەرەو ئەوێ دێ. بە بینینی ئەو دڵی خۆش بوو. وەک گوڵ گەشـــاوە و لە بەر خۆیەوە گوتی: 'هەتا ئێســـتا لە ژیانمدا قەت ئەوەندە خۆشـــحاڵ نەبووم کە بە دیتنی ئەو کۆیلەیە خۆشـــحاڵ بووم.' کە غولامەکە گەیشـــتێ، گوتی: 'کاکە ببوورە، درەنگیش هاتم، ئەرێ ئەو لاوە دەناســـی کە کەنیزەکەی لێ کڕیت؟' یۆنس گوتی: 'نە بە خودا نایناسـم!' غولامەکە گوتی: 'ئەو وەلیدی کوڕی سـەهلە و جێنشـینی خەلیفەیە.' ئەسپێکیشی لەگەڵ خۆی هێنابوو، گوتی: 'فەرموو سوار بە.' یۆنسی سوار کرد و ڕۆیشتن تا گەیشتنە ماڵێک و چوونە ژوورەوە. کەنیزەکە کە چاوی بە یۆنس کەوت، لە بەری هەستا

و سـلاوی لێ کرد. یۆنس گوتی: 'کارت لەگەڵ گەورەکەت بە کوێ گەیشـت؟' کەنیز گوتی: 'منی لێرە دانا و فەرمووی هەر چییەکت پێویسـت بوو، بۆت دێنن.' ماوەیەک دانیشـت و کۆیلەکە پەیدا بوو و گوتی: 'هەسـتە.' یۆنس هەسـتا و لەگەڵ غولامەکەدا چوو بۆ لای گەورەکەی. تەماشـای کرد لەسـەر تەخت دانیشـتووە. لە یۆنسـی پرسـی: 'تۆ کێی؟' گوتی: 'یۆنسـی نووسـەرم.' لاوەکە گوتی: 'هەزار ئافەرین بۆ تۆ. خودا دەیزانێ تامەزرۆی دیدارت بووم و ناوتم بیستبوو. دوێنێ شەو چۆنت لێ گوزەرا؟' یۆنس گوتی: 'بە قوربانت بم. وەڵا خۆشم لێ گوزەرا.' لاوەکە گوتی: 'ڕەنگە لەو کارەی خۆت پەشیمان بووبیتەوە و بە خۆتت گوتبێت کە ئەو کەنیزەم بۆ لە خۆڕا دا بەو کوڕە نە دەیناسـم و نەهێشـتێک.' یۆنس گوتی: قوربان شتی وا مەفەرموو ئەو وەک دیاریش شایانی تۆ نییە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەوشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی شەش‌سەد و هەشتا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! وەلید گوتی: 'بەو خودایە پەشیمان بوومەوە لەوەی کەنیزەکەم لێ ستاندی و لەگەڵ خۆم هێنامەوە؛ گوتم خۆ ئەو کابرایەکە من ناناسێ، فەقیرە ڕەنگە نیگەران بێ. دەی یۆنس، ئێستا لە بیرتە قەرارەکەمان چۆن بوو؟' یۆنس گوتی: 'بەڵێ.' وەلید گوتی: 'ئێستاش لە سەر قسەی خۆت ماوی و ئەم کەنیزە بە پەنجاهەزار درەم دەفرۆشی یا نا؟' یۆنس گوتی: 'بەڵێ، دەیفرۆشم.' وەلید گوتی: 'خزمەتکار، نرخی کەنیزەکە بێنە.' کۆیلەکە پەنجاهەزارەکەی هێنا. وەلید گوتی: 'هەزار و پێنجسەدی دیکە بهێنە.' ئەوجار وەلید گوتی: 'یۆنس، ئەو هەزار دینارە لەبەر ئەوەی گومانی باشت پێ بردم. پێنجسەد دینارەکەش بۆ خەرجی ڕێگەکەت و ئەو دیارییانەیە کە بۆ خزم و کەستی دەکڕی. ئێستا لە من ڕازییت یا نا؟' یۆنس گوتی: 'بەڵێ، ڕازیم.' ئەوجار دەستی وەلیدی ماچ کرد و گوتی: 'قەسەم بە خودا دەست و چاو و دڵی منت تێر کرد.' وەلیدیش گوتی: 'دەی قەسەم بە خودا منیش نەچوومە لای ئەو کەنیزە و دەستنوێژم لێی نەشکاوە. دا بچن ئەو کەنیزە بێنن.' کەنیزیان هێنا. مۆڵەتی دانیشتنی دا و پێی گوت: 'گۆرانی بڵێ.' کەنیز ئەو شێعرەی گوت:

سەروبسکت مەسپێرە تۆ بەدم سروەی باوە
شۆڕەژن! مەستن هەموو شووشە لە سەد شوێن شکاوە
بێتوو گەر دەر بکەوی لە ناسۆی خەونی ئەم و ئەو
ئاڵۆزی گوڵ دەکات و ئارامیش دەفڕێ لەو ناوە
بشەکێ ئاڵای بزەت لە ژێر کەروێشکەی کەزیەکەت
ئەفیینداری چارەڕەش دەکەون یەکیەک لەو لاوە

وەلید کەیفی ساز بوو دەستخۆشی لە حەسەن کرد بۆ ئەو کەنیزەی پەروەردەی کردووە. ئەوجار ڕووی لە پیاوەکانی کرد و گوتی: 'دا ئەسپێک بۆ یۆنس زین بکە. هێستریکیش بۆ کەلوپەلەکانی بێنن.' دوایی گوتی: 'یۆنس، هەر کاتێک زانیت خەلافەت کەوتووەتە دەستی من، وەرەوە بۆ لام. بە خودا دەبێ پلە و پایەت وا بەرمە سەرێ لە هەموو شتێک بێنیازت کەم.' ئەوجار یۆنس ماڵی وەرگرت و ماڵاوایی کرد و گەڕاوە.

یۆنس گوتبووی: 'کاتێک وەلید بوو بە خەلیفە، چوومە لای. خودا شایەدە هەر قەول و بەڵێنییەکی دابووی، هەمووی بەجێ هێنا و زۆری ڕێز لێ گرتم. پێکەوە لەو پەڕی خۆشیدا دەمگوزەراند تا وا بوو ماڵ و سامانم زۆر بوو و دۆخم باش بوو. بەردەوام ئاگای لێم و دەستی دەگرتم تا کوژرا.'

### چیرۆکی هارووونەڕڕەشید و کیژۆڵەکە

"دەگێڕنەوە ڕۆژێک لە ڕۆژان هارووونەڕڕەشـــید لەگەڵ جەعفەری بەرمەکی وەزیریدا بە شـــوێنێکدا دەڕویشـــت، چەند کیژێکیان دیت، ئاویان دەدا بە خەڵک. خەلیفە چوو بۆ لایان و داوای ئاوی لێ کردن. یەکێکیان ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

گەورەیی و چـــــــــــــاکی و پاکی لەگەڵ ناوتدا جووتن
ئەســــتێرە و مـانگ و هەتـاو گەشـــاوەی تیشـــکی ڕووتن
جوانیت باخــــــــــــــێکە ڕەنگین، چی گوڵ بڵێی تێیدایە
شکــــــــــــــــــۆ و ڕێز و گەورەییت لە دونیا بێ هاوتایە

"خەلیفە خوێنشیرینی و گفتولفتی خۆشی ئەو کیژەی وەبەر دڵ کەوت."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەوشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی شەشسەد و هەشتا و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــكۆ! خەلیفە ســەری ســـوورِ ما و گوتی: 'ئەریَ كیژی نەجیبزادە، ئەو شـــێعرە ئی خۆت بۆ یان كەســـێكی دیكە بوو؟' كیژە گوتی: 'هی خۆم بوو.' خەلیفە گوتی: ''ئەگەر ڕاســـت دەكەی هی خۆتە، شـــێعرێك بڵێ كە هونەری ڕەگەزدۆزی تێدا بێ.' كیژێ دەمودەست ئەو بەیتەی گوت:

خۆشـــە بێخەوشـــی ببێتە هەوێنی ژینی ئەو خەڵكە
جێی داخە ترۆ ببێتە شـــەوێنی مەرگی ئەو خەڵكە

"خەلیفە گوتی: 'ئەو بەیتەش دزێتییە.' كیژە وڵامی داوە: 'نەخێر، خۆم گوتوومە.' خەلیفە گوتی: 'ئەگەر ڕاســـت دەكەی شـــێعرێك بڵێ كە هونەری لێكچوواندنی پێچەوانەی تێدا بێ.' كیژ گوتی:

كە شەڕ گەرم دادێ، ژیان دۆزەخـــــــــــێكی نەخوازراوە
مەرگی ڕەش دەگرێ بەرۆكی هەرچی خۆشـــییە لەو نـــاوە

"خەلیفە گوتی: 'ئەوەش خۆت نییە.' كیژە گوتی: 'بەڕێوەڵا، خۆم گوتوومە.' خەلیفە گوتی: 'كەوایە، شێعرێك بڵێ كە هونەری دژبەیەكی تێدا بێ.' دەمودەست كیژ گوتی:

دڵـــــــــــــــــی ڕەقت نەرم دەكەم
قەت ئەو كـــۆڵانە چـــۆڵ نـــاكەم
جوانی تـــــــــــۆ وای نەرم كردووم
گەر پێـــــــــــــم بڵێی بمرە مردووم

"خەلیفە پرســـی: 'كیژێ، لە كام خێڵی ئەم هۆزەی ؟' كیژە گوتی: 'لەوانەی وا تاوڵیان لەنێوەڕاســـتی تاوڵانە و ئەســـتووندەكیان لە هەمووان بەرزترە.' خەلیفە زانی كە كیژی ســـەرۆك هۆزە. ئەوجار كیژ لە خەلیفەی پرســـی: 'ئەی تۆ لە كام خێڵی؟' خەلیفە گوتی: 'لەوانەی وا داریان بەرزتر و میوەیان خۆشـــترە.' كیژە لەڕێوە كوڕنۆشـــی برد و ڕێزی تایبەتی لێ گرت. ئینجا گەڕاوە و لەگەڵ كچە عارەباندا ڕۆیشت.

"پاشـان خەلیفە بە جەعفەری گوت: 'دەبێ ئەو كیژە بخوازم.' جەعفەری وەزیر چوو بۆ لای باوكی كیژ و پێی گوت: 'خەلیفە كاری پێتە.' باوكی كیژ هات و گوتی: 'بە دڵ و گیان لە

خزمەتت دام. کەنیزی خۆتە و بە دیاری بۆتی دەنێرم.' ئەوجار کچەی ساز کرد و ڕازاندییەوە و بردی بۆ لای خەلیفە. لێی مارە کرا و بوو بە یەکێک لە خۆشەویستترین ژنانی خەلیفە. خەلیفەش ماڵ و سامانێکی زۆری دا بە باوکی کیژەکە. دوای ماوەیەک باوکی کیژە مرد و کیژە نەیزانی. کە خەلیفە بە مردنەکەی زانی، بە ماتی و خەفەتبارییەوە چووە کن ژنەکەی. کە ژنەکەی خەم و خەفەتی خەلیفەی دی، هەستا چووە وەتاغەوە و جلوبەرگە شکۆمەندانەکەی داکەند و بەرگی ماتەمی پۆشی و ئەژنۆی خەمی لە باوەش گرت. کە هۆکاری ئەوەیان لێ پرسی، گوتی: 'باوکم مردووە.' چوون بە خەلیفەیان گوت، هات بۆ لای و لێی پرسی: 'کێ پێی گوتی؟' کیژە گوتی: 'ڕەنگوڕووی خۆت.' خەلیفە پرسی: 'باشە چۆن بە ڕەنگوڕووی مندا زانیت ؟' کیژە گوتی: 'لەو کاتەوەی هاتوومە ماڵت، جگە لەم کەڕەتە، نەمدیبوو بە ماتی و مەلوولی بێیتە لام. منیش کەسم لە باوکم بەتەمەنتر نەبوو.' خەلیفە خۆشی لە وردبینییەکەی هات و چاوی پڕ بوو لە فرمێشک و سەرەخۆشی لێ کرد. کیژە گوتی: 'تەمەنی خەلیفە درێژ بێ' دوای ئەوە هەر بە خەم و خەفەتی باوکییەوە دەیگوزەراند تا دیقی کرد.

### چیرۆکی شێعری سێ کچەکە

"چیرۆکێکی دیکە دەگێڕنەوە کە شەوێک لە شەوان هاروونەڕڕەشید ڕەشید خەو لە چاوی تۆرا و لە خەوگەکەی هاتە دەرێ، هەر لەم دیو چووە ئەو دیو تا ڕۆژ بووەوە. ئەوجار داوای ئەسمەعیی کرد. کە ئەسمەعییان بانگ کرد، گوتی: 'ئەرێ ئەسمەعی، دەمەوێ ئەو شتە باشانەی لەبارەی ژنان و شێعریانەوە بیستووتە، بۆم باس بکەی.' ئەسمەعی گوتی: 'جا شێعری زۆرم لە ژنان بیستووە. بەڵام جگە لە سێ بەیت کە لە سێ کچم بیستووە، ئەوانی دیکەم بە دڵ نەبووە' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و هەشتا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! ئەسمەعی گوتی: 'عەرزم کردی شیعری زۆرم لە ژنان بیستووە. جگە لە سێ بەیت کە لە سێ کچم بیست، ئەوانی دیم بە دڵ نەبووە.' خەلیفە گوتی: 'دەی باسی ئەو سێ کچانم بۆ بکە.' ئەسمەعی گوتی: 'قوربان، ساڵێکیان لە بەسرە بووم، گەرمایەکی سەیر بوو. لە شوێنێک دەگەڕام تێیدا بحەسێمەوە ڕێم کەوتە شوێنێکی خۆش کە تازە ماڵدار بوو، ئاوپرژێن کرابوو. سەکۆیەکی لێ بوو کە چێو چنێ کرابوو. دەورووبەری دەتگوت بەهەشتە ئەوەندە خۆش بوو. بۆن و بەرامەیەکی دڵبزوێنی دەهات. من کە شوێنێکی ئاوا بە ئاوات دەخواست لە سەر تەختەکە دانیشتم. ویستم بخەوم، دەنگی ناسکی کچێکم هاتە گوێ کە گوتی: 'خوشکینە، ئێمە هەر وا بۆ خۆشی کۆ بووینەتەوە. وەرن سێسەد دینار دانێین و هەرکاممان شیعرێک بڵێ. شیعری هەرکاممان خۆشتر و جوانتر بوو، سێسەد دینارەکە بۆ ئەو بێ.' کچەکانی دیکە گوتیان باشە. ئەوجار کچە گەورەکەیان ئەو بەیتەی گوت:

لە خەونمدا هاتبووە لام لاوێکی قۆز و تاقانە
خۆزگە هەر بە ڕاستی دیبام ئەو خورتە لە لام میوانە

" 'کچە نێونجییەکەش، ئەو بەیتەی گوت:

لە خەونیشدا خۆشەویستم دڵی هەر بۆ من لێ دەدا
دڵم هەر بەوەندە خۆشە جێم کردووەتەوە لە دڵیدا

" 'ئینجا کچە چکۆڵەکەش ئەو بەیتەی گوت:

ڕوح و گیانی من فیدای ئەو خورتە قۆز و بۆنخۆشە بێ
کە وا ڕاخەر و پێخەفم ئێستاش بۆنی ئەوی لێ دێ

" 'لە دڵی خۆمدا گوتم: 'ئەو کچانە کە ئاوا وێژەوانی چاکن ئەگەر جوانیش بن ئیدی مەحشەر دەبێ. ئەوجار لە سەر سەکۆکە هاتمە خوارێ و ویستم بڕۆم کە دەرگە کراوە و کەنیزێک بانگی کرد و گوتی: 'خاڵە مەڕۆ، دانیشە.' منیش دیسان چوومەوە سەر تەختەکە و دانیشتم. کاغەزێکی بۆ هێنام کە بە دەستوخەتێکی تا بڵێی جوان نووسرابوو: 'خاڵە، ئەو سیانەمان خوشکین. لەسەر سێسەد دینار گرەومان کردووە کە هەریەکەی شیعرێکی

جوان و خۆش بڵێ، ئی هەرکەس لەوانی دیکە جوانتر و خۆشـــتر بوو. ئەوە ئەو پارەیە بۆ ئەو بێ. جا تۆمان کردووەتە دادوەر و خۆت بڕیار بدە. ڕێز و ســـڵاو.' منیش بە کیژەم گوت: 'دا پێنووس و لێ نووسێکم بۆ بێنە.' کچە ماوەیەک ون بوو، ئەوجار بە مرەکەبدانێکی زیوین و قەڵەمێکی زێڕینەوە هاتەوە. منیش ئەو بەیتانەم بۆ نووسین:

لە شـــــــــــــــوێنێکی دڵڕفێندا
بـــــۆ حەســــــــانەوەیەک لام دا
گـــوێـم لـــێ بـــوو چەنـــد کـــیـــژی هـــۆزان
جـــــــــوان خـــوێـنشـــــیـــریـــن لە بەر دڵان
لەگەڵ یەکـــــــــــتـــــر قـــــڕەیـــــان بـــــوو
لە ســــــەر شــــــێـــعـــر گـــــوڕەیـــــان بـــــوو
بـــاســــــی شـــــێـــعـــری چـــاکـــیـــان دەکـــرد
لە ســـــــــــەر شـــــێـــعـــر گـــرەویـــان کـــرد
هەر ســــــــــــــــــێ خوشک بە دەست و برد
یەکەی شــــــێـــعـــرێـــکـــیـــان پـــێـشـــــکەش کـــرد
خـــــــوشـــــــــکـــــــی گەورە بە فـــــیـــــزەوە
شـــــێـــــــــــــــــــــعـــری هـــێـــنـــا نـــاو ڕیـــزەوە
"لە خەونمدا هاتـــــــــبووە لام لاوێکی قۆز و تاقانە
خۆزگە هەر بە ڕاستی دیبام ئەو خورتە لە لام میوانە"

ئەوجـــارە خوشکی نێونجی دەستی کرد بە شێعر و گوتی:

لە خەونیشـــــدا خۆشـــــەویســـــتم دڵی هەر بۆ من لێ دەدا
دڵــــــــــــم هەر بەوەندە خۆشە جێم کردووەتەوە لە دڵیدا
خـــــوشـــــــکـــــــی چـــــووکەی گەردن بـــــلـــــوور
دەســـــــــــــــــــــــــتی پێکرد وەکوو شـــــالوور
ڕوح و گـــــــــیانی من فیدای ئەو خورتە قۆز و بۆنخۆشە بێ
کە وا ڕاخـــــــــــــەر و پێخەفم ئێستاش بۆنی ئەوی لێ دێ
ئاخری شـێعری کـــــــــــــــــــــــیژی گچکەم
لا پەســــــنـــــد بـــــوو چـــــون هەســـــت دەکەم
خەون و خەیـــــاڵ، خـــــۆزگە و بـــــریـــــا
کـــــــــــــــــــــــەس ناباتە ئەوبەر دەریا

"ئەسـمەعی گێڕاوییەتەوە: 'کە شـێعرەکەم نووسـی، کاغەزەکەم دا بە کچەکە و کچە گەڕاوە بۆ دیوەکەی خۆیان. وا بوو لەپڕ دیوەکە پڕ بوو لە دەنگی گۆرانی و سەما و جۆش و خرۆش. لە دڵی خۆمدا گوتم: 'ئیدی بۆ ئەوە نابێ بمێنمەوە.' لەسـەر تەختەکە چوومە خوارێ و ویسـتم بگەڕێمەوە. لە ناکاو کچە بانگی کرد: 'ئەسـمەعی، دانیشـە!' گوتم: 'کێ گوتی من ئەسمەعیم؟!' گوتی: 'گەورەم، ئەگەر بە ڕواڵەتیش نەتناسین، خۆ بە شێعرەکەتدا دەتناسینەوە.'

" 'دانیشـتمەوە. دەرگە کراوە و کەنیزی یەکەم بە کەشـەفێک میوە و شـیرینییەوە هات. شـیرینی و میوەم خوارد و دەسـتخۆشـیم لێ کرد. گەرەکم بوو بگەڕێمەوە، دیسـان کچە بانگی کردم: 'ئەسـمەعی، دانیشـە.' ئاوڕێکم لێ داوە. وام زانی مانگی چواردە لەژێر هەوری ڕەشـە دەرکەوت. کیسـەیەکی بۆ هاویشـتم کە سێسـەد دیناری زێڕی سـووری تێدا بوو و گوتی: 'ئەوە دیارییەم پێشکەشت بێ.'

"خەلیفە پرسـی: 'بۆچی شـێعری کچە بچووکەکەیانت پەسـند کرد؟' ئەسـمەعی گوتی: 'قوربان گیـان، خودا عومرت درێژ کـا! کچە گەورەکە گوتبووی کە خۆزگە جـارێکیش بە ڕاسـتی میوانم بێ، نەک هەر بە خەون. جا ئەوە هیوا و ئارەزووە، ڕەنگە شـتی وا ببێ و ڕەنگیشـە نەبێ. کچە ناوەنجییەکەش هەر باسـی خەون و خەیاڵێک دەکات، بەڵام کچە بچووکەکە لە شـێعرەکەیدا دەڵێت کە لەگەڵ واشـتاکەیدا خزاونەتە پێخەفێکەوە و بۆنی خۆشـی هەڵمژیوە و خۆی قوربانی کردووە، جا کەس خۆی قوربانی کەسـی دیکە ناکا ئەگەر لە گیانی شیرینتر نەبێ.' خەلیفە گوتی: 'ئەی ئافەرین، ئەسمەعی.' ئیدی دەستخۆشانە سێسەد دیناری دایە.

### چیرۆکی هاونشینی شەیتان لەگەڵ ئیبراهیمی مووسڵیدا

"دەگێڕنەوە کە ئەبووئیسـحاق ئیبراهیمی مووسـڵی گێڕاوییەتەوە کە: 'داوام لە هاروونەڕەشـید کرد ڕۆژێک مۆڵەتم بدا کە لەگەڵ هاوڕێ و دۆسـتانمدا تەنیا رابیبوێرم. خەلیفە بۆ ڕۆژی شـەممە مۆڵەتی دامێ. چوومەوە ماڵێ و خۆراک و خواردنەوە و هەر چییەک پێویست بوو، ئامادەم کرد. بە پاسەوانەکانم گوت کە دەرگە داخەن و نەهێڵن کەس بێتە لام. وا بوو لە جەنگەیەکدا کە من لە نێو ژناندا دانیشتبووم، شێخێکی بەشکۆ و سەنگین لێم وە ژوور کەوت. کەوا و پاتۆڵی سـپی لە بەردا، برنجۆکێک بەسـەرەوە و گۆچانێکی دەسک زێویشی بە دەستەوە بوو. بۆنی عەتر و گوڵاوی ڕۆژە ڕێیەک دەڕۆیشت. کە چاوم پێی کەوت زۆرم ڕق هەسـتا و بڕیارمدا لە دەگەوانەکە بدەم. تازە چ نەدەکرا شـێخ هات و سڵاوی کرد. منیش سڵاوەکەیم ستاندەوە و فەرمووم کرد دانیشێ. شێخ دانیشت و باسی

بەسەرهاتی عەرەبانی کرد و زۆریەک لە شێعرەکانی خوێندنەوە تا وا بوو تووڕەییەکەم نیشتەوە و گوتم ڕەنگە گەورەیی ئەویان بۆ دەرکەوتبێ بۆیە بە ئانقەست ڕێیان داوە بێتە ژوورەوە تا کوڕەکەم برازێنێتەوە. ئەوجار لە شێخم پرسی: 'حەزت لە چ خواردنێکە بۆ بێنن؟' گوتی: 'پێویستم بە خواردن نییە.' گوتم: 'ئەی لەگەڵ مەیدا چۆنی؟' گوتی: 'ئەوەیان خۆت دەزانی.' ئیدی من پێکێکم نۆشی و پێکێکیشم دا بەو. ئەوجار پێی گوتم: 'ئەرێ ئەبووئیسحاق، تاقەتت هەیە گۆرانییەکم بۆ بڵێی تا شتێک لە هونەرەکەت ببیستم؟' بە قسەکەی تووڕە بووم. بەڵام دوایە وەسەر خۆم نەهێنا و عوودەکەم بە دەستەوە گرت، تەواوی ئەو مایانەی دەمزانی ژەندم و گۆرانیم گوت. ئەوجار گوتی: 'ئەی ئافەرین، ئەبووئیسحاق.' دیسان بەو قسەیەی تێک چووم. چونکە لەگەڵ ئەوەی بەبێ پرس هاتووەتە ژوورەوە، سووک و ئاسان بە ناوی خۆشمەوە دەیدواندم؟! دوایی پێی گوتم: 'ئەگەر تاقەتت هەیە چەند گۆرانی دیکەشم بۆ بڵێ با خەڵاتت بکەم؟' عوودم هەڵگرت و گۆرانیم گوت و هەموو مەقامەکانم بۆ گوت، هەر لەبەر ئەوەی گوتبووی پاداشت دەکەم.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی شەشسەد و هەشتا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! 'ئەمن گۆرانیم بۆ گوت و ئەویش کەیفی ســـاز بوو، گوتی: 'ئەی ئـافەرین.' ئەوجـار گوتی: 'ڕێم دەدەی منیش گۆرانی بڵێم؟' گوتم: 'تکـایە فەرموو، بە ئارەزووی خۆت بیڵێ.' بەڵام بە ساویلکە و کەمئاوەزم زانی کە دەیویست لای مندا گۆرانی بڵێ. دەســـتی دا عوودەکە و تاڵەکانی توند کردەوە و دەســـتی پێ کرد. خودا دەیزانێ وام زانی عوودەکە وە زمان هاتووە.هێندە جوان هێنابوویە گۆ. ئەوجار شـــێخ بە گۆرانی ئەو بەیتانەی خوێندنەوە:

مەیگێڕ وەرە لام دەخیـــــــــــلم وە فریام کەوە
مەلـــی ڕووحـــم وا دەفـــڕێ دەرکەم لـــێ بـــکەوە
قاقرستانە ئەوکم بۆ بـــــــــــــــادەی دەستی تۆ
خـێـل بـوون چـاوانـی عـاشـــقـم ئـاوڕم لـێ بـدەوە
هێز و گوڕ و تـــــــــــــین و تاوم بە دەســـتی تۆیە
دەستـــــــــــــــم بگرە ڕزگارم کە بمبووژێنەوە

" 'قەســـەم بە خودا وام زانی بۆ هۆی گۆرانییەکەیەوە دەر و دیوار کەوتنە هەلهەلە ئێ سەما و دەنگە خۆش و بەسۆزەکەی سـەرسامی کردم و قسەم بۆ نەدەهات. ئەوجار ئەو بەیتانەشی خوێندنەوە:

تۆزوخـــــــــــــــۆڵی دەرکی یارم بۆم شنەی بەیانییە
بەو مەرجەی چـاویم لێ دیـار بێ نـاخۆشـــی مـانـای نییە
کەکرە هەنـــــــــــگووینە لەگەڵ یار شیرینی بێ ئابڕووە
نـامەوێ جەنـنەتـیش بـێ ئەو، چـۆڵە جـێـی وام بـۆ چـییە
ماچی لێوانی لە بـــــــــــــــۆ من کاری پەسنی زار نییە
هەرکەسێ جارێ ببینێ، بەســـــــــــــە دەردی کارییە

" 'ئینجا مەقامێکی دیکەی گوت و ئەو بەیتانەی تێدا خوێندنەوە:

هەرچەنـدە ڕاو، هـێـزی بـازوو و تـیـرەنـگـێـوی چـاکـی دەوێ
بەڵام گیانە تـــــــــــــــۆ بەو چاو و برژۆڵەوە هیچت ناوێ
مـاڵی کەوانی چـاوانـت بۆ تیر خســـتن هێنـد لە ســـەر پێن

ئەگەر نێچیر هەزاریـــــــــــش بن یەکی دەرنـاچن دەپێکرێن
نیگەرانی شـــــــــــــــەریش مەبە، تۆ زۆر خوێنشیرینی کاڵێ
قژی لوولت بـــــــــــــــــــــــلاو کەوە، لە دەست و پێیان دەهاڵێ

" 'دوایی بە منی گوت: 'ئیبراهیم، ئەو ئاوازەی بیستت، لە بەری بکە و فێری کەنیزەکانتی بکە.' گوتم: 'ئاوازەکەم بۆ دووپات کەوە.' گوتی: 'پێویست بە دووپاتکردنەوە ناکا.' ئیدی لە بەر چاوم ون بوو. پەشـۆکام و شـیرەکەم هەڵگرت و بەرەو دەرگە ڕام کرد. تەماشـام کرد دەرگەکە داخراوە. بە کەنیزەکانم گوت: 'چیتان بیست؟' گوتیان: 'ئاوازێکمان بیست خۆشتر لە هەرچی ئاوازە.' من سـەرم سـوور ما و بەرەو دەرگەی شـتەوە ڕام کرد. ئەویش داخرابوو. لە پاسەوانەکانم پرسی ئەرێ شێخ چی لێ هات. گوتیان: 'کام شێخ؟ وەڵڵا ئەوڕۆ کەس لەو دەرگەوە نەهاتووەتە ژووری!' گەڕامەوە و بیرم لە کاری ئەو دەکردەوە کە لەپڕ دەنگێک لە قوژبنێکیماڵەکەوە هات و گوتی: 'هۆی ئەبووئیسـحاق، مەترسـە، من ئیبلیس بووم کە بوومە هاونشینت.'

" 'دوایی سـوار بووم و چووم بۆ لای خەلیفە و باسـەکەم بۆ گێڕاوە. گوتی: 'ئادەی ئەبووئیسـحاق، ئەو ئاوازەی لەو فێربووی، بیڵێ.' عوودم هەڵگرت و ژەندم و ئاوازم گوتەوە. خەلیفە کەوتە حاڵی خۆی و گوتی: 'ئەو شـێخە بە خۆشـحاڵکردنی تۆ، ئیمەشـی خۆشحاڵ کرد.' ئەوجار دەستخۆشانەی دامێ و گەڕامەوە.'

## چیرۆکی عاشقی بێبەش

"مەسـرووری ڕەنجبەر گێڕاویەتەوە کە شـەوێکیان هاروونەڕەشـید خەوی زڕا و پێی گوتم: 'مەسـروور، کام لە شـاعیرەکان لە بەردەگەیە؟' هەسـتام چوومە دەرەوە، تەماشـام کرد جەمیلی کوڕی موعەممەری عوزرا لە دالان بوو. پێم گوت: وەرە خەلیفە کاری پێتە.' گورج لەگەڵم هات بۆ لای خەلیفە. خەلیفە مۆڵەتی دانیشـتنی دا و پێی گوت: 'دەی جەمیل، قسەیەک، نوکتەیەک، شتێکی خۆشت لە زەیندایە؟' گوتی: 'خەلیفە گەورەم، لەوانەی دیتومە، بۆت بگێڕمەوە یـان لەوانەی بیسـتوومە؟' خەلیفە گوتی: 'دا دەی لەوانەی دیوتە بۆم بگێڕەوە.'

"جەمیل گوتی: 'قوربان، من شـێت و شـەیدای کچێک ببووم و خۆشـم دەویسـت و هاتوچۆیم دەکرد.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەوشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە..

## که شەوی شەشسەد و هەشتا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! جەمیل گوتی: 'هاتوچۆیم دەکرد. دوای ماوەیەک باریان کرد بۆ شوێنێکی تر. کە ماوەیەکی پێ چوو هێندەم بیر دەکرد، لە تاوانی حەجمینم نەبوو. کەڵکەڵەی وەدوا کەوتنی کەوتە مێشـکمەوە. ئاخری وام لێ هات شـەوێک لە شـەوان هەسـتام بار و بنەم لە وشتر نا، جامانەم لە سەرم بەست و شیرم لە کەمەر دا، ڕمبم هەڵگرت و سواری وشـــتر بووم. هاتمە دەرەوە و ملی ڕێیەم گرت و ڕۆیشـــتم. شـــەوێکیان کە تاریک و ئەنگوســـتەچاو بوو و بە دەشـــت و دەر و هەوراز و نشـــێو و قەدپاڵدا بە دڵێکی پڕ لە مەینەتەوە دەڕۆیشـــتم و نەڕەی شـــێر و لوورەی گورگ و دەنگی کێوی و هۆڤییەکان لە هەموو لایەکەوە دەهات. لە ترسان هەر ئەوەندە بوو گیانم دەر نەدەچوو، هەر ناوی خودام لەسەر زمان بوو و بەم حاڵەوە دەڕۆیشتم تا وابوو، خەو بردبوومیەوە و وشتریش لە ڕێ لای دابوو. لە خەودا بووم کە شـتێک وە سـەرم کەوت. لە تاوان وە خەبەر هاتم. تەماشـام کرد لە مێرگێکی سەرسەوز خۆشم. پڕە لە دار و درەختی چڕ و ئاو شینایی. لە وشترەکە دابەزیم و جڵەوەکەیم بە دەســـتەوە بوو. بەدوای ڕزگارییەوە بووم تا وا بوو لە مێرگ و دارەکان وەدەر کەوتم و بەسەر دەشتێکدا کەوتم. ئیدی باری وشترەکەم توندوتۆڵ کردەوە و سـوار بووم و نەمدەزانی بەرەو کام لا بچم. چاوم بە چواردەوری ئەو دەشـتەدا گێڕا، لە نێوەڕاسـتی دەشـتەکەدا ئاورێکم دی. وشـترەکەم بەرەو ئاوەرکە لێ خوڕی. کە گەیشـتمێ، دیتم ئاورەکە لە تاوڵێکدایە و ڕمێکیش لە بەر دەمیدا چەقێنراوە، ئەسـپێک بەسـتراوەتەوە و وشـــترێکیش یخ دراوە. بە خۆمم گوت: 'مادام لەم بێروونەدا کەســـی تێدا نییە، دەبێ ئەو تاوڵە چیرۆکێکی گەورەی لە پشـــت بێ.' چوومە لای تاوڵەکە و ســـڵاوم کرد، کوڕێکی نۆزدەساڵان کە تەوێڵی وەک مانگی چواردە بوو و ئازایەتی و چوست و چالاکی لە سیمایدا دیار بوو، سـڵاوی سـتاندمەوە و گوتی: 'برای عەرەب، پێم وابێ ڕێت لێ تێک چووە.' گوتم: 'بەڵێ، بمخەوە سەر ڕێ.' گوتی: 'کاکە گیان ئێرە بێشەی شێرانە. شەوە و تاریکە، نیگەرانی تووشـــی دڕندە و هۆڤیان بی. تازە ئەمشـــەو لای من بمێنەوە و بەیانی بەڕێت دەکەم.' لە وشترەکە دابەزیم، یخم دا و ئەژنۆیم بەستەوە. بەرگی سەفەرم داکەند و ماوەیەک دانیشتم کە ئەو لاوە هەستا چوو مەڕێکی سەر بڕی و ئاورێکی کردەوە و هاتەوە تاوڵەکە. سیخی پاک و خوێی سپی هەڵگرت، گۆشـتی پلپل بڕی و لە سـیخی دا و لەسـەر ئاور برژاندی و دایمێ. خۆشـــی تاوێ دەینالاند و تاوێ دەگریا. ئەوجار خۆی پێ نەگیرا و لە قوڵپی گریانی دا و ئەو بەیتانەی خوێندنەوە:

دوور له تۆ من جــــــــــــــێگه و پێخەفم بۆ چیی
که تۆم نەبێ مـــــــــــــــاڵ و ئاواییم بۆ چیی
ڕوو له دەشــت و ســـــــــــــــارا دەکەم هەتا دەمر
له جــــــــــــــــێی مرۆ لەگەڵ کێوی و هۆڤی دەب
به یــادی تــۆ چــاو له ئەســــتــێــره و هەیــڤ دەکەم
ســــــــــکــاڵای دڵ بــۆ لای دڕک و داڵــیــش دەبەم

ئیدی من زانیم ئەو کوڕه ئەویندارە. کەســـێک دەردی ئەوینی نەچەشـــتبێ، ئەویندار ناناســـێتەوە. له دڵی خۆمدا گوتم که دەبێ ســـەر له کاری دەربکەم. دوایه گوتم: ڕەنگه جوانیش نەبێ منی میوان پرسـیار لەو بکەم. ئەو خەیاڵەم له ســەرم دەرکرد و دەســتم به گۆشــتخواردن کرد. که له خواردن بوومەوە، لاوەکه هەســتا چوو تەشــت و مەســینەیەکی خاوێن و دەســـرەیەکی ئاوریشـــمی هێنا. که دەســـتم شـــۆرد، گوڵاوی بۆ هێنام و خۆمم بۆنخۆش کرد. ئەوجار ماوەیەک دانیشـتین و قسـەمان کرد. دوایی کوڕه هەسـتا پەردەیەکی له نێوەڕاســتی تاوڵەکەدا گێڕا و پێی گوتم: 'کاکه گیان، فەرموو بچۆ بخەوە.' چووم خەوتم و له تەمەنمدا شەوی ئەوەندە ئاسوودە و خۆشم نەدیبوو.' "

گوتی: "خاوەنشکۆ! جەمیل گووتوویەتی، لە کاری ئەو کوڕە ڕامام تا سێ بەشی شەو ڕۆیشت. لەپڕ گوێم لە دەنگێکی ناسک بوو، دیار بوو دەنگی ئافرەت بوو. ئیدی سووچێکی پەردەکەی نێوانمانم لا دا، تەماشـــام کرد کچێکی جوان و لەبەردڵان لەوێ لە پەنا کوڕە دانیشـــتووە و خەریکی دەردی دڵن و جارێ دەگرین و جارێ پێدەکەنن. لە بەر خۆمەوە گوتم: 'ســـوبحانەڵلا، ئەو کچە کێیە؟ خۆ کاتێ من هاتمە ئێرە، جگە لەو کوڕە کەســـی ترم نەدی!' دوای لە دڵی خۆمدا گوتم: 'بێگومان ئەو کچە، کچە جنۆکەیە و ئەو کوڕێژگەیەی خۆش دەوێ و لەم ئاقارەدا بۆی دێتە ژووانێ.' ئینجا جوان چاوم لە کیژە کرد، دیتم مرۆیە و وەک عەرەبیش دەچێ. کە زانیم ئەو کیژۆڵەیە واشـــتای لاوەکەیە، غیرەتی ئەویندارانەم جووڵا، پەردەکەم داداوە و خەوتم. کە ڕۆژ بووەوە، نوێژی بەیانیم کرد و پێم گوت: 'برای عەرەب، گەورەیی بفەرموو ڕێم نیشـــان دە، با بڕۆم.' ڕووی تێ کردم و گوتی: 'کاکە گیان، میوانداری سێ ڕۆژە و من نایەڵم هەتا ســـێ ڕۆژان لێرە بچیتە دەرێ.' جەمیل دەڵێ سێ ڕۆژ لای مامەوە. کە ڕۆژی چوارەم هات، دانیشـــتبووین قســـەمان دەکرد، کە ناو و بنەچەیم لێ پرســـی. گوتی: 'لە هۆزی بەنی عوزرەم.' ناو و بنەچەی خۆی گوت و کەچی دەرکەوت ئامۆزامە و لە گەورەکانی بەنی عوزرەیە. منیش خۆم پێ ناســـاند و پرســـیم: 'کێ وای لێ کردی بێی لێرە بە تەنیا بژی؟' کە ئەوەی لێ بیستم، چاوی پڕ بوو لە ئاو و گوتی: 'ئامۆزا، من یەکێک لە کچە مامەکانم خۆش دەویست، شێت و شەیدای ببووم و تاقەتی جیایی ئەوم نەبوو. خوازبێنیم لێ کرد و مامم نەیدامێ. کەچی دای بە کەسێکی دیکەی هۆزەکەی خۆمان. ئەو پیاوە ئامۆزاکەمی لەگەڵ خۆی برد و ڕۆی. کە ئامۆزاکەم لە کیس چوو لێم دوور کەوتەوە، ئیدی نەمتوانی لە ناو هۆزەکەمدا بمێنمەوە و هەڵویســـتم گرت، ســـەری خۆم هەڵگرم و بڕۆم. ئیدی وا بوو هاتمە ئێرە و ئێستا بە تەنیا لەو بێروونەدا دەژیم.'

"پاشـان پرسـیم: 'ئەی ماڵی ئەوان لە کوێیە؟' گوتی: 'لە سـەر لووتکەی ئەو شـاخەیە و لێرەوە نیزیکە. ئەو کچە هەموو شـەوێ لە نیوەشـەودا، خۆی دەدزێتەوە و دێتە ئێرە، لای من. تێر پێکەوە قسـە و دەردی دڵ دەکەین. ئیدی هەموو شـەوێ ئەوە کاری منە لەبەر ئەو چەند خولەکە وتووێژە ئەوە لێرە گیرسـاومەوە و شـەو و ڕۆژ چاوەڕێم کاتی ژوانەکەمان بێ. تا ئاخری یان دەمرم یان ئەوە بە کوێری چاوی چاوچنۆکان پێک دەگەین.' جەمیل گوتی: 'خەلیفە، کە ئەو لاوە ئەو بەسـەرهاتەی بۆ گێڕامەوە زۆری بۆ نارەحەت بووم و پێم گوت: 'ئامۆزا، پێت خۆشـــە ڕێیەکت پیشـــان بدەم. لەو چۆڵەوانی و لەو خەم و خەفەتە ڕزگارت بێ؟' گوتی: 'ئەرێ وەڵا پێم بڵێ و زۆریشـم پێ خۆشـە.' گوتم: 'کە شـەو داهات و ئەو کچە هاتەوە لات، کچە سـواری وشـترەکەی من بکە و بۆخۆشـت سـواری ئەسـپەکەی

خۆت بە، منیش سـواری یەکێ لە وشـترەکان دەبم. ئەو شـەوە تا سـبەی ئێوارە یەکتەکان دەڕۆین هەتا تەواو لێرە دوو دەکەوینەوە. ئیدی تازە کەس دەسـتی پێت ڕاناگا و تۆش بە ئاواتی خۆت دەگەی. جیهانی خودا پان و بەرینە و منیش تا مابم بە گیان و ماڵ و شیرەوە لە پشتتم.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەش‌سەد و نەوەد و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! کە لاوە قسەکەی جەمیلی بیست، گوتی: 'ئامۆزا، دەبێ لەگەڵ خۆشی قســەی بکەم؛ ئەو کچێکی ژیر و وریایە.' بۆ شــەوێ کە کاتی هاتنی کچە بوو، کوڕەکە بە دیاریەوە دانیشــت. کاتی هاتنەکەی بەســەر چوو کچە هەر دیار نەبوو. کوڕە زۆر نیگەران بوو. لە چاو شــەوان زۆر وە درەنگی کەوتبوو، ئەوجار کوڕە لە تاوڵەکە چووە دەرەوە و ڕووی لەو شنەیە کرد کە لای کچەوە دەهات و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

ئـــــــــــەرێ ئەی سروەی بەهاری بە هەواڵی یار نازانی؟
یارم ئەوشـــــــــــەو دیار نییە ئەوە دەمرم چارم چییە
دوێنێ شەوێ میـــــــــوانم بوو، چاوم لە یاری جوانم بوو
من بەرگەی دووری ئەو نــاگرم پێم بڵێ چۆن خۆ ڕاگرم

"دیســان چووەوە تاوڵەکە و ماوەیەک بە گریانەوە دانیشــت. هەســتا و بە منی گوت: 'ئامۆزا، ئەو کچە شـتێکی بەسـەر هاتووە! دەنا قەت ئەوەندە درەنگ نەدەهات. تۆ لێرە بە با من بچم هەواڵێکی بزانم.' شــیر و مەتاڵی هەڵگرت و وە دەر کەوت، مـاوەیەکی پێچوو، تەماشـــام کرد شـــتێکی بە دەســـتەوەیە و بە گریانەوە بانگم دەکا. چووم بۆ لای. گوتی: 'ئامۆزا، دەزانی چی لێ بەســەر هاتووە؟' گوتم: 'چی لێ هاتووە.' گوتی: 'کچە مامەکەم، کە ویستوویە بێ بۆ لای من لە ڕێگادا شێر پەلاماری داوە و خواردوویە و جگە لەوەندە هیچی لێ نەماوەتەوە. ئەو سەر و قژەی بە دەستییەوە بوو پێشانی دام. کەمێک گریا و گوتی: 'تۆ دانیشە ئێستا دێمەوە. ڕۆیشت، تاوێک ون بوو، کە هاتەوە سەری شێرەکەی بە دەستەوە بوو، لە بەر تاوڵەکە بە زەویدا دا. دمی شێرەکەی ماچ دەکرد و دەیگوت بۆنی ئەوی لێ دێ. ماوەیەکی زۆر گریا و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

خۆشەویستانم کـــــــــــــۆوە بن بزانن چیم لێ قەوماوە
گوڵێـــــــــــــــــکم بوو لە دونیادا، ئەویشم وا لە دەست داوە
لەکوێیە ئەو چاو و برۆ و بەژن و باڵا ڕێکـــــــــــــــوپێکە
هۆڤی مــابوو ڕووم تێ بکـا، ئەی خوایە عەجەب کۆســـپێکە
کزەی جەرگم بێ تۆ نازێیم، ژینی وا هـــــــــــــیچ مانای نییە
بچـێ هەر کـوێ بە دواتەوەم، مـن ژیـنـی بـێ تـۆم بـۆ چـیـیە؟

"ئەوجـار گوتی: 'ئـامۆزا، تۆ ئەو خودایە بیکە بۆ خـاتری ئەو خزمـایەتییەمـان ئەو

وەسییەتەم بۆ بەجێ بێنە. ئەویش ئەوەیە: ئێستا کە من مردم بمشۆ و لەگەڵ ئەو ئێسک و سەروبسکەی بمانخە گۆڕێکەوە و ئەو شێعرەش لەسەر گۆڕەکەم بنووسە:

ئێمە جووتێک مەلی ئاشق شــــــــــەیدای فڕین و هەڵکشان
حەزمان دەکرد بە یەک بگــــــەین بچێژین تامی خۆشی ژیان
بەڵام داخـــــــــــــم خیرەسەری ڕێی نەدا ئێمە جووت ببین
چەند خۆشـــە گۆڕی تەنگ و قووڵ، بە ئاشـــکرا لەگەڵ یەکین

ئەوجار ئەوەندەی دیش گریا و لە خێوەتەکە چووە دەرێ و ماوەیەک ون بوو. کە چوومە دەرێ، هاوارێکی کرد و مرد. کە ئەوەم دیت، زۆر ناڕەحەت بوو، زۆر زۆرم خەم بوو. لە تاوان خەریک بوو دڵم بتۆقێ. ئەوجار چوومە پێشێ و لە باوەشم گرت. ئەوەی پێی گوتبووم، وام کرد. سێ ڕۆژ لە لای گۆڕەکەی دانیشتم. پاشان ڕێی بێروونم گرتە بەر و تا دوو ساڵ هەر سەردانی گۆڕەکەیم دەکرد.'

## چیرۆکی عەرەبی دەشتەکی و مەروانی حەکەم

"دەگێڕنەوە ڕۆژێکیان موعاویە لە دیمەشق لەسەر تەختی خەلافەت دانیشتبوو و لەو شــوێنەوە دیمەنی چواردەوری لێ دیار بوو و شـــنە لە هەموو لایەکەوە تێی دەکرد. ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی زۆریش گەرم بوو. لەو جەنگەیەدا چاوی بە کابرایەکی پێپەتی کەوت کە لە گەرمان بڕستی لێ بڕابوو. موعاوییە بە هەنتەشییانی گوت: 'ئەرێ بڵێی کەس لەو کابرایە چارەڕەشتر بێ وا لەو گەرمایەدا مەجبوو بێ بە پێ خاوسی بێتە دەرێ ؟' هەنەتشییان گوتیان: 'ڕەنگە بێ بۆ لای تۆ خەلیفە..' موعاویە گوتی: 'دەی قەسەم بە خودا ئەگەر بێ بۆ لای من، ماڵ و سامانێکی زۆری دەدەمێ و ئەگەر ستەمێکیشی لێ کرابێ، یارمەتی دەدەم. ' بانگی خزمەتکارەکەی کرد و پێی گوت لە بەردەرگە ڕاوەستە، ئەگەر ئەو دەشتەکییە مۆڵەتی خواست، ڕێی بدە با بێتە ژوورەوە و دەست بە ڕوویەوە مەنێ.' خزمەتکار چووە دەرەوە و دەشتەکی گەیشت. خزمەتکار گوتی: 'چیت دەوێ؟' گوتی: 'کارم بە خەلیفەیە.' زمەتکار گوتی: 'بچووە ژوورەوە و سڵاوی لێ بکە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی شەش‌سەد و نەوەد و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! کە خزمەتکارەکە ڕێی کرد بچێتە ژوورەوە، دەشتەکییەکە هاتە لای موعاویە و سـڵاوی لێ کرد. موعاویە لێی پرسی: 'لە چ هۆزێکی؟' گوتی: 'بەنی تەمیم.' پرسی: 'چۆنە بەو کوڵەکوڵی گەرمایە ئاوا هاتووی؟' گوتی: 'سکاڵام هەیە و پەنام بۆ تۆ هێناوە.' پرسی: 'سکاڵات لە کێیە؟' گوتی: 'لە مەڕوانی کوڕی حەکەم.' ئەوجار ئەو بەیتانەی خوێندنەوە:

دەسەڵات بدە دەس لەخواترسان
لەخواترس خزمەت ئەکا بە ئینسان
ڕەوا نییە کار بسپێرییە کەسێ
گەل بە دەستییەوە دایم ئەچەوسێ
دەبێ لە پێشدا سەری گورگ ببڕی
گەر مەڕی قڕ کرد تازە بۆ دەیبڕی

موعاویە کە شیعرەکەی بیست و زانی زۆر زۆر نارەحەتە، گوتی: 'برای عەرەبم، پێم بڵێ بزانم چی بووە، کێشەت چییە؟' دەشتەکی گوتی: 'جەنابی خەلیفە، ژنێکم هەبوو زۆرم خۆش دەویست. چەند وشترێکیشم هەبوو. بەوانە ژیانم دەگوزەراند، وشکەساڵی هات و وشترەکانم تێدا چوون و هیچم نەما. ژیانم کەوتبووە لێژێ. لێقەوماو وماڵوێران بووم. لە بەر چاوی ئەوانەش کەوتم کە جاران هاتوچۆیان دەکردم. کە خەزوورم زانی گوزەرانم خراپە، ژنەکەمی لێ ستاندمەوە و دەری کردم. هەستام چوومە کن مەڕوانی حەکەمی کاربەدەستی تۆ و داوای یارمەتیم لێ کرد. کە خەزوورمی بانگ کرد، سکاڵاکەمی پێ گوت. خەزوورم گوتی: 'من ئەو کابرایە ناناسم.' گوتم: ' خودا گەورەمان بپارێزێ، ژنەکەم بانگ بکە و لێی بپرسە تا ڕاستییت بۆ ڕوون ببێتەوە.' کە ژنەکەمی بانگ کرد و چاوی پێی کەوت، جوانییەکەی کەوتە دڵەوە و ئەویش بوو بە ڕکابەرم و لێم تووڕە بوو و خستمییە بەندیخانەوە. دوایە خەزوورمی بانگ کرد و پێی گوت: 'ئەو کچەتم لێ مارە بکە، هەزار دیناری زێڕی سوور و دەهەزار درەمی زێوت دەدەمێ و کچەکەت لەم دەشتەکییە ڕزگار دەکەم؟' خەزوورم تەماحی پارەکە گرتی و قایل بوو. ئەوجار مەڕوان بانگی کردم و بە تووڕەییەوە پێی گوتم: 'هۆی دەشتەکی، سوعاد تەڵاق بدە.' گوتم: 'تەڵاقی نادەم.' ئیدی کۆمەڵێک لە دەستوپێوەندەکەی تێ بەر دام و کارێکیان پێ کردم، هەر ئەوەندە بوو نەمردم. ناچار تەڵاقم دا. دیسان ناردمییەوە بەندیخانە. ئیدی لە زینداندا بووم تا هاوێر

ژنەکەم تەواو بوو، ئەوجار گواســـتیەوە و منیان بەر دا. ئیدی منیش بە هیوای تۆ وەڕێ کەوتم و پەنام بۆ تۆ هێناوە.' ئەوجار ئەو بەیتانەی خوێندنەوە:

گەر بێتوو ئەتۆ مافـــــــــــــــم نەستێنی
ڕیشەی بێـــــــــــــــــدادی لە بن نەهێنی
لە لای خودا من یەخـــــــــــــەت بەر نادەم
خۆ خودای گیان خۆی ئەســـتێنی دادم
دونیا هـــەر ئاوا تا ســـــــــــەر ڕوون نابێ
بە کەیفی زاڵم بێ زاکـــــــــــــــوون نابێ

"دوای ئەوە کابرای دەشـتەکی شـڵەژا و ددانی لێک توند کرد و بووراوە و وەک ماری بریندار گینگڵی دەدا. موعاویە کە شـــێعرەی بیســـت و ئەو حاڵەی کابرای دی، گوتی: 'ئەو کوڕی حەکەمە لە سنووری دین دەرچووە و چاوی بڕیوەتە ژنی موسڵمانان.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و نەوەد و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! موعاویە گوتی: 'کاکی دەشتەکی، قسەیەکت کرد کە من قەتم قسەی وا جوان نەبیستبوو.' ئەوجار داوای پێنووس و لێنووسی کرد و نامەیەکی بۆ مەڕاوانی کوڕی حەکەم نووسی کە ئاوای دەست پێ کردبوو: 'مەڕوان، پێم گەیشتووەتەوە کە ستەمت لە ژێردەستەکانت کردووە و کەسێک شایانی ئەوەیە کاربەدەست بێت کە چاوی لە نامووسی خەڵک نەبێ و خۆی لە کەڵکەڵەی شەیتانی بە دوور بگرێ.' بەو جۆرە نامەیەکی دووروودرێژی بۆ نووسی کە من لەم بەیتانەدا پوختی دەکەمەوە:

زۆرەملی و تەپەسەری کاری ئێمە مانان نییە
چەوساندنەوە و پێشێلی ماف، شیاوی ئەمیران نییە
بترسە لە نزای مەزلووم، کێویش بی لە ریشەت دێنێ
تاج و تەخت و بەختت ئیدی لای خودا پووشی ناهێنێ
قاری خودات لە بیر نەچێ مردن ئەوەندەی پێ ناچێ
سبەی رۆژی مردنت بێ، گیانت چۆن دەوێرێ دەرچێ
بەسە تاوێ سەر هەڵێنە، گەورەیی خودا ببینە
چاوێ لە خوار خۆتەوە کە خەڵکی بێ ئەنوا ببینە

"ئەوجار نامەکەی پێچاوە و کەمیت و نەسری کوڕی زوبیانی بانگ کرد کە باوەڕپێکراوی بوون. ئەوان نامەیان وەرگرت و چوون بۆ لای مەڕوان. نامەکەیان دایە و ڕووداوەکەیان بۆ گێڕاوە. مەڕوان نامەکەی خوێندەوە و گریا. چونکە نەشی دەتوانی سەرپێچی بکا، چوو بۆ لای سوعاد و باسەکەی بۆ گێڕاوە. ئیدی لەبەردم کەمیت و نەسر تەڵاقی دا و بەو دوو باوەڕپێکراوەدا ناردی بۆ لای موعاویە و نامەیەکی بۆ موعاویەش نارد و ئەو بەیتانەی تێدا نووسین:

کوا لە من دێ کاری نارەوای ئاوا
دوای نامووسی خەڵک کەوم بێ پەروا
چۆناوچۆنە رەنگە دابێتیان دنە
چون ئەو خانمە ژنی یاسایی منە
ئەوە من نیم خودام لە بیر چێتەوە
بە ملهوڕیم خەڵک بچەوسێتەوە
فەرمانی تۆم لە سەر چاوم داناوە

ژنـــــــــــــــەی گۆرینیشم وا تەلاق داوە

نامەکەی مۆر کرد و دای بەو دوو نێردراوە. ئەوان گەڕانەوە لای موعاویە و نامەکەیان دایێ و خوێندیەوە. موعاویە گوتی: 'گوێڕایەڵییەکی باشـــی کرد.' ئەوجار داوای کرد ژنەکە بێنن. سـەیری کرد ژنێکی زۆر جوان و شـەنگ و شـەپاڵە و هاوتای نییە لە جوانیدا. قسـەی لەگەڵ کرد، سەیری کرد زمانی ڕەوانە و گفتولفتی شیرینە. ئینجا بانگی کابرای دەشتەکی کرد. کابرا هات، تەواو لە ژیان جاڕس بوو. موعاویە گوتی: 'کاکی دەشـــتەکی، دەتوانی دەســت لەم ژنە هەڵگری و منیش کەنیزێکی زۆر جوانت بدەمێ. لەگەڵ هەر کامێکیشـــیاندا هەزار دیناریشت بۆ بنێرم؟ لە بەیتولماڵیش مانگانەیەکت بۆ دەبڕمەوە تا هەتا هەتا لە سەر هیچ پەکت نەکەوێ.' دەشـتەکی کە ئەو قسـەیەی لە موعاویەی بیسـت، لە حاسـتە خۆی بە لادا هات و بووراوە. موعاویە وای زانی مرد. کە وە هۆش هاتەوە، موعاویە گوتی: 'ئەرێ ئەوە چیت بەســـەر هات؟' کابرا گوتی: ' لە دەســـت لەتم و زۆری مەڕوان پەنام بۆ تۆ هێنابوو، ئێستا لە دەست ستمی تۆ پەنا بۆ کێ ببەم؟' ئەوجار ئەو شێعرەی خوێندنەوە:

هەرچەنـد بە ڕواڵەت دەڵـێـی ئەســـحابەی
شـەیتان دەبـــــــــێ بێ تۆ دەرسی دادەی
ئاهـ و نـــــــــــزوولەم کاری خۆی دەکا
خودا چاوپـــــــــــــۆشی لە ناحەق ناکا
چەندی پێت خـــــــــــــۆشە بدە ئازارم
خودا ڕۆژی خـــــــــــــۆی دەستێنێ دادم

ئەوجار گوتی: 'جەنابی خەلیفە، ئەگەر هەموو ماڵ و ســـامانتم بدەیتێ، جگە لە ســـوعاد هیچی دیکەم ناوێ.'

ژیران دۆستی خـــــــــــــۆ بە دونیا نادەن
ســـۆز و ســـامان وەک یەک چاو لێ ناکەن

"موعاویە گوتی: 'کاکە، تۆ خۆت دان بەوەدا دەنێی کە تەلاقت داوە و شـــایەدیش هەیە. جا ئێستا ئێمە ئەو ژنە خۆی سەرپشک دەکەین، ئەگەر ئەو هەرکەسێکی هەڵبژارد، ئەوە با بچێ لەگەڵ ئەو بژی، ئەگەر نا بە خۆتی دەدەینەوە.' دەشتەکییەکە گوتی: 'قسەی جەنابتانە، قوربان.' موعاویە بە ژنەی گوت: 'دەی سوعاد، دەڵێی؟ کامیانت خۆشتر دەوێ، خەلیفە بەم شـــکۆ و ڕێز و دەســـەڵاتەوە، یا مەڕوانی حەکەم بەو ســـتەمکاری و زۆرداریيەوە، یا ئەو

دەشتەکییە بەم هەژاری و برسێتی و نەدارییەوە؟' سوعاد ئەو دوو بەیتەی گوت:

ئەمن لە خۆم ڕانابینم دەست لە ئـــــــــــــــەوینم هەڵگرم
سەودای وا بە من ناکرێ دڵ بـــــــــــــــدەم و زێڕ وەرگرم
بـا دەشـــــتەکی و پێپەتی بێ مـادام هەڵبژاردەی دڵمە
نایگۆڕمەوە بە گشت دونیا چـــــــــــــــونکە دونیا و دینمە

"پاشـان سـوعاد گوتی: 'جەنابی خەلیفە، قەسـەم بە خودا من هەر لەبەر ئەوەی ڕۆژگار وای بەســـــر ئەو هێناوە، بە کەمی نازانم ژیان لەگەڵ ئەو بۆ من بەختەوەرییە. تازە ئەو ئـاوێتەی خوێنم بوو، تـا نەمرم لێم جودا نـابێتەوە.' موعـاویە ســـەری لە ئەمەک و خۆشـەویسـتی و ژیریی سـوعاد سـووڕ ما. دەهەزار درەمی داێ و بە کابرای دەشـتەکی گوت: 'دەستی ژنەکەت بگرە و بە دڵی خۆشەوە بڕۆنەوە.'

## چیرۆکی زومڕەی کوڕی موغەیرە

"دەگێڕنەوە شەوێک هاڕوونەڕڕەشید خەوی لێ نەدەکەوت. بانگی ئەسمەعی و حوسێن خەلیعی کرد و پێی گوتن: 'قســەم بۆ بکەن. بەڵام با حوسـێن لە پێشـدا دەسـت پێ بکا.' حوسێن گوتی: 'سـاڵێکیان چامەیەکم بۆ موحەممەدی سولەیمانی ڕەبیعی گوت و چووم بۆ بەســـرە. موحەممەد چامەکەی پێخۆش بوو. پێی گوتم لەوێ بمێنمەوە. ڕۆژێکیان چوومە دەرەوە. لە ڕێی مەهالییەوە بەرەو لای مورید وەڕێ کەوتم. گەرما کاری تێ کردم. ڕووم لە دەرگایەکی گەورە کرد تا تۆزێک ئاو بخۆمەوە. لە پڕ چاوم بە کیژێک کەوت دەتگوت سـەلوە بە ناز دەڕوا و تۆپە عەنبەرە بۆنی خۆشـی وڵاتی پڕ کردووە. سـەروبسـکی وەک بەڕەزا بە گوڵە شـــیلان و ســـوێســـنە ڕازابێتەوە، هەرچی جوانی و دەلالییە لە خۆی شەتەکدابوو. چاوە مەستەکانی نێرگز ئێرەیی پێ دەبرد. دموچاوی تۆپەمانگێ بوو پڕشنگی دەدا و کەزییە و ئەگریجەی بە لاجانگیدا هـاتبوونە خوارێ، بە شــــنە دەبزووتن و دڵی مردوویان وەجووڵە دەخست. مروارییەکانی لە بێخەوشیدا دەتروسکانەوە و بە گوڵە مێلاقە دەوریان درابوو. لە دڵی خۆمدا گوتم ئای خودایە ئەگەر بێتوو ئەو کیژە بزەی بێتێ دەبێ چیها کەس لە ئاســـتە خۆی گیانی دەرچێ. ئەوەندەی من باســـی بکەم پێم وانییە بتوانم پەسنی زەڕڕەیەک لە جوانی ئەو دەلالە بکەم؛ کە وایە بەو شێعرەی شاعیری دەسپێرم. کە دەڵێ:

زولف و کەزیەت ئاگـــــــــــــرێکن گڕ لە سامان بەر دەدەن
ئۆقرە هەڵدەگرن بە جارێ عالـــــــــــــــەمێ ڕسوا دەکەن
سیحری ئەو چاو و برۆیەی مەســــــــــــــخی ئینسانی دەکا
کلکە ســــــــــــــووتەی وێ دەخا گەر چاوێ لە چاوی بکا
بەژن و باڵای ناژ و ســـــــــــــەلوی بێتوو ڕۆژێ دەرکەوێ
گۆمی مەندی شار دەشڵەژێ و کەس لە جێی خۆی ناسرەوێ
کار و پیشەی تـــــــــــــــــــۆ تاڵانە، بێتوو لەو شارە برۆی
ورد و درشت دێ بە دواتدا چـــــــــــــونکە تۆ دڵیان دەبەی

" 'جەنابی خەلیفە، کە ئەو دەرگەیەم کردەوە تا سڵاو لەو ئاسکە ناسکە بکەم، کۆڵانەکە پڕ بوو لە بۆنی میشک و عەنبەری ئەو. سڵاوم لێ کرد. بە دەنگێکی هێواش و خەمگینەوە وڵامی دامەوە. گوتم: 'خانم، کابرایەکی غەوارەم و تینوێتی زۆری بۆ هێناوم. جامێ ئاوم دەدەیەی؟' گوتی: 'خاڵە، لێم دوور کەوە؛ من نان و ئاوم لێ حەرام بووە و گرفتارم.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و نەوەد و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! کچە گوتی: ' من نان و ئاوم لێ حەرام بووە و گرفتارم.' گوتم: 'لەبەر چی؟' گوتی: 'لەبەر ئەوەی ئاشـــقی کەســـێکم کە ویژدانی نییە و منی ناوێ.' گوتم: 'خانم، یانی لەم ســەر زەوییەدا کەســێ هەیە کە تۆ ئەوت بوێ و ئەو تۆی نەوێ؟!' گوتی: 'بەڵێ، لەبەر ئەوەی زۆر جوانە، منی ناوێ.' گوتم: 'ئەی لەبەر چی لەو دالانە ڕاوەســتاوی؟ گوتی: 'ئێرە ڕێی هاتوچۆیەتی و ئێستا کاتیەتی لێرەوە تێپەڕێ.' پرسیم: 'ئەی قەت پێکەوە قســەتان کردووە؟' ئاهێکی هەڵکێشــا و فرمێســکی داباراند و گوتی: 'ماوەیەکی زۆر پێکەوە بووین.' گوتم: 'باشـــە خانم، تۆ چەندەت ئەو لاوە خۆش دەوێ؟' گوتی: ' ئەوەندەم خۆش دەوێ کە ئەگەر بێتوو لە پڕدا ببینم، خوێنم دەمەیێ و گیــانم دەردەچێ. تــا یــک دوو حەوتوو وەک پەیکەری بێ گیانم لێ دێ.' پرســـیم: 'ئەی لەبەر چی لێک جیا بوونەوە؟' گەردوون لێکی جیا کردینەوە. بەســـەرهاتی من و ئەو شـــتێکی ســـەیرە. ئەویش ئاوا بوو: ڕۆژی جەژنی نەورۆز چەند کچم لە کچانی بەســـرە بانگ کرد. لە نێویاندا کچێکی زۆر جوانیان تێدا بوو کە زۆری خۆش دەویســـتم. کە هات، باوەشـــی پێدا کردم و ماچی کردم. ئەوجار دووبەدوو دانیشـــتین بادە بخۆینەوە. پێکەوە زۆرمان دەســـتبازی و قانەقدیلە و تلاوتل کرد. جارێ من سواری سەری ئەو دەبووم و جارێ ئەو سواری سەری من دەبوو. یەکترمان هەڵدەگلۆفت. هێند مەست بووین لە جەنگەیەدا ئەو دەستی بۆ پزووی دەرپێکەی من هێنا. بۆ دەرپێ بەرنەبووەوە. لەو دەمەدا کە ئێمە ئاوا بووین، خۆشـــەویســـتەکەم وە ژوور کەوت و منی ئاوا بە بێ دەرپێیی دیت. ئیدی تووڕە بوو گەڕاوە.' "

لێرەدا بوو، مــاوەی چیرۆکی ئەوشـــەویش کۆتــایی پێ هــات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و نەوەد و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! 'ئەو کچە گوتی:'ئێستا من داوای لێبووردنی لێ دەکەم، بەڵام ئەو بە تیلەی چاویش لێم نارِوانی، پێتێکیشم بۆ نانووسێ و کەسیش نانێرێتە لام.' گوتم: 'خانم، ئەوەی باسی دەکەی، عەرەبە یا عەجەم؟' گوتی: 'کاکە، لە گەورەکانی بەسرەیە.' گوتم: 'گەنجە یا پیر؟' خێسەیەکی لێ کردم و گوتی: 'ئەوە دەڵێی چی؟ گەنجێکە مانگ تای ناکا و هێشتا خەتی نەداوە، هیچ عەیبێکیشی نییە جگە لەوەی لەگەڵ مندا بێبەزەیە.' گوتم: 'ناوی چییە؟' گوتی: 'تۆ کارت بە ناوی ئەو چییە؟' گوتم: 'دەمەوێ بیبینم و هەوڵ بدەم پێکتان بگەیەنمەوە.' گوتی: 'بە مەرجێک ناویت پێ دەڵێم کە نامەیەک لە منەوە بۆ ئەو ببەی.' گوتم: 'باشە، وا دەکەم.' گوتی: 'ناوی زومرەی کوڕی موغیرەیە و بە ئەبووسەخا بانگی دەکەن و ماڵی لە مورێدە.' ئەوجار کچە داوای پێنووس و لێنووسی کرد. قۆڵی کراسەکەی هەڵکرد و باسکی بلوورینی دەرکەوت و دوای ناوی خودا نووسی: 'ئازیز، لە سەرەتای ئەو نامەدا نزام نەنووسی، ئاخر ئەگەر نزاکانم گیرا ببوونایە، تۆ لێم هەڵنەدەبڕای. ئێستا تەنیا ئاواتی من ئەوەیە تۆ بەوێدا بێیت و من لەو دالانەوە چاوێکت لێ کەم و گیانێکم بێتەوە بەر. ئاواتێکی دیکەشم هەیە ئەویش ئەویە بە دەستی خۆت نامەییەکم بۆ بنووسی تا من ئەو نامەیە بە یادی ئەو شەوانەی پێکەوە بووین. لە سەر دڵم دانێم کە قەت ئەو شەوانەم لە بیر ناچێتەوە. ئازیزم، هەرچەندە من شایانی خۆشەویستی تۆ نیم، بەڵام ئەگەر وەڵامی داواکەم بدەیتەوە، سپاسگوزارت دەبم. شوکری خودا دەکەم. سڵاو و ڕێزی دوبارەم.'

" 'کچە نامەکەی دامێ و چوومە دەرەوە و بەرەو ماڵی موحەممەدی کوڕی سولەیمان وەڕێ کەوتم. کۆڕێکی گەرم بەسترابوو و هەموو بازرگانان لەوێ بوون. کوڕێک لەوێ بوو وا دیار بوو ئەو بەزم و گۆڤەندەیان بە هۆی ئەوەوە ساز کردبوو. پرسیم ئەوە کێیە؟ گوتیان ئەوە زومرەی کوڕی موغەیرەیە. لە دڵی خۆمدا گوتم ئەو کچە لە خۆڕا ئاوای نەدەکرد. ئەوجار هەستام و بەرەو مورید ڕۆیشتم و لە بەردەرگەی زومرەدا وەستام تا ئەو لەگەڵ ئاپۆرەی کۆیلە و خزمەتکارەکانیدا گەڕاوە. لەبەری هەستام، سڵاوم لێ کرد و نامەکەم داێ. خوێندیەوە و تێگەیشت چ باسە. گوتی: 'خاڵە، تازە کچێکی دیکەم هێناوە. ئەگەر پێت خۆشە، وەرە ژوورەوە بیبینە.' لەگەڵی چوومە ژوورێ. ئەو لاوە کچێکی بانگ کرد. کچ هات، لە جوانیدا وەک خۆر دەدرەوشاوە و باڵای دەتگوت تووله نەمامە. زومرە نامەکەی داێ و پێی گوت: 'وەڵامی ئەوە بدەوە.' کە کچە نامەکەی خوێندەوە، گۆنای زەرد هەڵگەڕا و گوتی: 'خاڵە، ئەو کارانە بۆ تۆ نەهابن.' دەمودەست هاتمە دەرەوە و لارەلار ڕۆیستم تا گەیشتمەوە ماڵی کچەکە. مۆڵەتم وەرگرت و چوومە کنی. هەواڵی پرسی. گوتم: 'چ هەواڵێکی خۆشم پێ نییە.' گوتی: 'قەی ناکا، باکم پێی نییە. تۆش لە دەسەڵاتی خودا

بێئاگای.' ئیدی پێنج‌سەد دیناری زێڕی سووری دامێ و هاتمە دەرێ. چەند ڕۆژێک تێپەڕی، ڕێم کەوتە ئەو گەڕەکە تەماشـــام کرد بەر دەرگەی ئەو ماڵە پڕ بوو لە کۆیلە و خزمەتکار. کە پرســــیارم کرد، لەلایەن زومڕەوە هاتبوون. داوایان لەو کچە دەکرد، بگەڕێتەوە لای زومڕە. ئەو کچە مانگ‌ئاســایە دەیگوت: 'نەوەڵا، هەر چاویشــی ناکەم.' ئەمن کە ئەوەم دیت لەبەر ئەوەی زومڕە وای لێ هاتبوو، کڕنۆشــی سـپاسـگوزاریم برد و چوومە ژوورەوە بۆ لای کچە. ئەو کچە نامەیەکی دایە دەستم پڕ بوو لە داوای لێبووردن و پاڕانەوە و لالانەوە. ئەوجار کچە تەواوی ئەو دیارییانەی زومڕە بۆی ناردبوو، پیشـــانی دام؛ بایی ســـێ‌هەزار دینــار بوون. دوای مــاوەیەک ئەو کچەم دی کە شــــــووی بە زومڕە کردبووەوە.' هارووونەڕڕەشید گوتی: 'ئەگەر زومڕە پێش من نەکەوتایە، من ئەو کچەم دەهێنا.'

## چیرۆکی ئیسحاقی مووسڵی و شەیتان

" یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە، دەگێڕنەوە کە ئیسـحاقی کوڕی ئیبراهیمی مووسـڵی گێڕاوییەتەوە: 'شەوێک لە شەوانی زستان لە ماڵێ بووم و هەور ئاسمانی تەنیبوو و باران بە خوڕەم دەباری. بە هۆی قوڕ و چلپاوەوە خەڵک ئەو مـاڵەومـاڵی نەدەکرد. منیش دڵم تەنگ بوو لەوەی کە نە کەس لە دۆسـتان دەیتوانی بێ بۆ لام و نە دەمتوانی بچم بۆ لایان. ئیدی بە کۆیلەکەمم گوت: 'دا شتێ بێنە با خۆمی پێوە سەرقاڵ کەم.' خواردن و مەیی هێنا. دەســـتم کرد بە خواردن و خواردنەوە و بەردەوام لە پەنجەرەوە چاوم لە دەرێ بوو کە بەڵکو ئەوە خودایە کەسێ دەرکەوێ و بێ تۆزێک پێکەوە دانیشین. لەو جەنگەیەدا کەنیزێکم بیر کەوتەوە، خۆشم دەویست و دەنگی زۆر خۆش بوو و زۆر باش لە عوودیشی دەزانی. ئیدی بە خۆمم گوت: 'ئەگەر ئەوم لا بێ، بێ تاقەتییەکەم بە ســــەر دەچێ. ئەمن لەو بیر و هزرانەدا بووم، کەســـــێک لە دەرگای دا و گوتی: 'ئەو خۆشـــەویســـتەی لە بەر دەرگە ڕاوەســـتاوە، بگەڕێتەوە یا بێتە ژوورێ؟' گوتم: 'ڕەنگە داری ئارەزووم هاتبێتە بەر.' خێرا هەســتام چووم دەرگام کردەوە. تەماشـام کرد ڕاسـت ئەو گراوەیە، عەبایەکی سـەوزی لە خۆی ئاڵاندووە و کوتە دیبایەکی بە ســــەریدا داوە تا تەڕ نەبێ. تا ئەژنۆی قوڕاوی بوو و جلەکانی بەری هەموو تەڕوتلیس ببوون. گوتم: 'کچێ، ئەوە کێ بەو قوڕ و چلپاوە تۆی هێناوە بۆ ئێرە؟' گوتی: 'پەیامنێرت هاتە لام و پێی گوتم کە چەند تامەزرۆی بینینمی منی. ئیدی منیش لە ڕێوە بە دەنگتەوە هاتم. کە ئەوەم بیســـت، ســــەرم ســـووڕ ما و هیچم پێ نەگوترا.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەوشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی شەشسەد و نەوەد و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! 'سەرم سوور ما و ویستم بڵێم کەسم نەناردووە. کەچی گوتم: 'سوپاس بۆ ئەو خودایەی وا دوای ڕەنجی دووری، بە دیدارت شاد بوومەوە. تۆزێک درەنگتر هاتیتایەی بۆ خۆم دەهاتم بۆ لات، زۆرم بیر دەکردی.' ئەوجار بە خزمەتکارەکەم گوت ئاوی گەرم بێنی بۆخۆم لاق و لەتەریم خاوێن کردەوە. دوایی دەستێک جلوبەرگی جوان و شکۆمەندانەم هێنا و لە بەرم کرد و پێکەوە دانیشتین. گوتم خواردن بێنن نەیهێشت. گوتم: 'ئەی لەگەڵ چەند پیاڵە مەی چۆنی؟' گوتی: 'لەگەڵتم.' چەند پێکێکم بۆ تێ کرد. گوتی: 'گۆرانیم بۆ دەڵێی؟' گوتم: 'من گۆرانی بڵێم؟ کچێ جوانێ گیان، ئەمن چاوەڕێی تۆ بووم دەست پێ بکەی.' گوتم: 'بە یەکێ لە کەنیزان بڵێم بێ گۆرانی بڵێ؟' گوتی: 'نا.' گوتم: 'دەی خۆت گۆرانی بڵێ.' گوتی: 'خۆشم نایڵێم.' گوتم: 'ئەی کێ هەیە تا گۆرانیت بۆ بڵێ؟' گوتی: 'بچۆ لە دەرێ کەسێک وەدۆزە.' لەبەر داواکەی ئەو هەستام چوومە دەرێ، بەڵام دڵنیا بووم کەسم دەست ناکەوێ و ڕۆیشتم و گەیشتمە سەر شەقامەکە. کوێرێکم دی هەر گۆچانەکەی لە زەوی دەکوتا و دەیگوت: ' خودا پاداشی چاکەی ئەوانە نەداتەوە کاتێک گۆرانیم بۆ دەگوتن، گوێیان بۆ ڕانەدەگرتم و کە بێدەنگ دەبووم، گاڵتەیان پێ دەکردم.' بەو کوێرەم گوت: 'مەگەر تۆ گۆرانیبێژی؟' گوتی: 'بەڵێ.' گوتم: 'تاقەتت هەیە ئەوشەو لەگەڵ ئێمە دانیشی؟' گوتی: 'ئەگەر دەتەوێ هاونشینتان بم، دەستم بگرە.' دەستیم گرت و هێنامەوە ماڵێ و بە خۆشەویستەکەم گوت: 'ئازیز، گۆرانیبێژێکی کوێرم هێناوە کە ئەو گۆرانیمان بۆ دەڵێ و ئێمەش کەیفی خۆمان دەکەین و ناشمانبینێ.' کچە گوتی: 'دا بیهێنە ژوورێ.' ئیدی بردمە ژوورێ. چێشتیان بۆ هێنا و کەمێکی خوارد و دەستی شۆرد. دوایە مەیم هێنا و سێ پیاڵەم مەی دایە خواردییەوە و بە منی گوت: 'تۆ کێی؟' گوتم: 'ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم.' گوتی: 'ناوی تۆم بیستبوو و خۆشحاڵم بە هاونشینیت.' گوتم: 'منیش هەروا.' ئەوجار گوتی: 'دەی ئیسحاق، گۆرانی بڵێ.' منیش عوودم بە دەستەوە گرت و گۆرانییەکم بۆ گوت. گوتی: 'ئیسحاق، خەریکە ببیتە گۆرانیبێژ.' من بەو قسەیە تێک چووم و عوودەکەم دانا. ئەوجار گوتی: 'کەست لە لایە گۆرانی چاک دەڵێ؟' گوتم: 'کچێکم لایە.' گوتی: 'دەی پێی بڵێ با گۆرانی بڵێ.' کچە گۆرانی گوت. کوێرەکە گوتی: 'لەم هونەرەدا هیچ باش نییت و کارت نەکردووە.' کچە تووڕە بوو و عوودی دانا و گوتی: 'ئەوەی پێمان بوو، هەر ئەوە بوو. ئەگەر هونەر لەمە زیاتر هەیە، پیشانمانی بدە.' کوێرە گوتی: 'عوودێکم بۆ بێنن کە دەستی لێ نەدرابێ.' بە خزمەتکارەکەمم گوت دا عوودێکی تازەی بۆ بێنە. پیری کوێر ژێیەکانی توند کردنەوە و مەقامێکی لێ دا من نەمدەزانی. ئەوجار گۆرانیی گوت و ئەو دوو بەیتەیشی خوێندەوە:

که باڵبازی زەنـــــــــــــــــگی وڵاتی تەنیم
خۆراســــا دەرکەوت دوور لە چـاوی غەنیم
پێی گوتم دەرگە لـــــــــــــه کەس نەکەیتەوە
گەر بە ڕەچـــــــــــــــــەڵەکیش بتگرێتەوە

" 'ئەو کچە بە تیلەی چاو ســـەیری کردم و گوتی: 'نەتدەتوانی ئەوەندە ڕازەی بەینمان نەدرکێنی.' من ســـوێندم بۆ خوارد و داوای لێبوردنم کرد و دەســـتیم ماچ کرد، مەمکیم گوشــی و لێویم مژی تا دڵیم چا کردەوە و وە پێکەنینم خســت. ئەوجار ڕووم لە کوێرەکە کرد و گوتم: 'دەی گۆرانی بڵێ.' کوێرە عوودی هەڵگرت و ئەم شێعرەی خوێندەوە:

پەنجەییم گرت مـاچم کرد و گوشــیم دوو ســێوی
هەتـا پێکەنی هەر مـــــژتم خونچەی دەم و لێوی
مانگی ڕوخســــــــــاری گەشاوە ئەو گوڵخونچەیە
چۆن دەتـــــــــــــــوانم بیرەنجێنم ئەو بێوێنەیە

" 'کە ئەوەمان بیست خۆمان لە کوێرەکە بەدوور گرت، ئەویش بۆ دەستبەئاوگەیاندن چووە دەرێ، زۆری پێچی هەر نەهاتەوە. بەدوایدا چووین، کەچی دیار نەبوو. دەرگاکانیش داخرابوون و کلیلەکان لای کەنیزان بوون و نەمانزانی کە هەڵکشا بۆ ئاسمان یا بوو بە ئاو و بە زەویدا ڕۆچوو. تازە زانیم کە ئەوە شـەیتان بووە. ئیدی ئەو شـێعرەی شـاعیرم بیر هاتەوە:

سەرم ســــــــــــوورِ ماوە لە کاری شەیتانی گڵاو و پیس
بێ پەنا و هـــــــــــەڵوەدا، ڕەحمی خوداشـــی دا لە کیس
ئەو هەمـــــــــــــــــوو فێڵ و کەڵەکە و تەفرە و فریودانە بۆ؟
ئەوە خەڵکیشـــــت لاڕێ کرد، بـاشـــە چی دەگـا بە تۆ؟

## چیرۆکی ئیبراهیمی مووسڵی و کۆیلەکە

"لە زمان ئیبراهیمی مووســڵی دەگێڕنەوە ڕۆژێکیان لە ماڵەوە دانیشــتبووم و لە دەرگا درا. کۆیلەکەم چووە دەرەوە و هاتەوە، گوتی: 'لاوێکی قۆز لە بەردەرگایە و مۆڵەتی دەوێ.' منیش مۆڵەتم دا. لاوەکە هاتە ژوورێ و شـــوێنەواری نەخۆشـــی پێوە دیار بوو، گوتی: 'دەمێکە دەمەوێ بێمە خزمەتت، پێویســتیم پێتە.' گوتم: 'پێویســتییەکەت چییە؟' سـێ‌سـەد دیناری دەرهێنا و خستییە پێشم و گوتی: 'شـێعرێکم نووسـیوە دەمەوێ ئەوە دینارانەم لێ

وەرگری و ئاوازێکی بۆ دانێ.' گوتم: 'دا دەی شێعرەکەت کامەیە؟' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و نەوەد و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! ئیبراهیم بەو لاوەی گوت کامەیە شـــێعرەکەت؟ لاوەکە ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

گەر بێتوو لە لاوێتیدا پشـت کـــــــــــــــــــۆم نەبێت و تەوێڵ گنج
ئەی لەبەر چی من بە گەنجی، هەرکیـانـم بە ســـەر هــاتووە
تەوێڵم ڕەنـــــــــــــــــــــــــگە لاسایی چینی زولفی یاری کردبێ
دڵنیام پشتم چاوی لە کـــــــــــــــــــــــــــەوانی برۆی کردووە

"من هەوایەکی شێوە چەمەریم بۆ شێعرەکەی دانا و بەو هەوایە، بۆم گوت. کوڕە لەوێ بووراوە. لە من وا بوو مرد. دوای ئیستێک وە هۆش هاتەوە، گوتی: 'دا دیسان بۆم بڵێوە.' ســـوێندم خوارد کە تازە نایڵێمەوە و لەوە دەترســـم بمری. گوتی: 'خۆزگە دەمردم.' ئیدی هەروا بەردەوام دەلالایەوە و دەگریا تا بەزەییم پێیدا هات و دیسان بۆم گوتەوە.

بەرزتر لە جاری پێشـــوو قیژاندی و بە لادا هات. دڵنیا بووم کە مردووە. گولاوم بە ســـەردا هەڵپرژاند تا وە هۆش هاتەوە و دانیشـت. زۆر ترسـام. شـوکری خودام کرد و پارەکانیم خستەوە بەردەمی و گوتم: 'پارەی خۆت وەرگرەوە و دەستم لێ هەڵگرە.' گوتی: 'من پێویســـتم بە پارەیە نییە و دووهێندەی ئەوەت دەدەمێ ئەگەر جارێکی دیکە هەر بەو هەوایە بیڵێیەوە.' بە هۆی بەڵێنی پـارەکەوە دڵم خۆش بوو و گوتم: 'دەیڵێمەوە، بەلام بە ســـێ مەرج: یەکەم، ئەوەی لای من بمێنییەوە و نان بخۆی تا هێزت بێتەوە بەر. دووەم، ئەوەی مەی لەگەڵ من بخۆیەوە تا خەمت بڕەوێ و تۆزێ دڵخۆش بێتەوە. سـێیەم، ئەوەیە بەســـەرهاتی خۆتم بۆ بگێڕییەوە.' وا بوو قایل بوو، مەرجەکانی بەجێ هێنا و گوتی: 'من خەڵکی مەدینەم و بە مەبەسـتی گەشـت و گەڕان لە ماڵێ هاتمە دەرێ. لە ڕێگەی عەقیقەوە کەوتمە ڕێ. لە نێو پۆلێک کچدا چـاوم بە دەنکێک کەوت کە جوانی ئـاوام تـا ئەوڕۆژە نەدیتبوو، ئەوێ ڕۆژێ لەو ســـەیرانگەیە بوون و ئێوارە ڕۆیشـتنەوە. ئەو کچە وای کار لە دڵم کرد، ئارا و قاراوی لێ بریم. پرسیارم لەم ژن و لەو ژن کرد کەس نەیدەناسی. وام لێ هات نەخۆش کەوتم. لە لای خزمێکمان باسم کرد. کەچی گوتی: خەمت نەبێ، جارێ بەهارە و باران دەبارێ. ئەوجار بۆخم لەگەڵت دێمە دەرێ و کارەکەت بۆ جێ بەجێ دەکەم. ئیدی دڵم حەسـاوە هەتا باران باری. خەڵک چوون بۆ سـەیرانگەی عەقیق. ئەمن لەگەڵ دۆست و ناسـیاوانم چوومە دەرێ. ڕاسـت لەو شـوێنەی جاری پێشـوو دانیشـتم. ئەوەندەی پێنەچوو کچەکان هاتن. ئیدی چووم بە یەکێک لە کچەکانی خۆمانم گوت بچووە لای هۆو کچە و

پێی بڵێ ئەو پیاوە دەڵێ کە شاعیر زۆر جوانی گوتووە کە:

کە لێم دیـار بێـت نـاتوانم قەت چـاوت لە سـەر هەڵبگرم
سوور بزانم بارانی تیر بەرەو ڕووی چـاوەکانم دێ

کچەکەی خۆمـان چوو بۆ لای ئەو ڕوومـانگە و چیم بەو گوتبوو، ئەویش بە کچەی گوتبوو. لە وڵامدا گوتبووی ئەتۆش بەو کوڕە بڵێوە کە شـاعیر بەم بەیتە جوانە وەڵامی داوەتەوە:

گـەر ئەڤینـدار لە دڵەوە ئۆگری ئەڤینی بێ
ئەو ڕۆژەی تـیـر دەبـارێ نـابـێ سـەری بـخـورێـنـێ

" 'ئەوجار من بێدەنگ بووم و لە شەرمان خەریک بوو دڵم بتۆقێ خێرا هەستام. کە من هەستام ئەویش هەستا. پێ و شوێنیم گرت و ماڵەکەیانم دیتەوە. ئیدی هاتوچۆی یەکدیمان دەکرد تا وا بوو شـتەکەمان لێ بڵاو بووەوە و باوکی کچە پێی زانین.' دەورووبەریانم ناردە خوازبێنی کچە. کەچی گوتبووی: 'ئەگەر ئاواتان نەکردبایە، دەسـتم بە ڕووتانەوە نەدەنا، بەڵام ئێستا قسەکە بڵاو بووەتەوە و بەسەر زمانی خەڵکەوەیە و ئەگەر من کچەکەم بدەم بە کوڕەکەتان، قسەی خەڵکی دێتەوە سەر. '

ئیبراهیم دەڵێ: من ئاوازەکەم فێری کوڕە کرد و ناونیشـانی ماڵی خۆی دامێ و گەڕاوە. ڕۆژێکیان چوومە کن جەعفەری یەحیا و شـێعری ئەو کوڕەم خوێندەوە. جەعفەر کەیفی سـاز بوو. چەند پیاڵەیەکی فڕ کرد و گوتی: 'ئەرێ ئیبراهیم، ئەوە شـێعری کێیە؟' ئیدی باسـی ئەو کوڕەم بۆ کرد. جەعفەر گوتی ئەو کوڕەم بۆ بـانگ کە بەڵێن بێ بە ئاواتی دەگەیێنم. منیش چووم بە دوای کوڕەدا و بردمە لای جەعفەر. ئەو بەسـەرهـاتەکەی لێ پرسـی، کوڕە هەمووی بۆ گێڕاوە. جەعفەر گوتی: 'بەڵێن بێ ئەو کچەت بۆ بێنم.' کوڕە بەو قسـەیە دڵی خۆش بوو و لەگەڵماندا دانیشـت. کە ڕۆژ بووەوە، جەعفەر چوو بۆ لای هاروونەڕڕەشیدی خەلیفە و باسەکەی شـەوی بۆ گێڕاوە. خەلیفە هەموومانی بانگ کرد و داوای کرد ئەو ئاوازەی بۆ شێعرەکەییم ساز کردبوو بۆی بڵێیم. منیش ئاوازەکەم بۆ گوت و ئەویش زۆری پێ خۆش بوو. نامەیەکی بۆ بریکاری حیجاز نووسـی و داوای باوکی کچەکەی کرد. ئەوەندەی پێ نەچوو کە باوک و خزمانی کچە هاتن. خەلیفە پێی گوت کە کچەکەی بدا بەو کوڕە و سـەد دیناری زێڕی سـووریشـی دایە. دوای ئەوە، ئەو کوڕە بوو بە یەکێک لە هاونشـینانی جەعفەر. وا بوو جەعفەر ئەو بەڵایە بە سـەر جەعفەر هات و کوڕەش گەڕاوە بۆ مەدینە. ئیدی خودا خۆی ئاگادارترە.

**چیرۆکی وەزیری ئەبووعامر**

دەگێڕنەوە، کۆیلەیەکی مەسـیحییان بۆ ئەبووعامری مەڕوان هێنابوو کە هیچ چاوێک تا ئێستا شتی ئەوەندە جوانی نەدیبوو. ناسرپاشا چاوی پێی کەوت و لە وەزیری پرسی: 'ئەو کۆیلەیان لە کوێوە هێناوە؟' وەزیریش گوتی: 'لە لای خوداوە.' ناسـرپاشـا گوتی: 'ئەوە تۆ بە ئەسـتێرەکان دەمترسـێنی و بە مانگ دیلم دەکەی؟' وەزیر داوای لێ بووردنی کرد و بەو کۆیلەیەدا دیارییەکی زۆری بۆ پادشا نارد و پێی گوت: 'تۆش یەکێک لە دیارییەکانی، ئەگەر ناچاریش نەبووایەم، دەستم لێ بەر نەدەدای.' ئینجا ئەو بەیتەی نووسی:

نەوگوڵێکم نارد بۆ خزمـــــــــــــــــــــــەتتان
حەیفە ئەو دوور بێ لە بـاخ و بێسـتـان

"ناسـرپاشـا کۆیلەکەی وە بەر دڵی کەوت و ماڵ و سـامانێکی زۆری داێ. ئەوجار کیژێکیان بە دیاری بۆ وەزیر نارد. وەزیر دیارییەکی گەورەتر لە بەرێی بە کەنیزەوە بۆ ناسرپاشا نارد."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی شەشسەد و نەوەد و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! وەزیر کەنیزەکەی نارد بۆ ناسرپاشا و ئەو بەیتەشی بۆ نووسی:

ئەوە مانـــــــــــــگێکم بۆ ناردیتە هەیوان
چون شـــــیاوە جێی مـانـگ بێ لە ئـاســـمـان

"کەنیز لای پاشا پێگەی بەرز بوو و پەلەی چووە سەرێ. وا بوو دوای ئەوە یەکێک لە دوژمنانی ئەبووعامری وەزیر چووبوو لە لای پاشا لە پشت سەری قسەی کردبوو. بۆی تێ چاندبوو و گوتبووی: 'هێشـــتا ئەبووعامر دڵی لای ئەو کۆیلەیەیە. هەر کاتێک مەی دەخواتەوە، یادی ئەو کۆیلەیە دەکا و پشـــیمانە لەوەی بە دیاری بۆی ناردووی.' ئەوجار ناسرپاشا نامەیەکی لە زمان کۆیلەکەیەوە دەنووسێ کە نێوەڕۆکەکەی ئەوە بوو: 'گەورەم، کە هی تۆ بووم، لەگەڵ تۆ زۆر خۆشـم ڕادەبوارد. گەرچی ئێسـتا لای پادشـام، بەڵام دڵم هەر لای تۆیە، لە ترسی تووڕەیی پاشا هیچ بڵێم. جا تۆ ئەگەر بۆت جێبەجێ دەبێ بە فێڵێک منی لێ وەرگرەوە.' پاشـــا نامەکەی دا بە کۆیلەیەکی مێرمنداڵ و ڕایســـپارد کە بڵێت ئەوە فلان کۆیلە نـاردوویەتی. کۆیلە چوو و نـامەکەی بۆ برد. کە ئەبووعـامر خوێنـدییەوە، لەپشتیەوە ئەو شێعرەی نووسین:

من تاڵـــــــــــــی و سوێری ڕۆژگارم دیوە
کاری نەشیـــــــــــــــاوی ئاوام نەدیوە
چۆن لە من دێ جا تـــــــــــــەماعی وا بکەم
بۆ نێچیر دەســــــــــــت لە زاری شێر ڕاکەم
من تۆم بە دیـــــــــــاری ناردووە بۆ هەیوان
هەیڤ و گوڵووک هەر شـــــیاوی جێی وان
ئەوە دامان نا تـــــــــــــۆ گیانی من بی
کە لە لەش دەرچـــــــــــووی تازە ئی من نی

چیرۆکی ئەحمەد دەنەف و حەسەن شوومان لەگەڵ دەلیلەی چاوبەست و کچەکەی

دیسـان دەگێڕنەوە کە لە سـەردەمی هاڕوونەڕەشیددا دوو پیاو هەبوون بە ناوەکانی ئەحمەد دەنەف و حەســـەن شـــوومان. ئەو دوو پیاوە یەک لە یەک پیلانباز و پیلانگێڕتر بوون، کاری چاک و خراپیان لە لا ئاوخواردنەوە بوو. کەس بێ ئیزنی ئەوان نەیدەوێرا پێ

له بەرە زیاتر ڕاکێشــــێ. بەو بۆنەیەوە خەلیفە پلە و پایەی دابوونێ و ئەحمەدی کردبووە ڕاوێژکاری دەســـتەڕاســـت و حەســـەنیش ڕاوێژکاری دەســـتەچەپ و مانگانە یەکی هەزار دیناری دەدانێ. ئەوانە یەکی چل پیاویشیان لە بەردەستدا بوو. ڕۆژێکیان ئەحمەد دەنەف و حەسەن شوومان هاوڕێ لەگەڵ هەشتا پیاوەکەیاندا ڕۆیشتن و جارچی بە فەرمانی خەلیفە جاڕی دەدا کە جگە لە ئەحمەد دەنەفی ڕاوێژکاری دەســـتەڕاســـت و حەســـن شـــوومانی ڕاوێژکـاری دەســـتەچەپ، کەس شـــــایـانی ئەو پێگەیە نییە و ئەوان فەرمـانبەردار و نامووســـپارێزن. لە بەغدادا پیرەژنێکیش هەبوو ناوی دەلیلەی چاوبەســت بوو و کچێکی بە ناوی زێنەبی نەسابەوە هەبوو. کە ئەو بانگاوازەیان بیست، زەینەب گوتی: 'دایە، سەیر کە، ئەو ئەحمەد دەنەفەی لە میسر دەریانکرد، ئێستا لە بەغدا بە هۆی فێڵبازی و ساختەچێتییەوە بووەتە دۆستی خەلیفە و ڕاوێژکاری دەستەڕاستی و ئەو حەسەن شوومانەش کە کوڕێکی لووســـکە و ســـەرەڕۆ بوو، ئێســـتا ڕاوێژکاری دەســـتەچەپە. هەر ژەمەی ســـفرە و خوانی خۆیـان هەیە و مـانگـانە هەزار دینـاریش لە خەلیفە دەســـتێنن. کەچی ئێمەش لەم مـاڵەدا دانیشتووین نە مووچەیەکمان هەیە و نە پێگەیەک و نە کەسیش لێمان دەپرسێ!' جا مێردی دەلیلەی چاوبەست پێشتر ڕاوێژکاری دەستەڕاستی خەلیفە بوو. کاتێک مرد، دوو کچی لە پاش بەجێ ما. یەکێک لە کچەکان مێردی هەبوو کە کوڕێک بوو بە ناوی ئەحمەد لەقیت واتە ئەحمەد بێزوو و کچەکەی دیکەشـــی زەینەب نەســـــابەیان پێ دەگوت کە شـــــووی نەکردبوو. جا دەلیلەی چاوبەست چەچوول و زۆرزانێک سـەیر، بە قسـەی خۆش ماری لە کون دێنا دەرێ و دەرســـی شـــەیتانی دادەدا. مێردەکەشـــی مانگانە هەزار دیناری لە خەلیفە وەردەگرت و کۆتری نامەبەری بەخێو دەکرد. خەلیفە هەر کۆترێکی لە کاتی پێویســـتیدا لە منداڵەکانی خۆشـتر دەویسـت. ڕۆژێکیان زەینەب بە دایکی گوت: 'هەسـتە فێڵ و دەهۆیەک ساز کە، بەشکوم لە بەغدادا ناوبانگ دەرکەین و ناومان بکەوێتە سەر زاران. وا بێ خەلیفە کارەکەی باوکم بداتەوە بە ئێمە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەوشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەشسەد و نەود و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ! زینەب بە دایکی گوت: 'دایە پیلانێک دارێژە وابێ لە بەغدادا دەنگ داتەوە و نێو دەرکەین. دەلیلەی چاوبەســـت گوتی: 'زینەب! بە گیانی تۆ، دەبێ ئەورۆ لەو بەغدایە جەنجاڵییەک ساز کەم، ئەحمەد دەنەف و حەسـەن شـوومان بێن ئاو بە دەسـتمدا کەن.' دەمودەسـت دەلیلە هەسـتا پەچەیەکی بەسـت و جلوبەرگی هەژارانە و سـۆفییانەی پۆشـی و عەبایەکی جاوی لە بەر کرد و پشـتێنێکی پانی بەسـت و گۆزەڵەیەکی هەڵگرت، پڕی کرد لە ئاو و ســێ دیناری زێڕی خســـتە زارکەکەیەوە و بەســـتی. تەســـبێحێکی هەزاردەنکی کردە ملی و بە بەرۆکیدا شـۆڕی کردەوە، چەفتەیەکی هەڵگرت کە ڕیشـــووی زەرد و سـووری هەبوو و لە ماڵ هاتە دەرەوە. ناوی خودای دەهێنا و تەسـبیحاتی دەکرد، بەڵام خەیاڵی لای فێڵەکەی بوو. لەم کۆڵان بۆ ئەو کۆڵان چوو تا گەیشـتە کۆڵانێک کە تازە ئاوپرژێنیان کردبوو و ماڵیبوویان. لەوێ چاوی بە دەرگەیەکی بەرز کە ژێردەرانەکەی بەردی ڕووخام و مەڕمەڕی تێگیرابو، پیاوێکی مەغریبی دەرگەوانی بوو. ئەو ماڵە ماڵی میر حەسەنی شەڕولتەریق بوو. میر حەسەن ژنێکی جوانی هەبوو کە لە شەوی بووکێنیدا سوێندی دابوو ژنی دیکە نەهێنێت و جگە لە ماڵی خۆیدا لە ماڵی دیکەدا نەخەوێ. ڕۆژێکیان میر حەسـەن چووە دیوانی خەلیفە و دیتی وا هەر میرێک کوڕێک دوو کوڕی لەگەڵدایە. کە لە دیوان گەڕاوە، چاوێکی لە ئاوێنەکە کرد. تەماشـــای کرد تاڵە سـپییەکانی ڕدێنی زۆر لە ڕەشـــەکان پتر بوون. بە مرومۆچییەوە چووە لای ژنەکەی. ژنە ســـڵاوی لێ کرد. میر حەســەن گوتی: 'لێم دوور کەوەوە؛ لەو ڕۆژەوەی تۆم دیوە، خۆشـیم لێ نەکیوەتەوە!' ژن گوتی: 'ئەوە بۆ وا دەڵێ؟' میر حەسەن گوتی: 'هەر لە یەکەم شەوەوە سوێندت دام کە ژنی تر نەهێنم. ئەورۆ میرەکانم بینی کە هەریەکەی کوڕی خۆی لەگەڵ بوو. منیش لەوەی کە هیچ کوڕ و کچێکم نییە، خەریک بوو دڵم بتۆقێ. خەریق بوو دڵم بتۆقێ. هەرکەس کوڕی نەبێ، ناوی لە ســەر پەڕەی ڕۆژگار دەسـڕدرێتەوە. ئەویش ئەوە بۆ چارەڕەشـــی من تۆ نەزۆکی!' ژنە گوتی: 'تاوانی من نییە، تۆ خۆت هەرکانی[1].' میر حەســـەن گوتی: 'کە لە ســـەفەر هاتمەوە، ژنێک دێنم.' ئەوەی گوت هەســـتا چووە دەرێ. لەو جەنگەیەدا دەلیلەی چاوبەست گەیشتە بەر دەرگەکەیان و چاوی بەو ژنە کەوت. بە خۆی گوت: 'دەلیلە، هیچ وا چاکە بە فێڵێک ئەو ژنە بەرم و ڕووتی کەم و جل و زێڕەکانی لێ بســـتێنم.' ئیدی لەوێ ڕاوەســـتا، ناوی خودای دەهێنا و تەســبیعاتی دەکرد. ژنی میر حەســـەن چاوی بە پیرێژنە کەوت کە جلوبەرگێکی ســادەی پۆشـیبوو. دەتگوت تۆپە ڕووناکییە. ژنی میر حەســەن کە ئەوەی دیت گریا و بە کەنیزەکەی گوت: 'بڕۆ دەسـتی شـێخ ئەبووعەلی دەرگەوان ماچ بکە

---

[1]. هەرکان: خرش، کەسێک کە نەتوانێ منداڵی لێ بکەوێتەوە.

و داوای لێ بکە ڕێی ئەو پیرەژنە بدا بێتە ژوورەوە بەشـکوو بە هانامەوە بێ و فکرێکم بۆ بکاتەوە.' کەنیزە بە لەز چوو دەسـتی دەرگەوانی ماچ کرد و پێی گوت: 'خانم دەفەرموێ ڕێی ئەو پیرەژنە بدە با بێتە ماڵەوە بەشکوو پێ و قەدەمی خێر بێ.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوتسەدەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ! که کەنیزه چوو قسەکەی خانمەکەی به دەرگەوانەکه گوت، دەرگەوان خێرا له پیرەژن چووه پێشەوه و ویستی دەستی ماچ بکا. پیرەژن گوتی: 'نەکەی، دوور کەوه با دەستنوێژەکەم نەشکێ.' دەرگەوان زۆر دامابوو. کەندوکۆسپی ڕۆژگار برستی لێ بڕیبوو. مووچەی سێ مانگی لای میر حەسەن بوو، نەشی دەتوانی لێی بستێنێ. ئەوجار به پیرەژنەی گوت: 'دایه شێخ، تۆزێکم ئاو لەو گۆزەیەی خۆت بدەیه بۆ متفەڕک.' پیرەژنه گۆزەڵەی له شانی داگرت و زارکی کردەوە. ئەو سێ دینارەی له زارکی گۆزەڵەکەی خستبوو، بەربوونەوە خوارێ. دەرگەوان دینارەکانی هەڵگرتەوە و ویستی بیداته دەست پیرەژنه، کەچی پیرەژنه گوتی: 'لایان بە، من تازه لەوە تێپەڕیوم پێویستیم به دینار بێ. هەڵیانگرە و بۆ خۆتیان خەرج بکه و له بری مووچەکەتیان دانێ که به لای میرەوەیه.' دەرگەوان گوتی: 'سوبحانەڵلا، خۆ ئەو پیرەژنه ئاگای له نێو دڵان و پێواره وا ئاگای له دڵی منە!'

"ئەوجار کەنیزه هاته پێشەوه و دەستی دەلیلەی ماچ کرد و بردییه ژوورەوە. که دەلیله چووه لای خانم، خانم له بەری هەستا و دەستی ماچ کرد. چێشتیان هێنا. دەلیله گوتی: 'کچم، من جگه له خۆراکی بەهەشت، هیچی دیکه ناخۆم. ئەویش لهساڵدا پێنج ڕۆژ، ئیدی ئەوەی دیکه به درێژایی ساڵ بەڕۆژووم. لەوه گەڕێ کچم، دەڵێی نارەحەتی وەک مات دێیته بەرچاوم. ئەوه چبووه؟ به ئەنکی خۆتی بڵێ.' ژنی میر حەسەن گوتی: 'دایه گیان، من هەر له یەکەم شەوەوه مێردەکەمم سوێند دا؛ که ژنی دیکه نەهێنێ. ئێستا که کوڕ و منداڵی خەڵک دەبینێ، ئیرەیی به باوکیان دەبا و دەڵێ تۆ نەزۆکی. منیش گوتم که خەتای من نییه و خۆت هەرکانی. کەچی لێم قەڵس بوو، چووه دەرێ و گوتی: 'که له سەفەر هاتمەوە، ژنت بەسەر دێنم.' دایه گیان، جا ترسم لەوەیه تەڵاقم دا و ژنێکی دیکه بێنێ؛ ئاخر ئەو ماڵ و سامانێکی زۆر و زەبەندی هەیە. ئەگەر لەو ژنەی کوڕی ببێ، هەموو دارونەداری بۆ ئەو دەبێ.' دەلیله گوتی: 'ڕۆڵە، مەگەر تۆ ئاگات له شێخ ئەبوولحەمەلات نییە؟ ئەگەر قەرزار سەردانی بکا، قەرزی بار دەبێ. ئەگەر نەزۆک سەردانی بکا، منداڵی دەبێ.' ژنی میر حەسەن گوتی: 'دایه گیان، من لەو ڕۆژەوەی هاتوومەته ئەو ماڵەوە، نه بۆ خۆشی و نه بۆ ناخۆشی لێره نەچوومه دەرێ.' دەلیله گوتی: 'کچم، من تۆ دەبەمه لای ئەبوولحەمەلات و داوای لێ بکه دووگیان ببی و نەزریش بکه ئەگەر مێردەکەت له سەفەر هاتەوه به کوڕ یا کچ دووگیان بووی، ئەو مناڵه بکەیته نۆکەر یان کلفەتی ئەبوولحەمەلات.' ژنی میر حەسەن هەر که ئەوەی بیست دەمودەست هەستا جلی جوان و شکۆمەندانەی له بەر کرد و به کەنیزەکەی گوت: 'ئاگات له کۆشک بێ تا دێمەوە.' ئەوجار به پلیکانەکانی کۆشکدا هاته

خوار و، شێخ ئەبووعەلیی دەرگەوان چووە پێشێ و گوتی: 'خانم، ئەوە بە تەمای کوێی؟' ژنە گوتی: 'بە تەمام بچمە سەردانی ئەبوولحەمەلات.' دەرگەوان گوتی: 'قەسەم بە خودا ئەو داپیرەیە لە خۆشەویستانی خودایە. ئاخر بەبێ ئەوەی من داوای هیچی لێ بکەم، خۆی زانی کە من دەستکورتم و سێ دیناری دامێ.'

"کورتی کەینەوە، دەلیلەی چاوبەست ژنی میر حەسەنی بردە دەرەوە و پێی گوت: 'کە سەردانی شێخ ئەبوولحەمەلات بکەی، ئیشەڵلا سکت پڕ دەبێ. لە بەرەکەتی ئەو شێخەوە مێردەکەت بەرانبەرت بەسۆز دەبێ و قسەیەکی لێ نابیستی کە دڵت بئێشێنێ.' جا دەلیلە لە دڵی خۆیدا دەیگوت: 'باشە من ئەوە لە کوێ ڕووت کەمەوە؛ خۆ هەموو شوێنێ قەرەباڵغە؟' ئەوجار بە ژنەی گوت: 'کچم، من لەپێشەوە دەڕۆم و تۆ بەدوامدا وەرە. بەڵام ئەوەندەم لێ دوور بە کە بمبینی، ئاخر ئەوانەی نیاز و پێویستیان بە منە و داوایەکیان هەیە، پێیانخۆشە دەستم ماچ کەن و نیازەکانیان بە من بڵێن.' ئەوەی گوت و بۆخۆی لە پێشەوە و ژنە لە دووری ئەو لە دواوە ڕۆیشتن تا گەیشتنە دووکانی کوڕێک بە ناوی سەید حەسەن. ئەو کوڕە هێشتا خەتی نەدابوو و قۆز و کەشخە بوو. کوڕە دەنگی پاوانەی ژنەی بیست و لەنجەولاری بینی. کە جوانییەکەی بینی، تێی ڕاما. پیرەژن کە ئەوەی دی، بە ئاماژە بە ژنەی گوت کە ڕووبەڕووی دووکانەکە دانیشێ تا دەچێتەوە لای. خێزانی میر حەسەن ڕووبەڕووی دووکانی کوڕە بازرگانە دانیشت. کوڕە بازرگان بە تاسەوە سەیری ژنەی دەکرد و دەلیلە لێی چووە پێشێ، سڵاوی لێ کرد و پێی گوت: 'تۆ سەید حەسەنی کوڕی کاک سەید موحسینی؟' کوڕە گوتی: 'بەڵێ، تۆ چۆن ناوی من دەزانی؟' دەلیلە گوتی: 'پیاوچاکان تۆیان پێ ناساندم و ئێرەیان پیشان دام. کوڕی من ئەو کچە کچی منە. ئەوە باوکێکی دەوڵەمەند و دەستڕۆیشتووی هەبوو. کە مرد، سامانێکی زۆری بە میرات بۆ جێ هێشت و ئێستا گەورە بووە. پێشینیان گوتوویانە: مێرد بۆ کچی خۆت بدۆزەوە. ئینجا ئەو کچە لە تەواوی ژیانیدا جگە لەمڕۆ، لە ماڵ نەهاتووەتە دەرەوە. ئێستا من ناوبانگی ئێوەم بە باش بیستووە و دەمەوێ بە قسەی پیاوچاکان بکەم و ئەو کچەمت لێ مارە کەم. ئەگەر سەرمایەشت کەمە، سەرمایەت دەدەمێ تا لەبری دووکانێک دوو دووکان دانێ.' کوڕە بازرگان لە دڵی خۆیدا گوتی: 'کوڕە خۆ من شتێکی ئاوام لە خودا دەویست، ئەوە سیانی بۆ ناردم.'

ئەوجار کوڕە گوتی: 'دایە گیان، دەمێکە دایکم دەیەوێ ژنم بۆ بێنێ، بەڵام من ڕازی نابم و دەڵێم: 'تا بە چاوی خۆم نەیبینم، نایهێنم.' دەلیلە گوتی: 'دەی مادام وایە هەستە بەدوای مندا وەرە تا کچەت بە ڕووتی پیشان بدەم.' دەموودەست لاوەکە هەستا و کیسەیەکی لەگەڵ خۆی هێنا، هەزار دیناری زێڕی تێدا بوو و گوتی: 'هاتوو پێویستم بە زێڕ و زیو بوو.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەوشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی حەوسەد و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! پیرێژنە بە سەید حەسەنی گوت: «ئەتۆ لە دواوە وەرە هەر ئەوەندە بێ کچەت لێ دیار بێ.» ئەوجار لە دڵی خۆیدا گوتی: «بیانبەمە کوێ ڕووتیان کەم؟»

پیرێژنە ڕۆیشت و ژنی ئەمیر حەسەنیش بە دوایدا، کوڕە بازرگانەش بە دوای ژنەدا. ڕۆیشتن هەتا پیرێژنە گەیشتە دووکانی حاجی محەممەدی ڕەنگرێژ. حاجی محەممەد کچ و کوڕی گەنجی خۆش دەویست. سەیری کرد ئەوە پیرێژنێک دێ و دوو منداڵی بە دواوەیە. پیرێژنە ڕاوەستا و کچ و کوڕە گەیشتنێ و لەو لاوە ڕاوەستان. پیرێژنە سڵاوی کرد و لە حاجی پرسی: «حاجی محەممەدی ڕەنگرێژ جەنابتی؟» حاجی وڵامی داوە: «بەڵێ بۆخۆمم چتان دەوێ؟» پیرێژە گوتی: «حاجی خانوویەکی گەورەمان هەیە و جێ جێی تێک ڕووخاوە و دەمانهەوێ دەستێکی پێدا بێنین و چاکی کەینەوە. تا تەواو دەبێ شوێنێکمان دەوێ لەگەڵ ئەو منداڵانە تێیدیا بحاوێننەوە. هەر وا لە خانوو دەگەڕام گوتیان حاجی جێ و ڕێی هەیە و ڕەنگە بتانداتێ. هەر بۆیە هاتوومە خزمەتت. هەر خۆمم و ئەو کچ و کوڕە جوانە کە بە هەزار زەحمەت گەورەم کردوون.» ڕەنگرێژ کە لەبەر ئەو منداڵانەش هەر پێ خۆش بوو بیانداتێ بە پیرێژنەی گوت: «ڕاست دەکەن، ئەمن ماڵی زیادیم هەیە، بەڵام کاریشم پێی دەبێ.» پیرێژنە گوتی: «ڕۆڵە گیان ئەمن لە مانگێک زیاتر لەو ماڵەی تۆدا نامێنمەوە. ئەگەر میوانیشت هات ئەوە بۆخۆم خزمەتیان دەکەم.» ئیدی ڕەنگرێژەکە لەڕێوە کلیلی دەر هێنا و دای بە پیرێژنە. پیرێژنە کلیلی وەر گرت و ڕۆیشت. ژنی ئەمیر حەسەن و کوڕە بازرگانیش بە دوای یەکدا ڕۆیشتن تا گەیشتنە کۆڵانێک. پیرێژنە دەرکی ماڵێکی کردەوە و چووە ژوورێ. ژنی ئەمیر حەسەنیش بە دوای ئەودا چووە ژوورێ. پیرێژنە بە ژنەی گوت: «ئەو ماڵە ماڵی شێخ ئەبوولحەمەلاتە و جێی وەدی هاتنی خۆزگە و ئاواتە.» پێی گوت ئەتۆ بچۆ ژوورێ و چارشێو و شت لە خۆت کەوە هەتا من دەگەڕێمەوە. ژنە چووە دیوێکەوە و دانیشت. کوڕە بازرگانیش گەیشتێ. پیرێژنە بە پیرییەوە چوو و پێی گوت: «لە حەوشە دانیشە هەتا کچەکەم دێنم پیشانتی دەدەم. کوڕە لە حەوشە دانیشت. پیرێژنە چووەوە لای ژنەکەی ئەمیر حەسەن و پێی گوت: «کچەکە دەمەوێ پێش ئەوەی شێخ سەری زۆر شلوغ بێ و زیارەتکەران تێی هاڵێن، ئەتۆ زیارەتی بکەی. بەڵام من نیگەرانی شتێکم.» ژنەکەی ئەمیر حەسەن گوتی: «نیگەرانی چی؟» پیرێژنە گوتی: «کوڕەکەی من گولە و شەو و ڕۆژ لێک ناکاتەوە و هەمیشە بە ڕووتی لێرە ویستاوە و چاوەدێری زیارەتکەران دەکا ئەگەر بێت و کچێکی وەک تۆ ببینێ بێ بۆ زیارەتی شێخ هێندەی ئیشتیا دەچێتییە هەڕای دەکاتێ و جل و شتەکەی لەبەر دادەدڕێ. ئێستا تۆ ئەو جلانەت داکەنە و زێڕ و شتەکەت لە خۆت کەوە و بیدە بە من بۆ هەڵدەگرم. کچە خێرا جل

و بەرگەکەی داکەند و زێڕ و خشـڵەکەی لە خۆی کردەوە و دای بە پیرێژنە. پیرێژنە گوتی ئەوە ئەو جلانە دەخەمە ناو سندووقی شێخ ئەبووحەمەلاتەوە با بەفەڕ بێ.

پیرێژنە جل و زێڕ و شتەی لێ وەر گرت و ئەوی لەوێ بە دەرپێیەک و ژێرکراسێکەوە بە جێ هێشت و چوو بۆ لای کوڕە بازرگانەکە. سەیری کرد ئەوە لەوێ دانیشتوو. هەر کە چاوی بە پیرێژنە کەوت گوتی: «ئەوە کوا کچەکەت چاوم پێی کەوێ؟» پیرێژنە بە چەپۆک بەر بووە سـەر و گوێلاکی خۆی. کوڕە بازرگانە گوتی: «ئەو چی بووە، بۆ وا دەکەی؟» پیرێژنە گوتی: «یا خودا کەس جیرانی خراپی نەبێ، جیرانەکان کە تۆیان لەگەڵ من دیت لێیان پرسـیم ئەوە چی بووە و کێیە؟ گوتم ئەوە کچەکەمی لێ مارە دەکەم. کەچی لەبەر بەخیلیان چوون بە کچەکەیان گوتووە ئەوە دایکت لەبەر پارووە نانێک تۆ لە گولێک مارە دەکا. ئەمنیش سوێندم خوارد کە تۆی بە ڕووتی پێشـان دەدەم با دڵی بحەسـێتەوە کە تۆ گول نیی. ئێسـتا نیگەران مەبە کارێک دەکەم ئەتۆش بە ڕووتی ئەو ببینی و ئەویش تۆ ببینێ.

کوڕە بـازرگـانەکە کە ئەو بەزمەی پێ نـاخۆش نەبوو. جلەکـانی داکەنـد و توورەکە دینارەکەشـی لە نێو جلەکان خسـت و بە پیرێژنەی گوت بیهێنە با بە ڕووتی بم بینێ. پیرێژنە گوتی: «ئەو جلانەتم دەیە با بۆت هەڵگرم.» کوڕە جلەکانی دا دەسـت پیرێژنە. پیرێژنە جلەکانی لێ وەرگرت و لە سـەر جلی کچەی دانا بیبا لە شـوێنێکی دانێ کەچی بە لایەکی دیکەدا لە ماڵەکە چووە دەرێ و دەرگاشی لە سەر ئەوان داخست و وە دوای کاری خۆی کەوت.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی حەوسەد و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! پیرێژنە کە جل و زێڕی ژنەکەی ئەمیر حەســـەن و کوڕە بازرگانی وەگیر کەوت یەکسەر بردی لە لای کابرایەکی دووکاندار دای نا و بۆخۆی چووەوە بۆ لای کابرای ڕەنگرێژ. ســـەیری کرد کابرا دانیشـــتووە و چاوەڕێی ئەوە. هەرکە پیرێژنەی دیت گوتی: «خۆ خانووەکەت بە دڵ بوو؟» پیرێژنە گوتی: «یاخوا ماڵت ئاوەدان بێ خانوویەکی بە بەرەکەتە. ئەوە دەچم کۆڵکێش دەبەم و ماڵەکەم دەگوێزمەوە ئەوێ. بەڵام زەحمەت نەبێ ها، ئەوە دینارێک و شتێک بەرە و لەوێ لەگەڵ ئەو منداڵانە بیخۆن و سەرێکیشیان لێ بدە، هەتا بۆخۆشـــم دەگەڕێمەوە.» کابرای ڕەنگرێژ گوتی: «ئەی دووکانەکەم؟» پیرێژنە گوتی: «دووکانەکەت بەو شاگردەت بسپێرە.» حاجی دووکانەکەی بە شاگردەکەی سپارد و چوو نان و پێخۆر و شت بکڕێ و بچێ سەری منداڵاکان بدا.

پیرێژنە چوو ئەو شتانەی بە ئەمانەت لە لای دووکاندارەکە دای نابوو، وەری گرتەوە و گەڕاوە بۆ دووکانی حاجی ڕەنگرێژ. شـــاگردەکەی لەوێ بوو پێی گوت: «هەســـتە ئەتۆش بچۆ بۆ لای حاجی و یارمەتی بدە. لەوێ لەگەڵ ئەوانیش نانەکەت بخۆ. ئەمن لێرە دەبم. کوڕەی بەڕێ کرد. کە کوڕە ڕۆیشت خێرا هەستا شتەکانی دووکانی پێچاوە. لەو جەنگەیەدا کابرایەکی ویشکەڵفرۆش بەوێدا هات. بانگی کرد و لێی پرسی: «کاکە تۆ حاجی دەناسی؟» کابرا گوتی: «بەڵێ دەیناســـــم بۆ؟» پیرێژنە گوتی: «ئەو فەقیرە مایە پووچ بووە و وەبن قەرز کەوتووە. خەڵک دێن شـــتەکانی دەبەن. ئەمنیش بۆ ئەوەی بیســـەلمێنم کە هیچی نییە ئەوە کەلوپەلەکەی بۆ دەبەمەوە بۆ خاوەنەکانیان. ها ئەو دینارێکیش کرێی گوێدرێژەکەت بێ، ئێستا بۆت دێنمەوە. تا دێمەوە ئەتۆ دەست دە بەردێک و ئەو خم و گۆزەڵە و دیزەیەی بشکێنە با ئەگەر پیاوەکانی قازی هاتن سیایی ماڵەکەی بگرن بزانن کە هیچی نییە بەشکوو لە کۆڵی بنەوە.» کابرای ویشـــــکەڵفرۆش گوتی: «حاجی زۆری چاکە بۆ من بوو، هەرچی بۆی بکەم هەر کەمە، بە چاوان هەموویان دەشـــکێنم.» ئیدی پیرێژنە تەواوی ئەو شـــتانەی پێچابوویەوە لە گوێدرێژەکەی دا و بردییەوە بۆ ماڵەکەی خۆی. کە گەیشـــــتەوە کچەکەی گوتی: «دایە نیگەرانت بووم، پێم بڵێ چیت کرد؟» پیرێژنە گوتی: «گوێی چوار کەسم بڕی: ژنەکەی ئەمیر حەســـــەن، کوڕە بازرگانێک، ڕەنگرێژێک و ویشـــــکەڵفرۆشـــــێک. تەواوی شـــتەکانیانم لێ ئەســـتاندن و لەو گوێدرێژەم دا و هێنامەوە. زێنەب گوتی: «بۆ دایە بە تەما نیت تازە لەو شـــارەدا بژی وا ژنی ئەمیر حەســـەن ڕووت دەکەی؟» پیرێژنە گوتی: «ئەمن لە هیچیان ناترسم مەگەین لە ویشکەڵفرۆشەکە، ئەو دەمناسێ. با پیرێژنە لێرە بەجێ بێڵین.

حاجی ڕەنگرێژ خواردەمەنی کڕی و لە سەر سەری نۆکەرەکەی دانا و بە لای دووکاندا

هاتەوە. سەیری کرد ئەوە کابرای ویشکەڵفرۆش خومرە و سوێنە و شتەکە دەشکێنێ و دوکانیش هیچی تێدا نەماوە. لە دوور هەرای ویشکەڵفرۆشی کرد. ویشکەڵفرۆش کە چاوی پێی کەوت پێی گوت: «ئیشەڵڵا هەر سلامەت بی بیرم لە تۆ دەکردەوە.» حاجی گوتی: «بۆ چی بووە بیرت لە من دەکردەوە؟» ویشکەڵفرۆش گوتی: «تۆ مافنگی بووی، دەیانویست سیایی ماڵەکەت بگرن.» ڕەنگرێژەکە گوتی: «ئەوە کێ وای پێ گوتووی؟» ویشکەڵفرۆش گوتی: «دایکت پێی گوتم. پێشی گوتم ئەو خومرە و سوێنە و شتە بشکێنم تا ئەگەر ڕاسپاردەی قازی هات چی وای لێ نەبێ.» ڕەنگرێژە گوتی: «شێتە تۆ دەڵێی چی دایکم لە مێژە مردووە.» ئیدی بە چەپۆک بە سەری خۆیدا دا و دەستی کرد بە گریان و هاواری ماڵەکەی کرد. ویشکەڵفرۆشیش لەگەڵ ئەو دەستی کرد بە گریان و هاواری کەرەکەی کرد. ئەوجار ویشکەڵفرۆش یەخەی حاجی گرت و داوای کەرەکەی کردەوە. حاجی یەخەی ئەوی گرت و گوتی پیرێژنەم لە تۆ دەوێ چی لێ هات. بۆ کوێ چوو؟ خەڵک تێیان هاڵا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که ئەوی حەوسەد و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ڕەنگڕێژ و ویشکەڵفرۆش ئاوقای یەک بوون. خەڵکیان تێ هاڵا. لە ڕەنگڕێژیان پرسی ئەوە چی بووە؟ ویشکەڵفرۆش گوتی: «من بۆتان دەگێڕمەوە.» ئیدی ڕووداوەکەی بۆ گێڕانەوە و گوتی کە من پێم وا بوو چاکە لەگەڵ ڕەنگڕێژ دەکەم. وا بوو کە منی دیت خم و سوێنە و شتەکەم دەشکاند بە چەپۆک بە سەر و گوێلاکی خۆیدا دا و بە منی گوت کە دایکم دەمێک ساڵە مردووە. ئێستا ئەوتە دەڵێ پیرێژنەم لە تۆ دەوێتەوە. منیش دەڵێم کەرەکەم لەو دەوێتەوە چونکە بە بۆنەی ماڵی ئەوەوە کەرەکەم چووە.» خەڵک لە ڕەنگڕێژیان پرسی: «ئەتۆ ئەو پیرێژنە دەناسی وا تێت ڕادیوە و دووکانت بەو سپاردووە؟» ڕەنگڕێژ گوتی: «ناوەڵا، نایناسم. ئەورۆ لەگەڵ کوڕ و کچەکەی هاتنە لام. ماڵێکیان لێ بەکرێ گرتم. یەکێک لە نێو خەڵکەکەوە گوتی: «دەبێ ڕەنگڕێژ کەرەکەی بۆ ویشکەڵفرۆش بژێرێ. چونکە ئەگەر ئەو باوەڕی بە پیرێژنە نەکردبا و دووکانی بەو نەسپاردبا، ئەویش کەرەکەی بەو نەدەسپارد و باوەڕی پێ نەدەکرد.» یەکی دیکە گوتی: «حاجی چونکە ئەو پیرێژنە لە ماڵەکەی تۆدا بووە هەر دەبێ. لە عۆدەی کەرەکەی بێیە دەرێ.» ئیدی ئەوان ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵی ڕەنگڕێژەکە کە دوایە درێژەی کێشەکەی ئەوانتان بۆ دەگێڕینەوە.

کوڕە بازرگانی فەقیر لەوێ چاوەڕوانی هاتنەوەی پیرێژنەکە بوو. پیرێژنە نەهاتەوە و کچەی نەهێنا. ژنی ئەمیر حەسەنیش هەر چاوەڕێی پیرێژنە بوو، پیرێژنە نەهاتەوە. ژنە هەستا بچێ بۆ زیارەتی شێخ ئەبووحەمەلات. کوڕە بازرگان کە ئەوی دیت لێی پرسی: «دایکت لە کوێیە، قەرار بوو تۆ لە من مارە بکا؟» ژنی ئەمیر حەسەن گوتی :«دایکم مردووە مەگەر تۆ کوڕی ئەو پیرێژنە و پیاوی شێخ ئەبووحەمەلات نی؟» کوڕە بازرگان گوتی: «ئەوە دایکی من نەبوو، ئەوە پیرێژنێکی جادووباز و حۆقەباز بوو. جلەکانی منی لەگەڵ هەزار دینار بردووە و هەڵاتووە. ئێستاش ئەو هەزار دینارە و جلەکانم لە تۆ دەوێتەوە.» ژنەش گوتی: «ئەمنیش جل و زێڕ و جەواهێراتەکەم هەر لە تۆ دەوێتەوە. ئەوان خەریکی دمبەدمە بوون کە ڕەنگڕێژەکە لێیان وەژوور کەوت. سەیری کرد ئەوە کوڕە و کچە لەوێن. لێی پرسین: «دایکتان لە کوێیە؟» ژنە تەواوی ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە. کوڕە بازرگانیش لە سەر ڕاوە هەمووی بۆ گێڕاوە. کابرای ویشکەڵفرۆش گوتی: «ئەمن کارم بەوەی نییە و کەرەکەی خۆم دەوێتەوە.» حاجی گوتی: «ئەو پیرێژنە چاوەبەستە دەستی هەموومانی بڕیوە. هەستن وەرنە دەرێ با دەرگاکە داخەم.» کوڕە بازرگان گوتی: «بۆ تۆ عەیبە ئێمە کۆک و پۆشتە هاتینە ماڵەکەتەوە و بە ڕووتی بڕۆینە دەرێ.» ناچار ڕەنگڕێژ چوو جلوبەرگی بۆ کوڕە بازرگانەکە و ژنی ئەمیر حەسەن هێنا و داینێ. ژنەکەی

ئەمیر حەســـــەنی ناردەوە ماڵی خۆی. کە ئەویش دوای ئەوەی مێردەکەی هات لە دوای بەسەرهاتێکی هەیە کە بۆتان دەگێڕینەوە.

حاجی دەرکی ماڵەکەی داخســـــت و بە کوڕە بازرگانەکەی گوت: «وەرە با وە دوای پیرێژنەکە بکەوین بیبینینەوە.» ڕەنگرێژ و کوڕە بازرگان و ویشـــکەڵفرۆش چوون بۆ لای والی بۆ شکایەت. والی پێی گوتن: «جا ئەو شارە پڕە لە پیرێژن، ئێوە بچن بیبیننەوە ئەمن ماڵەکەی ئێوەی لێ دەستێنمەوە.» ئەوان کەوتنە سۆراغی پیرێژنە.

پیرێژنە بە زێنەبی کچی گوت:«دەڵێم بچم، کڵاو لە ســـــەر یەکی دیکەش بنێم.» زێنەب گوتی: «دایە زۆر نیگەرانی تۆم.» پیرەی ســـــیحرباز گوتی: «ئاو و ئاور بە من ناوێرێ خەمت نەبێ.» دوای ئەوە هەســـــتا بەرگی کەنیزانی لە بەر کرد و بۆ فڕوفێڵ وەدەر کەوت. ڕۆیشـــــت هەتا گەیشـــــتە کۆلانێکی ئاوپرژێنکرا و ماڵدراو. دەنگی ئاواز و گۆرانی و دەف دەهات. چاوی بە کەنیزێک کەوت، کوڕێکی بە باوەشـــــەوە بوو کە جلوبەرگی زێڕین لە بەر دا و تاجی ڕازاوە بە دوڕ و گەوهەری لە سەر بوو. تۆقێکی زێڕی نەقیمداری بە ملیدا شۆڕ ببووەوە. وا دیار بوو، ئەو ماڵە ماڵی شابەندەری بازرگانان و ئەو کوڕەش کوڕی ئەو بوو. کچێکیشـــــی هەبوو کە ئەو جێژن و ئـاهەنگە بۆ ئەو گیرابوو. کۆمەڵێک ژنی گۆرانیبێژ هاتبوونە لای دایکی کچە. کاتێک کچە، یان دایکی دەهاتنە دەرێ و دەچوونەوە ژوورێ ئەو کوڕە داوێنی بەر نەدەدان. هەر بۆیە دابوویان بەو کەنیزە بیخافڵێنێ، تا ئاهەنگەکەیان تەواو دەبێ. پیرەی ســـەر ئاسنین کە ئەو منداڵەی بەو کەنیزە دیت لە کەنیزەکەی پرسـی: «ئەوە لێرە چ باســـــە و خانم ئاهەنگی چی دەگێڕێ؟» کەنیزە گوتی: « کچەکەی مارە دەکرێ و میوان و گۆرانیبێژ و شتی بانگ کردووە.» پیرێژنەی جادووباز لە دڵی خۆیدا گوتی: «دەبێ ئەو منداڵەی لەو کەنیزە بڕفێنم.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی حەوسەد و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! پیرێژنە هێندێک پارەی چرووکی زەردی لە گیرفانی دەرهێنا کە شـــێوەی دیناریان دەدا. دای بە کەنیزەکە و پێی گوت: «ها ئەو دینارانە بگرە و بچووە بۆ لای خانم و پێی بڵێ کە ئوموولخەیر سڵاوی دەگەیاندی و دەیگوت سبەینێ لەگەڵ کچەکانم دێم بۆ شاییەکەیان.» کەنیزەکە گوتی: «ئاخە دایە، ئەگەر ئەو منداڵە بەرمە ژووری و دایکی ببینێ گوڕوو دەگرێ و دەچێ بۆ لای.» پیرێژنە گوتی: «ئەو منداڵە بدە بە من.» کەنیزە منداڵەکەی دا بە پیرێژنە و پارە قەڵبەکانی لێ وەرگرت و چووە ژووری. پیرێژنە بە لەز خۆی گەیاندە کۆلانێکی دیکە و زێڕ و شـــتەکانی لێ کردەوە. پاشـــان لە دڵی خۆیدا گوتی: «پیرێژن واچاکە ئەو منداڵە بکەی بە بارمتە و هەزار دیناری پێ وەرگری.» هەر بۆیە منداڵەکەی برد بۆ بازاڕی گەوهەرفرۆشـــان. ســـەیری کرد جوولەکەیەک لە دووکانێکدا دانیشتووە و کۆڵێکی زێڕ لە پێش خۆی داناوە. بە خۆی گوت وا چاکە کڵاوێک لە سەر ئەو جووە بنێم. کەمێکی زێڕ لێ بســـتێنم و ئەو منداڵەی بۆ بەجێ بڵێم. جووەش، کە چاوی بە پیرێژنە کەوت و ئەو منداڵەی بە باوەشەوە دیت. منداڵەکەی ناسییەوە کە کوڕی شابەندەری بازرگانانە. ترســـا گوتی: نەکا شـــتێک لە دووکانەکانی دیکە بکڕێ، هەر بۆیە بانگی کرد: «خانم، فەرموو چیت دەوێ؟» پیرێژنە گوتی: «ئەتۆ مامۆســـتا عوزرەی یەهوودیی؟» یەهوودییەکە گوتی: «بەڵێ هەوم.» پیرێژنە گوتی: «خوشـکی ئەو منداڵە، کچی شـابەندەر، ئەوڕۆ مارە دەکرێ و بۆ خۆ ڕازاندنەوە پێویســـتی بە جووتێک گوارە و ملوانکەیەک و خشـڵی گرانباییە.» بەو جۆرە پیرێژنە بایی هەزار دیناری زێڕ لێ وەرگرت و گوتی: «ئەوە دەبێ خانم بە دڵیشـــی بێ و هەڵیانبژێرێ. هەر کامیانی هەڵگرت پارەکەیت بۆ دێنم. با ئەو منـداڵە لێرە بێ تـا دێمەوە. جووە منـداڵەکەی لێ وەرگرت. پیرێژنەش زێڕەکـانی برد و ڕۆیشـــتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی. زێنەبی کچی گوتی: «دایە ئەوە چیت کردووە و لە کوێت بوو؟» پیرێژنە گوتی: «کوڕی شـابەندەرم ڕووت کرد و بردیشـم بە بارمتە دامنا و هەزار دیناریشم پێ وەرگرت.» زێنەب گوتی: «دایە تازە تۆ ناتوانی پێ بخەیە ناو شارەوە.»

کەنیزی شـــابەندەریش کاتێک چووە لای خێزانی شـــابەندەر گوتی: «خانم ئوموولخەیر ســـڵاوی دەگەیاندی و گوتی ســـبەینێ لەگەڵ کچەکانم دێم بۆ ئاهەنگەکەتان.» خانم گوتی: «کەنی، کوا منداڵەکە؟» کەنیزە گوتی: «لە لای ئوومولەخەیرم دامنا، گوتم نەکا لێرە گوڕوو بگرێ. ئوموولخەیر ئەو چەند دینارەشـــی وەک شـــاباش نارد بۆ گۆرانیبێژەکان. کاتێک دینارەکانی دا بە گۆرانیبێژەکان و زانیان کە ســاختەیە و مســن. ئیدی خانم گوتی: «قەحبە هەڵێ بگە منداڵەکە.» کەنیزە هەڵاتە دەرێ و دیتی نە منداڵ دیارە و نە پیرێژنە. هـاواری کرد و کەوتە عەرزی. شـادییەکەیان لێ بوو بە شـین. لەو جەنگەیەدا شـابەندەر هاتەوە کە

زانی چی ڕووی داوە بە ناڕەحەتی لە ماڵ هاتە دەرێ و کەوتە سـوراغی منداڵەکە هەتا لە دووکانی جووەکە بە ڕووت و ڕەجاڵی دیتییەوە. گوتی: «عوزرە ئەو منداڵە منداڵی منە.» عوزرە گوتی: «بەڵێ منداڵی تۆیە.» شـابەندەر لە خۆشـیان شـاگەشـکە بوو. منداڵەی لە باوەش کرد و هەر لە جلەکانیشـی نەپرسـی. جووە کە زانی شـابەندەر خەریکە کوڕەکەی دەباتەوە، چووە پێشـی. شـابەندەر گوتی: «چییە؟» جووە گوتی: «پیرێژنێک هات بایی هەزار دیناری زێڕ و شـت بردەوە بۆ کچەکەی تۆ و ئەو کوڕەی لێرە دانا و گوتی با ئەو منداڵە لێرە بێ تـا پـارەکەیت بۆ دێنم. ئەگەر ئەو کوڕە نەبـا قەتم ئەو زێڕانە نەدەدایە.» شـابەندەر گوتی: «کچی من پێویسـتی بە زێڕی تۆ نییە. جلەکانی کوڕەکەم دەوە.» جووە دەستی کرد بە هات و هاوار و گوتی: «موسوڵمانینە فریام کەون.»

ئەوان لەوێ مشـت و مڕیان بوو کە ویشـکەڵفرۆش و ڕەنگرێژ و کوڕە بازرگان کە لە پیرێژنە دەگەڕان گەیشـتنێ و لە بازرگان و جووەیان پرسـی: «ئەو کێشـەیەتان لە سـەر چییە؟» ئەوانیش شتەکەیان بۆ گێڕاوە. ڕەنگرێژ و هاوڕێکانی گوتیان: «ئەو پیرێژنە جادوو بازە ئەوە داوی بۆ ئێمەش ناوەتەوە.» ئیدی بەسـەرهاتی خۆیان بۆ گێڕاوە. شـابەندەر گوتی: «ئەمن کوڕەکەم وەگیر کەوتووەتەوە جلەکانیم هەر ناوێ. ئەگەر پیرێژنەشـم دیتەوە ئەوە جلەکانی لێ دەسـتێنمەوە.» شـابەندەر کوڕەکەی بردەوە لای دایکی. دایکی بە دیتنی کوڕەکەی خۆشحاڵ بوو.

جووەکە لەو سـێ کەسـەی پرسـی ئێوە دەچن بۆ کوێ؟ ئەوان گوتیان ئێمە لە پیرێژنە دەگەڕێین. جووەکە گوتی: «من دەیناسـمەوە. بەڵام وا چاکە هەموو بە یەکەوە نەگەڕێین هەر یەکی بە لایەکدا دەڕۆین و لە دووکانی حاجی مەسـعوودی دەللاکی مەغریبی یەکتر دەبینینەوە. ئەوان هەر یەکی بە لایەکدا بڵاو بوونەوە و پیرێژنەش لەولاوە هاتبوو دەرێ بۆ پیلانێکی دیکە. ویشکەڵفرۆش چاوی پێی کەوت و ناسییەوە و چوو پێشی پێ گرت. پیرێژن گوتی: «چیت لێم دەوێ؟» ویشـکەڵفرۆش گوتی: «گوێدرێژەکەم دەوێتەوە.» پیرێژن گوتی: «گوێـدرێژەکەتم بەو دەللاکە مەغریبییە سـپـاردووە. لێرە بە ئەوە دەچم پێی دەڵێم گوێدرێژەکەت بداتەوە.»

ویشـکەڵفرۆش لەوێ ڕاوەسـتا و پیرێژنە چوو بۆ لای مەغریبی و دەسـتی ماچ کرد و دەسـتی کرد بە گریان. دەللاکە مەغریبییەکە گوتی: «بۆ دەگری دایە چی بووە؟» پیرێژنە گوتی: « وەسـتا گیان بە قوربانت بم ئەو کوڕەم ئەقڵی تێک چووە و قسـە دەپەڕێنێ هەڵدەستێ دەڵێ گوێدرێژەکەم دەوە. دادەنیشێ دەڵێ گوێدرێژەکەم دەوە. بردمە لای حەکیم دەڵێ دوو ددانی بۆ بکێشـن و تەوێڵی لە دوو جێوە داغ کەن چـاک دەبێتەوە. ئەتۆ ئەو دینـارەم لێ وەرگرە و بـانگی کە لای خۆت و بڵێ وەر گوێـدرێژەکەت لە لای منە. مەغریبییەکە گوتی: «هەر ئێستا جێبەجێی دەکەم و گوێدرێژەکەی لە مستی دەنێم.» دەللاک

دوو خزمەتکاری زەلام و بەخووەی هەبوو. بە یەکیانی گوت: «بچووە دوو بزماری ئاسن لە سەر ئاگرەکە سوور کەوە.» ئیجا بۆ خۆی بانگی ویشکەڵفرۆشەکەی کرد و گوتی: «کاکە، گوێدرێژەکەت لێرەیە وەرە بتدەمەوە.» کە ویشکەڵفرۆشەکە هاتە پێشێ، دەلاکە مەغرىبییەکە گرتی و بردییەوە ساردراوێکی تاریکەوە و مستێکی لێدا لە سەر زەوی تخێلی کرد. ئەوجار دەست و قاچی شەتەک دا. دەلاکەکە دوو ددانی کێشا و لە دوو جێوە تەوێڵی داغ کرد. ئەوجار بەرەلای کرد. ویشکەڵفرۆش گوتی: «مەغرىبیی ئەوە بۆ وات لێ کردم؟» دەلاک گوتی: «دایکت گوتی: ئەو کورەم، ئەقڵی تێکەڵی کردووە و لە جێی خۆی نییە. قسە دەپەڕێنێ هەڵدەستێ دەڵێ گوێدرێژەکەم دەوێتەوە. دانیشێ دەڵێ گوێدرێژەکەم دەوێتەوە. ئەوە گوێدرێژەکەت بوو دامییەوە.» ویشکەڵفرۆش گوتی: «خودا تۆڵەی ئەو زوڵمەت لێ دەکاتەوە وا لە منت کرد.» مەغرىبیی گوتی: «جا ئەمن بە قسەی دایکت وام لێ کردی.» ئیدی بۆی گێڕاوە کە چی پێ گوتبوو. ویشکەڵفرۆش گوتی: «خودا حەقی ئێمە لەو پیرێژنە بستێنێتەوە.» دوای ئەوە مەغرىبیی کە گەڕاوە دووکانەکەی سەیری کرد دووکان هیچی تێدا نەماوە. باقڵ پیرێژنە کە ئەوان بە ویشکەڵفرۆشەکەوە سەرقاڵ دەکا، گسک لە دووکان دەدا و ئەوەی بە کەڵکت دێ لەگەڵ خۆی دەیبا و دەڕوا. مەغرىبیی کە زانی دووکانەکەی تاڵان کراوە، ئاوقای ویشکەڵفرۆش بوو و یەخەی گرت. گوتی: «کوا دایکت، دایکتم بۆ پەیدا کە.» ویشکەڵفرۆش گوتی: «ئەو دایکی من نییە.» ئەوە پیرێژنێکی جادووبازە و داوی بۆ زۆرکەس ناوەتەوە. گوێدرێژەکەی منیش ئەو بردوویە.» ئەوان لەو قسانەدا بوون کە ڕەنگرێژ و جووە و کورە بازرگانیش گەیشتنێ. سەیریان کرد مەغرىبیی یەخەی ویشکەڵفرۆشی گرتووە و ویشکەڵفرۆشیش ناوچەوانی داغ کراوە. گوتیان ئەوە چی بووە؟ ویشکەڵفرۆش ڕووداوەکەی بۆ گێڕانەوە و مەغرىبیش هەر گێڕایەوە. ئیدی ئەوانیش گوتیان ئەوە ئەو جادووبازە کڵاوی لە سەر ئێمەش ناوە. ئیدی ئەوانیش بەسەرهاتی خۆیان بۆ مەغرىبی گێڕاوە. مەغرىبیی دەرگای دووکانی گاڵە دا و لەگەڵ ئەوان چوو بۆ لای والی. بە والییان گوت: «ئێمە ماڵەکەی خۆمان لە تۆ دەوێتەوە.» والی گوتی: «ئەو شارە پڕە لە پیرێژن و گەلۆ کەستان ئەو پیرێژنە دەناسێتەوە؟» ویشکەڵفرۆش گوتی: «ئەمن دەیناسمەوە. بەڵام دەبێ دە دانە خزمەتکاری خۆتم لەگەڵ بخەی.» ئیدی ویشکەڵفرۆش لەگەڵ دە دانە لە پیاوەکانی والی وەدەر کەوتن و هاوڕێکانیشی بە دوایاندا ڕۆیشتن. دەستیان کرد بە گەڕان بە دوای پیرێژنەدا. وا بوو لە پڕدا پیرێژنەی سەر ئاسنین پەیدا بوو. ویشکەڵفرۆش و پیاوەکانی والی پیرێژنەیان گرت و بردیان بۆ لای والی. لە بن دیوارەکەی ماڵی والی ڕایان گرت تا والی بێتە دەرێ. پیاوەکانی والی ئەوەندە ماندوو بوون. خەویان لێ کەوت. پیرێژنەش خۆی لە خەو دا. ویشکەڵفرۆشیش لەگەڵ هاوڕێکانی پاش ئیستێک خەویان لێ کەوت. پیرێژنە کە زانی هەموویان خەویان لێ کەوتووە، هەستا چوو بۆ لای ژنی والی و دەستی ماچ کرد و پێی گوت: «والی لە کوێیە؟» ژنە وەڵامی داوە:

«والی خەوتووە. چ کارێکت پێیەتی؟» پیرێژنە گوتی: «مێردەکەم کۆیلە فرۆشـــە و پێنج کۆیلەی داوە بە خۆم بیفرۆشم. بۆخۆی چووە بۆ سەفەر. والی کە منی دیت بە هەزار دینار کۆیلەکانی لێ کڕیم و دوو سەعات دیناریشی حەقدەست بۆ من دانا و پێی گوتم بیانهێنە بۆ ماڵی ئێمە. ئێستا ئەوە کۆیلەکانم هێناوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! پیرێژنە هەر وا خەریکی هەڵخەڵەتاندنی ژنی والی بوو. لەو قسانەی بۆ دەکرد. ڕێکەوت وا بوو لەو جەنگەیەدا والی هەزار دیناری زێڕی لە لای ژنەکەی دانابوو. گوتبووی بە تەمام کۆیلەی پێ بکڕم. خێزانی والی کە ئەو قسانەی لە پیرێژنە بیست وەیزانی ڕاستە. ئیدی لە پیرێژنەی پرسی: «کۆیلەکان لە کوێن؟» پیرێژنە گوتی: «ئەوەتان لە بەر دەرگا خەوتوون. ماندوو بوون.» ژنی والی لە پەنجەرەوە سەرێکی کێشا دەرێ، مەغربی و ویشکەڵفرۆش و کوڕەبازرگان و ڕەنگرێژ و جووەی دیت لەوێ خەوتبوون. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەوانە کۆیلەی چاکن یەکی هەزار دینار زیاتریش دێنن.» لەڕێوە دەرکی سندووقی کردەوە و هەزار دینارەکەی کە والی لە لای دانابوو، دای بە پیرێژنە و گوتی: «بڕۆ. ئەگەر والیش هەستا دوو سەد دینارەکەی لێ وەردەگرم. ئەگەر هاتییەوە دەتدەمێ.» پیرێژنە گوتی: «خانم، لەو دووسەد دینارە سەدی بە سەر کەنیزەکاندا دابەش بکە و سەدەکەی دیکە با لە لای خۆت بێ هەتا دێمەوە.» دوای ئەوە گوتی: «خانم، زەحمەت نەبێ لە دەرگای پشتەوە بەڕێم کە.» ژنی والی فەرمانی دا و ئەویان لە دەرگای پشتەوە بەڕێ کرد و بە لەز خۆی گەیاندەوە لای کچەکەی. کچە بە دایکی گوت: «دایە چیت کرد؟» دایکی وڵامی داوە: «فێڵێکم ساز کرد و هەزار دینارم لە ژنی والی وەرگرت. ویشکەڵفرۆش و جوولەکەکە و ڕەنگرێژ و کوڕە بازرگان و دەللاکەکەشم پێ فرۆشت. بەڵام یەک شت هەیە، من تەنیا نیگەرانی ویشکەڵفرۆشەکەم ئەو من دەناسێتەوە.» کچە گوتی: «دایە، بەسسە دانیشە، دەست هەڵگرە. [فما كل مرّة تسلم الجرة] واتە هەر ئاوات بۆ ناچێتە سەرێ.» جارێ دایک و کچ بەجێ دێڵین و دەچینەوە لای والی.

کە والی لە خەو هەستا خێزانی پێی گوت: «کۆیلەکانیشت مەبارەک بێ، وەڵا کۆیلەی چاکن.» والی گوتی: «کۆیلەی چی؟» ژنەکەی گوتی: «ئەو پێنج کۆیلەیەی لە پیرێژنەکەت کڕیوە. بۆ لێم دەشارییەوە؟ ئەگەر خودا پێی خۆش بێ ئەوانیش وەک تۆ دەکاتە خاوەن پلە و پایە.» والی گوتی: «باوەڕ بکە من کۆیلەم نەکڕیوە. کێ شتی وای پێ گوتووی؟» ژنە گوتی: «ئەو پیرێژنە دەڵاڵەی کە قیمەتی کۆیلەکەکانت لەگەڵ بڕیبووەوە و قەولت پێدابوو هەزار دیناری نرخی کۆیلەکان و دووسەد دیناریشی دەستخۆشانە بدەیەی!» والی گوتی: «خۆ هیچت نەداوەتێ؟» ژنە گوتی: «بەڕێوە وەڵا، چووم چاوم لە کۆیلەکان کرد و هەزار دینارەکەی لە لای منت دانابوو، دام بەو.» والی لەڕێوە هەڵاتە دەرێ. سەیری کرد جووە و ویشکەڵفرۆش و ڕەنگرێژ و کوڕە بازرگان و دەللاکە مەغرببیەکە لەوێ بوون. لە نۆکەر و دەستوپێوەندەکەی پرسی ئەو پێنج کۆیلەیەی کە لە پیرێژنەکەمان کڕی لە کوێن؟» پیاوەکانی والی گوتیان: «جگە لەو پێنج کەسەی کە پیرێژنەکەیان گرتبوو کەسی دیکەمان

لێرە نەدیوە. ئەو پیرێژنەش دوای ئەوەی ئێمە خەوتبووین چوو بووە ژووری بۆ حەرەمسەرا.» والی گوتی: «ئەوە فرۆفێڵێکی گەورەیە بەڵام بۆ بۆخۆی دەیدۆڕێنێ.» پێنج کەسەکە گوتیان کە ئێمە شتەکانی خۆمان لە تۆ دەویتەوە. والی گوتی: «پیرێژنە ئێوەی بە هەزار دینار بە من فرۆشتووە.» ئەوانیش گوتیان بەڕێز والی ئێمە سەربەخۆین و بە پێی شەرع کەس بۆی نییە ئێمە بکڕێ یان بفرۆشێتەوە. وەرە با بچین بۆ لای خەلیفەش. والی وڵامی دانەوە: «ئێوە ماڵی منتان پێشانی پیرێژنە داوە و ئەمن ئێوە بە هەزار دینار دەفرۆشمەوە.

ئەوان لەوێ خەریکی دمبەدمە بوون کە ئەمیر حەسەن شەڕولتەریق گەڕاوە و ژنەکەی خۆی بە ڕووت و ڕەجاڵی دیت و ژنەکەی ئەمیر هەموو شتێکی بۆ ئەمیر گێڕاوە. ئەمیر حەسەن گوتی: «ئەمن جگە لە والی کەسی دیکە ناناسم و لەوم دەوێتەوە. لەڕێوە هەستا چوو بۆ ماڵی والی. کە چاوی بە والی کەوت پێی گوت: «ئەوە تۆ پیرێژنانت فێر کردووە بە ماڵاندا بگەڕێن و چاوی خەڵک ببەستن و دەستی خەڵک ببڕن؟ ئەوەت لێ ڕوون بێ کە من زێڕەکانی خێزانم هەر لە تۆ دەوێتەوە و کارم بە کەس نییە.» ئەوجار ڕووی لە پێنج کەسەکەی دیکە کرد و گوتی :«ئێوە بۆ لێرەن؟» ئەوانیش تەواوی ڕووداوەکەیان بۆ گێڕاوە. ئەمیر حەسەن پێی گوتن: «ئێوە مافتان زەوت کراوە.» ئینجا ڕووی لە والی کرد و گوتی: «ئەو فەقیرانەت بۆ گرتووە؟» والی گوتی: «ئەوانە پیرێژنەیان هێناوەتە ماڵە من.» ئەوان بە ئەمیر حەسەنیان گوت: «تۆ پارێزەری ئێمە بە.»

والی بە ئەمیری گوت: «ئەمن ماڵی هەمووتان دەدەمەوە هەر پێم بڵێن کامتان ئەو پیرێژنە دەناسن؟» هەموویان گوتیان ئێمە دەیناسین. والی دە کەسی لە پیاوەکانی لەگەڵ خستن. ویشکەڵفرۆش بە پیاوەکانی والی گوت: «ئێوە بە دوای مندا وەرن ئەمن بە چاوە شین بووەکانیدا دەیناسمەوە.»

وا بوو ئەوان کەوتنە ڕێ و هەرکە گەیشتنە یەکەم گەڕەک پیرێژنەیان دیت. خێرا گرتیان و بردیان بۆ ماڵی والی. والی کە چاوی پێی کەوت، پێی گوت: «ماڵی ئەو خەڵکە بێنەوە.» پیرێژنە گوتی: «من نەکەسم دیوە و نە ماڵی کەسیشم بردووە.» والی دەستووری دا بیخەنە بەندەوە تا بەیانی. بەندیوانەکە گوتی: «ئەمن ناوێرم وەستۆی گرم. پەندێکم بە سەر دێنێ.» والی لە ڕێوە سواری ئەسپ بوو، پیرێژنەی لەگەڵ پیاوەکانی برد بۆ قەراغ دیجلە و بە جەللادەکەی گوت، پیرێژنەی بە پرچی هەڵواسن. جەللادەکە هەڵیواسی و دە کەسی وەک نۆبەدار لە لا دانا. دوای ئەوە والی گەڕاوە ماڵێ. کە بوو بە شەو نۆبەدارەکان شەکەت بوون و خەو بە سەریاندا زاڵ بوو. ڕێکەوت وا بوو کابرایەکی دەشتەکی گوێی لێ دەبێ، دووکەس پێکەوە قسە دەکەن یەکیان بەوی دیکە دەڵێ لە بەغدا بووم زولوبیا و هەنگوینم خوارد ئاوا و ئاوا خۆش بوو. کابرای دەشتەکەی کە گوێی لەو قسەیە دەبێ دەڵێ وەڵا

دەچم بۆ نێو شـــار هەتا هەنگوین و زولوبیا نەخۆم نایەمەوە. ســـەیر لەوەدا بوو ئەو ڕەوەندەیە قەتی بەغدا نەدیبوو و قەتیشـــی زولوبیا و هەنگوین نەخواردبوو. ئیدی لەڕێوە سواری ئەسپ بوو، بەرەو بەغدا کەوتە ڕێ و لە بەر خۆیەوە هەر دەشی گوت: «خواردنی هەنگوین و زولوبیا باشە و بەڵێنم داوە هەر زولوبیا و هەنگوین بخۆم.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەوسەد و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! دەشتەکی هەر دەڕۆیشت و لە بەر خۆیەوە ئەو قسانەی دەکرد. هەتا گەیشتە لای پیرێژنەکە. پیرێژنە گوێی لە قسەکانی ئەو بوو. زانی ئەوە نە قەتی بەغدا دیوە و نە قەتی زولوبیا خواردووە و پیاوێکی ڕەوەندە و دەشتەکییە بە ئەسپاییەکی بانگی کرد و گوتی: «کاکی عەرەب، فریام کەوە.» دەشتەکی گوتی: «خودا فریات کەوێ، ئەتۆ کێی و بۆ هەڵیان هاوەسیوی؟» پیرێژنە گوتی: «نەیارێکم هەیە زولوبیا دروست دەکا. ئەمن بە لای دووکانەکەیدا تێدەپەڕیم، تفم کردەوە. تفەکەم کەوتە مەنجەڵەکەوە. ئەو پیاوە لە لای حاکم شکایەتی لێ کردم و داوای کرد لە دارم دەن. پاشان گوتی ئەگەر دە ڕیتڵ خورما و زولوبیا بخوا ئازادی دەکەم. ئەگەر نەشی خۆم هەڵی داوەسم. هەتا دەمرێ با بە حەواوە بێ. ئەمنیش لە شیرنی بێزارم و ئیشتیام نایبا. ئیدی نازانم چیم بە سەر دێ؟» دەشتەکەی گوتی: «ئەمن لە تاوی زولوبیا و هەنگوین کەس و کارم بەجێ هێشتووە. خەمت نەبێ ئەمن لە جیاتی تۆ هەمووی دەخۆم.» پیرێژنە گوتی: «خۆ ئاوا نایدەن بە کەس مەگین لە جیاتی من لێرە هەڵواسرابێ.» بەو جۆرە عەرەبە دەشتەکییەی فریو دا و لە جێگای خۆی هەڵی واسی. جلەکانی ئەوی لە بەر کرد، پێچەکەی ئەوی لە سەری کرد. سواری ئەسپەکەی ئەو بوو، وەک بەرزەکی بانان خۆی دەرباز کرد و چووەوە لای کچەکەی. کچەکەی کە چاوی پێی کەوت لێی پرسی: «ئەوە چییە بۆ وات کردووە؟ ئەو جل و سیپالانەت لە کوێ بوو؟» دایکی دەستی کرد بە گێڕانەوەی ڕووداوەکە. با ئەو ڕووداوەکەی بۆ بگێڕێتەوە.

نۆبەدارەکان کە وەخەر هاتن، سەیریان کرد تاو هەڵاتووە. یەکێک لە نۆبەدارەکان هەرای هەڵواسراوەکەی کرد و گوتی: «بخۆ پوور پەتک، بۆڵە بۆڵ مەکە. گۆڕی گیانت بێ.» عەرەبە دەشتەکییەکە گوتی: «بە خودا ئەمن پڕپۆڵە ناخۆم، زولوبیا و هەنگوینتان هێناوە یان نا؟» نۆبەدارەکان تەماشایان کرد ئەوە عەرەبێکی ڕەوەندە بە دارەکەوە هەڵواسراوە. لێیان پرسی: ڕەوەندە ئەی ئەوە پیرێژنەکە چی لێهات؟ عەرەبە گوتی: «من لە دارەکەم کردەوە، چونکە ئەو شیرینی پێ نەدەکەوت و ئیشتیای نەدەچووە زولوبیا و هەنگوین.» نۆبەدارەکان زانیان کابرا پیرێژنەی نەناسیوە و ئەویشی فریو داوە. ئیدی زۆر ترسان و گوتیان ئێستا ئێمە هەڵێین یان لێرە دانیشین. لەو فکر و قسانەدا بوون، والی لەگەڵ کۆمەڵێک لە دەستوپێوەندەکانی گەیشتنێ. کە دابەزین والی بە نۆبەدارەکانی گوت: «بچن ئەو پیرێژنەی بێنن.» دەشتەکی هەر دەیگوت ئەمن پڕپۆڵە ناخۆم، هەنگوین و زولوبیاکەم بۆ بێنن.» والی سەری بۆ لای دارەکە وەرگێڕا سەیری کرد ئەوە دەشتەکییەک لە جێی پیرێژنەکە بە حەواوەیە. نۆبەدارەکان زمانیان تێک ئاڵا و کەوتنە مینگە مینگ و ناچار ڕووداوەکەیان بۆ والی گێڕاوە. والی گوتی: «لە ڕێی خودادا کارم بە ئێوە نییە ئەو

پیرێژنە زۆر جادووبازە و چاوبەستە.» عەرەبە رەوەندەکەیان لە دارەکە کردەوە. رەوەندە بەربینگی بە والی گرت و گوتی: «من ئەسپ و جلوبەرگ و پێچەکەم دەوێتەوە. والی گوتی: «ئەتۆ بۆ وات لێ هاتووە؟» رەوەندە بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕاوە. والی زۆری پێ سەیر بوو. ئینجا لە کابرای پرسی باشە بۆ ئەو پیرێژنەت لە دارەکە کردەوە؟ رەوەندە گوتی: «خۆ من نەمدەزانی ئەو پیرێژنە فێڵبازە و بە دەهۆیە. ئەوجار ئەو خەڵکەی کە پیرێژنە هەڵیفریواندبوون رووبان لە والی کرد و گوتیان ئێمە پیرێژنەمان دا بە تۆ و بە تۆمان سپاردبوو. ئێستا دەبێ بچین بۆ لای خەلیفە دادمان بستێنێ. حەسەن شەڕولتەریق لە دیوانی خەلیفە دانیشتبوو چاوەڕێی والی بوو، کە والی و دەشتەکییەکە و ئەو پێنج کەسەی دیکە چوونە دیوان و داوایان لە خەلیفە کرد دادیان بستێنێ. خەلیفە گوتی: «کێ حەقی ئێوەی خواردووە؟» هەر کام لەوان بەسەرهاتی خۆی بۆ خەلیفە گێڕاوە. والی گوتی: «خەلیفە ئەو قەڵتاخە کۆنە منیشی هەڵفریواند و ئەو پێنج کەسە کە ئازادیشن، بە منی فرۆشت و هەزار دیناریشی لێ ئەستاندم. خەلیفە گوتی: «ئەمن ماڵی هەمووتان دەدەمەوە بەس دەبێ ئەو پیرێژنەم بۆ بگرن و بۆم بێنن.» والی لە رێوە شیرەکەی لە قەدی کردەوە و گوتی: «من لە دوای ئەوەی بەو حاڵە گرتم و لە دارم دا و ئەو فێڵەی لەو رەوەندەیە کرد. قەتم پێ ناگیرێ.» خەلیفە گوتی: «ئەی من بە کێ بڵێم بۆم بگرێ؟» والی گوتی: «بە ئەحمەد دەنەف بڵێ بیگرێ. مانگێ هەزار دینار لە خەلیفە وەر دەگرێ. چل و یەک لاتی لە بەر دەستی دایە کە یەکی مانگێ سەد دیناری بۆ بڕیونەوە.» ئیدی خەلیفە فەرمانی دا ئەحمەد دەنەفیان بانگ کرد. خەلیفە پێی گوت: «لە تۆم دەوێ ئەو پیرێژنەم بۆ ببینییەوە و بیهێنییە ئێرە.» ئەحمەد دەنەف قەبووڵی کرد. خەلیفە دەشتەکییەکە و ئەو پێنج کەسەی لە لای خۆی ڕاگرت.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەحمەد دەنەف کە بەڵێنی بە خەلیفە دا ئەو پیرێژنە ببینێتەوە، هەستا وەدەر کەوت. داروودەستەکەی و حەسەن شوومان لێی کۆ بوونەوە. ئەحمەد تەواوی ئەو ڕووداوانەی بۆ گێڕانە و پێی گوتن ئەو شارە پیرێژنی زۆر تێدایە بە ڕای ئێوە ئەو پیرێژنە چۆن ببینینەوە؟ یەکێک لە ژێردەستەکانی ئەحمەد کە نێوی عەلی ملکەڵ[1] بوو بە ئەحمەدی گوت: «ئەتۆ بۆ لەگەڵ حەسەن شوومان ڕاوێژ دەکەی؟» حەسەن شوومان گوتی: «عەلی، چۆن ڕێ بە خۆت دەدەی من بە کەم بزانی؟ بە نێوی گەورەی خودا، هەر کارتان لەگەڵ ناکەم.» دوای ئەوە ئیدی هەستا. ئەحمەد دەنەف ڕووی لە داروودەستەکەی کرد و گوتی: «هەر دە کەستان بچنە گەڕەکێک و لەو پیرێژنە بگەڕێن. عەلی ملکەڵ بە خۆی و بە دە کەسەوە ڕۆیشت. پێش ئەوەی بڵاوەی بکەن گوتیان لە فلان جێ یەکتر ببینینەوە. لە نێو شاردا بڵاو بووەوە کە ئەحمەد دەنەف بە دوای گرتنی پیرێژنە چاوبەستەکەوەیە.

زێنەب بە دایکی گوت: «دایە ئەگەر خۆت بە زیرەک دەزانی و دەڵێی کڵاوی عیسا لە سەر مووسا دەنێی، کڵاوێک لە سەر ئەحمەد دەنەف بنێ. پیرێژنە گوتی: «کچم من لە حەسەن شوومان نەبێ لە کەس ناترسم.» زێنەب گوتی: «بەو پرچانەم سوێندت بۆ دەخۆم، جلی چڵ و یەک گەوەند و ڕێکرت بۆ دێنم.» ئیدی لەڕێوە هەستا جلوبەرگی گرانبایی لە بەر کرد و ڕووپۆشی داداوە و چوو بۆ لای عەتارێک. ئەو عەتارە خانوویەکی دوو ڕووپەڕی هەبوو. دەرگاشی بە سەر هەردووک کۆڵانەکەدا بوو. دینارێکی دا بە عەتارەکە و پێی گوت: «ئەورۆ ئەو خانووەم بە کرێ بدەیە.» عەتار کلیلی خانووەکەی دایە. زێنەب گەڕاوە ماڵێ فەرشی لە گوێدرێژەکەی ویشکەڵفرۆش دا و بردی بۆ ئەو ماڵە. فەرشی ڕاخست و سفرەی بە خواردەمەنی و شەراب ڕازاندەوە. بە ڕوویەکی خۆشەوە لە بەر دەرگا ڕاوەستا. لەو جەنگەیەدا عەلی ملکەڵ لەگەڵ داروودەستەکەی بەوێدا هاتن. زێنەب چووە پێشێ و دەستی ماچ کرد. عەلی سەیری کرد کچێکی جوان و لەبەر دڵانە گوتی: «چیت دەوێ.» زێنەب گوتی: «ئەتۆ ئەحمەد دەنەفی؟» عەلی گوتی: «نا، ئەمن پیاوی ئەوم. بە شوێن ئەو پیرێژنە جادووبازەدا دەگەڕێم کە قۆڵی تەواوی خەڵکی بڕیوە. پێم بڵێ تۆ کێی و بۆ لێرە ڕاوەستاوی؟» زێنەب گوتی: «باوکی من لە موسڵ شەرابفرۆش بوو. کاتێک مرد ماڵێکی زۆری لە پاش بەجێ ما. ئەمن لە ترسی بەرپرسانی موسڵ هاتمە ئێرە. لێرە پرسیارم کرد، بڵێی لەو شارەدا کێ ئاگای لە من بێ و داشداریم بکا. گوتیان جگە لە ئەحمەد دەنەف کەس پێی ناکرێ.» عەلی گوتی: «پیاوەکانیشی دەتوانن ئاگایان لە تۆ بێ.»

---

[1]. ئەوە لە دەقە فارسییەکەدا ناوی علی کتف الجمل ـە.

ئیدی زێنەب گوتی: «زۆر باشـــە کەوایە لەبەر دڵی من پارووپەک نان بخۆن و قومێک ئاو بخۆنەوە.» ئیدی ئەوان قســـەی زێنەبیان نەشـــکاند و چوونە ژووری. نانیان خوارد و خەریکی شـــەراب خواردنەوە بوون کە زێنەب بەنگی بۆ لە پیاڵەکان کرد و هەموویانی بێهۆش کرد. جلەکانی داکەندن. پیاوەکانی دیکەی ئەحمەد دەنەف بە کۆڵانـدا هـاتن و ئەوانیشی بەو دەردە برد. هەتا سەرە گەیشتە ئەحمەد دەنەف. ئەحمەد دەنەف زۆر گەڕابوو پیرێژنەی نەدیتبووەوە. تووشـی پیاوەکانیشـی هەر نەبوو. وا بوو ڕێی کەوتە ئەو کۆڵانە و گەیشتە لای کچە. زێنەب چووە پێش و دەستی ماچ کرد. ناز و کرێشمەی زێنەب کاری لە دڵی کرد. زێنەب پێی گوت: «تۆ کێی؟» گوتی: «من ئەحمەد دەنەفم.» زێنەب گوتی: «ئەمن غەریبم و لە موسڵەوە هاتووم. باوکم بادەفرۆش بوو. کە مرد ماڵێکی زۆری لە پاش بەجێ ما. ئەمن لە ترسـی بەرپرسـانی ئەو شـارە هاتوومە ئێرە و لێرە بادەفرشـیم داناوە. والی پێتاکی خستووەتە سەر من. پێم خۆشە لە ژێر باڵی تۆدا بم و ئاگات لێم بێ ئەو ماڵەش بۆ تۆ باشـــترە.» ئەحمەد دەنەف گوتی: «هیچ مەدە بە والی، ئێمە دەبێ ئاگامان لە تۆ بێ.» زێنەب گوتی: «لەبەر دڵی من فەرموو پارووپەکم نـان لەگەڵ بخۆ. ئەحمەد دەنەف چووە ژووری. نانی خوارد و شەرابی خواردەوە. بەو جۆرە کچە ئەویشی بێهۆش کرد و جلەکانی لە بەر داکەند. تەواوی جلەکانی لە کەرەکەی ویشـــکەڵفرۆش و ئەســـپەکەی ڕەوەندە دا و عەلی ملکەڵی وەهۆش هێناوە و لێیدا ڕۆیشت.

که عەلی وەهۆش هاتەوە، ســـەیری خۆی و هاوڕێکانی کرد. هەموویان ڕووتن. ئەحمەد دەنەف و هاوڕێکانی وەهۆش هێناوە. کە ئەوانیش خۆیان بە ڕووتی دیت، ئەحمەد دەنەف گوتی: «هاوڕێیان، چ باسە ئێمە لە پیرێژنەی جادووباز دەگەڕاین بیگرین، کەچی کەوتووینە داوی قەحبەیەکەوە. خۆزگە حەسەن شوومانمان لەگەڵ دەبوو. ئێستا دەبێ ڕاوەستین ببێ بە شەو و تاریک دابێ، جا بڕۆینەوە. ئەوان ئاوایان بە سەر هات.

حەســـەن شـــوومـانیش شـــەو هـاتەوە بنکەکەیـان، هـاوڕێکانی لە بنکە نەبوون. لە دەرکەوانەکەی پرســـی: «ئەوە لە کوێن؟» لەو جەنگەیەدا بە ڕووتی پەیدا بوون. حەســـەن گوتی:

هەر کەس بێ ڕاوێژ هەنگـاوێـک بنێ
تـیـرێـکە و بە تـاریـکـیـیەوەی دەنـێ
نەمـامـێـک بـێ ڕاوێـژ بـچەقـێـنـێ
هەر بەری بـێ مـرادی دەبـیـنـێ

دوای ئەوە لێی پرسـین: «ئەوە کێ ئەتکی کردوون؟» گوتیان: «ئێمە گرتنی پیرێژنەمان

وەستۆ گرت و کچێک ڕووتی کردین.» حەسەن شوومان گوتی: «وەی دەستی خۆش بێ، وای لێ کردن.» گوتیان: «حەسەن بۆ تۆ دەیناسی؟» حەسەن گوتی: «ئەویش و پیرێژنەش دەناسم.» گوتیان: «ئەی چی جوابی خەلیفە بدەینەوە؟» شوومان گوتی: «دەنەف تۆ لە لای خەلیفە دانی پێدا بنێ کە بۆت ناگیرێ و بڵێ من نایناسم. ئەو کارە بە حەسەن شوومان بسپێرە.» ئەو شەوە خەوتن. بەیانی هەستان چوونە دیوانی خەلیفە و کڕنۆشیان برد. خەلیفە گوتی: «ها ئەحمەد چیت کرد؟ کوا پیرێژنە؟» ئەحمەد لەڕێوە شیرەکەی لە قەدی کردەوە و گوتی: «ئەمن پیرێژنەکە ناناسم. ئەگەر دەکرێ حەسەن شوومان ڕاسپێرێ، چونکە ئەو پیرێژنە و کچەکەی دەناسێ. شتێکیش هەیە ئەو پیرێژنە بۆ دزی ئەو کارانە ناکا. ئەو هەر دەیهەوێ توانایی گێرەشێوێنی خۆی و کچەکەی پێشانی خەلیفە بدات. هەتا خەلیفە ئەو بخاتە شوێن و پێگەی مێردەکەی لە کاروباری دەرباردا.» وا بوو حەسەن شوومان بەڵێنی دا پیرێژنە بگرێ و داواشی کرد لە کوشتنی خۆش بێ. خەلیفە گوتی: «بە گۆڕی باپیرانم، ئەگەر ئەو پیرێژنە ماڵی خەڵک بداتەوە ئەمن لێی خۆش دەبم و قسەی حەسەن ناشکێنم.» ئیدی خەلیفە دەسرەیەکی وەک گفت و بەڵێن دا بە حەسەن و ناردی بە دوای پیرێژنەدا. حەسەن چوو بۆ ماڵی پیرێژنە و هەرای پیرێژنەی کرد. کچەکەی بە دەنگییەوە هات. حەسەن گوتی: «دایکت لە کوێیە، پێی بڵێ بێ بچین بۆ لای خەلیفە و شتەکانی خەڵک بدەوە. پێشی بڵێ نەترسێ خەلیفە دەسرەی گفت و بەڵێنی داومێ لێی خۆش دەبێ و نایکوژێ. ئەگەر نەیەتە دەرێ ئەوە دەکوژرێ و نابێ گلەیی لە کەسیش بکا. پیرێژنە لەڕێوە هاتە دەرێ و شتی خەڵکەکەی لە گوێدرێژی ویشکەڵفرۆش و ئەسپی ڕەوەندەکە دا. حەسەن شوومان پێی گوت: «جلوبەرگەکانی ئەحمەد دەنەف و دارودەستەکەیت لە بیر چوو.» پیرێژنە گوتی: «بە گەورەیی خودا ئەمن ئەوانم ڕووت نەکردووە.» حەسەن گوتی: «ڕاست دەکەی ئەوە فێڵ و کەڵەکی زێنەبی کچتە.» ئیدی حەسەن و پیرێژنە چوون بۆ لای خەلیفە. حەسەن چوو ئەو شتانەی پیرێژنە لەو خەڵکەی ستاندبوو لە پێش خەلیفە دا. خەلیفە کە ئەوانەی دیت دەستووری دا پیرێژنە بۆ هەتا بخەنە بەندەوە. پیرێژنە هاواری لێ هەستا و گوتی: «شوومان، تۆ بەڵێنت دا بمپارێزی.» حەسەن شوومان خۆی بە سەر کەوشەکانی خەلیفە دادا و گوتی: «خەلیفە تۆ داڵدەت دا و بەڵێن بوو لێی خۆش بی.» خەلیفە گوتی: «ئەوە ئەو جارەش بە تۆم بەخشی.» ئیدی ڕووی لە پیرێژنە کرد و لێی پرسی: «نێوت چییە؟» پیرێژنە وڵامی داوە گوتی: «ناوم دەلیلەیە.» خەلیفە گوتی: «تۆ موحتالەی.» واتە، تۆ چاوبەستی ئیدی ناویان نا دەلیلەی موحتالە واتە دەلیلە چاوبەست. دوای ئەوە خەلیفە پرسی: «پێم بڵێ بۆ ئەو کارانەت دەکرد.» دەلیلە گوتی: «خەلیفە ئەمن ئەو کارانەم بۆ تەماع و ماڵی دنیا نەدەکرد بەڵام کە بیستمەوە ئەحمەد دەنەف و حەسەن شوومان چۆن چاوی خەڵک دەبەستن و دەست و گوێبڕی دەکەن. ئەمنیش ویستم بڵێم کە منیش دەتوانم لەوان نەمێنمەوە و توانایی خۆم

پێشان بدەم. لەو جەنگەیەدا ویشکەڵفرۆش هاواری لێ بەرز بووەوە و گوتی: «باشە تۆ بۆ بە کەرەکەمەوە نەوەســـــتای و بە مەغرببیت گوت، ددانەکانم دەرێنێ و ناوچەوانم داغم بکا؟»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتایی پێ هات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی حەوسەد و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کە ویشکەڵفرۆش داوای حەقی خۆی کرد باسی ئەو زوڵمەی کرد لێی کرابوو، خەلیفە سەد دیناری زێڕی خوێنبایی دادانی دایە. سەد دیناریشی هەقی خومرە و سوێنە و شتەکەی دا بە ڕەنگرێژە تا دووکانەکەی ئاوەدان کاتەوە. ئەوان دۆعایان بۆ خەلیفە کرد و ڕۆیشتنەوە. کابرای ڕەوەندەش جلەکانی و ئەسپەکەی وەرگرتەوە و سواری بوو، لە بەر خۆیەوە گوتی: «ژنەکە تازە لە من حەرام بێ ئەگەر بێمەوە بەغدا بۆ خواردنی زولوبیا و هەنگوین.» و لێی دا ڕۆیشت. ئەوجار خەلیفە بە پیرێژنەی گوت: «داوایەکم لێ بکە.» دەلیلەی چاوبەست گوتی: «باوکم کۆتری نامەبەری ڕادێنا و مێردەکەشم لە بەغدا سەرهەنگ بوو. ئەمن تکام ئەوەیە جێگەی باوکم بدەن بە من و جێگەی مێردەکەشم بدەن بە کچەکەم.» خەلیفە داواکەی جێبەجێ کرد. دوای ئەوە پیرێژنە بە خەلیفەی گوت: «دەرکەوانی کاروانسەراش بە من بسپێرن. [خەلیفە کاروانسەرایەکی دروست کردبوو سێ دەرگای بوو. چل پاسەوان و چل گەماڵی شێرخنکێنی بۆ تەرخان کردبوو. ئەو گەماڵانەشی لە وڵاتی سولەیمانییەوە هێنابوو. هەموویان تۆقی زێڕیان لە ملیدا بوو. کوڕێکی گەنجی چێشتلێنەر لەو کاروانسەرایەدا، چێشتی بۆ پاسەوان و گەماڵەکان ساز دەکرد. خەلیفە گوتی: «دەلیلە بەڵێنییەکم بۆ بنووسە کە ئەگەر هاتوو کاروانسەرا شتێکی لێ بێ تۆ وڵامدەر و بەرپرس بی.» دەلیلە گوتی: «باشە بە چاوان، بەڵام ڕێ بدە با کچەکەم لە دیوێکی کاروانسەرا بێ و کۆتر پەروەدە بکا.» خەلیفە قایل بوو. پیرێژنە زێنەبی کچی بردە دیوێکی کاروانسەرا و چل کۆتری نامەبەری پێ سپارد.

زێنەبیش جلەکانی ئەو چل کەسە گەڕباز و گەوەندەی بە جلەکانی ئەحمەد دەنەفیشەوە لەگەڵ خۆی بردە دیوەکەی کاروانسەراوە. خەلیفە پیرێژنە چاوبەستەکەی کردە فەرماندەری ئەو چل کەسە پاسەوانە و ئەمری پێ کردن گوێڕایەڵی بن. دەلیلە لە دالانی کاروانسەرا شوێنێکی بۆ خۆی دیاری کردبوو، لەوێ دادەنیشت. هەموو ڕۆژێ دەچووە دیوانی خەلیفە و ئێوارانیش دەهاتەوە شوێنەکەی خۆی. چل کەسیشی دەکردە چاوەدێر بە سەر کاروانسەراوە. کە دەبوو بە شەو، گەماڵەکانیشی بەر دەدا. تا پاسی کاروانسەرا بکەن. ئەوە کاری دەلیلە بوو.

## چیرۆکی دەلیله و عەلی جیوە[1]

عەلی جیوە یەکێک لە هەرە شەڕفرۆش و گەڕبازەکانی میسر بوو. ئەو زەمان پیاوێک بوو بە نێوی سەلاح میسری. سەلاح فەرماندەی هێزکانی دەربار بوو. چل کەسی لە بەر دەستیدا بوو. سەلاح و داروودەستەکەی زۆریان پلان و گەلاڵە دادەڕشت و داویان بۆ عەلی دەناوە. بەڵام عەلی کوڕێک نەبوو وا بە ئاسانی لە داو کەوێ. زوو دەرباز دەبوو. هەر بۆیە ناویان نابوو جیوە واتە وەک جیوە ڕاوەستانی نییە.

ڕۆژێک عەلی جیوە میسری لەگەڵ هاوڕێکانی دانیشتبوون. هەر لە خۆڕا دڵی گیرا و پەژارە دایگرت. یەکێک لە هاوڕێکانی پێی گوت: «ئەگەر دەزانی وەڕەزی هەستە بچووە لە نێو شاردا کەمێک بگەڕێ با وەڕەزییەکەت بە سەر چێ.» عەلی لەڕێوە هەستا بە قسەی کرد و ڕۆیشتە دەرێ تۆزێک خەمی دڵی سووک کا. ئەوەندەی دەگەڕا زیاتر ناڕەحەت دەبوو هەتا گەیشتە مەیخانەیەک. لە دڵی خۆیدا گوتی: «با بچمە ئەو مەیخانەیە بەشکوو خەمەکەم بڕەوێ.» کە چووە ژووری سەیری کرد ئەوە خەڵکەکە هەموو پۆل پۆل دانیشتوون. بە مەیفرۆشەکەی گوت: «ئەمن پێم خۆشە بە تەنیا دانیشم.» مەیفرۆشە بردی لە سووچێک بە تەنیا داینا. داوای شەرابی کرد و شەرابی بۆ هێنا. ئەوەندەی خواردەوە هەتا تەواو سەرخۆش بوو. بە مەستی لە مەیخانەکە هاتە دەرێ و بە کۆلانەکانی گەڕەکی بەهەشتدا ڕۆیشت هەتا گەیشتە دەروازەی سوور. لەوێ سەقاوێکی دیت ئاوی دەدا بە خەڵک و لە بەر خۆیەوە دەشی گوت: «شەراب نییە لە شەرابی مێوژ چاکتر. ئاوات نییە لە بە یار گەیشتن خۆشتر. لای سەرو بۆ کەس نییە لە زانا و تێگەیشتوان شیاوتر.» عەلی جیوەی میسری پێی گوت: «ئاوم دەیە، سەقاوەکە پەرداخێکی پڕ کرد و داییێ. عەلی جیوە چاوێکی لە پەرداخەکە کرد و ئاوەکەی ڕشت. سەقاوەکە «مەگەر ئاو ناخۆیەوە؟» پەرداخێکی دیکەم بۆ تێکە. سەقاوەکە پەرداخێکی دیکەی بۆ تێ کرد و داییێ. عەلی جیوە پەرداخەکەی لێ وەرگرت و ڕشتی. سێیەمین جاریش هەر وای کرد. سەقاوەکە گوتی: «ئەگەر ئاو ناخۆیەوە با من بڕۆم.» عەلی جیوە گوتی: «یەکی دیکەم بۆ تێکە.» سەقاوەکە یەکی دیکەی بۆ تێ کرد و داییێ. عەلی جیوە ئاوەکەی لێ وەرگرت و خواردییەوە و دینارێکی زێڕی دایە. سەقاوەکە بە سووکی چاوێکی لێ کرد و گوتی: «دەست خۆش کۆیلە.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. علی زیبق: عەلی جیوە.

# که شەوی هەوسەد و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! عەلی جیوە کە دیتی سەقاوەکە ئاوا بە سووکییەوە سەیری دەکا، بۆی گەڕاوە و خەنجەری لێ هەڵکێشا و گوتی: «کاکە نافامێتی جوان قسە بکەی؟ ئەو خێگە ئاوەی تۆ ئەگەر زۆر بێنێ سێ درەم دێنێ، ئەو پەرداخە ئاوانەی من ڕشتم قاپێک نەدەبوو. کەچی ئەمن دینارێکی زێرم دایەی. تۆ بۆ سووکایەتیم پێ دەکەی؟ بۆ کەست لەمن نەترستر و دڵاواتر دیوە؟» سەقاو گوتی: «بەڵێ، ژنان بەردەوام منداڵی ئازا و نەترس و دڵاوایان دەبێ.» عەلی جیوە میسری گوتی: «کێت لە من بدەتر و بوێرتر دیوە؟» سەقاو گوتی: «بەسەرهاتێکی زۆر خۆش دەزانم. دەڵێی بۆت بگێڕمەوە؟» عەلی گوتی: «بیگێڕەوە.»

سەقاو گوتی:«باوکم گەورەی سەقاوەکان بوو. کاتێک فەوتی کرد، پێنج وشتر و یەسترێک و دووکان و ماڵێکی بۆ بەجێ هێشتم. ئەمن لە دڵی خۆمدا گوتم با بچم بۆ مەککە بۆ زیارەت. ئیدی هەستام پێنجسەد دینارم قەرز کرد و وشتر و شتم ساز کرد و بەرەو حیجاز کەوتمە ڕێ. کە گەیشتمە حیجاز زێڕ و وشترەکانم لە دەست چوو. لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئەگەر بگەڕێمەوە میسر خاوەن قەرز بە گرتنم دەدەن.» ئیدی لەگەڵ حاجییەکانی شام کەوتمە ڕێ هەتا گەیشتمە حەڵەب. لە حەڵەبەوە بەرە و بەغدا ڕۆیشتم. لەوێ پرسیاری گەورەی ئاوفرۆشانم کرد. پێشانیان دام. ئەمن چووم بۆ لای و سڵاوم کرد. ئەویش سڵاوەکەی ئەستاندمەوە و هەواڵی پرسیم کێم و لە کوێوە هاتووم. بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕاوە. دیوێکی چووکەی دامێ و تەواوی کەل و پەلی ئاوفرۆشی دامێ. ئەورۆژە لە ناو شاری بەغدادا سووڕامەوە. جامێکم ئاو بۆ کابرایەک ڕاگرت گوتی: «هێشتا هیچم نەخواردووە تا ئاو بخۆمەوە.» ڕووم لە یەکی دیکە نا و گوتی: «خودا ڕزقت بدا.» بەو جۆرە تا نیوەڕۆ گەڕام هیچم وەگیر نەکەوت. لە دڵی خۆمدا گوتم: «خۆزگە نەهاتبام بۆ بەغدا.» لەو فکرەدا بووم، لە پڕدا تاقمێکم دیت بە هەڵەداوان دەڕۆیشتن. ئەمنیش وە دوایان کەوتم. ئاپۆڕەیەکی گەورەم دیت. لە کەسێکم پرسی کە ئەو ئاپۆڕەیە چییە؟ گوتیان ئەوە ئەحمەد دەنەفە داروەدەستەکەی لە شانی دەڕۆن[1]. مانگانە لە لایەن خەلیفەوە هەزار دینار دەدرێ بە ئەحمەد دەنەف و یەکی سەد دیناریش دەدرێ بە پیاوەکانی. حەسەن شوومانیش هەزار دیناری دەدرێتێ. ئێستا ئەوان ئەوە لە دیوان دەگەڕێنەوە، بەرەو ماڵ دەڕۆنەوە. لەو جەنگەیەدا ئەحمەد دەنەف چاوی بە من کەوت داوای پەرداخێک ئاوی کرد. ئەمن پەرداخێکم بۆ پڕ کرد و دامێ. ئەو ئاوەکەی لێ وەرگرتم و ڕشتی. جاری دووەم و جاری سێیەمیش ئاوای کرد. جاری چوارەم وەک تۆ ئاوەکەی لێ وەرگرتم و قومێکی لێ دا و گوتی: «سەقاو

[1]. لە شانی دەڕۆن: لەوشانە و شانی دەڕۆن، گوێبە فەرمانین.

لە کوێوە هاتووی؟» گوتم: «لە میسرەوە.» گوتی: «خودا میسر ئاوەدان و خەڵکەکەشی بپارێزێ. پێم بڵێ بۆ هاتوویە ئێرە؟» ئەمن بەسەرهاتەکەی خۆم بۆ گێڕاوە، پێم گوت کە لە ترسی قەرزداران ناوێرم بچمەوە. ئیدی ئەویش دەستی لە گیرفانی ڕاکرد و پێنج دیناری دامێ و بە هاوڕێکانیشی گوت یەکی دینارێک بدەن بەو سەقاوە. ئەوانیش یەکی دینارێکیان دامێ. ئەوجار ئەحمەد دەنەف گوتی: «کاکە هەتا تۆ ئاو بدەی بە ئێمە ئەوەندە پارەیەت دەدەینێ.» ئیدی بەو شێوەیە جار جار سەرم دەدان و لە نێو شاریشدا دەسووڕامەوە و خەڵکی دیکەش هاوکاریان دەکردم. هەتا بەینێک ئاوام ڕابوارد. ڕۆژێک پارەکەم بژارد هەزار دینارم بوو. لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئەوجار وا چاکە بڕۆمەوە بۆ شارەکەی خۆم.» ئیدی هەستام چووم بۆ ماڵی ئەحمەد دەنەف و دەستیم ماچ کرد. گوتی: «چیت دەوێ.» گوتم: «دەمەوێ بڕۆمەوە بۆ شارەکەی خۆمان و ئەو دوو بەیتەشم بۆ خوێندەوە:

هاتووم بڵێم ماڵی تۆ هەردەم ئاوەدان
غەریب و دەربەدەر بووم و بێ ئاو و نان
دەستت گرتم تۆ، پێی غەریبیت کردمەوە
بەرەو نەمان دەچووم تۆ زیندوت کردمەوە
گەر ڕێم بدەی دەڕۆمە بۆ دیارم
شێت بووم لە سوێی خۆشەویست و کەسوکارم

ئەحمەد دەنەف کە ئەوەی بیست وشترێک و سەد دیناری زێڕی دایە و گوتی: «کاکە پێم بڵێ تۆ خەڵکی میسر دەناسی؟»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و دەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! سەقاو گوتی: «ئەحمەد دەنەف لەمنی پرسی: «عەلی جیوەی میسری دەناسی.» منیش گوتم: «بەڵێ دەیناسم.» گوتی: «ها ئەو نامەیە بگرە و بۆی بەرە. بیدە بە عەلی جیوەی میسری و بڵێ ئەحمەد سڵاوی دەگەیاندی و ئێستا ئەو لە لای خەلیفەیە.» ئەمن نامەکەم لێ وەرگرت و هاتم بۆ میسر. دانە دانە قەرزەکانم داوە و دەستم کردەوە بە ئاوفرۆشی. ئێستاش کە ئێستایە نامەکەم نەداوە بە عەلی جیوە چونکە نازانمماڵەکەی لە کوێیە.

عەلی جیوە گوتی: «کاکە چاو و دڵت ڕوون من عەلی جیوەم.» ئیدی نامەکەی دایە کە نامەکەی هەڵپچڕی و خوێندییەوە ئەو دوو بەیتەی تێدا نووسرابوو:

هەرچەندە تۆش بیرم نەکەی لە بیرت ناکەم
کار و بار بە تۆوە بەندە و لە یادت ناکەم
هەر بژی بە کامەرانی هەرچەندە بێ تۆ
ژیانم پڕ کەند و کڵۆیە و گەندە بێ تۆ

دوای ئەوە نووسیبووی کە ئەحمەد دەنەف سڵاو دەنێرێ بۆ گەورەترین ڕۆڵەی خۆی، واتە عەلی جیوەی میسری و ئاگاداری دەکاتەوە کە پاشقولی سەلاحەددینی میسری داوە و بێ سەروشوێنی کردووە و تەواوی بەردەستەکانی هێناوەتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. بۆ وێنە عەلی ملکەڵ. ئێستا لە دیوانی خەلیفە لە سەرووی وەزیرانیشەوەم. ئەگەر لە سەر قەول و بەڵێنی خۆت ماوی هەستە وەرە بۆ لام. بەشکوو بە بۆنەی نەبەزی و نەترسیتەوە لە خەلیفە نیزیک بیتەوە. ئیتر خۆشیت.»

کاتێک عەلی جیوە نامەکەی خوێندەوە، ماچی کرد و لە سەر سەری دنا. دە دیناری زێڕیشی دا بە بە سەقاوەکە و گەڕاوە ماڵێ. هاوڕێکانی لە ڕووداوەکە ئاگادار کردەوە و پێی گوتن کە ئەوە ئێوەم بە یەکتر سپارد. جلەکانی گۆڕی و جلی سەفەری لە بەر کرد. چەکوچۆڵی پێویستی هەڵگرت. گەورەی بنەماڵەکەیان گوتی: «دەتەوێ بچی بۆ سەفەر؟» جیوە گوتی: «بەڵێ. سەفەر دەکەم.» گوتی: «ئەخە ئازوخە و شتمان لە ئەنباردا نەماوە.» عەلی جیوە گوتی: «هەرکە گەیشتمە شام بژیوتان بۆ بەڕێ دەکەمەوە.» ئەوەی گوت و وەڕێ کەوت. گەیشتە کاروانێک، سەیری کرد شابەندەری بازرگانان لەگەڵ چل دانە بازرگانی دیکە خەریکن باروبنە تێکەوە دەپێچن بڕۆن بۆ سەفەر. بازرگانەکان هەموو باریان لێ دابوو. ساز بوون بڕۆن، بەڵام بارەکانی شابەندەر هەر لە سەر عەرزی

کەوتبوون. چاوی لێ کرد سەرکاروانی شابەندەر کابرایەکی شامییە. ئەو کابرا شامییە داوای لە هەر کەس دەکرد یارمەتی بدا، پێی پێدەکەنی و گاڵتەی پێ دەکرد. عەلی جیوە لە دڵی خۆیدا گوتی: «وا باشە خۆم لەگەڵ ئەو کابرایە یەک بخەم.» عەلی جیوە کوڕێکی جوانچاک و لە بەر دڵان بوو. ئیدی چووە پێشێ و سڵاوی لە کابرا کرد. کابرا گوتی: «چیت دەوێ؟» عەلی جیوە گوتی: «مامە گیان، دەڵێی بە تەنیایت و چل باریشت پێیە. ئەوە بۆ کەست لەگەڵ خۆت نەهێناوە یارمەتیت بدا؟» کابرا گوتی: «دوو کوڕم بە کرێ گرت و جلوبەرگی باشم دانێ و یەکی دوو سەد دیناری زێڕیشم دانێ، کەچی تا دەرەوەی شارم لەگەڵ هاتن و ڕایان کرد.» عەلی جیوە لێی پرسی: «دەچی بۆ کوێ؟» کابرا گوتی: «بەرەو حەڵەب دەچم.» عەلی جیوە گوتی: «ئەمن تا حەڵەب لەگەڵت دەبم و یارمەتیت دەدەم.» ئیدی بوون بە هاوڕێ و بارەکانیان لە وشتران نا و وەڕێ کەوتن. کابرای شامی بە هاوڕێیەتی عەلی خۆشحاڵ بوو. کەوتە بەر دڵی هەتا بوو بە شەو. لە شوێنێک باریان خست و خواردیان و خواردیانەوە. کە کاتی خەو هات، عەلی لە سەر تەنیشت درێژ بوو، خۆی لە خەو کرد. کابرای شامی لە نیزیک عەلی خەوت. عەلی هەستا و چووە لەو لاوە خەوت. کابرای شامی بەدم خەوەوە خۆی تلاندەوە ویستی عەلی لە باوەش بگرێ. سەیری کرد لەوێ نەماوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ڕەنگە قەولی بە کەسێکی دیکە دابێ و ئەوشەو چووبێ لە لای ئەو خەوتبێ. بۆ شەوێکی دیکە ناهێڵم بچێ بۆ هیچ کوێ و لەگەڵ خۆم دەیخەوێنم. عەلی جیوە هەتا لای بەیانی لە جێی خۆی خەوت و لای بەیانی چووەوە لای کابرای شامی خەوت. کاتێک شامییەکە لە خەو هەستا. تەماشای کرد عەلی جیوە لە پەنای خەوتووە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەگەر لێی پرسم دوێشەو لە کوێ خەوتبووی لێم دەتۆرێ و دەڕوا. وا چاکە هیچی پێ نەڵێم.

ئیدی عەلی جیوە ئاوا بەردەوام فریوی دەدا هەتا گەیشتنە بێشەڵانێک. لەو بێشەڵانەدا شێرێکی تێدابوو. هەر کاتێک کاروان دەگەیشتە ئەوێ، پشکیان داویشت. وەبەر هەرکەس کەوتبا دەیانهاویشتە پێش ئەو شێرە و ئیدی کاری پێیان نەدەبوو.

قسمەت وابوو پشکیان هاویشت و قورعە بە نێوی شابەندەری بازرگان دەرکەوت. شابەندەر زۆر ناڕەحەت بوو، بە کابرای شامی گوت: «خێر لەو سەفەرەت نەبینی. هەموو ئی سەرونەشەمەی تۆ بوو، ئەمن ئاوام لێ بەسەر هات. بەڵام تکایەکت لێ دەکەم، ئەوە وەسێت بێ کە دوای من بارەکانم بگەیەنە دەست منداڵەکانم.» عەلی جیوە گوتی: «ئەوە چی بووە دا منیش تێگەیەنن؟» شتەکەیان بۆ باس کرد. گوتی: «بۆ لە پشیلەیەکی کێوی دەترسن؟ ئەمن بۆتان دەکووژم.» شابەندەر گوتی: «ئەگەر تۆ ئەو شێرە بکووژی من هەزار دینارت دەدەمێ.» بازرگانەکانی دیکەش بەڵێنیان دا بیدەنێ. عەلی جیوە هەستا دەستی دا چەکوچۆڵی پێویست و بۆ شێرەکە چوو. ڕمبێکی پۆڵای پێ بوو لە سەر شانی

ڕایگرت و لە شێرەکە خوڕی. شێرە هێرشی بۆ هێنا. ڕمبەکەی هاویشتێ و نەیگرت. کە ڕمبەکە نەیگرت شیرێکی داهێنایە و دوو لەتی کرد. کابرای شامی و بازرگانەکان واقیان وڕ مابوو. شابەندەر هەستا لە باوەشی گرت و ناوچەوانی ماچ کرد و هەزار دیناری زێڕی دایە. هەرکام لە بازرگانەکان یەکی بیست دیناری زێڕیان دایە. عەلی جیوە تەواوی زێڕەکانی بە شابەندەر سپارد.

ئەوە شەوە خەوتن و بەیانی بەرەو بەغدا ڕۆیشتن. گەیشتنە ناوچەیەک کە مەڵبەندی شێران و واری سەگانیان پێ دەگوت. کابرایەکی ڕەوەندەی لێ بوو بە هۆز و عەشیرەیەکی زۆرەوە ڕێگری دەکرد و کاریان جەردەیی بوو. ئەو کابرایە بە پیاوەکانییەوە ڕێی پێ گرتن. پیاوەکان هەڵاتن و دەستیان کرد بە هات و هاوار. لەو جەنگەیەدا عەلی جیوە بەرەنگاریان بووەوە و سوارێکیانی لێ خستن و لە سەر زەوی تخێڵ بوو. ئیدی سواری ئەسپەکەی ئەو بوو، یەکی دیکەیان هێرشی بۆ هێنا کە عەلی هێندە لێزانانە ڕمبێکی ئاوقا کرد کە لە سنیگی درا و لە بڕبڕەی پشتی هاتەوە دەرێ. چەتەکان کە ئەوەیان دیت ڕایان کرد. عەلی جیوە سەیری یەکیانی بڕی و بانگی بازرگانەکانی کرد: بگەڕێنەوە ڕێگرەکان تارومار بوون. بازرگانەکان گەڕانەوە وماڵێکی زۆریان پێشکەشی عەلی جیوە کرد و دۆعای بەخێریان بۆ کرد. ئیدی ڕۆیشتن تا گەیشتنە بەغدا. لە بەغدا عەلی میسری ماڵەکەی لە شابەندەر وەرگرتەوە و دای بە کابرای شامی و پێی گوت ئەگەر چوویەوە ئەو ماڵەی بدە سەرۆکی هۆزەکەمان.

ئەو شەوە خەوتن و بەیانی عەلی هەستا چوو بۆ ناو شار تا ماڵی ئەحمەد دەنەف ببینێتەوە. هێندێک منداڵ کایەیان دەکرد، منداڵێکیان تێدا بوو ناوی ئەحمەد بیژوو[1] بوو. عەلی جیوە گوتی: «قسەی ڕاست، دەبێ لە منداڵانی ببیستی.» بە ڕێکەوت هەڵوا فرۆشییەک لەوێ بوو. کەمێکی هەڵوا کڕی و بانگی منداڵەکانی کرد. ئەحمەد بیژوو دەنگی منداڵەکانی دا و دووری خستنەوە. بۆخۆی چووە پێشێ و بە عەلی جیوەی گوت: «چیت دەوێ؟» عەلی وڵامی داوە و گوتی: «ئەمن کوڕێکم بوو، مرد. لە خەونمدا داوای هەڵوای لێ دەکردم. هەر بۆیە ئەو هەڵوایەم کڕی هەتا بە سەر منداڵەکاندا دابەشی بکەم. ئەوجار نەختێکی هەڵوا دا بە ئەحمەد بیژوو. ئەحمەد سەیری کرد دینارێک بە هەڵواکەوە نووساوە. ئەحمەد بیژوو هەڵواکەی داوە و گوتی: «بڕۆ ئەمن قەحبەم لە لا نییە تا گەوادیت بۆ بکەم. ئەگەر پرسیارێکت هەیە، بیکە.»

عەلی جیوە گوتی: «ڕۆڵە گیان من لە ماڵی ئەحمەد دەنەف دەگەڕێم. ئەتۆ ئەو دینارەم لێ وەرگرە و ماڵەکەیانم پێشان بدە.» منداڵەکە گوتی: «ئەوە من لە پێشەوە دەڕۆم و تۆش

---

[1]. احمد لقیط: ئەحمەد بیژوو.

به دوامدا وەرە هەتا دەگەمە بەر دەرگای ماڵی ئەحمەد دەنەف. لەوێ بە لاق لە بەردێک دەدەم و بە دەرگای ماڵی ئەحمەد دەنەفی دادەم. بۆخۆت بزانە.» ئیدی منداڵەکە لە پێشەوە ڕۆیشت و عەلی جیوە بە دوایدا. ڕۆیشتن هەتا منداڵەکە ڕاوەستا و بە لاق نووکە شەقێکی لە بەردێک دا و هاویشتییە ماڵی ئەحمەد دەنەفەوە. عەلی جیوە ماڵەکەیانی هەڵنا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی حەوسەد و یازدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! کاتێک عەلی جیوە بە ماڵەکەیانی زانی، منداڵەکەی گرت و ویســـتی دینارەکەی لێ بســـتێنێتەوە، نەیتوانی. ئەوجار پێی گوت: «برۆ تۆ بەڕاســـتی، ژیر و بوێری. هەرکە لە لایەن خەلیفەوە پلەم بدرێتێ دەتکەم بە پیاوی خۆم.» منداڵە ڕۆیشـــــت و عەلی جیوە لە دەرگای دا. ئەحمەد دەنەف گوتی: «دەرکەوان بیکەوە عەلی میسـرییە.» دەرکەوان دەرگای کردەوە و عەلی جیوە چووە ژووری و ســـــڵاوی لە ئەحمەد دەنەف کرد. ئەحمەد لەبەری هەســـتی و لە ئامێزی گرت. کەوایەکی بە شـــانی دادا و گوتی: «کاتێک خەلیفە ئەو پلە و پایەی دا بە من. خەڵاتی بۆ پیاوەکانیشـــــم دانا. منیش ئەوەم بۆ تۆ هەڵگرت. ئیدی بردییە لای سەرەوە و داینیشاند. ناردی خواردەمەنی و شەرابیان هێنا و دەستیان کرد بە بادەخواردنەوە هەتا بەیانی.

ئەحمەد دەنەف بە عەلی گوت: «کوڕە نەچی لە ماڵێ بچییە دەرێ. بەغدا وەک میســـــر نییە و ناوندی خەلافەتە. پڕە لە لات و بەڕەڵا.» عەلی ســــێ ڕۆژان لە ماڵ نەهاتە دەرێ. ئەحمەد دەنەف پێی گوت: «بە تەمام بتبەم بۆ لای خەلیفە با جل و جیرەی مانگانەت بۆ ببڕێتەوە، بزانم کەی کاتی دەبێ.»

ڕۆژێک ئەحمەد دەنەف عەلی میســـری بە تەنیا لە ماڵێ بەجێ هێشـــت و چووە دەرێ. ئەویش دڵی گیرا و وەڕەز بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: «با بچم لە بەغدادا خولێک لێدەم. بەشک و وەڕەزیم بەسەر بچێ.» ئیدی هەستا وەدەر کەوت. کۆڵان بە کۆڵان ڕۆیشت هەتا گەیشتە بازاڕ. چووە قاوەخانەیەک نانی قاوەڵتی خوارد و هاتە دەرێ دەستی بشوا. لە پڕدا چاوی بە چل کەسی پۆڵاپۆش کەوت، دەڕۆیشتن و دەلیلە چاوبەستیش لە دواوە بە سواری یەســـترێکەوە، کڵاوزرێ لەســـــەر و زێڕێی پۆڵا لە بەردا. لە دیوانی خەلیفە گەڕابوونەوە و دەڕۆیشـــتنەوە بۆ کاروانســـەرا. دەلیلە کە چاوی بە عەلی میسـری کەوت، بە بەژن و باڵا و قەڵافەتیدا وەک ئەحمەد دەنەفی هاتە بەر چاو. نەترسی و ئازایەتی لە سیمایدا دیار بوو. کە گەیشـــتنەوە کاروانســـــەرا چووە لای زێنەبی کچی. لەڕێوە داوای تەختەبەختی کرد. بەختی ئەو کوڕەی گرتەوە. ســـەیری کرد، ناوی عەلییە و ئەســـتێرەی بەختی لە ئەســـتێرەی بەختی خۆی و کچەکەی درەوشــــاوەترە. زێنەب گوتی: «دایە بەو فاڵەدا چیت بۆ وەدەر کەوت؟» دەلیلە گوتی: «کچم، ئەوڕۆ کوڕێکم دیت وەک ئەحمەد دەنەف دەچوو. دەترســـم ئەو کوڕە ببیســـتێتەوە کە تۆ ئەحمەد دەنەف و ئەوانت ڕووت و کردووە. ئەودەم بێتە کاروانســـەرا و گیڕەیەکمان تێ بهاڵێنێ. پێم وایە لە ماڵی ئەحمەد دەنەفیشە. زێنەب گوتی: «دایە ئەو قسانە چییە بۆ وا دەڵێی؟ پێم وا بێ لێی ترساوی.»

ئیدی زێنەب هەستا، جلی و بەرگی جوانی لە بەر کرد و چوو بۆ نێو شار. بە نێو شاردا دەگەڕا و هەرکەس دەی دیت شێت و شەیدای چاو برۆ و سەر و بسک و بەژن و باڵای دەبوو. خۆیان بە قوربان دەکرد و ئەویش بە نازەوە دەڕۆیشـــت. هەتا لە دوور چاوی قەلافەت و شان و باهۆی عەلی جیوەی میسری کەوت. کە بەرەوڕووی دەهات. کە گەیشتە ڕاستی دەستێکی لە شانی عەلی دا و گوتی: «خودا ئاشقان ڕاوەستاو کا.» عەلی جیوە گوتی: «چەند جوانی پێم بڵێ ژنی کێی؟» زێنەب گوتی: «ئی گەوجێکی وەک تۆم.» عەلی جیوە گوتی: «مێردت هەیە؟» زێنەب گوتی: «ئەرێ هەمە.» عەلی جیوە گوتی: «ئەتۆ دێیە لای من یان من بێمە لای تۆ؟» زێنەب گوتی: «ئەمن کچە بازرگانم و مێردەکەشم بازرگانە. قەت نایەمە دەرێ. ئەوڕۆش بۆیە هاتم چێشـتم لێ نابوو، بە تەنیا تاقەتم نەبوو نان بخۆم. ئیدی هاتمە دەرێ. ئەوە تووشـی تۆ بووم و کارت لە دڵم کرد. کەوتییە بەر دڵم، دەکرێ دڵم نەشـکێنی و لەگەڵ بێی چێشـتەکەم لەگەڵ بخۆی؟» عەلی گوتی: «کاتێک بانگهێشـتت دەکەن، وا جوانە قەبووڵی کەی.» ئیدی کچە ڕۆیشت و عەلی جیوەیش کۆلانە و کۆلان وە دوای کەوت.

عەلی جیوە بە خۆی گوت: «ئەتۆ لەو شـارەدا غەوارەی، ئەوە هاتوو تووشـی بەلایەک بووی. وا چاکە ئەو ئافرەتە لە کۆڵ خۆت کەیەوە. ئیدی دینارێکی دەر هێنا و دای بە زێنەب و گوتی: «ئەو دینارەم لێ وەرگرە و کاتێکی دیکەم بۆ دیاری بکە دێم.» زێنەب گوتی: «بە گەورەیی خودا دەسـتت لێ هەڵناگرم. تازە دەبێ هەر ئێستا لەگەڵم بێی. عەلی جیوە ناچار وە دوای کەوت. زێنەب گەیشـتە بەرد دەرگایەک. دەرگاکە داخرابوو. بە عەلی جیوەی گوت ئەو قفڵە هەڵگرە. عەلی گوتی: «کوا کلیلەکەی؟» زێنەب گوتی: «کلیلەکەی بزر بووە.» عەلی گوتی: «هەرکەس دەرکی داخراو بکاتەوە گوناکارە و لە لایەن حاکمەوە سـزا دەدرێ. من بەبێ کلیل دەرگا ناتوانم بکەمەوە.» ئیدی زێنەب چارشێوەکەی لە سەری کردەوە و ڕووی وەک مانگی وەدەر خست و ئاگری لە دڵی عەلی بەردا. سووچێکی چارشـێوەکەی خستە سـەر قفڵەکە و نێوی دایکی مووسـای بە سـەر قوفڵەکدا خوێند. قوفڵەکە بۆخۆی کراوە. زێنەب چووە ژوورێ. عەلی جیوەیش بە دوایدا چووە ژوورێ. سـەیری کرد ئەوە شـیر و چەکی پۆلا هەڵواسراوە. ئەوجار زێنەب چارشێوی لەو لا دانا و هات لە لای دانیشت.

عەلی جیوە بە خۆی گوت: «ئەوە ڕزقێکە و خودا بۆ نـاردووی دەبێ بیخۆی. ئیـدی سـەری بردە پێشـێ ماچێکی بکا. زێنەب بە لەپی دوو دەسـتی دموچاوی گرت و گوتی: «هەتا شەو زۆر خۆش نییە.» ئیدی هەستا و سفرەی ڕاخست و خواردن و شەرابی دانا. خواردیـان و خواردیانەوە. دوای ئەوە چوو جەڕەکە لە چاڵەکە پڕ کرد لە ئـاو هێنـای بە دەستی عەلی جیوەیدا کرد و ئەویش دەستی شوشت. زێنەب چوو جەڕەکەی پڕ کاتەوە، لە پڕدا زێنەب دەستی کرد بە زیقە زیق و هات و هاوار و بە سـەر سـەرخۆ دادان و سنگ و

بەرۆک پچڕین. دەیگوت: «ئەنگوســـتیلەکەم، ئەنگوســـتیلەکە لێ لە چاڵاوەکە کەوت. ئەتۆ بچووە ئەو لاوە ئەمن خۆم ڕووت دەکەمەوە دەچم ئەنگوســـتیلەکە دەر دێنمەوە.» عەلی گوتی: «بۆ من جوان نییە ئەمن لێرە بم و ئەتۆ بچییە خوارێ. لەڕێوە عەلی جیوە جلەکانی داکەند و گوریســی لە ناوقەدی بەســت و چوو لە چاڵەکەوە. زێنەب گوتی: «ئەو گوریســە کورتە. گوریســەکە لە خۆت کەوە بچووە خوارێ.» عەلی جیوە گوریســەکەی کردەوە و ڕۆیشت لە ئاوەکەوە. زێنەبیش چارشێوی بە سەری دادا و دەستی دا جلەکانی عەلی جیوە و چووەوە بۆ لای دایکی.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و دوازدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! زێنەب جلەکانی عەلی هەڵگرت و خۆی گەیاندە دایکی و گوتی: «دایە ئەو کوڕەم ڕووت کردەوە و لە ماڵی ئەمیر حەسەن لە چاڵم هاویشت و ئێستا ڕەنگە تەواو بووبێ.»

لەو جەنگەیەدا ئەمیر حەســـەن لە دیوانی خەلیفە بوو. کە چووەوە ماڵێ، ســـەیری کرد دەرگا کراوەتەوە. بانگی خزمەتکارەکەی کرد لێی پرسی: «ئەو دەرگایەت بۆ دانەخستووە؟» گوتی: «گەورەم بە خودا بۆخۆم دام خست. ئەمیر چووە ژوورێ. کەس لە ژوورێ نەبوو. هەموو شـــتێکیش لە ســـەر جێی خۆی بوو. ئەوجار بە خزمەتکارەکەی گوت: «بچووە مەســـینەیەکم ئاو بۆ بێنە با دەســـتنوێژەکەم بشـــۆم.» خزمەتکارە دۆڵچەکەی لە بیرەکە ڕۆهێشتە خوارێ. کە دۆڵچەکەی هەڵکێشـاوە، بە دەستییەوە قورس بوو. کە سەری کێشـا چاوی لە ناو بیرەکە کرد شـــتێکی زەلامی تێدا دیت. گوریســـەی فرێ دا و هەڵات بۆ لای ئەمیر. گوتی: «گەورەم دێوێک لە ناو بیرەکە دایە.» ئەمیر حەســـەن گوتی: «بڕۆ چوار قورئـانخوێن بێنە قورئـانی لە ســـەر بخوێنن بـا بڕوا بەلای کـاری خۆیەوە.» کە قورئانخوێنەکان هاتن. ئەمیر حەسەن پێی گوتن: «بچنە دەوری ئەو بیرە و قورئان بەسەر ئەو دێوەدا بخوێنن.» ئەوجار خزمەتکارەکان دۆڵچەکەیان ڕۆهێشـــتەوە. عەلی میســـری دەســـتی بە گوریســـەکەوە گرت. هەڵیان کێشـا سـەرێ. کە هاتە سـەرێ سـەیریان کرد. دەسـتیان گرت و هاتە دەرێ. لە نێو فەقێکان دانیشت. ئەمیر حەسـەن سـەیری کرد مرۆڤە. لێی پرسی: «تۆ دزی؟» عەلی میسری گوتی: «ناوەڵا.» ئەمیر گوتی: «ئەی بۆ چووی لەو بیرەوە؟» عەلی میسـری گوتی: «دوێشـەو شـەیتانی بووم، چووم لە دیجلە مەلە بکەم. کە چووم لە ئاوەکەوە، ئاوەکە بردمی و هێنامییە ئەو بیرەوە.» ئەمیر حەســـەن گوتی: «درۆ مەکە و ڕاستی بڵێ.» ئیدی عەلی میسری تەواوی ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە. ئەمیر حەسەن دەستێک جلی کۆنی دایە و دەری کرد. عەلی جیوە چووەوە ماڵی ئەحمەد دەنەف و تەواوی بەســـەرهاتەکەی بۆیش گێڕاوە. ئەحمەد دەنەف گوتی: «پێم نەگوتی بەغدا ژنگەلێکی لێیە پیاوان فریو دەدەن و ئەتکیان دەکەن.» عەلی ملکەڵ گوتی: «وەڵا ســـەیرە جا چۆن کچێک فەرماندەیەکی میسری ڕووت کردوەتەوە.» عەلی جیوە ئەو قسەیەی لە دڵی گران هات. لە کارەکەی خۆی زۆر پەشـــیمان بووەوە. ئەحمەد دەنەف کەوایەکی دیکەی دایە. دوای ئەوە حەسـەن شـوومان بە عەلی میسـری گوت: «گەلۆ تۆ ئەو کچە دەناسـی؟» عەلی میسـری گوتی: «ناوەڵڵا، نایناسم.» حەسەن گوتی: «ئەوە زێنەبی کچی دەلیلەی چاوبەستە.» عەلی، وادیارە ئەو کچە جلوبەرگی کەســـانی زۆر گەورەتر لە ژێردەســـتانی ئەوی بردووە. عەلی میسری گوتی: «ئەوە بۆ ئێوە شوورەییە کە کچێک ئاو لەو خەڵکە بکا.» حەسەن شوومان

گوتی: «مەبەسـتت چییە؟» عەلی میسـری گوتی: «بە تەمام زەماوەندی لەگەڵ بکەم.» حەسـەن شـوومان گوتی: «ئەو فکرەی لە سـەرت دەرهاوێ. کاری وا ئاسـتەمە.» عەلی میسری گوتی: «شوومان من هەر دەبێ زەماوەندی لەگەڵ بکەم، پێم بڵێ دەبێ چی بکەم.» شـوومان گوتی: «ئەگەر تۆ بە گوێم بکەی و چیت پێ دەڵێم ئاوا بکەی، ئەوە بە ئامانجت دەگەیەنم.» عەلی میسـری گوتی: «لە قسـەت دەرناچم.» ئیدی شـوومان بە علی گوت: «جلەکانت داکەنە.» عەلی جلەکانی داکەند. شـوومانیش مەنجەڵێکی وەسـەر ئاو نا. شـتێکی وەک قیری تێدا کوڵاند. کە کەمێک سـار بووەوە لە گیانی عەلی هەڵسـوو. عەلی وەک قولی لێ هات. لێو و سەر کوڵم شتی تەواو ڕەش کرد. چاوی بۆ ڕشت. جلی قولەڕەشانی لە بەر کرد. کردی بە قولەڕەشـێکی تەواو. کەباب و شـەرابی دایە و پێی گوت: «لە کاروانسـەرا کۆیلەیەکی لێیە، چێشـتلێنەرە. ئێسـتا تۆ دروسـت وەک ئەوت لێ هاتووە. هەستە بچووە بۆ لای. وەک ڕەشـەکان بە نەرمی قسـەی لەگەڵ بکە و پێی بڵێ لە مێژە لەگەڵ کەسـی خۆمان دانەنیشـتووم و بووزەم[1] نەخواردووەتەوە. ئەویش پێت دەڵێ من کارم هەیە و پێم ناکرێ. بەرپرسایەتی سازکردنی چێشتی چل کەسم لە ئەستۆیە. تێرکردنی گەماڵەکانم لە ئەستۆیە. دەبێ سـفرە بۆ زێنەب و دەلیلەش بەرم. تۆ پێی بڵێ وەرە جا کەباب دەخۆین و بووزە دەخۆینەوە. بانگی کە شـوێنێک و لەوێ ئەوەندەی پووزە دەرخوارد دە هەتا مەست دەبێ. کە مەبست بوو، لێی پرسە چی لێ دەنێ و چەند جۆر چێشت لێ دەنێ. شەوی پێشوو چی لێ ناوە. لە بارەی جۆری خواردنەکان و شلەکان پرسیاری لێ بکە. لێی پرسە کلیلەکان لە کوێ دادەنێ. بە مەسـتی ڕاسـتی تەواوی ئەوانەت پێ دەڵێ. دوای ئەوە بێهۆشـی بکە و جلەکانی لە بەر کە. بەرهەڵبێنەکە لە خۆت دە و وێردەکان لە لاقەدت بدە. دوایە دەسـت دە قرتاڵە و بچووە لە بازاڕ گۆشت و سەوزی بکڕە بگەڕێوە چێشتخانە. شۆرباوەکەی لێ نێ و بیبە بۆ دەلیلە. بەنگ لە چێشـتەکە بکە با گەماڵ و کۆیلە و دەلیلە و کچە هەموویان بێهۆش بن. ئینجـا بچووە دیوەکەی زێنەب و تەواوی جلەکـان بێنە. ئەگەریش دەتهەوێ لەگەڵ زێنەب زەماوەند بکەی ئەوە هەموو کۆترە نامەبەرەکانیش لەگەڵ خۆت بێنە.» عەلی جیوە لەڕێوە هەسـتا چوو بۆ کاروانسـەرا و سـڵاوی لە کۆیلە چێشـتلێنەرە کرد. کۆیلەکە سـڵاوەکەی ئەسـتاندەوە و بەخێرهاتنی کرد. ئینجا عەلی گوتی: «لەمێژە لەگەڵ کەسـی خۆمان دانەنیشـتووم بە دڵی خۆم کەبابێک بخۆم، بووزەیەک بخۆمەوە. غوڵامەکە گوتی: «ئەوە خەریکی ئامادەکردنی چێشـتم. عەلی میسـری بە قسـەی خۆش و نەرم ڕازی کرد. تاوێک لەگەڵی دانیشـێ و پاورێکی نان لەگەڵ بخوا. بەو جۆرە بردی مەسـتی کرد و پرسیاری هەموو شتێکی لێ کرد. ئەویش وڵامی داوە کە هەموو ڕۆژێ بەیانیان پێنج جۆر، دوانیوەڕۆیان پێنج جۆر خواردن سـاز دەکەم. دوێنێ جۆرێکیان لێم ویسـت کە چێشـتی

---

[1] بووزە: شەرابێکە لە ئارد و برینج و گەنم و چێو دروست دەبێ.

«دەنکە هەنار»ی پێ دەڵێن.» عەلی میسری لێی پرسی: «لە پێشدا سفرە بۆ کێ دەبەی؟» چێشـــتلێنەر وڵامی داوە: «لە پێش هەموویاندا بۆ زێنەب و پاشـــان بۆ دەلیلەی دەبەم. کە ئەوان نانیان خوارد، نان بۆ کۆیلەکان دادەنێم و دوای ئەوانیش سـەگەکان تێر دەکەم. هەر سـەگەی ڕیتلێکی بۆ داوێم. عەلی میسـری تەواوی ئەو پرسـیارانەی لێ کرد. سـەیر لەوەدا بوو، لە بیری چوو لێی پرســی کلیلەکان لە کوێ دادەنێ. ئیدی بیهۆشـی کرد و جلەکانی لە بەر داکەند و لە بەری کردن. قرتاڵەکەی هەڵگرت و چوو بۆ بازاڕ گۆشت و سەوزی کڕی.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی حەوسەد و سێزدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! عەلی میسری قرتاڵەی هەڵگرت و چوو لە بازاڕ گۆشت و سەوزی کڕی و گەڕاوە کاروانسەر. هەر چووە ژووری، تووشی دەلیلە بوو. دەلیلە چاوبەست هەرکە چاوی پێی کەوت ناسییەوە و پێی گوت: «هۆی سەرۆکی دزان بگەڕێوە. دەتهەوێ کڵاو لە سەر من بنێی؟» عەلی میسری لە بیچم و ڕواڵەتی کۆیلە چێشتلێنەرەکەدا ڕووی لە دەلیلە کرد و گوتی: «خانم ئەو قسانە چن؟» دەلیلە گوتی: «ڕاستی بڵێ کۆیلە چێشتلێنەرەکەت کوشتووە یان بێهۆشت کردووە؟» عەلی میسری گوتی: «چێشتلێنەری چی؟ مەگە ئێرە جگە من چێشتلێنەری دیکەشی لێیە؟» دەلیلە گوتی: «خۆتم لێ لاڕێ مەکە تۆ عەلی جیوەی میسری.» عەلی میسری بە زمانی ڕەشەکان وڵامی داوە میسریان ڕەشن یانی سپی؟ خۆ من لە مێژە لە خزمەت تۆ دام.»

کۆیلەکانی دیکە هەموو پێکەوە گوتیان ئەو ئامۆزای ئێمە. دەلیلە گوتی: «ئەو لە ئێوە نییە و ئەوە عەلی جیوەی میسرییە. وادیارە ئەو ئامۆزاکەی ئێوەی کوشتووە یان بێهۆشی کردووە.» ئەوان گوتیان نەخێر خانم ئەوە ئامۆزاکەی ئێمە. دەلیلە گوتی: «ئەوە عەلی جیوەی میسرییە و پێستی خۆی ڕەشت کردووە.» عەلی جیوە گوتی: «خانم، عەلی جیوەی میسری کێیە، من سەعدوڵلای چێشتلێنەرم.» دەلیلە گوتی: «ئەمن دەرمانێکم هەیە ئەگەر لێی دەم ڕەشاییەکەی دەبا. وەر با تاقی کەمەوە.» ڕۆنەکەی هێنا و کەمێکی لە مەچەکی هەڵسوو، کەچی هیچی لێ نەکرد. کۆیلەکان گوتیان خانم لە سەعدوڵلای ئامۆزامان گەڕێ با بڕوا چێشتەکەمان بۆ لێنێ. دەلیلە پێی گوتن: «ئەگەر ئەو سەعدوڵلا بێ دەزانێ دوێشەو داوای چیتان لێ کرد و دەشزانێ کە ڕۆژێ چەند جۆرتان خواردن بۆ لێ دەنێ.» ئیدی ئەوان جۆری خواردنەکانیان لێ پرسی. ئەویش باسی پێنج جۆر خواردنەکەی بۆ کردن و گوتی: «دوێشەو داوای چێشتی دەنکە هەنارتان کرد.» کۆیلەکان گوتیان: خانم ڕاست دەکا. دەلیلە گوتی: «ئێوە لەگەڵی بچن ئەگەر بە چێشتخانەکە بزانێ ئەوە هەوە. دەنا بیکووژن.»

باش بوو، چێشتلێنەرەکە پشیلەیەکی بوو، کاتێک چێشتلێنەرەکە دەهات بچێ بۆ چێشتخانە دەچوو لە بەر دەرگاکەی هەڵدەتروشکا. لە دوور کە چاوی بە چێشتلێنەرە دەکەوت بەرەو پیری دەچوو. پێی هەڵدەگەڕا و دەچووە سەر شانی. ئەوجاریش وەک ڕۆژان کە عەلی جیوە وەڕێ کەوت بەرەو پیری هات و چووە سەر شانی. عەلی پاڵێکی پێوە نا و بەریداوە. ئیدی پیشلەکە ڕاست هەڵات بۆ چێشتخانەکە. عەلی جیوە بە پشیلەکەدا زانی ئەوێ چێشتخانەیە. چوو بۆ ئەوێ. لەوێ بە ڕێکەوت چاوی بە شوێنی کلیلەکان کەوت. کلیلەکانی هێنا و دەرکی چێشتخانەکەی کردەوە. کۆیلەکان گەڕانەوە لای دەلیلە و

گوتیان بۆخۆیەتی چونکە ئەگەر ئەوە لە ئێمە نەبایە شوێن و جێگای چێشتخانە و کلیلەکانی نەدەزانی. وادیـاره ئەوە هەر ســـەعـدوڵلای ئـامۆزامـانە. دەلیلە گوتی: «بە خودا ئەو چێشتخانەی بە پشیلەکەدا و کلیلەکانیشی بە درۆشم و هێما دیوەتەوە. کەیفی خۆشتانە.

بەوجۆرە عەلی جیوە چووە چێشتخانە و چێشت و شتی ساز کرد. سفرەی بۆ زێنەب برد و هەموو جلەکانی لە دیوەکەی زێنەبدا دیت. ئەوجار هاتە خواریّ و سـفرەی بۆ دەلیلە برد. نانی بۆ کۆیلەکان دانا و خواردنیشـی بۆ سـەگەکان هاویشـت. بۆ شـێویش هەر ئاوای کرد. دەرگای کاروانســەرا هەر لە ڕۆژئاوابووندا دەکراوە. دوای ئەوە عەلی جیوە هەسـتا و لە کـاروانســـــەرادا جـاڕی دا کە خەڵکینە ئەوە نۆبەدارەکـان چـاوەدێری وڵات دەکەن و گەماڵەکانیش بەڕەڵا کراون. هەر کەس بێتە دەریّ و شـــتێکی لیّ بیّ. یەخەی کەس نەگریّ. عەلی جیوە نانی ســـەگەکانی خســـتە ئاخرییەوە و دەرمانداوی کردن. وا بوو ســـەگەکان هەموو تۆپین. کۆیلەکان و دەلیلە و زێنەبیشـی بێهۆش کرد. ئەوجار چووە دیوەکەی زێنەب و تەواوی جلەکان و کۆترە نامەبەرەکانی هێنا. دەرگای کاروانسەرای کردەوە و لەویّ هاتە دەریّ و بەرەو ماڵ بووەوە. حەســەن شـوومان کە چاوی پێی کەوت، لێی پرسـی: «چیت کرد؟» عەلی جیوە هەموو شــتێکی بۆ گێڕاوە و ســپاســی هاوکارییەکانی ئەویشــی کرد. حەسەن شوومان گیایەکی کوڵاند و گیانی عەلی جیوەی پیّ شوت. ڕەشاییەکەی لیّ بووەوە وەک خۆی لیّ هاتەوە. چوو بۆ کاروانسەرا و جلەکانی لە بەر کۆیلە چێشتلێنەرەکە کردە و وە هۆشی هێناوە. عەلی جیوە ئاوای کرد. بزانین دەلیلە چی بە سەر هات.

یەکێک لە بازرگانەکانی نیشـتەجێی کاروانســـەر بەیانی زوو هەســتا هاتە حەوشـــەی کاروانســەرا. سـەیری کرد دەرکی کاروانســەرا کراوەتەوە و تەواوی نۆبەدار و کۆیلەکان لەملا و لەولا بێهۆش کەوتوون و گەماڵەکانیش تۆپیون. چوو بۆ لای پیرێژنەکە ســـەیری کرد ئەویش بێۆشە. تەماشای کرد پەڕێکی بە ملی داکراوە و شیشەیەکی دژی بەنگیشی لە پشت سـەرییە. بازرگانەکە لەو شیشـەیە کەمێکی لە لووتی کرد. پیرێژنە وەهۆش هاتەوە و گوتی: «ئەمن لە کوێم؟» بـازرگـانەکە گوتی: «کە هـاتمە دەریّ تەمـاشـــــام کرد، تۆش و کۆیلەکانیش بیّ هۆش کەوتوون و سـەگەکانیش تۆپیون.» دەلیلە پەڕەکەی لە ملی داکەند و خوێندییەوە. لەو پەڕە نووسرابوو کە ئەو کارە کاری عەلی میسرییە. ئەوجار دەلیلە زێنەبی کچی و کۆیلەکانی وەهۆش هێناوە و گوتی: «من بە ئێوەم نەگوت: ئەوە عەلی میســـرییە! تازە لە لای کەس باسی ئەو شتە مەکەن. بە زێنەبی کچیشی گوت: «چەند جارم پیّ گوتی: «خۆ لە عەلی میســری مەدە تۆڵەی خۆییمان لیّ دەکاتەوە. ئێســتاش ئەو کارەی لە تۆڵەی ئەو کارەی تۆ کردووە. دەشـیتوانی کاری دیکەشـت لەگەڵ بکا. باشـە گەورەیی کردووە و بەوەندە لە کۆڵمان بووەتەوە، مەبەستیشی ئەوە بووە کێشەکە تەواو بیّ و ئاشت بینەوە.

ئیدی دەلیلە بەرگی پیاوانی داکەند و بەرگی ژنانەی لە بەر کرد. ئەمانەت نامەی لە مل

کرد و بەرەو ماڵی ئەحمەد دەنەف ڕۆیشــــت. کاتێک کە عەلی جیوە هاتبووەوە، جل و کۆترەکانیشــــی لەگەڵ خۆی هێنابووەوە. حەســــەن شــــوومان پارەی چل کۆتری دا بە نۆکەرەکەی و پێی گوت بچووە چل کۆتر بکڕە و ســــەریان بڕە و ســــووریان کەوە. کاتێک دەلیلە لە دەرگای دا. ئەحمەد دەنەف گوتی: «ئەوە لە دەرگادانی دەلیلە، دەرکەوان دا بچووە دەرگای لێ بکەوە.» دەرکەوان هەستا دەرگای لێ کردەوە. دەلیلە هاتە ژووری.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتایی پێ هات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی حەوسەد و چواردەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! کە دەرکەوانەکە دەرگای کردەوە، دەلیلە هاتە ژووریێ. حەســـەن شـووومان پێی گوت: «پیری گڵاو، ئەوە بۆ هاتوویە ئێرە؟» دەلیلە گوتی: «سـەرهەنگ، ئەوە ملی من و ئەوەش شیری ئێوە. هەر پێم بڵێ کێ ئەو کارەی لەگەڵ من کرد. ئەحمەد دەنەف گوتی: «ســـەرۆکی بەردەســـتەکانی من.» دەلیلە بە ئەحمەدی گوت: «بیکە بۆ خاتری ئەو خودایە پێی بڵێ، تـازە ئەگەر هەر وای لێ هـاتووە، ئەو چـاکەیەم لەگەڵ بکـا و کۆترە نامەبەرەکانم بۆ بێنێتەوە. حەسەن شووومان بە عەلی گوت: «عەلی ماڵت نەشێوێ ئەخە ئەو کۆترانەت بۆ سەر بڕی؟» عەلی جیوە گوتی: «خۆ من نەمزانی ئەو کۆترانە نامە بەرن.»

ئەوجـار ئەحمەد دەنەف بە نۆکەرەکەی گوت: «دا کەمێکی گۆشـــتی کۆتر بۆ بێنە.» نۆکەرەکە کە بۆخۆی کۆترەکانی ســوور کردبووەوە کەمێکی گۆشـتی کۆتر بۆ دەلیلە هێنا. دەلیلە لێی وەرگرت و لە زاری خســت. کەمێکی جووت و لە زاریدا هێنای و بردی و گوتی: «ئەوە گۆشتی کۆتری نامەبەر نییە. ئەمن ئەوانەم بە دەنکە میسک بەخێو دەکرد.» حەسەن شووومان بە دەلیلەی گوت: «ئەگەر تۆ دەتهەوێ کۆترە نامەبەرەکانت وەگیر کەوێتەوە بزانە عەلی میســـری دەڵێ چی و داخوازییەکەی وەدی بێنە.» دەلیلە گوتی: «چ داخوازییەکی هەیە؟» حەســـەن گوتی: «کچەکەتی لێ مـارە بکە.» دەلیلە گوتی: «ئەمن دەبێ لەگەڵ کچەکەم قسـە بکەم. ئەوجار حەسـەن شـووومان بە عەلی میسـری گوت: «تۆش کۆترەکانی دەوە.» عەلی میســـری کۆترەکانی داوە. دەلیلە دڵی خۆش بوو. کۆترەکانی وەرگرتەوە. حەسـەن پێی گوت: «زوو وڵامەکەمان بۆ بنێرەوە.» دەلیلە گوتی: «ئەگەر عەلی میسری بە تەمایە لەگەڵ زێنەب زەماوەند بکا ئەو کەڵەکەی لێی داوە شـــتێک نییە. زیرەکی ئەوەیە کە زێنەب لە خاڵە زورەیقی بخوازێ چون بە مێرددانی بە دەست ئەوە.

ئەوان کە ئەو قســـانەیان لە دەلیلە بیســـت پێیان گوت: قەحبە، ئەو قســـانە چییە بۆ بە تەمای هاوڕێکەمان بە کوشت بدەی؟ دوای ئەوە دەلیلە لە لای ئەوان هاتە دەرێ و چووەوە بۆ کاروانسەرا و بە کچەکەی گوت: «عەلی میسری داوای تۆی لێ کردم بە تەمایە شووی پێ بکەی؟» زێنەب زۆری پێ خۆش بوو. بە هۆی داوێنپاکییەوە عەلی میســـری کەوتبووە بەر دڵی و ئاشـقی ببوو. زێبەب پرسـی: «ئەوە چۆناوچۆن بوو.» دەلیلە ئەوەی دیبووی و بیستبووی هەمووی بۆ گێڕاوە و گوتی: «مەرجم بۆ دانا کە دەبێ بچێتە لای خاڵە زورەیقت و داوات بکا. بە تەما بووم بە دەســت خاڵت لە بەینی بەرم.» با دایک و کچ قسـەی خۆیان بکەن.

عەلی میســری ڕووی لە هاوڕێکانی کرد و گوتی: «زورەیق کێیە و چ کارەیە؟» گوتیان

زورەیق ســەرۆکی لاوانی عێراقە و دەتوانێ کێو کون بکا و ئەســتێرە لە ئاســمان داگرێ وکلی چاو بدزێ. ڕۆڵەیەکە کەس تای ناکا. بەڵام تۆبەی کردووە و ئەو کارانە ناکا. ئێســتا خەریکی ماسیفرۆشییە. دوو هەزار دیناری بەو کارە پاشەکەوت کردووە. ئەو دوو هەزار دینارەی لە هەمبانەیەک خســتووە و بە گورزەهۆن[1]ێک کە زەنگوڵەی مســی و گوڵینگی چکۆڵەی ڕەنگاورەنگی بە سەرەکەیەوەیە، زارکی هەمبانەکەی بەستووە. ئەو هەمبانەیەی لە دووکان بە سینگێکدا کردووە و کاتێک دووکان هەڵدەگرێ، دەیهێنێ لە بەر دەرگای دووکان هەڵیداوەسێ و هەرا دەکا و دەڵێ: ملهوڕانی میسر، لاوەکانی عێراق و ئازا و بە جەرگەکانی عەجەم هەر کەس لە خۆی ڕادەبینێ ئەوە زورەیقی مـاســیفرۆش توورەکەیەکی لێرە هەڵواســیوە و دوو هەزار دینـاری زێڕی تێدایە هەرکەس ئازا بێ و بە هەر فێڵێک بۆی دەلوێ ئەو توورەکەیەی لێ بدزێ، ئەو زێڕە بۆ خۆی و نۆشــی گیانی بێ. زورەیق لە دووکان دانیشــتووە و ئاوری کردووەتەوە و تاوەیەکی مســی لە پێش خۆی داناوە و خەریکی ماسی برژاندنە. کاتێک ئەو کەسانەی تەماح دەیانگرێ و دێن بیخافڵێنن تا توورەکە زێڕەکەی لێ بڕفێنن بەو تاوە مســییە لە تەپڵی ســەریان دەدا و دەیانکووژێ. عەلی ئەگەر بتهەوێ خۆ لە زورەیق بدەی خۆت بە هیلاک دەدەی. دوژمنـایەتی زورەیقیش مەکە و زێنەبیشت ناوێ. پێویستیت بەو نییە.

عەلی گوتی: «هاوڕێیان ئەو قسـەی ئەوم پێ ناخۆشـە و ناتوانم هەر وا بە لایدا تێپەڕم. دەبێ ئەو توورەکەیەی هەر لێ بڕفێنم. بەس ئێوە دەستێکم جلی ژنانە بۆ پەیدا کەن. لەوێوە جلی ژنانەیان بۆ هێنا. عەلی میسری بەرگی ژنانی لە بەر کرد و ڕووبەندی بە سەروچاویدا بەر داوە. هێنای کاریلەیەکی کوشــتەوە و ڕیخۆڵەکانی دەرهێنا. نێو ڕیخۆڵەکانی پڕ کرد لە خوێن و ئەوســەرەوســەری ڕیخۆڵەکانی گرێ دا. ڕێخۆڵەکانی لە ڕانی بەســت و پاتۆڵی لە سەر هەڵکێشا. دوو شتی وەک مەمک دروست کرد و شیری تێ کردن و لە سینگی بەست. کابرایەکی بارەبەر بە وێدا هات، گوێدرێژێکی پێ بوو. دینارێکی دا بە کابرا، کابرا ســواری کرد هەتا دووکانی زورەیقی ماســیفرۆشــی برد. عەلی میســری چاوی بە توورەکە کەوت، بەوێوە هەڵواسرابوو. زورەیقیش ماســی دەبرژاند. عەلی میســری لە بارەبەرەکەی پرسـی: «کاکە ئەو بۆنە چییە؟» کابرا گوتی: «ئەوە بۆنی ماسییەکانی زورەیقە.»

عەلی میســـر بە کابرای باربەری گوت: «ئەمن دوو گیانم و ژنی ئەمیر حەســەنی شـەڕولتەریقم. بۆخۆت دەزانی کە بۆن بۆ من باش نییە. نەختێکم لەو گۆشـتی ماسـییە بۆ بێنە. کابرای باربەر چووە لای زورەیق و پێی گوت: «زورەیق، بەو بەیانییە هەستاوی بۆن بە سـەر ژنانی دوو گیاندا بڵاو دەکەیەوە! ئێسـتا ئەوە ژنی ئەمیر حەسـەنی شـەڕولتەریقم

---

[1]. گورزەهۆن: بەنێکی ســێ لوێیە کە لە مەرەز و خوری دروســت دەکرێ و بۆ بەســتنی شــت کەڵکی لێ وەردەگیرێ.

لەگەڵە و ئەو بۆنە بەسەریدا چووە دەترسم زیانی پێ بگەیەنێ. نەختێکم لە گۆشتی ئەو ماسییە دەیە با بیدەمێ. لەرێوە زورەیق کوتێکی گۆشت لێ کردەوە ویستی لە ئاورەکەدا بیبرژێنێ. ئاورەکە دامرکا. زورەیق چووە خوارێ ئاورەکە بگەشێنێتەوە. عەلی میسری لە بەر دەرگاکە دانیشتبوو خۆی خستە سەر ڕیخۆڵەکان و ڕیخۆڵەکان تەقین و خوێن لە نێو لینگییەوە چۆڕاوگەی بەست. ئیدی دەستی کرد بە هات و هاوار و گوتی: «واظهری واظهری واتە وەی پشتم وەی پشتم. باربەرەکە چاوێکی لێ کرد سەیری کرد، خوێنی لە بەر دەڕوا. گوتی: «خانم ئەوە چی بووە؟» عەلی میسری بە حاڵەتێکی ژنانەوە گوتی: «منداڵەکەم لە بار چوو. زورەیق سەری بردە پێشێ سەیری کرد خوێنی لە بەر دەڕوا. ترسا و هەڵاتەوە ناو دووکانەکەی. کابرای باربەر گوتی: «زورەیق خودا تۆڵەی ئەو ژن و منداڵەت لێ کاتەوە. ئەتۆ چی جوابی مێردەکەی دەدەیەوە. ئەتۆ بۆ بەو بەیانییە ئەو بۆنە بە سەر خەڵکدا بڵاو دەکەیەوە و کەچی کە داوای چنکێک گۆشتت لێ دەکەن بڕوبیانوو دێنییەوە و نایدەی.

ئیدی کابرای باربەر ڕێشمەی گوێدرێژەکەی گرت و ڕۆیشت بە لای کاری خۆیەوە. لەو جەنگەیەشدا کە زورەیق هەڵاتە ناو دووکانەکەیەوە، عەلی میسری دەستی کێشا هەمبانەکە لێ کاتەوە کە زەنگوڵەکان زرینگانەوە و زورەیق پێی زانی و گوتی: «ژنەتیوە ئاوسە ئەوە بە تەما بووی بەو بۆنەوە کڵاوم لە سەر کەیت. بزانە چیت لێ دەکەم، دەستی دا تاوە مسەکە و تێی هەڵکرت نەیگرت و لە یەکی دیکە درا. خەڵک لە زورەیق کۆ بوونەوە و پێیان گوت: «ئەرێ تۆ بازاڕی یان سپایی؟ ئەگەر کاسبکاری ئەو توورەکەیە لەوێ کەوە و شەڕ بە خەڵک مەفرۆشە. زورەیق لە بەر خۆیەوە گوتی: «باشە لێی دەکەمەوە.»

عەلی میسری لە دەرفەت کەڵکی وەرگرت و گەڕاوە لای هاوڕێکانی. شوومان پرسی: «چیت کرد.» عەلی میسری ڕووداوەکەی بۆ گێڕانەوە و جلە ژنانەکەی داکەند و گوتی: «شوومان، جلی کۆیلانەم بۆ بێنە.» شوومان چوو بۆی هێنا. عەلی میسری جلی خزمەتکارانی لە بەر کرد و دەفرێک و پێنج درەمی هەڵگرت و چوو بۆ دووکانی زورەیق. زورەیق لێی پرسی: «چیت دەوێ؟» درەمەکانی دایە. زورەیق ماسییەکی دایە. عەلی میسری وەک خزمەتکاران بە ئارامی گوتی: «ئەمن ماسی گەرمم دەوێ. زورەیق ماسییەکەی لە تاوەکە هاویشت و ویستی بۆی ببرژێنێ کەچی ئاورەکە کووژاوە. زورەیق چووە خوارێ ئاورەکە بدەمێ، عەلی میسری دەستی برد بۆ توورەکە و زەنگوڵەکان دەنگیان لێ هەستا. زورەیق گوتی: «کەڵەکەکەت لەگەڵ من سەر ناگرێ، هەرچەند لە بیچمی خزمەتکار و شتیشدا بێی. هەر کە درەمەکانم لە دەستتدا دیتی تۆم ناسی.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی حەوسەد و پازدەیە هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئیدی زورەیق تاوە مسییەکەی تێ هەڵکرد و عەلی میسری خۆی لادا. تاوەکە وە مەنجەڵێکی پڕ لە گۆشتی کوڵاو کەوت. مەنجەڵە شکا و پریشکەی چەوری و شتەکە بە جلەکانی قازییەکدا ڕژا کە لە بەر دەرگاوە ڕەد دەبوو. قازی گوتی: «ئەوە کێ بوو ئاوای لێ کردم.» خەڵکەکە گوتیان قازی ڕەنگە منداڵەورکە بەردیان هاویشتبێ و لە مەنجەڵەکە کەوتبێ و پریشکەی کردبێ. دوایە کە چاویان لێ کرد و تاوە مسییەکەی زورەیقیان لە مەنجەڵەکەدا دیت، لەڕێوە ڕوویان لە زورەیق کرد و پێیان گوت پیاوی چاک بە شەرم لە خودا بکە و ئەو توورەکەیە لەوێ لا بەرە. زورەیق وڵامی داوە: «ئیشەڵڵا لای دەبەم.»

عەلی میسری گەڕاوە لای هاوڕێکانی. پرسیاری هەمبانەکەیان لێ کرد. چی ببوو ئەویش بۆی گێڕانەوە. جلەکانی داکەند و جلی بازرگانانەی لە بەر کرد و هاتە دەرێ. تووشی مارگرێک بوو. مارگرەکە توورەکەیەکی پێ بوو، دوو قاژووی تێدا بوو. تێڕێکی بوو، شتەکانی تێدا بوو. عەلی میسری پێی گوت: «کاکە منداڵەکانی من قاژوویان زۆر خۆش دەوێ، ئەتۆ وەرە و ئەو قاژووانە پێشانی ئەوان بدە، منیش چاکەیەکت لەگەڵ دەکەم.» بەو فێڵە لەگەڵ خۆی هێناوە و بەنگی بۆ لەگەڵ خواردنەکەی کرد و بیهۆشی کرد. جلەکانی ئەوی لە بەر کرد و چوو بۆ لای زورەیقی ماسیفرۆش. کە لە دووکانەکەی نیزیک بووە، بلوێری دەرهێنا و دەستی کرد بە بلوێر لێدان. زورەیق پێی گوت: «خودا ڕزقت بدا.» ئەویش قاژووەکانی لە تێرەکەکە دەرهێنا و هاویشتییە بەر دمی. وا بوو زورەیقیش زۆر قاژوو دەترسا. هەر بۆیە کە چاوی بە قاژووەکان کەوت، هەڵاتەوە بۆ ناو دووکانەکەی. عەلی میسر قاژووەکانی گرت و لە تێرەکەکەی ناوە و دەستی کێشا بۆ توورەکەکەی زورەیق. زەنگوڵە زرینگانەوە. زورەیق گوتی: «ئەوە بەردەوام دەتهەوێ فێڵم لێ بکەی و هەر جارەی بە شێوەیەک خۆتم لێ دەگۆڕی. ئیدی زورەیق دەستی دا تاوە مسییەکە و ڕێی هاڵاند. ڕێکەوت وا بوو باڵباز[1]ێکی میری لەگەڵ خزمەتکارەکەی بەوێدا هاتن. تاوەکە ڕاست وە سەری خزمەتکارەکە کەوت و سەری شکاند. باڵبازەکە گوتی: «ئەوە کێ ئەوەی هاویشت. خەڵکەکە گوتیان ڕەنگە لە ئاسمانەوە هاتبێ. کە باڵبازەکە بۆ ڕوون نەبووەوە کێ هاویشتوویە و ڕۆیشت. خەڵکەکە بە زورەیقیان گوت: «ئەو توورەکەیە لەوێ کەوە.» زورەیق گوتی: «ئیشەڵڵا لێی دەکەمەوە.»

کورتی کەینەوە عەلی میسری ئەو ڕۆژە لە حەوت ڕێوە بۆی چوو، نەیتوانی بیخافڵێنێ

---

[1]. باڵباز: سەرباز، عەسکەری میری.

و توورەکەکەی لێ برفێنێ. ناچار گەڕاوە. جلەکانی مارگیری داوە و چەند درەمێکیشی دایە. گەڕاوە بۆ دووکانی زورەیق. گوێی لێ بوو زورەیق دەیگوت: «ئەگەر ئەوشـــەو هەمبانەکە لە دووکان دانێم. دووکان دەبڕێ و هەمبانەکەم دەبا. وا چاکە بیبەمەوە ماڵێ. دوای ئەوە هەســتا توورەکەکەی لێ کردەوە دەرکی دووکانی گاڵە دا. توورەکە زێڕی لەگەڵ خۆی برد و بەرەو ماڵ بووەوە. عەلی جیوەش وە دوای کەوت. زورەیق کە گەیشــتەوە ســەیری کرد دراوســـێکەیان ئاهەنگی شـــادیانە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «بچمەوە ئەو توورەکەیە بدەم بە خێزانم و جل و بەرگێکی جوان لە بەر کەم و بێم تۆزێک خۆشـــی ڕابوێرم. خۆ من دڵم تۆقی.»

کورتی کەینەوە، ئەو ڕۆیشـــت و عەلیش بە دوایدا ڕۆیشـــت. زورەیق ژنێکی بوو لەو کەنیزە قولە ڕەشـــانە، کە جەعفەری بەرمەکی وەزیر ئازادی کردبوو. زورەیق لەو کەنیزە کوڕێکی بوو. کوڕە نـاوی عەبدوڵلا بوو. زورەیق هەمیشـــە بە ژنەکەی دەگوت کە بەو زێڕانەی کە لەو توورەکەیە دایە عەبدوڵلای پێ خەتەنە دەکەین و جێژنێکیشـــی بۆ دەگرین. هەر بۆیە کاتێک زورەیق بە ڕوویەکی گرژەوە چووە لای ژنەکەی، ژنە گوتی: «ئەوە چی بووە؟ بۆ وا ناڕەحەتی؟» زورەیق گوتی: «ئەوڕۆ تووشـــی چەتەیەک بووم حەوت جاری گەلاڵە بۆ دارشـــتم تا ئەو توورەکەیەم لێ بدزێ نەیتوانی. هەر بۆیە نەموێرا لە دووکان بەجێی بێڵم و لەگەڵ خۆم هێنامەوە.» ژنە گوتی: «ئەو توورەکەیەم دەیە با هەڵیگرم بۆ جێژنی عەبدوڵلا.»زورەیق توورەکەکەی دایە.

عەلی میسری خۆی لێ مات دابوون و گوێی لە قسەکانیان ڕاگرتبوو. ئەویشی لێ دیار بوو. ئەوجار زورەیق هەســـتا جلەکانی بەری داکەند و جلوبەرگی نوێی لە بەر کرد و بە خێزانی گوت: «ژنەکە ئاگات لەو توورەکەیە بێ، ئەوە من دەچم بۆ ئەو بەزم و ئاهەنگە. ژنەکەی پێی گوت: «ئێستێک بخەوە جا بچووە بۆ شـایی.» زورەیق خەوت. عەلی میسری هەســـتا بە ئەســـپایەکی چوو توورەکەکەی هێنا و چوو لە قەراغ شـــاییەکە ڕاوەســـتا بۆ تەماشای گۆوەندە.

زورەیق خەونی بینی کە باڵندەیەک هات و توورەکەکەی برد. بە پەشـــۆکاوی لە خەوە ڕاپەڕی. بە خێزانی گوت: «دا هەســـــتە توورەکەکە بێنە. دایکی عەبـدوڵلا هەســـــتـا و توورەکەکەی نەدیتەوە. بە چەپۆک بە ســـەر و ســـەکوتی خۆی دادا. زورەیق گوتی: «دایکی عەبـدوڵلا، هەر ئەو چەتەیە توورەکەکەی بردووە. دەبێ بچم لێی بســـتێنمەوە.» دایکی عەبدوڵلا گوتی: «ئەگەر توورەکەکە نەهێنییەوە دەرگات لێ ناکەمەوە و ڕێی ماڵێت نادەم.»

زورەیق هەستا چوو بۆ لای شاییەکە. سەیری کرد، عەلی میسری ڕاوەستاوە و سەیری شـــایی دەکا. لە دڵی خۆیدا گوتی: «هەر ئەوە، توورەکەکەی هەڵگرتووە. ئەوەش لە ماڵی

ئەحمەد دەنەفە.» ئیدی زورەیق دەستی خۆی ڕەپێش خست و خۆی گەیاندە سەربانی ماڵی ئەحمەد دەنەف و لەوێوە چووە حەوشەکەیان. تەماشای کرد هەموویان خەوتوون. لەو جەنگەیەدا عەلی میسری لە دەرگای دا. زورەیق گوتی: «کێیە؟» عەلی میسر گوتی: «منم.» زورەیق گوتی: «توورەکەکەت هێناوە یان نا؟» عەلی میسری وەیزانی حەسەن شوومانە. گوتی: «بەڵێ، هێناومە. بیکەوە.» زورەیق گوتی: «هەتا پێشانم نەدەی نایکەمەوە. ئەخە من و ئەحمەد دەنەف و گرێومان کردووە. عەلی میسر گوتی: «دەستت بێنە، زورەیق لە پەنا ڕێسمەی دەرگاکەوە دەستی کێشا و توورەکەکەی لێ وەرگرت و لەو شوێنەی کە لێی هاتبووە خوارێ، هەر بەوێدا چووەوە سەربان و لەوێوە ڕۆیشتە خوارێ و چووەوە بۆ لای شاییەکە.

عەلی میسری ماوەیەکی زۆر لە بەر دەرگا وێستا. کەس دەرگای لێ نەکردەوە. ئەوجار توند لە دەرگاکەی دا. هاوڕێکانی وەخەر هاتن و گوتیان ئەو لە دەرگا دانە عەلی میسرییە. دەرکەوان دەرکەی کردەوە و بە عەلی گوت: «توورەکەکەت هێناوە یان نا؟» عەلی میسری گوتی: «گاڵتەم پێ مەکە. مەگەر ئێستا توورەکەکەم بە بن دەرگاکەدا نەدا بە تۆ؟ نیشان بەو نیشانە گوتیشت: سوێندم خواردووە هەتا توورەکەکە نەبینم دەرگاکە ناکەمەوە. شوومان گوتی: «بە خودا ئەمن توورەکەم لێ وەرنەگرتووی. دەبێ کاری زورەیق بێ، لێی وەرگرتووی.» عەلی گوتی: «دەبێ من ئەو توورەکەکەی هەر لێ بستێنم.» ئیدی ڕۆیشتەوە بۆ لای شاییەکە. لەوێ گوێی لێ بوو. گۆرانیبێژەکان دەیانگوت: «باوکی عەبدوڵڵا شاباشمان دەیە، ئەوجار نۆبەی جێژن و شایی کوڕەکەی ئێوە.» عەلی میسری زانی کە زورەیق لەوێیە. خۆشحاڵ بوو. هەستا چوو، خۆی گەیاندە سەربانی ماڵی زورەیق و لەوێوە چووە حەوشەکەیان. سەیری کرد کەنیزەکە خەوتووە. ئەوی بێهۆش کرد و جلەکانی ئەوی لە بەر کرد و منداڵەکەی لە باوەشی کرد و لە ماڵەکەدا هات و چوو. چاوی بە چارۆکەیەک کەوت نانی جێژنیان تێ خستبوو. لەو جەنگەیەشدا زورەیق هاتەوە و لە دەرگای دا. عەلی میسری لاسای کەنیزانی کردەوە و وڵامی داوە: «کێیە؟»زورەیق گوتی: «ئەبووعەبدوڵڵا.» عەلی میسری گوتی: «ئەمن سوێندم خواردووە تا توورەکەکە نەهێنییەوە دەرگات لێ نەکەمەوە.» زورەیق گوتی: «توورەکەکەم هێناوەتەوە.» عەلی میسری گوتی: «توورەکەکەم دەیە، دەرگاکەت لێ دەکەمەوە.» زورەیق گوتی: «چارۆکەکە شۆڕ کەوە تا توورەکەکەت بۆ تێخەم.» عەلی میسری چارۆکەکەی بۆ شۆڕ کردەوە. زورەیق توورەکەکە خستە لوێی چارۆکەکە و گرێی دا. عەلی میسری توورەکەکەی هەڵکێشا و چوو کوڕەکەی بە دەرمان بێهۆش کرد و کەنیزەکەی وەهۆش هێناوە و خۆی دەرباز کرد. خێرا بە سەربانی ماڵی ئەحمەد دەنەفدا گەڕاوە لای هاوڕێکانی. توورەکە و نان و منداڵەکەی لە بەر دەم دانان. بە شوومانی گوت: «ئەوە کوڕی زورەیقە، ها با لە لای

تۆ بێ و ئاگات لێی بێ. حەســەن منداڵەکەی لێ وەرگرت و شــاردییەوە. کاریلەیەکیان هێنا سەریان بڕی و بە پێش خزمەتەکەیان گوت: «جوان، وەک مردوو کفنی کە.»

زورەیقیش ماوەیەکی زۆر لە بەر دەرگا ڕاوەســـتا. دوای ئەوە توند لە دەرگاکەی دا. کەنیزە پێی گوت: «توورەکەکەت هێناوەتەوە یان نا؟» زورەیق گوتی: «مەگەر ئێســـتا بۆخۆت چارۆکەکەت شـــۆڕ نەکردەوە بۆم تێ بەســـتی؟» کەنیزە گوتی: «ئەمن چارۆکەم شۆڕ نەکردووەتەوە و توورەکەشم لێ وەر نەگرتووی.» زورەیق گوتی: «قەسەم بە خودا عەلی میســـری گورزی خۆی لێ وەشـــاندم و دەســـتی خۆی ڕەپێش خســـتووە.» ئەوجار چاوێکی بە ماڵەکەیدا گێڕا. ســـەیری کرد نانی جێژن و منداڵەکەی نەماوە. لەڕێوە دەســـتی کرد بە هات و هاوار و شـین و ڕۆڕۆ. بە چەپۆک بە ســـەروســـەکتی خۆی دادا و ســـنگ و بەرۆکی خۆی داڕنی و گوتی: «دەبێ جەعفەری وەزیر بێ حەقم بستێنێ، تۆ کوڕەکەت لێ بە کوشـــت دام.» زورەیق پێی گوت: «خەمت نەبێ. هێنانەوەی کوڕەکەت لە ســـەر من.» ئیدی هەســـتا پەڕۆی بەزینی[1] لە ملی کرد و چوو بۆ ماڵی ئەحمەد دەنەف و لە دەرگای دا. دەرکەوان دەرگـای لێ کردەوە. زورەیق چووە ژوورێ. شـــوومـان گوتی: «ئەوە چۆنە هاتووی، زورەیق؟» زورەیق گوتی: «هاتووم داوا لە عەلی میسری بکەم منداڵەکەم داتەوە، توورەکە زێڕەکە بۆ خۆی.» شـــوومـان گوتی: «عەلی مـاڵتە بۆ نەتگوت، ئەوە منـداڵی زورەیقە.» زورەیق پرسی: «بۆ چی بووە؟» شوومان گوتی: «خەریک بووین کشمیشمان دەدایە دەنکێک پەڕی گەڕوویەوە و مرد. ئەوەتا تازە کفنمان کردووە. ئیدی زورەیق دەستی کرد بە شـن و ڕۆ و هەسـتا کفنەکەی کردەوە. چاوی بە کاریلەیەک کەوت لە کفنەکەیانەوە پێچا بوو. گوتی: «عەلی منت خۆشـــحاڵ کرد. دوای ئەوە کوڕەکەیـان بۆ هێنـا. زورەیق منداڵەکەی وەرگرت. ئەحمەد دەنەف پێی گوت: «تۆ توورەکەکەت هەڵواســـیبوو دەتگوت هەرکەس ئەو توورەکەزێڕە بەرێ بۆخۆی. ئێســـتا ئەو توورەکەیە ئی عەلی میســـرییە. زورەیق گوتی: «ئەمن گەردنی عەلی میســـریم ئازاد کردووە، ئەو زێڕانە بۆ خۆی. قەلی جیوەی میسریش پێی گوت: «ئەتۆش ئەو زێڕانەم لە جیاتی تێچووی کاروبارەکانی زێنەبی خوشـکەزات لێ قەبووڵ کە.» شـوومان گوتی: «مارەییەکەی چییە؟» زورەیق گوتی: «ئەو ســوێندی خواردە و کەس وەخۆ ناکا هەتا جل و زێڕەکانی قەمەری کچی عوزرەی جووی بۆ نەهێنێ.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. لە فارسییەکەدا «محرمە» نووسراوە کە قوماشێک کە هێمای تەواوکردنی ململانێیەک بووە.

## کە شەوی حەوسەد و شازدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! عەلی میســـری گوتی: «ئەگەر ئەوشـــەو نەیهێنم، تازە زەماوەندی لەگەڵ ناکەم.» شـــوومان گوتی: «عەلی ئەگەر بێت و بتهەوێ فێڵی لێ بکەی دەکوژرێی. عەلی میســـری گوتی: «بۆ دەکوژرێم؟» پێیان گوت کە عوزرەی یەهوودی ســـیحربازە و جندۆکەی لە ژێر فەرمان دایە. ئەو جووە لە دەرەوەی شـــار کۆشـــکێکی هەیە، خشـــتێکی لە زێڕە و یەکی زێوە. کاتێک ئەو جووە لە نێو ئەو کۆشـکە دایە کۆشـکەکە دیارە هەر کە لەو کۆشکە هاتە دەرێ کۆشکەکە ون دەبێ. کچێکی هەیە ناوی قەمەرە واتە مانگ. کە کراس و شـتەکەی لە زێڕ و جەوهێراتی شـایانە چێ کراوە. ئەو جلانە لە سـەر مەجۆعمەیەکی زێڕ دادەنێن. دەرگاکانی کۆشک دەکەنەوە و جاڕ دەدەن کە ملهوڕانی میسر، لاوەکانی عێراق و ئازا و بە جەرگەکانی عەجەم، هەر کەس ئەو مەجۆعمەیە و جلەکانی ناوی بەرێ ئەوە جلەکانیش و مەجۆعمەکەش بۆ ئەوە و گەردنیشی ئازا بێ. هێندێک کەس تەماع گرتوونی و بەڵام دەستیان پێی ڕانەگەیشتووە. هەر بۆیە ئەو کابرا جووە بە جادوو ئەوانی کردووە بە کەر و مەیموون. عەلی میسری گوتی: «دەبێ ئەو کراس و شتە هەر بێنم تا زێنەب شەوی بووکێنی لە بەر بکا. دوای ئەوە عەلی میســـری چوو بۆ دووکانی جووە. ســـەیری کرد کابرایەکی دزێو و ناشـیرین و توورە زێڕ و زێو و تەرازووی لە پێشـە و یەسـترێکیش لە بەر دەرگای دووکانەکەی بەســـتراوەتەوە. ئاگای لێ بوو جووە دووکانی گاڵە دا. زێڕ و زێوەکانی لەملاولای تێرەکە کرد و بە یەسترەکەیدا دا. بۆخۆشـی سوار بوو ڕۆیشت هەتا لە شـــار ڕۆیشـــتە دەرێ. عەلی میســـریش بە دوایدا ڕۆیشـــت. بەڵام ئەو پێی نەدزانی. لە دەرەوەی شار جووە توورەکەیەکی دەر هێنا کەمێکی خۆڵ لێ دەرهێنا و وێردی بە سەردا خوێند و هەڵی هاویشت. لەڕێوە کۆشـکەکە وەدەر کەوت. عەلی میسری کۆشکێکی دیت تا ئێستا کۆشـکی ئاوای نەدیتبوو. ئەوجار یەسترەکە ئەوی لە پێپلیکانەکان بردە سەرێ. ئەو یەســـترەش جندۆکە بوو کە جووەکە دەســـتەمۆی کردبوو. کـاتێک جووە تێرەکەی لە یەســرتەکە کردەوە. یەسـترە بزر بوو. جووە لە کۆشـکدا دانیشـت. عەلی میســریش ئەوە ئاگای لە هەموو شتێک بوو.

ئەو جووە کراس و شتەکەی کچەی لە سەر مەجۆعمەیەکی زێڕ دانا و بە زنجیری زێڕ لە بەر دەرگا هەڵی ئاوەسی. عەلی میسری لە پشت دەرگاوە ئاگای لە هەموو شتێک هەیە. جووە جاڕی دا کە ئەی ملهوڕانی میســـر، لاوەکانی عێراق و ئازا و بە جەرگەکانی عەجەم، هەر کەس ئەو کراس و مەجۆعمە و شــــتە بەرێ، گەردنی ئازا دەکرێ و کەس کاری پێی نابێ. دوای ئەوە وێردێکی خوێند و ســـفرە و خواردەمەنی لە پێش داندرا. جووە نانەکەی خوارد و سفرە هەر بۆخۆی کۆ کراوە و لا چوو. وێردێکی دیکەی خوێند شەراب و بادەی

هاته پێش. جووه شـەرابیشـی خواردەوە. عەلی میسـری لە دڵی خۆیدا گوتی: «عەلی، هەتا ئەو مەست نەبێ، ئەتۆ ناتوانی ئەو مەجۆعمەیە بێنی.» ئیدی عەلی لە پشت سەرییەوە وردە وردە بە ئەسپایی هات. ڕمبێکی ئاسنیشی بە دەستەوە بوو. جووە ئەوی دیت. وێردێکی بە سـەردا خوێند و بە دەسـتی ئەوی گوت لە حەوادا ڕاوەسـتە. دەسـتی عەلی لە حەوادا ڕاوەسـتا. ئینجا دەسـتی چەپی درێژ کرد. دەسـتی چەپیشـی لە حەوادا ڕاوەسـتا و لاقی ڕاستیشی هەروا. ئیدی عەلی میسری لە سەر لاقێک ڕاوەستا بوو. کە جووە تەلیمسەکەی لە سـەر لابرد و وەک ئەووەڵی لێ هاتەوە. ئەوجار جووە فاڵی گرتەوە. نێوی عەلی جیوەی میسـری وەدەر کەوت. جووە ڕووی تێکرد و گوتی: «وەرە پێشـێ و پێم بڵێ تۆ کێی و چ کارێکت هەیە؟» عەلی میسری وڵامی داوە و گوتی: «من عەلی جیوەم کە چوومە خوازبێنی کچی دەلیلە چاوبەست کە بۆ مارەییەکەی داوای جلی کچی تۆیان لە من کردووە. ئەگەر تۆ دەتهەوێ هیچ بە سـەر نەیە ئەو ئەو جلانەم دەیە و بۆخۆت بێ وەی بە.» جووە پرسـی: «دوای مەرگی تۆ ئەمن جلەکانی ئەوت دەدەمێ. تا ئێسـتا تاقمێکی زۆر هاتوون و داویان بۆ من ناوەتەوە و نەیانتوانیوە ئەو جلانە لە من بسـتێنن. ئەگەر تۆ بە قسـەی من دەکەی بڕۆ و گیانی خۆت ڕزگار بکە. چونکە مەبەستی ئەوان ئەوە نەبووە ئەو جلانەیان بۆ بەری، ئەوان هەر ویستوویان تۆ بە کوشت بدەن. ئەگەر من لەو تەختەبەختەدا نەمدیبایە شانس و بەختی تۆ بە سـەر شـانس و بەختی مندا زاڵە هەر زۆر زوو سـەرم لە لەشـت جوێ دەکردەوە. عەلی میسـری کەیفی بەو قسـەیە سـاز بوو کە جووە بۆی دەرکەوتووە بەختی ئەو بەسـەر بەختی خۆیدا زاڵە. ئەوجـار بە جووەی گوت: «دەبێ تۆ ئەو جلانەم هەر بدەیەی» جووە لێی پرسـی: «یانی هەر دەبێ ئەو کارە بکەی؟» عەلی میسـری گوتی: «بەڵێ، جگە لەوە مەبەسـتی دیکەم نییە.» لەڕێوە جووە جامێکی هێنا و پڕی کرد لە ئاو. دۆعایەکی بە سـەردا خوێند و بە عەلی میسـری گوت: «ببە بە کەر.» و ئاوەکەی پێدا کرد. لەڕێوە عەلی جیوە بوو بە گوێدرێژێک و دەستی کرد بە زەڕەڕەڕ. دوای ئەوە ئاڵقەیەکی بە دەوریدا کێشـا. ئەو ئاڵقەیە بۆی بوو بە بازنە و چوارچێوە. جووە هەتا بەیانی دانیشـت و خەریکی بادە خواردنەوە بوو. ئەوجار پێی گوت: «ئەوڕۆ من سـوارت دەبم با یەسـترەکە بحەسـێتەوە. دوای ئەوە جووە مەجۆعمە و جلەکانی لە سـووچێک دانا و بۆخۆی وەدەر کەوت تێرەکەی بە عەلی جیوە دادا و بۆخۆشـی سـواری بوو. کۆشـکەکە لە بەر چاو بزر بوو. چووەکە بە سواری عەلی جیوە ڕۆیشت هەتا گەیشتە دووکان و دابەزی. توورەکە و هەنبانە زێڕ و زیوی لە پێش خۆی دانا.

عەلی جیوەیش لە بیچمی گوێدرێژدا لەوێ بەسترابووەوە. دەیبیست و تێدەگەیشت بەڵام نەیدەتوانی قسـە بکا. لە پڕدا کوڕە بازرگانێک کە ڕۆژگار بەختی وەرگێڕابوو بە ناچاری تووشی ئیشی سووکی ئاوفرۆشی ببوو، بازنەی خێزانی هێنا بۆ لای جووە و لێی پرسی:

«ئەو بازنەیەم لێ بکڕە و پارەکەیم دەیە گوێدرێژێکی پێ دەکڕم.» جووە لێی پرسی: «جا بە تەمای چی بەو گوێدرێژە بکەی؟» گوتی: «بە تەمام خیگەخیگە ئاوی لە دەریاوە پێ بێنم بیفرۆشم. جووەکە پێی گوت: «ئەو گوێدرێژەم لێ بکڕە.» کوڕە بازرگانە بازنەکەی فرۆشت و بە پارەکەی عەلی جیوە [کە ئێستا گوێدرێژ بوو] لە جووەی کڕی و لەگەڵ خۆی بردییەوە بۆ ماڵێ. عەلی میسری لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەگەر بێت و ئەو کابرایە دە جارم ئاو لە دەریاوە پێ بێنێ بۆ ناو شار خۆ من بەرگە ناگرم و دەمرم. دەبێ بە فێڵێک خۆ لەو بەڵایە ڕزگار بکەم. لەو جەنگەیەدا ژنی ئاوفرۆشەکە کەمێکی گژوگیا بۆ هێنا. ئەویش بە لمبۆزی ژنەکەی بە پشتەوەدا خست و گورزەکەی لێ ڕەق کرد. ژنە وە هاتوهاوار و زیقەزیق کەوت. دراوسێکانی فریای کەوتن و عەلی جیوەی کەریان لێ کشاندەوە. دوای ئەوە مێردی ژنەکە هاتەوە. ژنە پێی گوت: «یان دەبێ من تەڵاق بدەی یان ئەو کەرە دەفرۆشی.» کابرا گوتی: «چی بووە؟» ژنە گوتی: «ئەوە شەیتانە چووە لە بیچمی کەرەوە، دەیویست سوارم بێ. ئەگەر جیرانەکان لێیان نەکشاندبامەوە کاری خۆی دەکرد. ئیدی کابرا لەڕێوە گوێدرێژەی بردەوە بۆ جووە. جووە لێی پرسی: «ئەوە بۆ هێناتەوە؟» کابرا شتەکەی بۆ گێڕاوە. جووە درەمەکانی داوە بە کابرا و بە عەلی جیوەی گوت: « کەڵکەباز دیسان کارێکت کرد بتهێنێتەوە بۆ لای من؟»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و حەڤدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! جووە گوتی: «ئێســـتا کە بە کەربوونی خۆت ڕازی نەبوو دەبێ کارێکت پێ بکەم هەتا ورد و درشـــت بێن پێت ڕابوێرن و ببیە تیزەجاڕی خەڵک. ئەوجار سواری بوو هاتە دەرەوەی شار و مستێک خۆڵەمێشی هەڵگرت و دۆعای بە سەردا خوێند و هەڵیهاویشـــت. لەڕێوە کۆشـــکەکە وەدەر کەوت. چووە ژووری و تێڕە و شـــتەکەی لێ کردەوە. مەجۆعمە جلەکانی هێنا و هاواری کرد کە کێ لە خۆی ڕادەبینێ ئەو ئەوانە بەرێ با بێ بیبا. ئینجا وێردێکی خوێند و ســـفرە لە بەر دمی ئامادە بوو. نانەکەی خوارد و وێردێکی دیکەی خوێند و شـــەراب ئامادە کرا. شـــەرابەکەی خواردەوە تا ســـەرخۆش بوو. ئەوجار قاپێکی ئاو هێنا و دۆعای بە ســـەردا خوێند و بە ســـەر عەلی جیوەیدا هەڵیپرژاند کە لە بیچمی کەردا بوو. گوتی: «وەک خۆی لێ بێتەوە.» عەلی هاتەوە قاڵبی مرۆڤ و وەک ئەووەڵێی لێ هاتەوە.

جووە گوتی: «عەلی، قســـەیەکت پێ دەڵێم بە قســـەم بکە و با لە دەســـت منیش ڕزگارت بێ. بڕۆ بە ڕێی خۆتدا و دەست لە زێنەب هەڵگرە. بردنی کراسی کچی من دژوارە. دەنا بە جادوویەک دەتکەم بە مەیموون. یان دێوێکت لێ ڕادەسـپێرم بتباتە پشت کێوی قاف فڕێت بدا. عەلی میســـری گوتی: «عوزرە من بەڵێنم داوە و هەر دەبێ ئەو جلانە بەرم.» جووە گوتی: «عەلی تۆ وەک گوێز دەچی هەتا نەتشـــکێنن ناخورێی. ئیدی قاپێکی ئاو هێنا و جادوویەکی بە سـەردا خوێند و بە سـەریدا هەڵیپرژاند و گوتی: «بچووە لە بیچمی ورچەوە. لەڕێوە عەلی جیوە چوو لە قالبی ورچەوە. زنجیری لە ملی کرد و ســـینگێکی گەورە بۆ چەقاند و بەســـتییەوە. بۆخۆشـــی چوو بە لای خواردن و خواردنەوەوە. جار جار پارووەیەکیشـــی بۆ ئەو داویشـــت. تا بوو بە ڕۆژ. جووە مەجۆعمەی لەوێ لا برد و لە ســووچێک دایناوە. بەرەوە دووکان ڕۆیشتن و عەلی جیوەیش وە دوای کەوت تا گەیشتنە دووکان.

جووە بە زنجیر عەلی بەستەوە و بۆخۆی چوو لە دووکان دانیشت. عەلی دەیبیست و تێگەیشت و نەیدەتوانی قسە بکا. وا بوو کابرایەکی بازرگان هات بۆ لای جووە و پێی گوت: «عوزە ئەو ورچەم پێ بفرۆشـە، ژنەکەم نەخۆشـە نۆژدار و تەبیبان دەڵێن دەبێ گۆشـتی ورچ بخوا و ڕۆنی ورچ لە خۆی بدا چاک دەبێتەوە. جووە خۆشـــحاڵ بوو لە دڵی خۆیدا گوتی: «دەیدەمێ با بیبا سـەرێ برێ و منیش دەحەسێمەوە.» عەلی میسـری لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەو کابرایە بە تەمایە ســـەرم برێ، تازە مەگین خودا فریام کەوێ دەنا ڕزگارم نابێ.» جووە بە بازرگانەکەی گوت: «چونکە نەخۆشـــت هەیە هەر وا دەتدەمێ، بیبە.»

بازرگان دەستخۆشی لێ کرد و زنجیری ورچەی گرت و ڕۆیشت. گەیشتە قەسابییەک، بە کابرای قەسابی گوت: «چەقۆ و شت بێنە و لەگەڵم وەرە. قەساب وێرد و چەقۆ و شتی هەڵگرت و بە دوای بازرگاندا ڕۆیشت. کە گەیشتنە ماڵی بازرگانەکە قەسابەکە دەست و پێی ئەوی بەست و خەریکی تیژکردنی وێر و چەقۆکان بوو. ورچە، واتە عەلی میسری زۆری بۆ خۆی هێنا و پەتک و زنجیری پچڕاند و هەڵات. بە باز بازێن و خۆ حەوادا هەڵات هەتا چوو خۆی بە کۆشکی جووەدا کرد. چونکە جووە دوای ئەوەی ئەوی دا بە بازرگانەکە بۆخۆی چووبووەوە بۆ کۆشکەکەی خۆی. کچەکەی پرسیاری کرد کە عەلی میسری چی لێ هات. جووە ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە. کچەکەی گوتی: «بانگی یەکێک لە جندۆکەکان بکە، لێی پرسە بڵێ ئەوەی کردووتە بە ورچ هەر عەلی میسرییە یان یەکی دیکە و فێڵی لە ئێمە کردووە؟ جووە لە بەر لێوییەوە شتێکی گوت و دێوێک بە دەنگییەوە هات. جووە لێی پرسی: «گەلۆ ئەو پیاوەی من کردوومە بە ورچ ئەوە هەر عەلی میسرییە یان کەسێکی دیکە و خۆی لێ کردووین و بەو فریوی داوین؟» لەڕێوە دێوە چوو عەلی میسری هێنا و لە پێش جووە داینا و گوتی: «ئەو ورچە عەلی میسرییە.» جووە وێردی بە سەر جامێک ئاودا خوێند و ئاوەکەی بە سەر ورچەکەدا هەڵپرژاند. لەڕێوە ورچە هاتەوە سەر بیچمی خۆی و بووەوە بە عەلی میسری مرۆڤ. کچی جووە کە تێی ڕوانی سەیری کرد کوڕێکی جوانچاک و قۆزە و ئاشقی بوو، عەلی دڵی چووە کچە جووەکە. کچە جووە گوتی: «گڵاو ئەو جلانەی منت بۆ چییە وا کارێک دەکەی باوکم ئاوات لێ بکا؟» عەلی میسری وڵامی داوە و گوتی: «قەولم داوە ئەو جلانەی تۆ بەرم بۆ زێنەب نەسابە و مارەی کەم.» کچە گوتی: «لە پێش تۆدا زۆری دیکە ویستوویان ئەو جلانە بەرن و زۆر ڕێشیان تاقی کردووەتەوە نەیانتوانیوە. ئەتۆ دەست لە تەماعە هەڵگرە.» عەلی گوتی: «یا ئەو جلانە لەگەڵ خۆم دەبەم یان مەجبوورم باوکت بکووژم.» جووە بە کچەکەی گوت: «ئاگات لێیە ئەو گڵاوە دەست هەڵناگرێ و خۆی بە دەست من بە کوشت دەدا.» ئەوجار ڕووی لە عەلی کرد و گوتی: «ئێستا دەتکەم بە سەگ.» وێردی بە سەر جامێک ئاودا کرد و بە سەر عەلی میسریدا هەڵپرژاند و گوتی : «ببە بە سەگ.» عەلی میسری لەڕێوە بوو بە سەگ و جووە و کچەکەشی دەستیان کرد بە خواردنەوەی شەراب. کە ڕۆژ بووەوە جووە سواری یەسترەکە بوو. بانگی عەلیشی کرد و عەلی کە ئەوڕۆ ببوو بە سەگ وە دوای جووە کەوت. سەگەل پێی دەوەڕین و بۆی دەهاتن. هەتا گەیشتنە دووکانی وردەواڵەفرۆشێک. کابرای وردەواڵەفرۆش سەگەکانی لێ دوور خستەوە. عەلی لە لای ئەو خەوت. دوای ئێستێک جووە ئاوڕی داوە، سەگەکە دیار نەبوو. وردەواڵەفرۆشیش دەرکی دووکانی گاڵە دا و بەرەو ماڵ بووەوە. سەگەکەش کە عەلی بوو، کەوتە شوێنی هەتا چووە ماڵی کابرا. کە کچی وردەواڵەفرۆش چاوی پێی کەوت. ڕووی گرت و گوتی: «بابە ئەو پیاوە غەوارەیەت بۆ هێناوەتە؟» کابرا گوتی: «پیاوی چی کچم ئەوە سەگە؟» کچی وردەواڵەفرۆش وڵامی

داوه و گوتی: «بابه ئەوه عەلی جیوەی میسرییه ئەو جووه به جادوو کردوویه به سەگ.» کابرا ڕووی له عەلی کرد و لێی پرسی: «ئەتۆ عەلی جیوەی میسریی؟» سەگەکه به ئاماژه گوتی: بەڵێ. ئەوجار کابرا له کچەکەی پرسی: «ئەو جووه بۆ کردوویه به سەگ؟» کچه گوتی: «له بەر جلەکانی قەمەری کچی کردوویه به سەگ. ئەمن دەتوانم لەو دۆخه ڕزگاری بکەم.» کابرا گوتی: «جا ئەگەر له دەستت دێ بۆ ڕاوەستاوی. کاری باش ئەوەندەی زووتری بکەی باشتره.» کچه گوتی: «ئەگەر بێت و من ماره بکا ڕزگاری دەکەم.» سەگه به سەر گوتی: باشه مارەت دەکەم.

لەڕێوه کچی وردەواڵەفرۆش جامێکی ئاو هێنا و له بەر لێوییەوه شتێکی گوت. له پڕدا هاوار بەرز بووەوه و جامەکه له دەس کچه بەربووەوه. کچه که تەماشای کرد ئەو دەنگه دەنگی کەنیزەکەی باوکی بوو به کچەی گوت: «خانمەکەم، قەول و قەراری ئێمه ئاوا نەبوو. ئەوه ئەمن بووم، تۆم فێری سیحربازی کرد. ئەویش بەو قەراره که هەرکەس لەگەڵ تۆدا زەماوەند بکا دەبێ لەگەڵ منیش زەماوەند بکا. دوایەش شەوێک بۆ تۆ بێ و شەوێک بۆ من. گوتم با له بیرت نەچێ.» کچی وردەواڵەفرۆش گوتی: «وایه، قەرارمان وابوو.»

باوکی کچه که ئەوەی بیست به کچەکەی گوت: «ئەوه، ئەوەی له کوێ فێر بوون؟» کچەکەی وڵامی باوکی داوه و گوتی: «ئەمن لەو فێر بووم و له خۆی پرسه ئەو له کێ فێر بووه؟» ئەوجار له کەنیزەکەی پرسی. کەنیزەکه گوتی: «ئەمن له لای عوزرەی جوو بووم. کاتێک ئەو دەچوو بۆ دووکان. ئەمن دەچووم کتێبەکانی ئەوم دەخوێندەوه تا وای لێهات هێندێک ڕووحم دەستەمۆ کردن و هەموو جۆره جادوویەکیان لێ فێر بووم. ڕۆژێکیان جووه مەست بوو. بانگی منی کرد و بۆ خەوگەکەی خۆی. ئەمن سەرجێیم نەکرد و گوتم: «هەتا موسوڵمان نەبی سەرجێیت ناکەم. ئەو موسوڵمان نەبوو. منیش پێم گوت: «دەی کەوایه بمفرۆشه.» ئیدی منی به تۆ فرۆشت و تۆش منت هێناوه ماڵێ. ئەمن سحر و جادووم فێری کچەکەی تۆش کرد و پێشم گوت بەبێ پرسی من هیچ کارێک نەکا. هەرکەس لەگەڵ ئەو زەماوەند بکا دەبێ لەگەڵ منیش زەماوەند بکا. شەوێک لەگەڵ ئەو بێ و شەوێک لەگەڵ من بێ. ئەوجار کچه جامێکی ئاو هێنا و وێردی به سەردا خوێند و به سەر سەگەکەیدا هەڵپرژاند. عەلی جیوه هاتەوه بیچمی مرۆڤ. عەلی میسریس تەواوی بەسەرهاتی خۆی بۆ وردەواڵەفرۆش گێڕاوه.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکه.

## که شەوی حەوسەد و هەژدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـکۆ! عەلی میسـری تەواوی بەسـەرهاتەکەی بۆ گێڕاوە. وردەواڵەفرۆش گوتی: «گەلۆ تۆ هەر بە زەماوەند لەگەڵ کچەکەی من و کەنیزەکەم قەناعەت دەکەی؟» عەلی میســـری گوتی: «من دەبێ لەگەڵ زێنەب زەماوەند هەر بکەم.» لەو جەنگەیەدا لە دەرگا درا. کەنیزە گوتی: «کێیە؟» قەمەری کچی جوولەکەکە گوتی: «عەلی میسری لە ماڵی ئێوەیە؟» کچی وردەواڵەفرۆش گوتی: «کچی جوو، ئەگەر لە مـاڵی ئێمە بێ چیـت لێی دەوێ؟» ئەوجـار بە کەنیزەکەی گوت: «دەرگـای لێ بکەوە.» کەنیزەکە دەرگـاکەی لێ کردەوە. قەمەر هاتە ژوورێ. عەلی میســـری چاوی پێی کەوت و لێی پرســـی: «ئەوە بۆ هاتوویە ئێرە؟» قەمەر گوتی: «ئەمن دانی پێدا دەنێم و شایەدی دەدەم کە خودا شەریک و هاوتای نییە و محەممەد پێغەمبەری خودایە. ڕووی لە عەلی میســـری کرد و گوتی: «لە ئیسلامدا مارەیی لە سەر پیاوانە یان لە سەر ژنانە؟» عەلی میسری گوتی: «پیاوان مارەیی دەدەن بە ژنان.» کچە جووەکە گوتی: «ئەمن مارەیی خۆم هێناوە، ئەوە کراس و شتەکەمە و ئەوەش لووتی باوکم. ئیدی لووتی باوکی هاویشتە بەر پێ عەلی میسری و گوتی: «ئەوە دوژمنی تۆش و دوژمنی ئیسلامیشم کوشت. هۆکاری کوشتنەکەش ئەوە بوو کاتێک جووە بە جادوو عەلی میسری کرد بە سەگ. شەو لە خەونیدا بە کچەیان گوت کە موسوڵمان بێ. کچە موســـوڵمان بوو. کە لە خەو هەســـتا، داوای لە بابی کرد موســـوڵمان بێ. باوکی موســـوڵمان نەبوو. کچە ئەوی بێهۆش کرد و بە بێهۆشـــی کوشـــتی. لووتی باوکی بڕی و لەگەڵ جلەکـانی خۆی هێنـای بۆ عەلی میســـری. دوای ئەوە عەلی میســـری ڕووی لە وردەواڵەفرۆش کرد و گوتی: «ســـبەینێ وەرن بۆ لای خەلیفە تا کچەکەت و کەنیزەکەت مارە بکەم.»

ئەوجار عەلی جلەکانی کچە جووەکەی هەڵگرت و بە کەیفسازی گەڕاوە بۆ ماڵی ئەحمەد دەنەف. لە پڕ کوڕێکی هەڵوافرۆشـــی دیت. هەر دەســـتی لێک دەدا و پەکم و ڕۆی بوو. لە بەر خۆیەوە دەیگوت: «سوبحانەڵلا خەڵک چەند حەرامخۆر بووە و کەس نازانێ شت چۆن دەفرۆشن.»

کە گەیشـــتە عەلی میســـری ڕووی تێ کرد و گوتی: «دا توخودا کەمێک لەو هەڵوایە بچێژە.» عەلی میسـری نەختێکی لە هەڵواکە خوارد و مەمنا دەرمانی بێهۆشـی تێ کرابوو، عەلی میسـری بێهۆش کەوت. هەڵوافرۆشـەکە جلەکانی کچە جووەکەی هەڵگرت و خسـتییە قوتووی هەڵواکەیەوە و لێی دا ڕۆیشت. ڕۆی ڕۆی تا تووشـی قازی بوو بانگی کرد، کاکی هەڵوافرۆش وەرە ئێرە. هەڵوافرۆش چوو بۆ لای و قوتووی هەڵواکەی دانا و مەجۆعمەکەی

لە ســــەر دانا و بە قازی گوت: «بەڵێ چیت دەوێ؟» قازی گوتی: «هەڵوام دەوێ.» کابرا کەمێکی وردە هەڵوا کۆ کردەوە و ویســـتی بیداتێ. قازی گوتی: «ئەوەم ناوێ، بۆخۆی کەمێکی هەڵوا لە گیرفانی دەرهێنا و پێشـــانی هەڵوافرۆشـــی دا و گوتی: «ئەگەر ئەلەوەت هەیە لێت دەکڕم.» هەڵوافرۆش کەمێکی لە هەڵواکە خوارد و بێهۆش کەوت. قازی دەســـتی دا قوتووەکە و کابرای هەڵوافرۆشـیشـــی لە ســـندووقێک خســـت و چوو بۆ ماڵی ئەحمەد دەنەف. ئەو قازییە حەسەن شوومان بووە. هۆکاری ئەو کارەش ئەوە بوو کە کاتێک عەلی میســری گوتی کە هەتا جلوبەرگی کچی ئەو جووە نەهێنم نایەمەوە و ماوەیەکیش بوو لێی بێخەبەر بوون و هەر نەهاتبووەوە نیگەرانی بوون. ئەحمەد دەنەف گوتی: «کوڕەکان بڕۆن وە دوای پێوشـــوێنی عەلی جیوە بکەون. هاوڕێکانی کەوتنە ســـۆراغی. حەســـەن شـــوومان جلی قازییەتی لە بەر کرد و وەدەر کەوت. هەڵوافرۆشـــی دیت و ئەوی ناســـییەوە کە ئەحمەدە بیژووە. ئەوی بێهۆش کرد و بە کەلوپەلەوە هێنایەوە ماڵی ئەحمەد دەنەف.

چل کەس لە داروودەســـــتەکەی ئەحمەد دەنەف لە ناو شـــــاری بەغدادا بە دوای عەلی میســـــریدا دەگەڕان. کە لە پڕدا عەلی ملکەڵ و هاوڕێکانی ئاپۆرەیەکیان دیت. کە چوونە پێشـــێ ســـەیریان کرد ئەوە عەلی میســـری لەوێ بێهۆش کەوتووە و خەڵکەکەش دەوریان داوە. خێرا وەهۆشـــیان هێناوە. عەلی میســـــری گوتی: «ئەوە من لە کوێم؟» عەلی ملکەڵ گوتی: «ئێمە ئەوە تازە گەیشـــتینە ئێرە و نازانین کێ وای لێ کردووی!؟» عەلی میســـــری گوتی: «هەڵوافرۆشـێک بێهۆشـــی کردم و جلەکانی کچە یەهوودیەکەم پێ بوو، بردوویە و ڕۆیوە. ناشـزانم کێیە و چووە بۆ کوێ.» عەلی ملکەڵ، گوتی: «ئەمن کەسـم لێرە نەدیتووە. ئێســتا هەســتە با بچینەوە بۆ لای ئەحمەد دەنەف. ئیدی ئەوان هەسـتان چوونەوە بۆ ماڵی ئەحمەد دەنەف. ئەحمەد دەنەف کە ئەوانی دیت سڵاوی لێ کردن و گوتی: «عەلی جلەکانی کچە جووەکەت هێنا یان نا؟» عەلی میســـری گوتی: «جلەکانی کچە یەهوودیەکە و لووتی[1] باوکیم هێنابوو، هەڵوافرۆشـــــێک منی بێهۆش کرد و لێی ئەســــــتاندم. لەو جەنگەیەدا عەلی شـــــوومان لە پەنایەک هاتە دەرێ و گوتی: «عەلی جلەکانی کچە جووەکەت هێنا یان نا؟» عەلی میسری بەسرهاتەکەی گێڕاوە و لە عەلی شوومانی پرسی: «ئەتۆ بە جێ و ڕێی ئەو هەڵوافرۆشە دەزانی؟» حەسەن شوومان گوتی: «ئەرێ دەزانم. هەستە با بڕۆین.»

ئیدی هەستا و دەستی عەلی میسری گرت و بردییە پەناکەوە. عەلی میسری دیتی ئەوە هەڵوافرۆش لەوێ بێهۆش کەوتووە. وە هۆشـــــیان هێناوە. کاتێک هەڵوافرۆش وە هۆش هاتەوە، تەماشای کرد ئەوە ئەحمەد دەنەف و عەلی میسری و چل کەسی دیکە لە چەتەکان لە دەوری وێســـتاون. ترســـا و گوتی: «ئەمن لە کوێم؟ کێ منی هێناوەتە ئێرە؟» حەســـەن

[1]. لە فارسـییەکەدا نووسـیویێ سـەری کابرا جووکەی هێناوە. کە لەگەڵ قسـەی کچی جووەکە کە لە ڕاسـتیدا ئەو باوکی دەکوژێ. بە حەسەن دەڵێ لووتیم بڕی بۆم هێنای. یەک ناگریتەوە.

شــوومان گوتی: «من تۆم گرتووە و هێناومییە ئێرە.» عەلی میســری گوتی: «بیژوو ئەوە تۆ بووی ئەو کارەت لەگەڵ من کرد؟» ویستی بیکوژێ. حەسەن شووومان گوتی: «مەیکوژە ئەو ئێسـتا خزمی تۆیە.» عەلی میســری گوتی: «بۆ خزمی منە؟» حەســەن گوتی: «ئەوە ئەحمەد بیژووی خوشــکەزای زێنەبی نەســابەیە.» عەلی میســری گوتی: «هەتیوە زۆڵە بۆ ئەو کارەت کرد؟» ئەحمەد بیژوو گوتی: «دایە گەورەم دەلیلە، پێی گوتم، ئەو کارە بکەم. ئەویش لەبەر ئەوە بوو کە زورەیقی ماسـیفرۆش بە دایە گەورەمی گوت کە عەلی میسـری چەتەیەکی تەواوە. دەزانم جووە دەکووژێ و جلەکانی کچە دێنێ.» هەر بۆیە دایە گەورەم بانگی منی کرد و پێی گوتم: «ئەحمەد، عەلی میســـری دەناســـی؟» منیش گوتم: «بەڵێ دەیناســم. ئەمن ماڵی ئەحمەد دەنەفم پێشــان دا.» نەنکم گوتی: «برۆ وەدوای کەوە ئەگەر توانی جلەکانی کچە جووەکە بێنێ، بە فێڵێک جلەکانی لێ بســـتێنە. ئەمن لە بیر ئەودا بووم فێڵێک ببینمەوە کە چاوم بە هەڵوافرۆشــێک کەوت. دە دینارم دایە و جام و هەڵوا و قوتوو و ســـندووق و مەجۆعمەکەم لێ کڕی. ئیدی ئەوجار، تۆم خســـتە ژێر چاوەدێرییەوە هەتا ئاوای لێ هات. دوای ئەوە عەلی میسری بە ئەحمەد بیژووی گوت: «ئێسـتا هەسـتە برۆ بۆ لای نەنکت و زورەیقی ماســـیفرۆش، پێیان بڵێ کە من جلەکانی کچە جووەکە و لووتی جووەکەشم هێناوە. پێشیان بڵێ: «کە سبەینێ لە دیوانی خەلیفە حازر بن و مارەیی زێنەبم لێ وەرگرن.

کە ڕۆژ بووەوە ئەحمەد دەنەف، عەلی میسری لەگەڵ خۆی برد. جلەکانی کچە جووەکە و لووتی جووەکەی لە سەر مەجۆعمەیەکی زێڕ دانا و بردنی بۆ دیوانی خەلیفە و کڕنۆشی برد.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و نۆزدەیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک عەلی میسری لەگەڵ ئەحمەد دەنەف چووە هەنتەشی خەلیفە، کڕنۆشـی برد. خەلیفە چاوی لێ کرد ئازایەتی لە سـیمایدا دیار بوو. پرسـیاری لە ئەحمەد دەنەف کرد کە ئەو گەنجە کێیە؟ ئەحمەد دەنەف گوتی: «خەلیفە، ئەوە عەلی میســـرییە. خەلیفە خۆشـــی ویســـت. ئەوجار عەلی جیوە لووتی جووەی لە پێش خەلیفە دانا و گوتی: «خەلیفە، ئەوە دوژمنی تۆیە.» خەلیفە گوتی: «ئەوە لووتی کێیە؟» عەلی جیوە وڵامی داوە: «ئەوە عوزرەی جوولەکەیە.» خەلیفە گوتی: «کێ کوشـتوویە؟» عەلی جیوە ڕووداوەکەی لە سـەرەتاوە تا کۆتایی بۆ گێڕاوە. خەلیفە گوتی: «ئەمن باوەڕەم نەدەکرد ئەتۆ کوشـتبێتت چونکە ئەو جادووبازێکی دەگمەن و بێ هاوتایە. عەلی میســـری گوتی کە خەلیفە، خودا بە دەستییەوە دام.

ئەوجار خەلیفە والی نارد بۆ کۆشـکی جووەکە. چاوی بە جەسـتەی بێ لووتی جووەکە کەوت. تەرمەکەیان هێنا بۆ لای خەلیفە. خەلیفە فەرمانی دا بی سووتێنن.

قەمەری کچی جووەکە هاتە لای خەلیفە و کڕنۆشـــی برد. بە خەلیفەی گوت کە ئەو، کچی یەهوودییەکەیە و موسـولْمان بووە. داوای لە خەلیفە کرد کە لە عەلی میســری مارە بکا. خەلیفە ئەوی لە عەلی میسری مارە کرد و کۆشکی جووەکەی بەو هەموو شکۆیەوە دا بە عەلی میسـری و گوتی: «عەلی داوام لێ بکە.» عەلی میسـری گوتی: «تکای من ئەوەیە لە بارەگای خۆت ئەرکم پێ بسپێری.» خەلیفە گوتی: «عەلی بنێرە بە دوای دارودەستەکەت لە میســر با بێن.» دوای ئەوە گوتی: «عەلی لە بەغدا خانووت هەیە؟» عەلی وڵامی داوە: «ناوەڵڵا خەلیفە، خانووم نییە.» حەسەن شوومان گوتی: «ئەوە من خانووەکەم بە تەواوی کەلوپەلەکانی ناوییەوە بەخشی بە عەلی میسری.» ئیدی خەلیفە فەرمووی: «حەسەن ماڵت ئاوەدان بێ و خانووی خۆت بۆ خۆت.» دوای ئەوە بانگی خەزێنەداری کرد و پێی گوت کە دە هەزار دینار بدە بە وەسـتاکار با خانوویەکی خۆش بۆ عەلی جیوە دروسـت بکا. دوای ئەوە خەلیفە پرسـی: «عەلی ئەگەر شـتێکی دیشـت دەوێ دەنگ بکە.» عەلی جیوە وڵامی داوە: «خەلیفە، بە دەلیلە چاوبەســـت بفەرموو زێنەبی کچیم داتێ و منیش جلەکانی کچە جووەکەی لە بری مارەییەکەی دەدەمێ.» خەلیفە ڕایسـپاردە دەلیلە کچەکەی بدا بە عەلی. دەلیلە فەرمانی خەلیفەی بەجێ هێنا و زێنەبی لە عەلی مارە کرد. کچی وردەواڵەفرۆش و کەنیزەکەشیان لێ مارە کرد. عەلی دەستی کرد بە عەیش و نۆش و ڕابواردن و هەتا سـی ڕۆژان ئەوە کاری بوو.

دوای ئەوە عەلی جیوە نامەیەکی بۆ دارودەستەکەی نووسی و ئاگاداری کردنەوە کە خەلیفە چی لەگەڵ کردووە. پێی گوتن هەستن بێن بۆ بەغدا. نامەکەی دا بە نامەبەر و بەڕێی کرد بۆ میسر. ئەوەندەی پێ نەچوو، هەموویان هاتن. عەلی جیوە ئەوانی لەو کۆشکەدا کە خەلیفە بۆی چێ کردبوو جێ کردەوە. دوای ئەوە بردنی بە خەلیفەی ناساندن. خەلیفە دانەدانەیانی خەڵات کرد. پاشان چووە لای زێنەبی کچی دەلیلەی چاوبەست. سەیری کرد. دوڕێکی نەسما و غونچە گوڵێکە تای نییە. دوای ئەوە چووە لای هەر سێ کچەکەی دیکەش. شەوێک بە ڕێکەوت عەلی جیوە لە لای خەلیفە بوو. خەلیفە فەرمووی پێم خۆشە بەسەرهاتی خۆتم لە ئەووەڵەوە بۆ بگێڕییەوە. عەلی تەواوی بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕاوە. خەلیفە فەرمانی دا تەواوی ئەو بەسەرهاتە بنووسنەوە و لە خەزێنەدا هەڵی گرن بۆ یادگار.

### چیرۆکی ئەردەشێر و حەیاتونفووس

یەکی دیکە لەو چیرۆکە خۆشانە، ئەوەیە کە دەگێڕنەوە لە شاری شیراز پادشایەکی گەورە و بەڕێزی لێ بوو بە نێوی «سەیف ئەعزەم». سەیف ئەعزەم شا بەرە و پیری دەچوو منداڵیشی نەبوو. حەکیم و تەبیبانی بانگ کرد و ڕاوێژی پێ کردن و گوتی: «ئەمن ئەوە تەمەنم بەرەو ژوور هەڵدەکشێ و کوڕیشم نییە کە ئەو وڵات و تاج و تەختەم بۆ ڕاگرێ، ڕاتان چییە، چ بکەم؟» گوتیان: پادشا ئێمە دەرمانێکت بۆ دەگرینەوە بە کارت دێ. ئیدی دەرمانێکیان بۆ گرتەوە و بردیانە خزمەت پادشا. پادشا دەرمانەی دەکار کرد و چووە لای خێزانی. بە ویستی خودای تەعالا ژنە دوو گیان بوو. کە نۆ مانگ و نۆ ڕۆژەی تەواو بوو، کوڕێکی بوو وەک مانگی چواردە. ناویان نا ئەردەشێر. ئیدی منداڵەیان پەروەردە کرد تا گەورە بوو. فێری زانست و ئەدەبیان کرد تا بوو بە پازدە ساڵ. لە عێراق و شامیش پادشایەکی لێ بوو، ناوی عەبدولقادر بوو. شاعەبدولقادر کچێکی بوو لە سەر چاوی کوێرت دانابایە چاکی دەکردەوە. ناوی کچە حەیاتونفووس بوو. ئەو کچە لە پیاوان بێزار بوو، بە جۆرێک کەس نەیدەوێرا لە لای ئەو باسی پیاوان بکا. زۆریەک لە پاشایانی ساسانی داوایان کرد. باوکی قسەی لەگەڵ کرد و ئەویش گوتی: «شتی وا نابێ و هەر باسیشی مەکە. من قەد شوو ناکەم. ئەگەر زۆریشم لێ بکەی خۆم دەکوژم.»

کاتێک ئەردەشێری کوڕی سەیف ئەعزەم تاریفی حەیاتونفووسی بیست. بابی لێ ئاگادار کردەوە. باوکی چاوێکی لێ کرد و زگی پێی سووتا. پاشان بەڵێنی دا حەتاتونفووسی بۆ بێنێ. هەر بۆیە وەزیرەکەی نارد بۆ خوازبێنی. باوکی حەیاتونفووس قەبووڵی نەکرد. وەزیر بە ناڕەحەتی و دەستبەتاڵی گەڕاوە و پادشای ئاگادار کردەوە.

سەیف ئەعزەم شا توورە بوو و گوتی: «چۆن پادشایەکی وەک من رووی لێ بنێم بۆ شتێک، جوابم ناداتەوە. ئیدی فەرمانی دا جارچی جاڕ بدا لەشکر چادر و خێوەتان لە دەرەوە هەڵدەن و خۆیان بۆ شەڕ ساز کەن. گوتیشی لە عێراق ناگەڕێمەوە هەتا جوقەواریان لێ نەبڕم و وڵاتەکەیان خاپوور نەکەم.

کاتێک ئەردەشێری کوڕی ئەو هەواڵەی بیست، لە جێ هاتە دەرێ و چوو بۆ لای باوکی کڕنۆشی برد و پێی گوت: «پادشا خۆت مەخە نارەحەتییەوە.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

## که شەوی حەوسەد و بیستەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەردەشێر گوتی: «بابە خۆت مەخە نارەحەتییەوە. لەشکری بۆ بەڕێ مەکە. چونکە هەموو کەس دەزانێ هێز و دەسەڵاتی تۆ لە شاعەبدولقادر زیاترە و ئەگەر بێتوو هێرشی بکەیتە سەر ئەوە لەشکرەکەشی تەفروتوونا دەکەی و وڵاتەکەشی کاول دەکەی. خۆیشی دەکوژی. ئەودەم کچەکەی کە ئەو شتانە ببینێ، خۆی دەکوژێ و ئەمنیش لە تاوان دڵم دەتۆقێ و هەموو شتێک تەواو دەبێ. پادشا گوتی: «ئەی ڕۆڵە گیان دەڵێی چی بکەین؟» ئەردەشێر گوتی: «بابە ئەمن جل و بەرگی بازرگانان لە بەر دەکەم و وە دوای کاروباری خۆم دەکەوم.» پادشا گوتی: «ڕۆڵە گیان چۆنت پێ باشە ئاوا بکە.» دوای ئەوە بانگی وەزیرەکەی کرد و پێی گوت: «خۆت ساز بکە و لەگەڵ کوڕەکەم بچووە بۆ سەفەر. یارمەتی بدە کارەکەی جێبەجێ بکا. تۆ لەوێ لە جێی منی. ئاگات لێی بێ.» وەزیر گوتی: «بە سەر سەر و سەر چاو.»

ئیدی پادشا سێسەدهەزار دیناری زێڕ و گەوهەری گرانبایی دا بە کوڕەکەی. ئەوجار شازادە چوو بۆ لای دایکی و دەستی ماچ کرد و ڕوخسەتی لێ خواست. دایکیشی دوعای بە خێری بۆ کرد و بابی سەدهەزار دیناری لە زێڕ و گەوهەرەکانی خۆی کە لە پادشاکانی پێشووەوە بە میرات بۆی مابووەوە دایە. دوای ئەوە شازادە جلی بازرگانانی لە بەر کرد. ئینجا ماڵاوایی لە پادشا کرد. لەگەڵ وەزیر و خزمەتکار و کۆیلەکانی کەوتنە ڕێ. شەو و ڕۆژ هەر ڕۆیشتن. کاتێک سەفەرەکەیان زۆری خایاند شازادە ئەو شیعرەی خوێندەوە:

سەودای بینینی یاری جوان
خستمییە ناو دەشت و کێوان
بێ بەزەیە خۆشەویست
چ ناناسێ پیر و جوا
تیری عەشقت جەرگمی بڕی
بریـــــــن نە یەکە و نە دوان

که شێعرەکەی تەواو بوو لە تاوان بە لادا کەوت. وەزیر گوڵاوی بە سەردا هەڵپرژاند تا وە هۆش هاتەوە. کە وە هۆش هاتەوە وەزیر پێی گوت: «شازادە هێمن بە، هێمنی کلیلی هەموو دەرگا داخراوەکانە. ئێمە ئەوە بەرەو ئەوێ دەچین و ئەوەندەی نەماوە بە دیداری شاد بی.

ئیدی هەر ئاوا دڵخۆشی دەداوە و بەرەو ئامانج دەڕۆیشتن. کە ماوەیەکی دیکە ڕۆیشتن

و نەگەیشتنێ، دیسان ئاوری خۆشەویستی بڵێسەی دا. ئەو شێعرەی گوت:

پێی بڵێن بە شای جـــــــــــــوانان
لاوێ داوێن لە بیـــــــــــــابان
حـاشـــــای لە گشـــت شـــتێ کردووە
ســـەرێکە و هـــــــــــــەڵی گرتووە
لە بۆ چنینی گـــــــــــــوڵی ڕووت
پـــادشـــــــایەکە و بـــووە پەرپـــووت

ئەوجار دەستی کرد بە گریان. وەزیر دڵخۆشی داوە و بەینێک ڕۆیشتن هەتا لە شاری بەیزا نیزیک بوونەوە. وەزیر گوتی: «مووژدە بێ ئەوە شـــاری بەیزایە. ئەو شـــارەی تۆ دەتهەوێ. شازادە لە ڕادەبەدەر خۆشحاڵ بوو. پاشان ئەو شێعرەی گوت:

هـاتـمە دەرکـت تـۆی مەبەســـتـم
گوێ گرە لە ســـــــــــــۆز و هەستم
لێرە و لەوێ ناوم بـــــــــــــیستووی
شـــەیـدات بووم هەرچەنـد نەمـدیتووی

کە چوونە ناو شـار لە کاروانسەرایەک لایاندا و دوو سێ ڕۆژێک حەسانەوە. ئەوجار وەزیر هەستا فکرێک بۆ شازادە بکاتەوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەوسەد و بیست و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک وەزیر و شازادە گەیشتنە کاروانسەرا و لەوێ حەسانەوە، وەزیر هەستا ڕێگایەک بۆ شازادە ببینێتەوە. وا بوو بە شازادەی گوت: «فکرێکی چاکم بە زەین گەیشت.» شازادە گوتی: «چ فکرێکت بە زەین گەیشت؟» وەزیر گوتی: «دەمەوێ لە چەقی بازاڕی بەزازان دووکانێکی بەزازیت بۆ دانێم. شوێنەکەی وا بێ چاک و خراپی پێدابێ. ئەمن پێم وایە ئەگەر تۆ لە دووکان دانیشی، وردەوردە خەڵک هەموو دەتبینن. بەو شێوەیە دەکەوێ سەر زاری خەڵک و بە ئاواتت دەگەی.» شازادە گوتی: «وەزیر فکرەکەت فکری چاکە.»

لەڕێوە لەگەڵ شازادە هەستان و جلوبەرگی گرانبایی و ڕێکوپێکیان لە بەر کرد و هەزار دینارێ زێڕیان لەگەڵ خۆیان برد و وەدەر کەوتن. لە شاردا سووڕانەوە و خەڵک کە دەیاندیتن چاویان تێ دەبڕین و بە دیتنی شازادە سەریان سووڕ دەما و دەیانگوت ئەوە دەبێ فریشتە و شت بێ. لە وەچەی مرۆڤ نییە. خەڵک دوور و نیزیک بە دوایاندا دەڕۆیشتن هەتا گەیشتنە بازاڕی بەزازان. لەوێ ڕاوەستان. کابرایەکی ڕێکوپێک و مەند هاتە پێشێ و سڵاوی لێ کردن. ئەوانیش سڵاوەکەیان ئەستاندەوە. کابرا گوتی: «بەڕێزان ئەگەر کارێکم لە دەست دێ لە خزمەتتاندام.» وەزیر گوتی: «کاکە، ئەو کوڕە کوڕی منە و دەمهەوێ لەو بازاڕەدا دووکانێکی بۆ دانێم و بۆخۆی فێری کڕین و فرۆشتن بێ.» کابرا لەڕێوە کلیلی دووکانێکی دانێ و بە دەڵاڵەکانی گوت بۆیان خاوێن کەنەوە. وەزیر ناردی فەرشی حەریری قەراغ زێڕینیان هێنا بۆ دووکان. ئەوەندەی پێویست بوو، کەلوپەلی گرانبایی بۆ کڕی. بۆ ڕۆژی دوایی کۆیلە دووکانی هەڵگرت و شازادە چوو لە دووکان دانیشت و دوو بەردەستی دیبا لە بەر لە پێشی ڕاوەستان. دوو حزمەتکاری کەم تەمەنی حەبەشیشی لە دووکان ڕاگرت. وەزیر داوای لە شازادە کرد دان بە خۆیدا بگرێ و هیچ نەهێنییەک نەدرکێنێ. ئەوەشی پێ گوت، هەرچی دیتت و بیستت هەموو ڕۆژێ بۆم بگێڕەوە. بەو جۆرە شازادە بوو بە بەزاز.

خەڵک ناوبانگی جوانی شازادەیان بیست و لە هەموو لایەکەوە دەستە دەستە ڕوویان لە بازاڕ دەکرد و دەهاتن تێی ڕادەمان. ئاپۆڕەی جەماوەر کارێکی دەکرد ڕێی لە ڕێبواران دەبڕی. شازادەش واقی وڕ مابوو. هەر بەملا و ئەولادا دەیڕوانی و بە تەماش بوو، گوێی لە قسەی نیزیکانی پادشا بێ، بەشکوو باسی کچی پادشا بکەن. کەچی هەر گوێشی لە هیچ نەدەبوو. هەر بۆیە نارەحەت و دڵمەند دەبوو. وەزیر هەموو ڕۆژێک پێی دەگوت ئەوڕۆ پەیدا دەبێ نارەحەت مەبە. ماوەیەک ئاوا تێپەڕی و هیچ خەبەرێک نەبوو. هەتا وا بوو

ڕۆژێک پیرێژنێک بە جلی چاکەکاران و پارێزکارانەوە هات و دوو کەنیزی جوانیشی لەگەڵ بوو. کە گەیشتە بەر دەرگای دووکانی شازادە ماوەیەک لێی ورد بووەوە و لە بەر خۆیەوە گوتی: «پاکە ئەو خودایەی ئەو سیما جوانەی خوڵقاندووە.» ئینجا سڵاوی کرد. شازادە سڵاوەکەی ئەبستاندەوە و فەرمووی کرد لە پەنای دانیشێ. پیرێژنە لێی پرسی: «کوڕی جوانم لە کام شارەوە هاتووی؟» شازادە گوتی: «دایە من خەڵکی لای هێندم و بۆ گەڕان هاتوومە ئەو شارە.» پیرێژنە گوتی: «لە کاڵا و قوماشەکانت شتێکی وام دەیە شیاوی شایان بێ.» شازادە هەرکە گوێی لە قسەی پیرێژنە بوو، گوتی: «ئەمن هەموو جۆرە شتێکم هەیە. هەر پێم بڵێ بۆ کێت دەوێ؟ پیرێژنە گوتی: «ڕۆڵە گیان، من دەمەوێ زۆر جوان و ڕێکوپێک و گرانبایی بێ.» شازادە گوتی: «باشە پێم بڵێ بۆ کێت دەوێ تا شتی شیاوی ئەوت بدەمێ.» پیرێژنە گوتی: «ئەو شتانەم بۆ خانمەکەم، حەیاتوننفووسی کچی شا عەبدولقادر دەوێ.» شازادە کە ئەو قسەیەی لە پیرێژنە بیست، هەوساری ئەقڵی لە دەست بەر بوو، دەستی برد کیسەیەکی دەر هێنا و دای بە پیرێژنە. کە سەد دیناری تێدا بوو. ئەو سەد دینارە بدە بە سابوونی جل شوتنەکەت. دوای ئەوە دەستی برد کراسێکی دەهەزار دیناری لە بوخچەیەک دەر هێنا و دای بە پیرێژنە و گوتی: «ها ئەوە یەکێک لەو شتانەیە کە هێناومە بۆ ئەم وڵاتە. پیرێژنە کە ئەوەی دیت تووشی زەندەمان و سۆسرەت بوو. بە شازادەی گوت: «کوڕی جوان ئەو کراسە بایی چەندەیە؟» شازادە گوتی: «جا ئەوە چییە، بایی هیچ نییە.» پیرێژنە دیسان لێی پرسییەوە. شازادە گوتی: «بە خودا هیچتان لێ وەرناگرم. ئەگەر شازادە خانمیش قەبووڵی نەکرد بۆ خۆتی هەڵگرە. شوکری خودا کە لەگەڵ تۆی ئاشنا کردم، چونکە ئەگەر کارێکم بۆ بێتە پێشێ تۆ یارمەتیم دەدەی.» پیرێژنە نوقمی وتەی جوان و ئەدەب و گەرم و گوڕی و مەند و ماقووڵی شازادە ببوو. ئیدی لێی پرسی: «کوڕم، نێوت چییە؟» شازادە گوتی: «نێوی من ئەردەشێرە» پیرێژنە گوتی: «وەڵا سەیرە، ئەو ناوە ناوی پادشایانە و ئەتۆش جلی بازرگانانت لە بەر دایە.» شازادە گوتی: «باوکم زۆری خۆش دەویستم و ئەو ناوەی لە سەر ناوم، خۆ نێو دیاردەی بنەچەک نییە.» پیرێژنە گوتی: «ڕۆڵە گیان، ئەتۆ پارەی شتی خۆت وەرگرە.» شازادە سوێندی خوار کە هیچ وەر ناگرێ.

پیرێژنە گوتی: «ڕۆڵە گیان، ئەوەی بزانە کە هەرکەس ڕاست بێ ڕاستی وەڕێ دێ و ئەو دڵاوایییەی تۆش بێ هۆ نییە، دوور لە تۆ پێشینیان گوتوویانە: «قشقەڕە لە خۆڕا پشتی گامێش ناخورێنێ.» ئێستا پێم بڵێ چ نیازێکت لە دڵی دایە، بەشکوو قسمەت وابێ بتوانم یارمەتیت بدەم. ئیدی شازادە دەستی پیرێژنەی گرت و داوای لێ کرد بەڵێنی پێ بدا، ئەو ڕازەی لای کەس نەدرکێنێ. ئەوجار بەسەرهاتەکەی خۆی و باسی ئەڤینی خۆی بۆ کچی شا عەبدولقادر بۆ گێڕاوە. داپیرە سەری ڕاوەشاند و بە شازادەی گوت: «ڕاست دەکەی.

بەڵام ڕۆڵە گیان ئێستا تۆ لێرە بە بازرگانێک دادەندرێی. ئەگەر کلیلی تەواوی خەزێنەکانی دنیایەت پێ بێ، هەر پێت دەڵێن بازرگان. ئەگەر بتەوێ کچێکی لە چینی خۆت سەرتر بێنی دەبێ داوای کچی قازی یان کچی ئەمیرێک بکەیت. کوڕم ئەوە چۆنە لە سەر کچی پادشا شین بوویەوە. کە کچێکی منداڵکاری دنیا نەدیوە و قەت قەت لە کۆشک نەهاتووەتە دەرێ. تاقانەی باوکییەتی و لە چاوی خۆشتر دەوێ. کوڕی خۆم بزانە چیت پێ دەڵێم. ڕاستی لە من ببیستە و گوێ ڕاگرە بزانە دەڵێم چی.» شازادە گوتی: «فەرموو، گوێم لێیە.» دایە پیرە گوتی: «کوڕی خۆم تۆ داوای کچی وەزیرم لێ بکە بزان چۆنت بۆ جێبەجێ دەکەم. ئەتۆ بە تەمای بە بازێک بچییە ئاسمان. شتی وا نابێ.» شازادە گوتی: «دایە تۆ ژنێکی ژیر و دنیادیتووی و هەموو شتێک باش دەزانی. تا ئێستا کەسێکت دیوە سەری بێشێ و دەستی تێمار بکا؟» پیرێژنەکە گوتی: «ناوەڵڵا.» شازادە گوتی: «کارەکەی منیش ئاوایە. ئەمن کەسی دیکەم ناوێ. کەسی دیکەش هەستی من دانامرکێنێ جگە لەو. بە خودا ئەگەر بێتوو کارێکم بۆ نەکەی شێت دەبم و دەمرم. دایە تۆ ڕەحم بە غەریبییەکەم بکە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەوسەد و بیست و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! شـــازادە گوتی: «بەزەییت بە غەریبییەکەمدا بێ.» پیرێژنە گوتی: «ڕۆڵە، بە خودا بەو قســـانە هەموو جەرگم کونەکون دەبێ. بەڵام چی بکەم هیچ ڕێگایەکم پێ شـــک نایە.» شـــازادە گوتی: «تکات لێ دەکەم نامەیەکی لە لایەن منەوە بۆ بەرە و لە جیاتی من دەستی ماچ بکە.» پیرێژنە زگی پێی سووتا و گوتی: «هەرچی پێت خۆشە بۆی بنووسە. با بۆی بەرم.» شازادە کە ئەوەی بیست لە خۆشیان خەریک بوو بفڕێ. بە لەز پێنووس و لێنووسی هێنا و ئەو شێعرانەی نووسی:

مەلی دڵ وا بەرەو لات دەفـــــــــــــــڕێ
ســــــۆزی نەی هەنــاوە، بــۆت دەچــڕێ
گەر هەســـــت پێ دەکەی دووکەڵێ لە دوور
دڵی ســـــــــــــــــووتاومە بۆ تۆ دەگڕێ
من و دەشت و دەر هــــــــــــەر باسی مەکە
هـــــــــــــــــــیزی ئەوینتە ڕێم بۆ دەبڕێ

کە لە نامەکە بووەوە. پێچایەوە و دای بە پیرێژنەکە. دەستیشی برد، توورەکەیەکی دەر هێنا کە ســـەد دیناری زێڕی تێدا بوو، داییێ و گوتی ئەو زێڕانەش بە ســـەر کەنیزەکاندا دەبەش بکە. پیرێژنە وەری نەگرت و گوتی: «ڕۆڵە من چاوم لە زێڕ و ماڵ نییە.» شـــازادە گوتی: «هەر دەبێ لێم وەرگری.» ناچار پیرێژنە وەری گرت و دەستی شازادەی ماچ کرد و گەڕاوە لای شـازادەخانم. گوتی: «خانمەکەم شـتی وام بۆ هێناوی لە هیچ کوێ شـتی وا وەگیر ناکەوێ. ئەو شـتانەشـم لە کوڕێک کڕیوە، جوانچاک و قۆزی وا هەر نییە. چاو لەو کراسە تەشک زێڕینە بکە لە لای ئەوم هێناوە.» هەرکە کراسەکەیان بڵاو کردەوە کۆشـک بە تشـکی ڕووناک بوو. ئەوەی لەوێ بوو، ســـەری لەو گەوهەرانە ســـوورِ مابوو کە لەو کراسەدا دەکار کرابوو. کچە لێی ورد بووەوە و فکری کردەوە کە ئەو کراسە بە قەد پیتاکی دە ساڵی وڵاتەکەی باوکی تێچووە. لە پیرێژنەی پرسی: «ئەو کراسە ئی ئەو کوڕەیە یان لە یەکی دیکەت کڕیوە؟» داپیرە جوابی داوە ئەو کراســـــەم لە لای ئەو کوڕە قۆزەوە هێناوە. شـازادە خانم پرسی: «دایە ئەو بازرگانە خەڵکی ئێرەیە یان لە شوێنێکی دیکەوە هاتووە و غەریبە؟» پیرێژنە وڵامی داوە: «خانمەکەم غەریبە و ماوەیەکە هاتووەتە ئێرە. بەڵام خانم بە خودا ئەو کوڕە ئەوەندە جوانە، ئەوەندە ڕێکوپێکە ئەوەندە ئاکار جوانە سەیر. شـتی وام قەت قەت نەدیوە مەگین تۆ.» شـازادە خانم گوتی: «زۆر ســـەیرە. خۆ ئەو کراســـە نرخی

دیاری ناکریٚ. چۆن دەکریٚ بازرگانێک شــتی ئاوای هەبیٚ؟ دایە گوتی نرخی ئەو کراســە چەندەیە؟» داپیرە گوتی: «خانم بە خودا ئەو گورە گوتی: «جا ئەوە چییە تا قیمەتی لە سەر دانێم ئەوە هەر دیارییەک بیٚ لە منەوە بۆ کچی شا. ئەو کراسە هەر شایانی ئەوە و بۆ کەسی دیکە نابیٚ. ئەو زێرانەی پێدا ناردبووم لێی ورە نەگرتم. بە خودا زۆریشم حەول دا لێی وەر نەگرتم. جگە لەوە گوتیشــی ئەگەر کچی شــا پێی ڕازی نەبوو هەڵی گرە بۆ خۆت.» کچی پادشـــا گوتی: «ئەو دلاواییە بیٚ وێنە و کارێکی گەورەیە کاری کەس نییە. ئەمن هەر لە خۆڕا دڵم دەترسیٚ نیگەرانم. شتێک بیٚ. دایە، بۆ لێت نەپرسی بزانیٚ چ کارێکی هەیە بۆی جێبەجیٚ بکەین؟» داپیرە گوتی: «خانمەکەم لێم پرسی چ کارێکی هەیە؟» گوتی: «کارێکم هەیە بەڵام پێی نەگوتم چ کارێکی هەیە هەر ئەو کاغەزەی دا بە من و گوتی: «ئەوەی بدە بە شازادە خانم.» شازادە کاغەزەکەی لیٚ وەرگرت و خوێندییەوە. ڕەنگی تێک چوو. زەرد هەڵگەڕا و گوتی: «ئەو گلاوە چۆنی وێراوە قســەی ئاوا بۆ کچی پادشـــا بنووسیٚ؟ چ پێوەندییەک لە نێوان من و ئەو گلاوەدا هەیە نامە بۆ من دەنووسیٚ؟ بە خودا ئەگەر لە ترسی خودا بموێرابایە دەمنارد قۆڵبەستی کەن و گویٚ و لووتی ببڕن و پاشان لە چەقی بازاڕ لە دارم دەدا.»

داپیرە کە ئەوەی بیست، تەواوی گیان دەستی کرد بە لەرزین و ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و زمانی گیرا. پاش ئیســتێک کەمێک ورەی هێناوە بەر خۆی و گوتی: «خانمەکەم بۆ چی لەو کاغەزەدا نووســی بوو، ئاوا تێک چووی؟» گوتی: «دایە، هێندێکی شــێعر و قســەی ناحەز تێدا نووســیوە. بەڵام ئەو لە ســیٚ حاڵت بەدەر نییە و ڕێی بە خۆی داوە و ئاوا هاتووەتە پێشیٚ. یان شێتە و دەیهەویٚ سەری خۆی بە با دا یان ئەوەیکە بۆ گەیشتن بە من پشتی بە دەســەلات و پادشــایی و شــتی خۆی بەســتووە. یان دەنا وەیزانیوە من قەحبەیەکم و هەر شەوەی لەگەڵ کەسێک ڕۆژ دەکەمەوە وا ئەو شێعرانەی بۆ من نووسیوە.» داپیرە گوتی: «خانمەکەم، بە خودا ڕاســت دەفەرمووی. بەڵام چ موبالاتێکی مەدەیە. ئەو گلاوی گەمژەیە. ئەوە تۆ لە کۆشکی خۆت دانیشتووی و باڵدار ناتوانیٚ بە سەریدا بفڕیٚ. ئێستا تۆ نامەیەکی بۆ بنووسە و کەمێکی سەرکۆنە بکە و هەڕەشــەی کوشــتنی لیٚ بکە. بڵیٚ ئەتۆ کێی نامە بۆ من دەنووســی خۆ من تۆ ناناســم. بازرگانێکی خوێڕی بووی یان نەبووی. دایمە بە دوای درەم و دینارێکدا هەڵوەدای و، دەر و دەشــت دەپێوی. قەســـەم بە خودا وە خۆ دێیەوە و دەســت لەو خەون و خەیاڵە هەڵدەگری چاکە دەنا دەنا دەڵێم لە نێوەڕاســتی بازاڕ لە دارت بدەن.» شــازادە خانم گوتی: «دایە، دەترســم ئەگەر من شــتێکی بۆ بنووســم بڵیٚ ئەوە پێی خۆشـــە بۆیە وڵامی نامەکەی بۆ نووســـیومەوە.» داپیرە گوتی: «ئەتۆ بۆیە نامەی بۆ دەنووسی هەتا هەڕەشەی لیٚ بکەی و بیترسێنی تا دەستت لیٚ هەڵگریٚ.

با لە کورتی بیبڕینەوە، پیرێژنە کارێکی کرد هەتا شــازادە خانم دەســتی دا پێنووســی و

ئەو چەند شیعرەی بۆ نووسی:

ئەی بەڕەڵا، بــابــردەڵەی گەبــچــاری دیــنــار
لە خــــــــــــــــــۆبایی پلە نەزمی، نۆکەری دینار
کـوا مـن و تـۆیـان گـوتـووە و ئەو پـێـوەنـدیـیە
بە ئـامــاژە دەکـوژرێـی نەک، بە زەبـری دیـنـار
بە ڕێـــــــی خـۆتـدا بـگەڕێـوە، ئەگەر تـۆ ژیـری
خــــــــــــــــۆ ناگریَ لە بەر هێزم، لەشکری دینار

کە ئەو بەیتانەی نووسـی پێچایەوە و دای بە پیرێژنەکە. پیرێژنەکە نامەکەی وەرگرت و بەرە و دووکان کەوتە ڕێ. کە گەیشتە دووکان نامەکەی دا بە شازادە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که ئەوی حەوسەد و بیست و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! پیرێژنەکە نامەکەی دا بە شازادە و پێشی گوت کە کاتێک شازادە خانم نامەی ئەوی خوێندووەتەوە، تووڕە بووە و ئەو دڵخۆشی داوەتەوە و ڕازی کردووە وڵامی نامەکە بنووسێتەوە. شازادە بە دڵخۆشی نامەکەی لێ وەرگرت و خوێندییەوە. کە خوێندییەوە زۆر گریا. داپیرە زگی پێی سووتا و گوتی: «ڕۆڵە گیان خودا دڵ بە خەم و چاو بە فرمێسکت نەکا.» شازادە گوتی: «بە بڕوای تۆ من چی بکەم، لە کاتێکدا ئەو هەڕەشەی کوشتن لە من دەکا و سەرکۆنەم دەکا لەبەر ئەوەی نامەم بۆ نووسیوە؟» ئەگەر ئاوا بێ، مردنم زۆر لەو ژینە باشترە. بەڵا ئەوجارەش ئەو چاکەیەم لەگەڵ بکە و ئەو نووسراوەیەی بۆ بەرەوە.» داپیرە گوتی: «بینووسە لە سەر خودا. ئیشەڵڵا وڵامەکەیت بۆ دێنمەوە. ڕۆڵە بە خودا قەسەم من خۆم دەخەمە مەترسییەوە بۆ ئەوەی تۆ بە ئاواتت بگەیت.» شازادە سپاسی کرد و دەستی ماچ کرد. ئەو شێعرەی نووسی:

خەمۆکیم گرتووە بە دەست خەمی تۆ
دەردم کارییە لە سوێی عیشقی تۆ
پشتم وەک کەمان چەماوەتەوە
بەفری گەنجێتیم تواوەتەوە
تا کەی لە خودای عەشق ناترسی
لە دەردی دڵی شەیدات ناپرسی

دوای ئەوە نامەکەی پێچاوە و دای بە پیرێژنە و دوو کیسەشی دایە کە دووسەد دیناریان تێدا بوو. پیرێژنە مەکرە گێلاخەی دەکرد و کیسەکانی وەر نەدەگرت. شازادە سوێندی لێ خوارد کە دەبێ وەریان گرێ. ئیدی پیرێژنە کیسەکانی وەرگرت و بە شازادەی گوت: «بە کوێری چاوی نەیاران بە ئاواتت دەگەیەنم.» ئەوەی گوت و وەڕێ کەوت. کە گەیشتەوە لای حەیاتوننفووس، نامەکەی دایە. شازادە خانم گوتی: «دایە، ئەوە چییە هەر دێی و دەچی و نامەیەک دێنی؟ زۆر دەترسم بە بۆنەی ئەو نامانەوە ئابڕووم بچێ.» پیرێژنەکە گوتی: «خانمەکەم بۆ ئابڕووت دەچێ؟ لەبەر چی؟ کێ دەتوانێ باسی ئەوانە بکا؟» ئەوجار شازادە خانم نووسراوەکەی لێ وەرگرت و خوێندییەوە. کە خوێندییەوە دەستەکانی لێک دا و گوتی: «سوبحانەڵڵا، هاشا ئەو بەڵایەی تووشی من بووە. نازانم ئەو کوڕە لە کوێوە پەیدا بوو. بوو بە بەڵای گیانم.» پیرێژنە گوتی: «خانمەکەم ئەتۆ وڵامی نامەکەی بۆ بنووسەوە بەڵام کەمێک بە ڕاشکاوی پێی بڵێ ئەگەر ئەوجار نامەم بۆ بنووسی

دەتکوژم. شــازادە خانم گوتی: «دایە من دەزانم ئەو کارە هیچ ئاکامێکی نابێ و وا باشــە هەر وڵامی نەدەمە.» هەر وەک جاری پێشــوو پێم گوت، ئەگەر ئەو ســەگە دەســتم لێ هەڵنەگرێ دەیکوژم.» پیرێژنە گوتی: «ئەتۆ هەر ئەو قسـەیە بە نووسـراوە بنووسـە و تێی گەیەنە.» ئیدی شـــازادە خانم لەرێوە داوای پێنووس و لێنووســـی کرد و درێژەی بە هەڕەشەکانی دا و گوتی:

دەتـکـووژم و خـوێـنـت وەکـوو بەفەری پـار
نامێنێ شـــــــــوێنی لە دەرک و حەسار
وەگەرێوە تـــــــــــۆ، بۆچی بکوژرێی؟
بۆچی لە غـــــــــوربەت بەو دەردە ببرێی
چاوت هەڵێنە و بـــــــــزانە تۆ کێی
لەگەڵ کـێ دەدوێـی، ئەو کـێـیە و تـۆ کـێـی

ئەوجار نامەکەی پێچاوە و دای بە پیرێژنەکە. پیرێژنە نامەکەی وەرگرت و کەوتە ڕێ. کە گەیشتە لای شازادە، نامەکەی دایە.

شـازادە نامەکەی وەرگرت و خوێندییەوە. کە لە خوێندنەوە بووەوە، مات بوو. سـەری داخست و بە قامکی لە عەرزەکە وەر دا. داپیرە لێی پرسـی: «ڕۆڵە گیان ئەو چی بووە، بۆ مات بووی؟» کوڕە گوتی: «جا دایە بڵێم چی؟ کاتێک قسـەکانم هەر ناکۆکی و دوژمنایەتی دروسـت دەکا.» پیرێژنە گوتی: «ئەتۆ نامەیەکی بۆ بنووسـە و هەموو شـتێکی پێ بڵێ. مەترسـە ناهێڵم زیانت پێ بگەیەنێ، ئەرخەیان و گەشـبین بە، من کارێک دەکەم ئێوە پێک بگەین.» شازادە سپاسی داپیرەی کرد و دەستی ماچ کرد. پاشان ئەو شێعرەی نووسی:

لەگەڵـم هـێـنـد بە قـیـن و قـار مەبە شـــازادە
با ئەتۆی جوان، شـازادە بی و من پارســــــــەکزادە
تـــا لە دەلاقەی ئەویــنەوە بـــۆی نەڕوانـــی
بە کزەی برینی دڵی شـــــــــــەیدام نازانی
هەڕەشـــەم لـێ دەکەی کە بـمـکـوژی دەشـــتـوانـی
جێژنە بۆ من کە بکوژرێم بە دەســـت خوای جوانی

ئەوجار نامەکەی پێچاوە و دای بە دایەپیرە و ســەد دیناری زێڕیشـــی دایە. پیرێژنە دۆعای بە خێری بۆ کرد و ڕۆیشت. چووەوە لای کچی پادشا و نامەکەی دایە. کچی پادشا نامەکەی وەرگرت و هەتا ئاخری خوێندییەوە. کە لە خوێندنەوەی بووەوە فرێی دا و هەستا

حەوا. کەوشـە زێڕ و ڕازاوەکانی لە پێ کرد و ڕۆیشـت ڕۆیشـت هەتا گەیشـتە کۆشـکی باوکی. نێوچاوانی وا تێک نابوو کەس نەیدەوێرا پێی بڵێ کەرت بە چەندی. کە گەیشـتە ناو کۆشـک لە کەنیزەکانی پرسـی باوکی لە کوێیە. ئەوانیش پێیانگوت چووە بۆ ڕاوگە. ئیدی کچە گەڕاوە و وەک شێرە دەیمڕاند و قسەی لەگەڵ کەسیش نەدەکرد. تا ماوەیەکی پێچوو، وردە وردە هاتەوە سەرخۆ و هەوری ناوچاوانی تۆزێک سامال و ئەویش ئەهوەن بووەوە. پیرێژنە کە دیتی ڕقەکەی نیشتەوە، چووە پێشێ و کڕنۆشی برد و لێی پرسی: «خانمەکەم چووی بۆ کوێ؟» چووم بۆ لای باوکم هەتا پێی بڵێم ئەو هەتیوە بەڕەڵایە لە کۆڵم نابێتەوە. با لە بەر دەرگای دووکانەکەی هەڵی ئاوەسێ و ئیدی لەمەودوا ڕێ نەدا هەر بەڕەڵایەک بە بۆنەی بـازرگـانییەوە بێتە ئێرە.» پیرێژنە لێی پرسـی: «خـانمەکەم هەر لەبەر ئەوە چووبووی؟» کچە گوتی: «بەڵێ، هەر لەبەر ئەوە چووم. بەڵام باوکم چووبوو بۆ ڕاوگە و چاوەڕێ دەبم تا دێتەوە.» پیرێژنە گوتی: «خانم، شوکری خودا بەس نییە ئەتۆ کچێکی ژیر و وریای و لە قسە حاڵی دەبی. تۆ چۆن باسی شتی ئاوا سووک و چرووک لە لای باوکت دەکەی. هەر باسـی ئەو شـتانە بۆ تۆ جوان و شـیاو نییە.» کچە گوتی: «داپیرە بۆ باس کردنی جوان نییە و کارێکی نەشـیاوە؟» گوتی: «خانمەکەم، ئەتۆ وای دانێ ئەوە چووی لە لای باوکت باسـت کرد و بۆت گێڕاوە. ئەویش فەرمانی دا لە بەر دەرگای دووکانەکەی هەڵیان واسـی. ئەوجار خەڵک دەپرسـن ئەرێ ئەوە پادشـا بۆ ئەو کوڕەی هەڵاوەسـیوە؟ دەڵێن بە تەما بووە خەیانەت بە کچی پادشا بکا.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و بیست و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! پیرێژنە گوتی: «خەڵک دەڵێن ویستوویە خەیانت بە کچی پادشا بکا. دیارە کەس باوەڕ ناکا هەر لەبەر ئەوەی بە تەما بووە کارێک بکا، هەڵی ئاوەسن. دەڵێن وا نییە و داخودا چی بووە. جا ئەودەم هەر کەسەی قسەیەکت بۆ ساز دەکا و ئابڕووت دەبەنە سەر لکی دارێ. خانمەکەم نامووسی ژن وەک شیری پاک وایە بە تۆزە تۆزێک پیس دەبێ. هەر بۆیە تکات لێ دەکەم لە لای پادشا باسی نەکەی و بە دەستی خۆت ئابڕووی خۆت نەبەی. ئەمن ئەوە گوتم تۆش بە ئاقڵی خۆت لێکی دەوە. ئەگەر زانیت قسەکەم وا نییە ئەوە چیت پێ خۆشە بیکە.» کاتێک کچی پادشا جوان بیری لێ کردەوە، قسەکەی داپیرەی پێ ژیرانە بوو. ئیدی بە پیرێژنەی گوت: «دایە ڕاست دەکەی. ئەمن ئەودەم هێندەم ڕق هەستابوو نەمدەزانی چی دەکەم.» پیرێژنە گوتی: «ئەتۆ کچێکی پاکی. بەس نییە کەست تێ نگەیاندووە. بەڵام هەر وا بە سەر ئەو کوڕە بێ شەرمەشەوە مەچووە. نامەکەیەکی بۆ بنووسە و پێی بڵێ کە ئاوام کردووە و ئەگەر باوکم لە ماڵ بایە پێم دەگوت لە بەر دەرگای دووکانەکەت هەڵت ئاوەسێ. ئێستا نەچووە بچێ ئەگەر بێت و دەست هەڵنەگەری بە خودا نێوت لە نێو نێوان دەسڕمەوە.» کچە لە پیرێژنەکەی پرسی: «جا دایە بڵێی بەو قسانە دەست هەڵگرێ و بکشێتەوە؟» پیرێژنە گوتی: «جا چۆن دەست هەڵناگرێ بۆخۆشم قسەی لەگەڵ دەکەم و پێی دەڵێم کارێکی ئاوات کردووە.» کچە ئەوجار داوای لێنووس و پێنووسی کرد و ئەو چەند دێڕەی خوارەوەی بۆ نووسی:

لاچۆ لە سەر ڕێم. ساز مەکە کێشە
زیاتر لە بەرڕەت پێ ڕامەکێشە
دڵی ناسکی خۆت، هێند ئازار مەدە
بە شوێن خەیاڵدا هێندە غار مەدە
من پارووی تۆ نیم، خۆت مەخنکێنە
ڕێگەی خۆت بگرە و وازم لێ بێنە

نووسراوەکەی پێچاوە و هاویشتی بۆ پیرێژنەکە و گوتی: «دایە بەو سەگە بڵێ دەست هەڵگرێ و خۆی بەکوشتن نەدا و منیش تووشی گونا نەکا. پیرێژنە نامەکەی هەڵگرتەوە و بردی بۆ شازادە. شازادە کە نامەکەی خوێندەوە، سەری ڕاوەشاند و گوتی: «دایە بڵێی ئەو کارەی من بە کوێ بگا؟ بە خودا تاقەتم نەماوە ئەوە شێت دەبم. پیرێژنە گوتی: «ڕۆڵە، تاقەتت بێ چونکە لە مێژە دەڵێن: «الصبر مفتاح الفرج» (سەبر کلیلی دەرگاکانە). قەیناکا

ئەوەی لە دڵت دایە بینووســە دڵنیا بە من کارێک دەکەم ئێوە پێک بگەن.» شــازادە دۆعای بەخێری بۆ پیرێژنە کرد و ئەو چەند بەیتەی نووسی:

دڵــی کــولــۆڵــم هــێــنــد مەدە ئــازار
ئەی هەوێنی خۆشـــی و بختەوەری
بەرگە نــاگرم دەبم شــێــت و هــار
لە ســـوێت دەکێشـــم من کوێرەوەری
شـــەو و ڕۆژ پیشـــەم بۆتە شــین و زار
نـامبەزێنێ ســـەختی و چەرمەســـەری

ئەوجار نووسـراوەکەی پێچاوە و دای بە داپیرە و توورەکەیەکیشـی دایە کە چوارسـەد دیناری تێدا بوو. پیرێژنە نووسـراوە و توورەکەکەی وەر گرت و گەڕاوە بۆ لای شــازادە خانم و کاغەزەکەی دایە. شـــازادە کاغەزەکەی لێ وەر نەگرت و گوتی: «ئەوە چییە؟» پیرێژنە گوتی: «ئەوە وەڵامی ئەو نامەیەیە کە بۆ ئەو بازرگانە گڵاوەت نووسیبوو.» شازادە خانم پرســـی: «دایە، ئەرێ وەک پێم گوتی، ئاوا جوان تێت گەیاند کلکی لە گەڵۆزی نییە و بڕواتەوە.» پیرێژنە گوتی: «بەڵێ زۆرم بۆ شی کردەوە، ئەویش هیچی نەگوت و لە ئاخریدا ئەو کاغەزەی نووسی و دایمێ بتدەمێ.» کچە پادشا کاغەزەکەی لێ وەر گرت و تا ئاخری خوێندەوە و ڕووی لە پیرێژنەکە کرد و پرســـی: «ئەی کوا کاریگەری قســـەکانی تۆ؟» پیرێژنە وەڵامی داوە: «خـانمەکەم، خۆ ئەو گوتی تۆبە دەکەم و داوای لێ بووردنی کرد. شـازادە خانم گوتی: «نەوەڵا لە جاری پێشـوو زیاتر باسی هەسـتی خۆشـەویسـتی خۆی کردووە.» پیرێژنە گوتی: «خانمەکەم، بۆی بنووســـە بەو زووانە خۆت دەبینییەوە.» کچە گوتی: «پێویســـت ناکا وەڵامی بدەمەوە.» پیرێژنە گوتی: «وەڵا بە قســـەی من دەکەی بۆ ئەوەی دڵنیا بێ خەیاڵی خاوە و دەست هەڵگرێ بڕوا، وەڵامی بدەوە.» کچە گوتی: «بۆخۆت بچووە بێ ئەوەی نامەی بۆ بەری، ســـەرکۆنەی بکە و دەنگی دە با بڕوا.» پیرێژنە وەڵامی داوە: «نەوەڵا قســەی تۆ زیاتری کار تێ دەکا و بێ هیوای دەکا.» ئاخری کچە دەســتی دا پێنووس و کاغەزێکی ئاوای بۆ نووسی:

لەو بــادەی، ژیــنــی بــۆ فــیـــــــدا دەکەی
دڵــــــــــــــــنیا بە کە، لێوی لێ نادەی
ئــاســـــمــان زۆر بەرزە و دەســـــتــی تــۆ کــورتە
نازانـــــــــــــم تاکەی خۆت فریو دەدەی
ژیـــــــــــــــرانە هەستە و ملی ڕێ بگرە
پــێــش ئەوەی ســـەری خــۆت بە بــا بــدەی

کاتێک شـــێعرەکە تەواو بوو، پێچایەوە و لە داخان توند بە عەرزی دادا. پیرێژنە هەڵی گرتەوە و بردی بۆ شـــازادە. شـــازادە نامەکەی لێ وەر گرت و خوێندییەوە. زانی ئەو هاتوهاوار و لاڵانەوەیە کاری تێ نەکردووە و دڵی نەرم نەکردووە هیچ، زیاتریشـــی تووڕە کردووە. ئەوەی بە دڵیدا هات شـتێکی بۆ بنووسـێ و پێیدا هەڵ بڵێ و دۆعای بۆ بکا. ئیدی ئەو شێعرەی بۆ نووسی:

گـــوڵـــڕوخســـــارەکەم ئەی جـــوانـــی جـــوانـــان
نـــاوبـــانـــگـــت دەرچـــووە لە گـــونـــد و شـــــاران
لە چـــاو و زاری، پـــیســــــان بە دوور بـــێ
بـــا مـــن بـــمــــــــرم و، تـــۆ هەر مەســـــروور بێ
دڵ بە دڵ ســــــــــــــەوداســـەری تـــۆیە تـــۆ
ســــــــــــــــەر بە دڵ بەڵاگێڕی تۆیە تۆ
ڕیـــــــــــــــــشی سپی بوو دادێنم لێرە
ئـــاخـــری دێـــی بـــلـــێـــی بـــۆ لـــێـــرەی، خـــێـــرە؟

ئیدی نامەکەی پێچاوە و دای بە پیرێژنە، پێنجسەد دیناری زێڕیشی دایە. پیرێژنە وەری گرت و ڕۆیشـــت. نووســـراوەکەی دا بە کچی شـــا. کاتێک کچە کاغەزەکەی وەر گرت و خوێندییەوە، کاغەزەکەی بەر داوە و بە پیرێژنەکەی گوت: «گڵاو هۆکاری تەواوی ئەو نامە گۆڕینەوە تۆ بووی وا بە فروفێڵ شتت بە من نووسی هەتا ئەو بەزمە ساز بوو. هەر گوتت نامەی بۆ بنووسـە و هەڕەشـەی لێ بکە با دڵسارد بێتەوە و بڕوا. ئەو قسانەت هەر لەبەر ئەوە دەکرد هەتا من پەلکێش بکەیە ناو ئەو نامە گۆڕینەوەیە و حەیام بەری. دوای ئەوە کچە فەرمانی دا قۆڵبەستی کەن. خزمەتکارەکان قۆڵبەســتیان کرد و بە فەرمانی شـازادە خانم ئەوەندەیان لێ دا هەتا تەواوی گیانی خوێنی لێ هات و بێ هۆش بوو. ئەوجار بە کەنیزێکی گوتی: «لاقی بگرن ڕایکێشن بیبەن لە لەو لایە فڕێی دەن.» بە کەنیزێکیشی گوت: «لە سـەری ڕاوەسـتە کاتێک وەهۆش هاتەوە پێی بڵێ: «خانم گوتوویە ئیتر لەمەودوا بەو لایانەدا نەیە. ئەگەر بێت و پێ بنێتە کۆشـکەوە دەڵێم بیکوژن.» کاتێک پیرێژنەکە وە هۆش هاتەوە، کەنیزەکە پێ گوت کە شـــازادە خانم ئاوای گوتووە. ئیدی پیرێژەکە هەســـتا لە کۆشک چووە دەرێ پارەی دا بە باربەرێک و هەتا ماڵێ لە کۆڵی کرد. کچی پادشا نۆژداری بۆ ناردە ماڵێ دەرمانی بکا. نۆژدار بە گوێی شـــازادە خانمی کرد و چوو تیماری کرد. ئەوەندەی پێ نەچوو داپیرە چاک بووە و هەستا سوار بوو، چوو بۆ لای شازادە. زۆریش مات و مەلوول بوو. کاتێک شـازادە چاوی پێی کەوت لەبەری هەسـتا و سـڵاوی لێ کرد. سەیری کرد مات و دڵتەنگە. وتی: «ئەوە چی بووە بۆ وا شەمزاوی؟» پیرێژنە بۆی گێڕاوە

که کچی پادشا چ پەندێکی بەسەری هێناوە. شازادە کارەکەی لێ شێوا. زۆر ناڕەحەت بوو. گوتی: «داپیرە وەڵا بۆ تۆم زۆر پێ ناخۆش بوو. باشـــە داپیرە ئەرێ ئەو کچە بۆ پیاوانی ناخۆش دەوێ؟» پیرێژنە گوتی: «کورم، پادشا باخێکی یەکجار خۆشی هەیە کە پێم وا نییە لە سەر گۆی زەوی جێی ئەوەندە خۆش هەبێ.» وەک بۆ منی گێڕاوە ئاوا بوو: شەوێک لە شـــەوان خەوتبوو. لە خەودا دیتی کە لە باخەکەیاندا پیاســـەی دەکرد و دەگەڕا. لە پڕدا ڕاوچییەکی دیت لەوێ داوی ناوەتەوە و دانەشی لەسەر داوەکە ڕۆ کردووە. بۆخۆشی لەو لاوە دانیشتووە. ئەوەندەی پێ نەچوو کە باڵندە تێی ئاڵان. باڵندەیەکی نێر پێوە بوو. دەستی کرد بە باڵەفرکە، باڵندەکانی دیکە هەموو دەرفڕین، مێوەکەی ئەویشـــیان لەگەڵ بوو. مێوەکەی کە زانی ئەوە نێرەکەی پێوە بووە، خێرا گەڕاوە لای، زۆری هەوڵ لەگەڵ دا تا ڕزگاری کرد. لەو جەنگەیەدا ڕاوچی لە خەودا بوو. ڕاوچییەکە کە وەخەر هات سەیری کرد تەواوی داوەکانی شـــێواوە و ڕەویونەوە. چوو لە ســـەر ڕاوە تەپکەکەی ناوە و داوەکانی قوڵفە کردەوە و دانەشـــی بە ســـەرەوە کرد. بۆخۆی چوو لەولاوە خۆی مات دا. دوای ئیسـتێک باڵندەکان هاتنەوە دەوری تەپکەکە. ئەو نێر و مێیەی جاری پێشـووشـیان لەگەڵ بوو. دەســـتیان کرد بە چینە. وا بوو لەپڕدا، مێوە پێوە بوو. هەموو باڵندەکان هەڵفڕین و نێرەکەش لەگەڵیان هەڵفڕی و ڕۆیشـــت. ئیدی نەگەڕاوە. ڕاوچییەکە دوای ماوەیەک لە خەو هەستا. سەیری کرد باڵندە مێوەکە پێوە بووە. لە ڕێوە گرتی و سەری بڕی. لەو جەنگەیەدا کچی پادشـــا بە پەشـــۆکاوی لە خەو ڕاپەڕی و گوتی: «ئەوە ژن و پیاویش ئاوان، ژنان خۆیان فیدای مێردەکەیان دەکەن و ئەگەر ژنەش تووشـــی گرفتێک بێ پیاوەکە پشـــتی تێ دەکا و هەموو شـــتێکی لە بیر دەباتەوە. خودا قار لەو کەســـانە گرێ کە باوەڕ بە پیاوان دەکەن. چونکە ئەوانە بۆ ئەوە نابن پشیان پێ ببەستی. ئیدی بەو جۆرە شـازادە خانم ڕقی لە پیاوان هەڵگرت. شازادە لە پیرێژنەکەی پرسی: «بۆ، شازادە خانم قەت لە کۆشک نایەتە دەرێ؟» پیرێژنەکە گوتی: «ڕۆڵە ئەو ســاڵێ جارێک نەبێ لە کۆشـک نایەتە دەرێ، ئەویش ئەو جەنگەیە کە میوە پێ دەگا[1]. دەچێ بۆ سەیری باخ و شەوێکیش لە کۆشکەکەی ناو باخ دەمێنێتەوە. لە دەرکی پشـــتەوەڕا هاتوچۆ دەکا. جا با شـــتێکت پێ بڵێم. ئەوەندەی نەماوە شـازادە خانم بچێ بۆ باخ. نیزیکەی مانگێکی ماوە. تۆ بچووە خۆت لەگەڵ باخەوانەکە ڕێک بخە و لێی نیزیک بەوە. وا بێ مووتان بە نێواندا نەچێ. چونکە ئەو باخە لە پەنا کۆشـــکی کچی شایە، ئەو باخەوانە ناهێڵێ کەس بچێتە ناوییەوە. دوو ڕۆژ پێش ئەوەی شازادە خانم بچێ، ئەمن تۆ ئاگادار دەکەمەوە. ئەتۆ بچووە بۆ لای باخەوان و هەر چۆنێک بێ بۆ شـــەو لەوێ بمێنەوە. کاتێک شازادە خانم هات بۆ باخ بچووە لە پەنایەک خۆت بشارەوە.

---

[1]. ئەوە لە فارسـییەکەدا نووسـراوە کە دار گوڵ دەکا. بەڵام لە تەواوی چیرۆکەکەدا ئاماژە بە کاتی گەیشـتنی میوە دەکا بۆیە من لێرەدا ئەوەشم کردووە بە کاتی میوە گەشتن. ئەو ماوەی زەمانییەش زۆر دەخایەنێ.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و بیست و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! کاتێک پیرێژنە ئەو فکرەی بۆ شـــازادە کردەوە، پێی گوت: «بەڵام ئەگەر دیتت خۆی پێشـــان بدە با بتبینێ، چون دڵنیام ئەگەر ئەو جوانی و ڕێکوپێکییەی تۆ بینێ ئاشقت دەبێ. هیچ نیگەران مەبە حەتمەن پێک دەگەن.» شـازادە دەسـتی داپیرەی ماچ کرد و سپاسـی کرد. سێ قەوارە قوماشـی حەریری شـام و سێ قەوارەی ئەتڵەس و کوتە حەریری دیکەی دا بە پیرێژنەکە و توورەکەیەکی زێڕ دایە کە شەشسەد دیناری زێڕی تێدا بوو. پێشـی گوت: «ئەو زێڕانە بدە بە دروومانکار با ئەو کراسـانەت بۆ بدروێ.» پیرێژنە گوتی: «ئەگەر پێت خۆشـــەماڵەکەی من بزانی ئەوە پێشـــانت دەدەم و ئەتۆش ماڵەکەی خۆتم پێشـــان بدە. شـــازادە گوتی باشـــە و کۆیلەکەی خۆی لەگەڵ پیرێژنەکە نارد. بە نۆکەرێکیشـی کوت دووکانەکە داخا و بۆخۆشـی هەسـتا چوو بۆ لای وەزیر و ڕووداوی نێوان خۆی و پیرێژنە و کچەکەی پادشای بۆ گێڕاوە. وەزیر کە قسەکانی شازادەی بیست، پێی گوت: «ڕۆڵە ئەگەر هات و حەیاتوننفووس تۆی لە باخەکەدا دیت و دڵی تۆی نەگرت، ئەودەم چ دەکەی؟» شـــازادە گوتی: «ئیدی قســـەم پێ نامێنێ و ناچار دەبم، گیانی خۆم بخەمە مەترسییەوە و بە زۆر سواری ئەسپێکی کەم و بیرفێنم و لە دەشت و سەحار بدەم. بەشـکوو بمکوژن ڕزگارم بێ.» وەزیر گوتی: «ڕۆڵە بەو ئاقڵەوە دەتهەوێ بژی!؟ ئەتۆ لەو شـارەدا بە تەنیای. چۆن دەتوانی بەرەنگاری پادشـایەک ببیەوە کە سـەدهەزار سـواری ئازا و دلێری هەیە؟ ئەمن ئەو کارە بە باش نازانم و هیچ کەســێکی ژیر و ئاقڵیش کاری وا ناکا.» شـــازادە گوتی: «ئەی چ بکەم وەزیر؟» وەزیر وڵامی داوە: «ئەوڕۆم لە ســەر ڕاوەستە با بزانم ئەو باخەوانە نابینم. بەشکوو ڕێگایەکی دیکەمان بکەوێتە ڕێ.»

کە ڕۆژ بووەوە، وەزیر هەزار دیناری خسـتە گیرافانییەوە و لەگەڵ شـازادە بەرەو باخ ڕۆیشتن. گەیشتنە باخێک لە باخی بەهەشت خۆشـتر. کابرایەکی پیر لە نێو دەرکی باخەکە دانیشـتبوو. کابرا کە ئەوانی دیت کەوتنە بەر دڵی و خۆشـی ویسـتن. لەبەریان هەسـتا و سڵاوی لێ کردن و گوتی: «بەخێر بێن دەڵێی کارێکتان بە منە؟» وەزیر وڵامی داوە: «کاکە ئێمە غەریبین و لە گەرمان پەنامان بۆ ئێرە هێناوە. هاتووین لە بن دارێک تۆزێک پشـــوو بـدەین و دوایە بڕۆین. ئەگەر دەکرێ ئەو دوو دینـارەمـان لێ وەرگری و هێنـدێـک خواردەمەنیشـــمان بۆ بێنی خێرت دەگاتێ.» باخەوان کە قەتی درەم و دیناری لە گیرفانی خۆیدا نەدیبوو. خێرا دەرکی باخی بۆ کردنەوە و قۆناغێکی[1] خۆشـی پێشـان دان و گوتی ئەلێرە دانیشن ئێستا دەچم شتەکانتان بۆ دێنم و دێمە. بەڵام نەچن لە باخدا بگەڕێن چونکە

---

[1]. قۆناغ: شوێنی دانیشتن و حەسانەوە.

شازادەخانم پەنجەرەیەکی کۆشکەکەی دەڕوانیتە ناو ئەو باخە و زۆر جار لەوێرا سەیری ناو باخ دەکا.

ئیدی کابرا باخەوان لە باخ هاتە دەرێ بچێ خواردەمەنیان بۆ بکڕێ. ماوەیەک ون بوو، لە پڕدا هاتەوە و کاوڕێکی سووورەوەکراوی بە شانی کابرایەکی کۆڵبەردا دابوو. ئەوان خواردنەکەیان خوارد و پاشان ماوەیەک قسە و باسیان کرد. دوای ئەوە وەزیر هەستا و چاوێکی لەملا و ئەولای باخەکە کرد. لە نێوەڕاستی باخەکە کۆشکێکی زۆر بەرز و کۆنی دیت. بەجۆرێک کە هەموو نەقش و نیگار و سپیکارییەکەی بەری دابوو. وەزیر پرسی: «کاکە ئەو باخە ئی خۆتە یان بە ئیجارەت گرتووە؟» کابرا گوتی: «گەورەم ئەوە نە باخی خۆمە و نە بە ئیجارەشم گرتووە. ئەمن باخەوانی ئەو باخەم.» وەزیر گوتی: «مانگێ چەندت حەق دەدنێ؟» باخەوانەکە گوتی: «مانگێ دینارێک.» وەزیر گوتی: «وەڵام پێم ناخۆشە، ئەگەر کەسێک یارمەتییەکت بکا دەڵێی چی؟» کابرا گوتی: «جا هەرکەس کاری وا بکا، پاشەکەوتێکە بۆ ئەو دنیای خۆی. ئەمن دەڵێم چی.» وەزیر گوتی: «ئەو باخە باخێکی زۆر خۆشە بەڵام ئەو خانووەی زۆر کۆنە. ئەمن دەمەوێ ئەو خانووەی تازە کەمەوە و سپیکاری بکەم و نەقش و نیگاری تازەی تێدا بکێشمەوە. بە جۆرێک کە جێی ئەوەندە خۆش لەو باخەدا نەبێ. ئەگەر خاوەنەکەشی هات و دیتی ئەوا خۆش و ڕازاوەتەوە، لێت دەپرسێ ئەوە کێ ئاوای لێ کردووە؟ بڵێ بۆخۆم. زۆر کۆن و ڕووخابوو گوتم با دەستێکی پێدا بێنم. ئەگەر هاتوو گوتی پووڵت لە کوێ بوو بڵێ لە سەر حیسابی گەورەیی جەنابت و بە هیوای تۆ قەرزم کرد. گوتم دوایە دەمداتەوە. ئەودەم ناچار دەبێ خەڵات و پارەیەکی باشت دەداتێ. ئەمن سبەینێ وەستاکار و شت دێنم. جارێ ها ئەو پێنسەد دینارە هەڵگرە و بۆ منداڵەکانتی خەرج بکە. پێشیان بڵێ دوعای بەخێرم بۆ بکەن. شازادە بە وەزیری گوت: «ئەوە بۆ ئەو کارە دەکەی، ئەمن تێ نەگەیشتم؟» وەزیر وڵامی داوە: «جارێ ڕاوەستە دوایە بۆت دەردەکەوێ.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی حەوسەد و بیست و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کابرای باخەوان کە ئەو پارەیەی دیت عەقڵی لای خۆی نەما و خۆی بە سەر لاقی وەزیر دادا و دوعای بۆ خۆی و کوڕەکەی کرد. ئەوان کە ویستیان ماڵاوایی لێ بکەن باخەوان گوتی: «سۆزی چاوەڕێتان دەبم.» بەیانی زوو وەزیر وەستاکاری برد و چوو بۆ باخ. باخەوان کە چاوی پێی کەوت خۆشحاڵ بوو. وەزیر تێچووی تەواوی چاکردن و ئاوەدانکردنەوە و بژیوی ئەو وەستا و کرێکارانەی دا. وەستاکان زۆر زوو خانووەکەیان چاک کردەوە و دەستیان پێدا هێنا و سپیان کردەوە. ئەوجار وەزیر نەقاش و وێنەکێشی هێنا و پێی گوتن: «جا جوان گوێ لە من ڕاگرن بزانن دەڵێم چی، ئەمن باخێکی گەورەی وەک ئەوەم بوو، شەوێکیان لە خەونمدا بوو: ڕاوچییەک تەبکەی بۆ مەل و باڵندە نابووەوە و دانەشی بۆ لە بەینی داوەکان بۆ ڕۆ کردبوون. بۆخۆشی چووبوو لەو لاوە خۆی لێ مات کردبوون. پۆلێک باڵندە هاتن لە سەر تەپکەکە نیشتنەوە. وا بوو یەکیان وە باڵەپڕژە کەوت. هەموو مەلەکان هەڵفڕین کەچی نێرەیەک پێوە ببوو. ئاگام لێ بوو، مێوەکەی کە لەگەڵ ئەوانی دی هەڵفڕی گەڕاوە سەری و بە دندووک حەولی دەدا گرێی داوەکە بکاتەوە و نێرەکە ڕزگار بکا. وا بوو نێرەکەی ڕزگار کرد. ڕاوچییەکە خەوی لێ کەوتبوو. ئاگای لێ نەبوو. کە خەبەری بووەوە سەیری کرد تەپکەکەی جووڵاوە و داوەکانی شێواون. تەپکەکەی قایم کردەوە و داوەکانی چا کرد و دانەی دیکەی بۆ ڕۆ کردن و چووەوە حەشارگەکەی. دیسان مەلەکان هاتنەوە سەری. ئەو نێرە و مێوەی جاری پێشووشیان لەگەڵ بوو. ئەوجار مەلە مێوەکەیان پێ بوو. باڵندەکانی دیکە هەڵفڕین و ڕۆیشتن. نێرەکەش لەگەڵیان ڕۆیشت کە زانی مێوەکە پێوە بووە گەڕاوە ڕزگاری کا، بەڵام باشوویەک لە حەوا لێی دا و بردی هەڵیدڕی. پاشان ڕاوچییەکە هات و مێوەکەی لێ کردەوە و بردی سەری بڕی. جا لە ئێوەم دەوێ ئەو خەونەم لە سەر ئەو دیوارە بۆ بکێشنەوە. ئەگەر بێت و ئەو کارە زۆر بە باشی جێبەجێ کەن و ئەمن لێی ڕازی بم خەڵاتێکی واتان دەکەم کە ئێوەش ڕازی بن.»

کاتێک وێنەکێشەکان ئەو قسەیان بیست بە گیان و دڵ خەریکی کێشانەوەی وێنەکان بوون. هەتا تەواویان کرد و ناردیان لە دوای وەزیر بێت و کارەکەیان ببینێ. وەزیر هات و کارەکەیانی دیت. بە دڵی ئەویان کێشابووەوە. خەڵاتی باشی دا بە وێنەکێشەکان. دوای ئەوە شازادەش چوو بۆ باخ و هەتا ناو کۆشکەکەش چوو. خەبەری لە هیچیش نەبوو. کاتێک وێنەی باخ و ڕاوچی و باڵندەکانی دیت و ئەو باڵندە نێرەی دیت بە چنگ باشووەکەوە خوێنی لێ دەتکا. سەری سووڕ ما و گەڕاوە لای وەزیر و پێی گوت: «وەزیر ئەوڕۆ شتێکی سەیرم دیت!» وەزیر گوتی: «چیت دیت؟» شازادە گوتی: «ئەو خەونەی کە

کچی پادشا دیبووی و من بۆ تۆم گێڕاوە، وێنەی ئەو خەونە لە سەر دیوارەکانی کۆشک کێشراوەتەوە! شتێکی جیاواز لەویشم دیت، ئەویش ئەو بەشەیەتی کە شازادە نەیتبوو.»
وەزیر گوتی: «ئەو چی بوو؟» شازادە گوتی: «ئەو باڵندە نێرەی وا نەگەڕاوە سەر مێوەکەی لەو لاوە باشوو لێی دابوو. هەر لەبەر ئەوە نەگەڕابووەوە. خۆزگە کچەکەی شا عەبدولقادریش ئەوەی دەدی کە نێرەکەی چی بە سەر هاتووە بۆیە نەگەڕاوەتە مێوەکەی ڕزگار بکا. وەزیر گوتی: «شازادە بەڕاستی شێتکی زۆر سەیرە.»

بە کورتی شازادە زۆری ئەو وێنەیە پێ سەیر بوو. زۆریش بە داخ بوو لەوەی کە شازادە خانم خەونەکەی تا ئاخر نەدیوە. حەزی دەکرد جارێکی دیکە بیبینێتەوە. وەزیر بە شازادەی گوت: «ئەتۆ لە منت پرسی کە هۆکاری چاک کردن و خاوێنکردنەوەی ئەو کۆشکە چی بوو. گوتم کە بەو زووانە بۆت دەردەکەوێ کە مەبەستم چی بوو. ئەوە فکری من بوو. گوتم وێنەکێشەکان ئەو باڵندە نێرە لە چنگی ئەو باشووەدا بکێشنەوە. چونکە ئەگەر شازادە بێت و ئەو باڵندە نێرە ببینێ چی بە سەر هاتووە لە هەڵوێستەی پاشگەز دەبێتەوە و ڕقی لە پیاوان نابێ. شازادە کە ئەو قسەیەی بیست ڕۆ بوو دەستی وەزیری ماچ کرد و پێی گوت: «بە خودا ئەگەر بێت و کارەکەم جێبەجێ بێ و بە ئاواتم بگەم، ئەو فکر و ڕاوێژانەی تۆ هەموو بۆ باوکم دەگێڕمەوە، با گەورەیی تۆی زیاتر بۆ دەرکەوێ و قەدر و ڕێزت لە لای ئەوەندی دیش بچێتە سەرێ. وەزیریش تەوێڵی ماچ کرد. ئەوجار پێکەوە چوون بۆ لای باخەوان و پێیان گوت: «چاو لە کۆشک کە چەند خۆش بووە.» ئەویش گوتی: «ئەوە لە سایەی گەورەیی ئێوەوە ئاوای لێ هاتووە.»

کورتی کەینەوە، شازادە لە باخەوان دوور نەدەکەوتەوە و بەردەوام لەگەڵی لە هاتوچووەدا بوو. لێرەدا وەزیر و شازادە بە جێ دێڵین و سەرێکی حەیاتوننفووس دەدەین.

حەیاتوننفووس کاتێک دیتی نامە ویشکایی هات و پیرێژنەی لە بەر چاوی لا چوو، حەساوە و وایزانی کە کوڕە ڕۆیشتووەتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی. چەند ڕۆژێکی پێ چوو، مەجۆعمەیەکی سەر داپۆشراوی لە لایەن باوکییەوە بۆ هات. کاتێک سەری لادا، سەیری کرد پڕە لە مێوەی تازە پێ گەیشتوو. پێی سەیر بوو گوتی: «بۆ مێوە گەیوە؟» گوتیان: «بەڵێ.» گوتی: «دەی کەوایە دەبێ بچم بۆ باخ.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شه‌وی حه‌وسه‌د و بیست و حه‌وته‌م هاته‌وه

گوتی: خاوه‌نشکۆ! شازاده خانم گوتی: «ده‌بێ بچم بۆ سه‌یری باخ. به‌ڵام شتێک هه‌یه ئه‌وساڵ دایه‌م له‌گه‌ڵ نییه. به بێ ئه‌و خۆش نییه. بریا ناڕه‌حه‌تم نه‌کردبا. زۆر په‌شیمانم. ئه‌خه ئه‌و منی گه‌وره کردووه. حه‌قی به سه‌ر منه‌وه هه‌یه. که‌نیزه‌کان که ئه‌و قسه‌یان بیست، تێکڕا گوتیان خانم تۆ ئه‌و خودایه لێی خۆش به‌و بانگی که‌وه. شازاده خانم گوتی: «به خودا بۆخۆشم به ته‌مای ئه‌وه بووم.» ئه‌وجار دیارییه‌کی باشی بۆ ئاماده کرد و گوتی: «کێ پێی خوشه بچێ بۆ لای؟» له‌ڕێوه دوو که‌س له که‌نیزه‌کان که یه‌کیان ناوی بولبول و ئه‌وی دیکه‌یان ناوی سه‌وادولعه‌ین (گلێنه‌ی چاو) بوو، ئه‌و دوو که‌نیزه له هه‌ره نیزیکه‌کانی شازاده خانم بوون هاتنه پێشێ و گوتیان: «شازاده ئێمه بنێره.» شازاده ڕازی بوو. ئه‌وانی نارد.

کاتێک داپیره ئه‌وانی دیت له‌به‌ریان هه‌ستا و له ئامێزی گرتن. که‌نیزه‌کان گوتیان: دایه، شازاده لێت خۆش بووه و هه‌سته له‌گه‌ڵمان وه‌ره‌وه.» داپیره گوتی: «تازه قه‌ت نایه‌مه‌وه بۆ لای. مه‌گه‌ر له بیرم چووه‌ته‌وه له به‌ر چاوی دۆست و دوژمن چ په‌ندێکی به سه‌ر من هێنا و چی لێ کردم. هه‌ر ئه‌وه‌نده بوو نه‌یکوشتم. دوای ئه‌وانه‌ش هێشتا لاقی منی گرت و وه‌ک که‌لاکی سه‌گ ڕاکێشێ و فڕێی دام. به خودا ئه‌من قه‌ت تازه ناتوانم بێمه‌وه لای ئه‌و و چاوم به چاوی که‌وێته‌وه.» که‌نیزه‌کان گوتیان: له به‌ر دڵی ئێمه. دڵمان مه‌شکێنه. با شازاده‌ش تۆی ناڕه‌حه‌ت کردبێ، ئه‌دی ئه‌و خۆشه‌ویستی و سۆزه‌ت بۆ ئێمه چی لێ هات؟ چاو لێ که بزانه کێ هاتووه له دوات مه‌گه‌ر شازاده که‌سی له ئێمه گه‌ورتر له لایه؟ داپیره گوتی: «جا قسه‌ی تێدا نییه و ده‌زانم که‌سی له ئێوه سه‌رتر لێ نییه و پله و پایه‌ی من له خوار ئێوه‌وه‌یه. ئه‌وه ناخۆشه شازاده له پێشدا پله و پێگه‌ی منی وا بردبووه سه‌رێ ئه‌گه‌ر من له که‌نیزێک یا خزمه‌تکارێک تووڕه بام دڵی ده‌تۆقی.» که‌نیزه‌کان گوتیان هیچ له پله و پایه‌ت که‌م نه‌بووه‌ته‌وه و بگره زیاتریش بووه. ئه‌وجار داپیره گوتی: «به خودا ئه‌من ڕووی ئێوه ده‌مگرێ ده‌نا قه‌ت قه‌ت نه‌ده‌چوومه‌وه بۆ لای شازاده خانم. ئه‌گه‌ر بشی کوشتبام.» که‌نیزه‌کان سپاسیان کرد.

دوای ئه‌وه هه‌ستا و جله‌کانی کرده به‌رێ و له‌گه‌ڵ که‌نیزه‌کان که‌وته ڕێ هه‌تا گه‌یشتنه لای شازاده خانم. شازاده خانم که دایه‌ی دیت له‌به‌ری هه‌ستا. داپیره گوتی: «شازاده ڕاستی بڵێ هه‌ڵه‌ی من بوو یا ئی تۆ؟» شازاده گوتی: «هه‌ڵه، له منه‌وه بوو. ئێستا ده‌بێ تۆ لێم خۆش بێ. ئه‌تۆ لای من ڕێز و حورمه‌تت زۆره و حه‌قت به سه‌ر منه‌وه هه‌یه. به‌ڵام بیستووته که بوون و ڕزق و ژیان و مردن قه‌زا و قه‌ده‌ر دیاری ده‌کا. مرۆڤ له‌گه‌ڵ ئه‌و

چوار شـــته هیچی پێ ناکرێ و بۆی بڕدراوەتەوە. ئەمن ئەو کاتەی لە تۆ توورە بووم بە دەست خۆم نەبوو. ئێستاش پەشیمانم.»

کاتێک شازادە خانم ئاوا داوای لێ بووردنی کرد. داپیرەش ڕقەکەی نیشتەوە و کڕنۆشی بۆ برد. شـازادەش بۆ دڵ چاک کردنەوەی خەڵاتێکی بە نرخی دایە. داپیرە زۆر خۆشـحاڵ بوو. ئەوجار شـازادە خانم گوتی: «دایە وەک بزانم بەری باخ گەیوەتێ و کاتی سـەردان و سـەیری باخ هاتووە. داپیرە گوتی: «شـــازادە، ئەمن هەر ئەوڕۆ هاتوومە دەرێ بەڵام میوەیەکی زۆر لە بازاڕ دایە. ئەوڕۆ تەواو هەســتم کرد بەهارە. دوای ئەوە داپیرە لە لای شـازادە خانم هاتە دەرێ و چوو بۆ لای شـازادە ئەردەشـێر. شـازادە بە دیتنی خۆشـحاڵ بوو، لە باوەشی گرت و دڵی کراوە. پاشان داپیرە ئەو باسەی نێوان خۆی و شازادە خانمی بۆ گێڕاوە. پێشی گوت کە شازادە خانم قەرارە فڵانە ڕۆژ بچێ بۆ باخ.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەوسەد و بیست و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! پیرێژنەکە دوای ئەوەی بە شازادەی گوت کە قەرارە حەیاتوننفووس بچێ بۆ باخ لێشی پرسی: «ئەرێ پێم گوتبووی خۆ لە باخەوانەکەی نیزیک بکەوە و نێوانی لەگەڵ خۆشە بکە و دیاری بدەیە، بە قسەت کردم یان نا؟» شازادە گوتی: «ئەرێ ئیستا بووین بە هاوڕێ.» دوای ئەوە بە داپیرەی گوت کە چیان کردووە و چۆن تەواوی ماڵەکەیان خاوێن کردووەتەوە و وێنەی خەونەکەی شازادە خانمیان خستووەتە سەر دیوار. ئەوەشی پێ گوت کە باڵندە نێرەکەی کە نەگەڕاوەتەوە سەر ئەو مێوەی بە داوەکەوە ببوو. بە دەست باشوویەک بە خواردنیان داوە و وێنەکەی لە سەر دیوارەکە وێنا کراوە. بۆ ئەوەی پێشانی شازادە خانمی بدەن کە نەگەڕانەوەی بۆ لای مێوەکە لەبەر ئەوە بووە. تا ڕق و کینی لە پیاوان نەمێنێ و دڵی چاک بێتەوە. پیرێژنە کە ئەو قسانەی بیست کەیفی ساز بوو، بە شازادەی گوت: «کوڕم هەستە بچووە بۆ گەرماو و جلوبەرگی شکۆدار لە بەر بکە. کار لەوە باشتر نابێ و فکر لەوەی کە بە زەینی وەزیر گەیشتووە چاکتر نابێ. دوای ئەوە بچووە بۆ لای باخەوان و بە هەر فێڵێک بێ ڕازی بکە، شەو لە ناو باخ بمێنییەوە. هەرچەند عەرز و ئاسمان سەر لێک دا ناهێڵێ کەس لە ناو باخدا بمێنێتەوە. بەڵام ئەگەر جێبەجێ بوو، چوویتە ناو باخ لە پەنایەک خۆت بشارەوە و لە جێی خۆت مەبزوو. هەتا گوێت لە دەنگی من نەبێ. کە گوێت لێ بوو، گوتم: «یا خفی الالطاف آمنا مما نخاف» (ئەی خاوەن کەرەمی شاراوە لەو شتانەی لێیان دەترسین بمانپارێزە.) ئەودەم وەرە دەرێ و لە نێو دارەکاندا پیاسە بکە. هەتا شازادە بتبینێ و کار لە دڵ و دیدەی بکەی. دوای ئەوە بە ئاواتت بگەی و خەمت لە دڵدا نەمێنێ. شازادە گوتی: «بە سەر سەر و بە سەر چاو.» لەڕێوەش توورەکەیەکی دا بە داپیرە کە هەزار دیناری زێڕی تێدا بوو.

پیرێژنەکە توورەکەکەی وەر گرت و ڕۆیشت. شازادە چوو بۆ گەرما و خۆی شوت. کە لە گەرماو هاتە دەرێ. جلی شایانی ساسانی لەبەر کرد و پشتوێنەیەکی زێڕی ڕازاوە بە گەوهەری جۆراجۆری لە قەدی بەست و دەسرە و تاجێکی زێڕینی لە سەر نا. سەر کوڵمەکانی سوور و لێوی ئاڵ بوو. چاوەکانی کارمامزی هەڵدەفریواند. ئەوجار هەزار دیناری زێڕی لە گیرفانی نا و چوو بۆ ناو باخ. کە گەیشتە باخەکە لە دەرگای دا. باخەوان دەرگای کردەوە. شازادە چووە ژوورێ و باخەوانەکە خۆشحاڵ بوو. سڵاوی لێ کرد. باخەوانەکە سەیری کرد کەمێک مات بوو. نێوچاوانی تێک نابوو. باخەوانەکەی لێی پرسی: «ئەوە چی بووە بۆ دەڵێی ماتی؟» شازادە گوتی: «مامە گیان، بابم منی زۆر خۆش دەوێ و تا ئێستا قەتی دەست لێ هەڵنەهێناومەوە. کەچی ئەوڕۆ کێشەیەکمان کەوتە نێوان. ئەویش جنێوی پێ دام. زللەیەکیشی لێ دام و دەری کردم. هیچ جێیەکم شک نەدەبرد

ڕووی تێ کەم، ناچار هاتم بۆ لای تۆ. دەمەوێ پەنام بدەی لێرە بم هەتا بەشکم ئیشەڵڵا بەیانی لەگەڵ باوکم ئاشت بینەوە. کاتێک باخەوانەکە قسەکانی ئەوی بیست، بەزەیی پێید هات و گوتی: «گەورەم، ئەتۆ ڕازی بچم بۆ لای باوکت و داوای لێ بکەم لێت خۆش بێ و پێکەوە ئاشتتان کەمەوە؟» شازادە گوتی: «مامە گیان، باوکم زۆر خیلەسەرە. لە جەنگەی تووڕەییدا هەر بۆوەی نابێ بیدوێنی. ئەویش بۆ ئاشت بوونەوە لەو جەنگەیەدا.» کابرا گوتی: «گەورەم باشە وەرە با بچینەوە ماڵی ئێمە ئەوشەو لەگەڵ منداڵەکانی من بە و لەوێ بخەوە.» ئەویش گوتی: «مامە من ئەگەر نارەحەت دەبم، پێم خۆشە بە تاقی تەنێ بم.» کابرا گوتی: «وەڵاهی لە دڵم گران دێ ئەمن ماڵم بێ و ئەتۆش بە تاقی تەنێ لە ناو باخدا بخەوی.» شازادە گوتی: «مامە، ئەمن ئاوا دڵم ئەهوەنتر دەبێتەوە و دەزانم بابیشم ئاوا دڵی چاکتر نەرم دەبێ و بەزەیی پێمدا دێ و لەگەڵم ئاشت دەبێتەوە.» باخەوانەکە گوتی: «جا ئەگەر هەر وایە لێرە دەمێنییەوە، دەچم فەرش و جێخەوت بۆ دێنم.» شازادە گوتی: «ئیختیار بە خۆتە.» کابرا لە ڕێوە چوو فەرش و جێخەوی بۆ هێنا. ئەو نەیدەزانی قەرارە شازادە خانم بێ بۆ نێو باخ. جا با پچینەوە لای داپیرە.

داپیرە کە گەڕاوە لای شازادە خانم، پێی گوت کە باخ و دەشت و دەر خۆش بووە و هەموو دارەکان بەریان گرتووە. ئێستا کاتی سەیرانە. کچی پادشا گوتی: «ئیشەڵڵا بەیانی دەچین بۆ نێو باخ بۆ گەشت و سەیران. بەڵام تۆ کەسێک ڕاسپێرە و باخەوان ئاگادار کەوە.» داپیرە کەسێکی نارد بۆ لای باخەوان پێی بڵێ سبەینێ شازادە خانم دێ بۆ نێو باخ و نەهێڵی کەس بچێتە ئەوێ. باخەوان کە زانی شازادە خانم دەچێ بۆ ناو باخ، دەستی کرد بە خاوێن کردنەوەی ڕێوبان و جۆگە و حەوز و شتی وا. پاشان چوو بۆ لای شازادە و پێی گوت: «ئێرە هەر ئی خۆتە و ئەمن هەرچیم هەیە لە گەورەیی تۆوەیە، بەڵام دەڵێن مرۆڤی گەورە قسەی لەگەڵ دێ. ڕاستت دەوێ ئەو باخە باخی حەیاتوننفووسە. قەرارە بەیانی لەگەڵ تاوهەڵاتی بەیانیدا بێ بۆ ئێرە. ئێستا ڕایسپارد کە نەهێڵم کەس بێتە ناو باخەکەوە. هەر بۆیە تکات لێ دەکەم ئەوڕۆ برۆ دەرەوەی باخ. شازادە خانم ڕۆژێک لێرە دەبێ و دەڕواتەوە. ئەودەم وەرەوە ئێرە حەز دەکەی هەر مەڕۆ دەرێ.» شازادە گوتی: «پێم وا باری گرانین بە کۆڵتەوە؟ و کێشەمان بۆ ساز کردووی؟» کابرا گوتی: «نەوەڵا، جگە لە چاکە هیچی دیتان بۆ من نەبوو.» شازادە گوتی: «ئەگەر وایە، دەی خۆ بۆخۆت دەزانی کە هەر چاکەیەک پێویست بێ دەتوانم لەگەڵتی بکەم، لێم گەڕێ با لێرە لە پەنایەکدا خۆم دەشارمەوە. کەسیش نامبینێ. هەتا شازادە خانم دەڕواتەوە بۆ کۆشک.» باخەوان گوتی: «گەورەم، ئەگەر ئەو بە خەیاڵیش کەسێک لەو باخەدا ببینێ سەرم دەبڕێ.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و بیست و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! شازادە بە باخەوانەکەی گوت: «دڵنیا بە ناهێڵم کەس بمبینێ. ئەگەر دەزانی بژیوی منداڵەکانیشت کەم بووەتەوە ها ئەو پێنسەد دینارەیان بۆ خەرج بکە.» دەستی لە گیرفانی ڕاکرد و پێنسەد دیناری دایە. کابرای باخەوان کە زێڕەکانی دیت، نەرم بوو. بە شازادەی گوت: «پیاوی چاک بە نەهێڵی کەس بتبینێ.» ئیدی هێشتی لەوێ بمێنێتەوە. با ئەوان جارێ لەوێ بن.

بەیانی کە تاو لە کەل هاتە دەرێ کچی شا عەبدولقادر بە کەنیزەکانی گوت ساز بن با بچینە باخ. بۆخۆشی کراسی جوانی گرانبایی شکۆداری لە بەر کرد کە هەمووی بە زێڕ وگەوهەر ڕازابووەوە. پاشان دەستی داپیرەی گرت و بە دەرگای تایبەتی خۆیدا چوونە ناو باخەکەوە. داپیرە کە سەیری کرد باخ پڕ بوو لە کەنیز و خزمەتکار و نێرینەی خەساو و هەر یەکەی بە لایەکدا بڵاو بوونەوە بۆ گەشت و سەیران و میوەڕنین. بە شازادە خانمی گوت: «شوکری خودا تۆ کچێکی ژیری و لە ناو باخدا تۆ پێویستیت بە کەنیز و خزمەتکار نییە. لە دەرەوە شتەکە جاوازە و وا جوانە بۆ ڕێز و حورمەتی تۆش بێ ئەو کەنیزانەت لە دەور بن. بەڵام لە ناو باخ خۆشە سەرت چۆڵ بێ و بە کەیفی خۆت بحەسێیەوە. بە قسەی من دەکەی ئەوانە بنێرەوە با بڕۆنەوە.» شازادە گوتی: «قسەکەت ڕاستە.» پێیان بڵێ باخ چۆڵ کەن و بڕۆنەوە. ئیدی بە فەرمانی شازادە خانم باخیان چۆڵ کرد و هەموو چوونە دەرێ جگە لە دوو کەس لە کەنیزە تایبەتەکانی. داپیرە بە شازادە خانمی گوت: «جا ئەوجار هەستە با تێر لە نێو باخدا بگەڕێین. شازادە هەستا و دەستی خستە سەر شانی داپیرە. دوو کەنیزەکە بۆخۆیان لە پێشیانەوە ڕۆیشتن و خەریکی سەیران و میوەڕنین بوون. شازادە بەدم قسەی خۆش و گاڵتە و جەفەنگە لەگەڵ داپیرە دەڕۆیشتن و میوەیان لێ دەکردەوە و بەملا و لادا چاویان دەگێڕا. هەر جارەی ڕوویان لە لایەک دەکرد و دەگەڕان. هەتا گەیشتنە کۆشکەکەی ناو باخ. شازادە کە کۆشکەکەی دیت تازە کراوەتەوە. بە داپیرەی گوت: «دایە چاو لەو خانووەکە، دیوار و شتەکەی چاک کراوەتەوە و سپیکاری کراوە.» داپیرە گوتی: «خانمەکەم، بیستوومە کە باخەوان شتی لە هێندێک لە بازرگانەکان وەرگرتووە و فرۆشتوویە. بە پارەکەی ئەو کۆشکەی پێ چاکردووە. ئەمن بەڵێنم پێ دا گوتم هەر کات لەگەڵ شازادە هاتینە نێو باخ، بە شازادە خانم دەڵێم پارەکەت بداتەوە و خەڵاتێکی باشیشت بکا. ئێستا تکات لێ دەکەم ولامی چاکەکانی ئەو باخەوانە دڵسۆزە بدەوە.» لە ولامدا شازادە خانم گوتی: «باخەوان کارێکی زۆر باشی کردووە و دەستی خۆش بێ. بانکی خەزێنەدار بکە با بێ.» داپیرە خەزینەداری بانگ کرد. شازادە خانم بە خەزینەداری گوت: «دوو هەزار دینار بدە بە باخەوان.» ئەو جار داپیرە کەسێکی نارد لە

دوای باخەوان. چوون بە باخەوانیان گوت وەرە شازادە خانم کاری پێتە. باخەوان کە ئەو قسەیەی بیست ترسی ڕێنیشت و لە دڵی خۆیدا گوتی: «بە خودا حەتمەن شازادە خانم چاوی بە کورە کەوتووە. ئەوڕۆ ڕەشترین ڕۆژی منە.» ئەوجار بانگی ژن و منداڵەکانی کرد و وەسیەتی بۆ کردن. بەدم ماڵاواییەوە، دەستی کرد بە گریان و بەرەو باخ ڕۆیشت. کاتێک گەیشتە لای کچی شا. ڕووحی لە بەردا نەمابوو. پیرێژنەکە کە دیتی تێی گەیشت و پێش ئەوەی قسە بکا گوتی: «کاکە شوکری خودا بکە و دۆعا بۆ شازادە خانم بکە. پێم گوت چیت کردووە، چۆنت ئەو کۆشکە ئاوەدان کردووەتەوە. شازادە کارەکەتی زۆر پێ باش بوو. دوو هەزار دیناریشی دەستخۆشانە داویەی. ئەتۆ زێڕەکانت لە خەزێنەدار وەرگرە و دۆعای بە خێر بۆ شازادە خانم بکە. باخەوانکە کە ئەو قسەیەی لە داپیرە بیست کڕنۆشی بۆ شازادە برد. دوو هەزار دیناریشی لە خەزێنەدار وەرگرت و سپاسی شازادەی کرد و بەرەو ماڵی خۆی گەڕاوە. ژن و منداڵ و کەس و کارەکەیشی زۆر خۆشحاڵ بوون.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و سییەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! دوای ئەوەی باخەوان ڕۆیشتەوە. پیرێژنە بە شازادە خانمی گوت: «دەرەوەی کۆشکەکە زۆر خۆش بووە، بڵێی ژوورەوەشیان ئاوا خۆش کردبێ؟ دا با بچین چاوێکی لێ بکەین.» ئیدی شازادە و پیرێژنە پێکەوە چوونە ژوورێ. کە چوونە ژوورێ سەریان سوورِ ما و تەماشایان کرد، ژوورەوەشیان ئاوا سپی کردووەتەوە و وێنە و شتیان لە سەر دار و دیوارەکەی کێشاوەتەوە. شازادە بەملاولادا دەیڕوانی و واقی وڕ مابوو. هەتا گەیشتە لای سەرەوەی هاڵەکە و چاوی لە وێنەکان بڕی. دایە زانی کە چاوی بە وێنەی خەونەکەی کەوتووە. ئیدی دایە دوو کەنیزەکەی بانگ کرد، تا لێی گەڕێن شازادە خانم جوان بڕوانێتە دیمەنی خەونەکەی. کە شازادە خانم جوان لە وێنەکان ورد بووەوە، حەبەسا و بانگی پیرێژنەکەی کرد و گوتی: «دایە وەرە چاو لەو وێنە سەیرە کە.» پیرێژنەکە چوو لە وێنەکە ڕاما و بە وردی سەرنجی دایە و گوتی: «خانمەکەم ئەوە وێنەی ئەو باخ و ڕاوچی و داو و شتەیە کە تۆ لە خەونەکەتدا دیتبووت. باڵندە نێرەکەش بەربەندێکی گەورە، بۆ هاتبووە پێشێ، بۆیە نەگەڕابووەوە سەر جووتەکەی ڕزگاری بکا، ئەویش ئەوە بوو کە باشوو لێی دابوو لە وێنەکەشدا دیارە بە چنگ باشووەکەوە خوێنی لێ دەتکێ. بەڵام خانم بە ڕاستی وێنەی ئەو خەونە جێی زەندەمان و سۆسرەتە. ئەگەر تۆ بتویستبا بی کێشییەوە ئاوات بۆ نەدەکێشراوە. ڕەنگە ئەو فریشتانە خەمی ئەو باڵندە نێرەیان بووبێ و ویستوویانە بەو شێوەیە ڕاستییەکان بخەنە ڕوو تا ناخۆشی ئەو شتە لە دڵی ئێمە دەرهاوێن. کچی شا عەبدولقادر گوتی: «دایە تۆ ڕاست دەکەی ئێمە بە ناحەق سەرکۆنەی ئەو باڵندە چارەڕەشەمان دەکرد. پیرێژنە گوتی: «خانمەکەم، سپاس بۆ خودا کە ئەو نەهێنییەمان بۆ دەرکەوت. بۆمان ڕوون بووەوە کە ئەگەر ئەو باڵندەیە تووشی ئەو نەهامەتییە نەهاتبا دەگەڕاوە لای مێوەکەی و ڕزگاری دەکرد. بەڵام کەس لە دەست چارەنووس ناتوانی ڕا بکا. خانمەکەم ئەوەشمان بۆ دەرکەوت کە نێرەکانیش باشن. بە تایبەت مرۆڤ، چونکە حازرە بۆخۆی برسی و ڕووت و قووت بێ بەڵام ژنەکەی تێروپڕ و کۆک و پۆشتە بێ. دڵی دایک و بابی دەشکێنی حەوڵ دەدا ژنەکەی ڕازی بکا. ژنیش بە هەموو ڕاز و نهێنییەکی پیاوەکەی دەزانی و دەیپارێزێ. بە بێ ئەو هەڵناکا و ئەوی لە کەس و کاری خۆی خۆشتر دەوێ. شەو کە دەخەون دەست لە ملی یەکتر دەکەن وەک شاعیر دەڵێ:

کاتێ دەستەملانی تۆم ئازیزەکەم
چی خەم و پەژارەیە بە بای دەکەم
کەس و کار و خۆشەویستم هەر ئەتۆی

## ژیـــنـــی بـــێ تـــۆم نـــاوێ، نە زۆر و نەکەم

پیاوە ژنەکەی ماچ دەکا و ژنە پیاوەکەی ماچ دەکا. یەکێک لەو شتانەی کە جێی سەرنجە و دەی گێڕنەوە ئەوەیە کە پادشـــایەک ژنێکی هەبوو، زۆری خۆش دەویســـت، وا دەبێ ژنەکەی نەخۆش دەکەوێ و دەمرێ. لە تاوان خۆی لە گۆڕەکەی داوێ و دەڵێ دەبێ منیشی لەگەڵ بنێژن. دیســان دەگێڕنەوە پادشـایەک مرد. ژنەکەی گوتی دەبێ منیش لەگەڵ ئەو بە زیندوویی بنێژن دەنا خۆم دەکوژم.

کورتی کەینەوە داپیرە بەو شـێوەیە زۆری باسـی خۆشـەویسـتی نێوان ژن و پیاو بۆ کرد. هەتا دڵی چاک بووەوە و ئەو ڕقەی لە پیاوان بووی لە دڵیدا دامرکا. داپیرە کە ئەوەی زانی گوتی: «خانمەکەم ئێسـتا کاتی ئەوەیە بە ناو باخدا بگەڕێی و دڵت خۆش بکەی. ئیدی دوو بە دوو لە کۆشـــک هاتنە دەرێ و بە نێو باخدا گەڕان کە لە پڕدا شـــازادە چاوی بە شازادە خانم کەوت. کاتێک قەد و باڵا و لەنجە و لاری ئەوی دیت، چاوی تێ بڕی و هۆش و گۆشـی نەما. ئاوری خۆشـەویسـتی لە دڵیدا کڵپەی سـەند و بێ هۆش کەوت. کاتێک وە هۆش هاتەوە پەریڕوخسارەکە دیار نەبوو.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و سی و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! شازادە ئەردەشێر وە هۆش هاتەوە و شازادە خانمی نەدیت. لە دڵەوە ئاخێکی هەڵکێشا و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

هات و رابرد، رووپەرییەک بردی رووح و رەوان
دیارە پێکراوە دڵــــــــــم، پڕ بووە لە دەرد و ژان
لەنجەولار و رەوتی رۆینەکەی دڵ دەهەژێنی
مەلی دڵ ئاشقە، دەفڕێ لە دووی سەلوی رەوان

پیرێژنەکەی هەروا شازادە خانمی لەولا بۆ ئەولای باخ دەبرد، تا گەیشتنە ئەو شوێنەی شازادە ئەردەشێری لێ بوو. ئیدی پیرێژنە گوتی: « اللهمّ یا خفيّ الألطاف نَجّنا مما نخاف» (ئەی خاوەن کەرەمی شاراوە لەو شتانەی لێیان دەترسین بمانپارێزە.)

شازادە ئەردەشێر بە بیستی ئەو قسانە هەستا لە پەنا کە هاتە دەرێ و بە شکۆیەکی شایانەوە و قورس و قایم لە نێو باخدا دەستی کرد بە پیاسە کردن. بە جۆرێک ناژ و شمشاد ئێرەییان بە رێکوپێکییەکەی دەبرد. لەو جەنگەیەدا شازادە حەیاتونفووس چاوی پێی کەوت. ماوەیکی زۆر حەپەسا و واقی وڕ ما. ئەو جار تێر لە جوانی بەژن و بالا و سیمای راما، هۆش و گۆشی نەما و تیری خۆشەویستی دڵی پێکا. بە پیرێژنەی گوت: «دایە ئەو کوڕە قۆزە کێیە؟» داپیرە گوتی: «کوڕی چی لە کوێیە؟» شازدە خانم گوتی: «ھەھا لەو نێو دارانە دایە، زۆرمان لێ نیزیکە.» پیرێژنە بەملاولادا دەیڕوانی وەک ئەوەی خەبەری لە هیچ شتێک نەبێ. ئەوجار داپیرە گوتی: «سوبحانەڵلا، ئەو کوڕە لە کوێوە هاتووە!؟» حەیاتونفووس گوتی: «دایە ئەتۆ پێم بڵێ چۆن بزانین ئەوە کێیە؟ دایە تۆخودا جوان چاوی لێ بکە بەشکم بیناسی.» دایە گوتی: «خانمەکەم ئەوە ئەو گەنجەیە کە بە مندا نامەی بۆ تۆ دەنارد.» کچە گوتی: «دایە ئەو کوڕە چەندە قۆزە. پێم وا بێ لە دنیادا کەس هێندە لە بەردڵ نییە.» پیرێژنە کە زانی شازادە خانم شەیدا و ئەڤینداری شازادە ئەردەشێر بووە، پێی گوت: «خانمەکەم مەگە پێم نەگوتی، یەکجار زۆر جوانە؟» شازادە خانم گوتی: «دایە، کچە پادشاکان لە کاروبار و چاک و خراپی دنیا ئاگادار نین. چونکە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کەس نییە. دایە پێم بڵێ چۆن دەکرێ بۆ یەک ببین و چۆناوچۆن قسەی لەگەڵ بکەم.» پیرێژنە کە ئەو قسەی بیست و زانی کە خۆشەویستی کاری خۆی لە دڵیدا کردووە، گوتی: «خانمەکەم، هاتنی ئەو بۆ لای تۆ هیچ کارێکی نییە و چوونی تۆش بۆ لای ئەو زۆر ئاساییە چون تۆ هێشتا کیژۆڵەیەکی کەمتەمنی. هەستە بە دوامدا وەرە دەچینە لای. لەوێ

من قســەی لەگەڵ دەکەم با تۆ تریق نەبییەوە. وردە وردە نێوانتان خۆش دەبێ.» شــازادە خانم گوتی: «چۆنت پێ باشە وا بکە.»

ئیدی داپیرە لە پێشــەوە و شــازادە خانمیش بە دوایدا ڕۆیشــتن هەتا گەیشــتنە شــازادە ئەردەشێر. پیرێژنەکە گوتی: «گەنجۆ بزانە کێ هاتووە بۆ لات، ئەوە حەیاتوننفووسی کچی پادشــایە پلەوپایەی بناســە و لەبەری هەســتە. شــازادە لەڕێوە لەبەری هەســتا. چاویان لێک بڕی و هیچیان خۆیان بۆ ڕانەگیرا و ئاوێزانی یەک بوون. لە خۆشــیان بە لادا هاتن. ماوەی زۆر بێ ســـەروزمان کەوتن. پیرێژنە لە ترســـی ئابڕووچوون بردنییە نێو کۆشــکەکەوە و بۆخۆشـــی لە بەر دەرگای کۆشــکەکە دانیشــت. بە کەنیزەکانی گوت بچن بۆخۆتان بگەڕێن شـــازادە خانم کاتی حەســـانەوەیەتی. کەنیزەکان چوون بۆ نێو باخ. دوای ئەوە شـــازادە ئەردەشــێر و شــازادە حەیاتوننفووس وە هۆش هاتنەوە. ســەیریان کرد لە نێو کۆشــک دان. شــازادە ئەردەشــێر گوتی: «چاو کەژاڵەکەم ئەوەی دەیبینم خەونە یان ڕاســتییە؟» دیســان چوونەوە باوەشی یەک و شازادە ئەردەشێر ئەو شێعرەی گوت:

قەت نەمــدیــوە گــوڵــی وەک تــۆ
چاوکەژاڵ و کـــــــــــــــەوانیی برۆ
شــــەنــگ و شــــەپــاڵ و جــوان بــێ
خــوێــنشـــــیــرن و لەبەر دڵان بــێ
دم وەک خــونــچەی نەپشـــــکــوتــوو
پڕپڕ لە مرواری و مـــــــــــــــوورروو
کەس نەتوانێ پەســنی بـــــــــــــــکا
زمان لە ئاســـتی گۆ نەکا

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و سی و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشــکۆ! کە ئەردەشــێر شــێعرەکەی تەواو کرد حەیاتونفووس ئەوی بە خۆیەوە گوشــی و نێو دمی ماچ کرد. شــازادە گیانی هاتەوە بەر و باســی ئەو ســەختی و کوێرەوەرییانەی بۆ کرد کە لە رێی خۆشــەویســتی ئەودا تووشــی بووە. حەیاتونفووس داوای لێ خۆشــبوونی کرد و دەســت و لاقی ماچ کرد. ئەوجار یەکتریان لە باوەش گرت و دەستیان کرد بە گریان و شازادە خانم ئەو شێعرەی گوت:

خـۆشـــەویســـتـم لـێـم بـبـوورە ئـازارم داوی
لام زۆر ســـەیـرە لە ســـەر داوا و ئەڤـیـنـت مـاوی
کـۆتـرێـکـی مـالـی بـووم مـن چـیـم نەدەزانـی
خـاوەن دلـێـکـی وەکـوو تـۆم، بە دوژمـن زانـی
تـام و چـێـژی ئەوڤـیـنـداری بـۆ مـن نـامـۆ بـوو
تـا دلی ســلم بە دەســتی تۆ دەســتەمــــــۆ بوو

شازادە خانم کە شێعرەکەی تەواو کرد، فرمێسک بە چاوانی دا لیزگەیان بەست. شازادە ئەردەشــێر بەزەیی پێدا هات و دەســتەکانی ماچ کرد. لەگەڵ ئەو دەســتی کرد بە گریان و دەســت لە ملی یەکتر کردن و لاواندنەوە و ماچوو مووچ. تا دوانیوەڕۆ. ئەوجار هەســتان بگەڕێنەوە. حەیاتونفووس پێی گوت: «بینایی چاوم، ئێستا کاتی جیا بوونەوەیە. ئەی کەی بە یەک دەگەین؟» ئەردەشــێر بە قســەکەی ئەو دەســتی کرد بە گریان و گوتی: «نێوی جیابوونە مەهێنە، یاخوا ئەو وشەیە هەر هەڵگیرێتەوە.

دوای ئەوە کچی شا عەبدولقادر لە باخ چووە دەرێ. شازادە ئەردەشێر چاوی لێ بوو، شــازادە حەیاتونفوس بەدم گریان و هەنیسکەوە دەڕواتە دەرێ. ئیدی شــازادە ئەردەشێر ئاوری خۆشەویستی لە دەروونی بەر بوو. بە گریانەوە ئەو شێعر گوت:

خەریـک بـوو گـیـانـم دەر دەچـوو کە دیـتـم یـارەکەم دەڕوا
ئاگر لە هەناوم بەر بـــــــــــــوو کە دیتم یارەکەم دەڕوا
بۆ دامرکانی گڕی دڵ لـــــــــــــــــووزەوم بەردایە سەری
شـــەراب چی نەکرد ئـابڕووی چوو کە دیتم یـارەکەم دەڕوا
خۆشـــی پوورەی دا لە ســـــــــــەرم، هەزار جاری لەبەر مرم
کەچی بوو بە هەڵم و هەڵچوو کە دیــــــــــــــتم یارەکەم دەڕوا
ڕووح و ڕەوانم بۆ نەما ئەژنۆم هـــــــــــــــــێزی تێدا نەما

کچی پادشـــا کە گوێی لەو شـێعرە بوو، گەڕاوە خۆی لە باوەشـــی هاویشـــت و گوتی: «الصـبر مفتاح الفرج» (سـەبر کلیلی دەرگاکانە) دەبێ فکرێک بۆ پێک گەیشـتنمان بکەینەوە. ئیدی ماڵاوایی لێ کرد و رۆیشــــت. بە دڵێکی پڕ لە قرت و فرتی ئاشـــقانەوە چووەوە کۆشـکەکەی خۆی. شـازادە ئەردەشـێریش جار لەگەڵ جار شـەیداتر دەبوو. حەجمینی لێ هەڵگیرابوو. خەو و خۆرادنی نەبوو. شازادە حەیاتوننفووسـیش ئەو شـەوە نە دمی لە هیچ دا و نەخەویشـی لێ کەوت. بەیانی ناردی لە دووی داپیرە. داپیرە سـەیری کرد تەواو تێک چووە. هەواڵی پرسی. شازادە گوتی: «هەر لێم مەپرسە، هەمووی ئەوانە لە ژێر سەری تۆ دایە.» دوای ئەوە گوتی: «دایە خۆشـەویسـتەکەم لە کوێیە؟» دایە گوتی: «خانمەکەم خۆ هێشـتا شـەو و رۆژێکی تەواو نییە لێی دوور کەوتوویەوە.» حەیاتوننفووس گوتی: «دایە دەڵێی دڵم تۆقی بێ ئەو نـاتوانم هەڵکەم. زووکە فکرێکمـان بۆ بکەوە. خەریکە گیـانم دەرچێ.» دایە گوتی: «هێمن بە، تا فکرێکتان بۆ دەکەمەوە با خەڵک تێتان نەگا.» شـــازادە گوتی: «دایە، بە خودا ئەگەر ئەوڕۆ نەیهێنییە ئێرە بە پادشا دەڵێم تۆ ژیانی منت شێواندووە و تووشـــی ئەو پەندەت کردووم.» داپیرە گوتی: «خانمەکەم، تۆخودا کەمێک دان بە خۆتدا بگرە. ئەو کارە کارێکی هەر وا ســــووک و ئاســـــان نییە. کارێکی قورس و گرانە.» ئیدی پیرێژنی فەقیر هەر ئاوا لە بەری هەڵخوێند. هەتا ســــێ رۆژی مۆڵەت لێ وەرگرت. کچە گوتی: «دایە ئەو سێ رۆژەم بە سێ ساڵ لێ ڕادەبرێ. ئەگەر بێتوو ئەو سێ رۆژە تێپەڕێ و نەیهێنییە ئێرە خۆم دەکوژم.» پیرێژنە لە لای شــــازادە خانم هاتە دەرێ و چووەوە بۆ مـاڵەکەی خۆی. بەیـانی رۆژی چوارەم داپیرە بـانگی ئـاڕایشــــگەری کرد و داوای سووراوسپیاوی لێ کردن. ئەوان شتەکانیان بۆ هێنا.

ئەوجار شــــازادە خانمی هێنا و بەرگی ژنانەی لە بەر کرد و جوان ڕازاندییەوە و پێی گوت: «وەک ژنان قاچی چەپت وە پێش قاچی ڕاســـتت بخە.» شــــازادە چۆنی داپیرە پێی دەگوت، وای دەکرد و لە بەر چاوی پیرێژنە چەند جارێک هات و چوو. پیرێژنەکە ئەوی وەک حۆرییەک دەهاتە بەر چاو کە لە بەهەشــــتەوە هاتبێ. ئەوجار داپیرە پێی گوت: «ورە وەبەر خۆت نییە و غیرەتت بێ، دەتبەم بۆ کۆشــکی پادشـــا. بەر دەرگای کۆشــک پڕە لە سەرباز و نۆبەدار و خزمەتکار. ئەگەر بێت و سڵ بکەی ئەوان دەتناسنەوە و هەردووکمان دەکوژرێین.» شازادە ئەردەشێر گوتی: «مەترسە ئەمن ترسم لەو کارانە نییە.» ئیدی هاتنە دەرێ. پیرێژنە لە پێشـــەوە و شــــازادەش بە دوایدا بە جلوبەرگی ژنانەوە رۆیشـــتن هەتا گەیشـــتنە دەرگای کۆشـک. ئەوێ پڕ بوو لە باڵباز و خزمەتکار. داپیرە چاوێکی لە شـــازادە کرد هیچ شــــوێنەواری ترس و نیگەرانی لە ســـیمایدا دیار نەبوو. کە پیرێژن گەیشـــتە بەر

دەرگای کۆشک سەربالبازی[1] کۆشک ئەوی ناسییەوە. بە دوای ئەودا کچێکی دیت، ڕێگا ڕۆینەکەی مرۆڤی شێت دەکرد. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەو پیرێژنە دایەنی شازادە خانمە. ئەی ئەو کچە کێیە بە دواوەیەتی خۆ جگە لە حەیاتوننفووس کەس هێندە جوان نییە. شازادەش قەت لە کۆشک نایەتە دەرێ. خۆزگە دەمزانی چۆنە ئەوڕۆ هاتووەتە دەرێ. بڵێی شا ئیجازەی دابێ یان بێ ئیجازە ئەو، ئەو کارەی کردبێت؟» ئیدی لەڕێوە هەستا چوو بزانێ ئەو کارە چۆناوچۆن بووە. لەگەڵ سێ کەس لە بەردەستەکانی وە دوای کەوتن. پیرێژنە کە ئەوانەی دیت لە ترسان ڕووحی ڕۆیشت و گوتی: «قسەی تێدا نییە تاز هەردووکمان کوژراین.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. سەربالباز: بەرپرسی بالباز(چەکدارەکانی)میر، پادشا، و سوڵتان.

## که شەوی حەوسەد و سی سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! پیرێژن کە سەربالبازی دیت بە دارودەستەکەیەوە کەوتە شوێنیان ئاوی ئەژنۆی چوو. ترسی ڕێ نیشت. سەربالبازەکەش ترسێکی لە دلیدا بوو ئەویش ئەوە بوو کە دەیزانی شازادە خانم چ زیپک و زاکوونێکی هەیە و دەشی زانی کە پادشا چەندەی لێ قەبوول دەکا. ئەوجار لە بەر خۆیەوە گوتی: «ڕەنگە ڕوخسەتی لە شا وەرگرتبێ و بە فەرمانی ئەو بردبییەتێ دەرێ و ناشی هەوێ کەس بە کاروباری بزانێ. ئەگەر بێتوو ئێستا خۆی تێ هەلقوتێنم و بمهەوێ نهێنی لێ بخەمە ڕوو، دوایە ئەو بە شا دەلێ کە فلانەکەس پەتەی خستمە سەر ئاو. تازە حەتمەن بە کوشتم دەدا. وا باشە هەر کارم بە کاری نەدابێ.» ئیدی خێرا بە دارودەستەوە گەڕاوە و خەلکەکەی لە دەرگای کۆشک دوور خستەوە. دایە چووە ژوورێ و بە سەر سلاوێکی لە بالبازەکە کرد. خزمەتکارەکان بە حورمەتی داپیرە هەستان و سلاویان کرد. شازادە ئەردەشێریش وەکوو کچان بە دوویدا ڕۆیشتە ژوورێ. بەردەوام لەم دالانەوە چوونە ئەو دالان هەتا گەیشتنە دەرگای حەوتەم. کە دەرگای کۆشکی گەورە بوو. تەختی پادشا لەوێ بوو. لەوێوە چوونە کۆشکی ژنان. پیرێژنە لەوێ ڕاوەستا و بە شازادەی گوت: «ڕۆلە دەبێ لێرە خۆت بشارییەوە هەتا شەو. تا شەو ناتوانی بچییە کۆشکی شازادە خانم.» شازادە ئەردەشێر لەوێ خۆی مات دا. پیرێژنە ئەوی لەوێ بەجێ هێشت و بۆخۆی چوو بۆ شوێنێکی دیکە هەتا بوو شەو. کە بوو بە شەو پیرێژنە هاتەوە لای. پێکەوە چوونە کۆشکی ژنانەوە و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە دیوی حەیاتوننفووس. دایە لە دەرگای دا. کەنیزێکی مندالکارە دەرگای کردەوە و پرسی: «کێیە؟» داپیرە گوتی: «منم.» کەنیزە گەڕاوە و خانمی ئاگادار کردەوە. شازادە خانم گوتی: «دەرگای لێ بکەوە با لەگەل هاوڕێکەی بێنە ژوورێ.» کە لە دەرگاکە چوونە ژوورێ سەیری کرد مۆمی داگیرساندووە و فەڕشی دیبای ڕاخستووە. سفرەی ڕازاندووەتەوە بە میوە و شیرینی و شتی دیکە. عوود و عەنبەری لە ئاورگ خستووە. کاتێک شازادە داپیرەی دیت گوتی: «دایەی دلسۆزم ئەی کوا خۆشەویستەکەم؟» دایە گوتی: «ئەوم نەدیتەوە، بەلام لە جێی ئەو خوشکیم هێنا.» شازادە گوتی: «دایە ئەوە شێت بووی! کەسێک برسی بێ، ئاوی دەدنێ؟» دایە گوتی: «خانمەکەم، ئەتۆ جارێ تەماشای بکە. ئەگەر کەوتە بەردلت ئەوە لە لای خۆت ڕایگرە.» ئەوەی گوت و ڕووبەندەکەی لە سەر لادا.

شازادە خانم کە ئەوی دیت ناسییەوە و هەستا و لە باوەشی گرت و هەردووکیان بێ هۆش کەوتن. داپیرە گولاوی بە سەردا هەلپرژاندن هەتا وەهۆش هاتنەوە. ئەوجار شازادە خانم هەزارجاری دمی شازادە ئەردەشێر ماچ کرد و ئەو شێعرەی خوێندەوە.

ئەوشـــەو خۆر لە بـاوەشـــمـدا گۆرانی تیشـــک دەلێ
بـاروبـنەت تـێکەوە پـێـچە شـــەو، مەوێـســـتە و هەلـێ
دەورانـی خەم و خەفەت بـاوی نەمـاوە. بە ســـەر چـوو
بـولـبـول و قـومـری دەخـوێـنـێ، ئەورۆکە لە جـێی قەلـێ
شـــنەی تۆ هـات و ڕایـمـالێ، بۆ خـاو و گـنخی ژیـان
بەهـارە و دەپـشـــکوێ گولی هیوا، لە ســـەر هەر چلێ
شـــادی و خۆشـــی هەلـدەقولێ لە ســـەرچـاوەی ئەوینم
چـی خەم و خەفەت و دەرد و مەیـنەتە، ڕایـدەمـالـێ

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەلگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی حەوسەد و سی و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! شازادە حەیاتوننفووس دڵی تژی بوو لە خۆشی و شادی و گوتی: «گەلۆ بڵێی ڕاست بێ من، تۆ لە ماڵەکەی خۆمدا دەبینم و هاوڕێ و هاودەمی منی؟» دوای ئەوە لە خۆشیان ئەو شێعرەی خوێندەوە:

قەت باوەڕەم نەدەکرد، ئەڤین ئاوا بە تام بێ
ڕۆژێ دابێ، شەوێکی، خورتێکی وام لە لام بێ
گەرمایی خۆشەویستی سەهۆڵی قین وەتوێنێ
شادی هووروژم بێنێ و خەم ویشک و بێ وڵام بێ
سێلاوی خۆشەویستی، قوڕ و لیتەی ڕق بەرێ
ئەو کەسەی ڕقم لێی بوو، پشت و پەنا و قەڵام بێ

کە ڕۆژ بووەوە شازادە ئەردەشێری لە شوێنێکدا شاردەوە هەتا شەو هاتەوە. ئەوجار بردییەوە دیوەکەی و پێکەوە دانیشتنەوە. شازادە ئەردەشێر گوتی: «بە تەمام بچمەوە بۆ وڵاتی خۆمان و بابم لەو ڕووداوە ئاگادار کەمەوە و تا وەزیرەکەی بنێرێتە خوازبێنی تۆ. شازادە حەیاتوننفووس گوتی: «سۆمای چاوم، لەوە دەترسم بچییەوە وڵاتەکەی خۆت و لەوێ خەریکی کاروباری وڵات بی و منت لە بیر بچێتەوە. یان باوکت ڕازی نەبێ. ئەودەم من قوڕی کوێ بەسەردا کەم. خۆ بە خودا دڵیشم دەتۆقێ. وا چاکە تۆ هەر لەگەڵ من بی، هەتا من ڕێگایەک دەدۆزمەوە تا شەوێک پێکەوە لە کۆشک بڕۆینە دەرێ و بەرەو شارەکەی ئێوە بڕۆین. ئەمن تازە دەستم لە کەس و کاری خۆم شوتووە و تۆم بێ کەسم ناوێ.»

شازادە ئەردەشێر فکرەکەی ئەوی پێ باش بوو. قەبووڵی کرد و پێکەوە دەستیان کرد بە بادە خواردنەوە. ئیدی ئەوە بوو بە کار و پیشەیان هەتا وا بوو شەوێک تا بەری بەیانی دانیشتن و شەرابیان خواردەوە. ڕێکەوت وا بوو، یەکێک لە پادشاکان دیاری بۆ باوکی حەیاتوننفووس نارد کە یەکێک لە دیارییەکان تۆقێکی گەوهەرین بوو کە نرخەکەی بەرابەری خەزێنەی پادشا بوو. دیارییەکانیان هێنا هەنتەشی پادشا، پادشا گوتی: «ئەو تۆقە بۆ حەیاتوننفووسی کچم نەبێ شایانی کەس نییە.» ئیدی پادشا ڕووی لە یەکێک لە خزمەتکارەکان کرد و گوتی: «ئەو تۆقە بگرە و بیبە بۆ حەیاتوننفووس. ئەو خزمەتکارە لەبەر ئەوەی شازادە خانم ئازاری دابوو، ناخۆشی دەویست. تۆقەکەی لێ وەرگرت و ڕۆیشت. لە بەر خۆیەوە دەیگوت: «خودا ئەو تۆقەی لێ مەبارەک نەکا.» کە گەیشتە بەر

دەرگای کۆشک سەیری کرد دەرکی دیوەکەی حەیاتوننفووس داخراوە و پیرێژنەش لە بەر دەرگا خەوتووە. پیرێژنەی لە خەو هەستاند. کە هەستا خەجڵا و پەشۆکا بە خزمەتکارەکەی گوت: «چیت دەوێ؟» خزمەتکارەکە گوتی: «پادشـــا منی ناردووە بۆ لای شـــازادە خانم کـارێکم پێیەتی.» پیرێژنەکە گوتی: «کلیلەکەم پێ نییە ئەتۆ بڕۆوە تـا دەچم دەیهێنم. خزمەتکارەکە گوتی: «خۆ ئەمن ناتوانم بگەڕێمەوە بۆ لای پادشا.» ئیدی پیرێژنە چوو کلیل بێنێ. ترسا و نەگەڕاوە. خزمەتکارەکەش کە وەدەرنگی کەوتبوو لە ترسی پادشا حەجمینی نەبوو. ئیدی هێندە توند پاڵی بە دەرگاکەوە نا. وا بوو دەرگاکە کراوە. خزمەتکارەکە چووە ژووری. ڕۆیشت هەتا گەیشتە «دیوی مرادان»ی[1] شازادە خانم. سەیری کرد مۆم داییسا و جامی شـــەراب ڕیز کرابوو. پێی ســـەیر بوو. لە تەختەکە چووە پێشـــێ. تەختەکە بە پەردەیەکی حەریری ڕازاوە بە خشڵی گرانبایی دەور درابوو. پەردەکەی لادا. تەماشای کرد ئەوە کچی پادشـــا لەگەڵ کوڕێکی جوانکیلە خەوتووە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «وەڵا ســـەیرە، ئەویش بۆ کچێک کە ڕقی لە پیاوان بوو، هەر زۆر زۆر سەیرە.» ئیدی پەردەکەی داداوە و گەڕاوە. شـــازادە خانم ڕاپەڕی و چاوی بە خزمەتکارەکە کەوت. بە پەشـــۆکاوییەوە قاوی کرد. خزمەتکارەکە بە گوێی نەکرد. شـــازادە لە تەختەکە هاتە خوارێ و کەوتە ســـەری و گرتییەوە. خۆی بە سەر قاچی دادا و قاچی ماچ کرد. لە بەری پاڕاوە و تکای لێ کرد. بۆی داپۆشێ. خزمەتکارەکە گوتی: «خودا نهێنیت خۆیا کا. چونکە من چاکەم لە تۆ نەدیوە. ئیدی دەستی شازادەی لە داوێنی کردەوە و دەرگای لە سەر پێوە دا. خزمەتکارێکی دیکەی کردە چاوەدێری ئەوان و بۆخۆی گەڕاوە بۆ لای پادشـــا. پادشـــا لێی پرســـی: «تۆقەکەت دا بە حەیاتوننفووس؟» خزمەتکارەکە گوتی: «پادشا، قەسەم بە خودا ئەتۆ بۆخۆت شیاوی ئەوە و زۆر لەوەش زیاتری.» پادشا گوتی: «چی بووە؟» خزمەتکارەکە گوتی: «هەتا چۆڵ نەبێ نایڵێم.» پادشـا گوتی: «بیڵێ، بە ئاشـکرا بیڵێ.» خزمەتکارەکە گوتی: «ئەمانم بدە.» پادشـا عەمامەکەی بۆ هاویشـت. گوتی: «پادشـا، ئەمن چووم بۆ لای شـازادە خانم. تەماشـام کرد لەگەڵ کوڕێکی وەک مانگ جوان خەوتبوون. دەرگام لە ســـەر پێوە دان و گەڕامەوە لای تۆ.» پادشا کە قسەکەی ئەوی بیست، هەستا دەستی دا شیرێک و بانگی سەربالْبازەکەی کرد و پێی گوت: «لەگەڵ دارودەســـتەکەت بچووە بۆ دیوی حەیاتوننفووس و ئەو و ئەو کوڕەی لەگەڵیشی خەوتووە هەر بە لێفەکەوە بیانپێچنەوە بیانهێننە ئێرە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. دیوی مرادان عەرەبی و فارسییەکەی «مقصورە»یان نووسیوە: دیوێکی چکۆڵەیە، وەک پەردەی بووک و زاوا. وەک میحڕابی مزگەوت، شوێنێک کە بەبێ نیگەرانی لەگەڵ خۆشەویستەکەت دەکەوییە ڕازونیاز.

## که شەوی حەوسەد و سی و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! پادشا فەرمانی دا بچن کچەکەی و شازادە ئەردەشێر بێنن. سەربالباز و دارودەستەکەی کە چوونە ئەوێ سەیریان کرد ئەوە حەیاتوننفووس و ئەردەشێر ڕەنگ هەلبزڕکا و چاو بە فرمێسک لەوێ ڕاوەستاون. سەربالبازەکە بە شازادەکانی گوت کە چۆن لە سەر تەختەکە خەوتبوون ئاوا بخەونەوە. کچە کە زۆر ترسابوو بە ئەردەشێری گوت بۆ ئەوە نابێ سەرپێچی بکەین. ئیدی لە سەر تەختەکە درێژ بوونەوە و باوەشیان پێکدا کرد. پیاوەکانی شا ئەوانیان بە لێفە و دۆشەگەوە پێچاوە و بردیانن بۆ لای شا. پادشا کە لێفەکەی لە سەر لابردن کچە هەستا. شا ویستی بیکوژێ. ئەردەشێر زوو خۆی وە بەر داو گوتی: «پادشا تاوان لەوەوە نییە و دەبێ من بکووژی.» شا ئەوجار ویستی ئەردەشێر بکووژێ، کچەکەی خۆی خستە پێشی و گوتی: «ئەو نەکووژی کوڕی پادشایەکی گەورەیە.» پادشا کە گوێی لەو قسەیە بوو، دەستی ڕاگرت. ڕووی لە وەزیرەکەی کرد و گوتی: «دەڵێی چی، ڕات چییە؟» وەزیر گوتی: «هەر کەس بکەوێتە دۆخێکی ئاواوە درۆ دەکا. ئەوە هەر دەبێ بکوژرێ. بەڵام لە پێشدا بە هەموو شێوەیەک ئازاری بدە.» پادشا بانگی جەللادی کرد و پێی گوت: «ئەو بێژووە بەرن تێری جەزرەبە دەن و پاشان بیکوژن. دوایە ئەو قەحبەیەش بکووژن و جەستەکەشیان بسووتێنن. جەللاد دەستێکی لە شانی حەیاتوننفووس دا تا پێی بڵێ بابڕۆین. شا بە سەریدا قیژاند: «ئەوە بۆ ڕێز و حورمەت نابێ پرچی بگرە و وەک کەلاکە سەگ ڕایکێشە. جەللاد بە پێی فەرمانی پادشا جوولاوە. شازادە حەیاتوننفووسی ڕاکێشا هەتا ژێر دارەکە. ئەوجار کوتێکی لە داوێنی شازادە بڕی چاوی پێ بەست. هەر شیرەکەی لە کالانەکە دەخستەوە و دەری دێناوە و خۆی دەخافڵاند و بەشکوو کەسێک تکای بۆ بکا. تەواوی لەشکر لەوێ ڕاوەستابوون و بۆ شازادە دەگریان و دۆعایان بۆ دەکرد. بەشکوو خودا فریای کەوێ و ڕزگاری بکا. پادشا لە جەللاد خوڕی کە خاوە خاو مەکە و تەواوی کە. جەلاد شیرەکەی هەڵێناوە لە پڕدا تەپوتۆزێک وەدیار کەوت بەری ئاسمانی گرت. باقڵ کاتێک باوکی شازادە ئەردەشێر دەزانێ کوڕەکەی هیچ هەواڵێکی نییە، بۆخۆی بە لەشکرێکی زۆرەوە هاتبوو بە دوای کوڕەکەیدا.

شا عەبدولقادر کە تەپوتۆزەکەی دیت، گوتی: «ئەرێ خەڵکینە ئەو تۆزە چییە بەری ئاسمانی گرتووە؟» وەزیری مەزن بەرەو تۆزەکە ڕۆیشت بزانێ چ باسە. چاوی بە لەشکرێک کەوت لە ئەستێرە ئاسمان زۆرتر. لەڕێوە گەڕاوە لای پادشا و خەبەرەکەی دایە. شا عەبدولقادر گوتی: «بەرەو پیریان بچووە بزانە بۆ هاتوون و گەورەی لەشکرەکە کێیە؟ سڵاوی منیشی پێ بگەیێنە. ئەگەر هاتبن بۆ یارمەتی ئێمە یارمەتیان دەدەین. ئەگەر

پێویســـتیش بێ دیاریان بۆ دەنێرین. بە ڕاســـتی من لە هاتنی ئەو لەشـــکرە نیگەرانم و دەترســـم. ئیدی وەزیر بە لەز خۆی گەیاندە لەشـــکرگەکە و لە ناویاندا ســـووڕاوە هەتا بەرپرسانی لەشکری دیتەوە و لەوێشەوە چوو بۆ لای سەیف ئەعزەم شا. سەیری کرد پادشایەکی بەڕێز و حورمەت. لەڕێوە کڕنۆشی برد و زەوی ماچ کرد. ویستی سەری بەرز کاتەوە نیزیکانی پادشا واداریان کرد بۆ جاری دووەم و سێیەمیش زەوی ماچ بکا. وەزیر ســێ جاری زەوی ماچ کرد و ئەوجار دۆعای بۆ ڕاوەســـتاوی و ســـلامەتی پادشـــا کرد. سـڵاوی شـا عەبدولقادری پێ گەیاند و گوتی: « شـا عەبدولقادر سـەردەرانەی کۆشـکی دەسـەڵاتت ماچ دەکا و دەپرسێ خێرە تەشـریفتان هێناوە؟ ئەگەر لەگەڵ پادشـاکانی دیکە شـەڕتان بە دەسـتەوەیە لەشـکرتان بۆ سـوار دەکەم. ئەگەر شـتێکتان دەوێ بۆتان ئامادە دەکەم.» سـەیف ئەعزەم شـا گوتی: «ڕاسپاردە، بگەڕێوە لای خاوەنت و پێی بڵێ ئەعزەم شـــا دەیگوت: «لە مێژە کوڕێکم دیـار نییە و لێرەیە. ئەگەر کوڕەکەی لێرە بوو ئەوە دەیباتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی. ئەگەریش شـــتێکی لێ هاتبێ ئەوە پیاوەکانتان دەکووژم و ژنەکانتان بە دیل دەگرم و شـــارەکەتان بە ســـەردا کاول دەکەم. ئێســـتا زوو بگەڕێوە و ئاگاداری کەوە بۆچی هاتووین.» وەزیر سێ جاری زەوی ماچ کرد و بەرەو شـار گەڕاوە. لە ڕێگادا بیری دەکردەوە و سەری سووڕ مابوو نەیدەزانی بڵێ چی. کە گەیشتەوە لای شا عەبدولقادر، لە ترسان ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو. ئەوی دیتبووی و بیستبووی بۆ پادشای گێڕاوە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی حەوسەد و سی و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! وەزیر هەموو شتێکی بۆ شا عەبدولقادر گێڕاو. شا عەبدولقادر ترسی ڕێ نیشت و گوتی: «وەزیر، کوڕەکەی کێیە و لە کوێیە؟» وەزیر گوتی: «دەبێ کوڕەکەی هەر ئەو کوڕە بێ کە فەرمانی کوشتنیت داوە. شوکری خودا کە پەلە نەکراوە لە کوشتنەکەی. دەنا باوکی، وڵاتەکەمانی خاپوور دەکرد و خەڵکەکەی قڕ دەکرد.

شا بە وەزیری گوت: «ئاگات لەو تێگەیشتنە جوانەت هەیە، بە منت دەگوت: «بی کوژە!؟» خێرا بانگی جەللاد بکەن. کە جەللاد هات، پادشا هەواڵی کوڕەی لێ پرسی. جەللاد گوتی: «پادشا هێشتا نەمکوشتووە.» شا دڵی هێور بووەوە و ئۆخژنی هاتێ. ناردی بیهێنن. کاتێک شازادە ئەردەشێریان هێنا، شا عەبدولقادر لەبەری هەستا و ناچاوانی ماچ کرد و پێی گوت: «کوڕم، تکایە هیچ شتێک لە بارەی ئەوە لەگەڵمان کردی بۆ باوکت مەگێڕەوە.» شازادە گوتی: «پادشا کوا باوکم.» شا عەبدولقادر گوتی: «باوکت بە لەشکرێکەوە هاتووە لە دوات و لێرەیە.» شازادە گوتی: «بە تاجی پادشایەتی قەسەم لە جێی خۆم نابزووم هەتا نەیسەلمێنم کە من و شازادەی کچت پاکین و کچەکەت کەچینە[1]. ئێستا بنێرە با پیرک[2] بێن. ئەگەر ئەو کەچین نەبوو، خوێنم حەڵاڵت بێ و بمکوژە. پادشا لەڕێوە ناردی لە دووی چەند پیرک. کە پیرکەکان چاویان لێ کرد. کچە دەستی لێ نەدرابوو. قسەی شازادە وە ڕاست گەڕا و پادشایان ئاگادار کردەوە. پادشا شازادە ئەردەشێری خەڵات کرد. دوای ئەوە شازادەی لە باوەش گرت و ڕێزی لێ گرت. لەگەڵ گەورەکانی دەربار ناردی بۆ گەرماو. کاتێک شازادە لە گەرماو هاتە دەرێ، کەوایەکی دیبای شاقەل زێڕینی لە بەر کرد. تاجی شایەتی لە سەر نا و سواری ئەسپێک لە باشترین ئەسپەکانی ئەو وڵاتەی کرد. زینی ئەسپەکەی بە زێڕ و جەواهێرات ڕازابووە. چەند کەس لە گەورەپیاوانی دەوڵەتی لەگەڵ خست و بە ڕێز و حورمەتەوە ناردییە خزمەت باوکی. شا عەبدولقادر بە شازادە ئەردەشێریشی گوت: بە باوکی بڵێ کە شا عەبدولقادر عەرزی دەکردی لە ژێر فەرمانی ئەودام.

شازادە ماڵاوایی لە شا عەبدولقادر کرد و ڕۆیشت بۆ لای باوکی. باوکی کە چاوی بە کوڕەکەی کەوت لە خۆشیان هەموو داب و دەستوورێکی لە بیر چووەوە و لەبەر کوڕەکەی هەستا و لە باوەشی گرت. خۆشی و شادی و قریوە قریو کەوتە نێو لەشکرەوە. وەزیر و ئەمیرەکان هاتنە پێشوازی و کڕنۆشیان بۆ برد. ئەو ڕۆژە شادییەکی بێ وێنە کەوتە دڵی

---

[1]. کەچینە: واتە پەردەی کچێنی ساغە.

[2]. پیرک: مامان، قابیلە.

لەشکرەوە. شازادە ئەردەشێر بەو کەسانەی کە لەگەڵی هاتبوون، گوت: «چاو لە لەشکری ئەعزەم شـــا بکەن بزانن چ دەریایەکە. ئەوانەی لەگەڵی هاتبوون کاتێک ئەو لەشـــکر و شـکۆیەیان دەدی و وەبیریان دەهاتەوە کە شـــازادە بە دووکانی بەزازی قەناعەتی دەکرد، سەریان سووڕ دەما.

کورتی کەینەوە، هەواڵی لەشکری ئەعزەم شا لە شاردا بڵاو بووەوە. حەیاتوننفووسیش بیسـتییەوە. چووە سـەربانی کۆشـک. سـەیری کرد لەشـکر داروبەردی وڵاتی داگرتووە. شـــازادە خانم، دوای ئەوەی تەپوتۆزەکە پەیدا بوو، دەســـتیان ڕاگرت و نەیانکوشـــتن لە کۆشـــکەکەی خۆیدا بەند کرابوو. چاوەڕێی فەرمانی مەلیک بوو بزانێ کەی دەیانکووژن و دەیانسـووتێنن. شـــازادە حەیاتوننفووس کە ئەو لەشــکرەی دیت و زانی لەشــکری باوکی شـــازادەیە. مات بوو. ترســـا کە شـــازادە ئەو لە بیر بەرێتەوە و لەگەڵ باوکی بڕواتەوە بۆ شـارەکەی خۆیان و خەریکی دەسـەڵاتداری بێ. باوکیشـی ئەو بکووژێ. هەر بۆیە لەڕێوە کەنیزێک کە لەوێیان دانابوو، خزمەتی بکا. ناردی بۆ لای شـازادە ئەردەشـێر و پێی گوت: «بچووە بۆ لای شازادەی کوڕی ئەعزەم شا و هیچ مەترسێ. کە چوویە لای کڕنۆشی بۆ بەرە و خۆتی پێ بناسـێنە و پێی بڵێ کە خانم سـڵاوی دەگەیاندی و دەیگوت ئەو ئێسـتا لە کۆشـکدا بەند کراوە. تکای لێ دەکردی کە ئەو پشـتگوێ نەخەی. پێی بڵێ ئێسـتا تۆ پشـتت زۆر قایمە و هەرچی بڵێی دژایەتیت ناکەن. ئەگەر تۆ بە ڕاســـتی ئەوت خۆش دەوێ ئەوە ڕزگاری بکە و لە لای خۆت ڕایگرە. چونکە ئەو لەبەر تۆ، خۆی خســـتە ئەو تەنگانەیەوە. ئەگەر ئەویشـت ناوێ ئەو بە ئەعزەم شـای باوکت بڵێ با تکایەکم بۆ بکا بەشـکوو ڕزگارم بێ.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و سی و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کنیزی حەیاتوننفووس که چووه لای کوڕی ئەعزەم شا و قسەکانی خانمەکەی بۆ گێڕاوه، شـازاده زۆر گریا و ئینجا پێی گوت: «حەیاتوننفووس خانمی منه و من کۆیلەی ئەوم. من قەت ئەو لە بیر ناکەم. دوای ئەوه گوتی: «که چوویەوه قاچی ماچ که و پێی بڵێ لەو بارەوه لەگەڵ باوکم قسـه دەکەم تا وەزیر بنێرێته خوازبێنیت. ئەویش ناتوانێ دژایەتی بکا. ئەگەر بابیشـم به قسـەم نەکا، منیش لەگەڵی ناچمەوه وڵاتی خۆمان.» کەنیزه به لەز خۆی گەیاندەوه حەیاتوننفووس و دەستی ماچ کرد و پەیامەکەی پێ گەیاند. حەیاتوننفووس که ئەوەی بیست لە خۆشیان دەستی کرد به گریان و شوکری خودای کرد. حەیاتوننفووس با خەریکی شوکری خوا بێ.

شازادەش شەو لەگەڵ بابی دوو به دوو دانیشتن. باوکی گوتی: «دەی ڕۆڵه گیان بۆم بگێڕەوه چۆنت بۆ گوزەراوه.» شـازاده تەواوی بەسـەرهاتی خۆی له سـەرەتاوه هەتا کۆتایی و گیرانی له لایەن شا عەبدولقادر و نیزیک بوونه له مردنی بۆ گێڕاوه. ئەعزەم شا گوتی: «ئەگەر دەڵێی ئێسـتا به سـەریاندا دەیەن و شـار و وڵاتەکەی لێ وێران بکەین.» شـازاده وڵامی داوه: «نەوەڵا هیچی لێ مەکه خۆ ئەو چ کارێکی وای لەگەڵ من نەکردووه شیاوی ئەوه بێ. ئەمن دەمەوێ حەیاتوننفووسم بۆ بێنی و له گەورەیی خۆتەوه دیارییەک بۆ باوکیشی بنێری.» ئیدی ئەعزەم پادشا وەزیرەکەی نارد بۆ خوازبێنی حەیاتوننفووس و دیارییەکی زۆر گرانباییشـی به وەزیرەکەیدا نارد بۆ شـا عەبدولقادر. وەزیر ملی ڕێیەی گرت و چوو بۆ لای شا عەبدولقادر. شا عەبدولقادر لەو کاتەوەی که شازادەی بەڕێکردبوو بۆ لای باوکی هەر چاوەڕێ بوو دەیگوت ئێستا نا ئێتسـا به سـەرماندا دەدەن و وڵاتەکەم لێ وێران دەکەن. وا بوو له پڕدا وەزیری ئەعزەم پادشـا لێی وەژوور کەوت و کڕنۆشـی برد و زەوی ماچ کرد. پادشـا لەبەر وەزیر هەسـتا و ڕێزی لێ گرت. وەزیر خێرا خۆی به سـەر قاچی پادشـا دادا و قاچی ماچ کردەوه و گوتی: «کەسـێکی وەک جەنابت نابێ لەبەر شـتێکی وەک من هەسـتێ. ئەمن کۆیلەیەکی پله نەزمی تۆم. ئەگەر ڕێم دەی شـتێکت عەرز دەکەم.» پادشـا گوتی: «بیفەرموو.» وەزیر گوتی: «پادشـای مەزن، شـازاده باسـی له گەورەیی و چاکەکانی تۆ کرد لەگەڵ ئەو و هەر بۆیه ئەعزەم پادشـا جەنابتی زۆر وەبەر دڵ کەوت و هێندێکی دیاری بەو خزمەتکارەی خۆتدا ناردە خزمەت. سـڵاویشـی دەگەیاندی.» پادشـا که هێنده ترسـا بوو، چاوەڕوانی قسـەی وای نەدەکرد، هەر بۆیه باوەڕی پێ نەکرد هەتا دیارییەکانیان هێنا. دیارییەکەی ئەوەنده گرانبایی بوو که خەزێنەکانی تەواوی پادشاکانی دەوروبەری به قەد ئەو نەدەبوون. ئەوجار هەستا حەوا و شـوکری خودای کرد و دۆعای به خێری بۆ ئەعزەم پادشـا کرد. دوای ئەوه وەزیر پێی

## که شەوی حەوسەد و سی و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کنیزی حەیاتوننفووس کە چووە لای کوڕی ئەعزەم شا و قسەکانی خانمەکەی بۆ گێڕاوە، شـــازادە زۆر گریا و ئینجا پێی گوت: «حەیاتوننفووس خانمی منە و من کۆیلەی ئەوم. من قەت ئەو لە بیر ناکەم. دوای ئەوە گوتی: «کە چوویەوە قاچی ماچ کە و پێی بڵێ لەو بارەوە لەگەڵ باوکم قســـە دەکەم تا وەزیر بنێرێتە خوازبێنیت. ئەویش ناتوانێ دژایەتی بکا. ئەگەر بابیشـم بە قسـەم نەکا، منیش لەگەڵی ناچمەوە وڵاتی خۆمان.» کەنیزە بە لەز خۆی گەیاندەوە حەیاتوننفووس و دەسـتی ماچ کرد و پەیامەکەی پێ گەیاند. حەیاتوننفووس کە ئەوەی بیست لە خۆشیان دەستی کرد بە گریان و شوکری خودای کرد. حەیاتوننفووس با خەریکی شوکری خوا بێ.

شـازادەش شـەو لەگەڵ بابی دوو بە دوو دانیشـتن. باوکی گوتی: «دەی ڕۆڵە گیان بۆم بگێڕەوە چۆنت بۆ گوزەراوە.» شـــازادە تەواوی بەســـەرهاتی خۆی لە ســـەرەتاوە هەتا کۆتایی و گیرانی لە لایەن شا عەبدولقادر و نیزیک بوونە لە مردنی بۆ گێڕاوە. ئەعزەم شا گوتی: «ئەگەر دەڵێی ئێســتا بە ســەریاندا دەیەن و شـــار و وڵاتەکەی لێ وێران بکەین.» شـــازادە وڵامی داوە: «نەوەڵا هیچی لێ مەکە خۆ ئەو چ کارێکی وای لەگەڵ من نەکردووە شیاوی ئەوە بێ. ئەمن دەمەوێ حەیاتوننفووسـم بۆ بێنی و لە گەورەیی خۆتەوە دیارییەک بۆ باوکیشی بنێری.» ئیدی ئەعزەم پادشا وەزیرەکەی نارد بۆ خوازبێنی حەیاتوننفووس و دیارییەکی زۆر گرانباییشـــی بە وەزیرەکەیدا نارد بۆ شـــا عەبدولقادر. وەزیر ملی ڕێیەی گرت و چوو بۆ لای شا عەبدولقادر. شا عەبدولقادر لەو کاتەوەی کە شازادەی بەڕێکردبوو بۆ لای باوکی هەر چاوەڕێ بوو دەیگوت ئێسـتا نا ئێتسـا بە سـەرماندا دەدەن و وڵاتەکەم لێ وێران دەکەن. وا بوو لە پڕدا وەزیری ئەعزەم پادشـــا لێی وەژوور کەوت و کڕنۆشـــی برد و زەوی ماچ کرد. پادشـا لەبەر وەزیر هەسـتا و ڕێزی لێ گرت. وەزیر خێرا خۆی بە سـەر قاچی پاشـا دادا و قاچی ماچ کردەوە و گوتی: «کەسـێکی وەک جەنابت نابێ لەبەر شـتێکی وەک من هەسـتێ. ئەمن کۆیلەیەکی پلە نەزمی تۆم. ئەگەر ڕێم دەی شـتێکت عەرز دەکەم.» پادشـــا گوتی: «بیفەرموو.» وەزیر گوتی: «پادشـــای مەزن، شـــازادە باســـی لە گەورەیی و چاکەکانی تۆ کرد لەگەڵ ئەو و هەر بۆیە ئەعزەم پادشـــا جەنابتی زۆر وەبەر دڵ کەوت و هێندێکی دیاری بەو خزمەتکارەی خۆتدا ناردە خزمەت. ســـڵاویشـــی دەگەیاندی.» پادشـــا کە هێندە ترســـا بوو، چاوەڕوانی قســـەی وای نەدەکرد، هەر بۆیە باوەڕی پێ نەکرد هەتا دیارییەکانیان هێنا. دیارییەکەی ئەوەندە گرانابیی بوو کە خەزێنەکانی تەواوی پادشـاکانی دەوروبەری بە قەد ئەو نەدەبوون. ئەوجار هەسـتا حەوا و شـــوکری خودای کرد و دۆعای بە خێری بۆ ئەعزەم پادشـــا کرد. دوای ئەوە وەزیر پێی

گوت: «پادشــا، ئەعزەم پادشــا میوانی تۆیە و هاتووە خزمایەتیت لەگەڵ بکا. منی ناردووە بۆ خوازبێنی خــانمی خــانمــان، بەشـــەرم و حەیــا و ســـــەرچــاوەی داوێنپــاکی خــاتو حەیاتونئفووسی کچت. بۆ ئەردەشێری کوڕی. پادشا کە ئەوە قسەیەی بیست، گوتی: «لە لایەن منەوە هیچ ئیرادی نییە و بەڵام کچە بۆخۆی گەورەیە و بۆخۆی چۆنی پێ خۆشە با وا بکا.» دوای ئەوە پادشــا بانگی یەکێک لە پیاوەکانی کۆشــکی کرد و پێی گوت: «بچووە بۆ لای شازادە حەیاتونئفووس و پێی بڵێ بزانە دەڵێ چی.» ڕاسپاردە چوو بۆ لای شازادە و ئاگاداری کردەوە کە شتێکی ئاوایە و ئەتۆ دەڵێی چی؟ کچە گوتی: «ئەمن ڕازیم و زۆرم پێ خۆشە.»

لێرەدا بوو، مــاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتــایی پێ هــات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و سی و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کچی شا عەبدولقادر گوتی کە ئەمن ڕازیم و زۆریشم پێ خۆشە. کە ڕاسپاردەکە ئەو قسەیەی بیست، گەڕاوە لای پادشا و ڕازی بوونی شازادەی پێ ڕاگەیاند. ئینجا شـــا کەوایەکی گرانبایی کە بایی دەهەزار دینار بوو کردە خەڵاتی ئەو و پێی گوت: «وڵامەکەی بۆ بەرەوە و ڕەوخسەتێکیش بۆ من بخوازە بێمە خزمەتی.» وەزیر لە لای شا عەبدولقادر هاتە دەرێ و ڕۆیشـــتەوە بۆ لای ئەعزەم پادشـــا و لە وڵامی شـــازادە حەتوننفووســـی ئاگادار کردەوە و پەیامەکەی شـــا عەبدولقادریشـــی پێ ڕاگەیاند. ئەعزەم پادشـــا خۆشـــحاڵ بوو، ڕازیش بوو کە شـــا عەبدولقادر میوانی بێ. بۆ ڕۆژی دوایی شـــا عەبدولقادر چوو چاوی بە ئەعزەم پادشـــا کەوت. ئەعزەم پاشـــا ڕێز و حورمەتێکی زۆری لێ گرت و پێکەوە دانیشـتن. شـازادە ڕووبەڕوویان دەستەونەزەر ڕاوەستا بوو. وتەبێژێک لە وتاربێژەکانی دەرباری شـــا عەبدولقادر هەســـتا و وتارێکی خوێندەوە و پیرۆزبایی لە شـازادە ئەردەشێر کرد. ئەوجار ئەعزەم پادشـا فەرمانی دا مجرییەکیان هێنا. لەو مجرییەدا گەوهەر و نقیمی گرانبایی و پەنجاهەزار دنیاری زێڕی تێدا بوو. بە شـا عەبدولقادری گوت: «ئەمن لە لایەن کوڕەکەمەوە کراوم بە پارێزەری. شـا عەبدولقادر دەسـتی لە دەسـتی ناو ڕێک کەوتن. ئەو جار قازی و شـــایەدیان هێنا و کچی شـــا عەبدولقادریان لە ئەردەشـێری کوڕی ئەعزەم پادشـــا مارەکرد. دۆســـتان دڵخۆش و نەیاران ماتەمبار بوون. هەتا چەندین ڕۆژ خواردن درا بە خەڵک. دوای ئەوە شـــــازادەیـان نـاردە پەردەوە و بە ئاواتی خۆی گەیشـــت. ســـەیری کرد دوڕێکی نەســـماوە. دوای ئەوە ئەعزەم پادشـــا لە کوڕەکەی خۆی پرسـی: «ڕۆڵە هیچی دیکەت دەوێ یان نا؟» شـازادە گوتی: «بەڵێ پادشـا، دەمەوێ وەزیر و ئەو باڵبازانەی کە ئاوا لەگەڵ ئێمە جووڵانەوە سزا بدرێن و تۆڵەیان لێ بکەینەوە. ئەعزەم پادشـــا لەڕێوە چەند کەســـی نارد بۆ لای شـــا عەبدولقادر و داوای کرد وەزیر و ئەو باڵبازانەی بۆ بنێرێ کە شـــازادە ئەردەشـــێریان ئازار دابوو. شـــا عەبدولقادر ئەوانی بە پیاوەکانی ئەعزەم پادشادا نارد. ئەعزەم پادشا ئەوانی لە دەروازەی شار لە دار دا و هەڵی واسین. ماوەیەک دوای ئەوە داوایان کرد شا عەبدولقادر کچەکەیان بۆ بنێرێ. شا فەرمانی دا حەیاتوننفووس ئامادەی سـەفەر بکەن. حەیاتوننفووسـیان ئامادە کرد و لە سـەر تەختی زێڕی ڕازاوە بە خشـــڵی جۆراوجۆریان دانا و تەواوی کەنیز و خزمەتکارەکانیان لەگەڵ خست. خەڵکی شار بە تەواوی خۆیان ساز کرد و بۆ بەڕێکردنی هەتا دووری شار لەگەڵی چوون. لەوێوە ئەعزەم پاشـــا داوای لێ کردن بگەڕێنەوە و ســـوێندی لە شـــا عەبدولقادر خوارد چی دیکە لەگەڵیان نەچێ. ئیدی لەوێوە ماڵاواییان لێک کرد و ئەوان ڕۆیشـــتن و ئەوانیش گەڕانەوە بۆ ناو شـــار. هەردووک لا بە خێر و خۆشـــی و عەیش و نۆش ژیانیان

تێپەڕاند هەتا تێکدەری خۆشی و شادی ژیانی لێ ژێر و ژوور کردن.

## چیرۆکی بەدرباسم و گەوەر

چیرۆکێکی خۆشی دیکە دەگێڕنەوە، ئەویش ئەوەیە کە زەمانی زوو لە وڵاتی عەجەمان، لە خۆراسان پادشایەک هەبوو بە نێوی شەهرمان شا. ئەو پادشایە سەد ژن و کەنیزی بوو کەچی لە هیچ کامیان منداڵی نەدەبوو نە کچ و نە کوڕ. ڕۆژێک لە ڕۆژان هەر وا دانیشتبوو بیری ئەوە بە مێشکیدا هات کە ئەوە خەریکە تەمەنی هەڵدەکشێ و منداڵیشی نییە. مات و مەلوول دە گژ فکراندا چووبوو، کە یەکێک لە کۆیلەکانی هاتە ژووریێ و گوتی: «پادشا بازرگانێک هاتووە و لە بەر دەرگایە. کەنیزێکی پێیە هەتا ئێستا هیچ چاوێک شتی هێندە جوانی نەدیوە. پادشا گوتی: «با بێنە ژووریێ.» بازرگان وکەنیزەکەیان بردە لای پادشا. پادشا سەیر کرد کەنیزەکە چارشێوێکی حەریری بە سەریدا داوە دەڵێی سەلو و شمشادە. بازرگان ڕووبەندەکەی لە سەر لادا. ڕوخساری لە دیوەکەدا شۆقی داوە. حەوت پەلکەی بەردابووەوە لە پامووورەکانی دەدرا. ئەوەندە جوان و لەبەردڵان بوو، وەک شاعیر دەڵێ:

قوڵکەی چەنەی، خڕی کوڵمی، هەر چی تۆ پێی بڵێی جوانی
چاو و برۆ و لـــــووت و دمی، خانم لەگەڵ خۆیدا هانی
بەژن و باڵای ڕێـــــکوپێکی هەر یەک بۆخۆی نیشانەیە
ســینگ و مەمک، قەدی باریکی کە جوانییەکەی تاقانەیە

پادشا سەری لەو هەموو جوانییەی سوورِ ما و بە بازرگانی گوت: «کاکە نرخی ئەو کەنیزە چەندە؟» بازرگان گوتی: «پادشا ئەمن بە دوو هەزارم دینارم کڕیوە و لە ماوەی سێ ساڵدا سێ هەزار دیناریشم تێدا خەرج کردووە. ئێستا وەک دیاری پێکەش بە جەنابت بێ. پادشا کەوایەک و دەهەزار دیناری زێڕی دایە. بازرگان کەوا و زێڕەکانی وەرگرت و سپاسی کرد و هاتە دەریێ. دوای ئەوە پادشا کەنیزەکەی دایە دەس ئاڕایشگەران فەرمانی دا جوان ئارایشی بکەن و کۆشکێکی تایبەتی بۆ تەرخان بکەن.

ئەو شارە شاری بەیزا بوو. بەیزا لە قەراغ دەریا بوو. وا بوو کۆشکێکیان بۆ کەنیزە تەرخان کرد کە بەرجەوەندەکانی دەیڕوانییە دەریا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی حەوسەد و سی و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خـاوەنشـــکۆ! کەنیزەکەیـان بردە کۆشـــکێکەوە کە بەرجەوەنـدەکـانی هەموو دەیانڕوانییە دەریا. پادشـا هەسـتا چوو بۆ لای. کەنیزە لەبەری هەڵنەسـتا. پادشـا لە دڵی خۆیدا گوتی: «ڕەنگە ئەوە لە نێو هۆزێکی بێ داب و دەســـتووردا گەورە بووبێ. جوان پەروەردە نەکرابێ. هەرچی بوو پادشا لەبەر جوانییەکەی هۆشی لێ برابوو. چوو لە پەنای دانیشت و وردە وردە لە باوەشی گرت و دمی بە دمییەوە نا. تێر لێوی مژی. پاشان داوای خواردەمەنی کرد. سفرەیەکیان بۆ ڕازاندنەوە کە هەموو جۆرە خواردنێکی خۆشی لە سەر بوو. پادشـــا پارووی‌ەکی دەخوارد و پارووی‌ەکی بە دمی ئەوەوە دەکرد. هەتا کەنیزە تێری خوارد. هیچ قسـەی نەدەکرد. پادشا دەستی کرد بە قسـە کردن و نێوەکەی لێ پرسـی. ئەو مته‌قی لە بەر نەهات وڵامی نەدەداوە. هەر سـەری داخستبوو. پادشا گوتی: «سوبحانەڵلا ئەو کەنیزە چەند جوانە. بەڵام حەیف قسـە ناکا. ئەوجار شـا لە کەنیزەکانی پرسـی دیوتانە قسـە بکا؟ کەنیزەکان گوتیان هەتا ئێنسـتا نەیاندیوە قسـە بکا. پادشـا بە کەنیزەکانی دیکەی گوت: «گۆرانی و ســـەما و هەڵپەرکێ و شـــتی وای لەگەڵ بکەن بەشـــکوو وە دەنگ.» کەنیزەکان بەزم و ئاهەنگێکی وایان گێڕا داروبەردیان وەســـەما هێنا بوو. کەچی ئەو هەر ســـەیری کردن و قســـەی نەکرد. تەنانەت بزەیەکیشـــی نەهاتێ. پادشـــا نارەحەت بوو. کەنیزەکانی دیکەی ناردەوە بە لای کاری خۆیانەوە و بۆخۆی چوو بۆ لای. دەرگا و شـتی پێوەدا. جلەکانی خۆی داکەند و جلەکانی ئەویشـــی داکەند. ســـەیری کرد لەشـــی وەک کافووری ســـپی وایە. ئەوەندەی دیش کەوتە بەر دڵی و ئیشـــتیای چوویێ. ئاوێتەی بوو کردی بە ژن. دوڕێکی نەسـماو بوو. زۆری پێ خۆش بوو. گوتی: «پێم سـەیرە ئەوە چۆنە ئەو بازرگانە بە کچی هێشـــتوویەتەوە؟!» دوای ئەوە ئیدی پادشـــا هەموو ژیانی بوو بەو کەنیزە و لەوانی دیکە دابڕا. سـاڵێ تەواو لەگەڵی بوو. بەڵام کەنیزە قسـەی نەکرد. ڕۆژێکی لە ڕۆژان پادشـا هێندەی خۆش ویست گوتی: «ئەری سۆمای چاوم، من هێندەم تۆ خۆش دەوێ لەبەر تۆ لە تەواوی ژن و کەنیزەکانم دابڕاوم و تۆ بووی بە هەموو شـــتێکم. ئەتۆ کەمێکم لەگەڵ دلۆڤان بە و قســـەم لەگەڵ بکە. ئەگەر لاڵی بە ئاماژە تێم گەیێنە، تا ئیدی منیش لە خۆڕا ئەوەندە قســـە نەکەم و بەس لە خودام بوێ لە ڕێی تۆوە کوڕێکم بداتێ کە هەتا ئەو وڵات و دەســـەڵاتەی پێ ببڕێ. بیکە بۆ خاتری خودا وڵامم بدەوە. کچە ســـەری داخســـتبوو بیری دەکردەوە. تا وا بوو دوای ماوەیەک ســـەری بەرز کردەوە و چاوی لە پادشا کرد و بزەیەکی هاتێ و گوتی: «پادشای مەزن و بەڕێز، خودا داواکەتی قەبووڵ کرد و من دوو گیانم. لە مانگەکانی ئاخریشـــی دام. بەڵام نازانم کچە یان کوڕە؟ ئەگەر من دووگیان نەبایەم قەتم قسە لەگەڵ نەدەکردی.» پادشا بە قسەکەی دڵی کراوە و لە خۆشیان

سەر و دەستی ماچ کرد و ئەو شیعرەی گوت:

هەڵتۆقینی زنەی وشەت ئاواتی بوو
بە بارانی ڕەحمەتی ئەو جێبەجێ بوو
ناردت خۆری، ڕووناکی کا هۆدەی ژینم
پێش ئەوەی بێ، ڕووناکی و گەشی دەبینم

یەکەم ئاواتم وە قسە هاتنی تۆ و دووەم ئاواتم دووگیان بوونی تۆ بوو. دوایە پادشا لە لای ئەو هاتە دەرێ و بەو پەڕی دڵخۆشییەوە چووەوە سەر تەخت. بە وەزیری گوت: «هەزار دینار بەرە بە سەر هەژار و بێ ئەنوایاندا بڵاوی کەوە. وەزیر فەرمانی پادشای بە جێ گەیاند. دوای ئەوە پادشا دیسان گەڕاوە لای کەنیزەکە. لە باوەشی گرت و لێی پرسی: «خانمەکەم بۆ لە ماوەی ئەو ساڵەدا قسەت نەکرد؟» کەنیزەکە گوتی: «پادشا ئەمن کەسێکی هەژار و غەریب و دڵبریندارم و لە خزم و کەس‌وکار دابڕاوم.» پادشا کە قسەکەی بیست زوو تێی گەیشت و گوتی: «ئەوەی کە گوتت هەژارم ئەوە وا نییە و تەواوی ملک و ماڵ و سامانی من ئی تۆیە و بۆخۆشم یەکێک لە خزمەتکارەکانتم. ئەوەی کە گوتیشت لە خزم و کەست دووری دابڕاوی، پێم بڵێ کەس و کارەکەت لە کوێیە، با بیانهێنمە ئێرە لای خۆت.» کەنیزەکە گوتی: «پادشا، نێوی من «گوڵنار»[1]ی دەریاییە و باوکی من یەکێک لە پادشاکانی دەریا بوو. کە باوکم مرد، یەکێک لە پادشاکانی ناو دەریا کە دوژمنی باوکم بوو، هێرشیان کردە سەرمان و وڵاتەکەیان لێ داگیر کردین. برایەکم هەیە نێوی «ساڵح»ە و دایکیشم لە ژنە دەریاییەکانە. من و براکەم پێکەوە بەشەڕ هاتین. من سوێندم خوارد بچمە لای پیاوێکی ویشکی. ئیدی لە دەریا هاتمە دەرێ و لە قەراخ دوڕگەیەک دانیشتم. پیاوێک هات بۆ لام و منی بردەوە ماڵە خۆی. کابرا تەماعی تێ کردم و ویستی نیزیکیم لەگەڵ بکا. منیش وام لە سەری دا، خەریک بوو بمرێ. ئیدی منی بەو کابرا بازرگانە فرۆشت. ئەو پیاوەیان، پیاوێکی زۆر بە ویژدان و ئەمانەتدار بوو. زۆر بە پارێز و ئەمانەتەوە منی ڕاگرت تا بە تۆی فرۆشتم. ئەگەر ئەتۆ ئاوا منت لە ژنەکانی دیکەت خۆشتر نەویستبا، ئەوە لەو بەرجەوەندەوە خۆم لە دەریا داویشت و دەچوومەوە بۆ لای کەس‌وکارەکەم. ئەوە بوو بەسەرهاتی من و تەواو بوو.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

[1]. جلنار: بە مانای گوڵی هەنارە واتە گوڵنار. جا چەندە شیمانەی ئەوە دەکرێ ئەو چیرۆکە لە لایەن کوردەوە داڕژابێ ئەوە جێی باسە.

## كە شەوی حەوسەد و چلەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کە گوڵناری دەریایی بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ پادشا گێڕاوە. پادشا سپاسی کرد. ناوچاوانی ماچ کرد و گوتی: «سۆمای چاوم من قەت بە بێ تۆ هەڵناکەم. بێتوو تۆ ئیستێک لێم جوێ ببیەوە گیانم دەردەچێ.» کەنیزەکە گوتی: «پادشا، چی وای نەماوە کاتی منداڵ بوونەکەم بێ. دەبێ خزم و کەسەکەم بێن و ئاگایان لێم بێ. چونکە ژنانی ویشکایی شارەزاییان لە شێوەی منداڵبوونی ژنانی دەریایی نییە.» پادشا لێی پرسی: «چۆن دەکرێ بچی لە دەریاوە؟» گوڵنار گوتی: «ئێمە لە سایەی خێر و فەڕی ئەو نێوانەی کە لە سەر نقیمەکەی حەزرەتی سولەیمان نووسراون دەتوانین بە سەر دەریادا بڕۆین وەک چۆنە ئێوە بە دەشتێکدا دەڕۆن. پادشا کاتێک خزم و کەسی من هاتن، ئەمن پێیان دەڵێم کە تۆ منت بە پارەی خۆت کڕیوە و زۆرم لەگەڵ باش بووی و چاکەی زۆرت لەگەڵ کردووم. ئەتۆش بە کردەوە پشتی قسەکانی من بگرە بیسەلمێنە کە تۆ پادشای.» پادشا گوتی: «خانم، تۆ چیت باشە و چۆنت پێ باشە وا بکە. من لە قسەت دەر ناچم.» کەنیزەکە گوتی: «پادشا، ئێمە دەچین لە دەریاوە و چاویشمان کراوەیە و چاو لەو شتانە دەکەین کە لە دەریادا هەن. خۆر و مانگ و ئەستێرەکانیش دەبینین و چاویشمان هیچی لێ نایە. پادشا، هۆزی زۆر و جیاواز لە دەریادا هەن.» پادشا قسەکانی ئەوی پێ سەیر بوو. دوای ئەوە کەنیزەکە دوو دانە عوودی قەماری لە گیرفانی دەر هێنا و هاویشتییە سەر ئاورگەکە. لەو کاتەدا کوڵمەکانی زەرد هەڵگەڕا و چەند قسەیەکی کرد کەس لێی تێ نەدەگەیشت. لە پڕدا دووکەڵێکی زۆر هەستا و پادشاش هەر چاوی لێ دەکرد. کەنیزەکە بە پادشای گوت: «بچووە لەو دیوە خۆت حەشار بدە. هەتا من دایکم و براکەمت پێشان بدەم. پادشا لەڕێوە هەستا و چوو لە پەناکەدا خۆی مات کرد و لە دەلاقەیەکەوە ئەوانی لێ دیار بوو. کەنیزەکە بەردەوام عوودی دەسووتاند و وێردی دەخوێند. هەتا دەریا خرۆشا و پێلی دا و لاوێکی قۆز و جوانچاک لە دەریا هاتە دەرێ. لەو لاوانەی کە شاعیر دەڵێ:

تا دەست دەبا باڵا بەرز
بەژن ڕێکوپێک و تەرز
تووله نەمامێکی ساوا
باخەوانی ماڵی ئاوا
جوانچاکی وا کەس نەدیتوو
دە خەونی هیچکەس نەهاتوو

دوای ئەوە پیرێژنێک لەگەڵ پێنج کچی ڕووهەتاو کە هەموویان شێوەی گوڵناریان دەدا. هاتنە دەرێ. پادشـــا چاوی لێ بوو، کە بە ســـەر دەریادا دەهاتن. هەتا لە کەنیزەکە نیزیک بوونەوە. گوڵنار کە ئەوانی دیت لەبەریان هەســتا و بە دڵێکی خۆش و شـــادەوە هەڵات بۆ لایان.

ئەوانیش کە گوڵناریان دیت، ناسیانەوە و لە باوەشیان گرت و لە خۆشیان زۆر گریان. دوای ئەوە گوتیان: گوڵنار ئەوە بۆ چوار ســاڵە خۆت لێ شـــاردووینەوە و پێمان ناڵێی لە کوێی؟ بە خودا لە تاوی تۆ دنیامان پێ تەنگ بوو. خەو و خواردنمان نەبوو. هەر بۆت دەگریاین. دوای ئەوە کەنیزەکە دەســـتی دایکی و براکەی ماچ کرد و ماوەیەک پێکەوە دانیشـــتن. ئەو جار لێیان پرســـی بارودۆخی چۆنە و چی بە ســـەر هاتووە؟ گوڵنار گوتی: «ئەودەم کە لە ئێوە جیا بوومەوە، کابرایەک منی گرت و بە بازرگانێکی فرۆشـــت. ئەویش منی هێنا ئەو شارە و بە دەهەزار دینار بە پادشای ئەو شارەی فرۆشتم. ئەو پادشایەش منی لە نێو تەواوی ژن و کەنیزەکانیدا بە شاژن هەڵبژارد.» براکەی کە ئەو قسەیەی بیست، گوتی: «سپاس بۆ ئەو خودایەی کە ئێمەی پێک شاد کردەوە. بەڵام خوشکم ئەمن دەمەوێ لەگەڵمان بێیەوە بۆ شـــار و وڵاتەکەی خۆت و لای کەس و کارت.» پادشـــا کە گوێی لە قســـەی براکەی گوڵنار بوو. لە تاوی ئەوەی کە نەکا بە قســـەی براکەی بکا. خەریک بوو شـێت بێ. وا بوو، گوڵنار وڵامی داوە: «براکەم، ئەوەی منی کڕیوە پادشـــای ئەو شـــارەیە. ئەویش پادشـــایەکی زۆر گەورە و مەزن. هێندە پیاوی چاکە لەوەتی هاتوومە ئێرە هێشـــتا قســـەیەکی نەکردووە لە دڵم گران بێ. هیچ کارێک ناکا، هەتا ڕاوێژ لەگەڵ من نەکا. شـــتێکی دیکەش ئەوەندەشـــی من خۆش دەوێ ئەگەر بێت و بە جێی بهێڵم لەڕێوە دەمرێ. بە خودا ئەگەر بابی خۆم، ئێســـتا زیندوو بایە ئەوەندەی قەدر و ڕێز نەدەگرتم. ئێســـتا من لێشـــی دووگیانم. سپاس بۆ خودا کە من بۆخۆم کچی پادشای دەریام و مێردەکەشم گەورەترین پادشای ویشکاییە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی هەوسەد و چل و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! گوڵناری دەریایی، لەپێشـــدا بەســـەرهاتی خۆی بۆ گێڕاوە و دوایە گوتی: «پادشـــا منداڵی نییە. نە نێر و نە مێ. ئەمن داوا لە خودا دەکەم منداڵێکی کوڕم داتێ هەتا وڵات و دەسەڵاتەکەی بۆ ڕاگرێ. کاتێک برا و کچە ئامۆزاکانی گوڵنار ئەوەیان بیست، خۆشـــحاڵ بوون و بە گوڵناریان گوت: « گوڵنار، ئەتۆ بۆخۆت دەزانی کە ئێمە ئەتۆمان چەنـدە خۆش دەوێ و بەختەوەری و حەســـانەوەی تۆمـان دەوێ. ئەگەر دەزانی لێرە نارەحەتی هەستە لەگەمان وەرە با بڕۆینەوە. ئەگەر دەشزانی لێرە حەساوەی و جێگاکەت خۆشـە، ئاواتی ئێمەش هەر ئەوەیە. گوڵنار گوتی: «بە خودا ئەمن جێگاکەم زۆر خۆشـە و هیچ کێشەیەکم نییە.»

پادشا کە ئەو قسەیەی بیست دڵی حەساوە و ئەوەندەی دیکەش لە دڵیدا جێی کردەوە. ئەوەشی بۆ دەرکەوت کە ئەویش ئەوەندەی پادشا خۆش دەوێ کە پێی خۆشە هەر لە لای ئەو بمێنێتەوە و نەڕواتەوە بۆ لای کەس‌وکار و شارەکەی خۆی.

دوای ئەوە گوڵنار داوای خواردەمەنی کرد. کەنیزگەل هەموو جۆرە خواردەمەنییەک و هەڵوا و میوەیان هێنا. ئەوان خواردنەکەیان خوارد. دوای ئەوە گوتیان: «گوڵنار، خاوەنت پیاوێکی غەوارەیە. ئێمە بێ ڕوخســـەتی ئەو هاتینەماڵەکەی و نانمان خوارد. بەڵام ئەومان نەدیت و ئەویش ئێمەی نەدیت و نانی لەگەڵ نەخواردین تا چاومان بە چاوی یەک کەوێ و نان و نمەکمان بکەوێتە بەینەوە. گوڵنار لەڕێوە هەســـتا چوو بۆ لای پادشـــا و پێی گوت: «ئاگات لێ بوو، چۆن لە لای کەس‌وکارەکەم باســـی گەورەیی تۆم کرد و ســـپاســـم کردی. گوێشت لێ بوو، ئەوانیش چیان گوت و چۆن بە تەمابوون بمبەنەوە بۆ وڵاتەکەی خۆمان؟» پادشـــا گوتی: «بەڵێ، هەموو شـــتێکم دیت و هەموو شـــتێکم بیســـت. خودای گەورە وڵامی چاکەت داتەوە. باوەڕم نەدەکرد ئەوەندەت من خۆش بوێ.»

گوڵنار گوتی: «پادشا، چاکە هەر چاکە دێنێ. ئەتۆ چاکەت لەگەڵ من کرد و تا ئەوپەڕی توانا لەگەڵم دلۆڤان بووی. ئەمنت لە هەمووکەس خۆشـتر ویسـت. چۆن دەتوانم لە تۆ جیا ببمەوە؟ ئیســـتاش تکات لێ دەکەم، گەورەییم لەگەڵ بکە و وەرە ســـڵاوێک لە خزم و کەس‌وکارەکەم بکە و بیانبینە. با لەگەڵیان ئاشـــنا بی. ئەوانیش بە ئاواتی دەخوازن بە خزمەتت بگەن و بە دیدارت شـاد بن. گوتیان هەتا پادشـا نەبینین و سـڵاوێکی لێ نەکەین ناگەڕێینەوە بۆ وڵاتی خۆمان.» پادشـا گوتی: «منیش بە تەمای ئەوەم.» لەڕێوە هەسـتا و هات بۆ لایان و سـڵاوی لێ کردن. ئەوانیش هەسـتان و سڵاویان لە پادشا کرد. پێکەوە لە ســـەر ســـفرە دانیشـــتن و هەتا ســـێ ڕۆژان پادشـــا لەگەڵ ئەوان بوو. دوای ئەوە ئەوان

گەڕانەوە و مالاواییان لە شا و شاژن گوڵنار کرد. کاتێک گوڵنار مانگ و ڕۆژی خۆی هات. کوڕێکی بوو، وەک مانگی چواردە. پادشا لە ڕادەبەدەر خۆشحاڵ بوو. میوانداری و بەزم و ئاهەنگی گێڕا و هەتا حەوت ڕۆژان شـــار ڕازاوە. ڕۆژی حەوتەم دایک و برا و کچە مامەکانی شاژن گوڵنار هاتنەوە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و چل و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! که خزم و کەسەکەی گوڵنار هاتنەوە. پادشا به هاتنیان خۆشحاڵ بوو. پێی گوتن: «ئەمن نێوی کوڕەکەی خۆم نەناوە هەتا ئێوە بێن و ناوی بنێن. ئەوان ناوی کوڕەیان نا «بەدرباسم». دوای ئەوە کوڕەیان دا به سالحی خالی. سالح منداڵەی وەر گرت و له نێو خەڵکەکه هەستا و بەملاولای کۆشکدا گەڕا، هەتا له کۆشک چووه دەرێ و چوو له دەریاوە. ڕۆی ڕۆی هەتا له چاوی پادشا نەدیو بوو. پادشا که ئەوەی دیت دەستی کرد به گریان. گوڵنار گوتی: «پادشا خەمی کوڕەکەت نەبێ. چون من له تۆ زیاترم خۆش دەوێ. ترسی دەریات نەبێ. ئێستا براکەم دەیهێنێتەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو دەریا شەپۆلی دا. برای گوڵنار هاته دەرێ و کوڕەی به ساغ و سڵامەتی هێناوە. ڕووی له پادشا کرد و گوتی: «نیگەرانی کوڕەکەت بووبی نا؟» پادشا گوتی: «ئەرێ وەڵلا. زۆرم خەم بوو.» سالح گوتی: «پادشا، ئێمه کلێکمان هەیه، بردم لەو کلەم له چاوی کرد و ئەو ناوانەم به گوێیدا دا که له سەر ئەنگوستیلەکەی حەزرەتی سولەیمان نەخش کراون. ئیدی لەمەوبەدوا تۆ نیگەرانی خنکانی ئەو مەبه له ئاودا. تۆ چۆن له دەشتێکدا دەڕۆی ئەویش ئاوا به سەر ئاودا دەڕوا. ئەو جار سالح مجرییەکی له گیرفانی دەر هێنا و هەڵی پچڕی. گەوهەری ڕێک و تەکووز له یاقووت و زمڕوود. سێسەد گەوهەری له هێلکه کۆتر گەورەتری تێدا بوو، دەری هێنا. تیشکیان له تیشکی خۆر چاتر دەدرەوشاوە. به پادشای گوت: «پادشا، ئەو گەوهەرانه دیارییەکن له لایەن ئێمەوه بۆ جەنابت. ئێمه تا ئێستا به شوێن و جێگای گوڵنارمان نەدەزانی. هەر بۆیه دیاریمان بۆ نەهێنا بووی. ئێستا که لەگەڵ ئێوه ئاشنا بووین. جار جار دێن و دیاری گەورەشتان بۆ دێنین. چونکه له دەریادا گەوهەر و یاقووت وەک خیز و خۆڵی دەشت و سارای ئێوه وایه. کاتێک پادشا ئەو گەوهەرانەی دیت، هۆشی پەڕی و له دڵی خۆیدا گوتی: «جا خۆ دەنکێک لەو گەوهەرانه وڵاتەکەی من دێنێ.» پادشا سپاسی سالحی بەحری کرد و چاوێکی له شاژن گوڵنار کرد و گوتی: «ئەو برایەت منی خەجاڵەت کردەوە بەو دیارییه گرانباییەی بۆ منی هێناوە. گوڵنار سپاسی براکەی کرد. سالح گوتی: «ڕێز و حورمەتی تۆ ئەرکی سەر شانمانه، چونکه تۆ ئاگات له خوشکەکەی من بووه و لەگەڵی باش بووی. بێ ئەوەی ئێمه هیچ چاکەیەکمان لەگەڵ تۆ کردبێت. هەر بۆیه ئێمه ئەگەر کەسێک چاکەی ئاوامان لەگەڵ بکا چاکەی چەند قاتی لەگەڵ دەکەینەوە.

چاکه هێند چاکه، لەگەڵ چاکەکار
تۆ چاکەش بکەی نایەته ئەژمار
چاکەی تۆ جوابی قەرزبارییه

دوای ئەوە هەستا و گوتی: «پادشا ئێمە ئەگەر بە ساڵان لە خزمەت تۆدا بین، ناتوانین وڵامی چاکەکانی تۆ بدەینەوە. ئێستا داوات لێ دەکەین ڕێمان بدەی بگەڕێینەوە وڵاتی خۆمان و پێمان خۆشە بچینەوە لای کەس و کارەکەمان. ئەوەش بزانە هەتا ماوین تۆ و خوشکم لە بیر ناکەین و زۆر زۆرمان پێ خۆشە لە لاتان بمێنینەوە، بەڵام ئەوەی هەیە ئێمە پەروەردە و گۆشکراوی ئاوین و لە ویشکیدا ناتوانین هەڵبکەین.» پادشا کە ئەو قسانەی بیست هەستا ماڵاوایی لێ کردن. ئەوانیش گریان و گوتیان زۆر زوو دێینەوە و سەرتان دەدەین. دوای ئەوە لە دەریایان دا و ڕۆیشتن، ڕۆیشتن هەتا لە چاو ون بوون.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و چل و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! خزمانی گوڵنار لە چاو ون بوو و پادشـــا، زۆر بەڕێزەوە لەگەڵ گوڵنار هەڵسوکەوتی کرد. کوڕەیان لە هەموو بارێکەوە پەروەردە کرد و ڕایان هێنا. خاڵ و خوارزا و خزمانی دایکی پێیان لێ نەدەبڕین و بەینابەینێک ســـەریان دەدان و بە مانگ و دوو مانگ لە کۆشکدا دەمانەوە و پاشان دەڕۆیشتنەوە. کوڕە هەر یەک ڕۆژەی دوو ڕۆژە و جوانییەکەشـی تا دەهات جوانتر دەبوو تا تەمەنی گەیشـتە پازدە سـاڵی. لە پازدە سـاڵی کوڕێکی تەوا پێگەیشـــتوو و تگەیشـــتوو بوو. لە جوانیدا هاوتای نەبوو. نووســـین و خوێندنەوەی تەواو کرد و بۆخۆی وێژەوانێک بوو. ســـوارچاکی و تیرهاوێژی و شـــیر و مەتاڵگێڕییەکەی دەنگی دابووەوە. جوانییەکەی وێردی زمانی ژن و پیاو و گەورە و گچکە بوو. وەک شاعیر دەڵێ:

ناکرێ پەســـنی ئەو لاوە بە دێرێک و دوو دێر
پەســـنی لە خەڵک ببیســـتە لە مەیخانە و دێر
لە ســەر کانی و گۆلاوان و لە دەشـت و مەزرایە
تاریـــــــــفی جوانی ئەوگەنجەیە و کۆتایی نایە

ئەوجار پادشـــا وەزیر و ســـەرهەنگ و گەورەگەورەکانی دەوڵەت و وڵاتی بانگ کرد و پێی ڕاگەیاندن کە بەدرباســـمی کوڕی جێگری ئەوە و داوای لێ کردن، گفت و بەڵێن بدەن کە دوای نەمانی ئەو پشـــتی بگرن و هاریکاری بکەن. ئەوانیش ســـوێندیان بۆ خوارد و پەیمانیان لەگەڵ بەست. دوای ئەو کۆبوونەوەیە. تێکڕا گەورەکانی دەوڵەت و لەشکر سوار بوون، بۆ سەیران و گەڕان چوونە دەرەوە و شەو گەڕانەوە. کە گەیشتنەوە نیزیک کۆشک، پادشا دابەزی و بە پیان لە قەراخ ئەسپی شازادە ڕۆیشت. گەورەکانی دەوڵەت هەر کام بە نۆرە ماوەیەک سەرزینی پادشایان هەڵگرت. هەتا گەیشتنە دالانی کۆشک. شازادە لەوێ لە ئەسپ دابەزی. پادشـا لە باوەشـی گرت و لە سـەر تەخت داینا و دەسـتەونەزەر لە پێشـی ڕاوەســـتا. ســـەرهەنگ و گەورەگەورەکانیش وایان کرد. دوای ئەوە شـــازادە بەدرباســـم دەسەڵاتی بە دەستەوە گرت. ئەوەی لەتمکار بوو لای دەبرد و دادپەروەری لە جێی دادەنا. هەتا نیوەڕۆ پادشایەتی کرد. نیوەڕۆ لە سەر تەخت هەستا و چوو بۆ لای گوڵناری دایکی. تاجەکەی بە سەرەوە بوو. ڕوخساری وەک مانگ دەدرەوشاوە. دایکی کە چاوی پێی کەوت هەســـتا و ماچی کرد. پیرۆزبایی لێ کرد و گوتی: «وەرە لە لای دایکی خۆت دانیشـــە.» دوای ئیستێک سوار بوو چوو بە گەشت و سەیران. هەموو ڕۆژێ خەریکی بەڕێوەبەرایەتی

وڵات و ئەسپسواری بوو. ساڵێک بەو جۆرە ڕایبوارد. ئەوجار سوار بوو بە نێو ئەو شار و گوندانەدا دەگەڕا کە لە ژێر فەرمان و دەسەڵاتی ئەودا بوون. گوێی لە قسەی خەڵک دەگرت و بە هاواری خەڵکەوە دەچوو. ڕێکەوت وا بوو پادشا نەخۆش کەوت. ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ نەخۆشییەکەی پادشا پەرەی دەستاند. تا وا بوو بانگی کوڕەکەی کرد و خەڵکی بەو سپارد. داواشی لە گەورەکانی دەوڵەت کرد لە فەرمانی دەرنەچن و لە سەر پەیمانی خۆیان بن. دوو سێ ڕۆژ دوای ئەوە، پادشا مرد. بەدرباسمی کوڕی و گوڵنار و سەرهەنگ و وەزیر و گەورەکانی دەوڵەت مات و مەلوول بوون و هەتا مانگێک ماتەمیان گرت. ساڵح و دایکی و خوشکی و کچە مامەکانی هاتنەوە و ماتەمیان گرت و سەرەخۆشیان لە گوڵنار کرد گوتیان: «پادشا کە مردووە خۆ ئەوە کوڕی ئاوای لە پاش بەجێ ماوە. کەسێک کوڕێکی ئاوای هەبێ نەمردووە.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و چل و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! دوای ئەوە گەورەکانی دەوڵەت هاتنە لای بەدرباسم شا و گوتیان: کە جێی خۆیەتی ماتەمبار بین و شینی بۆ بگێڕین، بەڵام شین و گریان کاری ژنانە. ئەتۆ زۆر بیر لە مردنی باوکت مەکەوە، بەس نییە کوڕێکی وەک تۆی بەجێ هێشتووە و هەرکەس کوڕێکی ئاوای لە پاش بەجێ مابێ، ئەو کەسە نەمردووە.

کورتی کەینەوە، بەوجۆرە دڵخۆشی بەدرباسم شایان داوە و ڕازیان کرد بچێ بۆ گەرماو. کە لە گەرماو هاتە دەرێ، کراسێکی ئاتەک زێڕ تێ هەڵکێشراوی ڕازاوەی لە بەر کرد. تاجی ساسانیانی لە سەر نا و لە سەر تەختی دەسەڵات دانیشت. مافی ماف زەوتکراوانی ئەستاندەوە. زوڵم و زۆری لە سەر خەڵک هەڵگرت. خەڵکی تەواو لە خۆی ڕازی کردبوو. ئیدی ئەوە کاری ئەو بوو، هەتا ماوەیەکی زۆر.

شەوێکیان بەڕێکەوت خاڵە سالحی هاتە لای گوڵناری دایکی و سڵاوی لێ کرد. گوڵنار هەستا و ئەوی لە ئامێز گرت و پاشان لە لای خۆی داینا و لێی پرسی: «ئەرێ دایک و خوشک و ئامۆزاکانم چۆنن؟» سالح گوتی: «خوشکێ وەڵا ئەوان زۆر باش و سەرودڵ خۆشن خەمی هیچیان نییە، جگە لە دووربوونی تۆ.» دوای ئەوە گوڵنار خواردنی دانا و خواردیان و دەستیان کرد بە قسە کردن. قسە هاتە سەر بەدرباسم و باسی جوانی و ئازایەتی هات. بەدرباسم پاڵی بە پاڵپشتێکەوە دابوو. کە زانی دایکی و خاڵی باسی ئەو دەکەن، خۆی لە خەو کرد و گوێی ڕاگرت. سالح بە خوشکەکەی گوت: «کوڕەکەت ئەوە حەڤدە ساڵی تەمەنە و ژنت بۆ نەهێناوە. ئێمە نیگەرانی ئەوەین شتێک بێ و منداڵێکی لە پاش بەجێ نەمێنێ. ئەمن دەڵێم شازادەیەک لە شازادەکانی دەریای لێ مارە بکەم.» گوڵنار گوتی: «کامەیان خۆمن هەموویان دەناسم دایەی دانە دانە نێویان بەرە.» ئیدی سالح دانە دانەیانی ناو دەبرد و گوڵنار دەیگوت: «ئەمن ئەوەی بۆ کوڕی خۆم نانهێنم. هەتا دەنکێک بە قەد خۆی جوان و چاک نەبێ بۆی ناهێنم.» سالح گوتی: «خۆ کچی دەریایی نەماوە نێودێرم نەکردبێ. ئەوە زیاتر لە سەد کچم هەڵدا ئەتۆ هیچیانت پەسند نەکرد. دا خوشکێ بزانە کوڕەکەت خەوتووە یان نا؟» گوڵنار چوو کەمێکی تێ ڕاما، وای بۆ چوو خەوتبێ. بە سالحی گوت: «بەدرباسم خەوتووە. بۆ دەتهەوێ بڵێی چی وا گوتت بزانە خەوتووە یان نا؟» خالی وڵامی داوە: «خوشکم، ئەمن کچێکم لەو کچە دەریاییانە کەوتەوە بیر کە شیاوی ئەو کوڕەی تۆیە. دەترسم ئەگەر تاریفی بکەم و بەدرباسم بەخەبەر بێ و گوێی لێ بێ، نەدی و نەناس ئاشقی بێ. شیمانەی ئەو دەکرێ دەستیشمان پێی ڕانەگا و تووشی سەختی و ناڕەحەتی بین.» دایکی کە ئەو قسەیەی بیست پێی گوت: «ئەتۆ هەر ناوی کچەم پێ بڵێ

ئەمن هەموویان دەناســـم. ئەگەر بزانم شـــیاوی کوڕەکەم بێ، بۆی داوا دەکەم و تەواوی سامانەکەمی لە سەر دادەنێم. ئەتۆ هەر پێم بڵێ کێیە. مەترسە کوڕەکەم خەوتووە.» ساڵح پێی گوت: «ئەمن دەترســم ئەو بەخەبەر بێ و بە بیســتنی ئەو قســانە ئاشــقی بێ. وەک شاعیر دەڵێ:

هەرکەس ببیستێ باسی جــــــــــــوانی ئەو
لە نینۆک پای ڕا، هەتا قــــــــــــــــژی ئەو
بە باڵای بەرزیا، ورد ورد هـــــــــــــەڵزنێ
هەرچی جوانییە هەمـــــــــــــــووی هەڵبنێ
مەحـاڵە عەقـڵـی هەر لە جـێـی خـۆی بـێ
نەکەوتبێتە جێ و لە ســـەر پێی خۆی بێ

گوڵنار گوتی: «براکەم، بیڵێ مەترسە.» ساڵح گوتی: «خوشکم، جگە لە شازادە گەوەر، کەس شـیاوی کوڕی تۆ نییە. شـازادە گەوەر کچی سـەمەندەل پاشـایە. لە چاکی و پاکی و ڕەوشت بەرزی و جوانیدا تای کوڕی تۆیە و لە ویشکایی و دەریادا کچی وا نییە.» گوڵنار کە ئەو تاریفەی لە براکەی بیست گوتی: «بە خودا ڕاست دەکەی، منیش ناوبانگیم بیستووە. جگە لەو کەس شیاوی کوڕی من نییە.» بەدرباسم کە ئاوا تاریفی کچی سەمەندەل پاشای لە خاڵی بیســت و دایکی بۆی ئەســتاندەوە. ئاشــقی بوو. بە ڕواڵەت خۆی لە خەو کردبوو کەچی لە تاوی کچەش تین لە دروونییەوە دەهات. نوقمی دەریایەکی بێ کۆتایی بوو.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەوسەد و چل و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! سالح بە گوڵناری خوشکی گوت: «خوشکێ جارێ لەو بابەتەوە قسە لەگەڵ بەدرباسم مەکە. چونکە باوکی ئەو کچە پیاوێکی زۆر لە خۆ بایی و خۆ بە زل زانە. جارێ با داوای کچەکە بکەین. ئەگەر هاتوو باوکی گوتی باشە وەرن قسەی لێ بکەین، ئەوە شوکری خودا دەکەین. ئەگەر هاتوو قەبووڵیشی نەکرد ئەوە یەکی دیکەی بۆ دەخوازین.» گوڵنار گوتی: «فکرێکی بەجێیە.» ئیدی ئەوان باسەکەیان تەواو کرد و ئەو شەوە خەوتن.

بەڵام بەدرباسم کێچ کەوتە کەوڵی و فکر و خەیاڵ لە سەری دا. هەتا بەیانی هەر هێنای و بردی و لێکی داوە. ئاگرێک لە هەناویدا داییسا و لای دایکی و خاڵیشی دەنگی نەکرد. کە ڕۆژ بووەوە لەگەڵ خاڵی چوو بۆ گەرماو. دوای گەرماو دانیشتن ناشتایان خوارد. دوای ناشتا خواردن. پادشا بە خاڵی گوت: «ئەوڕۆش لە لامان بمێنەوە و مەڕۆوە.» سالح بە قسەی کرد. ئەوجار پادشا بە خاڵی گوت: «خاڵە هەستە با بچین لە نێو باخ کەمێک بگەڕێین.» ئیدی هەستان چوون بۆ نێو باخ و ماوەیەک گەڕان. ئەوجار بەدرباسم شا بۆ حەسانەوە لە بن دارێک دانیشت. بە پێی پەسن و تاریفەکانی خاڵی ئەو کچەی هێنا بەر چاوی و دەستی کرد بە گریان و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ڕووناکە ژینم بە ڕووت و ڕووتم لێ ونە<br>
ڕووتم بێ تۆ، ڕووی تۆم نەبێ، ژینم ڕووتەنە<br>
هەنگی ئەڤینم هەردەم دەفڕێ بۆ لای تۆ<br>
حەزی لە شەهدی لێوتە، ئەو هەنگە نەوسنە<br>
زۆرم بیستووە دەڵێن، کە بێ هاوتایە ئەو<br>
هێند جوانە کە داوود، لە ئاستیدا منگنە<br>
ئاواتی دیداری تۆ، من دەبەمە ژێر گڵ<br>
مردنم لە تاوی تۆ، چارەنووسی منە

کە سالح ئەو شێعرەی بیست ، پەشیمان بووەوە و کەوتە ئاخ و ڕۆ و دەستەکانی لێک دا و پێی گوت: «بۆ ڕۆڵە، گوێت لێ بوو. لەگەڵ دایکت باسی شازادە گەوەرمان کرد؟» بەدرباسم وڵامی داوە: «بەڵێ بیستم و بێ ئەوەی بیبینم ئاشقی بووم. ئێستاش بێ ئەو هەڵناکەم.» سالح گوتی: «باشە ڕاوەستە با بە دایکیشت بڵێم. پاشان پێکەوە دەچین و شازادە گەوەرت بۆ دەخوازم. چونکە ئەگەر بێ ئیزنی دایکت بتبەم. دایکت دڵی لێم دێشێ

و دوایە کـارەکەی تۆش قورتی تێ دەکەوێ. دەبمە هۆکـاری تێـک چوونی نێوانی تۆ و دایکیشـــت. هەر وەک ئەوەی من بوومە دابڕانی دایکت لە خۆمان. بێجگە لەوەش وڵاتەکەی تۆ بێ پادشـا دەمێنێتەوە و تووشـی پاشـاگەردانی و کەس بە کەسـی دەبێ. دەسـەڵاتەکەت تووشـی نسـکۆ دەبێ.» پادشـا کە ئەو قسـانەی لە خاڵی بیسـت گوتی: «ئاخە خاڵە، ئەگەر بچینە لای دایکم و ڕاوێژی لەگەڵ بکەین. ئەو ڕێمان نادا بچین. هەر بۆیە ناگەڕێمەوە بۆ لای ئەو و ڕاوێژیشـی لەگەڵ ناکەم. سـاڵح کە ئەو قسـەیەی بیسـت. گێژ بوو. نەیدەزانی چ بکا. زانی تازە ناگەڕێتەوە بۆ لای دایکی و هەر دەشـبێ لەگەڵی بچێ. ئیدی ئەنگوسـتیلەیەک کە ناوەکانی خودای گەورەی لە سـەر نەخشـکرابوو دای بە بەدرباسـم شـا و پێی گوت: «ئەو کلکەوانەیە لە قامکت بکە با لە بەڵا و نەهاتی دەریا و گیروگرفتەکانی دیکە بە دوور بی. پادشا کلکەوانەکەی لە قامک کرد و چوون لە دەریاوە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی حەوسەد و چل و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشــکۆ! بەدرباســم شــا، لەگەڵ خاڵی چوون لە دەریاوە و ڕۆیشــتن هەتا گەیشــتنە کۆشــکی خاڵی. لەوێ دایە و داپیران و خزم و کەســی خۆی دیت و دەســتی ماچ کردن. داپیرە لە باوەشــی گرت و ناوچەوانی ماچ کرد و لێی پرســی: «ئەرێ ڕۆڵە گوڵناری دایکت چۆنە؟» بەدرباسم وڵامی داوە: «سپاس بۆ خودا کە لەش ساغ و سەرودڵ خۆشە و سڵاوی تۆ و کچەکانی مامی دەگەیاند.» دوای ئەوە ساڵح بۆی گێڕاوە کە لەگەڵ خوشکی چیان گوتووە و بەدرباســم گوێی لێ بووە و ئێســتا ئەوە ئاشــقی شــازادە گەوەری کچی ســەمەندەل شــا بووە. ئێســتا هەر لەبەر ئەوە هاتووە بچێ بۆ خوازبێنی ئەو کچە و مارەی بکا. دایەگەورەی بەدرباســم کە ئەو قســەیەی بیست. تووڕە بوو، پاشــان مات بوو. ئەوجار گوتی: «کوڕم تۆ هەڵەت کردووە و نەدەبوو نێوی شــــازادە گەوەرت هێنابا. چونکە تۆ سەمەندەل پادشا باش دەناسی کە پیاوێکی گەوجی ملهوڕە و کچ نادا بە داواکاران. چونکە هەموو پادشــــایانی دەریا داوایان کردووە و قســــەی هەموویانی لە عەرزی داوە و پێی گوتوون: «ئێوە کووفوو(واتە ئێوە هاوتای کچی من نین.) ئەمن لەوە دەترسم وڵامی ئێمەش ئاوا بداتەوە.» ساڵح گوتی: «دایە ئێستا ئێمە چ بکەین. بەدرباسم شا ئاشقی ئەو کچە بووە و دەڵێ هەر دەچمە خوازبێنی. ئەگەر تەواوی ماڵ و سامانەکەشم، لەو ڕێیەدا دانا بێ. ئەو پێی وایە ئەگەر بێت و بەو کچە نەگا گیانی دەردەچێ و دەمرێ.» دوای ئەوەش ســاڵح بە دایکی گوت: «دایە، خۆ ئەو خوشــکەزایەی من لە شــازادە گەوەر جوانترە و باوکیشــی پادشــای وڵاتی عەجەمە و ئێســتا ئەو لە جێی باوکی پادشــایە. شــازادە گەوەر جگە لەو شــایانی کەس نییە. ئەمنیش بە تەمام دیاری گرانبایی وا کە شــایانی ئەو بێ لەگەڵ خۆم بەرم و بچم بۆ خوازبێنی. ئەگەر بە پێی پادشایەتی بێ، ئەوە بەدرباسم بۆخۆی پادشایە و کوڕی پادشاشە. ئەگەر بە جوانی کچەکەی لەگەڵمان بکا، ئەوە بەدرباسم لە کچەکەی ئەوە جوان و دەلالترە. ئەگەر بە وڵات و لەشکر بیکا، ئەوە وڵات و لەشکری بەدرباسم شا زۆر لە ئی ئەو بەرینتر و لەشــکریشــی زیاترە. ناچارە هەر دەبێ مل بدا. منیش تا وەدی هێنانی ئاواتی خوشــکەزاکەم دانانیشــم. چونکە هۆکاری ئەو ڕووداوە منم.» دایکی ســاڵح گوتی: «چۆنت پێ باشــە وا بکە. بەڵام تکات لێ دەکەم بە لەســەرخۆیی و زمانی خۆش قســەی لەگەڵ بکە و بە تووڕەیی و هەڕەشە قسە مەکە.

ئەوجار ســاڵح هەســتا دوو توورەکەی پڕ کرد لە گەوهەر و یاقووت و زمڕوود و مرواری و بە کۆڵی هاوڕێکانی دادا و لەگەڵ بەدرباســم شــا بەرەو ماڵی ســەمەندەل پاشــا کەوتنە ڕێ. کە گەیشتنە کۆشک داوای ڕوخسەتیان کرد و چوونە ژوورێ. سڵاویان کرد و کوڕنۆشیان برد. سەمەندەل پاشا لەبەریان هەستا و بەخێر هاتنی کردن و فەرمووی کردن

دانیشـن. ئەوجار گوتی: «سـاڵح ئەوە چۆنە هاتووی بۆ لامان؟» سـاڵح دیسـان هەسـتا و کورنۆشـی بردەوە و گوتی: «ئێمە داوامان لە پێشدا لە خودای تەعالا و پاشان لە پادشای مەزنمانە. ئینجا سـەری توورەکەی کردەوە و دیارییەکانی لە پێش هەڵرشـت و گوتی: «پادشا، داوای یەکەممان ئەوەیە ئەو دیارییانەمان لێ قەبووڵ کەی و دڵمان خۆش کەی.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی حەوسەد و چل و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! سەمەندەل شا لێی پرسی: «ئەو دیارییانەت بۆ هێناوە؟ پێم بڵێن چ کارێکتان هەیە؟ ئەگەر لە دەستم بێ بۆتان جێبەجێ دەکەم و ئەگەر لە دەستیشم نەیە، ئەوە هیچ. خوداش زیاتر لە تواناییەکانت ئەرکت ناخاتە سەر شان. ساڵح کڕنۆشی برد و گوتی: «پاشای زەمان، کارەکەت لە دەست دێ و لە بەر دەستی خۆت دایە. منیش داوای کارێک ناکەم کە لە دەست تودا نەبێ. خۆ شێت نیم، داوای شتێک بکەم کە بزانم پادشا لە دەستی نایە. کارەکە ئەوەیە، هاتووم بۆ خوازبێنی دوڕی شاراوە، گەوەری کچت. هیوادارم پادشا بە گەورەیی خۆی بێ هیوامان نەکا. کاتێک پادشا ئەو قسەیەی بیست، بە گاڵتەجاڕی هێند پێکەنی بە پشتدا کەوت و گوتی: «ساڵح من تۆم بە پیاوێکی ژیر دەزانی و پێم وا نەبوو، هێندە گەوج بی و قسەی بێجێ بکەیت. ئەوە لە کەیەوە وات لێ هاتووە خوازبێنی کچە پادشایان بکەی؟ کێ ڕێوشوێنی بۆ کێشاوی؟ ئەوە پلە و پایەت چووەتە سەرێ من نەمزانیوە یان ئەقڵت گۆڕاوە کە قسەی وا لەگەڵ من دەکەی؟» ساڵح گوتی: «ئەسلەحوڵڵا، پادشا ئەمن داوای کچی تۆ ناکەم بۆ خۆم. هەرچەند نەک هەر هیچم لەو کەمتر نییە، بگرە لەویش زیاترم. چونکە بۆخۆت دەزانی باوکی من یەکێک لە پادشاکانی دەریایە. دیسان من ئەوم بۆخۆم ناوێ. بۆ بەدرباسم شای کوڕی شەهرمان پادشام دەوێ کە یەکێکە لە گەورەترین پادشاکان. ئەگەر دەڵێی کچەکەت جوانە، ئەوە ئەو لە کچەکەت زۆر جوانتر و ڕەسەنتر و خانەدانترە. پادشا ئەگەر داواکەی ئێمە قەبووڵ بکەی، ئەوە دڵنیا بە کارێکی بەجێ و باشت کردووە. ئەگەر قەبووڵیشی نەکەی ئەوە لە حەق و ئینساف لات داوە. تۆ دەبێ ئەو کچە هەر بە مێرد بدەی. چونکە حەکیمان دەڵێن کچ یان دەبێ بە مێرد بدرێ یان بمرێ. ئەگەر هەر بە تەمای بە مێردیشی بدەی، وەڵا ئەوە ئەو خوشکەزایەی من لە هەموو کەس بۆ ئەو شیاوترە.»

سەمەندەل پاشا کە ئەو قسەیەی بیست زۆر تووڕە بوو. گوتی: «سەگی پیاوان، ئەوە دنیا وای لێ هاتووە کەسێکی وەک تۆ قسە بۆ من دەکا و نێوی کچی من لە کۆڕدا دێنی و دەڵێ خوشکەزاکەم هاوشانی ئەوە؟ ئەتۆ کێی و خوشکەزاکەت کێیە و خوشکت کێیە و کوڕەکەی کێیە و مێردەکەی کێیە، تا ئاوا قسە لەگەڵ من بکەی؟» ئینجا بانگی باڵبازەکانی کرد و گوتی: «سەری ئەو گڵاوە لە جەستەی کەنەوە.» باڵباز شیریان لە کالان دەرکێشا و بۆ ساڵح چوون. ساڵح هەڵات و گەیشتە دەرگای کۆشک. خزم و کەس و نیزیکانی هۆزەکەی کە زیاتر لە هەزار سوار بوون، ئاگایان لێ بوو، لێیان پرسی ئەوە چی بووە؟ ساڵح ڕووداوەکەی بۆ گێڕانەوە. ئەو باڵبازانەی کە دایکی ساڵح ناردبوونی تا ئاگایان لێی بێ، کە ئەوەیان بیست، لە ئەسپ دابەزین و شیریان لە کالان دەرکێشا و هێرشیان کردە

سەر سەمەندەل پادشا. شا خەبەری لەوانە نەبوو. هەر بۆیە حەپەسا و بانگی باڵبازەکانی کرد، گوتی: «دا ئەو سەگانە قۆڵبەست بکەن. هەر دووک هێرشیان کردە سەر یەکتر. ئەوەندەی نەخایاند کە هێزی سەمەندەل ڕایان کرد و تێک شکان. ساڵح و باڵبازەکانی، سەمەندەل پاشایان قۆڵبەست کرد.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و چل و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک خزمانی ساڵح سەمەندەل پادشایان قۆڵبەست کرد، شازادە گەوەریش بیستییەوە کە باوکیان گرتووە هێندێک لە باڵبازەکانیان کوشتووە. لە کۆشک هاتە دەرێ و هەڵات بۆ یەکێک لە دوورگەکان و چووە سەر دارێک خۆی مات دا. کاتێک ئەو دوو هۆزە پێکیان دادا و دەستیان کرد بە کوشت و کوشتاری یەکتری. پیاوەکانی سەمەندەل پادشا هەڵاتن. بەدرباسم شا ئەوانی دیت کە هەڵدەهاتن پرسیاری کرد ئەوە چبووە؟ ڕووداوەکەیان بۆ گێڕاوە. کاتێک بەدرباسم شا زانی کە سەمەندەل پادشا گیراوە، ترسا و هەڵات و لە بەر خۆیەوە گوتی: «هۆکاری ئەو ڕووداوە منم. هەر بۆیە یەخەی من دەگرن.»

کورتی کەینەوە، بەدرباسم شا نەیدەزانی ڕوو لە کوێ بکا. چارەنووس ئەوی بەرەو ئەو دوورگەیە برد. لەوێ لە بن دارێک وەک مردوو درێژ بوو، ویستی کەمێک بحەسێتەوە. لە کاتێکدا لە سەر پشت درێژ ببوو، دەیڕوانییە ئاسمان چاوی بە کچێک کەوت کە لە سەر دارەکە بوو، لە جوانیدا دەتگوت مانگی چواردەیە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «بە خودا بێت و نەبێت ئەوە شازادە گەوەری کچی سەمەندەل پادشایە و زانیوییە باوکی گیراوە هەڵاتووە پەنای بۆ ئێرە هێناوە و لە ترسان چووەتە سەر ئەو دارە. ئەگەر ئەویش نەبێ لەو نامێنێتەوە. ئینجا هەر فکری لێ کردەوە و پاشان لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەرێ بۆ هەڵنەستم بیگرم، ئەگەر هاتوو شازادە گەوەر بوو ئەو چ باشترە. بۆ خۆمی دەخوازم. ئەمنیش هەر ئەوەم دەوێ. ئیدی هەستاو ڕووی لە گەوەر کرد و گوتی: «ئەی ئەوپەڕی ئاواتم، ئەتۆ کێی و بۆ هاتوویە ئێرە و چوویە ئەو سەرە؟» شازادە گەوەر چاوی لێ کرد. سەیری کرد لاوێکی جوانچاکی باڵا بەرز و ڕێکوپێکە ولامی داوە: «شاسواری خەونەکانم، من شازادە گەوەرم، ڕام کردووە هاتوومە ئێرە، چونکە ساڵح و خزم و کەسەکەی هێرشیان کردووەتە سەر باب و شەڕیانە. ئەمن لە ترسی گیانم، هاتوومە ئێرە. بەدرباسم شا کە ئەوەی بیست، سەری لەو ڕێکەوتە سوور ما و لە دڵی خۆیدا گوتی: «قسەی تێدا نییە بە ئاواتی خۆم گەیشتم.» دوای ئەوە پێی گوت: «خانم، وەرە خوارێ ئەمن گیرۆدەی داوی ئەڤینی تۆم و ئەو شەڕ و هەرایە لە سەر من و تۆیە. ئەمن بەدرباسم شام. شای وڵاتی عەجەمم و ساڵح خاڵی منە. خاڵم چووە بۆ خوازبێنی تۆ بۆ من. ئەمن لەبەر تۆ گەیشتوومەوە ئێرە و وڵاتی خۆم بەجێ هێشتووە. ئێستا وەرە خوارێ با بچین بۆ کۆشکەکەی باوکت و ڕزگاری بکەین. گەوەر کە ئەو قسەیەی بیست لە دڵی خۆیدا گوتی: «کەوایە لەبەر ئەو گڵاوە ئەو شەڕ و هەرایە ڕووی داوە و پیاوەکانی باوکم کوژراون و بۆخۆشی بە دیل گیراوە. ئێستا باوکم بە دەستیانەوە دیلە. منیش ئاوا هەڵوەدای ناو ئەو دار و دارستانە بووم. دەبێ

کارێکی لەگەڵ بکەم جارێ ئاوا ڕایگرم، ئەوەش ئاشـــقە و ئاشـــقیش هیچ کارێکی لێ عەیب نییە. هەر بۆیە گەوەر بە زمانێکی خۆش و نەرم دەستی کرد بە فێڵ و کەڵەک. بەدرباسمیش نەیدەزانی چی لە بن ســـەر دایە و قســـەی دڵ و زمانی یەک نییە. ئیدی گەوەر پێی گوت: «ئاای سـۆمای چاوم، ئەوە تۆ شـازادە بەدرباسـمی کوڕی شـازادە گوڵناری؟» شـازادە بەدرباسم گوتی: «بەڵێ خانمە شازادەکەم.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی هەوسەد و چل و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! گەوەر گوتی: «خودا قار لە بابم گرێ و لە دەســـەڵاتی بخا وا دەیهەوێ من بدا بە کەسێکی لە تۆ باشتر. بە ڕاستی گەوج و نەفامە.» دوای ئەوە گوتی: «پادشـــا، لە بابم خۆش بە و لێی بە دڵ مەگرە. لە بیرت بێ ئەگەر تۆ بســـتێک بێی بەلای منەوە من هەنگاوێک دێم بە لای تووە. ئێستا تۆم وا کەوتووەتە بەر دڵ ئەوەندەی تۆ منت خۆش دەوێ من سـەد ئەوەندەم خۆش دەوێی.» لە دارەکە هاتە خوارێ و چووە پێشێ. لە ئامێزی گرت و دمی بە لێوییەوە نا و ڕایمووســـی. بەدرباســـم شـــا کە ئەوی ئاوا دیت، ئەوەندەی دیکە ئاشقی بوو. پێی وا بوو بە ڕاستی ئەویش ئاشقی ئەو بووە. ئەویش ئەوی لە باوەش گرت و توند بە خۆیەوە گوشـــی و ماچی کرد و پێی گوت: «شـــازادە بە خودا خاڵە ســـاڵحم یەک لە هەزاری جوانییەکانی تۆی بۆ باس نەکردبووم. دوای ئەوە گەوەر ئەوی بە خۆیەوە گوشی و هێندێک شتی گوت کە ئەو لێی تێ نەدەگەیشت. ئەوجار گوتی: «لەو بیچمەی خۆت وەرە دەرێ و ببە باڵندەیەک کە باڵەکانت سپی و دندووک و قاچەکانت ســـوور بێ. هێشـــتا شـــازادە گەوەر قســـەکانی تەواو نەببوو، کە بەدرباســـم شـــا بوو بە باڵندەیەکی باڵ ســـپی و دندووک و قاچ ســـوور و چاوی لە گەوەر بڕی. شـــازادە گەوەر کەنیزێکی لە لا بوو. نێوی مەرسـییە بوو. شـازادە گەوەر ڕووی تێ کرد و گوتی: «ئەبەو خودایە لەبەر باوکم نەبایە ئەو هەتیوە زۆڵەم دەکوشـــت. چونکە تەواوی ئەو کێشـــە و ئاژاوانە لە بن ســـەری ئەو دایە. بەڵام قەیناکا ئێســـتا تۆ ببیە لە دوڕگەی وشـــکەڕۆ لەوێ داینێ با قڕی بێ. کەنیزە ئەوی برد لەوێ داینا و ویســـتی بگەڕێتەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی: «بە خودا کەسێکی ئاوا جوان و لە بەر دڵان نابێ لە توونییان و لە برسـان قڕی بێ. ئیدی لەوێ هەڵی گرت و بردی بۆ دوڕگەیەکی سـەرسـەوز و پڕ لە میوە و ئاو و چۆم و کانیاو. ئەوجار گەڕاوە بۆ لای خانمەکەی و پێی گوت: «چۆنت فەرموو، ئاوام لێ کرد و گەڕامەوە. جارێ با بەدرباسم لەوێ بێ.

خاڵە سالحی کاتێک سەمەندەل شایان بە دیل گرت، تەواوی داروودەستە و دەوروبەریانی کوشـت. بۆ شـازادە گەوەر گەڕا نەیدیتەوە. گەڕاوە بۆ ماڵی خۆی و بە دایکی گوت: «دایە ئەوە کوا بەدرباسـم لە کوێیە؟» دایکی وڵامی داوە: «ڕۆڵە نازانم و هیچ هەواڵێکم لێی نییە. ڕەنگە ترسابێ هەڵاتبێت.» کە سالح گوێی لەو قسەیەی دایکی بوو، زۆری پێ ناخۆش بوو. گوتی: «دایە بە خودا، ئەمن دەترسـم شـتێکی بە سـەر هاتبێ. نەکا یەکێک لە سـوارەکانی سـەمەندەل گەیشـتبێتە سـەری. یان کچی سـەمەندەل پادشـا ئەوی دیبێ و ئێمە خەجاڵەتی دایکی بین. چونکە ئەمن ئەوم بێ ئیجازەی دایکی هێناوە. ئیدی سـاڵح لە تاوان سـیخوڕ و زێرەڤانی بە هەموو لایەکدا بڵاو کردەوە. هیچ هەواڵی نەبوو. ساڵح هەمیشە مات و پەشێو

بوو.

گوڵناری دایکی دوای ئەوەی زانی کە بەدرباســم لەگەڵ ســاڵحی خاڵیدا ڕۆیوە و هیچ هەواڵێکیان هەر نەبوو. هەســتا و بۆ دیتنەوەی کەوتە پێوشــوێنی بەدرباســم و چوو لە دەریاوە. چوو بۆ لای دایکی. دایکی شــازادە کە ئەوی دیت لەبەری هەســتا و لە ئامێزی گرت. شــاژن گوڵنا، هەواڵی کوڕەکەی پرســی. دایکی وەڵامی داوە: «ڕۆڵە گیان ئەو لەگەڵ خاڵی هـات بۆ ئێرە. خاڵۆی زێڕ و گەوهەر و یاقووت و زمڕوودێکی زۆری برد و چوو خوازبێنی شازادە گەوەر لە سەمەدەل پاشا بکا. سەمەدەل پاشا، قسەکەی لە عەرزی دان و لێیان قەڵس بوو. منیش هەزار سـوارم ناردبوو بە دوای براکەتدا. کە لێیان بوو بە شـەڕ و کێشــە، خودا براکەتی بە ســەر ئەواندا زاڵ کرد. باڵباز و دەســتەودایرەکەی کوژران و سەمەندەل پاشاش بە دیل گیرا. کاتێک کوڕەکەی تۆ هەواڵی ئەو شەڕە دەبیستێ هەڵدێ و ئیدی نەگەڕاوە لامان. ئێســتاش بە هەواڵی نازانین. ئەوجار گوڵنار هەواڵی ســاڵحی برای پرسی. دایکی گوتی: «ئەوە لە جێی سـەمەندەل پاشـادا دانیشـتووە و خەریکی پاشـایەتییە. سیخوڕیشی بۆ هەموو لایەک بەڕێ کردووە. تا بکەونە پێوشوێنی کوڕەکەی تۆ و شازادە گەوەر. کاتێک گوڵنار ئەو قسەیەی بیست. ناڕەحەت بوو. ڕقی لە براکەی هەڵسا. دوای ئەوە گوتی: «دایە، ئەمن نیگەرانی وڵاتەکەی بەدرباســم و دەترســم ببێ بە پاشــاگەردانی و ئاژاوە. ئەگەر درەنگ بگەڕێمەوە دەشێوێ. وا چاکە ئەمن بگەڕێمەوە و وڵات ڕێک بخەمەوە و کوڕەکەش بە خودا بســپێرم. بەڵام ئێوەش لێی کەمترخەم مەبن. چونکە شـتێکی لێ بێ، ئەمن شێت دەبم. بۆخۆت دەزانی من لە دونیادا جگە لەو کەس شک نابەم. ئیدی گوڵنار بە دڵێکی پڕ لە کەسەرەوە بە گریان گەڕاوە و دنیای لێ تەنگ و تاریک بوو.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەوسەد و پەنجایەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! گوڵنار بەدەم ناڕەحەتی و داخ و دیقانەوە گەڕاوە. جا با بزانین بەدرباسم شا چی لێ هاتەوە.

گوتمان گەوەری کچی سـەمەندەل پاشـا، بەدرباسـم شـای بە جادوو کردە باڵندە و بە کەنیزێکدا ناردی بۆ دوورگەی وشـکەڕۆ هەتا لەوێ لە توونیان و لە برسـان قڕی بێ. بەڵام کەنیزەکەی دڵی نەهات لەوێ بەڕەڵای کا و بردی بۆ دوورگەیەکی خۆش و سـەرسـەوز. جا دوای ئەوە بەدرباســـم بۆخۆی بە میوە و ئاو و هەوای ئەوێ بەڕێ چوو و ژیا. نەشـــی دەزانی چ بکا و ڕوو لە کوێ کا و هەر لەوێ ماوە. هەتا ڕۆژێک ڕاوچییەک ڕێی کەوتە ئەو دوورگەیە و چاوی پێی کەوت. پێی سـەیر بوو، مەلێک باڵی سـپی و دندووک و قاچەکانی سـووور بێ. ڕاوچییەکە زۆری پێ جوان بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: «قەتم مەلی ئاوا جوان نەدیوە.» ئیدی داوی بۆ ناوە و گرتی و هێنایەوە بۆ نێو شار. گوتی ڕەنگە پارەیەکی باشم بۆ بکا. وا بوو کەسـێک هات و گوتی ئەو باڵندەیە بە چەندە؟ ڕاوچی گوتی: «بۆ چیتە؟» کابرا گوتی : «سـەری دەبڕم و دەیخۆم.» ڕاوچی پێی گوت: «جا چۆن ڕەوایە ئەو باڵندە جوانە سـەر ببڕدرێ. وەڵا نایفرۆشـم بە دیاری دەیدەم بە پادشـا. زۆر لەو پارەیەی تۆم زیاتر دەداتێ. ناشی کوژێ هەر بۆ جوانی ڕایدەگرێ. ئەمن لەوەتی هەم، هەر ڕاوم کردووە لە ئاو و ویشکیدا. کەچی شتی ئاوا جوانم نەدیوە.

ئیدی کابرای ڕاوچی بردی بۆ لای پادشا. پادشا کە چاوی پێی کەوت، زۆری پێ جوان بوو. دە دیناری دا بەکابرا. کابرای ڕاوچی کڕنۆشی برد و هاتە دەرێ. پادشا باڵندەکەی دا بە خزمەتکارێک و ڕایسـپارد ئاگاداری لێ بکا. خزمەتکارەکە ئەوی خسـتە قەفەسـێکەوە و دان و ئاوی بۆ دانا. دوو ڕۆژی پێ چوو. پادشا بە خزمەتکارەکەی گوت: «دا ئەو مەلەم بۆ بێنە با چاوێکی لێ کەم.» خزمەتکارە قەفەسـەکەی بۆ هێنا. تەماشـای کرد دندووکی لەو دانەیە نەداوە لە پێشـیان ڕۆ کردووە. پادشـا گوتی: «خۆزگە دەمزانی چی دەخوا؟» دوای ئەوە پادشـا داوای کرد نانی بۆ دانێن. سـفرە ڕاخرا و هەموو جۆرە خواردەمەنییەکیان لە سەر سفرە دانا. پادشا دەستی کرد بە نان خواردن و مەلەکەشی لە پەنا بوو جار جار بە دمییەوەی دەکرد. پادشـا سـەیری کرد لە تەواوی ئەو تەعامانە دەخوا. پادشـا و دانیشـتوان پێیان سـەیر بوو. سـەریان سـووڕ ما. پادشـا ڕووی لە خەڵکەی کرد و گوتی ئەمن قەتم نەدیوە باڵندە ئاوا شـلە و شـت بخوا. دوای ئەوە کۆرەکە هەسـتان و چۆڵیان کرد. بانگی خێزانی کرد بێ تەماشای بکا. کاتێک شاژن چاوی پێی کەوت، ڕووی گرت و گەڕاوە. پادشا هەرای کرد و گوتی: «ئەوە ئەو ڕووبەندەت بۆ داداوە.» شـاژن گوتی: «پادشـا خۆ ئەوە

باڵندە نییە و پیاوێکی وەک تۆیە.» پادشــا گوتی: «درۆ دەکەی چۆن شــتی وا دەبێ، باڵندە مرۆڤ بێ؟!» ژنە گوتی: «ئەمن درۆ ناکەم ئەو باڵندە بەدرباســم شــایە. کوڕی شــەهرمان شای عەجەم و گوڵناری دەریاییە.»

لێرەدا بوو، مــاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و پەنجا و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! چۆناوچۆن بوو ئاوای لێ هات؟ خێزانی پاشـــا گوتی: «شـــاژن گەوهەر، کچی سـەمەندەلپاشا بە سیحر و جادوو وای لێ کردووە. ئیدی بەسـەرهاتەکەی لە ئەوەڵەوە تا کۆتایی بۆ پاشـا گێڕاوە. کە پاشـا وتەکانی ئەوی بیسـت پێی سـەیر بوو. ژنەکەشی یەکێک لە سیحربازترین ژنانی ڕۆژگار بوو. پاشا پێی گوت، گوتی: «ئازیزم، ئەو سیحرە بەتاڵ کەوە. خودای گەورە دەستی گەوهەر بشکێنێ، وا ئەوەندە بێ مروەت بووە.» ژنە گوتی: «پێی بڵێ بچێتەوە کونجێکەوە. پاشـــا گوتی: «بەدرباســـم، بچۆ ئەو پشـــتەوە. بەدرباسم بە قسەی پاشای کرد.

ئینجا ژنە هەســـتا، قاپێک ئاوی بە دەســـتەوە گرت و چووە پەناکەوە. ورتەورتێکی بە ســـەر ئاوەکەدا کرد و پێی گوت: «بیکە بۆ خاتری ئەو نێوە پیرۆز و مەزنانە لەو بیچمە وەرە دەرێ و وەرەوە ســـەر بیچمی خۆت.» لە ڕێوە بەدرباســـم باڵ و پەڕی لە خۆی کردەوە و هاتەوە سـەر شـێوەی خۆی. پاشـا سـەیری کرد لاوێکی ئەوەندە جوانچاکە لە دونیادا تای نییە. دوای ئەوە بەدرباسـمشـا دەسـتی پاشـای ماچ کرد و دوعای بەخێری بۆ کرد. پادشـاش سـەری ماچ کرد و پێی گوت: «بەدرباسـم بەسـەرهاتی خۆتم بۆ بگێڕەوە.» ئەویش بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕاوە. دوای ئەوە پاشا گوتی: «ئێستا کە خودای تەعالا ئەو ســـیحرەی تۆی بەتـاڵ کردەوە، دەڵێی چی و بە تەمـای چ بکەی؟ بەدربـاســـم گوتی: «چاوەڕوانیم لە گەورەییت هەیە پاپۆڕێکم بۆ ئامادە بکەن و پێداویسـتی سـەفەرم بدەنێ و بەڕێم کەن. چونکە زۆر لە مێژە لە وڵاتەکەی خۆم دابڕاوم. دەترســـم وڵاتەکەم لە دەســـت بچێ. پێم وا نییە دایکم لە تاوی من هەتا ئێستا مابێ.

پاشـــا داواکەی هێناجێ و پاپۆڕێکی بۆ ئامادە کرد. چەند خزمەتکاریشـــی لەگەڵ ســـوار کرد و بەڕێی کردن. دە ڕۆژان بە دەریادا ڕۆیشتن. ڕۆژی یازدەیەم دەریا کەوتە جموجۆڵ و شەپۆلان. پاپۆڕڤانەکان لغاوی پاپۆڕەکەیان لە دەست دەرچوو. تا وای لێ هات پاپۆڕەکە خۆی بە کێوێکدا دا و پاپۆڕە تێک شـــکا و هەموو ســـوارەکانی نوقم بوون، جگە لە بەدرباسمشا کە بە تەختەیەک لە تەختەکانی کەشتییەکە خۆی گرتەوە. با، تەختەکەی ڕادا و بردی هەتا نۆ ڕۆژان، دوای نۆ ڕۆژ گەیشـتە قەراخ دەریا. بەدرباسـمشـا. شـارێکی لێ وە دیار کەوت لە نێو دورگەیەکدا لە قەراخ دەریا ڕۆ نرا بوو کە لە شـــفرە ســـپیتر بوو. ئاوی دەریا لە قەدی دیوارەکانی دەدا. کاتێک پاشا بردباسم ئەو شارەی لە نێو ئەو گراوەدا دیت، خۆشـــحاڵ بوو. چووە تەنکاوەکە و لە تەختەکە هاتە خوارێ. چووە ناو شـــارەکەوە. کە چووە ناو شـارەکەوە ئەسـپ و ئێسـتر و گوێدرێژێکی زۆر بۆی هاتن و بە جووتە لێیان دا

و به گاز و قەپاڵ تۆقاندیان و نەیانهێشت بچێتە ناو شارەوە.

کە نەیانهێشت بچێتە ناو شارەوە واوە هات بە مەلە چوو بۆ لایەکی دیکەی شار. ئەوێش کەسی لێ نەبوو. سەری سوور ما و گوتی: «خۆزگە دەمزانی ئەو شارە ئی کێیە و بۆ پادشای نییە؟ بۆ کەسی تێدا نییە؟ ئەو کەر و ئێسترانە چۆنە لێرەن؟ هەر ئاوا دەڕۆیشت و لەو بیر و هزرانەدا بوو. نەشی دەزانی بۆ کوێ دەچێ. لە پڕ کابرایەکی دووکانداری دیت. سڵاوی لێ کرد. کابرا سڵاوەکەی ئەستاندەوە و تێی ڕوانی. سەیری کرد لاوێکی جوانچاک و لە بەر دڵانە. لێی پرسی: «کوڕی باش، ئەتۆ کێی و ئەوە چۆن گەیشتوویە ئەم شارە؟» بەدرباسم بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕاوە. پیاوەکە پێی سەیر بوو. لێی پرسی: «ڕۆڵە گیان لە ڕێگا تووشی کەس نەبووی؟» بەدرباسم وەڵامی داوە: «باوکە گیان، ئەمن سەرم لەو شارە سوور ماوە! تووشی هیچ کەسێک نەبووم و کەسم نەدیوە!» کابرای دووکاندار گوتی: «وەرە دووکانەکەوە، خودای گەورە ئەتۆی لەو شەیتانە پاراستووە.» بەدرباسم‌شا زۆر ترسا و لە کابرای پرسی: «گەورەم مەبەستت لەو قسەیە چ بوو، وا منت لەو شارە و خەڵکەکەی تۆقاند؟» کابرا وەڵامی داوە گوتی: «ڕۆڵە گیان، ئەو شارە شاری سیحر و جادووە. شاژنێکی هەیە جادووگەرە. ئەو کەر و ئێستر و شتەی دیتتن ئەوانە وەک ئێمە مرۆڤن. بەڵام سەیرن. چونکە هەر کەس بێتە ئەو شارە. ئەوێش ئەگەر وەک تۆ جوانچاک بێ. ئەو شاژنە ڕەزاگرانە دەیگرێ و چل شەو چل ڕۆژ لەگەڵی دادەنیشێ و دوای چل ڕۆژان بە جادوو دەیکا بە کەر و ئێستر.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

کە شەوی حەوسەد و پەنجا و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! دووکاندارەکە دوای ئەوەی باسی ئەو ئاکارانەی شاژنی بۆ بەدرباسم‌شا کرد پێی گوت: «ئەگەر ئەتۆش بچییە دەرێ جادووت لێ دەکا و وەک ئەوانە دەتکا بە یەک سم.

بەدرباسم گوتی: «گەورەم چۆن بڵێی وا دەکەم.» کابرا گوتی: «ڕۆڵە گیان، ئەو مەلکەیە بە جادوو بووە بە مالیکی ئەو شارە. ناوی شاژن لابە کە ماناکەی بە عەرەبی دەبێتە ڕۆژمێری هەتاوی. بەدرباسم‌شا کە ئەو قسانەی بیست لە ترسان وەک مێژۆکە دەلەرزی. لە دڵی خۆیدا گوتی: «باوەڕم نەدەکرد لە چنگ سیحر ڕزگارم بێ. ئێستا کە ڕزگارم بووە، چارەنووس تووشی قۆناخێکی دیکەی کردووم.»

بە ڕاستی بەدرباسم گێژ ببوو. نەیدەزانی چ بکا. پیاوەکە کە دیتی بەدرباسم زۆر ترساوە و نیگەرانە پێی گوت: «ڕۆڵە، هەستە بچووە لە بەر دەرگای دووکان دانیشە و

ســـەرنج بدە خەڵکی ئەو شـــارە و ئەو جل و بەرگەی لە بەریان دایە. نیگەران مەبە و هیچ مەترسە، شاژن و خەڵکی ئەو شارە منیان خۆش دەوێ. ئەمن لێیان ناترسم.

بەدرباسـم کە ئەو وتانەی کابرای بیست، هەسـتا چوو لە بەر دەرگا دانیشت. چاوی بە خەڵکەکەدا دەگێڕا. خەڵـک کە ئەویـان لەوێ دیـت چوون بۆ لای کـابرا و گوتیـان: «ئەوە کوڕتە؟» گوتی: «ئەوە برازامە، بیســـتم براکەم مردووە ناردم بە دوایدا هێنانمە ئێرە.» گوتیان: «کاکە ئەو کوڕە جوان و بەرچاوە دەترســـین شـــاژن بە ســـەریەوە نەچێ و لێت بســـتێنێ چونکە ئەو ئی جوانی خۆش دەوێ.» کابرا گوتی: «شـــــاژن منی خۆش دەوێ هەرچی بڵێم لە قسەم دەرناچێ. ئەگەر بزانێ ئەوە برازامە، کاری پێی نابێ و لەبەر دڵی من چاوپۆشی لێ دەکا.»

بەدرباسم شا چەند مانگێک لە لای ئەو کابرایە ماوە. کابرا زۆری خۆشێ دەویست. پاش ماوەیەک ڕۆژێک لە ڕۆژان بەدرباســـم هەر وەک ڕۆژان لە دووکان دانیشـتبوو کە لە پڕدا هەزار ســـوار بە جلوبەرگی شـــکۆدار و قایش و هەیاســـەی ڕازاوە بە دوڕ و گەوهەرە و شـیری ڕووت بە دەسـتەوە پەیدا بوون و سـڵاویان لە کابراکە کرد و ڕۆیشـتن. بە دوای ئەوانـدا هەزار کەنیزۆکی جوان و دەلال کە گشـــتیـان جلی دیبـای ڕازاوە بە زێڕ و جەواهێراتیان لە بەردا بوو یەکی زەرگێکیشیان بە دستەوە بوو بە سواری گەیشتنێ. لە نێو ئەو کەنیزۆکانە کیژۆڵەیەکیان تێدا بوو کە لە سەر زینی خەمڵاو دانیشتبوو کە هەر لە مانگ و ئەسـتێرە دەچوو. کە گەیشـتنە دووکانی کابراکە سـڵاویان کرد و تێپەڕین. هەر بە دوای ئەواندا شـــاژن لاب بە کەژاوەیەکی گەورەوە وە دەرکەوت و هاتە بەرەوە تا گەیشـــتە دووکانی کابراکە. بەدرباسـمی دیت لە دووکان دانیشـتبوو. کە سەرنجی دایە دیتی ڕۆژێکی بەژن و باڵا سەلەوە بۆخۆی. شاژن سەری لەو هەموو جوانییەی سووڕ ما و لغاوی عەقڵی لە دەست بەر بوو. لە ئەسپەکەی دابەزی و چوو لە دووکان لە پەنا بەدرباسم شا دانیشت. بە کـابرای گوت: «ئەوە ئەو کوڕە جوانەت لە کوێ بوو؟» کـابرا گوتی: «ئەوە برازامە و بەینێکە هێناومەتە لای خۆم.» شـاژن گوتی: «لێی گەڕێ با شـەوێک لە لای من بمێنێتەوە.» کابرا گوتی: «بەو مەرجەی جادووی نەکەی.» شـــاژن گوتی نە بە خودا. کابراکە گوتی: «دەبێ ســـوێندم بۆ بخۆی کە ئازاری نەدەی و تلیســـمی نەکەی.» دوای ئەوە شـــاژن فەرمووی ئەســـپێکی چاک بە زینی خەمڵاوەوە زین کەن و بیهێنن بۆ بەدرباســـم. هەزار دیناری زێڕیشـی دا بە کابرای دووکاندار و بەدرباسـمشـای لەگەڵ خۆی برد. خەڵک کاتێک ئەو هەموو جوانییەی بەدرباســمیان دەدیت دڵیان بۆی دەســووتا و دەیانگوت: بە ڕاســتی حەیفە ئەو دێوەزمەیە ئەو لاوە جوانە تلیسم بکا. بەدرباسمشا قسەکانی ئەوانی دەبیست و هیچیشـی نەدەگوت. خۆی دابووە دەسـت ڕوحمی خودا. لەگەڵ شـاژن لاب ڕۆیشـتن هەتا گەیشتنە کۆشک.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەوسەد و پەنجا و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! بەدرباسمشا لەگەڵ شاژن لاب ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە کۆشک.

ئینجا خزمەتکار و گەورەکانی دەوڵەت دابەزین. شـــاژن بە ســـەرکاردارەکانی گوت: «ڕێیان بدەن با هەموویان بڕۆنەوە. لەڕێوە خزمەتکار و گەورەکانی دەوڵەت کڕنۆشـــیان برد و بڵاوەیان کرد. شـــاژن لەگەڵ کەنیزەکانی و بەدرباســـم چووە ژووری. بەدرباســـم چاوی بە کۆشکەکەدا گێڕا سەیری کرد لە خشتی زێڕ دروست کراوە و باخێکی گەورە لە حەوشـــەی کۆشـکە و لە نێوەڕاسـتی باخەکەشـدا گۆلێکی لێیە. شـاژن لە سـەر تەختێکی شـــفرەیی دانیشـــت کە ئەو تەختە لە بەرجەوەندێکدا بوو کە بە ســـەر باغەکەدا دەیڕوانی. بەدرباسمشای لە پەنا خۆی دانا. باوەشی پێدا گرت و ماچی کرد.

ئینجـا بە کەنیزەکـانی گوت ســـفرە ڕاخەن و خواردن بێنن. ســـفرەیەکیـان هێنـا کە قەراغەکانی هەمووی بە زێڕ و جەواهێرات ڕازابووە و هەموو جۆرە خواردنێکی لە ســـەر بوو. ئەوانیش خواردنەکەیان خوارد و دەســـتیان شـــوت. ئەوجار دەفری زێڕ و زێو و بلووریان دانا پڕ لە نوقڵ و شـیرینی جوارجۆر. دوای ئەوە شـاژن فەرمانی دا مووزیکژەن و گۆرانیبێژ بانگ بکەن. هەر کە فەرمان درا دە دانە کەنیز کە هەریەکی ئامێرێکی مووزیکی بە دەستەوە بوو وە ژوور کەوتن. ئینجا شاژن پیاڵەیەک بادەی هەڵدا و پیاڵەیەکیشی دا بە بەدرباسمشا. هەر ئاوا بەردەوام بادەیان خواردەوە هەتا تەواو سەرخۆش بوون و هۆشیان نەما. ئەوجار شاژن بە یەکێک لە کەنیزەکانی گوت گۆرانییەکیان بۆ بڵێ. ئەویش گۆرانییەکی بۆ گوتن. گۆرانییەکە ئەوەندە خۆش بوو کە بەدرباســـم وایزانی کۆشـکەکەش خەریکە وە سەما و هەڵپەڕکێ کەوێ. بۆخۆشی زۆر دڵخۆش و کەیفساز بوو. لە خۆشیان دڵی کراوە و غەریبی و ئاوارەیی لە بیر چووەوە و لە دڵەخۆیدا گوتی: «ئەو شـــاژنە زۆر کچێکی خانومان و جوانە و قەت لەو شـاره ناڕۆم. وڵاتێکی پان و بەرینە و بۆخۆشـی لە شـاژن گەوهەر جوانتر و لەبەردڵانترە. هەر لەگەڵ شـــاژن خەریکی بادە خواردنەوە و کەیف و خۆشی بوون هەتا بوو بە شەو.

چلووره و مۆم داگیرسـان و عوود و عەنبەریان لە سـکڵدانەکان هاویشـت و خەریکی خواردنەوە بوون. کاتێک شـاژن لاب سـەرخۆش بوو لە جێی خۆی هەسـتا و چووە سـەر جێگاکەی. کەنیز و شـتەکەی ناردەوە و بە بەدرباسـمشـای گوت بچێ لە پەنای درێژ بێ. بەدرباسم چوو لە پەنای درێژ بوو هەتا بەیانی.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و پەنجا و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کە ڕۆژ بووە، شاژن لاب لە خەو هەستا. لەگەڵ بەدرباسمشا چوونە گەرماو و خۆیان شوت و ئاوی خاوێنیان بە خۆیاندا کرد و هاتنە دەرێ. شاژن عەبایەکی شکۆداری لە بەر بەدرباسم کرد و دەستیان کرد بە شەراب خواردنەوە و گۆرانیبێژ گۆرانی بۆ گوتن و لە خۆشیدا بوون هەتا بوو بە شەو. هەتا چل شەوان بەو شێوەیە ڕایان بوارد و لە کەیف و خۆشیدا بوون.

دوای ئەوە شاژن گوتی: «بەدرباسم ئێرەت پێ خۆشترە یان دووکانەکەی مامت؟» بەدرباسم گوتی: «شاژن بە خودا لای تۆ لە تەواوی دونیا خۆشترە. مامم فەقیرە پیاوێکی دانەوێڵەفرۆشە.» شاژن بەو وتەیە پێکەنی و هەتا بەیانی لە ئامێزی یەکتردا خەوتن. کاتێک بەدرباسمشا لە خەو ڕابوو، سەیری کرد شاژن لابی لە لا نەماوە. پێی سەیر بوو ترسێک کەوتە دڵییەوە. ماوەیەک چاوەڕێ بوو هەر نەهاتەوە. هەستا جلەکانی کردە بەری بە دوایدا ڕۆیشتە دەرێ. ڕۆیشت هەتا گەیشتە باخی کۆشک. چووە ناو باخەکەوە چۆمێکی لێ بوو، مەلێکی چەرموو لە قەراخ چۆمەکە بوو. هەر لەوێ دارێکی گەورەی لێ بوو کە مەل و باڵندەی جۆراجۆری لە سەر بوو. نوقمی سەیری ئەو دیمەنانە بوو کە باڵندەیەکی ڕەش هات و نیشتە سەر باڵندە چەرموەکە و سێ جاری پێدا فسی. دوای ئیستێک مەلە سپییەکە بوو بە مرۆڤ. کە بەدرباسمشا جوان لێی ورد بووە ئەو مرۆڤە، شاژن بوو.

لەوێدا بۆی دەرکەوت کە ئەو مەلە ڕەشە مرۆڤە بە جادوو وای لێ کردووە بۆ ئەوەی بتوانێ لەگەڵیشی جووت بێ خۆیشی بووە بە باڵندە. بەدرباسمشا، زۆری لە دڵ گران هات. ئیدی توورە بوو گەڕاوە کۆشک و چوو لە ناو جێگەکەیدا خۆی لە خەو کرد. ئەوەندەی پێ نەچوو شاژن هاتەوە لای و دەستی کرد بە خۆ تێ هەڵسوون و ماچ و دەستبازی. بەڵام ئەو هیچ ملاباتێکی نەدایە و زۆری لێ قەڵس بوو. شاژن زانی کە ئەوی لەگەڵ ئەو مەلە ڕەشەدا دیوە. هەر باسیشی نەکرد. کاتێک بەدرباسمشا ویستی شاژنی دابین کرد. بە شاژنی گوت: «ڕێم بدە بچمەوە دووکان بۆ لای مامم. ئەوە چل ڕۆژە نەمدیوە بیرم کردووە.» شاژن گوتی: «باشە بچۆ بەڵام زۆرت پێ نەچێ چونکە من بە بێ تۆ هەڵناکەم.

بەدرباسمشا سوار بوو ڕۆیشتەوە بۆ دووکانی کابراکە و سڵاوی لێ کرد.

کابرا هەستا لە باوەشی گرت و لێی پرسی: «چۆن لەگەڵ ئەو جادووگەرە سیحربازە هەڵت کرد؟ بەدرباسم وەڵامی داو کە هەتا دوێنێشەو لە کەیف و خۆشیدا بووم. شەو کە خەوتبووین لە نیوەشەودا خەبەرم بووەوە، تەماشام کرد، شاژن لە جێگەکەیدا نەماوە. هەستام جلەکانم لە بەر کرد و کەوتمە پێ و شوێنی و چوومە ناو باخەوە... بەو جۆرە

تەواوی ڕووداوەکەی بۆ کابرا گێڕاوە. کابرا کە بەســـەرهاتەکەی بیســـت، گوتی: «خۆ لەو چاوبەسـتە لادە. تەواوی ئەو مەل و باڵندانەی تۆ دیوتن لە سـەر ئەو دارە هەموویان گەنج و لاوی غەوارەن و شـــاژن ئاشـــقیان بووە و لە خۆشـــەویســـتیان جادووی لێ کردوون کردوونی بە مەلی جۆراوجۆر. ئەو مەلە ڕەشـــە یەکێک لە کۆیلەکانی شـــاژن بوو. هێندەی خۆش ویست کردی بە باڵندەیەکی ڕەش.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و پەنجا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! کابرا گوتی: «ئەگەر بزانی کە تۆ بە کار و نهێنییەکانیت زانیوە، لە بیری ناچێ و لە دڵیدا ڕای دەگرێ. بەڵام تا من مابم کاری پێت نییە. ئەمن موســـوڵمانم و ناوم عەبدوڵڵایە کەس وەک من لە سیحر و جادوودا شـارەزا نییە. بەڵام تا مەجبوور نەبم، کەڵکی لێ وەرناگرم. زۆر تەلیســـمی ئەو گڵاوم شـــکاندووە و خەڵکم ڕزگار کردووە. یەک زەڕڕەی لێ ناترسـێم. بگرە ئەو لە من دەترسێ. خەڵکی ئەو شـارە هەمووی لە سـەر دینی ئەون و ئاگرپەرستن. ئەوشەو بچووەوە. هەرچی کردی بەیانی بۆم بگێڕەوە، چونکە دەزانم بە تەمایە شتێکت بەسـەر بێنێ. نیگەرانیش مەبە شتێکت پێ دەڵێم، نەتوانێ هیچت لێ بکا.» بەدرباسمشا ماڵاوایی لێ کرد و گەڕاوە کۆشک کە چووەوە سەیری کرد، شاژن دانیشتبوو چاوەڕێ بوو.

شـــاژن کە چاوی پێی کەوت لەبەری هەســـتا و لە پەنا خۆی داینا. بە کەنیزەکانی گوت خواردن بێنن. کە خواردنەکەیان خواردا داوای شەرابی کرد. کەنیزەکان شەرابیان هێنا. بەو جۆرە تا نیوەشـەو خەریکی شـەرابخواردنەوە بوون. شـاژن بە دوای یەکدا چەندین پیاڵەی لە بادەکە دەرخواردی بەدرباسـمشـا دا تا تەواو مەسـت و سـەرخۆش بوو. ئاوەزی فڕی. ئینجا شــاژن ســوێندی دا و گوتی: «پرســیارێکت لێ دەکەم دەبێ ڕاســتییەکەیم پێ بڵێ.» بەدرباسـم گوتی: «بەڵێن بێ جگەت لە ڕاستی چم لێ نەبیستی.» هێزی ئەو دڵە پروکاوەم، ئەتۆ لەبەر ئەوە لە من نارەحەت نیی کە ئەو شـــەوەی وە دوام کەوتبووی منت لەگەڵ ئەو مەلە ڕەشــە دیت، کە پێمدا فســی؟» بەدرباســم کە لەبەر مەســتیان هۆشـێکی وای نەبوو، گوتی: «بەڵێ، ئەمن لەبەر ئەوە لێت نارەحەت بووم.» لەڕێوە شـــاژن لە باوەشـــی گرت و خۆی بە قوربان و ســـەدەقەی کرد و گوتی: «ئەو هەڵوێســـتەی تۆ بووە هۆی زیاتر بوونی خۆشەویستیم بۆ تۆ. تازە لە هەموو کەس لای من ئازیزتری.» دوای ئەوە پێکەوە خەوتن.

لە نیوەشـــەودا شـــاژن هەســـتا. بەدرباســـمشـــایش بە خەبەر بوو، بەڵام خۆی لە خەو کردبوو. بە دزییەوە چاوەدێری دەکرد. ئاگای لێ بوو، توورەکەیەکی ســـووری هێنا و شتێکی سووری لێ هێنا دەرێ و بە نێو کۆشکدا بڵاوی کردەوە. لە ناکاو بوو بە چۆمێکی بە خوڕ. ئەوجار مستێکی جۆ هێنا چاندی و لەو چۆمە ئاوی دا. جۆیەکە شین بوو و گوڵی کرد. هێنای گوڵەکانی لێ کردەوە و دەنکەکانی لێ جوێ کردەوە و جوان لێی کرد و کردی بە ئارد. چوو لە شوێنێک داینا و گەڕاوە. لە پەنا بەدرباسم خەوت هەتا بەیانی. بەدرباسمشا کە هەستا ڕوخسەتی خواست و چووەوە لای کابرای دووکاندار. هەموو شتێکی بۆ گێڕاوە. کابرا پێکەنی و گوتی: «بە خودا ئەو چاوبەســـتە تەڵەیەکی بۆ ناوییەوە. بەڵام گوێی مەدەیە

و مەترسێ.» پاشان کەمێکی ئارد دایە و گوتی: «ئەگەر شاژن ئەو ئاردەی دیت و گوتی: «ئەوەت بۆ چییە؟» بڵێ بۆ خواردنم هێناوە. ئینجا فەرمووی بکە کەمێک بخوا. ئەویش کەمێکت ئارد دەداتێ و دەڵێ لێی بخۆ. بەڵام وریا بە نەچی لێی بخۆی. گورجێک لەگەڵ ئەوەی خۆت بیگۆڕە و لە ئی خۆت بخۆ وا بێ نەزانێ. ئەگەر کەمێک لە ئی ئەو بخۆی تازە سێحرەکەی کاریگەری لە سەرت دەبێ. ئەوە تۆ دەبی بەو شتەی کە ئەوە دەیهەوێ. بەڵام ئەگەر لە ئاردەکەی نەخۆی، جادووەکەی کارت تێ ناکا و تریق دەبێتەوە و دەیکا بە گاڵتە و جەفەنگ و دەست دەکا بە خۆ بە قوربان کردن و خۆشەویستی نواندن. بەڵام لە بیرت بێ هەمووی هەر فێڵ و دهۆیە و دوڕووییە. ئەتۆ خۆشەویستی خۆت دەربڕە و پێی بڵێ سۆمای چاوم لەو ئاردە بخۆ و کەیف بکە. ئەگەر هاتوو نەختێک لە ئاردەکەی خستە سەر زمانی کەمێک لە لوێچی دەستت کە و دەستە تەڕەکەت بە سەر و چاویدا بێنە و بڵێ وەرەوە دۆخی ئاسایی. لە ڕێوە ئەو لە بیچمی خۆی دێتە دەرێ و ئەتۆ چۆنت پێ خۆش بێ وای لێ دێ. جا وەرەوە لای خۆم هەتا ڕێیەکت پێشان دەم.

بەدرباسمشا ماڵاوایی لە کابرای دووکاندار کرد و گەڕاوە بۆ کۆشک. شاژن لەبەری هەستا و ماچی کرد و پێی گوت: «ئازیزم بۆ ئەوەندەت پێ چوو؟» بەدرباسم گوتی: «لە لای مامم بووم.» لەو چەنگەیەدا ئاردەی دیت. شاژن لە لای خۆی دانابوو. ئیدی گوتی: «ئەوە ئاردە؟ مامیشم ئاردێکی ئەوەندە خۆشی لە لا بوو، ئاردەکەی دەر هێنا.» ئینجا شاژن ئاردەکەی ئەوی لە دەفرێک کرد و ئاردەکەی خۆی هێنا پێشێ و گوتی: «ها لەوە بخۆ بزانە لە ئاردەکەی مامت خۆشترە یان نا؟» بەدرباسمشا کەمێکی لە ئاردەکەی خۆی لە لوێچیدا ڕاگرت و دەستی بردە سەر دەفرەکەی شاژن و پاشان ئاردەکەی ناو لەپی دەستی خۆی خوارد شاژن وایزانی کە لە ئاردەکەی ئەوی خواردووە خێرا لوێچێکی ئاو پێ بوو بە سەروچاوی بەدرباسمیدا کرد و گوتی: «گڵاو ببە بە ئێسترێکی تەک چاوی سەروچاو پان.» بەدرباسم هیچ نەگۆڕا و وەک خۆی ماوە. شاژن کە زانی چی بەسەر نەهات، هەستا ناوچاوانی ماچ کرد و گوتی: «گاڵتەم لەگەڵ کردی. دڵت لێم نەهێشێ.» بەدرباسمشا گوتی: «خانم توخودا شتی وا مەڵێ یانی من هەست بەو هەموو خۆشەویستییەی تۆ ناکەم؟ دەزانم گاڵتە و جەفەنگم لەگەڵ دەکەی.» ئێستا تۆ لەو ئاردەی من بخۆ بزانە ئی من خۆشترە یان نا؟» شاژن پاروویەکی لە ئاردەکەی ئەو خوارد ئەو بە لەز کەمێکی ئاو بە سەروچاوی ئەودا کرد و گوتی: «لەو سیمایەت وەردە دەرێ و بچۆوە سەر بیچمی پێشووت.» شاژن بوو بە ئێستر و ڕۆندکی بە چاوانیدا هاتە خوارێ لمبۆزی لە قاچی بەدرباسم دەخست. بەدرباسمشا هەستا لغاوی کا. نەیهێشت لغاوی بکا. ئیدی هەر لەوێ بەجێی هێشت و بۆخۆی گەڕاوە لای کابرای دووکاندا و شتەکەی بۆ گێڕاوە. کابرا لغاوێکی بۆ دەر هێنا و گوتی: «ئەو لغاوەی لە سەر کە. بەدرباسم لغاوەکەی لێ وەرگرت

و گەڕاوە لای شاژن. لغاوی کرد و سواری بوو لە کۆشک هاتە دەرێ و یەکسەر چوو بۆ لای کاک عەبدوڵڵای دووکاندار. کاک عەبدوڵڵا بە شاژنی [کە ئێستا لە بیچمی ئێستردا بوو] گوت: «گڵاو خودا ڕووت ڕەش کا.» ئەوجار بە بەدرباسمی گوت: «کوڕم تازە تۆ بۆ ئەوە نابی لێرە بی سواری ئەو ئێسترە بەو کوێت پێ خۆشە بڕۆ بەڵام نەکەی لغاوەکەی بدەی بە کەس.»

بەدرباسمشا سپاسی کابرای دووکانداری کرد و ماڵاوایی لێ کرد و ڕۆیشت. هەتا سێ ڕۆژان بەردەوام هەر ڕۆیی. تووشی سۆفییەکی خوێنشیرین و جوانچاک بوو. سۆفی لێی پرسی: «ڕۆڵە گیان، لە کوێوە دێی؟» گوتی: «لە شاری ئەو چاوبەستە جادووبازەوە دێم.» سۆفی گوتی: «ئەوشەو میوانی من بە.» بەدرباسم قەبووڵی کرد و لەگەڵی چووەوە. لە ناکاو پیرێژنێک پەیدا بوو، هەرکە چاوی بە ئێسترەکە کەوت، دەستی کرد بە گریان و گوتی: «سوبحانەڵڵا ئەو ئێسترە چەند وەک ئێستری کوڕەکەی من دەچێ. مەخابن ئێستا تۆپیوە و کوڕەکەم لە تاوی مات و مەلوولە. کوڕم، بیکە بۆ خاتری ئەو خودایە ئەو ئێسترەم پێ بفرۆشە.» بەدرباسم گوتی: «داپیرە بە خودا ناتوانم ئەو ئێسترە بفرۆشم.» پیرێژنە تکای لێ کرد کە قسەکەی نەشکێنێ و گوتی: «ئەگەر من ئەو ئێسترە بۆ کوڕەکەم نەکڕم کوڕەکەم تێدا دەچێ.» کە پیرێژنە هەروا پێداگری کرد و لە سەری سمڕ بوو، بەدرباسم گوتی: «نایفرۆشم ئەگەر بیفرۆشم لە هەزار دیناری کەمتر نادەم. ئەو پێی وا بوو کە پیرێژنە هەزار دیناری بۆ جێبەجێ نابێ. پیرێژنە لەڕێوە هەزار دیناری لە گیرفانی دەهێنا. بەدرباسم کە زێڕەکانی دیت گوتی: «دایە من گەمەم لەگەڵ کردی، دەنا ناتوانم بیفرۆشم.» سۆفییەکە چاوێکی لە بەدرباسم کرد و گوتی: «لەو شارەدا کەس ناتوانێ درۆ لەگەڵ کەس بکا. لەو شارە هەرکەس درۆ بکا دەیکووژن. بەدرباسمشا کە ئەوەی بیست لە ئێسترەکەی هاتە خوارێ.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و پەنجا و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک بەدرباسم لە ئێسترەکەی هاتە خوارێ و لغاوەکەی دا دەست پیرێژنە. لغاوەکەی لە سەری داماڵی و کەمێکی ئاو بە سەردا هەڵپرژاند و پێی گوت: «کچێ لەو بیچمە وەرە دەرێ و بچۆوە سەر بیچمی پێشووت. لەڕێوە شاژن هاتەوە سەر بیچمی خۆی و پیرێژنەی لە ئامێز گرت. بەدرباسم زانی کە پیرێژنە دایکی ئەوە، ویستی ڕا بکا. پیرێژنە هاواری کرد. دێوێکی بە قەد کێوێک زەلام هات. بەدرباسم زۆری لێ ترسا. پیرێژنە کچەکەی لە پشتەوەی خۆی سوار کرد و بەدرباسمیشی لە پێش خۆی دانا. دێوە تیژ دەرپەڕی. ئەوەندەی نەخایاند گەیشتنەوە کۆشکەکەی شاژن لاب. کاتێک شاژن لاب چووەوە سەر تەختەکەی ڕووی لە بەدرباسم کرد و گوتی: «زۆڵی سەگ ئەوە ئەتۆ وات لێ هات ئاوا لەگەڵ من بجووڵێیەوە؟ بزانە چیت بە سەر دێنم و چ پەندێکیش بە سەر ئەو کابرا دووکاندارە دێنم وا هەر ئەمن چاکەی لەگەڵ دەکەم و ئەویش خراپەم لەگەڵ دەکا. ئەو کارانە کاری تۆ نین و هەمووی لە بن سەر ئەودان.» دوای ئەوە ئاوێکی بە سەر بەدرباسم پرژاند و گوتی: «بیچم و قەوارە بگۆڕدرێ بۆ باڵندەیەکی دزێوی ناحەز.» شاژن ئەوی لە قەفەسێک کرد و دان و ئاویشی بۆ دانەنا. کەنیزێک زگی پێی سووتا و بە دزی شاژنەوە دان و ئاوی دەدایە. هەتا وا بوو ڕۆژێک لە ڕۆژان کەنیزەکە دەرفەتی هێنا و خۆی گەیاندە کابرای دووکاندار و ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە و گوتی: شێخ عەبدوڵڵا شاژن لاب بە تەمایە برازاکەت لە ناو بەرێ. شێخ عەبدوڵڵاش بە کەنیزەکەی گوت: «دەبێ شارەی لە شاژن بستێنم و تۆ بکەمە شاژنی ئەو شارە.» ئینجا شێخ عەبدوڵڵا لە بنی جامێکی دا. لەڕێوە دێوێکی چوارباڵ هاتە دەرێ. شێخ عەبدوڵڵا پێی گوت: «ئەو کەنیزە هەڵگرە و بیبە بۆ شاری جولاناری[1] بەحرییە و دایکی. ئەوان لە تەواوی سیحر و جادوو بازەکانی دونیا سیحربازتر و جادووبازترن. بە کەنیزە کەی گوت: «کە گەیشتییە ئەو شارە و لای ئەوان بەسەرهاتی بەدرباسمیان بۆ بگێڕەوە. دێوە لەڕێوە کەنیزەکە هەڵگرت و وە حەوا کەوت. چی وای پێ نەچوو لە سەربانی کۆشکی شاژن جولانار بەحرییە نیشتنەوە. کەنیزەکەی لە سەربانی دانا. کەنیزە چووە لای شاژن جولانار و کڕنۆشی و برد. بابەتەکەی بۆ گێڕاوە. جولانار سپاسی کرد و لە شاردا تەپڵی شادمانی لێ درا و گەورەگەورەکانی شار ئاگادار کرانەوە کە بەدرباسمشا وە دیار کەوتووەتەوە. دوای ئەوە جولانار بەحرییە و دایکی واتە فەراشە و براکەی ساڵە و تەواوی هۆزی جان و لەشکری دەریای کۆ کردەوە و هەڵفڕین و چوون بە سەر شاری شاژن لابیان دادا و کافرەکانیان کوشت. پاشان شاژن بە

---

[1]. جولانار = گولا نار واتە گوڵی هەنار. ئەو وشەیە وەک کوردی دەچێ، عەرەبی کە پیتی ـ گ ـ ی نییە لە جیاتیان ج دەکار دەکەن.(وەرگێر).

کەنیزەکەی گوت: «کوڕەکەی من لە کوێیە؟» کەنیزە قەفەسێکی هەڵگرت و هێنایە بەردەمی پێی و گوت: «ئەو باڵندەیە کوڕی تۆیە.»

شـــاژن جولانار ئەوی لە قەفەســـەکە هێنا دەرێ و ئاوێکی بەســـەر هەڵپرژاند. شـــاژن بەدرباســـم هاتەوە ســـەر شـێوە و بیچمی خۆی. دایکی لە ئامێزی گرت و دەســـتی کرد بە گریان.

دوای ئەوە جولاناری بەحرییە شـــێخ عەبدوڵڵای دووکانداری بانگ کرد و ســـپاســـی چاکەکانی کرد. ئەو کەنیزەی کە هەواڵی بەدرباسمی هێنا بوو، لە شێخ عەبڵای مارە کرد و ئەوی کرد بە شاژنی ئەوە شارە. موسوڵمانەکانی شاری کۆ کردەوە و فەرمانی پێ کردن کە لە ژێر ئەمری شـێخ عەبدوڵلا نەچنە دەرێ و بەڵێنی لێ ئەســـتاندن. دوای ئەوە شـــاژن لەگەڵ دایکی و براکەی ماڵاوایيان لە شـێخ عەبدوڵلا کرد و گەڕانەوە بۆ شـارەکەی خۆیان. خەڵکی شـار لە خۆشـی گەڕانەوەی ئەوان دەسـتیان کرد بە شـادی و خۆشـی و هەتا سـێ ڕۆژان شـار لەو حاڵ و هەوایەدا بوو. دوای ئەوە شـاژن بەدرباسـم بە دایکی گوت: «دایە، ئەوجار نۆرەی ژن هێنانمە.» دایکی گوتی: «قسـەیەکی جوانە بەڵام کوڕی من ڕاسـتە با لە نێو کچە پاشـــاکاندا کچێکی وات بۆ ببینمەوە کە شـــیاوی تۆ بێ. ئینجا باپیری و کچەکانی پوورە جولانار و خاڵە ســـاڵەی هەر یەکی بە دەریایەکدا ڕۆیشـــتن تا کەنیشـــکێکی باش و شـــیاوی بۆ وەدۆزن. جولانار بەحرییەش چەند کەنیزێکی بە کوڵی دێواندا نارد بۆ ئەملا و ئەولا ڕایسپاردن کە دیو بە دیوی کۆشکی پادشاکان بگەڕێن و تەواوی کیژەکانیان ببینن.

کاتێک بەدرباسم زانی ئەوان بە ڕاشکاوی بۆی لە حەول دان، گوتی: «دایە، دەست لەو کارانە هەڵگرن. چونکە من جلگە لە گەوهەری کچی پاشـا سـەمەندەل کەسـی دیکەم ناوێ. دایکی بەدرباسم وەڵامی داوە: «زۆر باشە، ئەو جار دەزانم چ بکەم.» بە لەز کەسێکی نارد سەمەندەل شا بێنن. سەمەندەل شایان هێنا و بانگی بەدرباسم شایشیان کرد. بەدرباسم شا هات بۆ لای سەمەندەل شا. سەمەندەل شا لەبەری هەستا و سڵاوی کرد. ئینجا دانیشتن و پاش قســـەوباس بەدرباســـمشـــا خوازبێنی کچەکەی لە ســـەمەندەلشـــا کرد. ســـەمەندەلشـــا وەڵامی داوە کە: «کەنیزی خۆتە ناردی بە دوای گەوهەردا. گوتی: «بچن پێی بڵێن ئەوە سـەمەندەلشـای باوکت لە لای بەدرباسـمشـای کوڕی جولاناری بەحرییە و دەڵێ زوو بێتە ئێرە.» ڕاســـپێرداروەکان لە چاولێکدانێکدا دەرفڕین و ئەوەندەیان پێ نەچوو، شـــاژن گەوهەریان هێنا.

شـــاژن جەوهەر کە چاوی بە باوکی کەوت لە ئامێزی گرت. باوکی گوتی: «کچەکەم، ئەوە ئەتۆم لەو پاشا بەڕێزە مارە کردووە کوڕێکی خوێنشیرین و ڕەوشت پاک و مەزنە و نموونەی لە دونیادا کەمە. ئێوە تای یەکن و هەر ئێوە شیاوی یەکن.

شـــاژن گەوهەر گوتی: «بابە من کەنیزی ئەوم تۆ چۆن بڵێی ملکەچی فەرمانتم.» هەر لەوێ قازی و شـــایەدیان بانگ کرد و بەدرباســـمشـــا و شـــاژن گەوهەریان لێک مارە کرد. خەڵک شـــاریان ڕازاندەوە و دەســـتیان کرد بە شـــادی و شـــایی. پاشـــا زیندانییەکانی بەر دا. فەقیر و هەژارانی تێر و کۆک و پۆشـــتە کرد. گەورەگەورەکانی دەوڵەتی خەڵات کرد. لە هەموو لایەک شایی و خۆشی بوو سفرە ڕاخرابوو. هەتا دە ڕۆژان بەو شێوەیە بوو. دوای ئەو دە ڕۆژە بەدرباسمشا دیاری و خەڵاتێکی زۆری دا بە سەمەندەلشا و بەڕێی کردەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی. بۆخۆشیان تا کۆتایی ژیانیان لە عەیش و نۆش و خۆشیدا بوون.

## چیرۆکی محەممەدی کوڕی مەبارەک

خاوەنشـــکۆ، دەگێڕنەوە زەمانی زوو پاشـــایەک هەبوو لە وڵاتی عەجەمان کە محەممەد کوڕی مەبارەکیان پێ دەگوت و لە وڵاتەکەی خۆیدا پاشـــایەتی دەکرد. هەموو ســـاڵێکیش لەگەڵ کافرەکانی هیند و ســـیند و وڵاتانی ئەوپەڕی چۆمی جیحوون شـــەڕی دەکرد. ئەو پاشـــایەکی عادڵ و ئازا و بە زیپک و زاکوون بوو. حەزی لە کۆڕی شـــیعر و چیرۆک و حکایات بوو. هەر کەســـی دیتبا کە چیرۆک و بەســـەرهاتی خۆشـــی قەدیمی زانیبا پێی دەگێڕاوە.

جا دەگێڕنەوە کە هەرکەسێکی غەریبەش شتێکی خۆشی گێڕاباوە ئەوە خەڵاتی دەکرد و هەزار دیناری زێڕ و ئەســـپێکی بە زین و لغاوەوە دەدایە و ســـەرتاپا دەســـتێک جلی تەواوی لە ســـەرتاخوار دەدایە. بە ڕێکەوت وا بوو ڕۆژێک، کابرایەکی مەند و ماقووڵ هاتە لای و چیرۆکێکی ســـەیری بۆ گێڕاوە. پاشـــا چیرۆکەکەی پێ خۆش بوو. خەڵاتێکی زۆر زۆری دایە، یەک لەوان هەزار تمەنی بە برەوی خوراســـان و ئەســـپێک. دوای ئەوە ئەو هەواڵە لە ناوچەکەدا بڵاو بووەوە. کابرایەکی بازرگان بە نێوی حەســـەن ئەو هەواڵەی بیستەوە. لە وڵاتێکی دوورەوە هات بۆ لای پاشا. ئەو کابرایە شاعیر و نووسەر و قسەزان بوو. ئەو پاشـــایەش وەزیرێکی هەبوو ناحەز و دزێو و بەدگووز کە لە دەوڵەمەند و هەژار کەسی خۆش نەدەویست. هەرکەس دەهاتە لای پاشا و پاشا شتێکی دەدایە، ئەو ئێرەیی پێ برد و پێی ناخۆش بوو. بە پاشـــای دەگوت ئەو کارەی تۆ دەبێتە هۆی بە فیرۆچوونی ماڵ و سامانی وڵات و وڵات بەرەو مەترسی دەبا.

لە کورتی بیبڕینەوە، پاشا هەواڵی حەســـەنی زانی و فەرمانی دا بانگی بکەن. کە بانگیان کرد پێی گوت: «ئەو وەزیرە لەبەر ئەوەی من خەڵات و دیاری دەبەخشـــمە شـــاعیران و قســـەزانان و نیزیکانم لەگەڵم بەشـــەڕە. ئێســـتا ئەگەر تۆ چیرۆکێکی ســـەیر و ســـەمەرە و خۆشـــم بۆ بگێڕییەوە وا قەت شـــتی ئاوا خۆشـــم نەبیســـتبێ ئەوە چەندین شـــار و قەڵای

جۆراوجۆرت دەدەمێ و لە خۆمت نیزیک دەکەمەوە. دەتکەم بە سەرۆکی وەزیرەکانم. ئەگەریش چیرۆکێکی وام بۆ نەڵێی ئەوە تەواوی سامانەکەت لێ دەستێنم و لە وڵات دەرت دەکەم.» حەسەنی بازرگان وەڵامی داوە: «پاشام ساڵێکم دەرفەت دەوێ تا چیرۆکێکی وات بۆ بڵێم بە تەمەنت نەتبیستبێ.» پاشا وڵامی داوە: «ئەوە ساڵێکم دەرفەت دایەی.» پاشا ماڵێکی دایە و پێی گوت بڕۆوە لە ماڵێ دانیشتە و ئەو چیرۆکەی من دەمهەوێ بۆم ساز کە.» ئەگەر ئەوەی من دەڵێم بۆت جێبەجێ بوو، ئەوە گفت و بەڵێنەکەم دەبەمە سەرێ و پێشییەوە زیاد دەکەم. ئەگەریش بۆت جێبەجێ نەبوو ئەوە هیچمان لە هیچ نە من تۆ دەناسم و نە تۆ من.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و پەنجا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک حەسەنی بازرگان قسەکانی پاشای بیست، کڕنۆشی برد و ڕوخسەتی ڕۆیشتنی خواست و وە دەر کەوت. پێنج کەسی لە دەسپەروەدەکانی خۆی کە هەریەکی لە بوارێکی جیاوازدا وەک شێعر و قسەزانی و چیرۆکوێژی و شتدا شارەزاییان هەبوو بانگ کرد و یەکی پێنج هەزار دیناری زێڕی دانێ و پێی گوتن: «ئەمن ئێوەم بۆ ڕۆژێکی ئاوا پەروەردە کردووە. دەبێ یارمەتیم بدەن داواکەی پاشا بەجێ بێنم.» ئەوانیش تێکڕا گوتیان: «گیانی ئێمەش فیدای تۆ بێ هەرچی بڵێی بە سەر چاو.» حەسەنی بازرگان گوتی: «لە ئێوەم دەوێ هەر یەکی ڕوو لە شار و وڵاتێک بکەن و لەگەڵ چیرۆکوێژان و زانایان و دونیا دیتوان دانیشتن و لە بارەی چیرۆکی سەیفولملووک پرسیار بکەن و زانیاری کۆکەنەوە ئەگەر کەسێکیشتان دۆزییەوە کە بە تەواوی لە بارەیەوە شارەزایی هەبوو، ئەوە بە زێڕ و زیو و ماڵی دونیا خەنی بکەن. ئەگەر ئەوەی پێتانە بەشی نەکرد بی هێننەوە ئەمن خەنی دەکەم. جا هەر کام لە ئێوە ئەو کارەی لە دەست بێ، ئەوە لێی ڕوون بێ کە من خەڵاتێکی گەورە و گران و چاوەڕواننەکراوی دەدەمێ. ئێوە هەستن بڕۆن.

بەو جۆرە یەکیانی نارد بۆ هێند و سێند و یەکی ناردە وڵاتی چین و عەجەمان یەکی دیکەی نارد بۆ دەڤەری خوراسان و چوارەمینی نارد بەرە و ڕۆژئاوا و پێنجەمی بەرە و شام و میسر. هەر یەکی کاتێکی بۆ دیاری کردن و پێشی گوتن: «دەبێ هەوڵی خۆیان بدەن و کەمترخەمی و خاوەخاو نەکەن. ئەگەر گیانیشیان بکەوێتە مەترسییەوە دریخ نەکەن.» ئیتر ئەوان ماڵاواییان لە بازرگان کرد و هەر یەکی بەرە شوێنی دیاریکراوی خۆی کەوتە ڕێ. دوای چوار مانگان چوار کەس لەوان دەست لە گونان درێژتر گەڕانەوە و هیچ دەسکەوتێکیان نەبوو. بە هاتنەوەی بێ دەستکەوتی ئەو چوارە بازرگان زۆر هیوابڕاو و مات و مەلوول بوو.

بەڵام پێنجەمی کە ناوی ئەبولفەزل بوو، بەرەو شام ڕۆیشت و گەیشتە دیمشق. سەیری کرد دیمشق شارێکی خۆش و سەرسەوز و ئاوەدانە. ماوەیەکی زۆر لەوێ ماوە و بە پێوشوێنی ئەو چیرۆکەوە بوو. بەڵام هیچی وەگیر نەکەوت. لە ماڵ هاتە دەرێ ویستی لە دیمشق بڕوا و بچێتە شارێکی دیکە. لە پڕ لاوێک تیژ بەوێدا ڕابرد. ئەبولفەزل بانگی کرد و لێی پرسی: «کوڕی چاک ئەوە ئاوا بە پەلە بۆ کوێ دەچی؟» کوڕە وڵامی داوە ئەوە کابرایەکە چیرۆکی سەیر سەیر دەگێڕێتەوە، ئەگەر زوو خۆم نەگەیەنمێ لە نیزیکییەوە جگا نامێنێ دانیشم، ئەوەندەی خەڵک لێیە. لە دووریشەوە دەترسم باش حاڵی نەبم. ئەبولفەزل گوتی: «منیش لەگەڵ خۆت بەرە.» کوڕە گوتی ڕاکە با بڕۆین.»

لەرێوە ئەبولفەزل دەرگای ماڵیی گاڵە دا لەگەڵ لاوەکە کەوتنە وێرغە. هەر بە غار ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە ئەو شوێنەی کابرا لەوێ چیرۆکی دەگوت. ئەبولفەزل سەیری کرد، کابرایەکی ڕوو پاک و گەش لەوێ دانیشتووە و چیرۆکی پێشینیان دەگێڕێتەوە. چوو لە نیزەک ئەو دانیشت و جوان گوێی دایە تا هەمووی فێر بێ. کاتێک ڕۆژئاوا بوو، کابرا چیرۆکەکەی تەواو کرد. خەڵکەکە بڵاوەیان کرد. ئەبولفەزل چووە پێشێ و سڵاوی لێ کرد. کابرا بە ڕوویەکی خۆشەوە وەڵامی سڵاوەکەی داوە. ئەبولفەزل پێی گوت: «گەورەم ئەتۆ پیاوێکی سەروڕوو خۆش و پاکی و قسە و چیرۆکی خۆش دەزانی بە تەمام پرسیارێکت لێ بکەم.» کابرا گوتی: «چیت دەوێ لێم پرسە» ئەبولفەزل گوتی: «گەلۆ تۆ چیرۆکی سەیفولملووک و بەدیعولجەمال دەزانی یان نا؟» کابرا گوتی: «ئەتۆ ئەو قسەیەت لە کێ بیستووە و کێ باسی ئەو چیرۆکەی بۆ کردووی؟» گوتی: «ئەمن ئەو چیرۆکەم نە بیستووە بەڵام لە دوور ولاتەوە هاتووم و وە دوای ئەو چیرۆکە کەوتووم. ئەگەر تۆ ئەو چیرۆکە بزانی و بە ویژدانەوە فێری منی کەی و بۆم بگێڕییەوە ئەوەندەی بتهەوێ دەتدەمێ. بەڵام تکایە بێ کەموکووڕی بۆم بگێڕەوە. کابرا گوتی: «خەمت نەبێ، بۆت دەگێڕمەوە بەڵام لە بیرت نەچێ ئەو چیرۆکە بۆ ئەوە نابێ لە هەموو جێگایەک بی گێڕییەوە.» ئەبولفەزل گوتی: «گەورەم، بیکە بۆ خاتری خودا بۆم بگێڕەوە و دڵم مەشکێنە. هەرچی دەڵێی دەتدەمێ.» کابرا گوتی: «ئەگەر پێت خۆشە بۆت بگێڕمەوە و ئەو چیرۆکەت فێر کەم، دەبێ سەد دیناری زێڕم بدەیەی. جا بە پێنج مەرج فێرت دەکەم.

کاتێک ئەبولفەزل زانی کە چیرۆکەکە دەزانێ و بۆشی دەگێڕێتەوە زۆر زۆر خۆشحاڵ بوو. گوتی: «سەد دیناری چیرۆکەکە و دە دیناری زیادیشت دەدەمێ و پێنج مەرجەکەش لە سەر چاوم دادەنێم. کابرا گوتی: «زێڕەکان بێنە، چیرۆکەکەت بۆ دەگێڕمەوە.» ئەبولفەزل دەسبەجێ هەستا و دەستی کابرای ماچ کرد و بە دڵێکی خۆشەوە گەڕاوە ماڵەکەی و سەد دینارەکەی لە توورەکەیەک خست. بەیانی کە ڕۆژ بووەوە، زێڕەکانی هەڵگرت و چوو بۆ لای کابرا. کە چوو کابرا لەبەر دەرگا دانیشتبوو. زێڕەکانی دایە. ئێنجا پێکەوە چوونە ژوورێ. پێنووس و لێ نووسی بۆ هێنا لە پێشی دانا و گوتی: «ئەو چیرۆکەی کە تۆ دەتهەوێ با لە بیرت نەچێتەوە لێرەدا بینووسە.» کە چیرۆکەکە تەواو بوو، ئەبولفەزل دانیشت و تەواوی بۆ کابرا خوێندەوە، کابرا واژۆی لە سەر کرد. دوای ئەوە کابرا گوتی: «کوڕم، مەرجی یەکەم ئەوەیە کە گەیشتییە هەر جێیەک ئەو چیرۆک نەگێڕییەوە. لە لای ژنان و کەنیزان و کۆیلە و کەم ئاوەزان و منداڵان نەیگێڕییەوە. بەڵکوو دەبێ ئەو چیرۆکە لە لای پاشا و ئەمیران و وەزیران و پیاوماقووڵان بگێڕییەوە.» ئەبولفەزل مەرجەکانی قەبووڵ کرد و دەستی کابرای ماچ کرد و ماڵاوایی لێ کرد و ڕۆیشت.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: خاوەنشـــكۆ! ئەبولفەزڵ ماڵاوایی لە كابرا كرد و بە دڵێكی خۆشـــەوە گەڕاوە. ڕۆیشـت، هەتا گەیشـتەوە شـارەكەی خۆیان. خزمەتكارەكەی نارد بۆ لای بازرگانەكە هەتا ئەو هەواڵە خۆشـــەی پێ ڕاگەیەنێ و پێی بڵێ كە ئاواتەكەی تۆی وەدی هێناوە. جا ســەیر لەوەدا بوو هەر دە ڕۆژیش لەو دەرفەتە مابوو كە پاشـــا بۆ بازرگانی دانابوو. دوایە كە ئەبولفەزل چوو بۆ لای بازرگان ســەیری كرد بەو هەواڵە لە ڕادە بە دەر خۆشــحاڵ بووە. ئەبولفەزل ئەو پەڕاوەی كە چیرۆكەكەی تێدا نووســـرابوو دای بە بازرگان. بازرگانەكە پەڕاوەكەی لێ وەرگرت و جلەكانی خۆی لە سەر تا خوار لەگەڵ دە سەر ئەسپ و دە سەر وشـتر و دە ئێسـتر و سێ كەس لە كۆیلەكانی دایە. دوای ئەوە بازرگانەكە چیرۆكەكەی بە دەست و خەتی خۆی نووسـی بردی بۆ پاشـا و گوتی: «پاشـا چیرۆكێكی خۆشـی وام بۆ هێناوی كە قەتت نەبیســـتبێ. كاتێك پاشـا ئەوە قســەیەی لە بازرگان بیســـت. هەر لەوێ فەرمانی دا هەموو میران و زانایانی كۆ كردەوە لای خۆی و بە بازرگانی گوت: «لە ســەر كورسـی دانیشـە و چیرۆكەكەمان بۆ بخوێنەوە.» كاتێك پاشـا و هەنتەشـیان چیرۆكەكەیان بیسـت، واقیان وڕ ما و زێڕ و زێو و گەوهەریان كردە خەڵاتی. دوای ئەوە پاشـا باشـترین كەوای خۆی، لەگەڵ شـارێك لە شـارە گەورەكانی دا بە بازرگان و ئەوی كردە سـەرۆكی وەزیرەكانی خۆی. پاشـان فەرمانی دا ئەو چیرۆكە بە ئاوی زێڕ بنووسنەوە و لە خەزێنەدا بیپارێزن. هەر كاتێك پاشـــا وەڕەز دەبوو بانگی حەســـەنی بازرگانی دەكرد و بازرگان چیرۆكەكەی بۆ دەگێڕاوە. ئەو چیرۆكەش ئاوا بوو:

### چیرۆكی سەیفولملووك و بەدیعولجەمال

زەمانی زوو پادشـــایەك بوو بە ناوی عاســـم كوڕی ســـەفوان، دەســـت و دڵ بازی و دەهەندە و دلۆڤانییەكەی لە دونیادا دەنگی دابووەوە. شـارگەلێكی زۆری لە ژێر دەسـەڵاتیدا بوو. لەشـــكرێكی لە ئەژمار بەدەریشـــی بوو. وەزیرێكی بوو بە ناوی فارس كوڕی ســـاڵح. پادشـــا و وەزیرەكەی لەگەڵ هەموو خەڵكی وڵاتەكەیان خۆر و ئاوریان دەپەرسـت. پاشـــا زۆر بە تەمەن بوو تەواو بڕستی لێ بڕابوو. سەد و هەشتا ساڵ تەمنی بوو كەچی هێشتا كوڕێك یا كچێكی نەبوو. هەر بۆیە شـــەو و ڕۆژ مات و خەمبار بوو. ڕێكەوت وا بوو ڕۆژێكی وەك ڕۆژانی دیكە لە سەر تەختی دەسەڵات دانیشتبوو، میر و وەزیر و گەورەكانی شار هەركەسەی لە شوێنی دیاریكراوی خۆیان ڕاوەستابوون. هەركەسەی كوڕێك یا دوو كوڕیان لە بارەگادا هەبوو. پادشا ئێرەی پێ دەبردن و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «هەركەسەی

دڵی بە منداڵێک خۆشــە و جگە لە منی وەچاخ کوێر. هەر بینا ســبەینێ مردم و ئەو تاج و تەخت و وڵاتەم بۆ بێگانە بەجێ هێشت و ناوم بۆ هەمیشە پاک بووەوە. وەک ئەوەی هەر قەت قەت نەبووبم. دوای ئەوە پاشــا دەســتی کرد بە گریان و لە تەختەکەی هاتە خوارێ. کاتێک وەزیر پادشـــای ئاوا دیت بە ڕێپێدراوەکانی گوت بڕۆنەوە. جگە لە وەزیر کەس لە لای پادشــا نەماوە. ئینجا کوڕنۆشــی برد و پرســی: «پاشــای زەمان بۆ دەگری؟» پادشــا بەرسڤی نەداوە و سەری بەرز نەکردەوە. وەزیر دیسان کوڕنۆشی برد و گوتی: «پادشای زەمان من لە جێی کوڕ و کۆیلەی تۆم. پێم بڵێ بۆ دەگری. پادشا سەری هەڵنەهێنا و متەقی لێ نەهات و هەر گریا. وەزیر گوتی: «پادشـــا ئەگەر پێم نەڵێی لە بەر چاوی تۆ خۆم دەکووژم با ئەو ناڕەحەتییەی تۆ نەبینم.» عاسمشا سەری هەڵێنا و ئەسرینی چاوی سترِی و گوتی: «وەزیر لێم گەڕێ با لەگەڵ خەمی خۆم دەســـتەملان بم.» وەزیر گوتی: «ئەتۆ هۆکاری ئەو خەم و پەژارەیەتم پێ بڵێ دەشــقم ڕێگای چارەســەری ئەو خەمەتم پێ شــک بێ.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: خاوەنشـــکۆ! پاشـــا گوتی: وەزیر، خەمی من بۆ ماڵی دونیا نییە. خەمی ئەوەمە، تەمەنم گەیشتە سەد و هەشتا ساڵ و هێشتا منداڵێکم نییە. ئەگەر مردم، بە گڵم دەسپێرن و ناو و شوێنەوارم لە سەر زەوی دەسرپێتەوە. خەڵکی دیکە لە جێگای من لە سەر تەختەکەم دادەنیشـــێ و تازە کەس ناوم ناهێنێ. وەزیر گوتی: «پاشـــای زەمان تەمەنی منیش ئەوە لە سەد سـاڵی تێ پەڕاندووە و منداڵێکیشـم نییە و پێشـم ناخۆشـە. نازانم دەبێ چ بکەم؟ بەڵام بیستوومە دەڵێن سولەیمان کوڕی داوود خودایەکی هەیە بە توانا و دلۆڤانە. وا باشە پەنای بۆ بەرم و پێی بڵێم بەشـکم داوای لێ بکا یەکی منداڵێکمان داتێ. پاشـا فکرەکەی وەزیر پێ بـاش بوو. دیـارییەکی زۆری بۆ ســـولەیمـان پێچـاوە و دای بە وزیر و نـاردی بۆ لای سولەیمانی کوڕی داوود.

لەو لاوە خودای تەعالا وەحی بۆ سـولەیمانی کوڕی داوود نارد کە ئەوە پاشـای میسـر وەزیرەکەی خۆی بە دیارییەکی زۆرەوە دەنێرێ بۆ لای تۆ، جا کە هات داوایەکی ئاوا و ئاوات لێ دەکا. ئێسـتا تۆ وەزیرەکەی خۆت واتە ئاسـفی کوڕی بەرخیا بنێرە بۆ پێشـوازی. کە هات بۆ لات ئەتۆ پێی بڵێ: پاشـــا ئەتۆی بۆ شـــتێکی ئاوا ناردووە. ئەوجار ئەتۆ بێنە باوەڕی خۆتی بۆ ڕوونە کەوە.

لەڕێوە سولەیمان (س ـ خ) وەزیرەکەی خۆی ئاسفی لەگەڵ تاقمێک لە گەورەگەورەکان نارد بۆ پێشـــوازی فارس، وەزیری پاشـــای میســـر. ئاسـف وەڕێ کەوت و ڕۆیشـت هەتا گەیشـــتە لای فارســـی وەزیر. ســـڵاوی لێ کرد و ڕێزی پێویســـتی لێ گرت. لە مۆڵگەکانی ڕێگادا خواردن و گیای بۆ دابین دەکردن و دڵخۆشـــی دەداوە کە ســـولەیمان ئاواتەکەیان وەدی دێنێ. وزیر لە دڵە خۆیدا دەیگوت: «ئەوە کێ بە ســـولەیمانی گوتووە ئەوانە دێن؟!» دوای ئەوە لە ئاسـفی کوڕی بەرخیای پرسـی: «ئێوە چۆنتان زانی ئێمە دێین و کێ باسـی ئەو سەفەرەی ئێمەی بۆ کردوون؟» ئاسف وڵامی داوە: «حەزرەتی سولەیمان ئێمەی لەو ڕووداوە ئاگادار کردەوە.» وەزیر پرسـی: «ئەی کێ ئەوی ئاگادار کردووەتەوە؟» ئاسـف وڵامی داوە: «ئافرێنەری ئاســـمان و زەوی ئاگاداری کردووەتەوە.» فارس وەڵامی داوە ئەوە دەبێ ئافرێنەرێکی مەزن بێ! ئاسف کوڕی بەرخیا گوتی: «بۆ ئێوە مەگەر ئەو خودایە ناناسـن؟» ئەویش وەڵامی داوە و گوتی: «ئێمە خۆر و ئاگر دەپەرسـتین.» ئاسـف گوتی: «وەزیر خۆر خۆی ئەســـتێرەیەکە لەو ئەســـتێرانەی کە ئافرێنەر واتە خودا ئافراندوویەتی ئەوە نییە جارێک دیارە و هەیە و جارێک ونە. پێویســـتە خودا دایمە هەبێ و چاوەدێر بێ. شتی وا چۆن دەبێ ئەو خودا بێ؟!»

هەر ئاوا بە قسەکردن و وتوویژ ڕۆیشتن تا گەیشتنە لای تەختی حەزرەتی سولەیمان سڵاوی لێ بێ. حەزرەتی سولەیمان فەرمانی بە لەشکرەکەی دا کە هەر لە جن و ئینس و باڵندە و پەلەوەران لە سەر ڕێگاکەیان ڕیز بن. ئەوان لە دوو ڕیزدا لەمبەرەوبەری ڕێگەکە ڕاوەستان مەل و باڵندەکان بە باڵەکانیان سێبەریان لێ کردن. ئەو هەموو شکۆ و دەسەڵاتە ترسی خستە دڵی میسرییەکانەوە. هێزی ڕۆیشتنیان نەما. ئاسف گوتی: «مەترسن ئەوە لەشکری حەزرەتی سولەیمانە و هیچ مەترسییەکیان بۆ سەر ئێوە نییە. ئەوجار ئاسف کوڕی بەرخیا بۆخۆی بە نێو ڕیزەکەدا ڕۆیشت. فارسی وزیریش سامی شکا و بە دوای ئاسفی وەزیری سولەیماندا بە نێو ڕێزەکەدا ڕۆیشت. بەو جۆرە ڕۆیشتن تا گەیشتنە نێو شار. وەزیر ئەوانی بردە میوانخانەکەیان و هەتا سێ ڕۆژان پێیان ڕاگەیشتن و باشترین خواردنی شایانەیان دانێ و میوانداریان لێ کردن. ئینجا لە دەرفەتێکدا هەلی دیداریان لەگەڵ حەزرەتی سولەیمان بۆ ڕەخساندن و چوونە هەنتەشی. ویستیان کڕنۆش بەرن، کە حەزرەتی سولەیمان دەنگی دان و نەیهێشت و فەرمووی کاری وا بکەن. جگە لە خودا کەس شیاوی ئەوە نییە کە کڕنۆشی بۆ بەری. هەرکەس پێی خۆشە دانیشێ و هەرکەس پێ خۆشە ڕاوەستێ. وەزیر لەگەڵ هێندێک لە هاوڕێکانی دانیشتن. ئینجا سفرە ڕاخرا و خواردنیان خوارد.

دوای ئەوە حەزرەتی سولەیمان بە وەزیری میسر فەرموو: «ئەتۆ لەبەر ئەو کارە هاتووی و کێشە ئاوا و ئاوا بوو.» ئیدی حەزرەتی سولەیمان باسی پاشای میسر و ڕووداوی گریان و ناڕەحەت بوونی بۆ منداڵ و تەواوی ئەو شتانەی کرد کە لەوێ ڕووی دابوو. لە کۆتاییدا گوتی، ناوی پادشاکەش عاسمشاه.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و شەستەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! سولەیمان تەواوی ڕووداوەکەی کۆشکی پاشای میسری بۆ وەزیر گێڕاوە و گوتی: «وەزیر، شتەکە ئاوا بوو کە گێڕامەوە یان نا؟» وەزیر گوتی: «پێغەمبەری خودا، ئەوەی فەرمووت هەمووی ڕاســـت بوو. بەڵام ئەی پێغەمبەری خودا کاتێک ئەو ڕووداوە ڕووی دا خۆ کەس لە کۆشــکدا نەبوو تا ئاگای لەو شــتانە بێ. ئەتۆ چۆناوچۆن بەو وردەکـاریـانەت زانیوە و کێ پێی گوتووی؟» حەزرەتی ســـولەیمـان فەرمووی: «ئافرێنەری من کە ئاگای لە هەموو ڕاز و نهێنییەک هەیە پێی ڕاگەیاندم. لەڕێوە وەزیر و هاوڕێکانی بوون بە موســـوڵمان و ئیمانیان هێنا. ئەوجار حەزرەتی ســـولەیمان گوتی: «وەزیر دیارییەکی زۆرت لە لایەن پادشـاکەتەوە بۆ من هێناوە» وەزیر گوتی: «بەڵێ وایە پێغەمبەر خودا.» حەزرەتی سولەیمان گوتی: «ئەمن ئەوە هەموو دیارییەکەتم قەبووڵ کرد و پێشـەکەش بە تۆم کردەوە. ئێستا تۆ وابزانە لە ماڵی خۆتی و ئاسـوودە بە. ئەگەر خودا بیهەوێ ئاواتتان دێتە دی.

وەزیر چووە مزڵەکەی خۆی. ڕۆژی دوایی چووەوە بـارەگـا. حەزرەتی ســـولەیمـان فەرمووی: «وەزیر، کە چوویەوە بۆ لای عاسـمشـای کوڕی سـەفوان، هەردووکتان بچنە ســـەر فڵانە درەخت و لەوێ بێ دەنگ دانیشـــن. کە کاتی نوێژ هات و هەوا فێنکتر بوو، لە سەر دارەکە وەرنە خوارێ و چاو بگێڕن. دوو ئەژدیها دەبینن کە سەری یەکیان مەیموونە و سـەری ئەوی دیکەش وەک دووپشـک وایە. بە تیر ئەو دوو هەژدیهایە بکووژن و لە لای سەریانەوە بستێک بپێون و سەری ببڕن و فڕێی دەن. لە لای کلکیشیانەوە هەر وا. ئەوجار گۆشـتەکەیان سـوور کەنەوە و لەگەڵ خێزانەکانتان بیخۆن. پاشـان هەر ئەو شـەوە لەگەڵ ژنەکانتان نیزیکی بکەن بە هیوای خودا دوو گیان دەبن و منداڵی نێرینەشـیان دەبێ. دوای ئەوە حەزرەتی سـولەیمان ئەنگوسـتیلە و شـیر و بوخچەیەک کە دوو کەوای ڕازاوەی تێدا بوو، هێنـای و گوتی: «وەزیر، کاتێک کوڕەکانتـان گەورە بوون، هەر کوڕەی یەکێک لەو کەوایانەیان لە بەر بکەن. ئێستا هەستن بگەڕێنەوە چونکە پاشا چاوەڕوانی ئێوەیە.

وەزیر لەڕێوە هەسـتا ماڵاوایی لە حەزرەتی سـولەیمان کرد و وەڕێ کەوت. بە کەیفی ســـاز و دڵی خۆشـــەوە ڕۆیشـــت هەتا لە میســـر نیزیک بووەوە. یەک دوو کەس لە خزمەتکارەکانی ناردەوە، هەتا بچن ئەو هەواڵە خۆشـە بە عاسـمشـا بدەن. عاسـمشـا کە بیسـتی وەزیر هاتووەتەوە و ئاواتەکەشیان وەدی هاتووە، خۆشـحاڵ بوو. هەسـتا لە شـار هاتە دەرێ بەرەو پیلی چوو. وەزیر هەرکە چاوی بە پادشا کەوت، دەبەزی و کڕنۆشی بۆ برد و هەواڵەکەی پێ ڕاگەیاند و داوای لێ کرد موسـوڵمان بێ. پادشـا لەڕێوە موسـوڵمان

بوو. بە وەزیر گوت: «هەستە بڕۆوە ماڵەکەی خۆت و ئەوشەو تەواو بحەسێوە. دوایی بچووە بۆ گەرماو و جا وەرە لای من.»

وەزیر کڕنوشی برد و ڕۆیشتەوە ماڵێ، ئەو شەوە تەواو حەساوە و بەیانی چووە گەرماو و پاشان چووە لای پادشا. ئەوەی دیتبووی و ببوو هەمووی بۆ گێڕاوە. ئینجا پادشا و وەزیر دەستیان دا تیروکەوان و چوونە سەر ئەو دارەی کە حەزرەتی سولەیمان بۆی دیاری کردبوون. لەوێ بە بێ دانگی دانیشتن. دوای نوێژی ئێوارە کە هەوا فێنک بوو هاتنە خوارێ. دیتیان دوو ماری گەورە لە بن دارەکەن. یەکی تۆقێکی زێڕینیان لە ملدا بوو. پادشا زۆری پێ جوان بوون. گوتی: «وەزیر ئەوانە زۆر جوانن وەرە با بیانگرین و لە قەفەسیان دەکەین و ڕایان دەگرین جوانن.» وەزیر وەڵامی داوە گوتی: «خودا ئەوانەی بۆ کاری تایبەت خوڵقاندووە ئەتۆ بە تیر لە یەکیان بدە و منیش لە یەکیان. ئیدی یەکی تیرێکیان خستە بەر ماڵی کەوان و هەر کەسەی لە مارێکی دا. لە لای سەریانەوە بستێک و لە لای کلکیشیانەوە یەکی بستێکیان لێ فڕێ دان و ئەوەی دیکەیان دا چێشتلێنەرەکەیان و گوتیان ئەو گۆشتەمان جوان بۆ لێ نێ و ڕێک فلانە وەختە بۆمان بێنە. وە دەرنگی نەخەی ها.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەوسەد و شەست و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! چێشتلێنەرەکە گۆشتەکەی لێ وەرگرتن و بردی لە چێشتخانە جوان لێی نا و لە کاتی دیاریکراودا لە دوو دەفری جیادا بردی لە پێشی دانان. پادشا و وەزیر هەر یەکی دەفرێکیان هەڵگرت و لەگەڵ خێزانیان خواردیان و شەویش لەگەڵیان جووت بوون. لە هێز و دەسەڵاتی خوداوە دووگیان بوون. پاشا هەتا سێ مانگان هەر لە گومان و دڵەڕاوکێدا بوو. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «خۆزگە بمزانیبا ئەو کارە وایە یان نا.» هەتا وا بوو ڕۆژێک لە ڕۆژان منداڵە لە زگی شاژندا جووڵا و جا دڵنیا بوو کە دووگیانە. بە لەز خزمەتکارێکی نارد بۆ لای پادشا و پێی ڕاگەیاند کە ئەرخەیان بێ دووگیانە و منداڵەکە لە زگیدا جووڵاوە. خزمەتکارە تیژ دەرپەڕی و بە خۆشحاڵی و بزەوە چوو بۆ لای پادشا، کەچی تەماشای کرد پادشا مات دانیشتووە و دە گژ بیران ڕاچووە. چووە پێشێ و کڕنۆشی برد هەواڵی دووگیانبوونی شاژنی پێ ڕاگەیاند. پادشا هێندە خۆشحاڵ بوو، تەنانەت هەستا دەست و سەری خزمەتکارەکەی ماچ کرد و خەڵاتێکی زۆری دایە. ئینجا گەورەگەورەکانی دەوڵەتی بانگ کرد و گوتی هەرکەس منی خۆش دەوێ خەڵاتێکی باش بدا بەو خزمەتکارە. میران و گەورەکانی دەوڵەت ماڵ و گەوهەر و ئەسپ و ئێستر و زەوی و زار و باخیان پێشکەشی خزمەتکارەکە کرد. لەو جەنگەیەدا وەزیر هاتە لای پادشا و گوتی: «پادشا، هەر ئێستا لە ماڵێ دانیشتبووم و بیرم لە دووگیانبوونی خێزانم دەکردەوە و دەمگوت: «خۆزگە دەمزانی خێزانم دووگیانە یان نا؟» لە پڕدا خزمەتکارێکم هات و موژدەی دووگیانی خێزانمی دامێ. منیش ئەوەی پێم بوو لەگەڵ هەزار دیناری زێڕ مزگێنی دام بە خزمەتکارەکە و ئەوم کردە بەرپرسی خزمەتکارەکان. عاسمشا گوتی: «وەزیر، خودای تەعالا لە سای فەڕ و بەرەکەتی ئەو دینەوە خێر و ڕەحمەتی خۆی بە سەرماندا باراند و ئێمەی لە تاریکی ڕزگار کرد و بەرەو ڕووناکی بردین. وەزیر هەر ئێستا بڕۆ کۆت و بەند لە بەندییەکان بکەوە و بەریان دە. ئەو ماڵەی میر و پیاوانی دەوڵەت و هەرکەسی دیکەی کە کەوتووەتە لای دەوڵەت هەمووی بە زیادەوە بدەوە. هەتا سێ ساڵان پیتاک لە مسکێنان مەستێنن. لە دەرەوەی شار چێشتخانەیەک دانێن با شەو و ڕۆژ بەردەوام چێشتی ئامادەیان بێ بۆ ئەو کەسانەی لە شارەکانی دیکەوە دێن یان لێرەن و برسی و بێ ئەنوان با بخۆن و بۆ ماڵ و منداڵیشیان بەرنەوە. یەک حەوتوو با شار بڕازێنەوە.

وەزیر لەجێوە هاتە دەرێ و پاشا چۆنی فەرمان دابوو بەو شێوەیە کارەکانی جێبەجێ کرد. ئیدی خەڵک لە عەیش و نۆشدا بوون تا ئەو کاتەی شاژن کات و ساتی خۆی گەیشتێ و کوڕێکی مانگ ئاسای بوو. ناویان نا سەیفولملووک. ژنی وەزیریش کوڕێکی بوو، جوان

وەک ئەستێرە. ناویان نا ساعد ئەو دوو کوڕەیان بە باشترین شێوە پەروەردە کرد و ڕایان هێنان تا تەمەنیان گەیشتە بیستساڵ. ڕۆژێک پاشا وەزیرەکەی واتە فارسی بانگ کردە دیوێک و پێی گوت: «وەزیر، ئەمن دەمەوێ کارێک بکەم و ویستم لەگەڵ تۆدا ڕاوێژ بکەم.» وەزیر گوتی: «کارێکی بەجێیە ئەگەر من شایان بم.» عاسمشا گوتی: «وەزیر، تەمەنم بەرەو کۆتاییە، دەڵێم لە کونجێکدا دانیشم و دەسەڵاتی ولات بدەمە دەست سەیفولملووکی کوڕم کە ئێستا سەرەتای لاوییەتی. وەزیر گوتی: «بیرێکی جوانە، بەڵام ئەگەر تۆ ئاوا بکەی ئەوە منیش ساعدی کوڕم دەکەم بە وەزیری کە کوڕێکی ژیر و تێگەیشتووە. دوای ئەوە عاسمشا بە وەزیری گوت: «نووسراوگەلێک بنووسە و بینێرە بۆ ئەو ناوچە و دەڤەرانەی لە ژێر دەسەڵاتی خۆماندان، بڵێ کە دەبێ خەڵکی ئەو شار و شارەدێیانە تێکڕا لە فلانە مانگدا بێن و لە گۆڕەپانی فیل کۆ بنەوە. وەزیر لەڕێوە نامەگەلێکی نووسی ناردی بۆ هەموو سووچ و کەلێنێکی ولات و فەرمانی دا کە خەڵکی ئەو شار و شارۆچکانە بە ورد و درشتیانەوە لەو گۆڕەپانە ئامادە بن. کە کاتی دیاریکراو نیزیک بووەوە، فەرمان بە خزمەتکارەکان درا هەتا لە نێوەڕاستی گۆڕەپانەکە خێوەت هەڵدەن و گۆڕەپانەکە بە شێوەیەکی شیاو برازێنەوە. تەختە گەورەگەی پادشا کە هەموو ساڵێک لە ڕۆژی جێژندا لە سەری دادەنیشی، بیهێنن دابنێن. کاردارەکان ئەو کارانەی پێیان سپێردرابوو، جوان بەڕێوەیان برد. پەردەدار و میر و گەورەگەورەکان ڕیز بوون. پادشا هاتە دەرێ و بە جاڕچی گوت: جاڕ بدا و بە خەڵک بڵێ بێن لە گۆڕەپانەکە کۆ بنەوە. جاڕچی جاڕی دا و وردودرشتی ئەو شارە و شارەکانی دی لە حزووری پادشا کۆ بوونەوە. هەر کەسەی لە شوێن و پێگەی خۆی ڕاوەستا. پاشا فەرمانی دا سفرە ڕاخرا و خواردنیان هێنا. خەڵکەکە دانیشتن خواردنەکەیان خوارد و دۆعای بەخێریان بۆ پادشا کرد. ئەو جار پادشا بە دەنگێکی بەرز گوتی: «هەرکەس منی خۆش دەوێ لە جێی خۆی هەڵنەستێ با قسەکانی من ببیستێ و لێم تێ بگا. هەموو لە جێی خۆیان دانیشتن کە پادشا هەستا و گوتی: «میران و وەزیران و گەورەکانی دەوڵەت و خەڵکینە. گەلۆ ئێوە دەزانن کە ئەو ولاتە لە باب و باپیرانمەوە بە من گەیشتووە؟» تێکڕا گوتیان: «بەڵێ دەزانین کە ئەو ولاتە لە باب و باپیرانتەوە بۆ تۆ ماوەتەوە.» پادشا بە خەڵکەکەی گوت: «منیش و ئێوەش ئاگرمان دەپەرست. خودای تەعالا ئیمانی بە قیسمەت کردین و ئێمەی لە تاریکییەوە بەرەو ڕووناکایی برد. ئێوە دەزانن کە من پیاوێکی بە ساڵادا چووم. دەمەوێ لە سووچێک دانیشم و خەریکی خودا پەرستی بم و داوای لێ خۆشبوونی خودا لە گوناهەکانم بکەم. دەمەوێ سەیفولملووکی کوڕم کە کوڕێکی ژیر و بەوەز و ڕووحسووک و کارزانە لە جێی خۆم دانێم و ولات بەو بسپێرم. ببێتە پادشای ئێوە و بە دادوەرییەوە ولات بەڕێوە بەرێ. پێم خۆشە بزانم ئێوە لەو بارەوە دەڵێن چی؟» خەڵکەکە تێکڕا هەستان و کڕنۆشیان برد و گوتیان پادشا ئەگەر تۆ کۆیلەیەکیش بکەی بە پادشای ئێمە، ئێمە ملکەچ و فەرمانبەری

دەبین. لە قسەی جەنابت دەرناچین. جا چ بگا بە سەیفولملووکی کوڕی تۆ هەر لە سەر چاومانی دادەنێین. ئینجا عاسم‌شای کوڕی سەفوان لە سەر تەختەکەی هاتە خوارێ و کوڕەکەی خۆی لە سەر تەختەکەی دانا. تاجەکەی لە سەری داگرت و لە سەری ئەوی کرد. پشتێنەی دەسەڵاتی لە قەدی ئەو بەست و بۆخۆی لە پەنای دانیشت. میران و وەزیران و گەورەکانی دەوڵەت تێکڕا هاتن کڕنۆشیان بۆ سەیفولملووک برد و بەڵێنیان لەگەڵ تازە کردەوە و دۆعای سەرکەوتن و بەختەوەریان بۆ کرد. سەیفولملووک زێڕ و زێوی بە سەر هەموویاندا دابەش کرد.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی حەوسەد و شەست و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! پاشا سەیفولملووک زێڕ و زیوی بە سەر خەڵکدا هەڵخستەوە و دیاری دا بە خەڵک. ئەوجار وەزیر هەستا و کڕنۆشی برد و ڕووی لە خەڵکەکە کرد و گوتی: «خەڵکینە ئەوە دەزانن کە من وەزیری ئەو وڵاتەم و زۆریش لە مێژە من وەزیرم و پێش ئەوەی عاسمشای کوڕی سەفوان بێتە سەر تەخت من وەزیر بووم. ئێستا ئەوە ئەو لە سەر تەخت لا دەچێ و کوڕەکەی لە جێی خۆی دادەنێ؟» خەڵکەکە تێکڕا گوتیان: «بەڵێ دەزانین تۆ لە مێژە وەزیری و وەزیری لە باب و باپیرتەوە بۆ تۆ ماوەتەوە.» ئینجا وەزیر گوتی: «دەیجا ئەوە منیش لە پلەی وەزیری دادەنیشم و کوڕەکەی خۆم ساعد لە جێی خۆم دادەنێم. ئێوە دەڵێن چی؟» خەڵکەکە تێکڕا گوتیان: «کەس جگە لە ساعد شیاوی وەزیری سەیفولملووک نییە.» ئەوجار وەزیر عەمامەی وەزیری لە سەری داکەند لە سەری ساعدی کرد و حۆقە[1]ی وەزیری بە ساعد سپارد. ئینجا بڕیارنامەی گۆڕانکارییەکانیان بە مۆری سەیفولملووک و واژۆی ساعد نووسی. خەڵکی شارەکانی دیکە ماوەی حەوتوویەک مانەوە و پاشان گەڕانەوە بۆ شارەکانی خۆیان. دوای ئەوە عاسمشا و وەزیر، سەیفولملووک و ساعدیان هێناوە کۆشک و بە خەزێنەداریان ڕاسپارد بچێ کلکەوانە و شیر و مۆر و بوخچەکەی کە حەزرەتی سولەیمان دابووینێ بێنن. پاشا گوتی: «کوڕەکانی من وەرن لەو دیارییانە یەکی شتێک هەڵگرن. سەیفولملووک لە پێشدا دەستی برد و بوخچە و کلکەوانەکەی هەڵگرت. ساعدیش دەستی برد شیر و مۆرەکەی هەڵگرت. پاشان دەستی پاشایان ماچ کرد و هەرکەسەی گەڕاوە بۆ ماڵەکەی خۆی. سەیفولملووک بوخچەکەی لە سەر تەختێک دانا کە شەوان لەگەڵ وەزیرەکەی لە سەری دەخەوتن.

کە بوو بە شەو، خەوگەیەکی تایبەتیان بۆ سەیفولملووک و ساعد ئامادە کرد و تەختیان تێدا دانا. ئەوان چوونە ئەوێ، لە پشت سەر و لای قاچیان مۆم داییسا. هەتا نیوەشەو خەوتن. لە نیوەشەودا سەیفولملووک وەخەر هات. بە دڵیدا هات بچێ بوخچەکە بکاتەوە و چاوێک لە شتەکان بکا. هەستا دەستی دا مۆمێک و بوخچەکەی کردەوە؛ سەیری کرد کەوایەکی دەستکاری جنیانی تێدا بوو. کە کەواکەی هەڵداوە وێنەی کچێکی لە ناویدا دیت. بە دیتنی ئەو وێنەیە هۆشی لای خۆی نەما و ئاوەزی لە کار کەوت و بێهۆش بوو.

کە وە هۆش هاتەوە، دەستی کرد بە گریان و لە خۆدان. وێنەکەی ماچ دەکرد و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

---

[1]. حۆقە: دەڤێتدان ، مەرەکەبدان، قوتووی جەوهەر.

وێنەکەی تۆیان بە چـــــــیندا گـــــــــێڕا
شوێـــنێــــــــــک کە نەققاش ئاشی دەگێڕا
هەرچی نەققـاش بوو گشـــــت حەپەســـــابوو
هـــــــــــــــۆشی نەققاشی و شیتان نەمابوو

سەیفولملووک هەر دەگریان و دەلالاوە هەتا ئاخری وا بوو ساعدی وەزیریش وەخەبەر هات. سـەیری کرد سـەیفولملووک لە جێگاکەیدا نەماوە. دەستی دا مۆمێک و چوو بە دوایدا کەمێک گەڕا و ئاخری دیتییەوە. تەماشـــــای کرد ئەو خەریکە دەگری. گوتی: «ئەو چ بووە براکەم بۆ دەگری؟ پێم بڵێ چ بوو؟» پاشـا سـەیفولملووک سـەری هەڵنەبڕی و متەقی لێ نەهات و هەر گریا. ئیدی ســـاعد گوتی: «ئەمن وەزیر و برای تۆم و لە منداڵییەوە پێکەوە گەورە بووین، ئەگەر بە من نەڵێی بە کێ دەڵێ؟» سـەیفولملووک بێ ئەوەی قســـە بکا هەر سـەری داخسـتبوو دەگریا. سـاعد نەیدەزانی چ بکا سـەری سـووڕ مابوو. هەسـتا بە جێی هێشـت و چوو شـیرێکی هێنا و گەڕاوە لای سـەیفولملووک و نووکی شـیرەکەی لە سـەر سـینگی خۆی ڕاگرت و دەسکەکەی لە سـەر زەوی دانا و گوتی: «کاکە ئەگەر پێم نەڵێی چ بووە هەر ئیسـتا خۆم دەکووژم، با تۆ ئاوا نەبینم.» لەو جەنگەیەدا سـەیفولملووک سـەری هەڵێنا و گوتی: «براکەم من لە ڕووم هەڵنایە پێت بڵێم.» ســـاعد گوتی: «توخودا قســـەی وامەکە ڕووی چی، پێم بڵێ چ بووە خۆ ئەمن وەزیر و کارداری تۆم.» ســـەیفولملووک گوتی: «وەرە چاوێک لەو ڕوخسـارە بکە. ساعد چووە پێشێ و ماوەیەک تێی ڕوانی. دیتی لە لای سـەرەوە بە لۆلۆ بە شـێعر نووسـیوانە کە ئەو وێنە جوانە ئی کچی شـاماخی کوڕی شارۆخ پاشای جندۆکانە کە لە شاری بابێل لە باخی ئێرەمدا نیشتەجێن.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی حەوسەد و شەست و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! سەیفولملووک و وەزیرەکەی کە چاویان لە سیمای بەدیعولجەمال کچی شاماخشا کرد، وەزیر ساعد گوتی: « پاشا خاوەنی ئەو وێنەیە دەناسی هەتا وە دوای کەوین؟» سەیفولملووک گوتی: «ناوەڵلا نایناسم.» ساعد گوتی: «وەرە ئەو نووسراوەیە بخوێنەوە. سەیفولملووک هاتە پێش و ئەوەی لە سەر تاجەکە نووسرابوو خوێندییەوە کە زانی چییە یەک بە خۆی هاواری کرد. ساعد گوتی: «کاکە ئەگەر خاوەنی ئەو وێنەیە کە ناوی بەدیعولجەماڵە لە جیهاندا هەبێ، ئەوە ئەمن وەدوای دەکەوم و بۆت دەدۆزمەوە و تۆ بە ئاوات دەگەیەنم. ئێستا کە توخودا بەسە مەگری با بەرپرسانی دەوڵەت بێنە لات. دوای ئەوە بانگی بازرگان و دونیاگەڕانی بکە و شوێن و جێگای ئەو شارەیان لێ پرسە. بەشکم کەسێک بە شوێنی ئەو شارە و باخی ئێرەم بزانێ و پێمان بڵێ.

کە ڕۆژ بووەوە سەیفولملووک هەستا چووە سەر تەخت، کەواکەشی لە خۆی دوور نەدەخستەوە. ئینجا میر و پەردەدار و بەرپرسانی لەشکری هاتنە لای. کاتێک هەر کەسەی لە دیوان لە جێی خۆ حازر بوو. سەیفولملووک بە وەزیری گوت: «بە هەنتەشیان بڵێ کە دوێشەو پاشا نەخەوتووە و ناساخە. وەزیر وتەکەی ئەوی بە ئامادەبوان گوت. کاتێک عاسمشا ئەو قسەیەی بیستەوە، زانا و ئەستێرەناس و نۆژداری نارده لای سەیفولملووک. ئەوان بڕیاریان وابوو دەبێ هەتا سێ مانگان لە شوێنی خۆی دانیشێ و خەریکی شەراب خواردنەوە بێ. عاسمشا توورە بوو پێی گوتن: «گلاوینە ئەگەر هەر ئێستا چاری نەکەن هەمووتان دەکووژم.» سەرۆکی ئەو کۆمەڵە گوتی: « پاشا ، ئێمە دەزانین ئەوە کوڕی جەنابتە. بۆخۆشت دەشزانی ئێمە بۆ چارەی خوێڕیترین مرۆڤەکانیش کەمترخەمی ناکەین. چۆن بۆ چابوونەوەی کوڕی جەنابت کەمترخەمی دەکەین. بەڵام پادشا ئەو کوڕەی جەنابت زۆر زۆر تێک چووە و ناڕەحەتە، ئەگەر ڕێمان بدەی ئەوە عەرزت دەکەین.» عاسمشا گوتی: «چیتان لە سەر نەخۆشی ئەو کوڕەی من بۆ دەرکەوتووە؟» سەرۆکی زانایان گوتی: «پاشا ئەو کوڕەی تۆ ئەڤینداره و دەستی بە ئەڤینەکەشی ڕاناگا.» پاشا لێیان توورە بوو گوتی: «وەڵا تەڕی تێدەگەن ئێوە چووزانن کوڕی من ئەڤینداره، ئەو لە کوێ و ئەڤینداری لە کوێ؟» حەکیم گوتی: «پاشا، ئەتۆ لە ساعدی وەزیر پرسە ئەو ئاگای لە هەموو شتێک هەیە.» عاسمشا هەستا چوو لە دیویکدا دانیشت و ناردی بە دوای ساعددا و لێی پرسی: «دا پێم بڵێ ئەو برایەت چی بەسەر هاتووە؟» ساعد ترسا و گوتی: «پاشا، من ئاگام لە هیچ نییە.» پاشا لەڕێوە فەرمانی دا بانگی جەللاد بکەن و پاشان گوتی: «چاوی ساعد ببەستن و سەر بپەڕێنن.» ساعد ترسی ڕێنیشت و هاواری کرد پاشای جیهان دەرفەتم بدە.» پاشا فەرمانی دا دەست ڕاگرن. ڕووی تێ کرد و گوتی: «ڕاستییەکەم

پێ بڵێ. ساعد گوتی: «پاشا کوڕەکەی تۆ ئاشق بووە.» پاشا گوتی: «ئاشقی کێ بووە؟» ساعد وەڵامی داوە: «ئەڤینی کچی شای جندۆکانی چووەتە دڵەوە. وێنەکەی لەو کەوایەدا دیت کە حەزرەتی سولەیمان بە دیاری بۆ تۆی ناردووە.»

پاشا کە ئەوەی بیست خێرا هەستا چوو بۆ لای سەیفولملووکی کوڕی و لێی پرسی: «کوڕم ئەوە چ بووە، ئەو وێنەیە چییە وا تۆ ئۆگری بووی، بۆ بە منت نەگوتووە؟» سەیفولملووک وڵامی داوە: «بابە من پێم عەیب بوو، لە ڕووم هەڵنەدەهات بە تۆ بڵێم. ئێستا کە ئەتۆش زانیوتە تکایە فکرێکم بۆ بکەوە. پاشا گوتی: «جا ڕۆڵە من چم لە دەست دێ، هێشتا ئەگەر کچە مرۆڤ بایە ئەمن کارێکم پێ دەکرا بەڵام چی لە جندۆکان بکەم خۆ دەستم پێیان ڕاناگا. مەگەر حەزرەتی سولەیمان فکرێکمان بۆ بکاتەوە چونکە جننەکانیش لە ژێر فەرمانی ئەو دان. کوڕی من ئێستا ئەتۆ هەستە برۆ بۆ ڕاو و خەم و پەژارە لە دڵت دەراوێ. ئەمنیش سەد کچت لە جوانترین کچە پاشاکان بۆ دێنم. ئیدی پێویستیت بە کچە جندۆکان نابێ. سەیفولملووک گوتی:

پەند و ئامۆژگاری ژیران، تازە ناچێ بە گوێمدا
بابە مەڵێ منداڵمە و، دەیدەم بە داروبەردا

ئەوجار گوتی: «بابە من دەستم پێ لەو هەڵناگیرێ و کەسی دیکەش ناتوانێ جێی ئەو بۆ من بگێرتەوە.» باوکی گوتی: «ئەی چ بکەین ڕۆڵە گیان؟» سەیفولملووک گوتی: «بازرگان و جیهانگەڕان کۆ کەوە و ڕایان سپێرە بکەونە پێ و شوێنی. بەشکم باخی ئێرەم و شاری بابل ببیننەوە. عاسمشا فەرمانی دا تەواوی بازرگان و جیهانگەڕانیان هێنا و ئەمری پێکردن بە دوای باخی ئێرەم و شاری بابلدا بگەڕێن. دوای ئەوەی کە خەڵکەکە بڵاوەیان کرد یەکێک لەوان مابووەوە گوتی: «گەوەرم ئەگەر دەتانهەوێ ئەو شوێنانە ببیننەوە دەبێ بچن بۆ وڵاتی چین. چونکە ئەوێ وڵاتێکی پان و بەرینە و شیمانەی ئەوە دەکرێ لەوێ کەسێک بەو شوێنانە بزانێ و یارمەتی لە دەست بێ.

ئەوجار سەیفولملووک بە بابی گوت: «بابە کەشتییەکەم بۆ دانێ دەچم بۆ وڵاتی چین. پاشا گوتی: «ڕۆڵە تۆ لە سەر دەسەڵات دانیشە کاری بەڕێوەبردنی کار و باری خەڵکەکەت بکە. سەیفولملووک گوتی: «بابە وا چاکە ڕێم بدەی بۆخۆم بچم و ئەو سەفەرە بکەم. ئەگەر دیتمەوە ئەوە چ باشتر، دەنا ڕەنگە بەو سەفەرە دڵم بکرێتەوە و تۆزێک خەمی سەر شانم سووک بێ. دوایەش بە سلامەتی دێمەوە لای تۆ.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی حەوسەد و شەست و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! سەیفولملووک داوای لە باوکی کرد ڕێی بدا بۆخۆی بچێ بۆ وڵاتی چین. پاشا کە کوڕەکەی ئاوا دیت هیچی بە زەین نەگەیشت جگە لەوەی ملکەچی بێ و ڕێی بدا بچێ. ئینجا فەرمانی دا چل دانە پاپۆڕ و چل هەزار کۆیلەی بۆ دابین کرد و ماڵ و زێڕ و جەواهیرات و کەرەسەیەکی زۆری شەڕی بۆ دابین کرد و پێی گوت: «ڕۆڵە گیان بە خودات دەسپێرم، چونکە هەرچی بە خودای بسپێری دەپارێزرێ.» سەیفولملووک ماڵاوایی لە بابی کرد و ڕۆیشت و ڕۆیشت هەتا گەیشتە چین.

کە خەڵکی چین بیستیان ئەوە چل پاپۆڕی پڕ لە خەڵک و کەلوپەلی شەڕییەوە هاتووە، پێیان وا بوو، دوژمنن و هاتوون بۆ شەڕ. دەروازەی شاریان داخست و مەنجەنیقەکانیان[1] ئامادە کرد.

کە سەیفولملووک ئەوەی دیت دوو کەس لە پیاوەکانی نارد بۆ لای پاشای ئەو شارە و پێی گوتن: «بچن بە پاشا بڵێن ئەوە سەیفولملووکی کوڕی عاسمشاه و هەر بۆ گەشت و سەیران هاتووەتە ئێرە. بە تەمای شەڕ و کێشە نەهاتووەتە ئێرە. ئەگەر میواندارییمان دەکەن ئەوە باشە دەنا بە جێی خۆماندا دەگەڕێینەوە. پیاوەکان چوونە بەر دەروازەی شارەکە و گوتیان کە نێردراوی پاشا سەیفولملووکین. دەروازەی شاریان بۆ کردنەوە و بردیاننە لای پاشای چین. ئەو پاشایە، ناوی فەغفوورپاشا بوو عاسمشاشی باش دەناسی. کاتێک فەغفوورپاشا زانی سەیفولملووکە هاتووە، خێرا فەرمانی دا دەروازەکانیان بۆ کردنەوە و دیاری و خەڵاتی باشیشی دا بە نێردراوەکانی سەیفولملووکشا. ڕایسپارد خواردن ئامادەکرێ و میوانداری باشیان لێ بکرێ. بۆخۆشی لەگەڵ کەسانی تایبەتی دەربار چوو بۆ پێشوازی سەیفولملووکشا. کاتێک گەیشتنە یەک سەیفولملووکی لە ئامێز گرت و پێی گوت: «ئەمن کۆیلەی باوکی تۆم و ئەو شارەش شاری تۆیە.»

سەیفولملووکشا لەگەڵ وەزیرەکەی و پیاوەکانی دەوڵەت سوار بوون و چوونە ناو شارەوە. لە ناو شار تەپڵ و دەهۆڵی شادی لێ درا و هەتا چل ڕۆژان خۆشی و شادی و میوانداری بوو. دوای ئەوە پاشای چین گوتی: «مامە گیان پێم بڵێ ئەوە چۆنە هاتوویە ئێرە و چ کارکێت هەیە هەتا یارمەتیت بدەم، ویست و ئاواتەکەت وەدی بێنی.

سەیفولملووک گوتی: «گەورەم پاشا، چیت لێ بشارمەوە، ڕاستی لێم قەوماوە. ئاشقی بەدیعولجەمال بووم.» فەغفوورپاشا کە ئەوەی بیست دەستی کرد بە گریان، زۆری زگ

---

[1]. مەنجەنیق = قۆچەقانی گەورەی بەرد هاویشتن، کە کاری تۆپی ئێستای دەکرد.

پێی سووتا و گوتی: «جا ئێستا من چیم لە دەست دێ؟ چ بکەم؟» سەیفولملووک گوتی: «گەورەم تکام ئەوەیە جیهانگەڕ و بازرگانان کۆ کەیەوە و پرسیاری ئەو نێو و وێنەیەیان لێ بکەی بەشکم کەسێک بینانسێ و خەبەرێکی لێی هەبێ. پاشا لەڕێوە فەرمانی دا تەواوی جیهانگەڕ و بازرگانەکان کۆ ببنەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو هەموویان کۆ بوونەوە. سەیفولملووکشا لێی پرسین کێ بە جێگای شاری بابێل و باخی ئێرەم دەزانێ. کەس متەقی لێ نەهات و دەنگی نەکرد. سەیفولملووکشا زۆری پێ سەیر بوو. پاشان یەک لە سەرۆکی کەشتیوانەکان گوتی: «گەورەم ئەگەر تۆ ئەو شارە و ئەو باغەت دەوێ، دەبێ هەستی بچی بۆ دورگەگەلی وڵاتی هێند. سەیفولملووک لەڕێوە فەرمانی دا ئاو و پێداویستی ڕێیەیان پێچاوە و ماڵاوایيان لە فەغفورپاشا کرد و سواری کەشتی بوون و کەوتنە ڕێ. ماوەی چوار مانگ بای خوازراو هات و ئەوان ڕۆیشتن. وا بوو ڕۆژێک هەڵی کردە بایەک لە هەموو لایەکەوە پێڵ و شەپۆل کێوئاسا هەستان و ڕووی تێک کردن لەگەڵ ئەوەدا دایدا بارانێکی سەیر و دەریا بەجارێک شێت بوو. پاپۆڕەکانی پێکدا دا و تێکی شکاندن. تەنانت لۆتکە و گەمییە چکۆلەکانی ناو پاپۆڕەکانی شکاند. سەیفولملووکشا لەگەڵ تاقمێک لە پیاوەکانی بە گەمییەک بە سەلامەت دەر چوون. پاش ماوەیەک بایەکەی خست و تاوە هەلات و دەریا ئاسایی بووەوە. کە سەیفولملووکشا چاوی کردەوە سەیری کە لەو هەموو کەشتییە جگە لە ئاو و ئاسمان هیچی دیکە دیار نەبوو. بە هاوڕێکانی گوت ئەوە کەشتییەکانی دیکە چیان لێ هات و ساعدی برام کوا. گوتیان : گەورەم، پاپۆڕ و کەشتییەکانی دیکە بە سوارەکانیانەوە هەموو تێک شکان و نوقم بوون. وادیارە جگە لە ئێمە کەس دەرنەچووە و بوون بە خۆراکی ماسییەکان. سەیفولملووک دەستی کرد بە هاتوهاوار و لەخۆدان. تەنانەت ویستی خۆی لە دەریا هاوێ. کۆیلە و پیاوەکانی نەیانهێشت و گوتیان تازە ئەو کارانە فایدەی نییە و ئەوە هەموو بۆخۆت بە خۆت کردووە، دەنا ئەگەر بە قسەی باوکت کردبا ئاوات لێ بەسەر نەدەهات هەر چەند ئەوە قەزا و قەدەرە و هەر دەبوو ببێ.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.